# حەمەدۆك

( بەرگی دووەم )

نووسینی

یەشار كەمال

وەرگێڕانی

عەبدوڵلا حەسەن زادە

هەولێر - ٢٠١٢

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **رۆمان**
- **حەمەدۆك (بەرگی دووەم)**

---

- نووسینی: یەشار کەمال

---

- وەرگێڕانی: عەبدەڵڵا حەسەن زادە

---

- نەخشەسازی ناوەوە: ڕێدار جەعفەر

---

- بەرگ: هۆگر سدیق

---

- نرخ: (هەر چوار بەرگ بیست و پێنج هەزار) دینار

---

- چاپی سێیەم: ٢٠١٢

---

- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

---

- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

---

- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٣٩)ی پێدراوە.

---

**زنجیرەی کتێب (٦١٢)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# وتەیکە

پاییزی ساڵی ١٩٨٦ بەرگی یەکەمی داستانی "حەمەدۆك" شاکاری نووسەری بەناوبانگی تورکی‌نووس "یەشار کەماڵ" و وەرگێڕانی نووسەری ئەم دێڕانە لەسەر ئەرکی "دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی" ـ کە زۆر سوپاسی دەکەم ـ بڵاو کرایەوە.

لەو کاتەوە تا ئێستا هەم بۆخۆم بە ئاواتەوە بووم کە هەلم بۆ بڕەخسێ و بتوانم بەرگی دووهەمی ئەو داستانە شیرنەش بکەمە کوردی و بیخەمە بەر دەستی خوێنەرە بەڕێزە هاوزمانەکانم، هەم بەشێکی یەکجار زۆر لەو کەسانەی بەرگی یەکەمیان خوێندوەتەوە، بەنامەو رووبەڕوو لەبارەی بەرگی دووهەمەوە پرسیارکوتیان کردووم:"حەمەدۆك کەنگێ دێتەوە؟"، بەرگی دووهەمی حەمەدۆك خەبەری چیە؟". "خەبەروباسی حەمەدۆك چیە؟"و زۆر پرسیاری لەو بابەتە.

ئێستا خۆشحاڵم کەدەبینم دووساڵ پاش بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەم توانیومە ئاواتەکەی خۆم و داوایەکەی ئەو خوشك و برا رووناکبیرە کوردانەم "نیوانیو" بەجێ بێنم و بەرگی دووهەمی "حەمەدۆك" بکەم بە کوردی. ئاواتم ئەوەیە لە دوارۆژێکی نیزیك دا بکەوێتە ژێر چاپ و "بێتە بەر چرایە"و بگاتە دەستی ئۆگرانی چارەنووسی "حەمەدۆك".

لەسەر وەرگێڕانی بەرگی دووهەم دەمەوێ هێندێ شتی پێویست روون بکەمەوە:

هەم بەرگی یەکەم و هەم بەرگی دووهەم ـ بە شێوەی سەرەکی ـ لە فارسی‌یەوە کراون بە کوردی و زمانە کوردی‌یەکەیان یەکە. بەڵام ئەو دوو بەرگەی رۆمانی "ئینجەمەمەد" لەلایەن دوو کەسەوەو بە دوو سەلیقەی جیاواز کراون بە فارسی. لە کاتێك دا مامۆستا "ڕەین باغچەبان" لە وەرگێڕانی بەرگی یەکەم دا بەشی زۆری ناوەکانی نێو ئەو رۆمانەی کردوە بە

فارسی، "دکتر ایرج نوبخت" لەگەڵ وەرگێڕانی بەرگی دووهەم زۆربەی هەرەزۆری ناوەکانی ـ کە زۆریش زیاتر بوون ـ هەروەك خۆیان هێشتوەتەوە. ئەوانەش کە کردوونی بە فارسی، کەمیان لەگەڵ فارسی‌یەکەی بەرگی یەکەم وەك یەکن.

ئەمنیش بەش بە حاڵی خۆم لە وەرگێڕانی بەرگی یەکەم دا بەشێکی زۆری ناوەکانم کردوەتە کوردی و بۆ ئەوەی داستانەکە لەگەڵ "میزاجی کوردەواری" یەك بگرێ، بەرگێکی خۆماڵیم بە بەر قارەمانەکانی دا کردوەو تەنانەت شاخ و کێوەکانیشم بە رەنگی کوردەواری کێشاوەتەوە.

بەڵام چونکە لە تورکی دا دەستم زۆر کورتە لە بەرگی دووهەم دا ئەو کارەم لە دەست نەهاتوە. هەربۆیە بە ناچار ناوی قارەمانەکان و جێگاکەیان لە بەرگی دووهەم دا "دوو تۆو"ن. ئەو ناوانەی لە بەرگی یەکەم دا هاتوون، لە بەرگی دووهەمیش دا هەروەك بەرگی یەکەمی کوردی‌یەکە دانراونەوە بۆ ئەوەی خوێنەر بیان ناسێتەوەو بەسەریان بکاتەوە.

زۆربەی نیزیك بە تەواوی ناوە تازەکانیشم هەر بەو جۆرە کە لە فارسی‌یەکەدا هاتوون ـ دیارە بە رێنووسی کوردی ـ هێناون و دەستم لێ‌نەداون.

ئەوەی ئەمن بزانم تا ئێستا ئەم رۆمانە چوار بەرگی بە تورکی لێ‌بڵاو بوونەوە، بەڵام ئاگام لەوە نیە کە بەرگەکانی سێ و چواری بوونە فارسی یان نا؟ بە ئاواتەوەم لە دەستم بێ لەدوارۆژ دا ئەو دوو بەرگەی دیکەشی بکەمە کوردی و کارەکەم بەنیوەچڵی نەهێڵمەوە.

خۆ ئەگەر ئەمنیش ئاواتەکەم وەك زۆر ئاواتی دیکە بردە بن گڵ، ئەوە "دەست نیە لە گۆزەی مابێ"، با یەکی دیکە قۆڵی لێ هەڵماڵێ و کارەکەی من تەواو بکا. ئارەزوومە بەرگی دووهەمی "حەمەدۆك" بتوانێ جێگای خۆی لە کتێبخانەی کوردی و لە دڵی گەورەی خوێندەوارانی کورد دا بکاتەوە.

وەرگێڕ

پاییزی ١٩٨٨

## (١)

چۆمی‌جەیهان بە جنووبی دەشتی ئاناوارزا دا تێ‌دەپەڕێ. لە کێوی هەمیتە ڕا هەتا دەگاتە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا ڕاستەڕێ و بێ ئەوەی قۆرت و پێچێکی زۆری بێتە پێش، دەڕواتە خوارێ. لە هێندێ جێگا ئاوەکە زۆری عەرز دادڕیوە. جار جار خاکی لێوارەکان تێ‌دەڕووخێ و شلپە لە ئاوەکە هەڵدەستێنێ و براوایی‌یەکان کە دەڵێی بە شمشێر بڕیویانن ددانە ددانە بوون و لە لێواری چۆمەکە هێندێ چزیرکی چووکەڵەی خیزیان دروست کردوە.

لە هێندێ شوێن، چۆمەکە وردە خیزی خۆی پان دەکاتەوەو لەو دەشتەدا داوێنی لێ‌بڵاو دەکاتەوە. لەو جۆرە جێگایانە لەنێو تەنکاو دا هەزاران ماسیی سووفیی گەورە کە لە تیشك دا ون بوون، بە دوای یەك دا دەخزن و شەپۆل دەدەنەوە. قەراخەکانی رووبار پڕن لە قامیشەڵانی چووکەڵە کە لەو قامیشەڵانانەدا بۆقە شینکەی گەورە گەورەو ماسی‌خۆرکەی مل درێژو ڕەنگ خۆڵەپۆتینە دەسووڕێنەوە.

داری گەزیچار، بڕکە ئاڵەتی کێوی، داری بی، سنۆبەری کێوی و دەوەنە تووترك بست بە بست لێوارەکان دادەپۆشن. زەرگەتەو ژەنگەسوورەو مێشە شینکە لەبەر گەرما خەریکن هیلانەی خۆیان دروست دەکەن" بە جۆرێك کە بێشەکە لەبەر وزە وزی مێش و مەگەز ئارامی لێ‌هەڵگیراوە. پەڕەسێلکەکان بەو باڵی نەخشین و مۆنج مۆنج و بەو دەندووکە درێژەوە کە وەك پشتی جروجانەوەرێکی پشت ڕەق دەچێ دەگەنە جێ" و لە دابڕاوایی قەراخ چۆمەکەدا کە دەڵێی بە شمشێر بڕیویانە ماوەی چەند ڕۆژ خەریکی هەڵقەندنی قووڵکەیەکی باریك و قووڵ دەبن. ئەوان هێلانەی خۆیان لەنێو جەرگی زەوی و لە قووڵایی دا دروست دەکەن.

گوندەکانی هەمیتە، نورهانیە، سەلیمیە، ئەندەڵ و کەسیك کلی لە قەراخ چۆمی و لە نێوان کێوی هەمیتەو قەڵای ئاناوارزادا، واتە لەسەر رێگای قەڵای ئاناوارزا هەڵکەوتوون. چۆمەکە بە گۆڕینی رێبازەکەی، جاروبار لەم گوندانە دوور دەکەوێتەوەو روو لە هێندێك دێی دیکە دەکاو جاری واشە هێندە نیزیك دەبێتەوە، کە دێتە نێو ماڵان. زۆر جار رێ کەوتوە کە لافاوی گەورە نیوێکی گوندەکانی بردوە.

جەیهان لەنیزیك ئاناوارزا گۆمێکی گەورە دروست دەکاو بن قەڵای ئاناوارزا وەك گۆلێکی لێدێ کە هەمیشە دەسووڕێ. ئاوی ئەو گۆمە لە سەدان جێگە وەك گێژاوێکی چووکەڵە هەڵدەقوولێ، بەرز دەبێ، قووڵ دەبێتەوەو بە بڵقی ورد وردو بە خێراییەکی سەرسوڕهێنەر بێوەستان دەسووڕێ و دەسووڕێ بە جۆرێك ئەگەر لکە دارێك یان گەڵایەك بکەوێتە نێو گۆمەکە بێ ئەوەی بچێتە جێگایەکی دیکە لەم گێژاو بۆ ئەو گێژاو بەسەر ئاوەکەوە دەخولێتەوە.

وەختێك پەپوولە پەلامار دێننە سەر ئەم ئاوانە، بە فڕینی سەدان هەزار پەپوولە، ماسیی سیلوێری گەورەتر لە بنیادەم زارە گەورەو سمێڵ دارەکەیان لێك دەکەنەوەو شاڵاو بۆسەر رووبەری ئاوەکە دێنن و پاش قووت دانی کۆمایەك پەپوولە لوور دەبنەوە نێو ئاوەکە. لەو کاتانەدا ئاوەکە پڕ دەبێ لە بڵقی رەنگ زەرد.

بەردەڵانەکەی قەڵای ئاناوارزا وەك گەمییەك دەچێ کە لە جنووبەوە بۆ شیمال لەنگەری گرتبێ. ئەو گەمییە بە وێرانە تێك تەپیو و لەمێژینەکانیەوە، هەر ساتێك لە دەریایەکی مەندو ئارام دا بەسپایی و بە بێ هیچ تەکانێك بەرەوپێش دەڕواو ئەگەر لە شاخە بەرزو بنەوش و رژدەکانی سەرکەوین و روو بکەینە رۆژهەڵات، لە پێش دا کێوی هەمیتە بە لووتکە تەماوییەکەیەوە دەبینین" و ئەگەر بەیان بنگوێ و ئەگەر مژ هەڵکشێ بۆ بەرزاییەکان، لەو لووتکەیە گڵکۆی پیاوچاکێك لەگەڵ کۆڕەوە دارێك دەبینین. لە پاش کێوی هەمیتە تەپۆلکەکان تەخت و پان دەبنەوە. دەوروبەری گوندی "بووزکوویوو" رووتەنە" خاکێکی بوورەو بەیارە کە لە دوورەوە سپی سپی دەچێ" بەڵام لە دەوروبەری گوندی "جیجیك" خاکەکە دەگۆڕێ. رەنگی خاکەکە رەش دەچێ و سەوزایی دارستان دەست پێ دەکا. لێرە دەوروبەر بە گوڵ داپۆشراوە. لەنێو کێڵگەکانی جیجیك دا مەزرایەك لە مووزاییکی بیزانس دروست بووە کە لە نێو دەشتەکەدا وەك باخێکی گەورە لە گلۆوکی کێوی خۆی دەنوێنێ.

"قەدیرلی" لە جنووب و تەپۆلکەی "سوولەمیش" لە قەدیرلییە... لە سوولەمیش تاك و تەرا داری مۆرد بە بۆنی قورسیانەوە رواون. تەپۆلکەی سوولەمیش داری لێ نیە، بەڵام یەك

پارچە سەوزە. چۆمی ساووران لە خوار تەپۆلکەکە هەڵدەقوڵێ و بەسەر دەشتەکەدا دەڕواتەخوار.

جادەی "کووزان" لەجنووبی ڕۆژئاوای ئاناوارزایە... چۆمی "سوومباس" ئەم جادەیە دوولەت دەکاو هەتا بن گابەردەکانی ئاناوارزا درێژەی هەیە. گوندی "حاجی‌لار" لەوبەری سوومباس، لە ڕۆژئاوای قەڵای ئاناوارزایە... و کەمێك ئەولاتر گوندی "ئەسلانلی"یە... ئەم گوندە کوردی لەکی لێ‌دەژین کە پێشتر پێیان دەگوتن "تەیری ڕاوێ". دوورتر لەویش "دوومل قەڵا" دەبینی کە دەڵێی باڵەکانی لێك کردوونەوە بۆ ئەوەی زۆر بە خێرایی بەرەو دەریای مەرمەڕە هەڵفڕێ. دوومل قەڵا هەمیشە لەنێو مژ دایەو لەگەرمادا شاخە سوورەکانی هەڵمیان لێ‌هەڵدەستێ.

ئەم دەشتە، دەشتی بە پیت و بەرەکەتی ئاناوارزایە، و لەنێو ئاناوارزاش دا گۆلاوی لێڵ، پڕ هەراو دەنگ و بێ‌بڕانەوەی "ئاکچاساز" بەو قامیشەڵانی وەك بێشەیەوە هەڵکەوتوە کە نە باڵندەی لێ‌دەردەچێ و نە ماری تێ‌دەچێ. گوندە تورکمەن نشینەکان بەو کەوێڵانەوە کە لە قامیشی وشك و جەگەن ساز کراون لە دەوروبەری ئەو گۆلاوەن... گۆلاوی ئاکچاساز لە شیمال لەو جێگایە دەست پێ دەکا کە چۆمی ساووران لەگەڵ جەیهان تێکەڵ دەبێتەوەو لە جنووبیش ڕاست لە خوار گوندی "وایوای" کۆتایی دێ.

خاکی بەرێژەوی ئاناوارزا ساڵی سێ جار بەرهەم دەدا. لە سایەی ئەم خاکە تەڕو تازەو تورت و چەورەوە لە هەر ڕۆژێکی ساڵ دا جۆرە گیایەك لە زەوی دەڕوێ. هەرچی لەم دەشتە دەڕوێ دوو، سێ و تەنانەت پێنج هێندەی ڕووەکی جێگای دیکە دەبێ. ڕەنگی گوڵەکان، ڕەنگی گیا سەرسەوزەکان و ڕەنگی دارەکانیشی شتێکی دیکەیە. ئەم ڕووەکانە ئەگەر سەوز بن وەك بلووری سەوز وان و ئەگەر زەرد بن زەردێکی کارەباین. سوورەکەی وەك گڕی ئاگر سوورەو شینەکەی هەزار جار شین ترە. باڵی باڵندەو پەپوولەکانی، توێژو پشتی مێروولەو جڕوجانەوەرەکەی لەنێو هەزارو یەك ڕەنگی ئەفسووناوی دا دەدرەوشێنەوە. لەم دەشتەدا، جڕوجانەوەر، پەپوولەکان، پەلەوەرەکان و کوللەکان وەك تۆفان وەڕێ دەکەون. ڕۆژێك دەبینی لە دەشتی ئاناوارزا تۆفانێك لەو پەپوولانە کە بە هەزارو یەك ڕەنگ دەدرەوشێنەوە، بەرپا دەبێ. دارەکان، گیاکان، بەرد، خاك، سەرزەوی و ژوورەوەی ئاسمان لە پەپوولەدا ون دەبێ. پەپوولەی زەلام زەلام بە ڕەنگی زەرد، سوور، سەوز، شین و سپی هەریەکەی بە قەدەر باڵندەیەك تێکەڵ دەبن، دەبنە یەك و دەبنە گێژاوێکی گەورەی پەپوولە، وەك شەهابێکی تیژڕەو بەرەو ئاسمان

وەڕێ دەکەون، شەپۆل دەدەن، بەسەر بیابان دا بڵاو دەبنەوەو پاشان بە هەڵفڕینێکی لە نەکاو لە کاتێك دا وەك پەڵە هەور بەرز بوونەوە بۆ ئاسمان، دنیای دەوروبەری خۆیان دەکەنە دنیایەکی بێوێنە، سەرسوڕهێنەر، نائاسایی و ئەفسووناوی. ڕۆژێکی دیکە دەبینی مێرووله سووره زەلامەکان بە تەکانی وەك فەنەر لەسەر لاقە درێژەکانیان ڕوو دەکەنە دەشت و بە پەلە لەم سەری دەشتەوە دەڕۆن بۆ ئەوبەری. ڕەنگە ڕۆژێکیش دیتبێتت کە بایەك لە زەرگەتەو ژەنگەسوورەی چزووەشێن هەڵ دەکا.

ئەم دەشتە گوڵە ئەستێرەکانیشی زۆر گەورەن. شەوانە دەشتی ئاکچاساز بە فەرشێك لە ئەستێرەی پڕشنگدار دەڕازێتەوە. گیاکان، دارەکان، گوڵەکان، گەڵاکان و لکەکان تا بەیانی لەبەر گوڵە ئەستێرە لە تیشك دا نوقمن. ئەندازەکەیان لە ژمارە نایەو بە پاڵ یەکەوە هەڵدەفڕن. ئەودەم تۆفانێك لە ئەستێرەی پەرش و بڵاو هەڵدەستێ و ئەستێرەی عەرزو عاسمان سەرڕێژ دەکەن، دەبنە یەك و تێکەڵ دەبن. لەم دەشتەدا مێشە شینکەکانی، کوللەکانی و جڕوجانەوەرەکەی بە توێژی ڕەق و بنەوشی تڕووسکەدارەوە، هەموو تێکڕا لە یەك تۆفان دا دەکەونە جم وجۆڵ.

لەدەشتی ئاناوارزا هەموو شتێك: گیا، دار، باڵندەو جڕوجانەوەر بێ ڕاوەستان لە جووت بوون و زەوو زۆ دان. گیاندارو ئافەریدەکانی ئاناوارزا شتێکی دیکەن. گیاندارو ئافەریدەی دنیایەکی پڕ پیت و بەرەکەت، ساغ، پڕشنگدارو ئەفسووناوی.

قەراخەکانی گۆلاوی ئاکچاساز هەتا گۆلاوەکە خۆی، نێرگزەجارە. نێرگزەکانی دەگەنە پشتێن و بە ئەندازەی گوڵەباخێك دەپشکوون. قەراخەکانی ئەو گۆلاوە دەوران دەرو لە نێرگز دا زەرد هەڵگەڕاون" و هەربۆیە بەهاران گۆلاوی ئاکچاساز بۆنی گۆلاوی لێ‌نایە. بۆنی نێرگز شێرن و لەبەر دڵان لە خاکی نەرم بەرز دەبێتەوە، لەگەڵ هەوای گەرم، لەگەڵ بەردو گیا، لەگەڵ داران و لەگەڵ ئادەمیزادو باڵندەو جڕوجانەوەر تێکەڵ دەبێ و کاریان تێ‌دەکا...

هەر لەبەر ئەوەش بەهاران لە ئاناوارزا هەموو شتێك: مێش، جڕوجانەوەر، باڵندەو پێ‌ڕۆ بۆنی نێرگزی لێ‌دێ. لەبەر هەتاوی مەیلەو گەرمی بەیانان نێرگزجاڕ بۆنێکی خۆشی لێ‌هەڵدەستێ. لە بەهاردا دانیشتووانی ئاکچاساز بە بۆنی نێرگز سەرخۆشن و وەك سەرخۆشان بە لادا دێن. لە دەشتی ئاناوارزا هەموو بوونەوەرەکان لە باڵندەو پێ‌ڕۆ بەو بۆنە سەرخۆشن.

سێ ئاسکی چاوڕەش ـ پاشماوەی هەزاران ئاسك کە لە ڕۆژگاری زۆر کۆن دا لە بیابانەوە هاتبوونە دەشتی ئاناوارزاو ئەو دەشتەیان پڕ کردبوو ـ لە حاڵێك دا وەك بریسکە دەڕۆن، بەنێو

تۆفانی پەپوولەو کوللەو جروجانەوەرو مێش و بەنێو تۆفانی باڵندەو بەنێو بۆنی نێرگز دا تێدەپەڕن. لەکێوی هەمیتە تا قەڵای ئاناوارزا، لە قەڵای ئاناوارزا تا خوارەوەی گوندی وایوای، لە وایوای تا حاجیلارو خوارەوەی دوومەلی و لەوێوە هەتا لێوارەکانی جەیهان دەڕۆن و شەوو رۆژ دەگەڕێن. بێشەکانی گۆلاوی ئاناوارزا ئەوەندە پڕن کە گوللەیان لـێتێپەڕ نابێ و ماریان تێناچێ. لە هێندێ جێگا ئاوی گۆلاوەکە قوڵت قوڵت دەکوڵێ و کەف دەکا" بە جۆرێك کە ناتوانی قامکی تێ نێی، وەك گڕی ئاگر دەسووتێنێ. لە هێندێ جێی دیکە ئاوەکە جۆرێکی دیکەیەو هیچ وەك ئەو ئاوە گەرمە ناچێ" بنەکەی پڕ لە وردە بەردەو روونەو وەك سەهۆڵاو فێنکە" و تیشکی خۆر کە لەو وردە بەردانە دەدا هەتا دووری رەنگ دەداتەوە. لە هێندێ شوێنیش ئاوەکە لێڵ و قوڕاوییەو بۆنی لـێدێ.

عەرزە باتلاغەکەش لە هەموو جێیەك وەك یەك نیە" هێندێك بەشی قامیشەڵانن و قامیشەکانی بەقەدەر دارێك هەستاون، هێندێك بەشی گیاجاڕن بەگیایەکی وردیلەو گلۆوکی لاسك کورتی ترووسکەدارەوە، و شوێنێکی دیکەی چیمەنێکی ساف و بەربڵاو و یەکسەر شینەو جێگایەکی دیکەی دارەکانی هەڵچوون بۆ ئاسمان و لێرەوارێکیان پێك هێناوە کە ئەوەندە چڕو پڕە ئاسمانی تێڕا دیار نیە. جۆراوجۆرو رەنگاوڕەنگ، گیاکان، مالوێچە کە بە هەڵاتنی خۆر گوڵە شینەکانی بە ئەندازەی دوو لەپە دەست دەم دەکەنەوە، قامیشەڵانی پڕو پاڵ وێك داو، گوڵەزەردە، ئەو لەیلوپەڕانە کە هەرکامێکیان لەنێو ئاودا وەك باوەشێك تیشك مەلە دەکا" ماسیی سووف، ماسیی سیلوێر، کیسەڵەکان و بۆقە شینکە زەلامەکان... ئەو هەورەی لە کۆمای مێشوولەکان دروست دەبێ، رەشمارەکان، ماری ئاوی، رێوییە کلك سوورەکان، چەقەڵە ترسەنۆکەکان، هەزاران مەلی ئاوی بە رەنگێکی خۆڵەمێشیی مەیلەو سەوزو لاقی بڵیندو ملی درێژەوە.

وەختێك لە چیاکانی توورووسەوە شۆڕ دەبیەوە بۆ دەشتایی، دەشت لە بێدەنگی دا نوقمە" نە دەنگی باڵندەیەك دێتە بەر گوێ، نە خوڕەی ئاوێك و نە ورتەی ئینسانێك ـ دەشت هەمیشە هەموو دەنگەکان قووت دەدا ـ بەتایبەتی کاتێك خۆر بە دەرەوەیە. وەختێك هەوا گەرمە، چووکترین دەنگ لەو دەشتە بەرز نابێتەوەو ئەم بێدەنگییە هەتا نیزیك ئاکچاساز هەروا درێژەی هەیە. لە پاشان تەقینەوەی لەنەکاوی دەنگەکان ئینسانی تووشی سەرسوڕمان دەکاو خوێن لە دەمارەکانی دا دەبەستێ. لە گۆلاوەکە دەنگی جۆراوجۆرو تێکەڵ و نامۆ دێنە بەرگوێ. زیق و هۆڕی پەلەوەران، قڕەقڕی بۆقان، دەنگی قوڵتەقوڵتی ئاوی گۆلاو، دەنگی

سەیرو سەمەرەی جرِوجانەوەر، هاشەی لیژەوارو خشەخشی قامیشەلآن، قووقووی کەڵەباب، حەپەحەپی سەگان و لوورەی چەقەلآن لە قامیشەلآن دا دەبێتە یەك و وەك گوللە تۆپێك لە رووبار دا دەتەقێتەوە. ئاکچاساز پیاوی دەترسێنێ و هەربۆیەشە کە کەس بە ئاسانی ناوێرێ بچێتە ئاکچاساز.

خاکی ئاناوارزا" شاری مردووی هەزاران ساڵەی ئاناوارزا، بە قەلآ قایەکانیەوە، بە بەردەلآنەکانیەوە، بە جەیهانەکەیەوە کە وەك شێتان هەڵدەچێ، بە چۆمەکانی ساووران و سوومباسەوە، بە باڵندەکانیەوە، بە هەڵۆکانیەوە، لە فەسلی گوڵان دا بە گوڵەکانیەوە، لە وەرزی جموجۆڵی جرِوجانەوەردا بە جرِوجانەوەرەکەیەوە، بەو کێلگانەوە کە لە هەر دەنکێك هەزار دەنك بەرهەم دەدەن، بە ئاکچاسازیەوە کە لە ژێر هەتاوی گەرمی دا چەندین چۆمی زولآڵی وەك بەفراو تێدەپەرِن، بە جادە خاکیەکانیەوە، بە ماسیەیە خۆهاوێژەکانیەوەو بە زەوو زۆی بێپسانەوەیەوە لە باوەشی چوکووراوادا حەساوەتەوەو لەشی داوەتە بەر گەرماکەی و بە لەزەت و هەوەسەوە خەریکی ئیسراحەتە.

ئەودەم کە هەتاو لە پشت شاخەکانی ئاناوارزاوە روو دەکاتە رۆژئاوا، پەپوولەیەکی هێندەی باڵندەیەك بە نەخش و نیگاری پرتەقاڵیەیەوە، بەو باڵانەوە کە لەسەر پشتێ جووتی کردوون، لاقەکانی بەسەر سەروچاوی دا دێنێ و لە حاڵێك دا پەیکەری ناسکی لەرزەیەکی شیرن دەیگرێ، نوقمی تیشکی هەتاو لەسەر لکێك بەرەورووی هەتاوی دەمەو ئاوابوون، هەڵدەنیشێ و جووڵە لە خۆی دەبرِێ، و راست لە لەحزەی خۆرئاوابوون دا کە سەرانسەری دەشتی ئاناوارزا: دار، ئاو، عەرزو عاسمان رەنگیان شین هەڵدەگەرِێ، پەپوولەکەش رەنگی شین بەخۆیەوە دەگرێ.

خاکی ئاناوارزا خاك نیە، زێرە" و ئەمە تەنیا "عەلیسەفابەگ" باشی دەزانێ و تام و لەزەتی ئەم خاکە تەنیا عەلی سەفابەگە کە لە قووڵایی دڵی دا هەستی پێ دەکا. هەرکەسە سەودایەکی چاك یان خەراپی لەسەر دایە، هەرکەس تەماعی لە شتێك دا هەیە. بەڵام سەودای عەلیسەفابەگ لەهەمووان خەراپترو لە چارەنەهاتووترە. عەلیسەفابەگ چاوی تەماعی لە خاکی رەش و بەرهەم دارو بەرپێژەوی ئاناوارزاوە برِیوە. هەموو رۆژێ وەختێك هەتاو سەر وەدەر دەنێ، عەلیسەفابەگ پێ دەنێتە سەر ئەم خاکە رەشەو لە کاتێك دا لە تاوان دەلەرزێ، هەتا هەموو دنیا وەخەبەر دێ، چاو لە دەشتی ئاناوارزاوە دەبرِێ.

ئەو، ئەم بێدارییە، ئەم هەزاران جرِوجانەوەرە کە تێکەوە داوێن، ئەو مارە ساغ و قەڵەوانەی رادەخزن، بۆقە شینکە زەلامەکان کە کەوتوونەتە سەر یەك و لەنێو گەشترین رەنگی

سەوزدا دەدرەوشێنەوە، کیسەڵە چوست و توندڕەوەکان و ئەو جانەوەرانەی توێژە ڕەقەکەی پشتیان بەهەزارو یەك ڕەنگ دەدرەوشێتەوە، زەرگەتەکان، باڵندەکان، ئاسکەکان، لە وەختی گوڵان دا گوڵەکان، کیڵگە بەربڵاوەکان، مەرەزەجاڕە سەرسەوزەکان، پەپوولەکان، ئاوەکان، گۆلاوەکان، بەفراوەکان، جادەکان، گێژەڵووکەکان، ئەو هەورە سپییانە کە دەسووڕێن و دەبارێنن، ئەم دنیا سەرسوڕهێنەرە پڕوپەڕو بەربڵاوە کە بێ راوەستان لە جووت بوون و زەوو زۆدایەو سامی رۆژی قیامەت دێنێتە بەرچاو و هەروەها لە دایك بوونی دنیایەکی دیکە، بە سەرەگێژەوە تەماشا دەکاو ناگای لە خۆی دەبڕێ و دەیەوێ دەشتی ئاناوارزا بێنێتە نێو هەردوو باسکی و لە باوەشی بگرێ. ئەو کە جاران تەنانەت بستێك خاکیشی لە ئاناوارزا نەبوو، ئێستا کە بووەتە خاوەنی کێڵگەکانی ئاناوارزا، بۆچی هەموو زەوییەکانی ئاناوارزا نەکاتە هی خۆی؟ بۆچی زەوییە لە رادەبەدەرەکانی دیسانیش پەرە پێ نەدا؟ بە باوەڕی عەلیسەفابەگ ژیان یانی شەڕ" شەڕ بۆ وەدەست هێنانی زەویی زیاترو دیسان زیاتر. ئەگەر ژیان مانای ئەو شەڕە نەبێ، هیچ مانای نیە. شەڕ بۆ ئەستاندنی زەوی پیرۆزترین و بەجێترین شەڕە. بنیادەم لەم دنیایەدا ئەگەر شەڕ نەکا، ئیدی بە کەڵکی چی دێ؟ فەرقی لەگەڵ پووش و پەڵاش و دڕك و داڵ چیە؟

بەڵام شەڕ لەسەر زەوی بەرە بەرە خەریك بوو دژوارتر دەبوو" چونکە ئەو تورکمەنانەی بە پێچەوانەی ویستی خۆیان و بە زۆر لەم خاکەدا، لە ئاناوارزا، لە چوکووراواو لە گەرماو مێش و مەگەزو خانووی قامیش دا نیشتەجێ کرابوون، وردە وردە تێدەگەیشتن کە جگە لە زەوی پەناگایەکی دیکەیان نیە. زۆر لەو رۆژانە تێپەڕیبوو کە دەکرا پارچە زەوییەکی چوارپێنج هەکتاری بە پێنج کیلۆ خوێ، بە بزنێك، بە دە لیرە پووڵ، بەجەواڵێك یان بە لینگە گایەك بکڕی. پازدە بیست ساڵ پێشتر دێیەك بە هەموو هۆبەو هەواریەوە بە سێ هەزار لیرە کڕین و فرۆش دەکراو دەکرا رەعیەتەکانی ئاوایی بنێریە جێیەکی دیکە" بەڵام ئێستا وەزعەکە بە تەواوی گۆڕابوو و دانیشتووانی ئەو ماڵە قامیشانە حازر بوون لەسەر زەوی تەنانەت خوێنیش برێژن. مەسەلەیەك کە زۆری عەلیسەفابەگ ئازار دەدا، ئەوە بوو کە ئەو دەیتوانی لەوەختی خۆی دا کارەکانی لە بنەوە ڕاپەڕێنێ بێ ئەوەی تورکمەنەکان شتێکیان دەست کەوێ. بەڵام بەو بایەخە کە ئەو بۆ زەویی دانابوو ـ کە ئەویش لە تەماعکارییەکەیەوە هاتبوو ـ بە دەستی خۆی چاوو گوێی دێنشینەکانی کردبووەوە. شەڕ لەگەڵ دێنشینانی چاووگوێکراوەوە زۆر دژوارو هەر لەو کاتەدا شیرن بوو. ئەو لەو باوەڕە دابوو کە ئەم شەڕە شەڕێکە شیاوی ئینسان" چونکە خاك، ئەم شتە بەنرخە نابێ زۆر هاسان دەست کەوێ.

وایوای یەکێك لە گوندەکانی ئاناوارزایە" کەمێك لە دێیەکانی دیکە گەورەترە. خەڵکی وایوای گەورەترین کۆسپی سەر ڕێگای عەلیسەفابەگ بوون" نە لە چەتەکان دەترسان و نە لە پیاوانی حکوومەت" نە قسەی خۆش بە لای وانەوە قیمەتی هەبوو نە قسەی ناخۆش. ئەوان وەك فریزوو بە زەوییەوە چەسپابوون و چنگیان لێ گیرکردبوو و بەرامبەر بە هەموو بەڵایەك سنگیان کردبووە قەڵغان و شەڕیان دەکرد. ئەگەر عەلیسەفابەگ توانیبای هەر بەم گوندی وایوایە بوێرێ، ئەوی دیکەی ئاسان بوو و سەرانسەری ئاناوارزا لە دەستی خۆی دابوو.

وایوای لە لای سەرووی دەشتی ئاناوارزا، و لە خوارووی "تۆپراخ تەپە" کە هەتا وێ نیزیکەی نیوسەعات ڕێیە، واتە لەلای راستی گوندی "دەدەفاکلی" لەو جێگایە کە چۆمی ساووران بەدەشتێ دا بلاو دەبێتەوە، هەڵکەوتوە. هەموو ماڵەکانی ئاوایی کەوێڵێکن لە قامیش و جەگەن و چرپی. ئاناوارزا لەو جێ بەرزەی خۆیەوە بەسەر دەشتە هەموارەکەدا دەڕوانێ.

لە چۆمی جەیهان هەتا تەپۆلکەی سوولەمیش، ئاناوارزا ئەوەندە رێك و هەموارە کە دەشت بە هەموو گۆلاوەکانی، دێیەکانی، بە هەموو جموجۆڵ و قۆرت و پێچ و تەنانەت بە هەموو مێشەو دارستانە چڕەکانیەوە وەك دەریایەك دیتە پێش چاو. لە پێش خۆرهەلات دا دەشتی ئاناوارزا یەکسەر سپی دەبێ و ئەو دەشتە دەنگێکی لێ هەڵناستێ. ئەم خاکە، ئەم زەوییە کە هەر دەنگێك دەکاتە هەزار دەنگ لەم سەعاتەدا نوقمی بێدەنگییە.

لە کاتێك دا دەشت هێشتا سپی دەچێ، پەپوولەیەکی بە قەد باڵندەیەك بە رەنگی نارنجی بە باڵە کراوەوەو لەرزۆکەکانیەوە لەسەر لکێك هەڵنیشتوەو لاقی پێشەوەی بەسەر سەریدا دێنێ و ڕووبەڕووی ئەو خۆرە کە خەریکە هەڵ دێ خۆی خاوکێش دەکا.

## (٢)

زیيەگەرمێنی لەباشترین و بەرپێژەوترین خاك دا دەرِویّ. بەرزاییيەکەی لە بالآپیاوێك زیاتر نیە، بەلآم کۆرِەو زۆر دەکاو بە جۆرێك کە لە تاقە ریشەیەك باوەشێك چەقلّ دەردەکا. زیيەگەرمێنی بە ساوایی، رەنگی هەنگوینیيەو ئەو چەقلّە هەتا پیرتر دەبیّ، رەنگی بەرەو تاریکایی دەرِوا" لە هەنگوینیرِا هەتا رەش رەنگ دەگۆرِیّ. زیيەگەرمێنی بەهاران پێش هەموو شتێك چرِۆ دەردەکاو شین دەبیّ و گولّە زەردەکانی دەپشکوون. رەنگی گەلآی زیيەگەرمێنی لە پێش دا سەوزێکی کالّە، گولّە زەردەکانیشی کەم رەنگن، بەلآم وردە وردە گەلآکان دەبنە سەوزێکی پرِ رەنگ" سەوزێکی مەیلەورِەش... و گولّە زەردەکانیشی لای هاوینیّ رەنگیان دەبێتە پرتەقالّی.

لە چوکووراواو لەدەشتی ئاناوارزا سەدان هەکتار لێرِەواری زیيەگەرمێنی هەیە. ئەم لێرِەوارە مەیدانێکە لەگەلّ تەور بێگانە کە نە بالّندەی پێدا دەفرِیّ و نە کاروانێکی پێدا رادەبریّ.

زیيەگەرمێنی دارێکە کە رەقترین چەقلّی هەیە. قەدەکەی لەسەریّ تا خواریّ، هەتا باریکترین لکەکانیشی بە چەقلّێکی سیّسووچ داپۆشراوە. هەرچەندی رەنگی زیيەگەرمێنی لە هەنگوینیيەوە بەرەو رەشایی دەرِوا، بەو ئەندازەیەش چەقلّەکانی رەق تر دەبن و دەبن بە بزمارێکی ئاسنین. ئەم چەقلّە رەگەیەکی سەیرو بە قۆرت و پێچی هەیە کە بەقولآیی زەوِی دا دەرِواتە خوار. هەلکەندنی زیيەگەرمێنی کارێکی زۆر ئەستەمە، بەخاکەوە چەسپاوەو لێی جیا نابێتەوە.

ئەسپ، ولآغ، گا، بەرازو گورگ ناوێرن وەنێو زیيەلّێن بکەن. سەگیش ناچنە نێوی و ئەگەر بە هەلّە وەنێوی کەون، خوێناوی و دارِووشاو لێی وەدەر دەکەون. زیيەلّێن جیّخەوی کەروێشك

و گۆڕهەڵکەنەو چەقەڵی چووکەڵەیە. جاروباریش دەتوانی سووره ڕێویان ببینی کە کلکیان رووتاوەتەوە.

لەمانگەکانی بەهار دا زیپەڵێن کۆگای زەرگەتەو ژەنگەسوورەیە. هێلانەی هەزاران زەرگەتەو ژەنگەسوورەو شەمەترێلکە بە لك و پۆپ و چەقڵەکانی زیپەگەرمێنییەوە نووساون... مێشەنگوینەکانیش کە لە خەلیفەکانیان دێنەدەرو هێرش دەکەن، دەڵێی بە دوای شاژنەکەی خۆیان دا دەفڕن بە هەزاران و بە میلیۆن بەو باڵە ترووسکەدارانەیانەوە بەسەر زیپەڵێن دا بڵاو دەبنەوە.

جاڵجاڵووکەش داوەکەی خۆی بەسەر زیپەڵێنەوە دەتەنێ" و بەیانییان کاتێك خۆر سەر دەردێنێ دەڵێی تۆڕێکی تەنکی سپی بەسەر زیپەڵێن هەڵکشاوە کە لەگەڵ شووبای بەیانی ئەو داوانەی لە چڵە زیپەکەوە بۆ چڵە زیپەکی دیکە رایەڵ کراون، دەکەونە راژان.

بارانێکی زۆر ورد، نم نم دەباری" وەك تۆزێکی ورد و بەحاڵ و باڵ تێی دەگەیشتی. بای نەدەهات و ئاناوارزا لەنێو مژێکی وەك هەڵم دا بوو.

خەریك بوو هەتاو دەکەوت. لە رۆژهەڵات، ڕووناکایییەکی لێڵ جاروبار لە پشت مژەوە خۆی نیشان دەداو ون دەبووەوە. کابرا سەربەرگە گوڵدۆزیکراوەکەی لە خۆیەوە پێچابوو، تفەنگەکەی لەبن چڵەدڕکێك درێژ کردبوو، سەری وێ کردبوو، ئەژنۆی بە زگیەوە نووساندبوون و خۆی کوشم هەڵێنابوو و نووستبوو. دەستەیەك باڵندە کە بە هەراو هەنگامەی خۆیان قیامەتێکیان وەڕێ خستبوو، لە ژوور سەری وی و راست بەسەر لکەکانی زیپەگەرمێنی دا تێبەڕین. کابرا چاوی هەڵێنان و لەسەر یەکی دانانەوە. تاوێك دواتر هەڵستا دانیشت، چاوەکانی هەڵگلۆفین. خەواڵوو بوو. تەماشایەکی چەپ و راستی کرد. لەشی سڕ ببوو و ئەژنۆی شل بوون. راست بووەوە، خۆی خاوکێش کرد. تامی زاری تاڵ بوو. تفی رۆکرد. تفەکەی داوی جاڵجاڵووکەی کون کردو کەوتە سەر لقە چەقڵێك. داهاتەوە، تفەنگەکەی هەڵگرت و لە شانی کرد. خەنجەرێکی دەسك زیوی چەرکەسی بەسەر رانیەوە هەڵواسرابوو کە هەتا سەر ئەژنۆی دەهاتەخوار. لە پەنای خەنجەرەکە دەمانچە ناگانتەکەی لە قەدی بەستبوو. لەسەر کراسە هەوریشمە ڕەنگاوڕەنگ و دەستچنەکەی سێ ریز فیشەکدانی لە خۆی دابوون. دووربینێکی رەشی گەورەی لە ملیدا بوو" ئەوەندە نوێ بوو دەتگوت دەستی لێنەدراوە. پێڵاوەکەشی کە لە چەرمێکی ئەستوورو نەرم دروست کرابوو، نوێ بوو. گۆرەوییەکی خوریی پڕ نەخش و نیگاری بەسەر پانتۆڵە گوشادەکەی هەڵکێشابوو کە دەگەیشتە ئەژنۆی. ئەو پانتۆڵەی لە پێیدا

بوو، تایبەتی دێنشینەکانی کێوپارەی تووڕووس بوو، لە خوری دروست کرابوو و بە توێکڵەگوێز بە ڕەنگێکی کاڵی قاوەیی ڕەنگ کرابوو.

دەنگی کەڵەشێرو حەپەی سەگەل لە سێ لاوە دەهاتە بەرگوێ. کابرا رووی وەرگێڕا بۆ لای جنووب، هیچ نوختەیەکی نەناسی، نەیتوانی شوێنی خۆشی ساغ بکاتەوە. لە جنووب دەنگێکی بەردەوامی کەڵەباب دەهات. لای رۆژئاوا پڕ هەراو هەنگامە بوو و بۆقەکان لە دوێشەوێوە، هێشتا یەك بێن دەیان قڕاند. لە رۆژهەڵاتەوە دەنگێکی دڵگر دەهات و کپ دەبووەوە. لە دووری، لە دەرەوەی زیپەلێن فیکەیەکی بەرز درێژ بووەوە. هەوا گەرم و شەدار بوو و هەتاو کە لە ئاسمان بەقەد منارەیەك هەڵکشابوو لە پشت مژەوە نەدەبینرا، تەنیا رووناکایی‌یەکی لێڵ و وەك هەڵم لە پشتەوەی نم نمەی بارانەوە دەدرەوشایەوە.

کابرا بەرەو رۆژهەڵات وەرێ کەوت. هێزی لەبەر دا نەبوو. ئەژنۆی دوولا دەهاتنەوە. چوار رۆژ بوو بە رێگاوە بوو. هەرچەند لە دوێنێ نیوەڕۆیەوە توێشووی لێبڕابوو، هەستی بە برسیایەتی نەدەکرد. چوار رۆژ پێشتر لە سەرچاوەی ساووران سەربازان گەمارۆیان دابوو. ژمارەیان یەکجار زۆر بوو. گوللە وەك بارانە بە سەری دا دەبارین. بەخۆشی‌یەوە وەختێك گەمارۆیان دا هەم ئێوارە بوو و هەم باران دەباری" و ئەو، لای نیوەشەوێ توانی وەك پشیلە بەنەرمی و بێ هەست و خوست لەو دیوارە کە سەربازەکان بە دەوریان دا کێشابوو تێپەرێ. بەڵام ئیدی کێوپارە بۆ مانەوە نەدەبوو" کێو و دەشت پڕ لە سەرباز بوون. جگە لەوەش، ژمارەیەکی زۆر لە دێنشینان داربەدەست و چەکدار رەگەڵ سەربازەکان کەوتبوون و لە هەر کەلێن و قوژبنێك و لە نێو هەر دەوەنێك دا لە"چەتەکان" دەگەڕان. هەر حەوتوویەك پێشتر بوو کە هەزاران لادێیی وەسەر کێوی کەوتن و "عەلی‌یەزلە"یان گرت کە لە لووتکەی بڵندو قایمی چیادا خۆی حەشار دابوو.

تەنیا یەك رۆژنەی هیواو یەك رێگای رزگاری دەمایەوە" ئەویش گوندی وایوای و لەوێش "وەسمانەزلە" بوو. بەڵام ئەو دوودڵ بوو" لەوانەبوو هەر کە پێی نایە نێو گوندی وایوای خەڵکی گوندی بیدەنە دەستی پیاوەکانی دەوڵەت، لەوانەش بوو وەك برا، بە باوەشی ئاوەڵاوە پێشوازیی لێبکەن. وەسمانەزلە زۆر پیر بوو و لاقێکی لەسەر لێوی قەبری بوو. زۆر لەمێژ بوو لێی بێخەبەر بوو. ئەگەر ئەو مردبێ لە وایوای ناسیاوێکی دیکەی نیە. وەختێك دەهات سەرێکی ئومەتەزەردی داو شەوێکی لەکن مایەوە. بەڵام ئەو لە ترسان زراوی چووبوو. نەکا وەسمانەزلەش بترسێ. بەڵام نا، وەسمانەزلە ساردو گەرمی چێشتبوو" پیرەپیاوێك بوو ئازاو جوامێر بە دڵێکی پاك و منداڵانەوە. بەو حاڵەش، پێش بینی ناکرێ" بنیادەم شیری خاوی خواردوە..لله

به دانیشتن و خەیاڵ پڵاو کردن دەردێك دەرمان ناکرێ. هەرچی دەبێ با ببێ، ناچار دەبوو بچێتە وایوای. ئەگەر رێگا چارەیەکی دیکەشی بووایە، ئەگەر پەنایەکی دیکەشی شك بردبایە، دیسان هەستی دەکرد ئاشقانە بەرەو وایوای دەکێشرێ. زۆر بەوەوە ماندوو بوو، حەزی دەکرد بزانێ هەڵوێستی وەسمانەزلە کە هێندەی لەگەڵ دۆست و یەك گیان بوو، هەروەها هەڵوێستی خەلکی وایوای چۆن دەبێ. بەڵام هەر لەو کاتەدا نەدەکرا چارەنووسی عەلیەیەزلەی بێکەس و کاریشی لەبەرچاو نەبێ" کەسێك کە نەك هەر ئازارێکی بۆ دێهاتیەیەکان نەبوو، بەلکوو بەکەلکیشیان دەهات، ئەو، دۆستی فەقیرو هەژارو دوژمنی دەولەمەندان بوو. کاتێك دێهاتیەیەکان لەسەر لووتکەی کێوی گرتیان، لە حاڵێك دا لێیان دەداو تفیان لەروو دەکوتا، هێنایان و دایانە دەستی فەرماندەرو گوتیان:"جەنابی فەرماندەر، عومری هەموو دوژمنانت وا کورت بێ!" پاشانیش سێ شەوو رۆژان جێژنیان کرد. دەیهێنایە بەرچاوی خۆی، هەر کە پێی نایە نێو ئاوایی، وەسمانەزلە دەست و لاقی دەبەستێ و دەیداتە دەستی عەلیسەفابەگ. بەراستی ئەو عەلیسەفابەگە چ جۆرە بنیادەمێکە؟

دوێ شەو کە وەنێو زیپەلێن کەوتبوو، درك وداڵ لاق و لەتەرییان هەلدڕ هەلدڕ کردبوو. جێبرینەکانی دەبرژانەوە. باران وردە وردە، بەڵام بەردەوام دەباری. زەرگەتە لەنێو هێلانە خووساوەکانیان دا خۆیان مات دابوو و لەسەریەك کەلەکە ببوون.

چەقڵەکان پڕو ئەستوور بوون، بۆیە نەیدەتوانی توند بڕوا، هەتا نیزیك نیوەرۆیە رۆیشت و گەیشتە بەستێنێك. ئەم بەستێنە سەرانسەری زیپەلێنەکەی داگیر دەکرد. لە تەنیشت تەپۆلکە گلێك کە چوار لافاوگە یەکیان دەگرتەوە، سێ داری ئەستووری دیتن. قەدی داری نێوەڕاستێ گەندەڵ ببوو" ببووە قولکەیەك کە جێی دوو کەسانی تێدا دەبووەوە. چووە نێو کلۆرەدارەکە. دانیشت و پاڵی دایەوە. باران نەیتوانیبوو لە چۆغەکەی رەت بێ و لەشی تەڕ بکا. تەنیا لاق و لەتەری تەڕ ببوون. چۆغە باش تەنراوە گوڵدۆزیکراوەکەی دەگەیشتە ئەژنۆی. تفەنگەکەی لە شانی دەرهێناو هەڵی پەسارد. دووربین و خەنجەرو دەمانچەکەی لە پەنا تفەنگەکەی دانان و چاوی لەسەر یەك دانان. زۆری برسی بوو، بەڵام گوێی نەدایە. وەختێك نومەتەزەرد نیشانەکانی گوندی "وایوای"ی دابوویە گوتبووی:"ئەگەر لە زیپەلێنەکە وەسەر کەوتی، دەگەیە تەپۆلکە گلێك. لە کن تەپۆلکەکە سێ داران دەبینی. لەوێ ڕا تا وایوای دوو سەعاتەرێیە. دەبێ بەشەو بچیە نێو دێ. لەنێوەڕاستی گوندی دارێکی بلیند هەیە. لەبن دارەکە تابلۆیەکی زۆر سپیی مەڕمەڕ دەبینی کە لە تاریکاییش دا دەترووسکێتەوە" وەك گڕی

ئاگر تیشکی لێدەبێتەوە. ئەگەر گەیشتیە دارەکە پشتی وێ دەدەی، دەسووڕێی بۆ لای جنووب. پاشان وەڕێ دەکەوی. ئەگەر دنیا هێندە تاریك بێ چاو چاوی نەبینێ، دیسان برۆ. دەگەیە دەرگایەك. وەختێك گەیشتیە وێ، بانگ کە "وەسمانەزلە!"... دەسبەجێ دەرگا دەکرێتەوە." لە دڵی خۆی دا بیری کردەوە:"ئەدی ئەگەر نەکرایەوە؟" هەروا بە دڵی داهات:"ئەی ئەگەر دەرگا کرایەوەو هەموو پیاوەکانی ئاوەدانی لەو ماڵە بوون؟."

لە کلۆرە دارەکە نیوە بە خەو و نیوە بە بێداری رۆژی ئاوا کرد. کاتێك لە کلۆرەکە هاتەدەر، هەوا نەختێك فێنك ببوو. ئیدی باران نەدەباری. پەڵە پەڵە رووناکایی دیار بوو و شەوێکی مژاوی بەسەر زێیەڵێنەکەدا دەکشا. گوڵی زێیەگەرمێنی بۆنێکی شیرن و سەرخۆشکەری لێهەڵ دەستا.

تفەنگەکەی و خەنجەرەکەی و دووربینەکەی و هەرچی هەیبوو و نەیبوو لەبن سەربەرگەکەی دا شاردنیەوە" بەجۆرێك ئەگەر کەسێك تەماشاشی کردبایە هەستی بە هیچ نەدەکرد" تەنیا سەربەرگەکەی کەمێك ناقۆڵا دیار بوو. لە چوکووراواش کەس سەربەرگی لەبەر نەدەکرد، سەربەرگ لیباسی خەڵکی کێوپارەی بوو. پاشان کەس بەوەشی نەدەزانی، چونکە بە نیاز بوو بە شەو بچێ بۆ نێو دێ. رووبەڕووی، رووناکایی‌یەك دیار بوو. لاقە زۆر ماندووەکانی بەزەحمەت بەسەر زەوی دا رادەکێشان. باران نم نم دەباری، هەرکە بۆنی پەینی هاتە بەر لووتی، وشیار بووەوە. زێیەڵێنەکەی بەجێ هێشتبوو و گەیشتبووە یەکەم ماڵەکانی ئاوایی. سەگێك بە دەنگێکی ئەستوورەوە، بە هەژاوی وەڕی. دنیا زۆر تاریك بوو. کابرا بیری لە هیچ نەدەکردەوە" بەڵام لەبەر هەرچی بوو دڵی خێرا خێرا لێی دەدا. هەرکە پێی لەنێو ئاوەدانی نا، پیاوێکی دی کە بەرەوڕووی دەهات. نیگەران نەبوو. بۆ لای چوو. سڵاوی لێکردو تێپەڕی. ئەویش سڵاوەکەی ئەستاندەوە.

کابرا کە دەنگەکەی نەناسیبوو، گوتی:"ئۆغر بێ رێبوار! بەو شەوەی لە کوێ ڕا دێی و بۆ کوێ دەچی؟" وەڵامی دایەوە:"لە چیای ڕا دێم و دەچمە نارلی قشلا."

کابرا لەسەرەخۆ و بێ وەشك کەوتن گوتی:"بەخێرچی، خوات لەگەڵ!" ئەویش لە حاڵێك دا دەیگوت:"بژی"، بە خۆی نەبوو لەرزی.

لەنێوەڕاستی دێی رێگاکە دەبوو بە دوو" لە جادەی لای راست دارێکی گەورە رەش دەچوو. گەیشتە بن دارەکەو راوەستا. کەمێك ئەولاتر تابلۆ مەرمەرە سپی‌یەکە دەترووسکایەوە. تاریکیی تەواو بوو و جگە لە ماڵێك چرای هەموو ماڵەکان کووژابووەوە. بێدەنگی بوو"

بێدەنگییەکی مەرگ هێنەر... پاڵی وەدارەکە دا. ئەوەندە ماندوو بوو چەند دەقیقە هەروا بێ جووڵە لە جێی خۆی رەق بوو. دڵی بە توندی لێی دەدا. جنووب لەکام لا بوو؟ کامە لا شیمال بوو؟ نەیدەتوانی رۆژهەلات و رۆژئاوا لێك بکاتەوە. سەری دەگێژەوە دەهات. باران دەباری و لك و پۆپی دارە بەرزەکە لە ژوور سەری دەیان نەراند. قەدی راست کردەوە. لەدڵی خۆی دا گوتی:"هەرچی دەبێ بلا ببێ" و وەرێ کەوت... کەمێك دواتر لووت و بزووت لە پەرژینی ماڵێك هەڵئەنگوت. بە کۆمە کۆم دەرگاکەی دۆزیەوە:

"مام وەسمان، مام وەسمان، هۆی مام وەسمان!!!"

دەنگی ئەستووری پیاوێك بە خەواڵوویی وەلامی دایەوە:

"کێیە؟"

"میوانی خوا."

دەسبەجێ دەرگا کرایەوەو پیاوێك بە توێی کراس و دەرپێیان پەیدا بوو:"فەرموو برام، فەرموو ژووری با چرایەکە هەڵکەم."

"ئەمن لە ماڵی مام وەسمان دەگەرێم. ئێرە ماڵی وەسمانەزلە نیە؟"

"کاکە راوەستە جلەکانم لەبەرکەم و بت بەمە وێ، فەرموو بۆ ژووری. باران دەبارێ؟"

"وردە وردە دەبارێ."

کابرا دەسبەجێ هات، وەپێش کەوت و بێئەوەی قسەیەك پێکەوە بکەن گەیشتنە ماڵی وەسمانەزلە:

"مام وەسمان، مام وەسمان میوانت هاتوە، لەگەڵ خۆم هێناوە."

دەرگا دەسبەجێ کرایەوە. دەنگی ژنێك گوتی:"میوانی خوای بەخێر بێ، خێرو بەرەکەتی هێنا." و لێی زیاد کرد:"ئەتۆش وەرە ژووری "وەلی" هێشتا زوویە، وەسمانەزلە خەریکە کورتانی پینە دەکا."

کابرا گوتی:

"ئەمن خەوم دێ." و رۆیشت.

ژنەکە لە دوایەوە گوتی:"زۆر سوپاس وەلی"، و میوانەکەی بانگ کردە ژووری:"فەرموو کاکە!"

دەنگی زبرو ئەستووری وەسمانەزلە لەبەر ئاگردان بەرز بووەوە:"کێ هاتوە؟."

ژنەکە گوتی:"نایناسم، میوانی خوایە، سەربەرگی لەبەر دایە، وادیارە خەڵکی کێوپارە بێ."

وەسمانەزلە پرسی:"چیانشینە؟ کەوایە چیانشینە، ها؟ باشە، بەخێر بێ، بەرەکەتی هێنا، وەرە بەر ئاوری، وەرە، وەرە ئێرە دانیشە. باران دەبارێ؟"

"نم نم دەبارێ."

وەسمانەزلە کورتانەکەی لەولا دانابوو و لە تەپڵی سەری هەتا بەری پێی تەماشای میوانەکەی دەکرد کە بە تەڕو بڕی بە پێوە ڕاوەستابوو:

"برالە بۆچی هەروا لەو نێوەڕاستە ڕەق ڕاوەستاوی؟ دانیشە ئیدی، ئەدی بابە. یاڵڵا دانیشە ئیدی، چت بووە؟"

ئەو نەی دەتوانی دانیشێ. ئەگەر دانیشتبایە چەکەکەی لەبن سەربەرگەکەیەوە دەردەکەوت. وەسمانەزلە لە جێی خۆی هەستا، دەستی لەسەر شانی میوانەکە دانا، و بە چۆکەوە دانیشت:"دە دانیشە کوڕم!"

دیسان دانەنیشت.

"قەمەر دۆشەکێك بۆ میوانە بەرێزەکەمان بێنە ڕایخە."

ژنەکە لەوسەری ماڵێ وەڵامی دایەوە:"ئەوە دێنم."

"کوڕم زۆر تەڕ بووی. لەکوێ ڕا هاتووی و بۆ کوێ دەچی؟"

دەنگێکی خۆشحاڵانە گوتی:

"لە کێوپارەی را هاتووم، دەمەوێ بچمە لای وەسمانەزلە."

"ئاوا، دەچیە لای وەسمانەزلە؟"

میوانەکەش دووپاتی کردەوە:"ئاوا...!"

دایە قەمەر دۆشەکەکەی هێنا لە لای چەپی ئاگردانەکە ڕایخست:

"فەرموو دانیشە کاکە!"

وەسمانەزلە نەڕاندی:"دانیشە ئیدی کوڕم، ئەو عەبایەت دانێ و دانیشە. لە ژیانم دا ئەوە یەکەم جارە ببینم میوان دانەنیشێ."

دوودڵ بوو. بە هیچ جۆر ڕازی نەبوو سەربەرگەکەی دانێ.

دایە قەمەر بە گوێی وەسمانەزلەی دا چپاند:"ئەم کوڕە زۆر تێك چووە!" وەسمانەزلە بە دڵسۆزییەوە گوتی:"ئاخر بۆچی؟" پاشان دڵسۆزانە پرسی:"میوان! لە شتێك ناڕەحەت بووی؟"

میوان بە پێکەنین و بە دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستی گوتی:

"نام ناسیەوە مام وەسمان؟"

وەسمانەزلە لێی نیزیك بووەوە، دەستی لەسەر شانی میوانەکە دانا، تەماشای سەروچاوی کردو گوتی:"ئای میوان! ئەتۆ وەك جگەگۆشەکەی من دەچی، وەك شەهێنی من دەچی. ئەتۆ حەمەدۆکی ئەریَ؟ جگەرگۆشەکەم! شەهێنەکەم!" و باوەشی بە حەمەدۆك دا کرد. لە خۆشییان تەواوی لەشی دەلەرزی:"ئەوە ئەتۆی؟ میوانی خوا ئەتۆ بووی؟ شەهێنەکەم! ئەوە ئەتۆی؟"

حەمەد لە حالێك دا نەبوو کە بتوانیَ یەك قسەش بکا" لە جێی خۆی رەق ببوو و لە ئاسمانی خەونێکی دلگر دا هەڵدەفڕی.

"قەمەر! خوا بت گریَ وەرە! وەرە بزانە کیَ هاتوە. دەوەرە قەمەر وەرە!"

پیرێژن لە دوورەوە هاواری کرد:"دەڵێی چی وەسمان؟ چ باسە؟"

وەسمانەزلە گوتی:"وەرە وەرە. وەرە وەرە.وەرە بزانە کیَ هاتوە. بزانە کیَ هاتوە!؟"

قەمەر گوتی:"کیَهاتوە وەسمان؟"

وەسمانەزلە هاواری کرد:"شەهێنەکەم هاتوە، شەهێنەکەم، شەهێنەکەم."

قەمەر گوتی:"مەنەڕێنە شێتی ماخولیا، مەنەڕێنە! کوڕەکە قاچاغە. حەمەدۆك ئەتۆی کوڕی خۆم؟"

حەمەد گوتی:"ئەمنم، دایە!"

"زۆر بەخێر بێی کوڕم! ئەگەر ئەم شێتە لەکۆڵت بووەوە، دانیشە! خوا دەزانیَ لە کامە کێوی دوور دوورەوە هاتووی!"

وەسمانەزلە یەك بین دەیگوت:"بیَدەنگ بە کچیَ! بەری نادەم، بەری نادەم. هەتا تێر تێر بۆن بە شەهێنمەوە نەکەم بەری نادەم" و بۆنی بەمل و شان و پشتیەوە دەکرد.

دایە قەمەر گوتی:"کوڕەکە ماندوویە، کوڕەکە ماندوویە زۆری کوێرەوەری چاشتوون." و باسکی وی گرت و لە حەمەدی جیا کردەوە.

وەسمانەزلە ماوەیەك راماو و حەیران راوەستاو تەماشای حەمەدۆکی کردو دایە قەمەریش هەوڵی دەدا سەربەرگەکەی حەمەدۆك لەبەری داکەنیَ کە حەمەد وەهۆش خۆی هاتەوەو دەسبەجیَ سەربەرگەکەی داکەند. تفەنگەکەی، دەمانچەکەی، دووربینەکەی و نێزەکەی لە خۆی کردنەوەو بە دیواریەوە هەڵپەساردن و بۆخۆشی دەمەساتێك دواتر لەسەر دۆشەکێك کە دایەقەمەر رایخستبوو، دانیشت.

وەسمانەزلەش چوو بەرامبەری دانیشت. لە حەمەدەوە راماو چاوە سەرسوڕمان لیَدراوەکانی لە روخساری وەرنەدەگێڕا.

حەمەد پێدەکەنی. دایە قەمەر قسەی دەکردو وەسمانەزلەش هەروا بێدەنگ و بێجووڵە تەماشای حەمەدی دەکرد.

"ئەرێ ئەوەی دەیبینم راستە؟ ئەوەی دەیبیسم راستە؟ هەر بە راست ئەوە ئەتۆی شەهێنەکەم؟ بەڵێ؟ تۆم دووبارە بەم چاوانەم دیتەوە؟... ئەرێ دیمیەوە، ئەرێ دیمیەوە... ئێ... یاخوا بەخێر بێی!"

وەسمانەزلە خەریك بوو بەرە بەرە دەهاتەوە سەرخۆی:

"باشە ئاوا؟ قیسمەت و نسیب ئەوە بوو کە دیسان تۆ ببینمەوە. ئای وەسمانەزلە ئەتۆ بنیادەمێکی خۆش شانسی. کوڕە، کوڕە! دایکت ئەتۆی لە شەوی قەدردا بووە. کوڕە وەسمانەزلە ئەتۆ بۆ قەبریش بە دایرەو دمبەگەوە دەڕۆی..."

هەستا، دەستی بەسەر سەری حەمەددا هێنا. راوەستا، تەماشای کردو بە دەنگی بەرز گوتی:"بەخوا تۆ راست حەمەدۆکی. ئەتۆ شەهێنی خۆمی!"

دایە قەمەر لە حاڵێك دا دەیگوت:"خۆت شێت مەکە، مەیکە ماخولیابازاڕی" بە رقەوە لێی زیاد کرد:"شێتی پەتیارە! کوڕەکە قاچاغە، جارێکی دیکە ناوی حەمەدۆکت بە دەم دا نەیە، مەنەڕێنە!"

وەسمانەزلە هاواری کرد:"ئاخ، ئاخ، ئاخ!"

قەمەرو حەمەد هەردووك تێك رابوون.

"کوڕەکە خەریکە لەبرسان دەمرێ. شەهێنەکەم خەریکە لەبرسان دەمرێ. زووبە قەمەر زووبە!"

دایەقەمەر گوتی:"خۆ زراوت بردم" ئێستا پلاوێ دەم دەکەم."

حەمەد بە پێکەنینەوە گوتی:"مەترسە مام وەسمان. لەبرسان نامرم."

"زووبە! شەهێنەکەم خەریکە لەبرسان دەمرێ. لە پێش دا نەختێك پەنیر بێنە، ماستی بێنە، هەنگوینیشمان هەیە. وەنا؟ رۆنەکەرەشمان هەیە؟ رۆنی تازەیە، نا؟"

حەمەدۆك گوتی:"دایە قەمەر بەو نیوەشەوە پلاو پێویست نیە" شتی حازر هەرچی هەبێ باشە..."

"پێم گوتی شەهێنەکەم خەریکە لە برسان دەمرێ، نا؟"

پاشان دەستی بۆلای مەنجەڵێك کە لەسەر ئاورگەکە بوو راداشت و گوتی:"دۆینەکەی گەرم بکەوە."

دایە قەمەر دەسبەجێ سەراورەی وەسەر ناو ئاوری لەبن مەنجەڵەکەدا کردەوە.

"ئەم پیاوە هۆش و گۆشی لـێبڕیوم، گێژی کردووم."

وەسمانەزلە گوتی:"شەهێنەکەم، نەختێك راوەستە، ئێستا گەرم دەبێتەوە، دۆینەیەکی خۆشە."

ئاگرەکەی خۆشتر کرد. چەند بڕ داری خستنە سەرو گڕیان لـێ بەرز بووەوە.

دایە قەمەر بە پاڕانەوە گوتی:"دەبەرت مرم وەسمان نەختێك ئارام بە... کەمێك وەرەوە سەرخۆت!" و سفرەکەی لە پێش حەمەدی راخست.

تاوێك دواتر چێشتەکە گەرم بووەوە. دایە قەمەر دۆینەکەی لە قاپێکی گەورە کردو لە پێش حەمەدی دانا. هەڵمێکی بڵندو هێدی لە چێشتەکە هەڵدەستا. بۆنێکی خۆشیشی لـێدەهات. حەمەد دەسبەجێ و بێئەوەی قسەیەك بکا، خێرا خێرا چێشتەکەی خواردو تەواوی کرد. دایە قەمەر ماست و هەنگوینیشی لەسەر سفرەکە دانا. حەمەد خێرا خێرا ئەویشی خەلاس کرد.

دایە قەمەر هەرچی خواردەمەنیی لە ماڵێ دا هەبوو، تاق تاق و جووت جووت دەیهێنان و لەسەر سفرەی دادەنان. رۆنەکەرە، شەکر، پەنیر، کاکڵەگوێز، سێوو قەیسیو تووی وشك...

سەرەنجام حەمەد گوتی:"خوایە شوکور، خوایە شوکور، خوا بەرەکەتی سفرەی ئیبراهیمی خەلیل باوێتە سفرەتان!"

دایە قەمەر هەر دەیگوت:"بخۆ کوڕم، بخۆ کوڕە، لە ڕێی دوورەوە هاتووی، لە چیا بەرزەکانەوە هاتووی..."

حەمەد بە پێکەنینەوە دەیگوت:"خوا بەزیادی کا دایە، خوا بەزیادی کا، ئیدی خەریکە دەتەقم. چاوت لـێیە زگم بووەتە دەهۆڵ."

لە نەکاو شەپۆلێکی شادی حەمەدی داگرت. بەو پێشوازییە گەرمەی لە ماڵی وەسمانەزلە لێی کرا هەموو کوێرەوەرییەکانی لەبیر چوونەوە. هەستێکی منداڵانەی بۆ پەیدا بوو:

"مام وەسمان لە ماڵێ تۆ وەك باڵندەیەکی سووك باڵم لـێهات."

دایە قەمەر سفرەکەی کۆ کردەوەو قاوەجۆشە تورکمەنییەکەی کە زۆر لەمێژ بوو دەسکی شکابوو لەسەر ئاگر داناو پرسی:"رۆڵەگیان قاوەکەت چۆن بێ؟"

حەمەد سەری لـێشێوا. هەتا ئەو رۆژە زۆر کەم قاوەی خواردبووەوە. بەخۆدا شکایەوەو سوور هەڵگەڕا. پاشان دەستی بۆ هەوا بەرز کردەوەو گوتی:"هەر جۆرێك بێ."

وەسمانەزلە گوتی:"وەك هی من بێ، هەردووکیان پێکەوە ساز بکە." پاشان بێئەوەی قسەیەك پێکەوە بکەن، چاوەڕوانی ساز بوونی قاوەکە مان. حەمەد لە خۆشییان چاوی پێ

داپچڕابوون و پێدەکەنی. وەختێك دایە قەمەر قاوەکەی لە فنجان دەکرد، قاوەکە بۆنێکی خۆشی لێ‌هەڵدەستا. حەمەد بۆنی قاوەکەی زۆر پێ‌خۆش بوو. کاتێك دەسکی فنجانەکەی گرت، دەستی لەرزی و کەمێك قاوە رژایە نێو ژێرپیالەکە. حەمەد تەماشای وەسمانەزلەی کرد تا بزانێ ئەو چۆن قاوەکەی هەڵدەگرێ و چۆنی دەخواتەوە. دەستی ئەویش لەرزی، بەڵام قاوەکە نەرژایە نێو ژێرپیالەکە. ئەوەی لێ‌دەرچێ، دەستی وەسمانەزلە زیاتر دەلەرزین" دەتگوت باڵ لێك دەدەن. وەسمان بە دەستە لەرزۆکەکانی، یەك تەکان فنجانەکەی گەیاندە لێوانی و یەکەم قومی قاوەکەی بە دەنگ و هەرایەکی زۆرەوە هەڵقووڕاند. حەمەدیش هەر وای کرد، بەڵام هەم زاری سووتاو هەم نەی‌توانی وەك وەسمانی هەڵی‌لووشێ. قاوەکە تامێکی تاڵی سەیری هەبوو. پاش ئەوەی کەمێك سارد بووەوە، وەك وەسمانەزلە وردە وردە خواردیەوە. لەو ساتە بە دواوە، هەرگیز لە ژیانی‌دا، قاوەیەکی وا خۆشی نەخواردەوەو لەگەڵ خواردنەوەی هەر قاوەیەك، قاوەی دایەقەمەری وەبیر دەهاتەوە. هیچ قاوەیەك هەرگیز ئەو تامە بێ‌وێنەیەو ئەو بۆنە بێ‌وێنەیەی نەبوو. حەمەد لە سەرانسەری ژیانی خۆی دا تامی ئەو قاوەیەی هەر لە بنی ددانی‌دا بوو و لەگەڵ خواردنی هەر قاوەیەك، ئارەزووی قاوەیەکی وای دەکردو هەموو قاوەیەکی بۆیە دەخواردەوە کە بەڵکوو ئەو تامەی لێ‌بکاتەوە.

وەسمانەزلە پاش ئەوەی قاوەکەی تەواو کردو فنجانەکەی لە تەنیشت ئاورگەکە دانا، گوتی:"دەرێ ساردە؟ سەرمامە."

دایە قەمەر گوتی:"وردە وردە باران دەبارێ."

وەسمانەزلە گوتی:"باش بوو هاتی کوڕم. لە خەراپترین رۆژەکانی ژیانمان دا فریامان کەوتی. لەدەست ئەم عەلی‌سەفابەگە رۆژگارمان لێ‌تاڵ بووە. دیارە بە نیاز نیە دەست لەم دێیە هەڵگرێ. رۆڵە، بۆم تەحەمول ناکرێ. حەمەد، شەهێنەکەم، کوڕی خۆم، بەڕاستی غیرەتم قبووڵ ناکا. بەلای ناخێرم، دە کوڕم گەورە کردوون، بەڵام چی؟ دە کەروێشکی سڵ و ترسەنۆك! بۆخۆشم زۆر پیرم. دێهاتی‌یەکانیش لە عەلی‌سەفابەگ دەترسن، ترسەنۆکی بەڵایەکی خەراپە" هەرچی ترسەنۆکە، خوا بی‌بڕێ!"

گۆلمەیەك ریشی سپی و درێژ لەسەر چەنەگەی دەلەرزی. روخساری کە چرچ و لۆچی زۆر قووڵی تێ‌کەوتبوون، لە بەرامبەر گڕی ئاگردا وەك مس سوور دەچوو و لە خەم و خەفەت دا نوقم ببوو. چاوە شینە چووکەڵەکانی کە لەژێر برۆ سپی‌و پڕپشتەکانی دا شاررابوونەوە، لە پێش دا بریسکەیەکیان دەداو پاشان لەنێو گنج و لۆنجی دەوروبەریان دا ون دەبوون. لە هەموو ئاکارو

کرداری وەسمانەزلەدا حاڵەتێکی منداڵانە هەبوو" لە قاقای پێکەنینی دا وەختێك شتێکی پێ سەیر دەبوو، لە روانینی سەرسوڕماوانەی دا وەختێك برۆکانی هەڵدەتەکاندن، لە ئەوینی قووڵی دەرهەق بە ئینسان و گیانداران و جرِوجانەوەرو پێرِۆ و باڵندەدا، لە تەواوی هەستان و دانیشتنی و لە هەموو هەڵس و کەوتی دا حاڵەتێکی منداڵانە هەبوو. هەر بۆیە بوو دێهاتی‌یەکان چ لە کاتی لاوێتی داو چ ئەو کاتە کە بە ساڵ دا چووبوو، پێیان دەگوت وەسمان منداڵ! کەس نازانێ چۆن "منداڵ" بوو بە زلە". وەسمانەزلە خۆشی نەیزانی ئەو رووداوە چۆن پێش هات" هیچ کەس نەیزانی، لەنێو ئاوایی کەس لە بیری نەمابوو کە رۆژێك بە وەسمانەزلەیان گوتوە وەسمان منداڵ، بێجگە لە یەك کەس، ئەویش دایە قەمەر بوو کە وەختێك رقی هەڵدەستا هاواری دەکرد:"وەسمان منداڵ!"

دایە قەمەر بە رق هەستاوی لە وەسمانی نیزیك بووەوەو گوتی:"وەسمان منداڵ، هۆی وەسمان منداڵ! ئەتۆ چ بەم لاوە دەڵێی، بۆ نایەڵی پێلاوەکەی دانێ، هەناسەیەك بداو تۆزی رێگا لەخۆی بتەکێنێ؟ وەسمان منداڵ ئەتۆ عومرت ببێتە سەدساڵیش ئاقڵ نابی! کورِەکە خۆی بە ئاو و ئاوران دا داوەو هاتوەتە ئێرە، بە هەزار زەحمەت گیانی خۆی نەجات داوە. ئەتۆش یەك بین... بروانە کورِەکەی! چما نابینی بەستەزمانە تواوەتەوە. ئەمە باڵندەیەکی بریندارە کە هاتوە لەنێو درِك و داڵ دا خۆی شاردوەتەوە" لەوانەیە هەر ئێستا هەزار سەربازو هەزار ئاغای بەدواوە بن. ئێستاش کە ئێستایە ناوی حەمەدۆك ئاغاکان زراوتۆقێن دەکا. پێت وایە کەس فکر ناکاتەوە کە کورِەکە لە چیای رِا هاتوەتە چوکووراواو کەسیش ناتوانێ بزانێ کە وەختێك هاتە چوکووراوا راستەرِێ دێتە ماڵی تۆ؟ ئەتۆش رێگا نادەی بەستەزمانە پشوویەك بدا. هەر دەڵێی، حاڵ و وەزعمان ، رۆژگارمان... با شتێکت پێ بڵێم وەسمان منداڵ! ئەمن تۆ باش دەناسم، ئافەریم! ئەتۆ بەم ئەقڵەتەوە حەمەدۆکی دەدەیە دەستی ئاغاکان. ئاغاکانیش حەمەدۆکی دەبەن، دەیدەنە دەستی حکوومەت و ئەوانیش لەداری دەدەن. لە پاشانیش ئەتۆ وەسمان منداڵ هەر بچووە بن دارەکە بگری و لەخۆ بدە..."

وەسمانەزلە دەرفەتێکی بۆ قسەکردن دەست کەوت و گوتی:"قسەی تۆیە قەمەر، قسەی تۆیە، بێدەنگ بە کچێ، بێدەنگ بە!"

"کارەکانت هیچیان راست نین" دێیەکەت بەسەردا کاول بێ، عەلی‌سەفابەگیش خوا بیبڕێ. نە رێو شوێنی پیاوەتی ماوە، نە ئینسانەتی... نایەڵی کورِەکە پشوو بدا... ئێوەی ترسەنۆك، هەقی خۆتانە ئەگەر عەلی‌سەفابەگ بی‌هەوێ دەربەدەرتان بکا."

وەسمانەزلە بە دەنگێکی بەرز نەڕاندی:"وست بە قەمەر، وست بە! لـێ‌وەبڕە پیرێژن!"

حەمەد بە ئیشتیاو بە ئۆگرییەوە تەماشای ئەو ژن و مێردە پیرەی دەکرد کە پێکەوە دەمەقاڵێیان بوو.

"بێ‌دەنگ بە پیرێژن! وست بە! حەمەد، هەم کوڕمانە هەم شەهێنمانە. ئاخ قەمەر! ئاخر باشتر نیە حەمەد وەزعی دێیەکەمان بزانێ؟"

دایەقەمەر کە نەختێك هێدی ببووەوە گوتی:"بۆچی، بەڵام ئێستا کە وایە باسی زەینەڵی بۆ بکە. گەورەترین بەڵای گوندەکەمان زەینەڵە، زەینەڵە کەچەڵ."

وەسمانەزلە بە لێوی داچۆڕاو و خەفەتبارەوە گوتی:"شەهێنەکەم، وەزع زۆر خەراپە! ئەتۆ ئەم رۆژانە لە کێوی ناحەوێیەوە. عەشیرەتە چیانشینەکان خەلکێکی سەیرن! ئەم رۆژانەش بە جارێك هار بوون! نە حەمەدۆکی دەناسن، نە "گزیك دووران". تەنانەت بابی خۆشیان راو دەنێن و دەی‌دەنە دەستی حکوومەت. ئەگەر پێ لە ئاناوارزا بنێی، بە دوو رۆژان دەگیر دەکەوی. جارێ دەبێ لێرە لەلای ئێمە وەمێنی، جگە لەم پیرێژنە، نابێ هیچ کەس بزانێ ئەتۆ لێرەی؟ تەنانەت کوڕەکانیشم. خۆ جگە لە وەلی کەسی دیکە تۆی نەدی کە هاتیە ئێرە؟"

"کەس نەی‌دیم."

"ئەگەر وابێ باشە. تەنانەت کوڕەکانی ئەم پیرێژنەش نابێ پێ‌بزانن. یەك ئەتۆ دەزانی و یەك ئەمن" و یەك ئەم پیرێژنەو یەکیش خوای گەورە..."

دایە قەمەر سەری راوەشاند. زێڕەکانی سەر نێوچاوانی کە لەژێر چارشێوەکەی دەرکەوتبوون، زرینگەیان لـێ‌هات:

"ئەتۆ وەسمان منداڵ! ئەمن تۆ دەناسم. سبەینێ بەیانی دەچی نێو دێی پڕ دەکەی. ئائائاخ. ئەمن تۆ باش دەناسم."

وەسمانەزلە بە ڕقەوە لە جێی خۆی راست بۆوەو گوتی:"سەرم مەخە سەر پیرێژنی بێ‌ئەقڵ، سەرم مەخەسەر. چما ئەمن گێژم، چما ئەمن شێتم، بچم بە یەکێك بڵێم، ئەویش بە یەکی دیکە بڵێ و ئەویش بە یەکی دیکە هەتا بە گوێی زەینەڵی دەگاتەوە. زەینەڵیش خۆ کەسی لە دەست دەرباز نابێ. زەینەڵیش بچێ بە ئاغا سەگبابەکەی بڵێ کە حەمەد لەماڵێ وەسمانەزلەیە لە گوندی وایوای و دوایەش حەمەدی بگرن و لە داری بدەن. وەختێك حەمەدیش مرد، ئاغاکان لەنێو دێ دا، رمبازێن بکەن" دێهاتیەکان دەربەدەر بن و دێهاتەکەش وێران؟..."

"وەسمان منداڵ ئەمن مردوو و ئەتۆ زیندوو" ئەگەر وا نەبوو؟"

"حەمەد، شەهێنەکەم! بەخێری خۆت بەو ژنە بڵێ بەو نیوەشەوە دەهریم نەکا، مەیەڵە هێندەم چەقە لەگەڵ بکا!"

دایەقەمەر وەختێك دیتی وەسمانەزلە زۆر تووڕە بووە، بێدەنگ بوو. بەبێدەنگ بوونی وی وەسمانەزلەش لێی بڕیەوە."

دایە قەمەر گوتی:"ئێستا وەرە جێگایەك بۆ ئەم کوڕە بدۆزینەوە."

"ئەرێ، جێیەکی بۆ پەیدا بکەین کەس نەیبینێ، جێگایەك کە شەهێنەکەم لەوێ بخواو بنوێ و قەڵەو بێ. بەژنیشی بەرزتر. پێمەکەنە قەمەر، راستە ئەو حەمەدۆکە، بەڵام هێشتا منداڵە."

دایەقەمەر هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو گوتی:"خوا بیپارێزێ!"

دەیەویست بڵێ:"بۆ دایك و بابی..." پاشان وەبیری هاتەوە کە دایك و بابی مردوون، گوتی:"خوا ئەوی بە میللەت و دەوڵەت بێڵێ!" بەڵام ئەم قسەیەی خۆی پێ خۆش نەبوو" دەوڵەت و ئاغاکان لەگەڵی دوژمن بوون" ئەگەر وەگیریان کەوتبا خوێنیان لە جیاتی ئاو دەخواردەوە. سەرەنجام گوتی:"...بەو فەقیرو هەژارانە کە خۆشییان لە ژیانی خۆیان نەدیوەو زوڵمیان لـێدەکرێ."

وەسمانەزلە چرا فتیلەیەکی کە لە پشتەوەی ئاگردان لەسەر پێچراکە دانرابوو دەست دایەو چووە سووچێکی دیکەی ماڵەکەو بانگی کرد:

"وەرە حەمەد، وەرە شەهێنەکەم! وەرە ئێرە جێگایەکت بۆ ساز کەین. پاشان تا بەیانی دادەنیشین و قسان دەکەین."

هەم حەمەدو هەم دایەقەمەر چوونە لای و رووبەڕووی دۆڵابییەکی گەورە کە نوێنیان لـێ دادەنان راوەستان. جێنوێنەکە ئەم سەرو ئەوسەری ژوورەکە درێژ بوو. دۆڵابییەکی گەورەی پڕ نەخش و نیگار بوو کە بە دووکەڵی داران رەش هەڵگەڕابوو. بەرزاییەکەی دەگەیشتە هۆڵەی ژوورەکە. وەسمانەزلە دەرگای گەورەی جێنوێنەکەی کردەوە، دۆڵابییەکە تازە نیوەی پڕ بوو لە جەواڵ کە بە ریز لەسەر یەك دانرابوون. لەسەر جەواڵەکانەوە تەختەیەکی تەنکیان راکێشابوو کە سەرەوەکەی پڕ بوو لە لێفەی تووکە مریشك.

وەسمانەزلە گوتی:"حەمەد، وەرە، ئەمەش ماڵی تۆ! بەڵام لەبارەی ماڵەکەی دیکەتەوە... ئەم پیرێژنە نایەڵێ ئاگام لە خۆم بێ... زەوییەکەشت... دێهاتییەکان زەوییان بۆ کڕیبووی... راوەستە جارێ جێگاکە ساز کەین، دوایە قسان دەکەین. پیرێژن

دووباره دەیکاتە هەرا! شەهێنەکەم! دەبێ ئەم جەوالانە بێنینە دەرێ. کچێ وەرە ئەم چرایە بگرە!" چرایەکەی بۆ لای دایەقەمەر کە راوەستابوو تەماشای دەکردن، راداشت و ئەویش بە پەلە لێی وەرگرت.

پێنج جەوالی پڕ لە گەنمیان لە جێنوێنەکە هێنانەدەرێ و بە دیواریان هەڵپەساردن.

دایەقەمەر گوتی:"ئێوە ئیدی راوەستن" ئێستا نۆرەی منە. حەمەد گیان، ئەو دۆشەکە بێنە خوارێ! دەبووری ها، ئەمن تاقەتم پێی ناشکێ!"

وەسمانەزلە دەسبەجێ گوتی:"پیرە ئیدی!"

قەمەر گوتی:"چ بکەم رۆڵە، پیر بووم! ئەتۆ دۆشەکەکەی بێنە خوار!"

حەمەد دۆشەکەکەی هێنایە خوار. قەمەر دۆشەکەکەی لەنێو دۆلابییەکەدا راخست:"ئەم لێفەو باڵنجانەش بێنەخوار...!"

نوێنەکان لەبەر بۆنی سابوون وەك مسك بۆن خۆش بوون، وەك بەفر سپی بوون. حەمەد دڵی بوورایەوە" ئەگەر لێی گەڕابان سێ شەو و رۆژان دەخەوت. لە بێخەوییان خەریك بوو شێت بێ.

وەسمانەزلە گوتی:"یاڵلا، ئێستا بچینە بەر ئاوری دانیشین!"

دایەقەمەر گوتی:"دەبەرت مرم وەسمان، لەکۆڵ کوڕەکەی بەوە. نابینی بەستەزمانە خۆی بەسەر پێوە راناگرێ؟"

وەسمانەزلە گوتی:"یاڵلا شەهێنەکەم! ئێستا کەوایە بنوو، بەیانی قسان دەکەین."

## (٣)

وەسمانەزلە کە تا بەیانی خەوی لـێ نەکەوتبوو، لەگەڵ کەڵەباب خوێندنان لە جێی هاتەدەر. ئاورەکەی هەڵکردو قاوەکەی لە تەنیشت ئاوری دانا. ئەوەندە بەکەیف بوو کە ئۆقرەی لـێ هەڵگیرابوو، لە کەوڵی خۆی دا نەدەگونجا. دوو جار چوو دەرگای جێ نوێنەکەی کردەوەو تەماشای حەمەدۆکی کرد کە جارێ هەڵنەستابوو. بەڵام لە تاریکێ دا نەیتوانی باشی ببینێ. پاش قاوە خواردنەوە چەند جاری دیکە سەری حەمەدی داو هەموو جارێ دڵی تەپ تەپ لێی دەداو تووشی هەژانێکی ئەوەندە خۆش و شیرن دەبوو کە بۆی تازە بوو.

لەسندووقە دارگوێزە نەخشاوەکە، چاکەت و پانتۆڵێکی شینی تۆخی دەرهێنان کە تەنیا لە زەماوەندو رۆژانی جێژن دا لەبەری دەکردن. جلەکان کۆن بوون، بەڵام لەبەر خاوێنی دەبریسکانەوە. سەر گیرفانەکان و دەلینگەکان و پەراوێزی پانتۆڵەکەی گوڵدۆزی کرابوون. چاکەتەکەشی پڕ بە بەری لەشە رەق و تەقەکەی بوو. دیار بوو لە بن دەستی خەیاتێکی وەستاکار هاتوونەدەر. جلەکانی لەبەر کردن: چاکەت و پانتۆڵ لەگەڵ کراسێکی خەت خەتی یەخی حوسەینی کە لە ئاوریشمی خالیس بوو و لەگەڵ سوخمەیەکی شین... زنجیرسەعاتە زێوە قەڵەمکاری کراوەکەی بەسەر سوخمەکەیەوە هەڵواسی. لە جیاتی پشتێن، قایش شمشێرە قەڵەم کاری و زێڕکفت کراوەکەی یادگاری باپیری بەست کە نوێ نوێ بوو. کیسە باڕووتە چەرمە زێڕکفت کراوەکەی وە تەنیشتی خست و لە پەنای ویش دەمانچە ساچمەزەنە دەسك سەدەف و بریسکەدارەکەی لە قەدی بەست. چەکمە رەشەکانی پاش ئەوەی ماوەیەکیان تێوە راماو بۆیاخی کردن، لەپێ کردن و کڵاوەکەی، کە لە لبادێکی ناسك دروست کرابوو و دەوران دەوری قەیتانی ئاوریشمی تێ گیرابوو، لەسەری نا. چەندین جار بە هەنگاوی قایمەوە لەم سەری ژوورەکەوە چووە

ئەوسەری. کە هەتاو کەوت دەرگای ئەو دۆلابیەی کردەوە کە حەمەدی تێدا خەوتبوو. حەمەد وەك گلۆلە خۆی خڕ کردبووەوەو خەوی لێ‌کەوتبوو. تفەنگەکەشی لەبن سەری بوو.

وەسمانەزلە لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئەم کوڕە سەگبابێکی سەیرە! ئەو تفەنگەی کەنگێ هێنا لەبن سەری نا؟ لە ماڵێ منیش متمانە بە کەس ناکا. بستە منداڵێك! لووتی بگرم، روحی دەردەچێ." پاشان زەردەیەکی هاتێ و لە دڵی خۆی دا گوتی:"کوڕەکەمان لەو ئینسانە بە وەزن سووك و بە قیمەت گرانانەیە، هیوامانە، نووری چاومانە، بەستەزمانە لە چیاو بەندەنان هیچی دەست نەکەوتوە بێ‌خواو بەژن بکا... وەختێك لێرە خواردی و تەسەل بوو، لەوانەیە بەژنێ بکا، قەڵەو بێ، ببێتە پاڵەوان." دیسان بە ئۆگری و میهرەبانی‌یەوە تەماشای روخساریی کردو پێ‌کەنی:"یاخوا بژی، ئەگەر بەژنی نەکردو قەڵەویش نەبوو گرنگ نیە، خۆ ئەمە عەیب نیە... شەهێنیش چووکەڵەیە، بەڵام نێچیری لە دەست دەرباز نابێ." ئەمجار بە دەنگی بەرز پێ‌کەنی:"هەموو کەس پێی وایە حەمەدۆك پیاوێکی زەلامە بە قەد دوو کەسان، بە قەد غولێك! دیارە ئاوا باشترە" چونکە هیچ کەس باوەڕ ناکا ئەم کورپژگە مەزلوومە حەمەدۆك بێ. تەنانەت سوێندیشیان بۆ بخۆین، کەس باوەڕ ناکا. ئاسوودە دەی‌شارینەوە هەتا مشووری هەموو ئاغاکان دەخواو دەچێتەوە عەلی‌کۆ کە یەك پارچە نوورە. پاشانیش دەچێتە لووتکەی بە بەفری کێوی "دوڵدوڵ"، دەڕوا هەتا دوندی سەری کێوی. پیاو وردیلانە بێ باشە" وەك شەهێن کە وردو چالاکە." دڵی پڕ بوو لە شادمانی‌یەکی دلگر. بەسپایی داهاتەوەو مووی سەری حەمەدی ماچ کردو دەرکەی دۆلابی‌یەکەی پێوەدا. دوایە دیسان دەستی کردەوە بە راوێچکە کردن لەم سەری ژوورەکەوە بۆ ئەوسەر. لەو بەینەدا دایە قەمەر وەخەبەر هات، کتری‌یەکەی هەڵگرت و چووە دەرێ. ئەویش چارشێوە سپی و گەورەو گوڵدۆزی‌کراوەکەی لە سندووق هێنابووە دەرو بە خۆی‌دا دابوو. کاتێك وەسمانەزلەی دی، راوەستا. پێکەنینی هات، پاشان بە ترسەوە گوتی:

وەسمان! وەسمان! ئەتۆ هەمیشە جلکی وا لەبەر ناکەی" پێت وا نیە خەڵك بۆن دەکەن کە خەبەرێك هەیە؟"

وەسمان بە تووڕەیی نەڕاندی:"بە گۆڕی بابی خەڵکیەوە! ئەگەر خەڵك ئەقڵیان لە مێشك دا بایە نەدەبوونە گاڵتەجاڕی دەستی دووسێ ئاغایان. برۆ تەماشای کە! لەو ژوورە، لەنێو دۆلابی‌یەکەدا، بنیادەمێك خۆی قانگڵە کردوەو خەوتوە" وەك منداڵێکی شیرەخۆرە لێوی هەڵچنیون و چلمی هەڵدەلووشێ... بە رواڵەت منداڵێکی وردیلانەیە، بەڵام ئازایە، ئاقڵە، ئینسانە! ئەو ئینسانێکی تەواوەو هەر بۆیەش ئاغاکان و پیاوەکانی حکوومەت وەك سەگ لێی

دەترسن“ لە ترسی وی زراویان دەچێ. هەتا دوێنێ ئەو کێوە پێنسەد دزو ڕێگری پێوە بوو، کەچی حکوومەت وەسەر خۆشی نەدێنا. دەزانی بۆ؟ چونکە ئەو ڕێگرانە ئینسانەتی‌یان نەدەزانی. بەڵام بڕوانە، بۆ حەمەدۆکێك کێو و دەشت پڕ بووە لە سەرباز. بڕوانە، بڕوانە! تەواوی ئاغا مل ئەستوورەکان! حکوومەتێکی وا گەورەو گران، بە سەربازە بێ ئەژمارەکانیەوە لەم بەستەزمانە وەخۆ کەوتوون..."

وەسمان بە پەلە ڕۆیشت. لە کاتێك دا چەکمەکانی تەق و تووقیان دەهات، چوو دەرگای دۆڵابی‌یەکەی کردەوە:

"بڕوانە! وەك منداڵێکی شیرەخۆرە وایە... ئەگەر حکوومەت ئەمەی بەم وەزعەوە ببینێ هەم لە شەرمان دەبێتە دڵۆپە ئاوێك و هەم لەبەر پێکەنینێ دەدڕێ."

دەرگای دۆڵابی‌یەکەی پێوەدا. قەڵافەتی جیددی تر بوو، دەستی لەسەر شانی قەمەر داناو بە ڕاوێژێکی زۆر گەرم گوتی:"قەمەر، جوانکیلەکەم! ئەگەر پیاوانی حکوومەت شەهێنی من بەم قەڵافەتەوە ببینن، ئەگەر ئاغاکان حەمەدی من بەو شێوەیە ببینن ڕەنگە زیاتریش ترس بیانگرێ. ئەودەم بیر دەکەنەوە کە کاڵەك بە ڕەنگی نیە... دەڵێن ئەگەر ئەم کوڕیژگەیە ڕاپەڕێ و ئەوانی دیکەش نەختێك غیرەتیان هەبێ چ کارێك ناتوانن بکەن؟ ئەدی قەمەرە جوانکیلەکەم، ئاوایە. پیاوبوون شتێکەو ئینسان بوون شتێکی دیکە."

دووبارە لە نێو ژوورەکەدا دەستی کردەوە بە ڕاوێچکە کردن:

"ئینسانەتی“... ئینسانەتی، ئینسانەتی، کچێ قەمەر! ئینسانەتی... بزانە لاقێکم لەسەر لێوی قەبری‌یە. ئەگەر زۆری دیکە بژیم دەساڵی دیکە دەژیم. پاشان فاتیحەم بۆ دەخوێنن. مەلی گیانم لە قەوەزی لەشم هەڵدەفڕێ و دەڕوا. کچێ قەمەر! ئینسانەتی، ئینسانەتی بنج و بناخەی هەموو کارێکە. ئەمە ترسە کە بنیادەمی خوێڕی دەکاو ئینسانەتیی لێ دەستێنێتەوە. ئەمن ئەوەی باش دەزانم و ئەوە پێشت دەڵێم..."

دایە قەمەر لەتکە نانێك و پیاڵە شیرێکی هێناو دانیە دەستی وەسمان. وەسمانەزلە بە پووکە بێ ددانەکانی نانەکەی جوی و پیاڵە شیرەکەی بەسەردا کردو خێرا خەلاسی کرد.

"کچێ قەمەر، ئەمن دەچمە نێو دێی. ئەگەر شەهێن وەخەبەر هات، مەیەڵە بچێتە دەرێ. شۆرباوەکەی بۆ بەرە نێو دۆڵابی‌یەکە. تەنەکەیەکیشی لە پەنا دانێ، هەر لەوێ دەست بە ئاو بگەیەنێ. دوایە بیڕێژە“ بە جۆرێك کە کەس پێ نەزانێ. سبەینێ هەر لەوێ ڕا دەرگایەك بۆ دیوی تەویلەی دەکەینەوە."

ورده بارانەکە لێی کردبووەوە. پەڵە هەورێك بە ئاسمانەوە نەبوو. ئەو شنەبا ئارامەی دەهات لە دوورەوە، لە دەشتێ، لە ئاکچاسازەوە شەپۆل شەپۆل بۆنی نێرگزی بەرهەتاو، بۆنی پەین، بۆنی گیاوگۆڵ، بۆنی گوڵاو و زەرگەتەو پەپوولەو قامیش و بۆنی لیتەی گۆلاوەکەی لەگەڵ خۆی دێنا.

وەسمانەزلە لەبەر دەرگا هەڵتروشکا، قەلنەکەی بە تووتنی قاچاغی زەردی کارەبایی داگرتەوەو ئاوری دا. سێ جار وا کۆخی کە دەنگی کۆخەی گەیشتە ئەوسەری ئاوایی. ئەوانەی گوێیان لە دەنگی بوو، گوتیان:"ئەمڕۆ لەو ڕۆژانەیە کە وەسمانەزلە کەیفی سازە."

وەسمانەزلە لە جێی خۆی هەستا، قەلنەکەی بە لای ڕاستی زارییەوە گرت و بە شەویلاکە بێ ددانەکانی گرتی، دەستی لە پشتەوە گرێ دان، و هەتا توانی هەوڵی دا پشتی ڕاست بکاتەوەو قایم ڕایگرێ، بەڵام نەختێك چەماوەو کۆم بوو. وەڕێ کەوت. دەت گوت سواری ئەسپێکی جوان و خۆش ڕەوتی عەرەبی بووە. حاڵەتێکی هەبوو دەت گوت لە بەرزایی لووتکەکانەوە دەڕوانێتە جیهان و هەرچی لە جیهان دا هەیە" دەت گوت بە زمانی بێزمانی دەڵێ:"ئەگەر گەورەترین نهێنیی دنیام لە سنگم دا ڕاگرتبێ، لە لای هیچ کەس باسی ناکەم,..." مەودای نێوان ماڵێ خۆی و ماڵی "سیلوێرگلین"ی ـ کە لەوپەڕی ئاوایی بوو ـ بەو حاڵەتەوە بڕی" بە سەرمەستی و سەرخۆشی، بە ئیرادەو دەم بە پێکەنین. دەت گوت دەڵێ:"ئەی خەڵکینە! ئەم کێوە چووکەڵانە ئەمن دروستم کردوون." هەرکەس وەسمانەزلەی دەدی پێی وابوو بۆ کارێکی گرنگ دەچێتە ماڵی سیلوێرگلین. بەڵام کە گەیشتە بەردەرکی سیلوێرگلین هەر بەو حاڵەتی پێشوویەوە لەبەر دەرگاوە گەڕایەوەو کەوتەڕێ. سیلوێرگلین کە چاوی لێبوو وەسمانەزلە هات و گەڕایەوە، لە ماڵێ هاتەدەر:"مام وەسمان، مام وەسمان! چۆن هەتا بەردەرکی ماڵێ دێی و نایە ژوورێ دەگەڕێیەوە؟"

سیلوێرگلین، هاوتەمەنی وەسمانەزلە بوو. مێردەکەی و کوڕەکانی چووبوونە سەربازی و ئیدی نەهاتبوونەوە. کەس و کارێکی نەبوو، لە کەوێلێکی ئەوسەری ئاوەدانی دا بە تاقی تەنیا دەژیا. تەنیا نەوەیەکی هەبوو کە ئەویش لە گوندێکی زۆر دوور دەژیا.

"مام وەسمان، فنجانێك قاوە بخۆوە، جا بڕۆ!"

وەسمانەزلە ڕاوەستا، زەردەخەنەیەکی کردو هەر بەو لەخۆبایی‌بوونەوەو بە حاڵەتێکەوە کە ئەگەر دنیایەك نهێنی لە سنگی دا بێ، نای درکێنێ، گوتی:"سلامەت بی، سیلوێرگلین! ئێستا وەختی قاوە خواردنەوە نیە!"

لە حاڵێك دا بەژنی ڕاست دەکردەوە وەڕێ کەوت. لە بنانگوێیان پێدەکەنی. ئەوانەی وەسمانەزلەیان لەو حاڵەداو بە ڕوخساری گەش و جلکی جێژنانەوە دی، تێگەیشتن کە شتێك ڕووی

داوه. دانیشتووانی ئاوەدانی لە ژن و منداڵ و پیرو نەخۆش کە لەبەر دەرگاکانیان دانیشتبوون، کاتێك وەسمانەزلەیان دی کە لە نێوەڕاستی ئاوەدانی قەلنە دەکێشێ و بە بەرگی جوانەوە فیز دەفرۆشێ و پیاسە دەکا، لەبەر خۆیانەوە گوتیان:"یانی چ بووە؟ لە نێو دێ دا شتێکی نائاسایی نەقەوماوە!"

وەسمانەزلە هەتا نوێژی نیوەڕۆیە هەروا لە نێو دێی دا هات و چوو، هات و چوو. کەس نەیدەوێرا پرسیاری لێبکا. ئەگەر کەسێکیش غیرەتی وەبەر خۆی نابایە، لە وەڵام دا لەگەڵ سەرێکی پڕ هەوا، چاوێکی پڕ لە بریسکەی شادمانی و زەردەخەنەیەکی شیرین و دلگیر بەرەوڕوو دەبوو. وەسمانەزلە دەستی لە پشتەوەی دەگرتن، و دەڕۆیشت و یەك بێ دووکەڵی قەلنەکەی بە با دەکرد.

"حسام" کوڕە گەورەی وەسمانەزلە دەسبەجێ رای کردەوە ماڵێ و چووە لای دایکی:"چ بووە دایە؟ بابم چیی لێقەوماوە؟"

دایەقەمەر گوتی:"نازانم. ئەمن چووزانم ئەو شێت و ماخولیایە چ دەکا! حەتمەن دووبارە شێتێیەکەی سەری هەڵداوەتەوە، لە خۆڕا خەریکە عەرزێ دەپێوێ. خۆ ناکرێ هیچیشی پێ بڵێی، چونکە هەربینا لە سەری دا."

دایەقەمەریش وەزعێکی نائاسایی هەبوو، ئەمەش حسامی زیاتر خستە گومانەوە:

"بەڵام دایە دەبێ شتێك هەبێ. ئەتۆ لە بابم زار قایم تری، کەس نەهێنیت لێ نابیسێ! بە هەرحاڵ بابم دەیڵێ. قسەی لە دڵی دا بمێنێ دڵی دەتۆقی... دوو رۆژان قسە لە دڵی خۆی دا راگرێ دیقی مەرگ دەکا. کەوایە بۆخۆت بیڵێ و لە نیگەرانی رزگارمان کە! بابم چەند ساڵ دەبێ ئاوای لیباس لەبەر نەکردوەو لەنێو ئاوایی دا نەگەڕاوە. ئەو تەنیا کاتێك دەچووە لای حەمەدۆك ئەو جۆرە خۆی پۆشتە دەکردەوە.

بە بیستنی ناوی حەمەدۆك دایەقەمەر رەنگی بە روونەوە نەما. دەست و لێوی دەستیان کرد بە لەرزین و ئەو حاڵەتە لەبەر چاوی حسامیش ون نەبوو.

حسام چووە بن دارە ئەستوورەکەی نێو ئاوەدانی. دێهاتیەکان کۆ ببوونەوەو بە تامەزرۆیی چاوەڕوانی خەبەرێك بوون کە دەبوو حسام لەگەڵ خۆی بێنێ. حسام لە دوورەوە هاواری کرد:"هیچم دەست نەکەوت. وەختێك بابم شتێك نەڵێ، چما دەکرێ قسە لە دەمی دایکم دەرکێشی؟ نارەحەت مەبن، دووسێ رۆژ زیاتری پێ ناچێ. بابم خۆی پێ راناگیرێ و ئاخرەکەی وەقسە دێ. بەڵام ئێستا کەس گوێی نەداتێ، هەروا بزانن چاویشتان پێی ناکەوێ. ئەودەم دەهری دەبێ و زمانی دەکرێتەوە... یاڵڵا! ئێستا هەرکەس وەدوای کاری خۆی بکەوێ..."

لای نیوەڕۆیە وەسمانەزلە چووەوە ماڵێ و چووە لای دۆڵابیەکە، سەرێکی حەمەدی داو دوایە دانیشت، خێرا خێرا نانەکەی خواردو دووبارە وەدەر کەوتەوە. سەرلەنوێ دووکەڵی قەلنەکەی بە با کردەوەو دەستی کردەوە بە راوێچکان. لەگەڵ پیاسەکردن بە سیلەی چاو دەیڕوانیە چاوی بە پرسیاری دێهاتیەکانیش.

وەختێك دیتی کەس لەو دەوروبەرە نیە، بە پێکەنینەوە لە دڵی خۆی دا گوتی:"دەزانم فێڵبازینە! خۆتان شاردوەتەوەو بە دزیەوە تەماشام دەکەن و دەڵێن ئێستا نا ئێستا زمانم دەکرێتەوەو هەموو شتێك هەڵدەڕێژم. ئەمن ماندوو بوونم نیە، تەنانەت ئەگەر دڵیشم بتۆقێ ئەمە لەو قسانە نیە بدرکێ، نەخەیر، ئەو هەوایە نیە."

سێ رۆژی تەواو، وەسمانەزلە لە هەوەڵی بەیانیەوە هەتا خۆرئاوابوون هاتە نێو دێ و بەو شکڵ و شێوەیەوە پیاسەی کرد. ئێوارەی رۆژی سێهەم شەکەت و ماندوو خۆی بە ژووری ماڵێ دا کردەوە. حاڵی شپرزە بوو و کە قەلنەکەی بە دەستەوە دەگرت، دەستی دەلەرزی:"ماندوو بووم کوڕە! مردم کوڕە! ئەمە سێهەم رۆژە! سێ رۆژ، لە بەیانیەوە تا ئێوارێ، گاڵتە نیە کچێ قەمەر. کێ تەحەمولی دەکا؟ کەس وەدەر ناکەوێ. بەڵام ئەمن دەزانم. ئێستا ئەوان خەریکن بتەقن."

گوێی نەدایە حەمەدۆك" تەنانەت قاوەکەشی نەخواردەوە. لە بەر ئاگردان دانیشت، خەو بردیەوەو دەستی کرد بە پرخە پرخ. دەمی لێك کردبووەوە، دەت گوت قوولکەیەکی تاریکە.

## (٤)

له قەراخ چۆمی ساووران بە دوای یەك دا دەنگی چەند گوللە بەرز بووەوە. هێشتا کەڵەباب نەیان خوێندبوو کە لەنەکاو تەقینەوەی نەڕەو گوڕەو هەراو هۆریا گوندی پڕ کرد. سەگەل لێکرا دەستیان کرد بە وەڕین، ولاغ زەڕاندیان، گاجووت هۆڕاندیان، ئەسپان حیلاندیان و هات و هاوارو زیڕە هەمو جێیەکی گرتەوە. شەو لە باران دا خووسابوو، تاریکایی خووساو شڵەژاو هەموو بە تویی کراس و دەرپێیان لە مالآن وەدەر کەوتن.

بەلآم وەسمانەزلە خۆی نەدۆڕاندو بەسپایی گوتی:"کچێ قەمەر، قەمەر! وەزعەکە شڕە" دیسان ئەو گەوادە کەتنێکی کرد، دیسان بەلآیەکی بەسەر کەسێك هێنا."

حەمەد خێرا تفەنگەکەی تاودایە، لە جێ خەوەکەی دەرپەڕی و هەتا بن دەرگا ڕۆیشت، دوودڵ بوو:"بچم یان نا؟" وەختێك چرا هەڵکراو وەسمانەزلە حەمەدی بەو وەزعەوە دی، بە چاوێکی تێکەڵ بە گاڵتە پێکردنەوە مۆڕەیەکی لێکردو گوتی:"چ بووە حەمەدۆك؟ چ بووە شەهێنەکەم؟ چ بووە؟ خۆت بۆ شەڕ ساز کردوە؟." پاشان نەڕاندی:"بڕۆ جێی خۆت دانیشە، بڕۆ، بڕۆوە سەر جێت! ئەم مەسەلانە پێوەندییان بە تۆوە نیە. دیسان ئەو پیرە کەمتیارە گەوادە کەتنێکی کردوە. دیسان وەجاخی فەقیرێکی بەستەزمان و بێدەست و لاقی کوێر کردوەتەوە. لەم دێیەدا هەموو شەوێ ئەم جۆرە پێشهاتانە روو دەدەن" بڕۆوە سەر جێیەکەت. ئەگەر شتێکی گرنگ بوو خەبەرت پێ دەدەم."

وەسمانەزلە بەدەم جل لەبەر کردنەوە یەك بێن قسەی دەکرد. حەمەدۆك کە ئارام ببووەوە، تفەنگەکەی لە شانی هێنایەخوار، لوولەکەی گرت و چووە بەر ئاگردان. یەك دوو پۆلووی ئاگری شەوێ لەنێو خۆڵەمێشەکەدا دەدرەوشانەوە.

دایەقەمەر لە وەسمانەزلەی ـ کە بە هەناسەبڕکەو هەژانەوە لە شتێك دەگەڕا ـ پرسی:"تووبی ئەو خوایە لە چ دەگەڕێی؟"

وەسمانەزلە بە تووڕەیی‌یەوە گوتی:"لە گۆڕی بابت دەگەڕێم قەمەر، لە گۆڕی بابت! لە چ دەگەڕێم؟ خەریکم لەسەعاتەکەم دەگەڕێم، لە سندانێکیش دەگەڕێم بۆ سەری تۆ! نابینی لە دەرێ چ قیامەتێکە! هەر دەبێ واش بێ" ئەم دێهاتی‌یانە، ئەو خەلکە نەفامە حەقی خۆیانە، هەزارجار هەقی خۆیانە! حالّی بووی؟"

"ها ئەوە سەعاتەکەت! بەم نیوەشەوە، لەو قیامەتەدا سەعاتت بۆ چیە؟"

"دەمەوێ بیخەمە گۆڕی بابت قەمەر گیان، گۆڕی بابت!" بەخۆی نەبوو زەردەیەکی هاتێ.

دەمەتەقەی پڕ لە خۆشەویستیی ئەم دووانە، بێ‌ئەوەی لێك دلگیر بن، جۆرێك هەستی بەختەوەریی لە حەمەدۆك دا پێك هێنابوو. دنیایەك کە ئەو دوو ئینسانە پێرە دروستیان کردبوو، دنیایەکی بێ‌بڕانەوە لە خۆشەویستی و سۆزو خۆش بینی بوو. هەراو هۆریای دەرێ پەرەی دەگرت و حەمەدیش هەر بیری لەو ژن و مێردە دەکردەوە کە دەت گوت دوو مندالّن:"ئەگەر هەموو ئینسانەکان وەك ئەم دووانە بوونایە، ئەگەر هەموو ئینسانەکان ئاوا بوونایە... خوا دەزانێ دنیا چەند جوان دەبوو، مرۆڤ چەند بەختەوەر دەبوو!"

وەسمانەزلە کە سەعاتەکەی لە گیرفانی هاویشتبوو، گەڕایەوە تەماشایەکی چەکمەکانی و قۆلّی چاکەتەکەی کرد. پاشان پۆلوویەکی لە ئاگرەکە دەرهێناو قەلنەکەی پێ داگیرساند. دەنگ و هەرای دەرێ هەر زیادی دەکردو لە مالّی وەسمانەزلە نیزیك دەکەوتەوە. وەسمانەزلە لە هۆدەکەی هاتەدەرێ. لە حەوشەی دا ڕاوەستاو هاواری کرد:"ئاوری دا! سەگبابی گەوواد ئاوری دا! وەختێك ئێمە پیاو نەبین، دیارە ئاوری دەدا... دەکوژێ و دەبڕێ و ڕەحمیش بە کەس ناکا... سەگبابە ئاخرەکەی قسەی خۆی بردە سەرێ! ئاوری لە مالّێ حەسەنی بەردا... لەوانەیە حەسەنیشی کوشتبێ!... دیارە دەی‌کوژێ، ئای حەسەن!... حەسەنی جوامێرم! پیاوماقوولّەکەم! قزلّباشەکەم! حەسەن! بەستەزمانەیان کوشت! دایکی جوامێران زوو تازیەدار دەبێ... دایکی جوامێران... ئەم دێیە پیاوێکی جوامێری تێدا بوو، ئەویشیان کوشت، دایکی جوامێران..."

لەگوتنی "دایکی جوامێران زوو تازیەدار دەبێ "پەژیوان بووەوە. داخوا حەمەد گوێی لەم قسەیە ببوو؟" ئەگەر گوێی لێ بووبێ، بەڕاستی خەراپ دەبێ. بەستەزمانە وەك باڵندەیەکی بریندار پەنای هێناوەتە بەر مالّی تۆ، ئەتۆش ڕاست دەبیەوە دەلّێی دایکی جوامێران زوو تازیەدار دەبێ! هەی وەسمانەزلەی نەفام! ئەوە کە دەلّێن گورگ ئەگەر پیر بوو، دەبێتە سودرەی سەگان بە هیچ جۆر ڕاست نیە. وەسمانەزلە، گورگ ئەگەر پیر بوو، بۆخۆشی دەبێتە سەگ! خوا بکا گوێی لێ‌نەبووبێ!"

وەسمان دەرگای جێنوێنەکەی کردەوە تا بزانێ حەمەد گوێی لە قسەکانی بووە یان نا" و دوایە بانگی کرد:"کوڕم میوان! سەر بێنە دەرێ، تەماشاکە! گڕی ئاگر چووەتە ئاسمان."

حەمەد هاتەدەرێ. لە شیپانەی دەرکەی دا راوەستا.

"پێویست نیە لە ماڵێ بچیەدەر. تەنیا تەماشای ئەو بڵێسانە بکە کە دەچنە ئاسمان شەهێنەکەم! میوانەکەم! بڵێسەکان ببینەو پاشان بچۆوە سەر جێی، خەوێکی حیسابی بکە! ئەگەر پێشت خۆش بوو بچۆ دەرێ میزی بکە! رەنگە حەز بکەی لە دەرێ میزی بکەی. بەڵام لەم قوڕنەیە بەولاوەتر مەچۆ. پاشان رووی کردە لای ئەو خانووە کە ئاوری گرتبوو، و گوتی:

"وەختێك ئەمن قاچاغ بووم، شەش مانگان لە یەك ماڵ دا مامەوە. رۆڵە دەزانی لەو ماوەیەدا بە ئەزرەت چیەوە بووم؟ بە ئەزرەتەوە بووم لە دەرێ، لەبەر ئەستێران، بە خەیاڵی ئاسوودەوە میزێکی حیسابی بکەم. یەکەم شەو کە لە ماڵەکە چوومەدەر لە هەوەڵین دەرفەت دا یەکەم کاری کردم ئەوە بوو کە چووم لەبەر ئەستێران میزم کرد. هەل بە دەرفەت بزانە! ئەتۆش برۆ هەڵمیزە! میزێکی بە کەیفی خۆت بکە بە خەیاڵی ئاسوودە! بەڵام لێرە دوورتر مەڕۆ!"

حەمەد بەسپایی لە دەرگا چووە دەرێ.

سێ ژووری بەسەر یەکەوەی حەسەنی یۆبازئۆغلی لە ئاگر دا دەسووتان. ژووری یەکەم ماڵەکەی بوو، ئەوی بەرەژێرتر تەویلەو ئەوی خوارتریش کادێنی بوو. لە یەك سات دا ئاگرەکە گەیشتبووە ماڵێ "دەلی دوراك"ی دراوسێشی. ماڵی دۆراکیش لەنێو بڵێسەی ئاگر دا دەسووتا. هەرچەند بای زۆر بە قەوەتی نەدەهات، بەڵام با، بڵێسە ئاگرەکانی بە ئەندازەی منارەیەك بڵیند دەکرد. ئاگر بڵێسەی دەداو بڵێسەکان لە شەودا بڵاو دەبوونەوە.

هەموو خەڵکی ئاوەدانی منداڵ و پیرو لاو و ساغ و نەخۆش رژابوونە دەرێ. هێندێکیان جلیان لەبەر کردبوونەوەو دەستەیەکیش هەر لەوێ، لەبەر رووناکایی گڕی ئاگرەکە خەریك بوون لەبەریان دەکردنەوەو ژمارەیەکیش بە توێی کراس و دەرپێ‌یان دەرپەڕیبوون.

حەسەنی یۆبازئۆغلی، دەستەکانی لەبن هەنگڵی گرتبوون، لەشی بە راست و چەپ دا دەسووڕاندو چاوی لە ماڵە سووتاوەکەی وەرنەدەگێڕا. ژنەکەشی منداڵەکانی لەدەوری خۆی هاڵاندبوون و بە دەنگی بەرز دەگریا.

ئەوانەی ئەو سووتمانەیان ساز کردبوو، هەر لە پێش دا دەرگای هەرسێ ژوورەکەیان ئاور دابوو. بۆیە یۆبازئۆغلی نەی‌توانیبوو پڕمۆڵێکیش کەل و پەلی نێوماڵ بێنێتەدەرێ" تەنیا توانیبووی بە زەحمەت گیانی خۆی و ژن و منداڵەکەی نەجات بدا. ئەگەر لەحزەیەك درەنگتر جووڵابا، ئەوانیش لەنێو ئاگردا دەسووتان و دەبوونە خۆڵەمێش.

له تەویلەی حیلەی ئەسپێك دەهاتە بەرگوێ، كە عەرزو عاسمانی دەلەرزاند. ئەسپەكە لە سووچێكی تەویلەوە دەچووە سووچێكی دیكەو بەردەوام بە شێوەیەكی دڵتەزێن دەیحیلاند كە زیاتر وەك دەنگی ناڵەو هاوار دەچوو تا حیلەی ئەسپ. ئەو بزووتە ئاگرانە كە لە هۆڵەی داگیرساوی خانووەكە بەسەر پشتی دا بەردەبوونەوە، ئەسپەكەیان شێت كردبوو. كەس نەیدەتوانی بۆ رزگار كردنی كارێك بكا. لاوەكان و پیاوەكان هەروا راوەستابوون و گوێیان لەحیلەحیلی بە ژان و ئۆفی ئەسپەكە بوو.

سەفچەكاهیای پیر بە پاڕانەوە بە یەك یەكی دێهاتییەكانی دەگوت:"ئینسانێك پەیدا نابێ ئەم دەرگایە بكاتەوە، جوامێرێك، پیاوێك پەیدا نابێ ئەم دەرگایە بكاتەوە؟ ئەو ئەسپە ئەسپێكی رەسەنە، ئەگەر دەرگای لێبكەنەوە بۆخۆی دێتە دەرێ. زگم پێی دەسووتێ! ئەسپێكی رەسەنە" ئەسپی رەسەن وەك بنیادەم وایە" دەگری، پێدەكەنێ، بیر دەكاتەوە، تەنیا ناتوانێ قسە بكا. ئەو جۆرە ئەسپانە باشترین دۆستی بنیادەمن! جوامێرێك، پیاوێك پەیدا نابێ؟ ئاناناى پیری ماڵت خەرابێ! حەیف كە بۆخۆم لە خۆم ڕا نابینم دەرگاكە بكەمەوە، بۆخۆم ناتوانم..."

حیلەی ئەسپەكە بەرە بەرە زیاتر پەرەی دەگرت و دڵتەزێن تر دەبوو.

لە نەكاو حەسەنی یۆیاز ئۆغلی لە جێی خۆی دەرپەڕی و وەك فرفرە بە دەوری خۆی دا سووڕا" پاشان خەرارێكی تەڕ كە چەند لاوی ئاوەدانی بە دەستیانەوە گرتبوو بۆ ئەوەی بەسەر خانووی تەنیشت خانووە سووتاوەكەی دا دەن و نەیەڵن ئاور بگرێ، لە دەستی ئەستاندن. خەرارەكەی لە خۆیەوە پێچاو لە چاولێك نانێك دا لە بڵێسە ئاگرەكان تێپەڕی، خۆی بە ژووری تەویلە دا كردو هەوساری ئەسپەكەی گرت و هەر بەو خێراییە هاتەوە دەرێ. ئەسپەكە هەر كە گەیشتە دەرێ، هاتە سەر پاشووان، هەوساری لە دەستی حەسەنی دەرهێناو غاری دا بۆ مەیدانی نێو ئاوایی و لەوێ وەك حەسەنی، كە ماوەیەك پێشتر بە دەوری خۆی دا سووڕابوو، دەستی كرد بە سووڕان بە دەوری خۆی دا" ماوەیەك سووڕاو پاشان بۆ لای دەشتێ دەخۆی نووساو لەگەڵ تاریكایی شەو تێكەڵ بوو و لەبەر چاو ون بوو.

بەرە بەرە هۆڵەكان لە گڕی ئاگردا ون دەبوون و دەبوونە خەرمانێكی ئاگر لە تەنیشتی ئاوەدانی.

یۆیازئۆغلی خەرارەكەی لەسەر شانی هەڵگرت و دیسان دەستی لەبن هەنگڵی نانەوەو دووبارە چاوی بڕیە بڵێسە ئاگرەكان و تێیانەوە راما.

ئەوانی دیكەش راوەستابوون و بێ جووڵە، تەماشای سووتمانەكەیان دەكرد. لە هۆدەكان دەنگی قرچە قرچی شكانی دارەكان دەهات" و دیوارەكان تێك دەڕووخان. دەنگی دوا گوێرەكە ـ كە لە تەویلە دا گیری كردبوو ـ بەرە بەرە بێدەنگ دەبوو.

هەموو لە جێی خۆیان ڕەق ببوون، هیچ کەس جووڵەی نەدەکرد. ڕوخساری هەمووان باریک و ڕەنگ زەرد بوو. لەو نێوەدا تەنیا وەسمانەزلە وەزعێکی دیکەی هەبوو. دەهات و دەچوو، قسەی دەکردن، قەلنە بە لێوەوە، و زەردەخەنە لەسەر لێوان، دەستی لە پشتەوە گرتبوون و قەلنەی بە با دەکرد. هەر تاوە ناتاوێك دەهاتە لای یۆبازئۆغلی و دەیگوت:"سەرت سلامەت بێ، برالە هەر ئەقڵە لە خەسارێکی" پاشان دەگەڕایەوەو دەڕۆیشت و گوێی نەدەدایە ئەوە کە یۆبازئۆغلی گوێی لە قسەکانی هەیە یان نا. دووبارە دەهاتەوەو دەی گوت:"دۆستی خۆم، ئەتۆ کارێکی چاکت نەکرد! کارەکەت ناشیرن بوو" ڕاست و ڕەوان پێت بڵێم ئەتۆ هەموو دێیەکەت خستە مەترسییەوە. دیارە سزایەکەشت وەرگرت! موسیبەت لەوە خراپتر دەبێ؟ خەریك بوو ژن و منداڵەکەت و بۆخۆشت لەو ژوورەدا بسووتێن. شوکری خوا بکە هاوڕێ! شوکرانەبژێر بە، موسیبەتێك لە هەزار نەسیحەت باشترە. ئەمن ئیدی لەمڕۆ بەدواوە لە تۆ دڵنیام. کەسێك لەگەڵ مردن بەرەوڕوو بێ، باشتر دەبێ، پیاوتر دەبێ، لە ڕاستی دا ئەتۆ پیاوێکی ئازابووی، بەڵام هەر لەو کاتەدا بابایەکی کەللەشەق بووی" وانیە؟"

چەند سێبەرێك دەچوونە ماڵەکان و دەهاتنەوەدەر. چەند سێبەرێکیش دەچوونە نێو بڵێسە ئاگرەکان و دەهاتنەوەدەر. بۆنی گۆشتی سووتاو دەهات. بۆکڕووزو بۆزووڕوو دەهات. بۆنی سووتان لەگەڵ بۆنی بەهاری ساوا تێکەڵ دەبوو.

سەرەنجام وەسمانەزلە لە پیاسەکردن ماندوو بوو. چوو لەبەر ڕووناکایی ئاگرەکە ڕاوەستا. پشتی لە ماڵەسووتاوەکە کرد بوو و گەرمای ئاگر لە پشتێی دەدا. سەری هەڵێناو بە پێکەنینەوە چاوی بەسەر یەك یەکی دێهاتییەکان داگێڕا. بەژن و پیاو و پیرو لاوەوە لە هەمووانی ڕوانی. کاتێك وەرسووڕا بۆلای ڕاست، لووت و بزووت لە سەفچەکاهیا هەڵئەنگووت کە دەهاتە لای. وەسمانە زلە گوتی:"بڕوانە دۆستی خۆشەویست! سەفچەکاهیا، بڕوانە! ئەم بڵێسانە چەند جوانن! لە تاریکایی شەوی بەهاردا چەند جوانن!" ئەمجار قاقا پێکەنی. هەموو خەڵکی ئاوەدانی گوێیان لە پێکەنینەکەی بوو و بە سەرسووڕمانەوە تەماشایان کردو کردیانە پرتەوبۆڵە.

"بڕوانە سەفچەکاهیا، بڵێسە بۆ شەو چەند چاکە! گوللە بۆ سنگ چەند باشە! دەست و لاق بەستراومانەوە بۆ مەمانان چەند باشە! شیوەن و گریان بۆ دڵمان چەند چاکە! لەچکی ژنان لەجیاتی کلاو بە سەرمانەوە چەند جوانە! ئینسان بوون بۆ ئێمە چەند باشە! بڕوانە سەفچە گیان بزانە! ئەم بڵێسانە چەند سوورن، چەند جوانن! کە با لـێیان دەدا، بڵێند تر دەبن، پان تر دەبن جوان تر دەبن. کە بڵێسەکان بەرزتر دەبن، دڵی منیش گەورەتر دەبێتەوە، زیاتر دەکرێتەوە. دڵم

وەك دەزگای ئاسنگەرانی لـێ دێ. وێك چوونی دڵ و دەزگا چەند باشە! عەلیسەفابەگیش بۆ ترسنۆكیی مەمانان چەند باشە! ئینسانەتییش بۆ مەمانان چەند باشە! بروانە براڵە، سەفچە، بڕوانە! تەماشای ئەم بڵێسانە بکە! بڵێسە بۆ شەوەکانمان چەند باشە!"

سەفچەکاهیا تەماشایەکی روخساری بە پێکەنین و خۆشحاڵی وەسمانەزلەی کرد. گوێی لە قسەکانی بوو وەك ورێنەی شێتێك بێمانا بوون. سەری ڕاوەشاند و لێی دوور کەوتەوە. دەڕۆیشت و لەبەر خۆیەوە دەی گوت:"خوایە، خوایە، خوایە، پەنا بە خوا. خەریکە بەرە بەرە ئەقڵی دەگۆڕێ" جاران وانەبوو. دێ ئاگری تێبەربووە، ئەو لەبەر ئاگرەکە ڕاوەستاوە، پیس پیس، پێدەکەنێ. ئای وەسمانەزلە، ئای! پیر بووی ها! پشتت کۆم بووەتەوە، سۆمای چاوەکانت رۆیشتوە ها! ئای وەسمانەزلەی خۆم ئای! ئەی هاوڕێی بە هیممەتم، ئای! ئەتۆش پیر بووی! بنیادەم وەختێك پیر بوو، وەك مندالانی لـێدێ" تەنانەت وەك منداڵی شیرەخۆرە. ئەی بەستەزمان! خوایە، خوایە، خوایە پەنا بەتۆ!"

سەفچەکاهیا دووساڵ لە وەسمانەزلە گەورەتر بوو. پشتی چەمابووەوە" بە تەواوی دوولا هاتبووەوە. وەسمانەزلەو سەفچەکاهیا لە دێدا، جووتێك بوون کە ئەخلاقی سەیر و سەمەرەیان هەبوو. خاوەنی داب و ڕێوشوێنێکی جیا لە خەڵکی دیکە بوون و ڕێوشوێنی وایان بەرپا دەکرد کە دێهاتییەکان نە سەریان لـێدەردەکرد و نە قەتیشیان دیبوو، هەردووکیشیان لەگەڵ ئەم ڕێوشوێنانە ڕێك دەکەوتن. هەردووکیان جلکی وەك یەکیان لەبەر دەکرد، هەردووکیان دەمانچەی"کۆبوور"یان لە خۆ دەبەست و هیچیشیان مومکین نەبوو لەخۆبەستنی دەمانچەی ساچمەزەنی قەدیمیان لەبیربچێ. هەردووکیان ـ لە منداڵییەوەـ سەریان بە گوێزان دەتاشی، بەڵام ڕاست لە نێوەڕاستی تەپڵەسەریان بە پانایی دوو قامك موویەکی درێژیان دەهێشتەوە. مووی کەللەسەری سەفچەکاهیا ئەوەندە درێژ بوو کە ئەگەر بەری دابایەوە، وەك پرچی ژنان دەگەیشتە سەر پشتێنێ.

شەو، بە ئارامی دەڕەوی و لە گوندەکانی دراوسێشەوە هاوار و هەراو هۆریایەك دەهاتە بەرگوێ. لەنێو ئاکچاساز دەنگێکی وەك تەقینەوەی گوللە تۆپ دەبیسراـ وەك دەنگی گوللە تۆپێك کە لە بن زەویدا بتەقێتەوە ـ بۆنی باتلاغ و بۆنی گوڵ و نێرگزو بۆنی بەهار لەگەڵ بۆنی سووتەمەڕۆ تێکەڵ ببوو... دەمەساتێك بێدەنگییەکی قووڵ بەرپا بوو. هەموو دەنگەکان لەپڕ کپ بوون. ئەسپێك لە دووری بە تاڵی دەیحیلاند. پاشان بێدەنگ بوو. قرچەقرچی ئاگر لەمێژ بوو بەرەو بێدەنگ بوون چووبوو. بۆنی گۆشتی سووتاو فەزای پڕ دەکرد. کونە لووتی دێهاتییەکان پڕ بوون لە دووکەڵ و چەورایی گۆشتی سووتاو. هەموویان دەستیان کردبوو بە کۆخین.

بڵێسەکان وردە وردە کورت تر بوونەوە، چووکتر بوونەوەو لای بەیانی هۆدە سووتاوەکان تەنیا کۆما ئاگرێکیان لـێ بەجێ مابوو" و وەختێك هەتاو دەرکەوت، ماڵەکان تەپۆلکە

خەڵووزێکی رەش بوون کە دووکەڵیان لێ‌هەڵدەستا. لەنێو ئەو تەپۆلکە خەڵووزەدا هێندێ دەفری مسی خوارو خێچ و تواوە، چەند پارچە ئاسنی نیرو ئامووروو کۆیەك بەرد ئەستێ دیار بوون کە ببوونە قسڵ... حەیوانە سووتاوەکان کوتە ئێسکێکیشیان لێ‌نەمابووەوە. لە تەویلەکەوە هەتا قوولکەکەی پشتەوەی، رۆنێکی رەش وەرێ کەوتبوو.

ژن و منداڵ بە خەواڵوویی، پیرەکان بە دۆش داماوی و ماندوویی و جارزیو لاوەکان و تازە بە ساڵداچووەکان ماندوو و نارەق کردوو لەسەر عەرزی تەڕ، بەرەو هەتاوێك کە خەریك بوو سەر دەربێنێ، هەڵترووشکابوون، سەریان داخستبوو و روخساریان خەماوی و ناهومێد بوو. ئەم سەرانە کە بەریان دابوونەوە، نەدەجووڵان و ئاوڕیان وەڕاست و چەپ نەدەدایەوە. شتێکی وەك شەرم لە فەزا دا شەپۆلی دەدا، دەت گوت ئەگەر سەر هەڵبڕن و تەماشای روخساری یەکتری بکەن زراویان دەتۆقێ. کەس چووکترین دەنگی لێوە نەدەهات. بێجگە لە وزە وزی ئەو زەرگەتەو مێشەنگوینانە کە لە گوڵێکەوە دەچوونە گوڵێك و لە چڵێکەوە دەفڕینە سەر چڵێك، دەنگێکی دیکە نەدەهاتە بەرگوێ.

لەو نێوەدا تەنیا وەسمانەزلە بەرەو ئەو خۆرە کە خەریك بوو سەر دەربێنێ، راوەستابوو. سێبەرە درێژەکەی بە دەشتێ‌دا پان ببووەوە. وەك پەیکەرێکی بەسام، زەردەخەنە لەسەر لێو، لەبن یەکەمین تیشکەکانی بەرە بەیان دا بێ‌جووڵە راوەستابوو. ماوەیەك ئاوا راوەستاو دووکەڵی قەلنەکەی بۆ لای ئەو خۆرەی هەڵ دەهات، بە بادا کردو شنەبایەکی نەرمی دەهات دووکەڵەکەی لەگەڵ خۆی بۆ دووری برد. پاشان وەسمانەزلە جوولەیەکی کرد کە دەت گوت سەرێکی غوولێکی هەزار سەر جووڵاوە، دەستی کرد بە راوێچکە کردن بەرامبەر بەو ئاپۆرایە کە لەسەر عەرز دانیشتبوون. لەنێو ئەو خانووە سووتاوانەدا کە هێشتا دووکەڵیان لێ‌هەڵدەستا، دەستی لە پشت خۆی گرتبوون، قەلنەکەی بە دەمەوە گرتبوو، گەردنی راست راگرتبوو، دەگەڕا... دێهاتی‌یەکان سەریان هەڵبڕی و تەماشایان کرد. ئەو کەیف و دەماغ و پیاسەکردنەی بەنێو خانووە سووتاوەکان دا بۆ وان جێگای سەرسوڕمان بوو. هەتا خۆرەتاو بەرز بوو، وەسمانەزلە هەروا پیاسەی کردو دووکەڵی قەلنەی دایە بەر با. سەرەنجام روبەرووی حەسەنی یۆبازئۆغلی کە وشك ببوو، راوەستا. دەستی راستی حەسەن سووتاو و هەڵمساو و پڕ بلۆق بوو، دەستی چەپی لەبن هەنگڵی نابوو، روخساری وەك زەردەچێوە زەرد هەڵگەڕابوو و بە شەوێك دە ساڵ پیر ببوو. وەسمان بە دەنگێکی رەوان ، خۆشحاڵانەو زەنگوڵەدار گوتی:

"حەسەنی یۆبازئۆغلی، حەسەنی یۆبازئۆغلی! بابی خوا لێ‌خۆش بووت قزڵباش بوو، بەڵام کوردێکی قارەمان بوو" پیاوێك بوو" هیچ کەس و کاری نەبوو. بەڵام کەس نەی‌دەوێرا پێی بڵێ پشتی چاوت برۆیە. حەسەن! ئەم رۆژانە منداڵێکم دی" بەیانی، ئێوارێ، شەوێ، وەك خۆرەتاو گەش بوو" بستە منداڵێك وەك منداڵان دڵپاك، بەڵام سەرانسەر غیرەت و ئازایەتی. ئەو بستە منداڵە حکوومەتێکی بە دەسەڵات، تەنانەت

"مستەفاکەماڵ پاشا"ش لێی دەترسێ، هەر ئەو مستەفا پاشا چاوشینە کە یۆنان و دنیای بە پارووێک خوارد. ئاغاکان لە ترسانی وەك بی دەلەرزین. حەسەنی یۆبازئۆغڵی، ئاغاکان ئەوەندەی لەبەر دەلەرزین کە لە ترسانی پاتۆڵیان بە گەرەکی خوارێوە بەند نەدەبوو. حاڵی بووی یۆبازئۆغڵی؟ دوو کەلیمە قسەم لەگەڵت هەیە. با عەلیسەفابەگ بێ خانووەکەت بسووتێنێ" هەروەك سووتاندیشی! کاری چاکیشی کرد" کارێکی بەجێی کرد، کارێکی جوانی کرد، دەستی نەرزێ... با بێ ئێمەش بکوژێ، هەقی خۆمانە براله! ئێمە بۆخۆمان بێئابروویمان کرپوە هاورێ! کارێکی زۆر باش و بەجێ دەکا. با ئەو عەلیسەفابەگە سەگبابە بێ و هەر کارێك لە دەستی دێ، بیکا. زۆر باشە، تەنیا یەك شتت لەبیر بێ. قەت مەترسە! بە هیچ جۆر مەترسە! مەیەڵە دڵت بترسێ! دڵی ترسەنۆك بە کەلك نایە" زوو دەنگی لەبەر دەبڕێ. یۆبازی من! ئەتۆ مەترسە براله، مەترسە! ئەو لامەزەبە هەموو ئەو بەڵایانەت بۆیە بەسەر دێنێ کە بترسێی. مەترسە. برا ئازایەکەم، مەترسە! ئەتۆ پیاوێکی بەغیرەتی، مەترسە! هاورێ، ئەمن پێت دەڵێم مەترسە! چونکە پیاوێك بترسێ هیچ وەخت و لە هیچ جێیەك جێ رووی رزگاری نابینێ. ـ چ بچێتە ئاسمان و چ بێتەوە سەر عەرزو چ خۆی بە دەریادا بدا ـ مەترسە! ئەسپە راکردووەکەت دووبارە دێتەوە جێی خۆی. عەلیسەفای سەگبابیش سزای خۆی دەبینێ. ئەو ئەسپەی لە ئاورت نەجات دا دووبارە دێتەوە، دێتەوەو ئەو دەستە بلۆق کردوەی تۆ کە بۆ نەجاتی ئەوت سووتاند، دەبینێ. دەستت دەبرژێتەوە کورم؟ دیارە دەبرژێتەوە، با ببرژێتەوە. دەستی سووتاو چاك دەبێتەوە، ئەسپی رۆیشتوو دێتەوە، بەڵێ دێتەوە. ئەسپێك لە سووتمان رابکا ئیدی ناگەرێتەوە، بەڵام ئەسپی تۆ دێتەوە. براله، یۆبازئۆغڵی! حەسەن قزلباش، حەسەنە کوردە، پێت دەڵێم، پێت دەڵێم، پێت دەڵێم..." دەنگی بەرزتر کرد، دەنگی، دەنگێکی نائاسایی بوو" دەنگێکی ئەستوور بوو دەت گوت لە دەمی غوولێك دێتە دەر" دەنگێکی بەهێز بوو:"ئەسپەکەت دێتەوە، براله یۆبازئۆغڵی، ئەسپەکەت دێتەوە، لە پشت هەر تەپۆلکەیەك هەتاوێك هەڵدێ!"

وەسمانەزلە بە پێکەنینەوە چاوەکانی کە جووتە برۆیەکی پڕ پشت دایپۆشیبوون بەسەر ئاپۆرایەکەدا گێرا. لە پاشان بە دەنگێکی پڕ لە متمانەوە، بە پێداگرتن لەسەر یەك بە یەکی وشەکان گوتی:"لە پشت هەر تەپۆلکەیەك هەتاوێك هەڵدێ، هەتاوێك، هەتاوێك، هەتاوێك، هەتاوێك." و پاشان بە قامکی گەورەی کە دەتگوت رەگەی زێیەگەرمێنێیە، هەتاوی نیشان دان و گوتی:"هەتاوێکی ئاوا هەڵدێ، هەتاوێکی ئاوا جوان! هەم جوان و هەم گەرم... بەڵێ، هەتاوێکی ئاوا، هەتاوێکی ئاوا. لە پشت هەر تەپۆلکەیەك هەتاوێك هەڵدێ. ئەسپەکەت دێتەوە، رۆژێك دێتەوە، رۆژێك..."

پاشان پشتی تێکردن و خێرا بۆ لای ماڵێ وەرێ کەوت، و هەتا ئەو کاتەی گەیشتەوە ماڵێ و توند دەرگای لەسەر خۆی پێوەدا، ئاپۆرایەکە هەروا چاویان تێوە بڕیبوو.

## (٥)

خەریك بوو خۆرەتاو بکەوێ. ئەسپی یۆبازتۆغلی بە پێوەو بێجووڵە لە نێوەڕاستی دەشتێ ڕاوەستابوو. سێبەرەکەی بەلای بەردەڵانەکانی ئاناوارزادا کەوتبوو. هەزاران باڵندە یەکدەنگ بەرامبەر بە هەتاوێك کە خەریکی هەڵاتن بوو، دەیان خوێندو دنیایان پڕ کردبوو لە هەنگامەیەك وەك هەنگامەی ڕۆژی قیامەت. ئەسپەکە ملی ڕاکێشابوو" دەت گوت بۆن بە گیایەکی تەڕو تازەوە دەکا. سپیایی چاوە ڕەشەکانی پڕ لە خوێن بوو. بلۆقێك لەسەر کەفەڵی لای ڕاستی هەڵمسابوو. چەند لەحزە دواتر مێش و مەگەز لە دەوری بلۆقەکە دەستیان بە گەڕان کرد. ئەسپ بۆ دەرکردنی مێشەکان کلکی ڕاوەشاند... ئەمجار مێشوولەورتکەو دوایە مێشەرەشکەی چووکەڵە لەسەر چاوەکانی کەڵەکە بوون. حەیوان کە ڕەق ڕاوەستابوو، بەردەوام سەری ڕادەوەشاندو ماوەیەکیش بێئەوەی گوێ بداتە ئەو مێشانەی لە جیاتی بلۆقەکە لە چاوی نیشتبوون، بێهەست و خوست ڕاوەستا.

هەتاوێکی مەیلەوگەرم دنیای پڕ کرد. دەنگی باڵندەکان کپ بوو، و زەرگەتەکان لە هەوای گەرم دا کەوتنە فڕین. وەختێك گەرما قایم بوو، زەرگەتە ئارەق کردووەکانیش لەنێو گوڵە گەورەکان دا خۆیان شاردەوە. ئیدی شوێنەوارێك لەو زەرگەتانە نەدەبینرا کە لە گەرمادا باڵیان لێك دەداو دنیایان پڕ کردبوو لە وزە وزی خۆیان. تەنیا ژەنگەسوورەو مێشە شینکە بە ڕەنگی سوورو شینەوە درێژەیان بە سووڕانەوەی خۆیان دا. پاشان ئەوانیش ملی ڕێگایان گرت و لە دووری وەك پارچە هەتاوێك لێرەو لەوێ درەوشانەوەو ون بوون. گەرما توندتری کرد، هەوا شەدار بوو، گیاوگۆڵ و دارو باڵندە هەموویان لەو گەرما شەدارە بەهاریەیە ڕۆچوون. هەورێك لە پەپوولە بە هەوادا بڵاو بووەوەو تێپەڕی. هەورێکی مێشەنگوینە وەك تۆفان هات و بەسەر

دارچنارێکی بەرزەوە نیشت. هەموو شتێك بۆنی تازەیی‌یەکی هەتاو لـێدراوی لـێدەهات، گوڵی تازەپشکووتووی هەتاو لـێدراو، گیاشینی هەتاو لـێدراو، خاکی تازەی هەتاولـێدراو. لەم گەرما هەڵماوی‌یەدا، خاکی ئاناوارزا کە دەت گوت هەر ئێستا پاك و خاوێن ئافەریدە کراوە بۆنی تازەیی لـێدەهات.

چاوی ئەو ئەسپە کە بێجووڵە بەسەر پێوە راوەستابوو، پڕ بوون لە مێشەڕەشکە، و بلۆقی سەر کەفەڵیشی لەنێو مێش و مەگەزدا ون بوون. پەپوولەیەك لەنێو یاڵی درێژو ئارەق کردووی ئەسپەکە هەڵنیشتبوو، باڵە شینەکانی لێك دەکردنەوەو وێکی دەنانەوە.

رەنگدانەوەی رووناکایی ئاوی گۆلاوی ئاکچاساز کەوتبووە سەر دیوی چەپی ملی ئەسپەکە. لە نەکاو بەهۆیەکی نەزانراو، ئەسپ جوولا، سەری راوەشاند، چەند جار جووتەی هاویشت، مێش و مەگەزەکەی لە خۆی دەرکردو لە لایەکی دەشتەکەوە بۆ لایەکەی دیکە دەخۆی نووسا. لە خوار وایوایەوە هەتا مەزراکانی "تارسووسلی" لینگی دا. ئەوەندە توندی غاردەدا کە لاقی نەدەبینران.

وەختێك ئەسپەکە لە زەوی‌یەکانی تارسووسلی تێپەڕی و گەیشتە دەوروبەری نارلیقشلا، ئێوارە دادەهات. ئاوی گۆلاوی نارلیقشلا لە پەستا کەفی دەکرد، هەڵدەقوڵی و بلقی دەدان. رەشمارێکی درێژو زەلام ئارام ئارام لەنێو مێرگەکەڕا دەهات بۆ قەراخی گۆلاوەکە. تازە لە کونێ هاتبووەدەرو هێدی هێدی سڕی و سستیی خەوی زستانی لە لەشی خۆی دەردەکرد.

هەتا لە تیشکی هەتاو نیزیکتر دەکەوتەوە پێستە رەشەکەی سەوزی دەکردەوەو دەدرەوشایەوە. مارەکە راست بە بن لاقی ئەسپەکەدا تێپەڕی، بە جۆرێك کە لەشی لە سمی ئەسپەکە درا. جانەوەرێکی باڵداری زەلام بە دەنگێکی لە گوێگرانەوە لە دەوروبەری سەری ئەسپەکە ـ کە لە پەنای دارێکی بەرهەتاو راوەستابوو ـ دەخولایەوەو خەرمانەیەکی دەکێشایەوە. ئەسپەکە هیچ مویالاتی پێ نەدەکرد. لە دوور، لە پشت ئاکچاسازەوە لە نەکاو بڵێسە ئاگرێك درەوشایەوەو کووژایەوە. لەم لەحزەیەدا ئەسپەکە هەروەك باڵی گرتبێ، خۆی هەڵاویشت. لاقی لێك کردنەوەو ملی راکێشاو پاشان هاتە سەر پاشووان و ئەمجار دەستی کرد بە غاردان و لە کاتێك دا خەرمانەی گەورە گەورەی دەکێشان، دەستی کرد بە سووڕان بە دەوری خۆی دا. پاشان هاتەوە جێی پێشووی راوەستاو چەند لەحزە بۆنی بە ئاسمانەوە کرد. دیسان جووڵەی لە خۆی بڕی بە جۆرێك کە دەت گوت ئەگەر هەردوو گوێی و تەنانەت گۆشتی لەشیشی لـێبکەیەوە، نیازی جوولانی نیە.

لەدووری، زۆر دوور، لەسەر جادەی "کووزان"ڕا پیاوێك بەرەو ئەسپەکە دەهات. ئەسپەکە ئەوی دی و بە دیتنی وی توند سەری ڕاوەشاندو وەك شێتان حیلاندی و کەوتە لینگدان. وا دەفڕی کە بەرزگی لە زەوی دەخشا. هەتا ڕۆژئاوا لینگی دا. خەریك بوو تاریك دەبوو ئەسپەکە بە زاری بەکەفەوە هەروا لینگی دەدا. لە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا تێپەڕی و ڕووی کردە لای دوومڵیقەڵا. لەوێ لە دەوروبەری گوندی حاجیلار لە دوورەوە تارمایی پیاوێکی دی کە بۆ لای دەهات. هەر بەو خێراییە گەڕایەوەو دەخۆی نووسا. چراکانی گوندی حاجیلار هەڵکرابوون. بە دیتنی چرایەکان بە حیلەیەکی مەرگ هێنەرەوە تارمایی شەق کرد. لای بەیانی بوو کە شەکەت و ماندوو گەیشتە تۆپراخ تەپە. لەبەر ئارەق و ماندوویی هێزی لەبەر بڕابوو، سنگی وەك کوورەی ئاسنگەران دەدەمی" توانای هەڵێنانەوەی تاقە هەنگاوێکی دیکەشی نەبوو. بەری بەیانی، لە یەکەم ڕووناکایی ڕۆژدا دیتیانەوە کە گوێی بەردابوونەوە، سەری شۆڕ کردبووەوە، لاقی چەپی بە بەرزگیەوە نووساندبوو و بێوازو حەبەساو و ترساو بوو.

ئەسپی حەسەنی یۆبازئۆغڵی بوو، ئەسپێکی ڕەسەنی عەرەبی" خەنەیی، ڕاکشاو، باریك و درێژو زەلام، خەنەییەکی مەیلەوڕەش، ئەسپی خەنەیی مەیلەوڕەش زۆر کەمەو هەر لەو کاتەدا بە جوانترین نەوعی ڕەگەزی خۆی دەژمێردرێ.

ئەم ئەسپە خەنەییە هەتا ساڵێك لەمەوبەر هی عەلیسەفابەگ بوو. ئەم ئەسپە، وەختێك کە جوانوویەکی دووبڕ بوو، دۆستێکی زۆر خۆشەویستی بە شەجەرەنامەوە لە ئۆرفەوە بۆی ناردبوو. شەجەرەنامەکە ئافەریم نامەیەکیشی لەگەڵ بوو کە باسی کردەوەی نائاسایی باب و باپیرانی ئەو ئەسپەی دەکرد. ئەم ئەسپە هەر کە هاتە ماڵی عەلیسەفابەگ کەوتە سەر زارو زمانان و ژمارەیەکی زۆر لە ئاغاکانی کووزان، ئەدەنەو تارسووس هەر بۆ چاولێکردنی بە میوانی هاتنە ماڵی عەلیسەفابەگ. هەربۆیە عەلیسەفابەگ زۆری ئەو ئەسپە خەنەییە خۆش دەویست.

عەلیسەفابەگ بۆ ئاگاداری و تیمارکردنی ئەو ئەسپە مەیتەرێکی پیری لە ئۆرفەوە بەکرێ هێنا کە لە ڕاگرتنی ئەو ئەسپە خەنەییانەدا ئەزموونێکی زۆری هەبوو. بە باوەڕی ئاغا ئەم ئەسپە لە ئینسانیش ئاقڵترو بەهۆشتر بوو. تەنیا نەیدەتوانی قسان بکا، چەند خۆش دەبوو ئەگەر زمانیشی هەبایەو قسەشی کردبان... ئەو لەهەموو نیازێك حاڵی دەبوو، لەبەرامبەر میهرەبانی و خۆشەویستی دا وەك دۆستێك و بەرامبەر بەناخۆشی و خەراپە وەك دوژمنێك دژکردەوەی بەرێ و جێی نیشان دەدا. وەختێك عەلیسەفابەگ خەمبار دەبوو، ئەویش خەمبار

دەبوو و چاوە زەلامەکانی کە وەك گابەردێك سەخت و لەشکان نەهاتوو بوون تۆزی خەم و خەفەت دایدەگرتن" ئەوکاتەش کە عەلیسەفابەگ خۆشحاڵ دەبوو، ئەسپەکە وەك تۆفانێکی خۆشی و شادمانی وەکەیف دەکەوت و لە چاوەکانی دا بریسکەی خۆشحاڵی دەدرەوشایەوە. عەلیسەفابەگ هەمیشە دەیگوت:"ئەوم لە گیانی خۆم خۆشتر دەوێ."

ئەگەر دارو نەداری خۆی لە کێشەیەك دا لە دەست دابایە، وەختێك سواری ئەو ئەسپە دەبوو، دەهاتەوە سەرەخۆو هەستی دەکرد دنیا هەمووی ئی خۆیەتی. وەختێکیش دەیبیستەوە کە دەیان گوت عەلیسەفابەگ تەنیا سوارچاکی ئەو ئەسپە خەنەیییەیە، سەرانسەری گیان و لەشی پڕ دەبوو لە خۆشی و لەزەت. ئەوینێك کە دەرهەق بەو ئەسپە هەیبوو، بۆخۆشی پێی سەیر بوو. هەمیشە بیری دەکردەوە:"کەوابێ ئەو خوێنە وەحشییەی تورکمەنان هەر بەو خێراییە کە لە دەمارەکانی باب و باپیرانم دا دەجوولا، هێشتا لە دەمارەکانی منیش دا دەجوولێ. بەڵێ. دەجوولێ. ئەسپی عەرەبی شەجەرەنامەیان هەیە، بۆ ئینسان ئەسڵ و نەسەب گرنگ نیە" لە جیاتی ئەوە، ئینسانەکان هێندێ تایبەتمەندیی دیکەیان هەیە، جیا لە تایبەتمەندیی ئەسپەکان. بەڵێ ئینسان ئەسپ نیە. ئەدی سەرچاوەی ئەو ئەوینە بێئەندازەیەی من دەرهەقی ئەم ئەسپە لە کوێیە؟"

ئاخرەکەی ڕۆژێك هات کە ئەوینی زەوی و ئەوینی ئەو ئەسپە کەوتنە ڕووبەڕووی یەکترو ئەو خوێنە وەحشییەی تورکمەنەکان کە لەدەمارەکانی دا دەبزووت، لەمل بەملە لەگەڵ زەوی دا تێك شکا. ئەو، پێویستیی بە پارچە زەوییەکی هەرچەند چووکیش لەنێو گوندی وایوای یان دەوروبەری وایوای هەبوو" پارچە زەوییەك کە بتوانێ ببێتە کلیلی زەوییەکانی گوندی وایوای. فەرمانبەری تاپۆی شار پاش ماوەیەکی زۆر هەوڵ و تەقەلا، پارچە زەوییەکی ئەوجۆرەی بۆ دۆزیەوە" زەوییەك کە سنوورەکەی دەیتوانی بە کەیفی خۆی باڵ ڕاهاوێ. لە هەمووش گرنگتر ئەوەبوو کە ملکەکە لەنێو گوندی وایوایدا بوو. زەوییەك بوو بە پانایی حەڤدە هەزار میتری چوارگۆشە کە ملکی حەسەنی یۆبازئۆغلی بوو. ئەگەر قەباڵەی ئەم زەوییەی هەبایە، دەیتوانی، پێنسەد، هەزار، هەزاروپێنسەد و تەنانەت پێنج هەزار هەکتار زەوی لەنێو گوندی وایوای زەوت بکا. عەلیسەفابەگ هەر کە لە بوونی ئەو زەوییە ئاگادار بوو، لە خۆشییان باڵی گرت. دەسبەجێ پێنسەد لیرە بەخششی دا بە فەرمانبەری تاپۆ. لە خۆشییان سێ شەو و ڕۆژان خەوی لێنەکەوت. بەیانیی ڕۆژی سێهەم ئاغا ناردی لە دوای حەسەنی یۆبازئۆغلی و پێی گوت:"حەسەن ئەو پارچە زەوییە بدە بە من!"

حەسەن دەسبەجێ وەڵامی دایەوە:"بە چاوان، ئاغا!"

"حەسەن! ئەمن و ئەتۆ لە باب و باپیرمانەوە دۆستین" بابمان پێکەوە دۆست بوون" بابی تۆو بابی من بێ پرسی یەکتر ئاویشیان نەدەخواردەوە. ئێمەش پێکەوە براین، پێکەوە خزم و خوێشین. ئەگەر نینۆکی تۆ بشکێ، هەروا بزانە دڵی من شکاوە حەسەن! گۆشت و نینۆك لێك جیا ناکرێنەوە..."

"بەڵێ، ئاغا!"

"بڕوانە! راستە ئەمن و تۆ پێکەوە دۆستین، براین، خزم و خوێشین، بەڵام برامان برایەتی و کیسەمان جودایەتی... بڵێ بزانم بۆ ئەو زەوییە حەڤدەهەزار میترییە چەندت بدەمێ باشە" یان لە جیاتییان چت لە من دەوێ؟"

"سلامەتییەکی سەری تۆم دەوێ ئاغا! هەمووی مستەگڵێکە، بستە زەوییەك قیمەتی چیە؟ سلامەتییەکی سەری تۆم دەوێ ئاغا! ئێستا کە پێت لازمە سبەینێ دەچین دەیخەینە سەر ناوی تۆ. ئێستا کە بابمان پێکەوە دۆست بوون، مستە خاکێك قیمەتی نیە! لە بەرامبەر دۆستایەتیدا زەوی پووڵە رەشکەیەکیش ناهێنێ، ئاغا! سەری تۆ سلامەت بێ، ئاغا! خوا راوەستاوت کا!"

عەلیسەفابەگ کە لە خۆشییان پێدەکەنی، گوتی:"نا، وانابێ. ئەگەر شتێکت نەوێ نابێ. لە جیاتییان کەم یان زۆر دەبێ شتێکم لێوەرگری."

حەسەن بە شەرمەوە سەری داخستبوو و هیچی نەدەگوت.

"نا حەسەن! ئەگەر وابێ، هەر نامەوێ. پێم بڵێ چیت دەوێ؟ لە پێش دا ئەتۆ شتێك بڵێ، دوایە بۆخۆم دەزانم چ دەکەم. شتێك داوا بکە، لە قرۆشێکەوە تا گایەك، بزنێك، مەڕێك، شتێك بڵێ... ئەسپێك..."

حەسەن سەری هەڵنەدەبڕی و ئەلف تا بێ قسەی نەدەکرد.

عەلیسەفابەگ لە دڵی خۆی دا گوتی:"یۆبازئۆغلی وەك کچێك بەشەرمە" وەك کچێك! سەری هەڵنایەنێ. تەماشام ناکا. هەرچەند گەیوەتە ئەم تەمەنە، بەڵام دیسان وەك کچی جحێڵ لە شەرمان رەنگان دێنێ و دەباو بۆ ئەوەی پارەم لێوەرنەگرێ، کێشەم لەگەڵ دەکا. دابی تورکمەنانە کە لە لای گەورەتر لە خۆیان زمانیان ناگەڕێ. بەڵام ئەمن دەبێ بە زۆر شتێکی پێ وەرگرم. ئەم کارە پێشی قسەو قسەلۆکی پاشەڕۆژ دەگرێ."

لە پشت ئەو زەوییە کە شتێك لە هەکتارو نیوێك زیاتر بوو، زۆر بەرنامە خەوتبوون. بەخۆڕایی وەرگرتنی ئەو زەوییە کارێکی دروست نەبوو.

عەلیسەفابەگ بە گەرمترین و میهرەبانانەترین دەنگ گوتی:"جواب بدەوە یۆبازئۆغلی، قسە بکە! چاوەڕاستەکەم، براکەم، بلێ، باشترین کەس و کارم، قسە بکە. ئەو پیاوەتیەی تۆم هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. دەسپێرم ئەو چاکەیەت لەسەر بەردی قەبرەکەشم بنووسن. ئێستا قسە بکە!"

یۆبازئۆغلی سەری هەڵبڕی. چاوەکانی بریسکەیان دەدا. روخسارە چووکەلانەکەی وەك روخساری منداڵێکی قوماربازی لێهاتبوو کە بیهەوێ زۆڵەتیەك بکا. دەت گوت دەیەوێ بلێ:"دەزانم چۆنت پێدەفرۆشم!..." کاتێك یۆبازئۆغلی سەری هەڵێنا، عەلیسەفابەگ خۆشحاڵ بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:"سەرەنجام کوڕەکە رام بوو. روخساری وەك منداڵێکی حەوت ساڵەیە. ئەوەندەی ئەمن بزانم دەبێ تەمەنی زۆر بێ. لانی کەم هاوتەمەنی خۆمە."

ئێستا حەسەن بە شەرمێونی زەردەی دەهاتێ. بەڵام لەحزەیەك چاوی لە چاوی عەلیسەفابەگ وەرنەگێڕا:"ئاغا، ئێستا کە هەر پێ دەچەقێنی..."

"ئەرێ، زۆر پێ دەچەقێنم، حەسەن... ئەگەر لە جیاتیان شتێك وەرنەگری، خوا دەزانێ زەوییەکەم ناوێ. زەوی کە هیچ، زێڕیش بێ نامەوێ."

"ئاغا ئێستا کە هەر پێ دادەگری..."

ئاغا هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشاو بە راوێژێك کە دەت گوت بارێکی قورسیان لەسەر شانی لابردوە، گوتی:"بلێ حەسەن! قسە بکە، گیانەکەم! هەرچی دەتەوێ بلێ!"

"ئاغا، ئەمن ئەسپە خەنەییەکەتم دەوێ، یان ئەسپەکە، یان هیچ! ئەسپەکەم بدەیەو زەوییەکە بۆ تۆ. بەڵام رەخت و زینی تایبەتیی خۆشتم دەوێ."

ئاغا رەنگی پەڕی، بەڵام قسەی نەکرد... لە راستی دا زمانی گیرابوو. سەرەنجام توانی بلێ:"ئاوا حەسەن! کەوابێ، ئەسپە خەنەییە عەرەبییەکەمت دەوێ!"

حەسەن هەستایە سەرپێ و گوتی:"ببوورە ئاغا، یان ئەسپەکە یان هیچ." و بێ ئەوەی ئاوڕ وەدوای خۆی بداتەوە ملی رێگای گرت و رۆیشت.

پاش رۆیشتنی وی ماوەیەکی پێ چوو هەتا ئاغا هاتەوە سەرخۆی. بەڵام لە رقان شێت ببوو. لە پێشخانەکەدا دەهات و دەچوو و رادەوەستا. فکری دەکردەوە. داواکەی یۆبازئۆغلی هێند گرانی بۆ تەواو ببوو کە ئەگەر لەو کاتەدا وەدەستی کەوتبایە لەت وکوتی دەکرد. دەستی کرد بە نەڕاندن:"منداڵێکی لادێیی، تووتکەسەگێکی لادێیی، چۆن دەوێرێ داوای ئەسپی من بکا، چۆن، چۆن؟ چۆن دەوێرێ، بە چ روویەکەوە دەتوانێ قسەی وا بکا؟"

چەند رۆژێك هەروا تووڕە بوو. چەند رۆژێك لە رقان ئارام و ئۆقرەی لـێهەڵگیرابوو. ژمارەیەك لە پیاوماقووڵانی شار کەوتنە نێوان. ئاغاکانی دێهاتی دراوسێ نێوبژیـیان کرد، هەموو لێکرا بوونە تکاکار. عەلیسەفابەگ پووڵێکی زۆری بە حەسەن پێشنیار کرد. چەندین هەکتار زەویی لە جێگای جۆراوجۆر وەپێش کرد. بەڵام حەسەن پێی لـێدەکەوشێ کردو گوتی:"یان ئەسپی خەنەیی ئاغا، یان هیچ شتێك!"

عەلیسەفابەگ هیچ چارەی دیکەی بۆ نەمابوون" رۆژێکیان بەیانی ئەسپەکەی بە زین و رەختی گوڵدۆزی و زیوکاری کراوەوە ناردە دەرکی حەسەنی یۆبازئۆغلی و ئەو رقەی لە حەسەنی یۆبازئۆغلیی داگرتبوو، چەند بەرابەر زیادی کرد. دوو رۆژی پێ نەچوو کە تاپۆی زەویـیەکەش بەناوی عەلیسەفابەگ کرا.

هەرکە قەباڵەکە کەوتە دەستی عەلیسەفابەگ، لە پێش دا پێکەنی و پاشان لە حاڵێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن، بە چاوێکی پڕ بڵێسەوە تەماشای گوندی وایوای و حەسەنی یۆبازئۆغلی و دێهاتیـیەکانی کردو گوتی:"ئێستا ئیدی لە دەستم دەرناچن! ئێوە ئەسپەکەم، ئەسپێك کە لە گیانی خۆم خۆشتر دەوێ، لە من دەستێنن؟ ئەسپم لە دەست دەردێنن هەتا ئەو بێچووە قەرەجە وەك کوڕی بابی خۆی سواری بێ؟"

حەسەن و دێهاتیـیەکانی دیکە نەیان دەزانی کە ئاغا بۆچی وا رقی هەستاوە، ترسیان رێ نیشت. بەڵام ئەو ترسە رێگای هیچ پێشهاتێکی نەگرت. حەسەن، پاش وەرگرتنی ئەسپەکە شار بە شارو دێ بە دێ وەڕێ کەوت و گەیشتە هەر جێیەك گوتی:"ئەمە ئەسپی عەلیسەفابەگە. زەویـیەکی بێ ئاو و گیای دوو هەکتاریم دا بەو نەفامەو ئەم ئەسپەم لـێوەرگرت."

یۆبازئۆغلی، پاشان بەرە بەرە شووی لـێهەڵکێشا:"کابرا بۆ ئەو شۆرەکاتە دووهەکتاریـیە ئەسپەکەی هیچ، حازر بوو ژنەکەشیم بداتێ. زۆرم پیاوەتی لەگەڵ کرد کە لە جیاتی ژنەکەی داوای ئەسپەکەم کرد. کەسێك حازر بێ ئەسپەکەی بدا، ژنەکەی نادا؟ تۆخوا، بە ویژدانتان بڵێن راست ناکەم؟" بە سووکایەتی و گاڵتەی جۆراوجۆرەوە عەلیسەفابەگی دەکردە گەپجاڕی خەڵك. عەلیسەفابەگیش هەموو رۆژێ ئەم قسانەی دەبیستنەوەو شێت تر دەبوو. چەندین جار بە پیاوەکانی خۆی دا وەڵامی بۆ حەسەن نارد کە پێی بڵێن:"ئاگای لە زاری خۆی بێ" ئەگەر دەمی لێك نەنێ، دەزانم چۆنی پێ لێك دەنێم!" حەسەن مێشێکیشی لـێ میوان نەبوو.

"هیچ زاری خۆم نابەستم. ئەمن لە خۆی کە هیچ، لە فریشتەکەی سەرشانیشی ناترسم، هەرچی لە دەستی دێ کۆتایی نەکا. لەچاك و پیرەکانیشی ناترسم. با بزانم چ پیاوێکە! چەتەیەکی هەیە ناوی کالاییجییە. ئەگەر کێویش بێ باکم لێی نیە. چما ئەو بۆ پارچە زەوییەکی دووهەکتاری، بۆ کوتە کاغەزێك، بۆ مستە خاکێکی مەزرا ئەسپێکی وا جوانی نەدا؟ پیاوی وا لە کن من قیمەتی پوولە رەشکەیەکی نیە، ئەگەر ویستی بم کوژێ، با بمکوژێ، باکم نیە، وابزانە سەگێك لەت و پەتی کردووم. پارچە کێلگەیەکی دیکەشم هەیە بە قەبالەوە، سالێکی دیکە ئەم دووانەش دەدەم و ژنەکەی عەلیسەفابەگ وەردەگرم و سواری پاشکۆی ئەم ئەسپە عەرەبییەی دەکەم و دێ بە دێ دەیگێڕم. با بم کوژێ، ئەو لە لای من تۆزقالێك ئابڕووی نیە.

رۆژێکیان کاتێك حەسەن بە دڕووەلان دا تێدەپەڕی، پێنج جار تەقەیان لێکرد، بەلام وەبەر نەهات" چونکە سواری ئەسپ بوو و ئەسپەکە وەك با بۆی دەرچوو. گوللەکانی وێ نەکەوتن" چونکە حەسەن هەمیشەو لە هەموو جێیەك زۆر توند ئەسپی لینگ دەدا. چەند جاری دیکەش دەسرێژیان لێکرد" دیسان زیانێکی پێ نەگەیشت. وەك با بەنێو لافاوی گوللەکان دا تێپەڕی و رۆیشت. ئەم پێشهاتانە چووکترین شوێنەواریان لەسەر رەفتاری دانەنا، بگرە خەراپتریان کردو ئێستا ئیدی لە هەموو شوێنێك، لە شین و شادی دا بێپەردە قسەی دەکرد.

بردیانە مەخفەری پۆلیس، هێندیان لێدا خوێنی بە زارو تفنکان دا دەهات. پاش ئەوەی لە مەخفەر گەڕایەوە پازدە رۆژی تەواو خوێنی میست" بەلام دیسان گۆڕانێك لە ئاکارو کرداری دا پێك نەهات. دەیگوت:"ژنەکەشی دەکرم. درەنگ یان زوو ژنەکەشی دێنم" لە پاشکۆی ئەسپی عەرەبیم سواری دەکەم و کوێستان بە کوێستان دەیگێڕم، ئێستاش قەبالەی زەوییەکی دیکەم هەیە."

سێ جاریان ئەسپەکە دزیەوەو هەموو جارێ حەسەن دەچوو دەیدزیەوە:"تازە ئەگەر ئەسپەکەشم بمرێ پێم هیچ نیە. چما ئەسپێك کە لە گیانی خۆی خۆشتر دەویست نەی دا بەمن؟ چما وەختێك ئەسپەکەی دەدا شەرەفیشی نەدا؟ چما بە مردنی ئەسپەکە، شەرەفی دێتەوە جێیخۆی؟"

ئاسمان خەریك بوو رەنگی لاجیوەردیی بەخۆیەوە دەگرت و ئەستێرەکان لە ئاسمان رادەخزین، دەت گوت دەیانەوێ برژێنە سەر زەوی. ئەسپی خەنەیی پڕمە پڕمی دەهات، لینگی دەداو جاروبار رادەوەستا، تاوێکی چاك بۆنی بە ئاسمانەوە دەکردو ئەودەم لە خەرمانەیەکی گەورەدا بە

دەوری خۆی دا دەسوورا. مەیدانێکی بە قەدەر جێخەرمانێك لە بن پێی دا دەشێلراو گیاوگۆڵ و جڕوجانەوەرەکانی دەپلیشانەوە.

ئەسپی خەنەیی پاش سووڕانێکی زۆر، لەگەڵ ئەستێرەیەك چووە نێو نێرگزجاڕی ئاکچاساز. نێرگزجاڕەکان دەگەیشتنە نێوقەدی ئەسپەکەو لە هەوای مەیلەو گەرمی بەهاریدا، بۆنێکی قورسیان بڵاو دەکردەوە. ئەستێرەیەکی گەورە کە بە پرپشك هاویشتن بە ئاسمانەوە دەخزی، شۆقی خستە سەر کەفەڵی رووتی ئەسپەکە. مووی کەفەڵی پان و بەهێزو هەوەس بزوێنی بوونە نەشتەر. ئەسپی خەنەیی خۆی بە ئاوی زوڵاڵی گۆلاوی ئاکچاسازدا دا. لەسەر ئاوەکە لەیلوپەڕی درشتی رەنگ شین بە گەڵا پانەکانیانەوە مەلەیان دەکرد.

## (٦)

وەختێك لە دەرکەیان دا، عەلیسەفابەگ لە نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەکەی خۆی دا بەدڵەخورپەوە چاوەڕوان بوو.

ئەو دوو پیاوەی لە ئەسپ دابەزیبوون، هەموو ئەندامی لەشیان قوڕاوی بوو. ئەسپەکانیشیان نوقمی قوڕو زەلەق بوون.

عەلیسەفابەگ بە پەلە رایکردە خوارێ و گوتی:"خەبەر چیە؟ سووتمانەکەم دی. جوان دەسووتا. خەبەری حەسەنی چیە؟ خەبەری ئەسپەکەی چیە؟"

مورتەزا گوتی:"کاتێك ئادەم لەدەرگای دا، حەسەن دەرگاکەی کردەوە. وانەبوو ئادەم؟..."

ئادەم کە ئەندامێکی وردو پەیکەرێکی خواروخێچی هەبوو، وەڵامی دایەوە:"ئەرێ، راستە." "پاشانیش بە ئادەمم گوت وەلاکەوە. ئادەم وەلا کەوت و هەر کە ئەو کشایەوە پێنج گوللەم لە حەسەنی دان. وانەبوو ئادەم؟"

ئادەم سەری لەسەر ملە خوارەکەی راست کردەوەو گوتی:"با!"

"... حەسەن کەوتە سەر زەوی، وەك گا دەیهۆڕاند. دەسبەجێ دەرگام لەسەر داخست. وانەبوو ئادەم؟..."

"بەڵێ، دەرکەی لەسەر پێوەدا."

مورتەزا لەسەری رۆیشت:"... ئەمن ئەو پەڕۆ کۆنە نەوتاوییانەی بەدەستمەوە بوون، ئاگرم دان. نیوەیانم لەسەر دەرگاکە راکردو نیوەکەی دیکەم لە بن میچی خانووەکە ڕاکرد. لە پڕێك گڕی ئاگر بەرز بووەوە. پاشان چوومە تەویلەکە. دەرگای تەویلەکەشم ئاور تێبەردا. گڕ چووە ئاسمان. ئەسپەکە لە ژووری تەویلەدا دەیحیلاند. با لێی دا، بڵێسەکان لەشەودا بڵاو

بوونەوە. دێهاتی‌یەکان بەم لاو بەولادا رایان دەکردو هات و هاواریان وەڕێ خستبوو. ئێمە بۆی دەرچووین. سێ‌کەس هەتا قامیشەڵان وەدوامان کەوتن. ئەسپەکە لەنێو تەویلەدا وەك شێتان دەی‌حیلاند. وا دەی‌حیلاند دەت گوت دەپاڕێتەوە. حیلەکەی دڵی بەردی دەکرد بە ئاو. ئەو سێ کەسەی وەدوامان کەوتبوون هەتا پەنای قامیشەڵانەکە هاتن، نەیان وێرا وەنێو کەون، سێ گوللەشمان لەو سێ‌یانە خەسار کرد. وانەبوو ئادەم؟..."

ئادەم گوتی:"بەڵێ راستە. سێ گوللەکە ئەمن لێم خەسار کردن. بەلام شەو بوو، دنیا تاریك بوو، وێ‌یان نەکەوت."

مورتەزا گوتی:"... ئەسپەکە وای دەحیلاند کە دەنگی دەگەیشتە دەشتێ. دەنگی ئێستاش لە گوێم دا دەزرینگێتەوە. وەختێك دەسووتا، دەگریا..."

ئادەم هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:"سووتا، بەستەزمانە سووتا" راست وەك بنیادەم دەگریا. پیاو زگی پێی دەسووتا... ئێمە خۆمان بە قامیشەڵان دا کردو گیانمان دەربرد. پاشان گوێمان لە حیلەیەکی زۆر درێژی ئەسپەکە بوو" دەت گوت قەت لێی نابڕێتەوەو دەت گوت نیازی هەیە سێ شەوو رۆژان بحیلێنێ. بەلام لە نەکاو بێدەنگ بوو."

عەلی سەفابەگ حاڵەتێکی خەمناك و قیناویی بەخۆیەوە گرت:"با بسووتێ! با بسووتێ و ببێتە خۆڵەمێش، ئەو ئەسپە!"

پاشان هەناسەیەکی رەحەتی هەڵکێشا:"یاڵلا! بچن ئەسپەکان بشۆن، جلەکانتان بگۆڕن. زەینەڵ لە کوێ‌یە؟ خەبەری راست و دروست لەلای ئەوە. هەتا ئەو نەیە هیچ ساغ نابێتەوە."

ئەو دووانەش دووپاتیان کردەوە:"هیچ ساغ نابێتەوە"و وەڕێ کەوتن.

هەتاو هەڵکشیبوو. ئارام ئارام هەڵم لە زەوی هەڵدەستا. باڵندەکان لە قاووقیژ کەوتبوون. شوێنی تایەیەك لەسەر گیاشینی ئاناوارزا درێژەی هەبوو. دێهاتی‌یەك تەویلەی دەردەداو یەکی دیکە کە سەربەرگێکی خوریی قاوەیی ئەستووری لەبەردا بوو، ئەسپێکی ڕەش کوێتی شاڵ و ڕنەك دەکرد.هەورێکی پەپوولە بە درەوشانەوەی رەنگەکانەوە کەوتە فڕین، لەپێش ئەو دووانە نیشتەوەو پاشان هەستا رۆیشت. لە بەردەڵانە شینەکانی ئاناوارزا کە سەربەرگێکی مژی سپی‌یان بە خۆدا دابوو، هەورێکی شین و ساف بەرەو ئاسمان بڵیند بوو.

مورتەزاو ئادەم پاش ئەوەی سەروگوێلاکی خۆیان رێك و پێك کرد، هاتنەوەو بێ‌ئەوەی قسەیەك بکەن، رووبەرووی ئاغا دەستەونەزەر ڕاوەستان و لە قسوورێك کە لەوانەبوو تووشی هاتبن دەترسان و بێ‌ئەوەی تەماشای روخساری ئاغا بکەن، سەریان داخستبوو. عەلی‌سەفابەگ

لەسەر ئەو نیوتەختە کە قالیچەی تورکمەنیی لەسەر راخرابوو و جاروبار لەسەری دادەنیشت، هەستابوو، و لە حالێك دا قەمچیەکەی لە لاسکی چەکمە چین دارە زەردەکانی رادەکێشا، بە رق هەستاوی و بێئارامی ئەم سەر ئەوسەری ژوورەکەی دەپێوا.

مورتەزا گوتی:"بڕوانە ئاغا! ئەوەی لە خوارەوە دێ، زەینەڵ نیە؟"

ئاغا دەستی بۆ چاوی کردە سێبەرو ڕوانی. لە بەرەوە زەینەڵیدی کە لە دڕدووکەکان دەهاتە سەرێ. نێوچاوانی کرایەوە. گوتی؟"زەینەڵە. یانی ئەسپەکە چیی بووە؟"

مورتەزا بە راوێژێکی سەرکەوتووانەوە، گوتی:"ئەسپەکە مرد، وانیە ئادەم؟"

"بەڵێ، مرد. تەنانەت ئێسکەکانیشی بوونە خەلووز. داوە موویەکیشی نەماوە."

تاوێك دواتر، زەینەڵ بە هەناسەبڕکەو ڕەنگی پەڕیو و لیچ و لێوی داچۆڕاوەوە گەیشتە جێ. لاقی بە ئاشکرا دەلەرزین.

عەلیسەفابەگ کە نەختێك تێك چووبوو، گوتی:"ڕۆڵە زەینەڵ وەرە دانیشە! دانیشە بحەسێوە!" و بە ڕوانینێکی پڕ لە پرسیارەوە لە روخساریەوە ڕاما. خەریك بوو سەبرو حەوسەڵەی تەواو دەبوو. چەنەگەی خواروخێچی زەینەڵ بە جارێك یەك لا ببوو، بە جارێك بەلای راستی دەم و چاوی دا خوار ببوو.

"مورتەزا، هێندێك ئاو بۆ زەینەڵی بێنە با بێخواتەوە نەختێك بێتەوە سەرەخۆ."

زەینەڵ دانیشت. مورتەزا ئاوی هێنا. زەینەڵ وەختێك پیاڵە ئاوەکەی وەرگرت، دەستی لەرزی و ئاوەکە ڕژا.

"زەینەڵ، بلێ بزانم چ بووە، ئاخرەکەی؟"

زەینەڵ گوتی:"هیچ نەبوو. هیچ شتێك نەبوو، تەنیا ماڵ و تەویلەو کادێنی حەسەنی سووتان. هیچ نەبوو."

"بۆخۆی چی؟"

"لووتیشی لە خوێن نەهات!"

"ئەسپەکە چی؟"

ئەسپەکە خەریك بوو بسووتێ. دەرگای تەویلەکە پێوە درابوو. حەسەن ئەسپەکەی نەجات دا. هێندەی نەمابوو لەسەر ئەسپەکەی، خۆشی بە سووتان بدا. خۆی لە تەویلە ڕاکرد کە نوقمی ئاگر بوو. ئەسپەکەی هێنایە دەر."

"دێهاتییەکان چۆن بوون زەینەڵ؟ ترسابوون یان نا؟ سام گرتبوونی یان نا؟"

"ترسانی چی، رەق ببوون" وەك داری بێگەڵا لە جێی خۆیان وشك ببوون. سامێك دێیەکەی داگرتبوو کە ترس تەنانەت کاری کردبووە سەر زەوی و دارو بەرد و تەیری ئاسمانیش. هەناسە ڕاوەستابوو."

"ئا...خ حەیف، ئەسپەکە نەمرد! بەڵام ئەوە کە دێهاتی‌یەکان ترساون، زۆر باش بوو، زۆر..."

"تەنیا یەکێکیان، وەسمانەزلە، دەت گوت مێشێکی لێ‌میوان نیە. قەلنەکەی بە لالێوی‌یەوە نابوو و دووکەڵی بە بادەکرد. قژقژ پێ‌دەکەنی."

"دیسان دەیەوێ ئۆینان دەربێنێ؟ یانی ئەتۆ دەڵێی نایەتە لای ئێمە؟ نایە قسەمان لەگەڵ بکا؟ ها زەینەڵ؟"

"ئەمن باشی دەناسم. لیباسەکانی گۆڕیبوون. دەمانچەی ساچمەزەنی هەزار ساڵ لەمەوبەری لە قەدی بەستبوو. شتێکی لەبن سەریەوە هەیە، بەڵام جارێ کەس سەری لێ‌دەرناکا."

"لەوانەشە خەرفابێ. لەمێژە ئەمەنی لە هەشتا تێ‌پەڕیوە، جارێ با ڕاوەستێن بزانین دەبێتە چی؟"

زەینەڵ گوتی:"ئەقڵم نایبڕێ هیچ خەرفابێ. وەك هەورێکی ڕەش لە نێو دێ‌دا دەهات و دەچوو. هات لەپێش من ڕاوەستا. لەبەری پێم هەتا تۆقی سەرم لێم ورد بووەوە. بە باقە، دووکەڵی قەلنەکەی بە بادا کرد. سێ جار لاقی بەزەوی‌دا دا. ئەو خەبەرێکی هەیە، خەریکە خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکا. سێ رۆژ لەمەوبەر وانەبوو" لەترسان وەك مردووانی لێ‌هاتبوو. لاقی بەدوای خۆی دا ڕادەکێشان."

عەلی‌سەفابەگ گوتی:"ئەم زەوی‌یانە هی ئێمەن. پێی دەوێرین. وەسمانەزلەش هەر ئۆینێك پێی خۆشە، با دەری‌بێنێ. ئەمن دەسەڵاتم هەیە. هەم دەسەڵاتم هەیەو هەم هەقم بەدەستە. تەنیا یەك شتم پێ‌خۆش نەبوو، ئەویش دەرچوونی ئەسپەکەیە کە وەك داخێك لەسەر دڵم ماوە. دەبێ ئەسپەکە وەبینی و بە تفەنگ لێی بدەی."

ئادەم گوتی:"ئاغا، ئەمن کۆنە ڕاوچیم. ئەسپەکە لەبن بەردیش بێ، بە دووڕۆژ دەی‌بینمەوە و دەی‌کوژم، یان دەی گرمەوەو دەی دەمەوە دەستی جەنابت."

"مەی هێنە لای من! بە تفەنگ بی‌کوژە. هەتا ئەو ئەسپە نەکوژی، نەیەوە ئێرە! یاڵڵا بڕۆ ئەو ئەسپە بکوژە، بە تفەنگ بی‌کوژە با ئەویش لە کۆڵ بێتەوە."

زەینەڵ گوتی:"ئەمن نەخشەیەکی باشم هەیە. کارێك دەکەم کە دێهاتی‌یەکان ماڵ و ژیانی خۆیان بەجێ بهێڵن و هەتا دەریای مەڕ مەڕە ڕابکەن و تەنانەت ئاوڕیش لەدوای خۆیان نەدەنەوە! وا دەکەم لەترسان زراویان بتۆقێ."

عەلی‌سەفابەگ گوتی:

"زەینەڵ، ئەتۆ هەمیشە نەخشەی باش دەکێشی! هەموو کارێکت لەدەست دێ! ئەتۆش ڕۆژێك دەبی بە خاوەنی مەزرایەکی چووکەڵەی جوانکیلەی بەرێژەو. ئێستا وەرە نانەکەمان بخۆین، پاشان باسی نەخشەکەتم بۆ بکە."

زەینەڵ گوتی:"بە چاوان. زۆر باش بۆتان شی دەکەمەوە."

# (٧)

خەڵکی ئاوەدانی بە بێدەنگی بەرامبەر بە ماڵە دامردووەکەی حەسەنی یۆبازئۆغلی دانیشتبوون، سەریان داخستبوو و سەرو لەشیان شەونمی لەسەر کەوتبوو. خەڵکەکە لەسەرمان کوشم هەڵاتبوون. کەس لە جێی خۆی نەدەبزووت" هەموویان دەتگوت قالبە سەهۆڵن.

هەتاو کەوت، هەتاوێکی پرشنگدار و شادی بەخش. پەلەوەری دەشتێ یەك دەنگ دەستیان کرد بە خوێندن، و مێشەنگوینە بە باڵە ناسکەکانیان بە وزە وز کەوتنە هەڵفڕین و گەڕان. لە چەند ماڵی دووری ئاوایی دەنگی منداڵی ساوا بەرز بوو، و بە دوای ئەودا چەند منداڵی چووکەڵەش بۆیان ئەستاندەوەو گریان. ڕاست لەو کاتەدا لە پشت دووکەڵی خانووە سووتاوەکەوە دوو جەندرمە دەرکەوتن، کە سێبەری درێژیان بەدوایان دا ڕادەکشا. هاتنە پێش و پاش ئەوەی سلاویان لە ئاپۆرا بێدەنگەکە کرد، یەکێکیان گوتی:

"وەکیل باشی، حەسەن یۆبازئۆغلیی دەوێ، هەر ئێستا."

"سەیفەلی" بەو دەم و چاوی لەڕو تێك تەپیوەوە کە هەمیشە گریانی پێوە دیار بوو، هەستاو گوتی:

"فەقیرە ماڵەکەی سووتا. ئێستاش دووکەڵی لێ‌هەڵدەستێ. سووتاو بوو بە خۆڵەمێش."

پاشان ملی وەك گوڵە شللێرە بە لاوە ناو گوتی:"بڕوانە براله، هۆوێ ببینە، خوا پێی خۆشە؟ تەنانەت حەیوانەکانیشی سووتان. تەقەیان لە خۆشی کرد. زۆری نەمابوو منداڵەکانی، ژنەکەی و ئەسپەکەی، ئەو ئەسپە عەرەبییە جوانەشی ببنە خەڵووز. با بچێتە لای وەکیل باشی دەردی خۆی بڵێ. بەڵکوو وەکیل باشی بتوانێ دەردی دەرمان بکا. تەنانەت ڕۆن و بڕوێشەکەشی سووتاو لەبەین چوو. مریشك و کەڵەباب و نوێنەکانیشی بوونە خۆڵەمێش،

بڕوانن ئێستاش دووکەڵیان لێهەڵدەستێ. با وەکیل لێی بپرسێ کە کێ فەرمانی داوە ماڵەکەی بسووتێنن؟ کەس نیە بزانێ ماڵێ حەسەنی یۆبازئۆغڵی بە قسەی کێ سووتاوە. حەسەنی هەڵگرن، لەگەڵ خۆتانی بەرن. چاك بوو هاتن. ئەسپە عەرەبیەکەی خەریك بوو بسووتێ. یۆبازئۆغڵی خۆی بە ئاورەکە دا کردو نەجاتی دا. ئەسپەکەش گیانی دەربردو سەری خۆی هەڵگرت و چووە بیابان. ڕۆیشت و ڕۆیشت."

یۆبازئۆغڵی لە حاڵی سڕی و سەرسوڕماوی هاتەدەرو لە جێی خۆی هەستا. هەڵمێکی نەرم لە پشتی هەڵدەستا. چوو بۆلای جەندرمەکان. یەکێك لە جەندرمەکان بە پەلە کەلەپچەیەکی لەو جانتایە کە لە ملیدا بوو دەرهێناو دەستی حەسەنی یۆبازئۆغڵیی لە کەلەپچە کرد.

سەیفەلی پرسی:

"ئەوە چ دەکەن؟"

جەندرمەکە بە تووڕەیی گوتی:

"موختار ئەتۆ خۆت لەم کارە هەڵمەقوتێنە."

سەیفەلی گوتی:

"ئەمنیش لەگەڵتان بێم؟ بێم؟"

جەندرمەکە نەڕاندی:

"نا، پێویست نیە. خۆ ناچینە سەر شایی کە ئەتۆش بێی."

یۆبازئۆغڵییان وەپێش خۆیان داو وەڕێ کەوتن. بەنێو کێڵگە ساواکان دا ڕۆیشتن و گەیشتنە جادە خۆڵەکە. خەڵکە بێدەنگەکە هەتا حەسەنی یۆبازئۆغڵی لە چاویان نەدیو بوو لە پشتەوەڕا تەماشایان کرد. لەو بەیانیە گەرمە بەهاریەدا لەشی خەڵکەکە هەڵمێکی لێهەڵدەستا کە بۆترشی ئارەقەی لەشی لێدەهات.

وەکیل باشی پێشوازیەکی خەراپی لە یۆبازئۆغڵی کرد. کەفی هەڵدەخڕاندو وەك وەحشیان دەیئەڕاند:

"نە ڕێز دەناسن، نە حورمەت. نە لە ئینسانەتی حاڵی دەبن، نە لە برایەتی! نە گەورەیی دەزانن چیە، نە چووکەیی! نە ئاغا دەخوێننەوە، نە کوێخای. نە خوای دەناسن، نە پێغەمبەرو نە لە جەندرمە دەترسن و نە لە حکوومەت..."

وەکیل باشی بێئەندازە تووڕە بوو. لە ڕقان دەلەرزی و ددانی لە چیرەوە دەبردن. سەرو چاو و زگی یۆبازئۆغڵیی دابووە بەر مست و پێلەقە. یۆبازئۆغڵی جینگڵی دەدان. وەکیل باشی بەو

دەستە زەلامانەی پشت ملی حەسەنی گرت و لەگەڵ خۆی بردیە ژوورێکی چۆڵی مەخفەرو دەسبەجێ جەندرمەکانیش بە دوای دا هاتن و باتوومەکەیان دایە دەست.

وەکیل باشی بێ ئەوەی گوێ بداتە سەرو چاو و پشت و زگ بە هەموو توانایەوە بە باتووم بەر ببووە گیانی ئەو پیاوە کە لە بن پێی دا جینگڵی دەداو دەی‌ناڵاند. لە حاڵێك دا لەگەڵ هەر زەبرێك هارتر دەبوو، دەی‌گوت:

"ماڵەکەت دەسووتێنی! بە دەستی خۆت ئاور لە ماڵێ خۆت بەردەدەی، بەڵێ؟ بە فکری خۆت فێڵمان لێ‌دەکەی؟ ئەرێ؟ هەتیوە ولاغە! ئاخر چ کەرێك بە دەستی خۆی ئاور لە ماڵێ خۆی بەردەدا؟ هەتیوە ولاغە چما مێشکت جوولاوە. پێت خۆشە لێرەوە مەخفەر بە مەخفەر بت نێرمە شێتخانە؟ ها... ئەگەر لەو ماڵەدا ژن و منداڵەکەشت سووتابایە، نەدەچوویە بن دار؟ چت هەیە بڵێی؟ بۆ لاڵ بووی؟ ماڵەکەتت بۆ سووتاند؟ ئەگەر لەم ولات و دێهاتانەدا ئەوانی دیکەش چاو لە تۆ بکەن و خانووەکانیان بسووتێنن، ئاخری کاری ئەم ولاتە چ دەبێ. دە بڵێ. بڵێ چ دەبێ؟ بە ئاگردانی ماڵەکەت دەتەوێ ئەو میللەتە فێری سەك و سەگبابی بکەی؟"

وەکیل باشی بە روخساری سوورهەڵگەڕاو و داگیرساوەوەو بە ئارەق رشتن ئەوەندەی لە یۆبازئۆغڵی دا کە بۆخۆی هەناسەی لێ‌بڕا. پاشان باتوومەکەی بۆ ئەو جەندرمەیە ڕاداشت کە لە رووبەڕووی وەستابوو، و پێی گوت:

"بگرە، ئێسکی لەشی بهارە. ئەمانە خەریکن دەبنە نموونەیەکی خەراپ بۆ دێهاتی‌یەکان. رۆژێك دێ ئەمانە لەپێش ئاغاو خواو حکوومەت راوەستن. لێی دە، توخوا لێی دە! بە شمشێرت سوێند دەدەم لێی دەو لێی‌دە. لێی دەو لێی دە. لێی‌دە با ئەمانە ئەدەب گرتوو بن و ئیدی نەوێرن ماڵێ خۆیان بسووتێنن و ژن و منداڵیان ئاور تێ‌بەردەن. لێی دە، لێی دە، با رێگای سەك و سەگبابی بە خەڵکی دیکە نیشان نەدا. لێی دە، لێی دە!"

جەندرمەکەش دەستی کرد بە لێدانی، راست وەك وەکیل باشی. لێی دەداو دەی‌ناڵاند. ددانی لە چیڕەوە دەبردن و بە روخسارێکی داگیرساوەوەو بە زاراوەی تەڕابوزانی دەی‌گوت:

"هەتیوە تووتکە سەگە، ئاخر چ کەرێك بە دەستی خۆی ماڵێ خۆی، تەویلەی خۆی، ئەو ئەسپە عەرەبی‌یە لە گوین ئاسکەی، لەگەڵ ئەو منداڵە جوانانەی ئاور تێ‌بەردەدا؟ هەتیوە سەگبابە، سەگباب..."

یۆبازئۆغڵی بێدەنگ بوو. دەت گوت لە تەرمێکی بێ‌گیان دەدەن. جەندرمە تەڕابوزانی‌یەکەش ماندوو بوو.

جەندرمەی سێهەم باتوومەکەی وەرگرت. یۆبازئۆغلّی بێهۆش بوو. هەموو لەشی سڕ ببوو، خوێنی لە زاری دەهات. دەست و لاق و پشتی خوێنیان لێدەچۆڕا. هەموو لەشی خوێنی لێدەچۆڕا.

وەکیل باشی فەرمانی دا:

"ئەم سەگەی هەڵگرن فڕێی دەنە سەر ڕێگا. ئەگەر مرد بڵێن خەریك بوو رابکا، بە تفەنگ لێمان دا، یان بڵێن لە تێکهەڵچوونێکی چەکدارانەدا کوژرا. ئاغا بۆخۆی جێبەجێی دەکا. ئەگەریش هاتەوە سەر خۆی پێی بڵێن دێی وایوای بەجێ بهێڵێ و بڕوا. عەلیسەفابەگ لە دێیەکی دیکە زەوی و خانووی بۆ داناوە. ئەگەر لە وایوای بمێنێتەوەو دیسان مل بە ملە لەگەڵ ئاغا بکا، جارێکی دیکە تەرمەکەی لەم مەخفەرە دەچێتە دەرێ. پێی بڵێن لەمەودوا خۆی شێت نەکاو خانووی خۆی نەسووتێنێ."

وەکیل باشی خەریك بوو قاوەکەی هەڵدەقووڕاند کە خەبەریان پێ دا:

"یۆبازئۆغلّی خەریکە وەهۆش دێتەوە. دیسان لێی دەین یان نا؟"

"لێی مەدەن، بیهێننە ئێرە."

لەسەر مێزێك کە لە تەختەی رەندەنەکراو و ئەستوور دروست کرابوو، ماهووتێکی سەوزی کۆنیان راخستبوو کە جێ جێی لێسووتابوون، لە پشت سەریەوە لە سەر دیوارەکە شەش تیری برنجەیییان لەسەر خامێکی سوور چەسپ کردبوون. تیرە برنجەیییەکان بە مانەوەی زۆر رەش ببوون. بەشی ساف و بریسکەداری تیرەکان پڕ لە گوومیش بوو کە نەخش و نیگارێکی سەیری پێبەخشیبوون. لە سەرەوەی تیرەکان وێنەیەکی تەواوقەدی "مستەفاکەماڵپاشا" بە جل و بەرگی مارشاڵییەوەو قەمچی بە دەست بە چاوە شینە خەمبارەکانیەوە، دەبینرا. لەم تابلۆیەدا سەری ئەسپێکی رەش کوێت و لە پشت سەرە ئەسپەکەشەوە گۆلاوێکی کاڵ و دوور، خۆیان دەنواند.

"وەرە پێشم، خەبەردار راوەستە، ئاها، ئاوا! ئێستا بچۆوە ئاوایی پیلی ژن و منداڵت بگرەو بار بکە بۆ ئارلیقشلا. ئاغا لەوێ خانووی بۆ پەیدا کردووی. مەزرایەکیشی بۆ داناوی. گۆیا بابی تۆو بابی ئاغا پێکەوە دۆست بوون. هەربۆیەش خانووی بۆ داناوی. ئاغا وەڵامی داوە کە ئەگەر لە وایوای بمێنێتەوە، جاریکی دیکە تەرمەکەت لەم مەخفەرە دەبەنەدەر. ئەگەر جارێکی دیکەش خانووی خۆت ئاور تێبەردا هەرچی بەسەرت هات، هۆباڵی خۆت بەستۆی خۆت. قانوون دەڵێ کەسێك ماڵی خۆی بسووتێنێ، سزای ئیعدامە. ئەم جارە لەبەر خاتری

عەلیسەفابەگ ئازادت دەکەم. جارێکی دیکە کاری وا بکەی ئیعدام دەستت ماچ دەکا. بەڵێ! ئەم جارە لە گوناهت خۆش بووم. دووپات بێتەوە دەت کوژم. دەیاڵڵا برۆ، لاچۆ لە پێش چاوم."

سەروچاوی حەسەن یەك بەر خوێنیان لێدەتکا. نەیدەتوانی چاو هەڵێنێ. جلەکانی لەت لەت و ریشاڵ ریشاڵ ببوون. مەڵێ حەسەن، بڵێ پەڕۆکۆنێکی ڕێك نووشتاوی خوێناوی. بە لاتە لات وەڕێ کەوت. نەیدەتوانی فکریش بکاتەوە. تەنیا بەزەیی بەخۆیدا دەهات. ئەگەر پێی عەیب نەبایە وەك ژنان زۆر زۆر بۆ حاڵی خۆی دەگریا. لە گوندی "یالینزدۆت" تێپەڕی و بەدۆڵەکەدا سەربەرەژێر بووەوە. دوو سوار چاوەڕێی بوون.

دەنگێکی ناسیاو گوتی:"عەلی سەفابەگ سلاوی دەگەیاندی." بەلام حەسەن خاوەنی دەنگەکەی وەبیر نەهاتەوە.

چاوی هەڵێنان. بە پاڕانەوە تەماشای خاوەن دەنگەکەی کردو گوتی:

"چی دیکەم لێمەدەن. ئاغا هەرچی بفەرموێ، بە قسەی دەکەم."

"عەلیسەفابەگ دەیگوت بچێتە نارلیقشلاو لەوێ بمێنێتەوە. لەوێ خانوویەکی سازو ئامادە چاوەڕوانیەتی. ئاغا گوتی: بەلام ئامۆژگاریی‌یەکی دەکەم. ئیدی سواری ئەو ئەسپە عەرەبی‌یە نەبێ و جارێکی دیکەش خانووی خۆی نەسووتێنێ. لە قانوونی جومهووری دا کەسێك خانووی خۆی بسووتێنێ، ئیعدام دەکرێ. تێی بگەیەنن کە حکوومەتی جومهووری هەرگیز ڕێگا نادا کەسێك ماڵێ خۆی بسووتێنێ. کەمی مابوو خۆت و منداڵەکانیشت بسووتێن. ئاغا گوتی:"لێی بپرسن چما مێشکی تێك چووە؟ ئاغا گوتی: ئەو تەنانەت خەریك بوو ئەو ئەسپەی بە دیارییشم داوەتێ، بسووتێنێ. لێی بپرسن چما ئەقڵی تێك چووە؟ ئێستا گوێت لێبێ، ئەگەر گەیشتیەوە ئاوەدانی، پیلی ژن و منداڵت بگرەو بچوو بۆ نارلیقشلا، و هەتا هەی دوعا بۆ عومرو ماڵی ئاغا بکە کە خانووی داویەی. باشە؟"

حەسەن بە ناڵاندنەوە گوتی:

"باشە، خاڵی بووم کاکە! ئێوە لێم مەدەن، باشە ئیدی نە سواری ئەسپی عەرەبی دەبم و نە خانووش ئاور تێبەردەدەم!"

"دەنا ئاغا دەت کوژێ."

"پێی بڵێن نەم کوژێ."

کە گەیشتەوە دێی کەڵەبابی نیوەشەوێ دەیخوێندو خەلکی ئاوەدانی بێئەوەی چاو لێك نێن، لە ماڵێ سەیفەلیی موختار کۆببوونەوەو بە بێسەبری چاوەڕوانی هاتنەوەی بوون. وەختێك

یۆبازنئۆغلی دیتی چرای ماڵێ سەیفەلی داییسێ، یەکسەر رووی لەوێ کرد. هەر کە گەیشتە ژووری بێ ئەوەی قسەیەك بکا، لەبەر پێی ئەو دوو کوڕە جحێڵەدا کە بە پیریەوە چووبوون، کەوت و لە هۆش خۆی چوو. کاتێك وەهۆش هاتەوە، خۆی لەنێو جێ دا دی. بەیان ئەنگوتبوو. دێهاتیییەکان هەتا بەیانی بەخەبەر ببوون و ئاگاداریییان لێکردبوو. دایەقەمەر مەڵحەمی لەسەر برینەکانی دادەناو دوعای بەسەردا دەخوێند. وەسمانەزلە لە نێوان ماڵێ خۆی و ماڵێ سەیفەلی دا هات و چۆی دەکردو بەسەرهاتەکەی بۆ حەمەدۆك دەگێڕایەوە. لە پاش حەوتوویەك، ئەمجار یۆبازنئۆغلی توانی لە جێی بێتە دەرێ. هەموو گیانی نوقمی خۆشحاڵیی نەجات بوون لە مردن بوو.

رۆژێکیان بەیانی چووە بەردەرکی یەك یەکی ئاوماڵەکان و گەردن ئازایی خواست. هەرکەسی دەدی، پیر یان لاو، دەیگوت:

"براگیان ناچارم بڕۆم. حکوومەت دووری خستوومەوە. چما کەس بە حکوومەت دەوێرێ؟. حکوومەت پێی گوتووم بچمە نارلیقشلا لەوێ بمێنمەوە. حکوومەت منی کوشت! کوشتمی. دە ئێوە پێم بڵێن ئێمە بە حکوومەت دەوێرین؟ دیارە کەس پێی ناوێرێ. ئیدی سواری ئەسپی عەرەبی نابم. هیچ وەخت سواری نابم. ئیدی خانووی خۆشم ناسووتێنم. براینە! ئەمن رۆیشتم. گەردنم ئازا کەن!

لای نیوەڕۆیە بوو. یۆبازنئۆغلی وەك گۆرانییەکی دڵ ئێشاوی و دڵ شکاوی لە دێی باری کرد. ژن و منداڵەکەشی بە دوایەوە بوون و رۆیشتن و لە دووری لەبەر چاو ون بوون. هەتاو تەواوێك بڵیند ببوو.

## (٨)

وەسمانەزلە توندو فەرماندەرانەو سەربازییانە فەرمانی بە دایەقەمەر دا:"ئەمڕۆ دەرکە لە هیچ کەس ناکەیەوە. ئەمڕۆ ئێمە لەماڵ نین. دەمەوێ دەرگایەك بە دیوی تەویلەی دا بکەمەوە هەتا شەهێنەکەم بتوانێ بە ئاسوودەیی دەست بە ئاو بگەیەنێ. ئەمن باش دەزانم کە خەراپ ترین دەردی قاچاغێك ئەوەیە کە تەنگاو بێ. ئەودەم ئەگەر پیاو نەتوانێ بە ئاسوودەیی دەست بە ئاو بگەیەنێ، دنیا لەبەر چاوی دەبێتە زیندان و بە سەری دا دەڕووخێ. دایەقەمەر! دەمەوێ دەرگایەك بە دیوی تەویلەی دا بکەمەوە. با شەهێنەکەم بە ئاسوودەیی دەست بە ئاو بگەیەنێ."

دایە قەمەر دەرگای پێوەداو لە پشتەوەڕا دایخست.

وەسمانەزلە گوتی:

"وەرە حەمەد، وەرە یارمەتیمان بدە ئەم دەرگایە بکەینەوە هەتا بتوانی وەك گوڵ میز بکەی. ئیدی ناچار نەبی، لە ژوورێ و لە قەڵشتان و لە تەنەکەی بکەی."

تیشکی هەتاو وەك پەیکانی زێڕین لە قەڵشتی دەرگاو لە قەڵشتی پەنجەرەکانەوە دەکەوتە ژووری هۆدە نیوە تاریکەکە. لەو جادە تیشکانەدا هەزاران دانە خاکی وردی رووناك هەڵدەقوڵێن و دەسووڕان.

وەسمانەزلە رووی کردە حەمەد کە خەریك بوو نیزیك دەکەوتەوە، و لە حاڵێك دا تیغەی پەنا ئاگردانەکەی نیشان دەدا گوتی:

"ئا لێرەوە دەرگاکە دەکەینەوە."

حەمەد پرسی:

"مشارتان هەیە؟"

دایەقەمەر هاتە نێو قسان و گوتی:

"هەمانە، هەمانە."

حەمەد گوتی:

"زۆر باشە، کارەکە ئاسانتر بوو."

حەمەد مشارو تەورو تەورداسی لەدایە قەمەر وەرگرتن و لە پەنا تیغە دیوارەکە لەسەر زەوی دای‌نان.

وەسمانەزلە دەستی لەبەر پشتێنێ نابوو، لە تاو و سێبەری ژوورەکەدا تەماشای وی دەکرد:

"شەهێنەکەم! بە هیچ جۆر نابێ دەنگمان دەرچێ. ئەگینا خەڵك دەزانن لەماڵێین، هەرچەند وادیارە بۆنی شتێکیان کردوە. کوڕە گەورەکەم دایکی خستوەتە ژێر پرسیارو وەڵام و گوتوویە: بابم شتێکی دەبێ."

حەمەد پێ‌کەنی. تەورەکەی لە عەرزی هەڵگرت و لە حاڵێك دا دەستی باڵاپیاوێك لەسەر تیغەکە راگرتبوو، پرسی:

"مام وەسمان! ئەوەندە باشە؟"

وەسمانەزلە وەڵامی دایەوە:

"جارێ ئەم دەرگایە بەرە با ئەمن چاکی بکەم. ئەگەر پێشت خۆشە دەرگاکە ئەندازە بگرە، جێگای دەرکەکە بە قەدەر وی بکەوە."

حەمەد داهاتەوە. پاش ئەوەی دەرگا کۆن و قەڵشیوو کاڵ بووەوەکەی ئەندازە گرت، بە تەورێك کە بە دەستیەوە بوو، تەرازی کردو پاشان بە تەورداس لێك و لووسی کرد. تاوێك دواتر لەسەر تیغەکە جێ‌دەرکەیەکی باش و حیسابی کرایەوە. وەسمانەزلە دەرکە کۆنەکەی کە رێك و پێك کرابوو، وە جێ دەرگاکە خست. چەندین جار دەرگاکەی پێوەداو لێی کردەوەو کارەکە دروست بوو.

نیوەڕۆ داهات. کەڵەباب تاك و تەرا دەیان خوێند. وەختێك ئەوان سەرگەرمی کار بوون، دوو جار لە دەرگایان دا... حەمەد ئارەقەی کردبوو. تەور، مشار، تەورداس و جامە پڕ لە بزمارەکەی بۆ لای دایەقەمەر راداشت. وەسمانەزلە لە حاڵێك دا دەستی بە پشتی حەمەد دا دێنا، گوتی:

"دەستت نەرزێ کوڕم. شەهێنەکەم، زۆر باش بوو."

وەختێك دەستی بە پشتێ حەمەدیدا دێنا، دەستی دەلەرزی. لەخۆشی‌یان مووی لەشی ببوونە نەشتەر. داهاتەوەو بە سرتە بە حەمەدی گوت:

"ئێستا بڕۆ تەویلەی بە ئیشتیا خۆت سووك بکە. دایە قەمەر ئەو مەسینەیە بدە بە کوڕەکەم. خۆت سووك بکە، دوایەش وەرە پێکەوە نانێکی حیسابی بخۆین. کوڕم، زۆر لەمێژە ئاواتمە چۆکت وەچۆکی دەم و نانت لەگەڵ بخۆم."

حەمەد مەسینەکەی لەدایە قەمەر وەرگرت. چوو لە سووچێکی تەویلەی دانیشت و بە خەیاڵی ئاسوودە خۆی سووك کرد. وەسمانەزلە هەقی بوو. دەست بە ئاو گەیاندن لە تەنەکەی دا پرزەی لـێبرِیبوو! هێندێ ڕۆژان هەر دەستی بە ئاو نەدەگەیاندو ڕادەوەستا هەتا شەو دابێ، کە ئەمەش زۆر سەخت بوو.

حەمەد پاش ئەوەی لە تەویلە گەڕایەوە بە دەستێك ئاوی بە دەستەکەی دیکەی‌دا کردو لەسەر تەندوورەکە شتی. دایەقەمەر ویستی ئاوێی بە دەستی‌دا کا، بەڵام حەمەد نەی‌هێشت و دایەقەمەریش زۆری پێ دانەگرت. پاشان بە عوزرخوایی‌یەوە گوتی:

"ئاگرم هەڵنەکردوە، بەڵام فرۆی مانگایەمان هەیە، شەکری بەسەردا دەکەم. ئەگەر پێت خۆش بێ، هەنگوینیشمان هەیە."

وەسمانەزلە گوتی:

"فرۆو هەنگوینی بێنە، بەقەوەتە. کوڕەکەم پێی خۆش دەبێ."

هەموو فکرو خەیاڵی وەسمانەزلە ئەوەبوو کە بەلکوو بتوانێ بە خواردن و خۆراك ئەم کوڕە ڕیوەڵەیە بکاتە پیاوێکی بەسام و بە قەڵافەت: ئەو پێی وابوو ئەگەر نەختێك وەخۆ کەوێتەوەو ئەگەر کەمێك بەژنی بڵندتر بێ، وەك پاڵەوانان نێوشانی پان دەبن و ملی ئەستوور دەبێ، و ئەودەم ئەگەر کەسێك چاوی پێ‌کەوت لێی دەترسێ!... پیاو پێی شەرم بوو ئەم منداڵە کزەلۆکەیە بەرێتە لای خەڵك و بڵێ ئەمە حەمەدۆکە. پیاو سوێندی خواو پێغەمبەریش بخواو دەست بە قورئانیش دا بدا، دیسان کەس باوەڕ ناکا کە حەمەدۆکە. بیری کردەوە:"ئەمن پارێزگاریی لـێدەکەم و ئەم بستە پیاوە لە شەڕی جەندرمە دەپارێزم. ئێستا وەرە ئەم کوڕیژگەیە وەپێش خۆ بدەو بە خەڵکی بڵێ:"فەرموون ئەوەش حەمەدۆك کە هاتوەتەوە. کەس باوەڕ ناکا، تەنانەت دایەقەمەریش باوەڕ ناکا، یانی ناش توانێ باوەڕ بکا کە ئەم منداڵە حەمەدۆك بێ، نا. جارناجارێك کە تەماشای من دەکا، بە زمانی بێ‌زمانی دەڵێ: وەسمانەزلە

باوەڕ ناکەم، ناتوانم باوەڕ بکەم کە ئەمە شەهێنەکەی تۆ بێ، خوا بکا لێت نەگۆڕابێ. لە چاوەکانی دایەقەمەر دا شك و گومان بەدی دەکرێ. بۆخۆشم ئەگەر پێشتر ئەم دیبایە، باوەڕم نەدەکرد. ئاخر حەمەدۆك چۆن وا دەبێ؟... خوا شوکور کە کەس نایبینێ... چاکە شوکور کەس ناتوانێ لە وەختی خەودا بیبینێ کە چۆن وەك منداڵی قۆنداغە لچ و لێوان هەڵدەچنێ و چلمی هەڵدەلووشێ."

رۆژێکیان دایەقەمەر دیتبووی کە لە خەو دا وەك منداڵان دەگری:

"وەسمان! کوڕەکە لە خەوێ دا دەگری."

"مەیەڵە بگری."

"وەك منداڵی شیرەخۆرە وایە."

"باشە دایەقەمەر."

"بە هیچ جۆر تفەنگی لێناوەشێتەوە. بستە منداڵێکە."

"مەبەستت چیە، دەتەوێ بڵێی چی دایەقەمەر؟"

"مەبەستێکم نیە. هەر دەمەوێ بڵێم بستە منداڵێکە. هەر منداڵ لە خەوێ دا دەگری."

وەسمان لە دڵی خۆی دا گوتی:

"دایەقەمەر باوەڕ ناکا. بۆخۆشم ئەگەر بە چاوی خۆم ئەم دیبایە باوەڕم نەدەکرد کە ئەوەیە عەبدیخانی کوشت، ئەمە ئەم کەسەیە کە چووە نێو شاری. لە پێش چاوی حکوومەت کالایچیی کوشت. هەزار بەڵای بەسەر وەکیل باشی عاصم هێناو لەرزەی خستە کێوەکانی توورووسەوە!..."

"باش بخۆ، پارووی گەورەتر بکە شەهێنەکەم! فرۆو هەنگوین باشە. سێ رۆژ لەسەریەك دەبێ هەنگوین و فرۆ بخۆی... پاشانیش خواردنی چەورو چۆڵ... ئەتۆ زۆرت بێخۆراکی کێشاوە. دایەقەمەر! قەمەر..."

حەمەد وێڕای پێکەنین لەبەر خاتری وەسمانەزلە پاروەکانی گەورەتر دروست کرد.

"دەزانی شەهێنەکەم! دەرفەت نەبوو پێت بڵێم. ئەو زەوییە کە دێهاتییەکان بۆیان کڕیبووی، عەلیسەفابەگ دەستی بەسەردا گرتوە. ئەتۆ ئیدی مەزرایەکت نیە. بەڵام خانووەکەت لە جێی خۆیەتی. "سەیران قیز"ی تێدایە. زۆر تووڕەیە، لەگەڵ کەس قسە ناکا. تەنیا لەگەڵ دایەقەمەر قسە دەکا. ئەوی خۆش دەوێ. وەختێك هەموو خەڵك دەچنەوە ماڵەکانیان و هاتوچۆ دەبڕێ و باڵندەو پێڕو هەڵ دەورن، دەست دەکا بە گریان، دەنگێکی هەیە

هەر مەپرسە، دڵی بەردی بۆ دەبێ بە ئاو...، دێهاتی‌یەکان دەزانن کە ئەو کەنگێ گۆرانی‌یان دەڵێ، بۆیە ناخەون، چاوەڕوان دەبن هەتا دەست پێ بکاو گوێیان لە دەنگی بێ. حەمەدی من، شەهێنەکەم، سەیران قیز لە جوانی دا لینگەی نیە. ئەو بەڵایەی بەسەری هاتوە لەگەڕانەوە نایە... ئەو بەڵایانەی بەسەر وی هاتوون، خوا بە نسیب دوژمنیشتیان نەکا. بەڵام هەمووی ئەمانە تەحەمول دەکا. روخساری کەمێك سیس بووە. تەمی خەمی لەسەر نیشتوە، بەڵام هەمیشە سەری بەرزە. لە رقان دەم و چاوی گوڵ دەکا. رق هەستان جوانتری دەکا. ئەوەندە جوانە دڵت نایە تێر سەیری بکەی."

حەمەد هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەویش وەك هەموو خەڵکی چوکووراوا ئاگاداری ئەو بەڵایانە بوو کە بەسەر سەیرانێ هاتبوون.

"ئەتۆش بەسەرهاتەکەیت بیست کوڕم؟"

حەمەد بە چاوێکی فرمێسکاوی و روخسارێکی خەماوی‌یەوە جوابی دایەوە:

"بیستم مام وەسمان بیستم."

"وەختێك ئێمە زەویمان بۆ تۆ کڕی و خانوومان بۆ ساز کردی، عەلی‌سەفابەگ بەڵایەکی بەسەر هێناین هەر مەپرسە. چاکت کرد لە چیای نەهاتیەخوار. ئەگەر فریوی لێ‌بووردنت خواردباو لەکێوی هاتبایەوە، ئاغاکانی چوکووراوا هەزارویەك بەڵایان بەسەر دێنای. نەیان دەهێشت زیندوو بی. ئەتۆ چەقڵی چاوی وانی، چەقڵێکی تیژی پۆڵایین. ئەگەر لە دەشتێ بی، ئەگەر بچیە چیای، ئەگەر بڕۆیە بەندیخانە، ئەگەر بێ‌سەروشوێن بچی و ئەگەر بمری، دیسان ئەتۆ چەقڵێکی تیژی پۆڵایینی کە لە چاویان ڕاچووی. ئەگەر بچی لە ماڵەکانیان دا نۆکەری بکەی، دیسان لە تاوانت خۆش نابن. پارووی گەورە بکە کوڕم، هەنگوین و فرۆی بخۆ."

حەمەد سەری هەڵبڕی. دەم و چاوی زۆر جیددی بوون. پاروویەکی گەورەی لە دەمی خست، بریسکەیەکی پۆڵایین هاتە چاوەکانیەوە. ئەودەم بە راوێژێك کە وەك تیغی جەوهەردار تیژو بەسام بوو پرسی:

"یۆبازئۆغلی چیی بەسەر هات؟"

دایەقەمەر لە دڵی خۆی دا گوتی:"کەوابێ ئەو سامەی خەڵك دەڵێن حەمەدۆك هەیەتی، لە دەنگەکەی دایە؟ وەجاخت رۆشن بێ کوڕە، چەند نێرە، ئەمە چ دەنگێکە؟"

وەسمانەزلە گوتی:

"چوو گەردنی خۆی بە هەمووان ئازا کردو رۆیشت. نارەحەت و سام گرتوو و خەفەتبار بوو، دەت گوت دەچێتە سەفەری مردن."

حەمەد لەسەری رۆیشت:

"بریا دێیەکەی بەجێ نەهێشتبا..."

وەسمانەزلە ملی بەلاوە ناو گوتی:

"بریا نەڕۆیشتبا... پارووی گەورە بکە کوڕم!"

پاشان هەستا، چووە پەنای ئەو رووناکایی‌یە کە لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوور. دەمانچەکەی لە بەرگەکەی هێنایەدەرو دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی. پاش ماوەیەکی زۆر کە خەریکی خاوێن کردنەوەو چەورکردنی دەمانچەکەی بوو، دەستی بە قسە کرد:

"ئەتۆ وەك بڵێسە ئاگرێك لە ئاسیاب چەشمە رۆیشتی. باڵت گرت و رۆیشتی. لەبەر چاوان ون بووی. هەر کە ئەتۆ چوویە سەر عەلی‌کۆ، نوورێکی گەورە، بە قەد منارەیەك تەقیەوە. سێ شەوو سێ ڕۆژان بڵێسەی دا. هەموو دێهاتی‌یەکان سەریان سوڕمابوو. سێ شەو و سێ رۆژان نەخەوتن و تەماشایان کرد. ئەمنیش تەماشام کرد. لەو رۆژە بەدواوە هەموو ساڵێ راست شەوی ئەو رۆژە کە تۆ رۆیشتی، ئەو نوورە هەڵدەستێ و سێ شەوان دنیا وەك رۆژ رووناك دەبێ، باشە ئەتۆ دوایە چوویە کوێ؟"

حەمەد لە حاڵێك دا دەنگی ژەنگی خەمی لێ‌نیشتبوو گوتی:

"پاشان وەڕێ کەوتم، سواری ئەو ئەسپە بووم کە ئەتۆ دابووتمێ. شەوێك لەسەر کێوێکی بڵیند مامەوە، رۆژەکەی دیکە تووشی هۆبەی تورکمەنان بووم. دەسبەجێ ناسیانم کە حەمەدۆکم... پێشوازی‌یەکیان لێ‌کردم هەر مەپرسە... سۆراغی کەریم ئۆغڵیم پرسی..."

وەسمانەزلە لە حاڵێك دا دەمانچەکەی دەخستەوە کیفەکەی گوتی:

"پیاوێکی پیاوە. کەریم ئۆغڵی زۆر جوامێرە."

حەمەد لەسەری رۆیشت:

"سەرۆکی هۆبەی تورکمەنەکان پیرەپیاوێکی وەك کەریم ئۆغڵی بوو. وەختێك منی دەبردە رەشماڵەکەی، سێ فیشەکی هەڵتۆقاندن. پاشانیش دەسبەجێ هەر لەوێ دەستووری دا بەرانێکیان سەر بڕی.

## (٩)

"ناوی "موسلیم بەگ" بوو. جێژنیان هەبوو... فەرمانی دا هەتا بەیانی لە پێش چادرەکەی ئاگریان کردەوە. ئەو ئاگرەی لەپێش چادرەکە هەڵکرابوو، چوار هێندەی چادرەکە بەرز بوو. بڵێسەی ئاگر دەگەیشتە ئاسمان..."

"کورِم! چما ئەقڵ دەیگرت موسلیم بەگ ئازارێکت پێ بگەیەنێ. چما ئێستا ئەمن دەتوانم خەراپەت لەگەڵ بکەم؟ وەختێك ئەتۆ چوویە چادری ئەو، ئەمە بۆ وی شانازیەك بوو. لە خۆشیی ئەو شانازییە لە ئاسمانان دا دەگەڕا. ئاخر پیاو لە پیاوی وا دەترسێ؟ دەکرێ پیاو باوەڕ بە پیاوی وا نەکا؟ ئەم کۆچەرییانە خەڵکێکی ئازاو بەزییکن، ئەم نیشتەجێیانە کە دەیان بینی، هەموویان دیلی داب و شوێنی خۆیانن. ئەو لسپە مووە درێژە کە لەسەر تەپڵەسەری ئێمە، من و سەفچە... هەیە، بۆتە گەپجاڕی ئەو بیژووانە. هەر ئەو بیژووانە کە بە گەڕەکی خوارەوەیان دەڵێن وەدوام مەکەوە بۆنت لێ دێ! هەموو پیرەپیاوانی تورکمەن ئاوان. تەنانەت لاوە جوامێرەکانیشیان لسپێك کاکۆڵیان لە نێوەڕاستی سەریان دا هەیە. لەنێو تورکمەنان دا تاقە یەك داب هەیە، ئەویش داب و شوێنی ئینسانەتی و ئینسان بوون. ئەگەر یەکێك پەنات بۆ بێنێ. بڵێ پشت و پەنام ئەتۆی، قەڵاو پاڵپشتم ئەتۆی، یارمەتیم بدە، ئەتۆ چ ڕەفتارێکی لەگەڵ دەکەی؟ پشتیوانیی لێ دەکەی یان لێی دەگەڕێی بە تەمای خوا؟ کارێکی باشت نەکرد، دەبوو متمانەی پێ بکەی. پیاو دەبێ متمانەی بە پیاوان هەبێ."

"شەوێکی تاریك بوو. وەك دیوارێکی ڕەش. نێو چادرەکە پڕ دەبوو لە بۆنی گیاوگۆڵ و بۆنی توندی گوڵان. باڵنجەکە بۆنی نەعنای کێویی لێدەهات... دوو ڕۆژ دەبوو میوانی موسلیم بەگ بووم. دوو شەو بوو خەو نەچووبووە چاوم. هەر لە فکری ئەوەدا بووم کە ئەگەر

بخەوم، موسلیم بەگ لە خەویّ دا دەم کوژیّ، هەستم دەکرد لە مەترسی دام. هەتا ئەو رۆژە بەلاّی وام بەسەر نەهاتبوو، قەت وا تووشی بیّمتمانەیی نەببووم. سەری شەویّ وردە بارانەیەك دەباری. لە جیّیەکەم هاتمەدەریّ، بە لیباسەوە نوستبووم. تفەنگەکەم و فیشەکدانەکانم و دووربینەکەم و کلاّوەکەم و بە کورتی دارونەدارم هەرچی بوو، بەجیّم هیّشت، ئەسپەکەم لەبەردەرکی چادرە گەورەکە بەسترابووەوە، ئەویشم بەجیّ هیّشت و رۆیشتم..."

"ئەتۆ پیّت وابوو بەگ بۆ ئەسپیّك تۆ دەکوژیّ؟ تورکمەنیّك هەرچەندیش ناپیاو بیّ بۆ ئەسپیّك کەسیّك کە پەنای بۆ چادری وی هیّنابیّ، ناکوژیّ. حەتمەن ئەو شەوە تا سبەینیّ ئیّواریّ لەو ئەشکەوتە کە خۆت تیّدا شاردبووەوە، نەهاتیە دەریّ. لەنیّو ئەم دنیایەدا خۆت بیّ پشت و پەنا دەهاتە بەرچاو وانەبوو؟ هەر کە دەستت لە چەتەیی هەڵگرت پیّت وابوو بن پیّت بەتاڵ بووە، بەڵیّ؟ لە تەنگانەدا گیرت کردبوو، نا؟ لەو ئەشکەوتەدا کە خۆت لیّشاردبووەوە وەك میّژۆکە دەلەرزی. ئەمنیش بەلاّی وام بەسەر هاتوە. هەموو ئینسانیّك لەوانەیە بەسەری بیّ. پیاو هەرچەندی بەغیرەت و ئازا بیّ، ئەوەندە ترسەنۆکە، یان هەرچەندی ترسەنۆك بیّ، ئەوەندەش ئازاو بە غیرەتە. پیاو وەختیّك دەگاتە ئەو ئاکامە کە تەمەنی لە هەشتا تیّپەرِیبیّ."

"ئەشکەوتەکە جۆرە بەردیّکی سووری هەبوون. بەردیّکی سووری پوواو کە هەر دەستت لیّدابایە، هەڵدەوەری. لەسەر ئەو بەردە سوورە گوڵیّکی خواروخیّچی ناحەز روابوو کە رەنگیّکی سەیرو سەمەرەی هەبوو، نە گەلاّی وەك گەلاّی گوڵی دیکە بوو، نە بۆخۆی. دەرکی ئەشکەوتەکە بە بیّژان گیرابوو، تازە بۆنی خۆش دەبوو.

پیاو هەر پیّی وایە زۆر ئازایە، وەختیّکیش ترس بە سەری دا زاڵ دەبیّ، دیسان باوەرِ ناکا. لە خەفەتان دیق دەکا. شیّت دەبیّ و بە خۆی دەڵیّ: بۆ خەریکە بترسم؟ ترس کەوتوەتە دڵی بنیادەم، بەلاّم بەخۆی نازانیّ. بنیادەم تۆوی ترسە. بەلاّم ئەوەی نازانیّ. نایزانیّ و ناشی هەویّ بزانیّ. گوڵە بیّژان بۆن خۆشترین و تەرِو تازەترین گوڵە... بۆنی ئەو گوڵە کار دەکاتە سەر پیّست و موو و ئیّسکی بنیادەم. بۆنی گوڵە بیّژان دەتوانیّ بیّحاڵترین ئینسانەکان بیّنیّتەوە سەر حاڵ...

لە خوار خواریّ هەور دەشتیّکی دادەگرت کە بە میّرگ و میّرغوزاریّکی سەوز، بە گوڵی سوورو سپی و بنەوشی بە عەتری توندیانەوە، بەمیّگەلە مەرِی زۆرو زەوەند، بە لافاوگەکان، بە تاقەدارە قوڵەبنەکان بە برِکە چەقڵی پرِو بە پشت هەزار بە هەزاریّکی پیّك دیّنا. قازو قولّینگ

تیپەن تیپەن لەنێو مژەکە دا چەرخیان دەدان. لە دووری دەنگی تەقە دەهات، وادیار بوو لە جێگایەك شەڕ ساز بووە.

وەختێك هەتاو ئاوا بوو، دەشت ڕەنگی بڵێسەی ئاوری گرت. ئاسمان، کێوەکان، جێلافاوەکان و چۆمە گەورەکەی ئەوپەڕی دەشتێ وەك بڵێسەی ئاگر درەوشانەوە. پاشان لەحزەیەك لافاوێك لە ڕەنگی سووری ئاگرین دەشتەکەی پڕ کردو ئەمجار کێوەکان و دارەکان و خاکی سوورو مێگەلەکان و قازو قولینگەکان هەموویان شین هەڵگەڕان.

ئەمن شتی وام نەدیبوو. لە نێو ئاگری تاو لەرزدا دەسووتام. خۆم لە ئەشکەوتەکە فڕێ دایە دەر. کێو و دەشت لەسەر سەرم دەسووڕان. سێ ڕۆژان بە نۆبەتێداری برسی و ماندوو بە ڕێ دا دەڕۆیشتم. شوانێك جۆرێك لێم مۆڕ بووەوە، دەت گوت دەیەوێ هەر ئێستا سەرم ببڕێ. ناومی پرسی. گوتم مستەفارەش. پێکەنی. لەتکە نانێك و پیاڵە شیرێکی دامێ. وەك شێتان بە قومێك شیرەکەم هەڵقووڕاندو نانەکەشم بە پاروویەك قووت دا. پاشانیش غارم دا ڕۆیشتم. شوانەکە هەروا لە پشتمەوە پێدەکەنی و بانگی دەکرد: حەمەدۆك، حەمەدۆك!... هێندە هەڵاتم تا دنیا تاریك بوو. شەو داهات. شەو وەك دیوار بوو. سەری شەوێ باران دەباری..."

"حەتمەن حەیوانی کێوی شاڵاویان بۆ هێنای؟ وانیە؟ گیاوگۆڵ، دارودرەخت، جرِوجانەوەر... ئەتۆ قەت دیوتە مار چۆن توێژێ داوێ؟ کارێکی سەختە، مار شەکەت دەبێ. مار لە پێش دا گیاجارێکی نەرم بۆخۆی دەدۆزێتەوە. لەوێ ماوەیەك هەروا لەسەر گیا دەسووڕێ. پاشان دووسێ جار وەك فەنەر خۆی خڕ دەکاتەوە، لەشی خۆی خڕ دەکاتەوەو بەرەڵلای دەکا، خڕی دەکاتەوەو بەرەڵلای دەکا. جاری ئاخر خۆی خڕ دەکاتەوەو ماوەیەکی زۆر هەروا دەمێنێتەوە. وەك گلۆلەیەکی لێدێ. پاشان دەکرێتەوە، لە نەکاو دەبینی لەو وەزعەدا توێژەکەی لەبەر داڕناوە. توێژە درێژەکەی لە تەنیشت چلە درکێك بەجێ دێڵێ. مار وەختێك توێژێ داوێ، هەتا ماوەیەك وڕو کاسە، نازانێ چ بکا" بچێتە کوێ. ماوەیەك هەر لەوێ لەنێو گیاو گۆڵ گێژو حۆل دەسووڕێتەوە. ئەمنیش وەختێکی خزمەتی سەربازیم تەواو کرد، ئاوا بووم. هەتا ساڵێك تەنانەت نەم دەزانی دەستەکانیشم لەکوێ دابنێم! ئێستاشی لەگەڵ بێ، هەموو ڕۆژێ وەختی شەیپووری لە خەو هەستان، لە خەو هەڵدەستم."

"بۆخۆم، بەم گوێیانەم گوێم لێبوو کە شوانەکە لە پشتمەوە هاواری دەکرد:"حەمەدۆك، حەمەدۆك! بۆ کوێ دەچی؟"

"هەموو کەس وەختێك توێژێ باوێ، هاوار دەکا. هەموو کەس دەزانێ ئەتۆ حەمەدۆکی."

"بە چ ڕا دەزانن؟"

"دەزانن ئیدی، قسەکەت بکە."

"ئاوێك هەیە پێی دەڵێن "فورات"، ڕەنگی سەوزە. هەمیشە خەنەتیلکەی لەبن دایە. بەهارو هاوین وەك دەریایە. وەك دەریا کەف دەکا. ئەو دێیە لە پەنای ئەو ئاوە لە داوێنی کێوێك بوو کە گاشەبەردی سەوزی هەبوون. سەربانی خانووەکانیان بە گڵێکی سەوز گڵەبان کردبوو."

"ناوت چیە؟"

"مستەفاڕەش."

"شوانیی‌یە دەکەی؟"

"بەڵێ."

"خەلکی کوێی؟"

"ئووزوون یایلا."

"ئەسپی جوان جوانی لێن. دوو جێگا ئەسپی چاکیان هەیە، ئۆرفەو ئووزوون یایلا. ئەسپەکانی ئووزوون یایلا بێن درێژن، بەتایبەتی ئەسپە ڕەشە کوێتەکانی."

"ناوم مستەفاڕەشە."

"زەماوەندیان هەبوو. لەسەر تلۆفکی دوو سپیدار کە بە پەنای یەکەوە بوون، لەسەر سەرێ پەرچەمێکی ڕەنگاوڕەنگیان قایم کردبوو، هەمووان تفەنگیان داویشتە گوڵینگەکەی سەرێ. هەموو، چ پیرو چ لاو، چ ئەوانەی سەربازی‌یان کردبوو، چ ئەوانەی چەتە ببوون و تەنانەت ڕاوچی‌یە بەناوبانگەکانیشیان دەیانەویست بیپێکن و لەسەر سپیدارەکەوە بەری‌دەنەوە و خەڵاتی جێژنەکە وەرگرن. زۆریان تفەنگ هاویشتن، سوودی نەبوو. زۆر تووڕە ببوون. گوڵینگەکە زۆر چووك بوو. گوللە نەی‌دەنگاوت. ئەگەر نەیان توانیبا بەری دەنەوە، فەرِی باش نەبوو. بۆ زەماوەندەکە ئۆغری نەبوو. هەموو چاوەکان برابوونە نیشانەکە. بووك بە جلکی بووکێنی‌یەوە، زاوا، کچەکان و ژنە جحێڵەکان هەموویان چاویان لە نیشانەکە بوو... گوللەکان بە هەر چوارلای دا بە ویزە ویز تێ‌دەپەڕین. پووڵەکەی گوڵینگەکە لەبەر تیشکی هەتاو وەك زێڕ دەبریسکانەوە..."

"حەمەد! ئەم سەربەرگە لەسەر شانت فڕێدە. لە قوژبنێك کوشم هەڵاتووی، تەنانەت چاویش لە هیچ کەس ناکەی. پیاوێکی نابووتەڵەی، ئەویش ترسەنۆك! چاوەکانت لە کالانەدا وەك چاوی سمۆرە لەترسان بز دەچن. ئەم سەربەرگە لەبەر خۆت داکەنە، حەمە شوان، مستەفا شوان!"

"تفەنگی ئەڵمانیم لە کوڕە جحێڵەیەك وەرگرت. بەمۆڕەوە سەیری کردم. هەموو ئەو پیاوانەی لەوێ بوون، مۆڕەیان لـێکردم. ژنەکان و کچەکان پێم پێکەنین. دەستم وەك بی دەلەرزین. تفەنگەکە بە دەستمەوە وا دەلەرزی دەت گوت خەریکە هەڵفڕێ. هێنامە سەر دەستم و سێرەم گرت. نیشانە هەڵکەندراو بە خول دان کەوتەخوار.

"ناوت چیە؟"

"هەمووان گوتیان ئەتۆ حەمەدۆکی. ناسیانیەوە. ئەتۆ دەت گوت ناوم مستەفارەشە. ئەوان پێیان دەگوتی حەمەدۆك. لەوێش ڕات کرد. هەروا بزانە بە ڕووتی و پێخواسی لەنێو دێ دا مابوویەوە. هەموویان هەموو شتێکیان دەزانی: دایکت مردوە، خەجیج تفەنگی وێکەوتوە، وەکیل باشیعاصم لە ئەشکەوتەکە تۆی گرت، بەڵام پاشان بەرەڵڵای کردیەوە. وەختێك عەبدیخانت کوشت. هەموو دارو نەداری خۆت لە چادری موسلیم بەگ بەجێ هێشت و بۆی دەرچووی. هەموویان هەموو شتێکیان دەزانی... سووتاندنی دروەڵانەکە، بەسەرهاتەکەی گوندی ئاك توززلوو، مەسەلەی نایب رەجەب... هەموویان هەموو شتێکیان دەزانی..."

"های... حەمەدۆك... راوچیی شوورەکانی شاخە سەخت وحەستەمەکان حەمەدۆك!"

تاریکایی وەك دیوارێك لەسەر ڕێگای ڕاوەستابوو. خوناوکە بارانێك بەسەر شەودا دەباری. ئاوی فوڕات چووکترین بزووتنی نەبوو، تەنانەت شنەبایەکیش نەدەهات. شەو بوو، بارانێکی گەرم دەباری و هەڵمی دەکرد. خۆی رووت کردەوە. چووە نێو ئاو. لە حاڵێك دا جلەکانی بە دەستی چەپیەوە گرتبوون، بە دەستی ڕاستی مەلەی کرد. سەعاتێك و ڕەنگە دوو سەعاتیش لەگەڵ فوڕات مل بەمەلەی کرد. وەختێك گەیشتە ئەوبەری ئاوەکە خەریك بوو کازیوە دەنگووت. شەکەت و ماندوو بوو. ئەو ئاوەی مەلەی تێدا کرد بوو، لەشی کە دەبرژایەوە، و ئەو خیزەڵانەی لەسەری ڕاکشابوو، بۆنی ئەعنای کێوییان لـێدەهات. جلەکانی لەبەر کردنەوەو کەوتەرێ.

خەڵکی هەموو گوندەکان ئەویان دەناسی. لە هەر دێیەك زیاتر لە مانگێك نەیدەتوانی وەمێنێ. وەختێك چووە گوندێك گوتی:"حەمەدۆکم. بەخوا حەمەدۆك خۆمم" بەڵام کەس باوەڕی پێنەکرد. هێندیان گاڵتە پێکرد، ناچار بوو ئەوێش بەجێ بهێڵێ.

"ناوت چیە؟"

"مستەفا ڕەش."

"هەهە...، ئەمجار حەمەدۆك بووەتە مستەفارەش؟"

"چاکت گیر کردبوو کوڕەکەم. تەنانەت لە دێهاتی لێوارەکانی فوڕات، لەنێو کوردەکانی وەك هەڵۆی"دەرسیم" و لەنێو تورکمەنەکانی "بیرەجیك"یش دا کەس نەبوو تۆ نەناسێ. دەیان گرتی و دەیان

دایه دەستی حکوومەتی خوێنخۆر. ئەوانیش لەجیاتی خوێنی عەبدیخان خوێنیان دەرشتی. ئەدی خوێنی خەجیج، خوێنی دایکت، خوێنی پوورە ئیراز و نایب رەجەب چی؟ خوێنی ئەوانە دەبێتە چی؟ حکوومەت تۆڵەی خوێنی وان ناستێنێ. تۆڵەی خوێنی عەبدیخان لە تۆ دەستێنن. لەم دنیایەدا کەس نیە تۆ نەناسێ. هەمیشە وابووە. چاوت نیگەرانی کێوەکانە. ناوی حەمەدۆك لە کۆڵت نابێتەوە. بریا وەختێك دەهاتیەوە خۆت بە موسلیم بەگ نیشان دابایە. بریا لەجیاتی ئەوەی بەشەو بچی سوراغی تفەنگەکەت بکەی، بە رۆژی رووناك چووبای... ئاخر پیاو بە شەو دەچێ تفەنگی خۆی لە ماڵی موسلیم بەگ بدزێ؟ باش بوو بۆخۆت دیتت کە تفەنگەکەت هەر لەو جێیە بوو کە لێت دانابوو. چما لە ماڵەکەی ژنان کەمیان رێز بۆ دانای کە لێت دا رۆیشتی؟ چما پێیان نەگوتی بەگ نەیهێشتوە کەس پێ لە رکێفی ئەسپەکەت نێ؟ هەتا مردن موسلیم بەگ نەی دەهێشت کەس سواری ئەسپەکەت بێ. ئەگەر دە ساڵی دیکەش نەچوویایەوە سەر چەکەکانت، کەس دەستی لێنەدەدان. ئەگەر گوتبات ئەسپەکەم بۆیە بەجێهێشتوە موسلیم بەگ سواری بێ و کەیفی پێبکا، پێت وایە ئەو سواری ئەسپی ئەمانەتی تۆ دەبوو؟"

"گەیشتمە گەلی" مەریەم جیل"، تفەنگ و فیشەکدانەکەم بەدەستەوە بوون."تەمیر" هاتە لام. پیاوێکی وردیلانەی ئازاو بەغیرەت بوو. پیاوێکی زۆر چاك بوو. دەرۆستی لەشکرێك دەهات. هەتا گەیشتمە"کایرانلی" و سەر چیاکانی دولدولێ، هەموو جێیەك پڕببوو لە سەرباز. رووم کردە عەلیکۆ. سەرباز وەك خیزو خۆڵ بە وڵاتی وەربوون. ژن و منداڵ و دێهاتییەکانیش سەربار..."

"ئەمە دێهاتییەکان بوون کە پێشی"هیزارجی"یان گرت و بە چل گوللە لەشیان کردە کوولەکەی کەوباران، نەك سەربازەکان. ئەوە سەربازەکان نەبوون کە پەتیان خستە ملی"حەمەزلە" و بەسەر زەوی دا رایان کێشا... ئەگەر ئەوانە گرتبایانی، لەگەڵ تۆش هەروایان رەفتار دەکرد. یاپەتیان لە مل دەخستی، یان لە چل جێگاوە لەشیان بە گوللە کون کون دەکردی. باکیشیان نەدەبوو کە ئەوە حەمەدۆکە. پشت و پشتیوانی فەقیرو هەژارە. ئەمانە ئەگەر یاوەر فاروق، یان فەرمانبەرێکی دیکەی دەوڵەتیشیان چنگ کەوێ، بەڵایەکی خراپتر لەوەی بەسەر دێنن کە بەسەر هیزارجی و حەمەزلەیان هێنا. هەمووی ئەوانە فریو دەدەن... بەڵام دەزانن ئەتۆ بەهێزی... ئەگینا کارت تەواو بوو."

"لە کێوی تەنیا مایەوە. وانیە؟ لەم دنیایەدا، لەسەر لووتکی ئەو چیایە هەروا بزانە رووت و پێخواسی وانیە؟"

"بەڵێ مام وەسمان تاق و تەنیا مابوومەوە. دەت گوت رووت و قووتم."

تاریکایی وەك دیوار داهاتبوو. باران بەسەر شەودا دەباری، بارانێکی گەرم و هەڵماوی...

## (١٠)

وەسمانەزلە یەك تەكان لێوی دەبزووتن. دەچووە تەویلەو دەهاتەوە دەر، برۆ درێژەكانی هەڵ دەكێشان و دەستی پێدا دێنان. دەت گوت لە شتێك دەگەڕێ. تەماشایەكی دەوروبەری خۆی دەكرد. جاروباریش دادەهاتەوەو دەستێكی بەسەر چەكمەكانی دا دێنا. پاش ئەوەی ماوەیەكی زۆر لە تەویلەدا دەستی بەسەر یاڵی ئەسپەكەی دا دێنا، دەچووەوە لای حەمەد و لە حاڵێك دا هەوڵی دەدا پێبكەنێ، بەراوێژێك كە دەت گوت دەیەوێ بگری بانگی دەكرد:"حەمەد كوڕم" دەنگەكەی پەیامی تازیەی تێدابوو و زۆر دڵسۆزانە بوو.

هێشتا هەتاو نەكەوتبوو، دنیا بوولێل بوو، گاووگۆل دەچوونە لەوەڕگە. بەردەڵانەكانی ئاناوارزا هێدی هێدی هەڵمێكی لێڵیان لێ هەڵدەستا. ئەسپی خەنەیی لەسەر دوندی گابەردێك وەك پارچە بەردێك وشك و بێجووڵە راوەستابوو، نەسەری دەبزاوت نە كلكی.

موختار سەیفەلی لە پشت كەوێڵێك هاتەدەر، روخساری گرژی وەسمانە زلە كرایەوەو پاشان دووبارە نێوچاوانی تێك نایەوە. كەمێك دوای سەیفەلی، سەفچەكاهیاش پەیدابوو. دەسكێكی نێرگز بەدەستەوە بوون، هەركام لە گوڵە نێرگزەكان هێندی گوڵەباغێك دەبوون. لە كاتێك دا نێرگزەكانی بۆلای دایە قەمەر كە شیری دەدۆشی، ڕادەداشت، گوتی:"ها دایە قەمەر، نێرگزم بۆ هێناوی."دایە قەمەر لە حاڵێك دا وەك گەورەكچان لە شەرمان سوورهەڵگەڕابوو، گوتی:"دەستت نەرزێ كاك سەفچە"و پاشان بە پێكەنینەوە گوتی :"منت لەبیر بوو؟"

سەفچە وەڵامی دایەوە.

"شەوێ چاوم لەسەریەك دانەناون. هەموو شەوێ لە قەراغ قامیشەڵان هاتووم و چووم. ئەسپە شێتی یۆبازنۆغلی هەتا بەیانی لەو دەشتەدا چەرخی دەدان. نێرگزەکان دەگەیشتنە ئەژنۆی پیاوی."

لەپەنا پەرژینی کۆبوونەوە. وەسمانە زلە بە ڕقەوە گوتی:

"راستە قەولم داوە، بەڵام ناچم. ئەگەر ئەو ئاغایە، ئەگەر حکوومەتی لە پشتە، ئەمن پیاوێکی هەشتا ساڵەم. لە پشت منیش..." قسەکەی تەواو نەکرد. پاشان جارێکی دیکەش دووپاتی کردەوە:"لە پشت منیش..." جەرگی جەرگی دەخوارد. لەوە کە نەی توانی قسەی دڵی خۆی بکا، بە ئازار بوو. سەرەنجام گوتی:"لە پشت منیش خوای گەورە هەیە." و لەگەڵ گوتنی ئەم رستەیە ئاورێکی وەسەر ئەوگۆشەیە دا کە دۆڵابی‌یەکەی تێدابوو و حەمەدی تێدا خەوتبوو. ئەمجار لێی زیاد کرد:"لە پشت ئێمە کێ هەیە؟ ئەمەیان ئیدی کەس نایزانێ. کالایجی چۆن بە سزای خۆی گەیشت، عەلی‌سەفابەگیش ئاوا بە سزای خۆی دەگا. وەختێك ئێمە هاتین لێرە ماینەوە، عەلی‌سەفابەگ لە زگی دایکی خۆشی دا نەبوو... ئێمەش..."

لەو بەینەدا حسام کوڕە گەورەی وەسمانەزلە گەیشتە وێ" بەدوای وی دا رەشید هات. هەموو دێهاتی‌یەکان یەك یەك و دوو دوو دەهاتنە ماڵی وەسمانەزلە و لەوێ کۆ دەبوونەوە، ژنەکانیش هاتن و لە سووچێکی حەوشەی لە دەوری دایە قەمەر کۆبوونەوە. هەموو بێ‌دەنگ بوون. قەمەر شیرەکەی دۆشیبوو ودەفری شیرەکەی لە پەنای دەرگا دانابوو.

وەسمانەزلە راست دەبووەوە، بە دەنگی بەرز هێندێ شتی دەگوت و دووبارە دادەنیشتەوە و بێ‌دەنگ دەما. جاروباریش کڵاوەکەی لەسەری هەڵدەگرت، کاکۆڵە درێژەکەی نیوەڕاستی سەری لە دەستی دەهاڵاندو دووبارە بە قینەوە کڵاوەکەی لەسەر دەنایەوە. دەستی توند بە دەسکی دەمانچە ساچمەزەنەکەیەوە گرتبوو:

"نەحلەت لەو یۆبازنۆغلی‌یە. بۆ خۆنواندن، بە خاتری ئەسپێك، بۆ خاتری ئەوەی دوو جنێو بە عەلی‌سەفابەگ بدا دێ‌یەکەی بە... دا. ئێستا وەرەو چارەسەری بکە داخوا دەتوانی؟ نەحلەت لەو یۆبازنۆغلی‌یە، ئاخرەکەشی لێی‌دا رۆیشت و هەڵات."

خەلکەکەش بە نێوچاوانی گرژەوە گوتیان:"نەحلەت لەو."

"ئەم کارەی، ڕاکردنەکەی پشتی ئێمەی شکاند. ئێستا ئیدی عەلی سەفابەگ وەغیرەت کەوتوە. دەمارمان دەردێنێ."

هەموان یەك دەنگ گوتیان:"دەمارمان دەردێنێ."

"یۆیازتۆغلی دەبێ بێتەوە."

بە تێکڕا پەسندیان کرد:

"چارەیەکی دیکە نیە، دەبێ بێتەوە."

سەفچەکاهیا گوتی:

"کوڕە وەسمان! ئەتۆ تەنیا جارێکیش بێ بچووە لای ئەو بەرازە. بزانین قسەی چیە؟"

هێندێك لە ئاومالّەکان گوتیان:

"سەفچەکاهیا! ئەتۆش لەگەڵ مام وەسمان بچۆ، ڕەنگە قسەیەکی هەبێ."

وەسمانەزلە گوتی:

"چ قسەیەکی هەیە؟ دەیەوێ بڵێ چی؟ هیچ، هەوڵ دەدا من بترسێنێ. دووبارە دەڵێ دێیەکەم بۆ بەجێبێڵن، ئەگینا وادەکەم، وا بچێ. باشە دەتانەوێ ئەم دێیە بەجێبهێڵین؟ دەتانەوێ دێیەکی دیکە ساز بکەین؟ زەینەڵ کە لە سووچێك لەسەر بەردێکی مەڕمەڕی چوارگۆشە دانیشتبوو کە بە خەتی کۆنی یۆنانی نەخشابوو، گوتی:

"ئێمە خێر لەم دێیە نابینین، پێنج جار قایمقاممان هێنا، یاوەرمان هێنا، هەر پێنج جارەکە گوتیان جێ دێیەکە ملکی عەلی سەفابەگە."

لەنێو ئاپۆراکە کەس سەری هەڵنەبڕی چاو لە چاوی زەینەڵ بکا. ئەو لەسەر قسەکانی ڕۆیشت:

"پێش ئەوەی وەزعەکە خەراپتر بێ، بڕۆین باشە. هەموو خەڵك خەریکن دەست لە چوکووراوا گیر دەکەن. با لە دێی عەلی سەفابەگ بڕۆین و بچین جێیەکی باش بۆخۆمان بگرینەوە."

وەسمانەزلە گوتی:

"ئەتۆ بێدەنگ بە تووتکەسەگ، ئەتۆ سەگی ڕستەکراوی عەلی سەفابەگی."

زەینەڵ کە نارەحەت ببوو، گوتی:

"قسەی وا مەکە مام وەسمان. ئەمن سەگی کەس نیم. بەڵام لەمەودوا ئێمە خێرێکمان لەم زەوییانە پێنابڕێ. قەباڵەی بەدەستەوەیە، حکوومەتیشی لە پشتە. لەکێوەکان چەتەی هەن، پڕی دێیەکی گەورەش خزم و تایەفەی هەیە. ئێمە لەم گوندە دەردەکا. درەنگ، یان زوو دەرمان دەکا. هەتا درەنگ نەبووە، هەتا چوکووراوایان دابەش نەکردوە، لە فکری چارەسەردا بین باشە. لەگەڵ عەلیسەفابەگمان پێ ناکرێ. جاران هەر خۆت نەبووی دەت گوت ئەم

زەوییانە بۆ ئێمە خێر نادەنەوە؟ چما هەر خۆت نەبووی دەت گوت دەچم لەگەڵ عەلی سەفابەگ قسە دەکەم بۆخۆمان دێیەکی دیکە پەیدا دەکەین؟ چما هەر خۆت نەبووی دەت گوت ئێستا کە عەلی سەفابەگ زۆری دڵ بە ئاناوارزا دا چووە، با ئەم باتلاغەو ئەم تاولەرزەو ئەم بەڵایە بەجێ بهێڵین و بڕۆینە دەوروبەری گوندی "مەمەدقوڵی" کە پڕە لە هەنار. بچینە بناری چیاکان؟"

سەفچەکاهیا پشتی قسەکەی زەینەڵی گرت و گوتی:

"پیرە وەسمان، راست دەکا، ئەتۆ بۆخۆت ئەم قسانەت دەکرد، ئەوەی ئەم قسانەی دەکرد هەر خۆت بووی. ئێستا پەژیوان بوویەوە."

"عارفەکەچەڵ" کە خەریك بوو چیلکەی لە خۆڵێ وەردەداو خەتی سەیرو سەمەرەی دەکێشان گوتی:

"مام وەسمان، راستت دەوێ ئەتۆ قسەکانت یەکتر ناخوێننەوە. با یان لێ‌دەین بڕۆین، یان پیاوانە راوەستین و شەڕ بکەین. چەندین ساڵە لەم گومان و دوودڵی‌یەدا مردین و لە نێو چووین. نیوەی خەڵکی دێ رۆیشتوون. چوونە پشتی دووملی‌قەڵا نێو زەوییە بەیارەکان. بە بەدبەختی گوزەران دەکەن. ئێمە قسەمان لەسەریەك نین."

موختار سەیفەلی گوتی:

"دوو بە دوو جارێکی دیکە دەچینەوە لای عەلی‌سەفابەگ قسەی لەگەڵ دەکەین. دەبێ ئەم کارە یەك لا بکەین. ئەم دوودڵی‌یە ئێمەی کوشت. ئێمەی کوشت..."

وەسمانەزلە بە قینەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا. زۆری رق هەستابوو. قەلنەکەی داگیرساند. لە جێی خۆی هەستاو لە حەوشەی دا دەستی کرد بە راوێچکە کردن:

"عەلی‌سەفابەگ لەگەڵ حکوومەت رێك کەوتوە. زوڵم و زۆر رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبێ. ئێمەش رۆژ بە رۆژ بێ‌غیرەت تر دەبین. وەختێك کالایچی کوژرا، پێیان وابوو بەدبەختی‌یەکەمان کۆتایی هات. وانیە؟ بەڵام عەلی سەفابەگ بێکار دانەنیشتوە، هەزار جۆر فێڵ و تەڵەکەی لێ‌کردین. وەختێك دیتم دەستمان بە هیچ کوێ راناگا، پێشنیارم کرد لێرە بڕۆین. هەر کە کالایچی مرد، عەلی سەفابەگ حکوومەت، ئەو کێوی زوڵمەی لەسەر رێگامان شین کردەوە. ئەو، ئەو کێوی مردنەی لەسەر رێگامان قوت کردەوە. حکوومەت دەستی لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا درێژە. دەستی لە هەموو جێیەك ئاوەڵایە. ئەگەر راستتان دەوێ ئێمەش بێ‌کیفایەت و دەست‌وپێ‌سپیلکەین. ئەمن دەم توانی چ بکەم؟ گوتم

واز لێره بێنین و بڕۆین. گوتم ئەو خاکەی باب و باپیرانمان، ئەم خاکە پڕ پیت و بەرەکەتە کە لە هەر دەنکێك سەد دەنك بەرهەم دەدا، کە باقە باقە نێرگزی زەردی لێ‌شین دەبێ، کە پنگەکەی بە گوڵە وەنەوشەکەیەوە دەگاتە رکێفی سواری، بەجێ بهێڵین و بڕۆین. دەم دی چارەیەکمان نیە. ئەوانەی لە ئاوایی رایان کردو رۆیشتن، نیوەیان لە ترسان بوو، نیوەشیان جاڕز ببوون و لەبەر ناهومێدی لێ‌یان دا رۆیشتن. عەلی‌سەفابەگ بە ژمارەیەکی زۆر کەم، بە ئەندازەی قامکی دەستان شتێکی کەمی دا. ژمارەیەکیش کە لێره دەڕۆیشتن، پێ‌یان وابوو دەتوانن زەوی‌یەکی زۆر باش و پڕ بەرەکەت بۆخۆیان پەیدا بکەن. بەڵام ئێستا مەسەلەکە گۆڕاوە، بە تەواوییش گۆڕاوە. ئێوە خەبەرتان نیە مەسەلەکە گۆڕاوە. بش مری لە چوکووراوا بستە زەوی‌یەکت دەست ناکەوێ کە سەری وێ بکەی."

حسام هەرچەند دەی‌زانی، ئەگەر بیروڕای خۆی بڵێ، بابی چەند هێندە تووڕە دەبێ، گوتی:

"ئێستا چ گۆڕاوە بابە؟ ئاخر هەر دوێنێ نەبوو کە عەلی سەفابەگ خانووی بەسەر یۆباژئۆغڵیی چارەڕەش دا خەراپ کردو ئەو بەدبەختەشی دوور خستەوە، چما هەر ئەو حەسەنی یۆباژئۆغڵی‌یە نەبوو جەندرمە هێندیان لێ‌دا لە بن خۆیەوە میست؟ چ فەرقی کردوە بابە؟ هەر ئەوە؟ بچوو ئەگەر توانیت یۆباژئۆغڵیی بێنەوە ئاوەدانی، با عەلی‌سەفاش بی‌کوژێ..."

حسام پێی وابوو بابی جنێو و قسەی سووکی پێ دەڵێ. بەڵام وا نەبوو. وەسمانەزلە نە تووڕە بوو، نە جنێوی دان.

نەختێك راوێچکەی کردو بیری کردەوە. لە کاتێك دا مژی توندی لە قەلنەکەی دەدان بیری کردەوە. تەماشای دەم و چاوی یەك یەکی ئاوماڵەکانی کرد. راوەستاو ماوەیەکی زۆر چاوی لەچاوی دێهاتی‌یەکانەوە بڕی. دەت گوت لە شتێك دەکۆڵێتەوە. لەبن پەرژینەکە چڵە گەزگەسکێکی هەڵکەند، لەنێو دەستی دا پلیشاندیەوەو فڕێی دا. وا دەهاتە بەرچاو کەلەبەرخۆیەوە قسە دەکا. چونکە گنجی نێوچاوانی جار جار گرژ دەبوون و جاروباریش دەکرانەوە. لێوەکانی و مووی ریشی دەبزووتن. لە قووڵایی چاوە چووکە شینەکانی دا لە پشت برۆ پڕ پشتەکانیەوە بریسکەیەك لێی داو کووژایەوە. زۆر چاك دیار بوو کە لە نێو دوودڵی‌یەکی بێ‌ئەندازە دا پەلەقاژەیەتی. جۆرێك بوو دەت گوت راست ئەو وەختە کە دەیەوێ قسە بکا، لە دەم لێك کردنەوە پەژیوان دەبێتەوە. بێ‌گومان وەسمانەزلە هێندێ قسەی لەسەر زاری بوون. بەڵام چ قسەیەك... هەرکەس فکری بۆ شتێك دەچوو، هەموویان بە بێ‌سەبری چاوەڕوانی بیستنی بوون.

سەرەنجام وەسمانەزلە بێدەنگی‌یەکەی شکاند:

"ئەمن ناچمە لای ئەو سەگە. بزانم چۆن دەتوانێ ئێمە لە دێی خۆمان دەربکا. هەرچی لە دەستی دێ با درێغ نەکا. ئەگەر ئەو حکوومەتی هەیە، چەتەکانی هەن، ئێمەش کەسێکمان هەیە."

یەکێك پرسی:"ئێمە کێمان هەیە؟"

وەسمانەزلە قەدی راست کردەوە، پشتە چەماوەکەی قایم راگرت و بە نەڕاندنێکەوە گوتی:

"یەکێك هەیە."

دیسان دەستی کردەوە بە راوێچکە. زۆر دوودڵ دیار بوو. بەرە بەرە خەریك بوو ماندوو دەبوو. لەشی پیری توانای هەڵگرتنی ئەو هەموو کێشە کێشە دەروونی‌یەی نەبوو.

لاقی راستی هێنایەپێش. یەك دوو جار قورسایی لەشی خۆی خستە سەر، ئەودەم دەستی راستی لەبەر پشتێنێی ناو زەردەخەنەیەکی هاتێ. رەنگی دەم و چاوی کەمێك تاریك بوو. دووبارە زەردەیەکی کردو ئەمجار قسەکانی داگیرساند:

"رۆژێك بوو، رۆژگارێك بوو، لووتکە کێوێك بوو. ئەم لووتکەیە دوندی کێوی هەزار بە هەزاری قاف بوو. تاریکایی‌یەکی ئەنگوستەچاو بوو کە گوللەی تێنەدەچوو. رێبواران رێیان ون کرد. لە هیچ شوێنێك تەنانەت دڵۆپێکیش رووناکایی نەدەتکاو هەرگیز رۆژ نەدەبۆوە. کێوی قاف دەخرۆشاو هەرگیز رۆژ نەدەبۆوە. رێبوارەکان لە تاریکایی دا نەیان دەتوانی بڕۆن. نەیان دەتوانی هەناسە هەڵکێشن. هیوایان لەلا بڕابوو. هەمووان دەیان گوت:"لە چیاکانی قاف هەرگیز رۆژ نابێتەوە... و هەر لەوێ لە دەوری یەکتر کۆ ببوونەوە. هەر لەوێ مابوونەوە. چل چەتە بە سەرکردەیەکەوە بە دوایانەوە بوون... ئەوانیش هاتبوون سەریان لە دیواری تاریکایی درابوو. ئەرێ، سەریان لێدرابوو... و راست وەك ئێمەیان لێ‌هاتبوو، و گوتبوویان:"با چی دیکە لە کێوی قاف نەمێنینەوە." و وەك ئێمە ترسیان ڕێ نیشتبوو..."

خەڵکەکە گوێیان هەڵخستبوو، چاوەڕوان بوون داخوا وەسمانەزلە دەڵێ چی و قسەکەی دەباتەوە کوێ. هەرجارێك کە وەسمانەزلە ناوی کێوی قافی دێنا، لەنێو ژنەکان دا دەنگی وردە پێکەنینی گاڵتە پێ‌هاتن بەرز دەبووەوە، و وەسمانەزلەش وادیار بوو نیازی نیە سەروبنی داستانەکەی لە کن یەك دابنێ. لەپەستا باسی کێوی قافی دەکردو باسی تاریکایی‌یەکەی کە گوللە کاری لێنەدەکردو بە شمشێر شەق نەدەکرا. قسەکانی بێسەروبەر بوون:"تاریکایی بە قورسایی تاتە بەردەکان کەوتبووە سەرشانیان، راست وەك خۆمان..."

سەرەنجام وەسمانەزلە ماندوو بوو و قسەکانی بەم چەند رستەیە تەواو کرد:

"بەڵێ، تۆپەڵە نوورێك کەوتە سەر ئەو تاریکاییە. لەو کاتەوە رێبوارانی کێوی قاف رێی خۆیان دەدۆزنەوەو لە دیواری تاریکایی تێدەپەڕن. تاریکایی ئێمەش تۆپەڵە نوورێکی تێکەوتوە."

هەناسەی لە سنگی دا راگرت:

"قسەکەم تەواو بوو. هەربۆیەشە ئەمن بۆ پاڕانەوە ناچمە لای عەلیسەفابەگ. هەرکەس دەیەوێ بچێ با بچێ، ئەمن بەش بە حاڵی خۆم ناچم. چونکە لە نێو تاریکایی دا... ـ زمانی بە لێوەکانی دا گێڕا ـ لەنێو تاریکایی دا تۆپەڵە نوورێك پەیدا بووە. شەوی تاریکمان بووەتە رۆژی رووناك."

سەفچەکاهیا داهاتەوەو بەسپایی بە گوێی حسامی دا چپاند:

"رۆڵە، حسام! وادیارە بابت زۆر پیر بووە. دەڵێ چی؟ ئەتۆ هیچ لە قسەکانی تێگەیشتی؟"

حسام گوتی:

"هیچ تێنەگەیشتم. بابم شتێکی بەسەر دێ. زۆر پیر بووە."

خەڵکەکە بێئەوەی هیچیان دەست کەوێ، یەك یەك و دوو دوو ماڵێ وەسمانەزلەیان بەجێ هێشت.

وەسمانەزلە دواقسەشی کرد:

"بچن بەو سەگە کە ناوی سەفایەو پێی دەڵێن بەگ، بڵێن کە ئەمن قسەیەکم نیە لەگەڵی بکەم. پێی بڵێن هەموو هەورازێك سەرەوژێرێکی هەیە. بچن ئەمانەی پێ بڵێن."

چووەوە ماڵێ. بە قینەوە دەرگای هۆدەکەی لەسەر خۆی پێوەداو بە پەلە چووە لای حەمەدو پرسی:

"کوڕم، گوێت لە قسەکانم بوو؟"

"گوێم لێ بوو، مام وەسمان!"

"باشم قسە کرد، وەنا؟"

حەمەد گوتی:

"زۆر باش بوو."

"بە باوەڕی تۆ تێگەیشتن مەبەستم لەو نوورە کە کەوتوەتە نێو تاریکایی، چ بوو؟"

حەمەد لە کاتێك دا هەناسەیەکی هەڵدەکێشا، گوتی:

"رەنگە، کێ دەزانێ؟ بەڵکوو تێش گەیشتبن."

## (۱۱)

وەسمانەزلە بە دەنگی تەقەی لە خەو راپەڕی و دەسبەجێ چووە دەر. دەنگی تفەنگەکان وەك دەسرێژێك هات و بێدەنگ بوو. لە هەر چوار سووچی ئاوەدانی دەنگی سمی ئەسپان دەهات. دەنگی سمی ئەو ئەسپانە کە بە لینگدان و زۆر خێرا لە دەوری گوندی هەڵدەسووڕان. تاوێك دواتر دیسان دەسرێژێکی دیکە لە ئاوەدانی کرا. هەر کە دەنگی دەسرێژی گوللە بەرز بووەوە، لە پشت بەردەنووسێکی سپیەوە کە راست بەرامبەری وەسمانەزلە بوو، پێنج جار دەنگی تەقە وەڵامی دایەوە. وەسمانەزلە بە دەنگی گوللەیەك کە راست لە پەنای هاوێژرابوو سڵەمیەوەو لە حاڵێك دا سێ هەنگاو دەکشایەوە، گوتی:

"حەمەد، کوڕم ئەتۆی؟"

دەسبەجێش لێی زیاد کرد:

"ئەمنت تۆقاند."

حەمەد بە دەنگێك کە بە زەحمەت دەبیسترا، گوتی:

"مام وەسمان! ئەمنم."

"ئێستا بچۆوە ژووریێ و جارێکی دیکەش هەتا ئەمن پێت نەڵێم، مەیە دەرێ. خۆت ناڕەحەت مەکە. ئەگەر دێیەکەشیان وەبەر تۆپ دا گوێ مەدەیە. باشە کوڕم؟ جارێ نۆرەی تۆ نەهاتوە."

حەمەد لە بن بەردە سپیەکە هەستاو چووەوە ژووریێ. وەسمانەزلە لە دوایەوە گوتی:"راستەڕێ برۆ نێو دۆڵابیەکە. برۆ رەحەت لێی بخەوە."

ئەمجار بە میهرەبانیەکی بێئەندازەوە لە کاتێك دا زگی بە حەمەد دەسووتا، لەبەر خۆیەوە گوتی:"بەستەزمانە لە بەیانی هەتا شەوێ لە بستە جێیەك دا بەسەر دەبا. ماڵەکەی من بۆی

بووەتە زیندانێك لە هەموو زیندانان خەراپتر. شەهێنی من، حەمەدۆکی من بە میوانی هاتوەتە ماڵێ من. بڕوانە ئەمنیش چۆنی میوانداری لێدەکەم. وەسمانەزلە! ئەوە کە دەڵێن گورگ ئەگەر پیر بوو دەبێتە سودرەی سەگان، ڕاست نیە. گورگ ئەگەر پیر بوو هەر دەبێتە سەگ. ئافەریم بۆ تۆ، چاکت پێشوازی لە حەمەدۆك، لە شەهێنی چیاکان، لە هەڵۆی سەر دوندەکان کرد. ئافەریم بۆ تۆ ئافەریم. ئەگەر بیست ساڵ لەمەوبەر بووایە، ئەتۆ ئاوات میوانداری لە جگەرگۆشەکەت، لە شەهێنەکەت دەکرد؟ ئاخ... گورگەکان... سەگ... ئافەرین بۆ تۆ کوڕە..."

چاوە تەڕەکانی پاك کردنەوە. سوارەکان بە غار بە دەوری دێی دا دەسووڕان و هەر تاوە نا تاوێك چەند تفەنگێکیان بە ئاوەدانیەیەوە دەنان. لە تاریکایی دا، نم نم باران بەسەر شەو دا دەباری.

وەسمانەزلە هاتەوە ژوورێ. دایەقەمەر ئاگری هەڵکردبوو. لەبەر ئاگر هەڵکورمابوو:

"دایەقەمەر ئەوە چیە، ناڕەحەتی؟ بۆچی وا دانیشتووی؟"

"چ رووی داوە وەسمان، چیمان بەسەر دێ؟"

"هیچ نەبووە. عەلیسەفابەگ دەیەوێ دێهاتیەکان چاوترسێن بکا. ئەمە فێڵێکی زۆر کۆنە."

"دێهاتیەکان چ دەکەن؟"

"دێهاتیەکان خەویان گرانە. کەس نەهاتوەتە دەرێ."

وەسمانەزلە خۆی لەبەر کردەوە. لەبەر ئاگر دانیشت و خەریکی پڕ کردنەوەی هەردوو لوولەی دەمانچە ساچمەزەنەکەی بوو. ئەودەم لە حاڵێك دا خۆی ئازا نیشان دەدا، گوتی:

"دایەقەمەر، هەردوو لوولەی دەمانچەکەم داگرتووەتەوە. خوا دەزانێ لە هەرکەس بدرێ دیواودەری دەکا. قوڕ بەسەری ئەو کەسەی لە ڕاستم ڕا دێ. هاوار بە حاڵی. دایەقەمەر! تەماشاکە، ئیدی دەستم نالەرزێ. ڕاست وەك ئەو ڕۆژانە..." دەستی ڕاست بە دەمانچەکەوە هەڵێناو چاوی لێك ناو سێرەی گرت. هەر بەڕاستی دەستی نەدەلەرزی.

زۆر نیزیك، لە پشت ماڵێوە دەنگی تەقە هات.

وەسمانەزلە لە حاڵێك دا دەیگوت:"بەنێو دێی وەربوون"، دەرپەڕی. لە دەرێ، لەو تاریکاییەدا لە پشتەوەی ئاوەدانی ئەسپەکانیان لینگ دەدان. جار جار دەنگی سمیان کپ دەبوو و ڕێژنەیەك گوللە دەباری.

وەسمانەزلە لەبەر خۆیەوە گوتی:"لە حەوشەی ماڵێ دا نابێ. ئەگەر یەکێك لەو سەگانە لەم حەوشەیەدا بکوژم، جەندرمەکان دادەبارن و ماڵەکە سەرەوبن دەکەن. وەسمانەزلە، پیرەوەسمان! ئاوا بکەی بە چاکی کارەکە تێك دەدەی. ئێستا زۆرمان میوانداری لێ‌کردوە، بەستەزمانە کوڕەکەمان لە دۆلابی کردوەو ئێستاش بە هەردوو دەستان دەی‌دەینە دەستی جەندرمەکان..."

لە حەوشی ماڵێ هاتە دەرێ، چووە حەوشەی ماڵێ حسامی کوڕی. لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئەگەر یەکێك لەو سەگانە لەم حەوشەیەش دا بتۆپێنم، هەم ماڵێ حسامی دەگەڕێن و هەم ماڵێ خۆمان." بازی دایە ماڵی "قۆرت کەریم" کە دراوسێی دیوار بە دیواریان بوو. سوارەکان بە تاو بە کۆڵانەکانی ئاوایی دا تێ‌دەپەڕین. وەسمانەزلە لەبن بەردێك دامەزراو لوولەی دەمانچەکەی لە کۆڵانێ کردو چاوەڕێ ما. باوەڕبەخۆبوونێکی سەیری لە خۆی دا هەست پێ دەکرد:"ئەگەر یەکێك لەمانە لە لەوەڕ بخەم، خوا دەزانێ حەمەدۆکم، کوڕەکەم چەندی پێ خۆش دەبێ. ئەودەم تێ‌دەگا کە مام وەسمان لەو گورگانە نیە کە ئەگەر پیر بوون دەبن بە سەگ. هەموو گورگێك ئەگەر پیر بوو، نابێ بە سەگ. گورگی ئازا بە پیرییش هەر ئازایە. با یەکیان بێرەدا تێ‌پەڕێ... مانای رمبازێنی نێو دێیان تێ‌دەگەیەنم، تێیان دەگەیەنم کە چۆن ئاوایی وەبەر گوللە دەدەن..." گوللەکان بە ویزەویز بە سەر ماڵی قۆرت کەریم دا تێ‌پەڕین. دەنگی پێی ئەسپەکان نیزیکتر بووەوە.

وەسمانەزلە لە کاتێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن، لەدڵی خۆی دا بیری کردەوە:"ئەی دادو بێداد! بەو کۆڵانەی دیکەدا ڕۆیشتن." تاوێك دەنگی پێی ئەسپەکان کپ بوو. دەنگی تەقەیەکیش نەهات و بێ‌دەنگی‌یەکی تەواو دێیەکەی داگرت. وەسمانەزلە گوێی بە دەوروبەردا گرت، دەنگێك نەدەهات و جووڵەیەك نەدەبینرا:"خەڵکی دێی هەموویان مردوون براله! خوێنی هەموانیان وشك بووە. سبەینێ بەیانی ئەمانە پێشیان پێ‌ناگیرێ. دێیەکەی بەجێ دێڵن و هەڵ دێن. پاشانیش ئەم گوندی وایوایە بە نێرگزە زەردەکانیەوەو بە پنگە شینەکانیەوە وەك بەری دەستی لێ‌دێ. بڕوانە، توخوا بزانە کەس جیکەی لێ‌دێ، کەس هەناسە هەڵدەکێشێ؟ براله! دەڵێی خۆڵەمێشیان لەسەر دابێژتوون. ئەگەر بزانن، ئەگەر بزانن حەمەدۆك لەنێو دێیە، هەموویان وەغیرەت دەکەون. نە عەلی سەفابەگی بە پیاو دەزانن نە هیچ کەس، ئەگەر بزانن..." پێکەنینی هات:"ئەم سەگانە چیان لێ‌هات؟ لیباسە جوانەکانم خەریکە تەڕ دەبن. با بێن تا ئێمە کاری خۆمان بکەین. ناکا دێیەکەیان بەجێ هێشتبێ و ڕۆیشتبن؟ نا، مومکین نیە بڕۆن. هەتا بەیانی لێرەن."

تاوێك دواتر دووباره له سەرەوەی ئاوەدانی دەنگی تەقەیەکی بەردرێژ هەڵستا. ئەسپەکان حیلاندیان و رەشایی سوارەکان بە خێرایی بە پێش وەسمانەزلە دا تێپەڕی. سوارەکان ئەوەندە خێرا تێپەڕین کە وەسمانەزلە دەرفەتی چووکترین دژکردەوەی نەبوو. دەستی و تەواوی ئەندامی لەشی دەلەرزین. لە دڵی خۆی دا گوتی:"دووباره دێنەوە." و زۆر زوو پێش بینیییەکەی وەدی هات و راست لەو لەحزەیەدا کە سوارەکان لێی نیزیك بوونەوە هەستایە سەرپێ. هەستان و دەمانچە تەقاندنی یەك بوو. بە دوای دەنگی بەسامی دەمانچەکەدا هاوارێك شەوی قەڵاشتەوە. رەشایی سوارەکان لە چاولێك نانێك دا لە ئاوەدانی وەدەر کەوت و هاواری ئەو کابرایەی وەسمانەزلە لێی دابوو جارێکی دیکە لە دووری، لە نیزیك گۆلاوەکەوە هاتە بەرگوێ.

وەسمانەزلە بە خۆشحاڵییەوە گەڕایەوە ماڵێ. هەر کە گەیشتەوە لەگەڵ حەمەدۆکی بەرەوڕوو بوو، کە جلکی لەبەر کردبوون و هەموو چەك و چۆڵەیەکی لە خۆی دابوو. تەنانەت دووربینەکەشی لە ئەستۆی کردبوو:

"گوێت لە دەنگەکەی بوو حەمەدی خۆم!"

"گوێم لێ بوو دەستت نەرزێ."

"وەك گا دەیبۆڕاند. پێت وایە وەکوێی کەوتبێ."

حەمەد گوتی:

"لە کلاوەی ئەژنۆی دراوە. زۆری ئێش هەیە. پیاوی شپرزە دەکا. کەسانێك ئاوا هاوار دەکەن کە گوللە، یان لە کلاوەی ئەژنۆیان بدرێ، یان لە شانیان."

وەسمانەزلە لە سەرتاپای حەمەدەوە ڕاماو گوتی:

"چ بووە کوڕم، جۆرێکت لیباس لەبەر کردوون دەڵێی بەسەفەر دەچی."

حەمەد وەك داوای لێبووردن بکا گوتی:

"ببوورە مامە، عادەتی خۆمە. وەختێك تەقە بێ، دەبێ حازرو ئامادە بم."

وەسمانەزلە بە دەم هەناسە هەڵکێشانەوە گوتی:

"ماندوو بووم کوڕم، پیر بووم. ئەمەم ئەمڕۆ بە تەواوی بۆ دەرکەوتوە کوڕم. کەمی مابوو کابرای نەپێکم. کەمی مابوو... زۆرم پێ خۆشە بزانم، حەمەد، پێت وایە کێ بووبێ؟"

حەمەد لەبەر خۆیەوە گوتی:"دەبێ کێ بێ؟ ناکرێ بڵێی کێیە. چەند خۆش دەبوو عەلیسەفابەگ خۆی بووایە."

وەسمانەزلە کە چووبووە بەر ئاگردان، گوتی:

"کوڕە باش تەڕ بووم. ئەم جلکانەت چاو لـێیە شەهێنەکەم؟ ئەم جلانە لەو ڕۆژەوە کە لە بەرگدرووم وەرگرتوونەوە، هەمیشە بارانیان وێکەوتوە. بیست و پێنج ساڵە."

لە پاشان ڕووی کردە حەمەدو گوتی:

"شەهێنەکەم، عەلیسەفا نایەتە ئەم جۆرە جێیانە. بۆ ئەم جۆرە جێگایانە سەگەکانی دەنێرێ. دیسان زۆرم پێ خۆش بوو زانیبام کێیە بەرکەوتوە."

جلەکانی دانان. دانیە دایەقەمەرو گوتی:

"دایەقەمەر ئەمانە بگرە بە ئاوریان ڕادێرە با باش وشك بنەوە."

حەمەد پرسی:

"ئەمشەو دیسان دێنەوە؟"

"دەتەوێ چ بکەی؟"

حەمەد گوتی:

"هیچ، هەروا پرسیم."

"ئەمانە ویستیان هەتا بەیانی لەنێو دێی دا بگەڕێن. لە دەوروبەری دێ و لە دەرەوەی دێ بسووڕێنەوە. بەڵام بەو کارەی من کردم، ئەمشەو ئیدی نایەنەوە. ئێستاش کابرا دەنەڕێنێ، حەوتوویەك دەبێ هاوار بکا. ئەو ساڵەت لەبیرە کە ئەتۆ لە کالایجیت دا. عەلیسەفا تا بەیانی دێیەکەی وەبەر گوللە دابوو. بەڵام هەر کە کالایجیت کوشت، لە گووخواردنەکەی پەژیوان بووەوە. ئەمشەویش هەروایە. سبەی شەو دووبارە پیاوەکانی دەنێرێ دێیەکەی وەبەر گوللە بدەن... ئەگەر ئێمە لە پێشی ڕاوەستین و بەڵام لێشی بترسێین، ئەو هەزار جۆر سەگ و سەگبابی وەڕێ دەخا... بەڵام ئەگەر هەم لە پێشی ڕاوەستین و هەم لێی نەترسێین، عەلیسەفا دەترسێ و لەسەر پەت و سینگی خۆی ڕادەوەستێ. ئەگەریش لەگەڵ ئەوەی پێشی پێ دەگرین لێی بترسێین... سبەینێ یەکی دیکەشیان لـێدەنگێوم."

وەسمانەزلە وێڕای ئەوەی وەك منداڵی خۆشحاڵ دەستی ڕێك دەخشاندن، درێژەی بە قسەکانی دا:

"ڕاستە پیر بووم. بەڵام لەگەڵ ئەوەی لە تاریکی دا تەنیا تارمایییەکەیم دی، دیسان هەنگاوتم. هەنگاوتم برالە! سبەینێ یەکی دیکەشیان دەپێکم، دووسبەش یەکی دیکە... چەند ڕۆژان بێن، ڕۆژی یەکێکیان لـێکەم دەکەمەوە. هێندانیان لـێدەپێکم هەتا خەلاس دەبن، هێندانیان لـێدەنگێوم هەتا شپرێو دەبن. ئەوەی ئەمرۆ لەکلاوەی ئەژنۆیم داوە. ئەوانی دیکە

راست لەسەر دڵیان دەدەم. وانیە کوڕم؟ لە دەستانیان فرمیسکی خوێن گریاوین. ئەم دێهاتی‌یانە ترسەنۆکن. ئەگەر نیوەیان نەدەچوونە دوومڵی‌قەڵا ئەم بەڵایەمان بەسەر نەدەهات، ئەگەر ئەوان دێ‌یەکەیان چۆڵ نەکردبایە، ئەگەر یۆبازئۆغلی نەڕۆیشتبایە، ئەم بەڵایانەمان بەسەر نەدەهات. دەبێ بچم یۆبازئۆغڵیی بێنمەوە. دەبێ بچمە دەوروبەری دوومڵی، بەو دێهاتی‌یانەی دوور خراونەوە بڵێم بێنەوە ئاوەدانی. نابێ؟"

حەمەد کە کەوتبووە فکرێکی زۆر قووڵەوە سەری بە نیشانەی سەلماندن بۆ راوەشاند.

دایەقەمەر کە روخساری لەبەر بێ‌خەوی سیس ببوو، خەریك بوو لەبەر ئاگر پانتۆڵی مام وەسمانی وشك دەکردەوە. وەسمانەزلە رووی تێ‌کردو گوتی:

"دایە زۆر ماندووم. ئەو دەمانچەیەم وێ دە. تێسقەو فەڵاسقەکانیشم وێ دەو ئەختێکیش کۆنە پەڕۆی وشکم بۆ بێنە با ئەو بێچووە شێرەی داگرمەوە. ئێمە سبەی شەو دیسان پێویستیمان پێی دەبێ."

وەسمانەزلە بە وردی دەمانچەکەی داگرتەوە.

ئیدی نە دەنگی تەقە هات و نە دەنگی پێی ئەسپان. هەتا سبەینێ لەگەڵ حەمەد چۆکیان وەچۆکی یەکتر دا. وەسمانەزلە قسەی کردو حەمەدیش گوێی بۆ راگرت.

## (١٢)

هێشتا هەتاو نەکەوتبوو، وەسمانەزلە هاتە ماڵێ موختار سەیفەلی. سەیفەلی لەبەر ئاگردان لە نیزیك ئاگرەکە هەڵترووشکابوو بیری دەکردەوە. هەرکە وەسمانەزلەی دی، راست بووەوە. دیار بوو زۆری بێخەوی کێشاوە. هەر بە لا دا دەهات. لە حاڵێك دا زۆر خەفەتبار دیار بوو گوتی:

"فەرموو دانیشە مام وەسمان!" و بە دەنگێکی نووساو و شەرماوییەوە لەسەری رۆیشت:"دیتت چمان بەسەر هات؟ دیسان دەستی پێکردەوە."

وەسمانەزلە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

"چاوەڕوانی چ بووی؟ دانیشێ دوعای خێرمان بۆ بکا؟ وەختێك ئێمە وەك ژنان دەچین لە قوژبنی ماڵێدا خۆ دەشارینەوەو جیکەشمان دەرنایە. نیوەی دێهاتییەکان لە ترسان هەڵدێن دەچنە دووملی و دەچنە "یوورەگیر"، وەختێك یۆیازئۆغلی پاش ئەوەی ساڵێك سواری ئەسپی کابرا بووەو گووکاریی کردوە، هەر کە خانووەکەی سووتاو دوو داری لێدرا، رایکرد، هەر دەبێ عەلیسەفابەگیش ئەم بەڵایانەمان بەسەر بێنێ."

"ئێستا فەرموو دانیشە مام وەسمان، فەرموو ئێرە."

وەسمانەزلە لەبەر ئاوری لەسەر دۆشەك هەڵترووشکا، زەردەخەنەی لە لێوان نەدەکەوت:

"ناڕەحەت مەبە موختار!"

پاشان لە کاتێك دا بە پۆلووی ئاورەکە قەلنەی دادەگیرساند، لێی زیاد کرد:

"هیچ ناڕەحەت مەبە. ئەو نوورەی کەوتە سەر شەوی کێوی قاف لە شەوی ئێمەشی داوە. بە قودرەتی خواوەندی میری مەزن لە پشت هەر تەپۆلکەیەوە هەتاوێك دەردەکەوێ. خوا یەکە، بەڵام دەرگای هەزارو یەك... هەتا بەندەی خوا تووشی تەنگانە نەبێ، خدری زیندە فریای

ناکەوێ. حەزرەتی خدریش لە شکڵی کۆترێك دا دێتە ئێرە. خەفەت مەخۆ سەیفەلی، هەتا ئێستا چ شەوێکت دیوە، ڕۆژ نەبوویێتەوە؟"

سەیفەلی بەبێباوەڕی تەماشایەکی دەم و چاوی وەسمانەزلەی کرد. وەسمانەزلە لەو تەماشا کردنە حاڵی بوو و دڵی ئێشا. لە حاڵێك دا لەسەر هەموو وشەکانی ڕادەوەستا، گوتی:

"کوڕی خۆم! هەتا ئێستا چەند شەوت دیون بەیانیێیان نەبووبێ؟"

پاشان بە هەموو دەنگی خۆی هاواری کرد:

"ڕۆڵە موختار، ئەم جۆرەم چاو لێ‌مەکە."

سەیفەلی بەخۆ دا شکایەوەو بە نەرمی گوتی:

"مامە، بن زمانەیەکت هەیە. هەموو، هەموو خەڵکی ئاوایی گەورەو چووك لە تاوان خەریکە دیق دەکەن."

وەسمانەزلە نەڕاندی:

"با دیق بکەن، با بتەقن. دیارە شتێکم لە بن زمانی دا هەیە، بۆ نەبێ؟ ئەمن دەستی خدری زیندەم گرت، بۆ نەیگرم؟ دوێنێ شەو گوللەیەك هاویژرا. بۆ ناویژرێ؟ سوارێك وەك گا هۆڕاندی، بۆ نەهۆڕێنێ؟ بڕوانە ئەم دێیە. دەڵێی گۆڕستانێکی هەزار ساڵەیە، بۆ وا نەبێ؟ بەم وەزعەوە چیمان لە دەست دێ. ئەتۆ پێم بڵێ، ریش سپیی ئەم دێیەی، بۆ نەبی؟"

لەو بەینەدا "مەلافەرهاد" هاتە ژوور. پیاوێك بوو کە سی ساڵە دیار بوو. باڵابەرز بوو. دەم و چاوی درێژوباریك، ڕوومەتی سوورو سپی و برژانگی زۆر درێژ بوون. چەند ساڵ لەوەپێش هاتە وایوای و لەوێ مایەوە. هەرلەوێش ژنی هێنا. ژنەکەی "ئایشە" دوو کوڕو دوو کچی لێی هەبوون. کەس نەیدەزانی لە پێش دا چ کارە بووەو لەکوێ ڕا هاتوە. زۆر شتیان لەبارەی دا دەگوت.

سەیفەلی بە دیتنی مەلافەرهاد یەك پێ هەستاو گوتی:

"مامۆستا فەرموو بۆ ئێرە."

وەسمانەزلە بە هاتنی "مامۆستا" نەختێك دامرکایەوە. لە جێی خۆی دانیشتەوەو بەراوێژێکی نەرمتر دووپاتی کردەوە:

"دەکرێ نەبێ؟"

مەلافەرهاد بە دەم دانیشتنەوە پرسی:

"وەسمان ئاغا چ دەکرێ نەبێ؟"

وەسمانەزلە تەماشای مەلافەرهادی کردو گوتی:
"ئەوەی لە بن زمانم دایە."
مەلافەرهاد بە سەرسوڕماوی گوتی:
"ئەتۆ چەند رۆژێکە گۆڕاوی. وادیارە شتێکت لەبن زمانی دا هەیە."
وەسمانەزلە کەمێك لە جێیەکەی خۆی هەستاو گوتی:
"بەڵێ هەیە. شەوێکیان نوستبووم. لە خەوێم داگوێم لە دەنگێك بوو. یەکێك بانگی دەکردم وەسمان، وەسمانەزلە. دەرپەڕیم و دەرگام کردەوە. کۆترێك هاتە ژوورێ. چاوەکانی وەك دوو دڵۆپە نوور بوون. کۆتر لەو پێستە هاتەدەرێ. حەزرەتی خدر بوو. ریشە سپیەکەی وەك هەتاو دەدرەوشا. دەستی گرتم. نە لە خەودا بووم، نە تەواویش بەخەبەر بووم. تۆپەڵە نوورێکیش کەوتە سەر شەوی رێبوارەکانی کێوی قاف. و مەلا، ئەتۆ باوەڕ بەمە ناکەی. تۆ باوەڕت بە مۆجیزە نیە، وانیە؟"
مەلافەرهاد گوتی:
"نا، باوەڕم پێ نیە."
وەسمانەزلە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:
"نا...خ مەلا ئاخ. خۆزگە دەم توانی ئەوەی لە دڵم دایە بیهێنمە سەر زمانم. موسوڵمانی خوای ئەم رۆژانە لە کوێ بووی؟ دیسان خۆت ون کرد. شەوی رابردوو لێرە بووی؟"
"ئەرێ، لێرە بووم."
"چیت کرد؟"
"هیچ، لە جێی نەهاتمەدەر."
وەسمانەزلە خەریك بوو بتەقێ. ئەم خەڵکە چەند نازیرەکن. پەنا بۆ هەموو فێڵێك دەبەن تا مەبەستەکەیان دەست کەوێ. کەچی هەر تێناگەن. تەنانەت پیاوێکی بەهۆشی وەك مەلافەرهادیش حاڵی نابێ. چەند پێی دەگوت:"خدری زیندە لە ماڵێ منە. تۆپەڵە نوورێك کەوتوەتە نێو تاریکی و ناهومێدیەکانمان، نهێنیەك لە دڵم دایە." ، دیسان کەس حاڵی نەدەبوو. ئاخر لەوەی بێپەردەتر دەکرا بڵێ؟ چما دەکرا راست و رەوان بڵێ چەند شەو لەمەوبەر حەمەدۆك هاتە ماڵی ئێمە؟ دەکرا بڵێ؟ بێگومان ئەگەر وایگوتبایە دێهاتیەکان غیرەتیان دەهاتە بەر، دڵیان قایم دەبوو. بەڵام ئەگەر لەو نێوەدا سەگێك پەیدا بایەو چووبا راپۆرتی بە ئاغایەك یان بە حکوومەت دابایە، ئەودەم چ رووی دەدا؟ چما حکوومەت و

ئاغاكان هەرچی سەربازو بەكرێگیراویان هەیە نەیان دەنارده نێو دێی؟ لەشی بریندارو جەستەی منداڵانەو رێك هاتووی حەمەدی هاتە بەرچاو كە بە چل گوللە لەشی نازەنین و دڵی پڕ ئاواتی كون كون بووە... دەیهێنایە پێش چاوی خۆی پاش ئەوەی لیباسەكانیان لەبەر حەمەد دەكردو چەك و چۆڵەكەشیان دەدایە دەست، لە پەنای دیوار وێنەیان دەگرت. دێهاتییەكانیشی دەدی كە بە گریان و تازیەباری وەك هەتیوان دەورەی تەرمەكەیان داوەو ئاغاكانیش بە خۆشحاڵی پێدەكەنن. لەبارەی حەمەدەوە نەدەبوو باوەڕ بە چاوی خۆشی بكا. بەڵام بێدەنگییش مومكین نەبوو. داخوا باشتر نەبوو پاش ئەوەی سوێندو قورئانی دا، مەلافەرهادی لە مەسەلەكە حاڵی بكا؟ مەلا لەگەڵ خەڵكی دێ فەرقی هەبوو. مەلافەرهاد پیاوێكی پیاو بوو، ساردو گەرمی چاشتبوو. ئاخر خۆ دەبێ كەسێك هەر بزانێ كە... ئا...خ ئاخر خۆ دەبێ كەسێك هەر بزانێ...

وەسمانەزلە لە جێی خۆی هەستاو بە راوێژێكی بڕیاردەرانەوە گوتی:

"مەلا، با چەند دەقیقەیەك بچینە دەرێ."

مەلافەرهاد دەسبەجێ هەستا، دەستی دایە بن پیلی وەسمانەزلەو پێكەوە چوونە دەرێ.

وەسمانەزلە دەیناڵاندو دەیگوت:

"ئاخرەكەی ئەم دێهاتییانە دێیەكەی چۆڵ دەكەن و دەڕۆن. ناتوانن خۆ رابگرن."

"ئەمنیش هەر پێم وایە. ئەگەر چەند ماڵی دیكە ئاور تێبەردەن و ئەگەر چەند شەوی دیكە سوار بە نێو دێی وەربن و دێیەكە وەبەر گوللە بدەن، كەس لە ئاوەدانی دا گیر نابێ، هەموو هەڵدێن... ئەوانەی رۆیشتن ترسەنۆك بوون، لەو جێیەی بۆی چوون هیچ حاڵ و گوزەرانێكیان نیە، زۆر ناخۆشیان لێدەگوزەرێ. ئەوان لە دەستی عەلیسەفابەگ رایان كرد، چما ئەو جێیەی بۆی چوون عەلیسەفابەگی نیە؟ مام وەسمان! لە بن هەموو بەردێك عەلیسەفابەگێك نووستوە. دێهاتییەكان یان دەبێ لەگەڵ ئەم عەلیسەفابەگانە شەڕو بەربەرەكانی بكەن، یان دەبێ ببنە نۆكەری ئەڵقە لەگوێیان و وەدوای كاری خۆیان بكەون. خوا عەبدی خۆی خەڵق كردوە، بۆ ئەوەی خەڵق نەكردوە كە ببێتە نۆكەری خەڵكی دیكە. پیاو ئەگەر دژی زوڵم شەڕ نەكا، وەك لەگەڵ خوا بەشەڕ هاتبێ وایە. باشە، ئێستا پێم بڵێ ئەوە چیە لە دڵی خۆت دا شاردووتەتەوە؟"

وەسمانەزلە وەڵامێكی نەدایەوە. هەر فكری دەكردەوە. هەرچەند زۆر تامەزرۆی دركاندنی بوو، بەڵام لەوە كە هەر خۆی ئاگای لەو نهێنییە هەیە، هەستی بە لەزەتێكی

بێئەندازە دەکرد. هەروا ڕۆیشتن هەتا لە دێی وەدەر کەوتن. گەیشتنە دارە عەرعەرەکان. هەرچەند لەسەرەخۆ بەرێ دا دەڕۆیشتن، بەڵام وەسمانەزلە پشووی سوار ببوو و لە ئاوری دوودڵی دا دەسووتا. مەلافەرهاد سات بە سات ئاڵوگۆڕی دەروونیی ئەوی لە سیمای دا دەخوێندەوە:"بڕیاری داوە بیدرکێنێ، ئێستا دەیڵێ..." و چاوەڕوان دەماو پاش تاوێك لە گۆڕانی سیمای ڕا هەستی دەکرد کە لە درکاندنی پەژیوان بووەتەوەو ئەودەم تووشی هەستێکی سەیری کون پشکنین دەبوو. سەرەنجام مەلافەرهاد کە حەوسەلەی تەواو ببوو، گوتی:

"خۆت ماندوو مەکە وەسمانەزلە! لە هەل و مەرجی ئێستا دا ئەتۆ ئەم نهێنییە لەلای کەس نادرکێنی. ئەتۆ دڵت نایە بەخۆشتی بڵێی! خۆت ماندوو مەکە."

راست دەکەی مەلا، تەنانەت بۆخۆشم پێ حەیفە."

لە پاشان ڕاوەستاو ماوەیەکی درێژ لە چاوی مەلاوە ڕاما:

"مەلا، سوێندو قورئان دەخۆی بە کەسی نەڵێی؟"

مەلافەرهاد گوتی:

"سوێند دەخۆم."

وەسمانەزلە بێدەنگ بوو، و دیسان چاوی لە چاوی مەلاوە بڕی و ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد. وەك کەسێك دەچوو کە لەخەوێ دا بە ڕێگادا بڕوا.

پاش تاوێك گوتی:

"ببوورە. پەژیوان بوومەوە. ناتوانم بیڵێم. تەنیا ئەوەندە بزانە کە حەزرەتی خدر لە دێی خۆمانە. تۆپەڵە تۆپەڵە نوور ڕژاوەتە نێو تاریکایی و هێندێ مۆجیزەی گەورەش روویان داوە."

قۆڵی بە قۆڵی مەلا دا کردو وەڕێ کەوتن. وەسمانەزلە دوودڵ بوو و سەرتاپا شەڵاڵی ئارەق بوو. کاتێك گەیشتنەوە ئاوایی و چوونە ژووری ماڵێ سەیفەلی خەریك بوو هەتاو دەکەوت و خاکی بەهاری هەڵمی لێهەڵدەستا.

کە چوونە ژوورێ، سەیفەلی چاوەڕێیان بوو. حسام و زەینەڵ و دایەقەمەرو چەند دێهاتیی پەرێشان کە شوێنەواری بێخەویی سەرانسەری شەوی رابردوو لە روخساریان دا دیار بوو لە پەنای دانیشتبوون و چاوەڕێ بوون.

سەیفەلی گوتی:

"ئێستا پێنج شەش کەسمان سوار دەبین دەچینە مەخفەر شکایەت دەکەین، لە پاش مەخفەر دەچینە لای قایمەقام، پاش قایمەقام برووسکە بۆ والی و ئەمجار بۆ مستەفاکەماڵ پاشا لێدەدەین."

وەسمانەزلە بە بیستنی ئەم قسانە دڵی خۆی گرت و پاش ئەوەی بە قاقایەکی بەردرێژی تێکەڵ بە کۆخەسواربوون تێرو پڕ پێکەنی، گوتی:

"کوڕە سەیفەلی، ئەمن دەم زانی ئەتۆ کوڕێکی ساف و ساویلکەی، بەڵام پێم وانەبوو هێندە خۆش باوەڕ بی. کوڕە سەیفەلی! ئەو کەسەی جەرگت بە کوچکەوە دەدا قازییە!"

مەلافەرهاد بە راوێژێکی جیددییەوە گوتی:

"پێمەکەنە مام وەسمان، ئەگەریش ئەو کەسەی جەرگمان بە کوچکەوە دەدا قازی بێ، دیسان دەبێ لە لای قازی شکایەت لە قازی بکەین، پەلامار دێننە سەر دێیەکی وا گەورە، هەتا بەیانی دێی وەبەر تفەنگان دەدەن و خانووەکان ئاور تێبەردەدەن، ئەوە ئەرکی ئێمەیە کە شکایەت بکەین. با ئەوان لێی نەپرسنەوە."

وەسمانەزلە بە پێکەنینەوە گوتی:

"باشە با بیکەین. با شکایەت بکەین بزانین ئەو قازییەی جەرگمان بە کوچکەوە دەدا، چ وەڵامێکمان دەداتەوە! چ فتوایەك دەدا"

کەمێك دواتر سوار بوون. وەسمانەزلە لە پێشەوەو مەلافەرهاد، سەیفەلی و سێ کەس لە ریش سپییانی ئاوەدانی بە دوای دا چوونە مەخفەر. مەخفەر لە خانووبەرەیەکی چووکی زۆر بەرزدا بووکە بە خشتی سوور لە دەرەوەی گوندێکی سەرجادە دروست کرابوو. لەسەر بانەکەی، ئالآیەکی کاڵ بووەوەی شڕو شۆڵ رادەژا.

لەبەر دەرگای مەخفەر دابەزین. ئەسپەکانیان لە پەرژینی پەنای خانووەکە خستن، دوگمەی چاکەتەکانیان داخستن و لە دەروازەکەوە چوونە ژوورێ. لەبەر دەرگا سەرجووخە دورسوون بەخێراتنی کردن. موختار سەیفەلی بە ئەدەبەوە پرسی:

"وەکیل باشی لە ماڵ نیە؟"

سەرجووخە کەمێك تێك رابوو، ئەختێکیش تێك چوو، و دەسبەجێ وەڵامی نەدایەوە. بەڵکوو دوای کەمێك بیرکردنەوە جوابی دایەوە:

"وەکیل باشی دوێنێ شەوێ بریندار بووە. چەتە لێیان داوە."

برۆکانی وەسمانەزلە هەڵکشین، و چاوەکانی لەبن برۆکانیەوە دەرکەوتن. بریسکەیەکیان تێدا درەوشایەوەو بە راوێژێکی زۆر کون پشکنانەوە پرسی:

"زۆر بریندارە؟ گوللە لە کوێی دراوە؟"

"گوللەکە، گوللەی "وەرەندیل" بووە، هی راوە بەراز. کڵاوەی ئەژنۆی لەبەر یەك هەڵتەکاندوە."

وەسمانەزلە بە بێکەنینەوە پرسی:

"دوێنێ شەوێ وەکیل باشی لە کوێ لەگەڵ چەتان تێك هەڵچووبوو کە بریندار بوو؟"

سەرجووخە بەم پرسیارە بە تەواوی گێژ بوو. هەتا ماوەیەك وەڵامی پێ نەدرایەوە. پاشان لە حاڵێك دا لەبەر نارەحەتی دەنگی دەلەرزی، گوتی:

"دوێنێ شەوێ خەبەر هات کە تاقمێك چەتە بە ئاناوارزا وەربوون. گۆیا لە چیای لە دەستی یاوەر فارووق رایان کردوەو هاتوونەخوار بۆ دەشتێ. ئەوان تفەنگیان لـێداوە."

وەسمانەزلە چاوێکی لە مەلافەرهاد کرد. مەلافەرهاد لە حاڵێك دا لە رقان رەنگی شین هەڵگەرابوو، گوتی:

"یاڵڵا با بچینە شاری، لای قایمەقام. پاشان برووسکە بۆ "ئەنکەرە"ش لـێدەدەین."

سەرجووخە پرسی:

"چما شتێك بووە؟"

حاڵەتێکی وەك گاڵتەپێهاتن لە روخساری دا هەبوو کە نەیدەتوانی بیشارێتەوە.

وەسمانەزلە گوتی:

"هیچ نەبووە کورم. چما قەرار بوو شتێك رووبدا. هەمووومان لە ژێر سایەی ئێوەدا لە ئەمن و ئەمان داین. تەنیا دوێنێ شەوێ چەند گوللەیەکیان پێوە ناین... دیارە ئێمە پێمان وابوو تەقە لە ئێمە دەکەن، بەڵام وادیارە وەکیل باشی لەگەڵ رێگرەکان پێك هەڵپڕژاون. باشە. خواحافیز."

وەسمانەزلە لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا لە مەخفەر چوونە دەرێ. سوار بوون و رۆیشتن بۆ لای شاری.

لە رێیەدا وەسمانەزلە بە مەلافەرهادی گوت:

"ئەختێك وەرە ئەم لا."

ئەو دوو سوارە ئەختێك لەوانی دیکە بەجێ مان.

وەسمانەزلە گوتی:

"حاڵی بووی مەسەلە چیە. هیچ زانیت ئەو گوللە بەرازکوژە کە کلاوەی ئەژنۆی وەکیل باشیی لەبەر یەك هەڵتەکاندو بووە هۆی ئەوە وەك گا بهۆڕێنێ، لە کوێوە هاوێژراوە؟"

"تێگەیشتم. دەستت نەرزێ."

"ئەگەر ئەو کارەی دوێشەو ئەمن کردم، هەمووومان کردبامان و وەك کەروێشك لە کونان دا خۆمان نەشاردبایەوە، پێت وایە عەلیسەفابەگ پێی لە ئاوەدانی دەنا؟ ئەگەر ئەو شەوەی خانووی یۆبازئۆغلیی سووتا، بۆ بەیانییەکەی خانووی عەلیسەفا ئاگری گرتبایە، چ دەبوو؟ تازە کەس دەوێرا نارەحەتمان بکا؟"

"ئاشکرایە کە نا."

"باشە، کەوایە بۆ لە پێشی ڕاناوەستین و خەریکین دێیەکە چۆل دەکەین و هەڵدێین؟ ئەوانەش کە رایان نەکردوە هەموو شەوێ بە دەست بەستراوی لە ژێر ڕێژنەبارانی گوللەدان؟ بە باوەڕی تۆ هۆیەکەی چیە مەلا؟ بۆ وای لێهاتوە؟"

مەلای ئاوەدانی گوتی:

"پیاوی ترسەنۆك لەلای خواش خۆشەویست نیە. خەراپترین مەخلووقاتی خوا کەسانی بێغیرەت و ترسەنۆکن. بنیادەمی ترسەنۆك لە ئاگری جەهەننەم رزگار نابێ. ئەبەدەل ئەبەد لە ئاگردا دەسووتێ. ئەدنا بەندەی خوا بەندەی ترسەنۆکە. ئینسانی ترسەنۆك مایەی ریسوایی بەشەرییەتە. لەبارەی وەکیل باشیەوە زۆر خۆشحاڵم. چۆن دەکرێ ئەم مەسەلەیە بە قایەقام بڵێین؟ چۆنی حاڵی کەین کە ئەوەی پەلاماری گوندەکەمانی داوە، وەکیل باشی خۆی بووە؟"

وەسمانەزلە لە وەڵام دا گوتی:

"هیچ پێویست نیە تێی بگەیەنین و هیچ نابێ بە کەسیش بڵێین کە ئەمن گوللەم لە وەکیل باشی داوە. ئەمشەو دیسان هێرش دێنن و دیسان یەکێکیان لێ لەکار دەخەم."

مەلافەرهاد گوتی:

"زۆر کاری چاك دەکەی."

"خدری زیندە پێی گوتم:"ئەگەر دەتەوێ لەم شەڕە دا سەرکەوی، هەموو ئەوانەی لەم دێیە ڕۆیشتوون دەبێ بێنەوە." ئەمن دەمەوێ جارێکی دیکە بچمە لایان و پێیان بڵێم بێنەوە دێی خۆیان. پێیان دەڵێم وەزع لەگەڵ جاران فەرقی کردوە."

مەلافەرهاد هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاو گوتی:

"ئا...خ، ئا...خ مام وەسمان ئاخ کە ناتوانی بیان هێنیەوە. ئەوان حازرن لەوێ بمرن، لەنێو بچن، بەڵام حازر نین بێنەوە. ئا...خ، ئا...خ مام وەسمان. حەزرەتی خدر بە منیشی گوت باشترە هەموویان بێنەوە. ئاخ ئاخ مام وەسمان..."

گەیشتنە شاری، "خەلیل تیلکی ئۆغلی" دوژمنی ژمارە یەکی عەلیسەفابەگیان وەپێش خست و لە پلیکانەکانی قایمەقام وەسەر کەوتن. بۆ قایمەقامیان باس کرد کە چۆنیان هێرش کردوەتە سەر دێهاتییەکان و چۆن هەتا بەیانی دێیان ئاورباران کردوە. قایمەقام گوتی کە فکرێکیان بۆ دەکا. برووسکەیەکیان بە "فەتحی کووزان ئۆغلیی" عەریزەنووس ئامادە کردو بەڕێیان کرد بۆ ئەنکەرە.

شار هەمووی هەژابوو. داستانی هێرشی تازەی بەکرێگیراوانی عەلیسەفابەگ بۆ سەر گوندی وایوای کە وەکیل باشی رەمزییشیان لەگەڵ بووە، تەقە کردنەوەی وەسمانەزلەی هەشتاساڵە کە هەرچەند تاریك ببوو بە دەمانچەی ساچمەزەن کڵاوەی ئەژنۆی وەکیل باشی رەمزیی لەبەر یەك هەڵتەکاندبوو، بوو بە بنێشتە خۆشەی سەر زاران.

هەر ئەو رۆژە دەسبەجێ وەکیل باشی رەمزییان نارده نەخۆشخانەی سەربازی لە ئەدەنە.

وەختێك وەسمانەزلە لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا بە بازاڕ دا تێدەپەڕین، دوکاندارەکان، پارچەفرۆش، مسگەر، کەوش دروو، ئاسنگەرو بە کورتی هەرچی کاسبکار بوو هاتبوونە دەرکی دوکانەکانیان و بە سەرسوڕمانەوە تەماشای وەسمانەزلەیان دەکرد. تەنانەت ژن و منداڵیش بۆ دیتنی لە ماڵان هاتبوونەدەر. وەسمانەزلە هەتا لە شاری وەدەر نەکەوتن، سەری هەڵنەبڕی. لە ژێر روانینی سەدان چاو دا کە تێیەوە بڕابوون، خۆی چووکەڵە دەهاتە بەرچاو. ئەو رۆژە شار زۆری ئەو شەرمەندە کردبوو.

## (١٣)

ئادەم پیاوێکی زۆر کورتەبالاّ بوو بە دەم و چاوێکی خڕو نێوچاوانێکی هەمیشە گرژەوە. چاوێکی سێ‌گۆشەو لێوێکی تەنك و ملێکی کورتی هەبوون. تەواوی ئەندامانی لەشی لە ملی ڕا بیگرە هەتا دەست و لاق و نینۆك و بەژنی، هەموویان کورتیلە بوون. هەمیشە "فیلینتا"یەکی ئەڵمانیی زۆر جوانی بە دەستەوە بوو. مووە زەردە مەیلەو خەنەیی‌یەکانی وەك چەقڵی پشتی ژووشك هەمیشە ببوونە نەشتەر.

ئادەم دەی‌توانی چەند ڕۆژان بێ‌ئەوەی دەم لە خۆراك بدا لە قوژبنێك دا بچێتە بۆسەوەو جووڵە نەکا.

شەش ساڵ پێشتر بوو کە بوو بە پیاوی عەلی‌سەفابەگ. پێشتر کەروێشك و کەو و قازو قولینگ و سوێسکەی ڕاو دەکردن و دەی‌بردن بۆ خان و ئاغاکانی دەشتی ئاناوارزاو لەو ڕێگایەوە گوزەرانی خۆی بەڕێوە دەبرد. کاری هەر ئەمە بوو. ساڵ دوازدە مانگ لە دەشتی ئاناوارزا دەخولایەوە. باران و قوڕو شەوو ڕۆژ بۆ وی فەرقیان نەبوو. باڵندەی سەیرو نایابی دەگرتن و بۆ عەلی‌سەفابەگی دەبردن. عەلی‌سەفابەگیش هەرچەندی پیاوێکی چرووك و پارەپیس بوو، بە دیتنی ئەو باڵندە سەیرو سەمەرانە کە ئادەم بۆی دێنان، خۆشحاڵ دەبوو و سەری کیسەکەی دەکردەوە.

ڕۆژێکیان ئادەم لە حاڵێك دا چەند دانە لەو باڵندە سەیرانەی پێ بوو، هاتە مەزراکەی عەلی‌سەفابەگ. تووکی ئەو باڵندانە شینێکی مەیلەو سەوز بوو. دەندووك و لاقیان زۆر باریك و درێژ بوو. عەلی‌سەفا بە دیتنی ئەو باڵندە جوانانە کە تا ئەو ڕۆژە نەی‌دیبوون زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی:

"بریا یەکێکیان زیندوو بایە."

بانگی شێوان بوو. ئادەم تفەنگەکەی لەسەر شانی داناو چوو بۆ ئاکچاساز. بەیانی وەختێك تاریك و روونی دەهاتەوە، یەکێك لەو بالّندانەی لە بن هەنگلّیدا بوو. بالّندەکە لە بن هەنگلّی ئادەم دا ئەوەندە بە رەحەتی خەوتبوو، دەت گوت لە هێلانەی خۆی دایە. چاوەکانی وەك یاقووت سوور دەچوون و سەریشی نەخشین بوو. لەو رۆژە بەدواوە ئادەم لە مەزرای عەلیسەفابەگ دا مایەوە.

نە ئادەم بە عەلیسەفابەگی گوت:"ئەمن دەمەوێ لەلای تۆ بمێنمەوە، رازی یان نا؟" و نە عەلی سەفابەگیش بەوی گوت:"ئەمن لێرە پێویستیم بە تۆ هەیە، لە لای من بمێنەوە." ئادەم لە کێلّگەی عەلیسەفادا مایەوە. دەت گوت دەرکەزایەکە هەر لەوێ لە دایك بووەو هەر لەوێش گەورە بووە. لە پشت خانووبەرە ئاغایانەکەی کێلّگەوە کەوێلّێك کە دوو ژووری هەبوون، بەتالّ ببوو. ئادەم هەروەك بۆخۆی دروستی کردبێ، دەسبەجێ چوو تێی دا دانیشت و لە دێی دا مایەوە. چەند مانگ دواتریش بە خۆی و ژنێکەوە سەروکەللەی پەیدا بوو. ژنەکە لەگەلّ خۆی دەت گوت سێوێکن لەتت کردوون. راست وەك خۆی کورتەبالاّ بوو. ژنێك بوو بێدەنگ و چاورەش و چاوزەق. ژنێك بوو دەت گوت هەمیشە لە خەودا بە رێگادا دەرواو ئادەم یەکجار زۆری ئەو ژنە خۆش دەویست.

بەم جۆرە ئادەم بوو بە یەکێك لە باوەرپێکراوترین پیاوەکانی عەلیسەفابەگ. عەلیسەفابەگ دژوارترین ئەرکەکانی بە ئادەم دەسپارد. لە پێك هێنانی ترس و سام لە دلّی جووتیارەکان دا بگرە هەتا هێرش بۆ سەر دێهات و چەتەیی و ناردنی پەیام و وەلاّم.

ئادەمیش وەلاّمی ئەم متمانەیەی ئاغای زۆر بە باشی دەدایەوەو هەر کارێکی پێی سپێرابا بە رووسووری ئەنجامی دەدا. زۆری پێ نەچوو کە ئادەمی راوچی بوو بە بەلاّی گیانی خەلّکی دێهاتی دەشتی ئاناوارزا، و لەنێو ئەو دێیانەش دا گوندێك کە لە هەمووان زیاتر داری دەستی ئادەمی وێکەوتبوو و لە دەستانی هەراسان و جارز ببوو، گوندی وایوای بوو.

فیلینتایەکی زۆر جوانی ئەلّمانیی بە دەستەوە بوو. گوللەی بە خەسار نەدەدا. تفەنگەکەی بە قەد ژنەکەی خۆش دەویست و مووە زەردە مەیلەو خەنەیی‌یەکانی وەك نەشتەر وابوون.

ئەم رۆژانە ئادەم زۆر قەلّس و قۆلّ بوو. چەندین رۆژ بوو بە دوای ئەسپی خەنەیی دا دەگەرا. بەلاّم لەو ماوەیەدا نەیتوانیبوو ئەوەندە لە ئەسپەکە نیزیك بێتەوە کە تفەنگی بگاتێ. ئەم ئەسپە دەت گوت هەزار چاو و هەزار گوێی هەیە. چووکترین جموجۆلّ و تارمایی لە

دووره‌وه ده‌دی و به‌سپایی‌ترین ده‌نگی له دووره‌وه ده‌بیست. ماوه‌یه‌کی زۆر بوو له‌نێو پۆله جه‌گه‌نێك دا خۆی حه‌شار دابوو، به‌و هیوایه که ئه‌سپه‌که به‌وێ دا تێپه‌ڕێ. به‌ڵام ئه‌سپ نه ده‌هات و نه ده‌چوو و نه ده‌رده‌که‌وت. ئاده‌م خووی به‌م جۆره مه‌سه‌لانه‌وه گرتبوو، به حه‌وسه‌له بوو، ده‌یتوانی پێنج رۆژ، حه‌وتوویه‌ك و ته‌نانه‌ت ده رۆژیش له‌نێو ئه‌و جه‌گه‌نه‌دا چاوه‌ڕێ بێ. به‌ڵام ئه‌م ئه‌سپه سه‌برو سیکه‌دانه‌ی پێ نه‌هێشتبوو.

له‌ده‌شتێ دوو جار تووشی ئه‌سپه‌که بوو، به‌ڵام هه‌ردووجاره‌که پێش ئه‌وه‌ی تفه‌نگه‌که‌ی له‌شانی قایم کا، ئه‌سپه‌که ون بوو. چیی ببوو، بۆ کوێ رۆیشتبوو؟ غه‌یب بوونی ئه‌سپه‌که، ئه‌ویش له چاوترووکاندنێك دا ئه‌و گومانه‌ی بۆ ئاده‌م پێك دێنا که ده‌بێ نهێنی‌یه‌ك له کاری ئه‌م ئه‌سپه‌دا هه‌بێ. ئه‌م ئه‌سپه شتێکی نائاسایی بوو. ته‌نانه‌ت ئه‌خلاقی بنیاده‌میشی نه‌بوو، به‌ڵکوو بوونه‌وه‌رێکی ئه‌فسووناوی بوو، ... شتێك بوو وه‌ك جندو په‌ری" شتێکی جادوویی... به‌ره به‌ره ترس هه‌ڵی گرت.

لای نیوه‌شه‌وێ گوێی له ده‌نگی ئه‌سپێك بوو که له نێو قامیشه‌کان هاته ده‌رێ. له دوور تارمایی ئه‌سپه‌که‌ی دی که خه‌ریك بوو له تۆپراخ ته‌په وه‌سه‌ر ده‌که‌وت. دووباره گه‌ڕایه‌وه قامیشه‌ڵانه‌که. چه‌ندین شه‌و بوو خه‌و نه‌چووبووه چاوه‌کانی. هه‌ر که سه‌ری وه‌سه‌ر بنه‌قامیشێك کرد ده‌سبه‌جێ خه‌وی لێ‌که‌وت.

خه‌ریك بوو هه‌تاو بکه‌وێ، وه‌خه‌به‌ر هات. مژێکی وه‌ك هه‌ور له‌سه‌ر ئاکچاساز راوه‌ستابوو و ئاناوارزا له پشت په‌رده‌ی مژه‌که‌وه به حاڵ و باڵ دیار بوو. ئه‌و مژه‌ی به‌سه‌ر زه‌وی دا کێشرابوو، به‌ره به‌ره ئه‌ستوورترو قورس تر ده‌بوو. هه‌ر که ئاده‌م له قامیشه‌ڵان وه‌ده‌رکه‌وت، شتێکی دی که پێی وابوو چاوی ره‌شکه‌و پێشکه ده‌کا. که‌مێك له‌ولای خۆی ئه‌سپه‌که له‌سه‌ر ته‌پۆلکه‌یه‌کی چووکه‌ڵه له‌نێو ته‌م و مژێکی خه‌ست دا راوه‌ستابوو و چۆرته‌ی له خۆی بڕیبوو. له‌نێو ئه‌و مژه ئه‌ستووره‌دا جار جار ده‌رده‌که‌وت و جار جار ون ده‌بووه‌وه. دڵی داخورپا. یه‌که‌م جار بوو ئه‌سپه‌که ئه‌وه‌نده‌ی لێ نیزیك بێ که تفه‌نگی بگاتێ. ده‌سبه‌جێ تفه‌نگه‌که‌ی راست کرده‌وه، سێره‌ی لێ‌گرت و ده‌ستی لێ‌کێشا. ده‌نگی ویزه‌ی گولله به‌رز بووه‌وه‌و ده‌مه‌ساتێك هه‌موو شتێك له پشت په‌رده‌ی مژه‌وه ون بوو. ئاده‌م غاری دایه ئه‌و ته‌پۆلکه‌یه که ئه‌سپه‌که‌ی له‌سه‌ر راوه‌ستابوو: تاوێك دواتر چاوی له په‌له‌قاژه‌ی ئه‌سپه‌که ده‌بێ. پاش ئه‌وه‌ی هه‌ر له‌وێ ئه‌سپه‌که‌ی سه‌ربڕی، ده‌یباته لای عه‌لی‌سه‌فابه‌گ و ده‌ڵێ:"ئاغا! عومری دوژمنانت، عومری گوندی وایوایش هه‌روه‌ك

عومری ئەم ئەسپە کورت بێ!" و ئاغاش بۆی تێهەڵدێنێتەوە. ئاغا لە زەوییەوە بگرە تا پووڵ و سامان و دارایی هەموو شتێکی دەداتێ. دەبێ پازدە هەزار میتر زەوی لە ئاغا وەرگرێ. نایدا؟ دەیدا؟ بۆ دەبێ نەیدا؟" وەختێك گەیشتە سەر تەپۆلکەکە، بەسەر هەواری خاڵی دا کەوت! ئەسپ لە دووری بەسەر بەستێنێ دا بەرەو بەردەڵانەکانی ئاناوارزا دەیکوتا. ئەوەندە خێرا لینگی دەدا کەبەرزگی لەزەوی دەخشا. ئادەم هەر لەوێ وشك بوو. چەند لەحزەیەك تەماشای ئەو ئەسپەی کرد کە وەك لافاو بە بەستێنێ دا تێدەپەڕی. ئەسپ بەجۆرێك لینگی دەدا کە دەت گوت باڵی گرتوە. مژەکەش وردە وردە لادەچوو. ئادەم ئەوەندە چاوی دە دووی ئەسپەکە نا هەتا لەبن گابەردەکانی ئاناوارزا بوو بە نوختەیەکی رەشی چووکەڵە. وەختێك ئەسپەکەی لەبەر چاو ون بوو، هەر لەوێ لەسەر تەپۆلکەکە چۆکی دادا. ددانی لەسەر یەك رۆگرتن. لە داخان شێت بوو. ئەمجار ترسی سوار بوو. بیری کردەوە:"نەکا ئەم ئەسپە حیسابێکی هەبێ؟ نەکا جندو پەری بێ و چووبێتە کەوڵی ئەسپەوە؟ ئەمە شتێکی نائاساییە کە ئادەم لەو نیزیکەوە ئەسپێك نەنگێوێ، چارە نیە دەبێ ئەسپێك پەیدا بکەم کە هەر نەبێ بە قەد ئەسپی خەنەیی توند بێ. پاشان بە سواری وی وەدوای دەکەوم و هەر کە نیزیکی بوومەوە بە تفەنگ لێی دەدەم. ئەگینا بە هیچ فێڵێك ئەم ئەسپە ناکوژرێ. دەبێ بچمەوە لای بەگ، ئەسپێکی توندرەوی لێوەرگرم. بەڵام بەراستی چۆن ئاغام تێبگەیەنم کە نەم توانیوە ئەسپێك بەو زەلامییەوە بنگێوم؟ هیچ رێگای دیکەم نین..."

بەرە پێی ئادەم هەڵمسابوون. زییەگەرمێنی پانتۆڵەکەی لە ئەژنۆیانی بەرەژێر لەت و پەت کردبوو. دەلینگی پانتۆڵەکەی ریشاڵ ریشاڵ و سەروچاوی بە دڕك و داڵ خوێناوی بوون.

بە بێوازی بەرەو کێڵگە وەڕێ کەوت. کە گەیشتە ماڵە ئاغاوەتییەکە، عەلی سەفابەگ تازە لە خەو هەستابوو، خەریك بوو لە پێشخانەکەدا بە ئاوێك کە کچێکی جحێڵ بەمەسینە لە دەستی دەکرد، دەست و چاوی دەشوتن. ئادەم دوورتر راوەستاو لە جێی خۆی چەقی بۆ ئەوەی ئاغا خۆی بیبینێ و بپرسێ کە:"باشە، ئادەم! چ باس، چ خەبەر!" بەڵام ئاغا ئەوی نەدی. پاش ئەوەی دەست و چاوی بە خاولی وشك کردنەوە، چووە ساڵۆنەکە. ئادەم بە دوای دا رۆیشت، لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و هەر لەوێ لەسەر پلیکانەکان راوەستا. بەگ لەسەر مێزێکی درێژ دانیشتبوو، خەریك بوو لەگەڵ چەند کەسی دیکە بەرچایی دەخوارد. وەختێك ئادەمی لەسەر پلیکانەکان دی، بانگی کرد:

"بۆ لەوێ راوەستاوی ئادەم! وەرە ژوورێ بزانم."

ئادەم بێ ئەوەی تەماشای چاوی ئاغا بکا، چووە لای مێزەکە. بەگ کە هەستی بە داستانی ئەسپەکە کردبوو، رووی کردە دەوروبەرەکەی و گوتی:

"ئەو میرشکارەی باسم دەکرد ئەمەیە، نە باڵندەی لە دەست دەردەچێ و نە پێڕۆ. بەڵام ئێستا لە چاوانی دا دەخوێنمەوە کە ئادەم، ئەم سەردەستەی راوچییانە نەیتوانیوە ئەسپەکە بکوژێ. ئادەم بڵێ بزانم چۆن بوو کە نەت توانی بیکوژی؟"

ئادەم سەری هەڵبڕی. فرمێسک لە چاوانی دا قەتیس مابوو و بۆ هاتنەخوار لە بیانوویەك بەند بوو. بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"ئەو ئەسپە هەزار چاوو هەزار گوێی هەیە. ئەسپێکی سەیرە. دەبێتە باو شنەی دێ، دەبێتە مەلی ئاسمان و دەفڕێ. تەنیا جارێك لێی نیزیك بوومەوە، ئەو جارەش ئەو بە پێی خۆی هات. تفەنگم هاویشتێ، هەموو شتێك بەسەر یەك دا کەوت. گوتم لێم دا. بەڵام دوژمن لە ماڵێت نائومێد بێ ئاغا" لەپڕ دیتم، چەندین فرسەقم لێ دوورەو خەریکە دەچێتە لای ئاناوارزا. ئەمن سەر لە کاری ئەو ئەسپە دەرناکەم. بەگ! پێم وایە لە جێ دا ئەو ئەسپ نیە."

عەلیسەفابەگ هەناسەیەکی بەژانی هەڵکێشاو گوتی:

"ئەو، ئەسپە ئادەم. ئەسپە. بەڵام لە بنیادەمیش ئاقڵترە."

"بەگ! ئەگەر ئەو ئەسپ بێ، ئەگەر سیحرو جادوو نەبێ، ئەگەر جندو پەری نەبێ کە هاتبێتە کەوڵی ئەسپەوە، دڵنیابە کە رۆژێك هەر دەیکوژم."

بەگ لە جیاتی وەڵام دانەوە لەگەڵ برادەرانی کە لەسەر مێز دانیشتبوون، قاقا دەستی کرد بە پێکەنین و سەرەنجام گوتی:

"چت لێقەوماوە ئادەم! ئەو ئەسپە بە جارێك سەری لێشێواندووی، شپرزەی کردووی."

ئادەم وەڵامی دایەوە:

"دەردی داومێ. ئەو ئەسپە جندو پەر..."

بەگ قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

"نا ئادەم."

"بەگ! گوللە نایگرێتەوە."

"ئادەم، ئەو ئەسپێکی چالاکە. ئەم جۆرە ئەسپانە بە ئاسانی وەبەر نایەن."

ئادەم دیسان سەری داخست و گوتی:

"بەگ! ئەسپێکم وێ دە کە بتوانم بە سواری ئەو وەدوای کەوم. بەڵکوو بە گیری بێنم..."

"بچۆ تەویلەی، هەرکامێکیانت بە دڵ بوو هەڵیگرە. بەڵام دڵم ناو ناخواتەوە. ئەو ئەسپە وا دەگیر ناکەوێ. دیسانیش مەیلی خۆتە."

ئادەم بە شەرمەزاری گەڕایەوە ماڵێ.

نەرمی و میهرەبانیی ئاغا زیاتری شپرزە کردبوو. دیارە راوێژەکەی نەختێك گاڵتە پێکردنیشی لەگەڵ بوو. کەوایە بە سواری ئەسپیش ئەم بەرازە دەگیر ناکەوێ؟" نا، نا. ئەوە ئەسپ نیە پەرییە. ئەگەر جندو پەری نەبێ... ئاغام باوەڕی بە جندو پەری نیە... ئەگەر ئەو ئەسپە سیحرو جادوو نەبێ... سیحرو جادوو..."

لە تەویلەی دا ئەسپێکی بێن درێژو زەلامی بۆرە هەبوو. دەبێ بە سواریی ئەو وەدوای ئەسپی خەنەیی بکەوێ. نەحلەتی خوا لەو ئەسپە خەنەیییە...

ترسی ئەو ئەسپە خەنەیییە لە دڵی دا جێگیر ببوو. ئەو ئەسپە تەنیا بوونەوەری ئەم جیهانە بوو کە ئەو دەیەویست تفەنگی لێداو نەیدەتوانی لێی بدا.

ئەو شەوە هەتا بەیانی نەخەوت. یەك قسەشی لەگەڵ ژنەکەی نەکرد. لە جێدا ژنەکەشی لەو جۆرە وەختانەدا قەتی هیچ لێنەدەپرسی.

## (١٤)

ریشی رەش و تێك ئاڵقاوی مەلافەرهاد دەستی بە لەرزین کرد. سێبەری خەفەتێکی قووڵ بە چاوە گەشەکانی دا تێ پەڕی. روخساری جوان و کزەڵۆکەی کزترو ماسوولکەکانی دەم و چاوی گرژ بوون. روخساری پڕ گنج و لۆنجی وەسمانەزلەش بە ئازارو داگیرساو بوو. حەسەنی یۆبازئۆغڵی لەوسەری گوندی ئارلیقشلا لەکەوێڵێك دا نیشتەجێ ببوو. کەوێڵێك بوو نیوە وێران بە چەپەری شەق و شڕو بێ کەلکەوە. بانەکەشی بە قامیش داپۆشرابوو، تێك تەپیبوو.

کەل و پەلی نێو ماڵەکەی بریتی بوو لە ئاوخۆرەوەیەکی دار، دەستێك نوێن، سێ چوار دەوریی مس و مەنجەڵێك. هەرسێ منداڵەکەی نەخۆش کەوتبوون، لە سووچێکی کەوێڵەکە لەسەر کوتە حەسیرێك دەیان ناڵاند. حەسەنی یۆبازئۆغڵی بۆخۆشی لەڕو لاواز و شکاوەوە بوو، بە جارێك تواببووەوە. برینەکانی دەست و دەم و چاوی قووڵتر ببوون. حەسەن دیسان وەك جاران دەم بە پێکەنین بوو و دەیەویست وا نیشان بدا کە لە وەزعی تازەی رازی‌یە. بەڵام ژنەکەی کە نەی‌توانیبوو خوو بەو ماڵە نیوە وێرانەیەوە بگرێ، وەك ماتەمێکی سەرلێ شێواو لەنێو کەوێڵەکەدا دەهات و دەچوو و بە هیچ جۆر نەی‌دەتوانی پێشهاتی سووتمانەکە لەبیر بەرێتەوە.

وەسمانەزلە کە کۆڵەگرووی لە ئەوکێ مابوو، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"رۆڵە حەسەن، لەگەڵ مەلافەرهاد هاتووینە لات کە لەمە زیاتر لە وڵاتی غەریبایەتی دا نەسووڕێیەوە. تەماشایەکی ئەم خانووە بکە کە تێی دا دانیشتووی. داهات و گوزەرانێکیشت نیە. بۆچی هاتوویە ئێرە، ئاوماڵەکانت چی‌یان بۆ کردووی؟ لێرە بمێنی لە برسان دەمری. بینادەم ئەگەر بیهەوێ بژی، تەنانەت ئەگەر بیهەوێ بش مرێ، دیسان باشترە لەنێو خزم و

قەومی خۆی دا بێ. هاتووین لەگەڵ خۆمانت بەرینەوە. لێرە عارەبانەیەك بەكرێ دەگرین، ژن و منداڵەكەتی تێداوێین و دەڕۆین."

حەسەن سەری بەردابووەوەو تەماشای مەلافەرهادو وەسمانەزلەی نەدەكرد. هیچ گۆڕانێك لە روخساری دا بەدی نەدەكراو پیاو تێنەدەگەیشت بیر لە چی دەكاتەوە.

پاش وەسمانەزلە، مەلافەرهاد دەستی بە قسان كردو بە گوتنی رستەی:"حەسەن با پێكەوە بچینەوە" قسەكەی كورت كردەوە.

وەختێك حەسەن سەری هەڵبڕی، روخساری نەدەناسرایەوە، چاوی پڕ لە فرمێسك بوون. وەك منداڵێكی بێپەنا دەچوو. گوتی:

"ئەمن ئیدی ناچمەوە ئەو دێیە."

وەسمانەزلە نەڕاندی:

"دەچیەوە. بەخۆشیی خۆشت نەیەوە، وەك ولاغ بە راكێش راكێش دەت بەینەوە."

مەلافەرهاد پشتی قسەكەی وەسمانەزلەی گرت و گوتی:

"دەچیەوە یان بە زۆر بت بەینەوە؟"

حەسەن وەك منداڵێكی بەستەزمان دەستی لەبن هەنگڵی نان و گوتی:

"ناتوانم بێمەوە."

وەسمانەزلە گوتی:

"لەبارەی وەكیل باشیەوە نیگەران مەبە. وەكیل باشی لەنێو گوندی خۆمان گوللەیان لێدا. گوللەیەكی بەرازكوژیان لێخەسار كرد بە ئەستووراییی قامكێك. ئەویش بە دەمانچەی ساچمەزەنی دووسەدو پەنجا ساڵ لەمەوبەر. بەڵێ، شەوێ پەلاماری گوندەكەمانی دابوو كە لێیان دا. كلاوەی ئەژنۆیان لەبەریەك هەڵوەشاند، كارێكیان بەسەر هێنا وەك گا دەیبۆڕاند.

ئێستا لە نەخۆشخانەی ئەدەنە بەرەو قیبلە كەوتوەو "یاقدوس، یاقدوس"یەتی. دەپرسی چۆن و بە چی ڕا دەزانم؟ تەنیا كەسێك وەختی بریندار بوون وەك گا دەهۆڕێنێ كە بە گوللەی بەرازكوژ لێی دەن و كلاوەی ئەژنۆی لەبەر یەك هەڵتەكێنن. برووسكەمان بۆ مستەفا كەماڵ پاشاش لێدا، برووسكەیەكی جوان و رێك و پێك. ئەتۆ بڵێ مەلافەرهاد، بە دین و ئیمانت كە بەندەیەكی دیندارو نیزیكی خوای، تۆ پێی بڵێ عەریزەیەك كە فەتحی كووزان ئۆغلی نووسیبووی چۆن بوو. تور دین و ئیمانت فەتحیبەگ پیاوێكی زانا نیە؟ لەگەڵ ئەوەی پیاوێكی باش و لەسەرەخۆیە، نووسراوەكەی لەسەر بەرد دابنێی كونی ناكا؟ فەتحیبەگ پیاوێكی

لەسەرەخۆیە، بەڵام هەرچییەك بێ لە بنەماڵەی کووزان ئۆغلییە. هەرچی لە مشکی بێ هەمبانەی دەبڕێ. بڵێ مەلا بڵێ، با حەسەن بزانێ چیی بۆ مستەفا کەماڵ پاشا نووسیوە. نووسیویەتی:"ئەتۆ کە دەڵێی نیشتمانم نەجات داوە، نەجات دان ئاوا دەبێ؟ ئەتۆ نیشتمانت نەجات دا هەتا جەندرمەکان و وەکیل باشییەکان و پاشماوەی دەرەبەگەکان بە شەو هێرش بکەنە سەر گوندەکانمان، دێیەکەمان وەبەر تفەنگان بدەن و دەستدرێژی بۆ سەر ماڵ و نامووسمان بکەن؟" ئەمانە کێ نووسیونی؟ کووزان ئۆغلی چی دیکەی نووسیوە؟ نووسی کە:"زۆر ناشیرن و جێگای شەرمە کە حکوومەت پارێزگاری لە ئاغاکان بکاو دێهاتی وەبەر تفەنگان بدا. دەبێ رێگا چارەیەك بدۆزیتەوە." دەبینی چیی نووسیوە؟ دەزانی کێ نووسیویە؟ فەتحی کووزان ئۆغلیبەگ نووسیویە! حەسەن وەرەوە. ئەتۆ کوڕە کوردێکی. بابیشت پیاوێکی ئازا بوو. جگە لەوەش ئەتۆ کوڕی شیعەیەکی. شیعەکان چاونەترسن. وەك گورگی لووتکە بەرزەکانن، گۆرانیی بەسۆزیان هەن، خەڵکی دنیا وەختێك گوێیان لە گۆرانیی تورکیی شیعەکان دەبێ، سەریان سوڕ دەمێنێ..."

وەسمانەزلە ئەوەندەی قسە کرد کە ئیدی پشووی لێبڕا. لەگەڵ قسەکانی تفی لە زاری دەردەپەڕی. پاشان داستانی کێوی قافی باس کرد. باسی شەوە ئەمرەکەی کێوی قافی گێڕایەوە، باسی ئەو رێبوارە ناهومێدانەی کرد کە لە کێوی قاف سەریان لە دیواری شەو درابوو، ئەو نوورەی باس کرد کە وەك شمشێرێك تاریکایی کێوی قافی قەڵاشتەوە. و لە ئاخری دا پرسی:

"دەی، دەڵێی چی حەسەن!"

وەسمانەزلە شەڵاڵی ئارەق بوو. دوگمەی کراسەکەی کردەوە. بە دەست ئارەقەی مووە درێژو سپییە تەڕەکانی سنگی سڕی. قامکی دەستانی بۆترشی ئارەقیان گرت. پاشان دووبارە لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"پێت وا نیە ئەو خوایەی یووسفی لە چاڵاوێ نەجات دا رۆژێکیش ئاوڕێك وەسەر ئێمە بداتەوە؟ هە. هە. ها. دەڵێی چی حەسەن!"

مەلافەرهاد قسەکەی لە وەسمانەزلە وەرگرت و درێژەی پێدا:

"ئەو خوایەی یووسفی لەچاڵاوێ نەجات دا، هەرگیز بەندەکانی خۆی لە تەنگانەدا ناهێڵێتەوە. حەتمەن ئێمە شتێك دەزانین کە پێت دەڵێین وەرەوە. وەسمانەزلە چیی پێ گوتی؟ لەبارەی ئەو رێبوارانەوە کە لە کێوی قاف رێیان لێون ببوو و سەریان لە دیواری شەو درابوو،

و له پاش دیواری ناهومێدی مابوونەوە. نە جێیەکیان هەبوو بۆی بچن و نە ڕێگای گەڕانەوەیان هەبوو. باشە، ئەتۆ پێت وایە لە هەل و مەرجێکی وادا تۆپەڵە نوورێك ناکەوێتە سەر ئەودیوارە تاریکە کە شمشێر کاری لێنەدەکردو هەناسەی لە سنگی خەلکی دا رادەگرت؟ مام وەسمانەزلە کە گەیوەتە ئەم تەمەنە، دەزانی ئەم نوورە چ نوورێکەو ئیمان و باوەڕی بەو نووره هەیە... بۆیاز ئۆغلی با بەسەرهاتێکیشت بۆ بگێڕمەوە. سێ ڕێبوار بوون، سێ پیاو لە چۆل و دەشتێکی پان و بەرین دا... سەرگەردان و تینوو. لە تینووان خەریك بوو بمرن. ئەو سێ پیاوە لە تینووان بستێکیان زمان پێ دەرکێشرابوو... دەشتێك بوو کە لەوێ دا هەتاو نیازی ئاوابوونی نەبوو. لەو دەشتەدا کە تێی دا سەرگەردان بوون، لەنێو سەوزایی دا چاڵاوێك هەبوو کە ئاوێکی وەك دەنکی تەرزەی هەبوو، بەڵام ئەوان چاڵاوەکەیان پێ نەدەزانی. چاڵاوەکە لەم بەر بوو، ئەوان بەو بەر دا دەڕۆیشتن. لە پاشان لە نەکاو تەیرێکی سپییان لە ئاسمان دا دی. یەکێك لەو ڕێبوارانە پیاوێك بوو وەك مام وەسمانەزلە ساردو گەرم چێشتوو. گوتی با بچینە ئەو بەرە کە تەیرەکەی پێدا دەڕوا. وەڕێ کەوتن. تەیرەکە ڕاستەڕێ دەچووە سەر ئاوەکە. پیاوە پیرەکە دەڵێ تەماشای باڵی ئەو تەیرە بکەن، ماندوویە، ئەویش خەریکە لە تینووان دەخنکێ. وەدوای تەیرەکە دەکەون، دەڕۆن دەگەنە سەوزایی سەر چاڵاوەکە. ئاوەکە دەخۆنەوەو لە مەرگ ڕزگار دەبن...

بەڵێ، مام وەسمانەزلە ئەو پیاوەیە کە تەیرە سپییەکەی دیوە. هاتوە پێت دەڵێ تەیرەکە دەچێتە سەر چاڵاوەکە. ئەتۆ چیی جواب دەدەیەوە حەسەن؟ دێیەوە یان نا؟"

وەسمانەزلە لە حاڵێك دا لە خۆشییان پێدەکەنی گوتی:

"مەلا، مەسەلی ئەو تەیرە سپییە مەسەلێکی بەجێ بوو. ئیدی مەسەلی لەوە جوانتر نابینرێتەوە. بزانە حەسەن، تەیرە سپییەکە باڵی گرتوون، بڕوانە حەسەن، بڕوانە شیعەی خۆم، تەیرە سپییەکە خەریکە دەچێتە سەر ئاوی ژیان، لە گەڵمان وەرەوە بۆ دێی."

زۆریان قسە کرد. زۆریان شێرو ڕێوی هێنایەوە. بەڵام حەسەنی یۆبازئۆغلی خەراپ چاوترسێن ببوو. بە هیچ جۆرێك نەیان توانی بیهێننەوە. بە خەفەت و نارەحەتییەوە کەوێڵە وێرانەکەی حەسەنی یۆبازئۆغلییان بەجێ هێشت.

لە ڕێگا دا بێئەوەی قسەیەك بکەن، رکێف بە رکێفی یەکتر دەڕۆیشتن. لە خوار ئاناوارزاوە دەچوونە لای دوومەلیقەڵا.

مەلافەرهاد دەیگوت:

"نایەنەوە، لەترسی گیانیان نایەنەوە. مام وەسمان، وەختێك ترسی گیان چووە کلێشەی کەسێکەوە ناکرێ چاوەڕوانیی هیچت لێی هەبێ."

وەسمانەزلە لە تەواوی ڕێگاکەدا بێدەنگ بوو. هەر مەلافەرهاد قسەی دەکرد.

ئەو شەوە لە گوندی حاجیلار مانەوە. مەلافەرهاد یەك بێن قسەی دەکردو وەسمانەزلە بێدەنگ بوو.

خەریك بوو کازیوە دەنگوت کە بەرەو دوومڵی قەڵا وەڕێ کەوتن. هەر کە لاقیان لە حاجیلار بردە دەرێ، مەلافەرهاد پرسی:

"مام وەسمان چتە؟ هەر بێدەنگی."

"هەر بیر لەوە دەکەمەوە کە ئەتۆ لەکەنگێوە دەزانی ئەو تەیرە سپییە لە ماڵێ منە."

"ئەتۆ بۆخۆت گوتت مام وەسمان."

"چۆنت دیت؟"

"ئەم دیوە مام وەسمان. بەڵام ئەتۆ ئومێدت هەیە، ئەمنیش بە ئومێدم. کەوایە، ئەتۆ شتێك دەزانی؟"

"ڕاستە مەلا، جا چ زانینێك!"

وەسمانەزلە لەبەر ئەوەی کە نەیدەتوانی ئەوەی لەدڵی دایە بە زمان بیڵێ زۆر نارەحەت بوو. دڵی نیگەران بوو. لەدڵی خۆی دا دەیگوت: بریا توانیبام. لەبەر نارەحەتییان جینگڵی دەدان. گنجەکانی دەم و چاوی جار جار ڕێك دەهاتن و جاروباریش دەکرانەوە. تاوێك خۆشحاڵ دەبوو و ساتێك خەفەتبار. سەرەنجام گوتی:

"بەڵێ مەلا تەیرێکی سپی ئا...خ مەلا ئەویش چ تەیرێك! باڵندەیەك کە بۆیە دەبێ بیبینی، شەهێنی سپی."

پاشان لە قسەکەی خۆی پەژیوان بووەوە. ئەگەر مەلافەرهاد کەمێك بیری لە وشەی شەهێن کردبایەوە، بێگومان لە مەسەلەکە حاڵی دەبوو و تێدەگەیشت کە مەبەست لە تەیری سپی چ کەسێکە.

مەلافەرهاد لە خۆوە دووپاتی کردەوە:

"بۆیە دەبێ بیبینی."

وەسبەینێ ڕا گەیشتنە "ساریچام" دێیەکە لە شۆرەکاتێکی پڕ لە بەردەڵان دا هەڵکەوتبوو. خەڵکەکەی چەند کەوێڵی شەق و شکاویان لە قوڕو بەرد دروست کردبوو، تێیان

دا دەژیان. هێندێکیان لە چادری مووین و هێندێکیشیان لە کەپری شەق و شڕ دا دانیشتبوون. دێهاتیی‌یەکان بە روویەکی خۆشەوە پێشوازیی‌یان لێ‌کردن. هەموویان رەش و رووت بوون، هەموویان هێندە کز بوون تەنیا چنگێك ئێسك و پێستیان لێ‌مابووەوە. منداڵەکانیان لێکرا نۆبەتیی‌یان بوو.

وەسمانەزلە وەختێك کۆنە ئاوماڵەکانی خۆی لەو رۆژرەشی‌یەدا دی، کوڵی هەستا. نەی‌توانی پێشی فرمێسکی خۆی بگرێ. مەلافەرهادیش هەر زۆر پەشێو و نارەحەت بوو.

وەسمانەزلە کە تۆزێك بەسەر خۆی دا زاڵ ببووەوە، یەکسەر دەستی بە قسان کرد:

"ئەمن وەختێك باسی حاڵ و گوزەرانی ئێوەم بیست ئاورم تێ‌بەربوو. مەلافەرهاد، ئەو پیاوە باشەم لەگەڵ خۆم هێنا کە ئێوە لەگەڵ خۆمان بەرینەوە دێی خۆمان."

هەتا دەمەساتێك کەس دەنگی لەبەر دەرنەهات. سەرەنجام عبدالرحمن گوتی:

"بۆچی هاتوون ئێمە لەگەڵ خۆتان بەرنەوە. بێینەوە خانووەکانمان؟ چما ئاوریان تێ‌بەرنەدان؟ بێینەوە سەر کەردو کێڵمان، چما وێرانیان نەکردن؟ چما کچەکانمانیان هەڵنەگرتن؟ چما حەیوانەکانمانیان سەر نەبڕین؟ چما کەس و کارمانیان نەکوشت؟ وەسمانەزلە! لەو دێ‌یە چیمان ماوە هەتا لەگەڵتان بێینەوە؟ لەو دێ‌یە چ گۆڕاوە کە دەتانەوێ ئێمە لەگەڵ خۆتان بەرنەوە؟ عەلی‌سەفا مردوە؟ ئاکا بیهەوێ لەگەڵمان ببێ بە برا؟ حکوومەت لایەنی ئێمەی گرتوە؟ حەمەدۆك هاتوەتەوە؟ چ گۆڕاوە وەسمانەزلە چ گۆڕاوە؟ کە نیازت هەیە ئێمە لەگەڵ خۆت بەریەوە؟"

بە بیستنی ناوی حەمەدۆك گوتی...ئا...خ و راست لەو لەحزەیەدا چاوی لە چاوی مەلافەرهاد هەڵنەنگووت. چاو لێك کردنەکەیان بەمانا بوو. دیسان دڵی وەسمانەزلە کەوتە لێدان:"پێی بڵێم؟"

وەسمانەزلە زۆری قسەکرد، لەبەریان پاڕایەوە، هەڕەشەی کرد، بۆڵاندی، رێگە چارەی نیشان دان، بە قوربان و سەدەقەیان بوو، باسی ئەو نوورەی کرد کە دیواری تاریکایی شەق کرد، داستانی کێوی قافی چەند جار، هەر جارەی بە جۆرێك بۆ گێڕانەوە، بەسەرهاتی تەیرە سپی‌یەکەی بە شاخ و باڵەوە بۆ باس کردن و زۆر مەسەلی دیکەشی هێنانەوە.

ئەمجار مەلافەرهاد دەستی بە قسە کردو گێڕایەوە کە چۆن وەکیل باشی وەختی هێرش بۆ سەر ئاوایی بریندار بووەو تازەش ناگەڕێتەوە مەخفەر. هێندێك مەسەلی دیکەشی هێنانەوە. مەلافەرهاد"مەولوودی خوێنەوە" بوو. دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو. دەنگی ئەوەندە بەسۆز

بوو کە گوێگرەکانی دێنایە گریان. مەلا بەو دەنگە خۆشەی چەند ئایەتێکی قورئانی بە عەرەبی خوێندن و پاشان بۆی لێك دانەوە. نێوەرۆکی ئایەتەکان پشتیوانیی لەگەڕانەوەی جووتیارەکان بۆ سەر زەوییەکانیان دەکرد.

هەتا ئێوارێ زۆریان هەوڵ دا نەیان توانی دێهاتییەکان رازی بکەن کە بگەڕێنەوە وایوای. شێویان هێنا. وەسمانەزلە لە کاتێك دا حازر نەبوو نانی وان بخوا، نەڕاندی:

"نەحلەت لە پیاوی وەك ئێوە."

هەموو ئازای لەشی لە رقان دەلەرزی. روخساری وەك کاغەز سپی ببوو. مەلافەرهاد هەوڵی دەدا ئارامی بکاتەوە، دەترسان لە رقان خوێنی راوەستێ. پاش ئەوەی نەختێك وەسمانەزلەی ئارام کردەوە، سواری ئەسپەکەی کردەوە، بۆخۆشی سوار بوو. پاشان ئەسپەکەی بۆ لای ئەو دێهاتییانە کە لە رق هەستانی مام وەسمان سەریان سوڕمابوو، لێخوڕی و بە دەنگێکی ئارام و بەسپایی لە کاتێك دا لەسەر هەموو وشەیەك رادەوەستا، گوتی:

"ئێوە تووشی نەحلەتی خوا بوون. ئەوە پێتان دەڵێم تووشی بەڵای خواش دەبن. لێرە بن و لەنێو ئەو بەردەڵانە بێ ئاو و گیایەدا سەقەت بن، لێرە بن هەتا سەقەت دەبن. ئێوە وایوایتان وێران کرد."

تاریکەشەو بوو. لە تاریکایی دا ئەسپیان لێدەخوڕی و هەتا نیوەشەوێ بێدەنگ و رکێف بە رکێف لێیان خوڕی. وەسمانەزلە هەر لە فکری ئەوەدابوو کە داخوا مەلافەرهاد ئاگای لە هاتنەوەی حەمەدۆك هەیە یان نا. فکری دەکردەوە:"ئەگەر نەیزانیبا هاتوەتەوە، مومکین نەبوو ئەوەندەی هیواو هومێد هەبێ." و بەم جۆرە هەستی متمانەی خۆی دەرهەقی مەلافەرهاد بەهێزتر دەکرد. نەختێك دواتر لە بڕیارەکەی پەژیوان بووەوەو لە دڵی خۆی دا گوتی:"بنیادەم شیری خاوی خواردوە، ناکرێ متمانەی پێ بکەی." دەهاتە سەر زمانی و دووبارە پەژیوان دەبووەوە. سەرەنجام کە خۆی پێ رانەگیرا، گوتی:

"حەمەدۆك..."و بێدەنگ بوو. مەلافەرهاد هاتە نێو قسەکەی و گوتی:"حەمەدۆك چیی بەسەر هاتوە؟"

وەسمانەزلە پاش ساتێك دوودڵی گوتی:

"مەلافەرهاد..." و دیسان بێدەنگ بوو. دووبارە گوتی:

"مەلافەرهاد... بەڕاستی ئەم مەلافەرهادە کێیە، لە کوێ ڕا هاتوە، چ کارەیە؟ ژنی لە وایوای هێناوە. کچی یەکێك لە قەوم و خوێشەکانی هێناوە، بەڵام کێیە؟ جێی باوەڕە؟ چاوی راستە نابێ متمانە بە چاوی چەپە بکا. مەلافەرهاد!"

"فەرموو مام وەسمان."

"مەلافەرهاد دەڵێم ئەگەر ئێستا حەمەدۆك مابایە..."

"مام وەسمان! یانی دەڵێی حەمەدۆك مردوە؟"

"قسان دەکەین، ئەگەر حەمەدۆك وەك جاران لە چیاکان بووایە، ئەتۆ پێت وایە یاریدەی نەدەداین؟"

مەلافەرهاد بە باوەڕێکی قایمەوە گوتی:

"دیارە کە یاریدەی دەداین. ئەو کوڕێکی پاك و شەریف و ئازایە."

وەسمانەزلە گوتی:

"بریا لەم هەل و مەرجەدا حەمەدۆك لە چیاکان بووایە، یان ئەگەر لە بەین نەچووبێ لە لای ئێمە بووایە. بە باوەڕی تۆ ئەودەم بۆ ئێمە نەدەبووە ئەو تۆپەڵە نوورە کە کەوتە نێو تاریکایی؟"

"بۆچی، دەبوو."

"یان وەك تەیرە سپیەکە؟"

"ئەم جۆرە ئینسانانە راست وەك ئەو تەیرە سپیەن. ئەمانە کاریان هەر ئەوەیە. دیتت چۆنی کالایجی کوشت" دیتت چۆن بە کوشتنی وی عەلیسەفابەگی تەزاند؟ وانەبوو؟"

وەسمانەزلە گوتی:

"بریا حەمەدۆك پەیدا بایەوە. جارێکی دیکە بە چاکی ژیانی لە عەلیسەفابەگ تاڵ دەکرد، بە جۆرێك کە ئیدی نەتوانێ راست بێتەوە..."

## (١٥)

"خانووەکەیان دا بە سەیران قیز. بەڵایەك کە بەسەر وی هات، خوا بەسەر دوژمنی کەسی نەهێنێ. ماڵەکە چۆنە؟" حەزی دەکرد بچێ و ئەو خانووە لە نزیکەوە ببینێ. زەوی‌یەکە چۆن زەوی‌یەك بوو؟ لە کوێی ئاوەدانی بوو؟ مەزراکە عەلی سەفابەگ زەوتی کردبوو. عەلی سەفا چ جۆرە پیاوێکە، چیی دەوێ؟ ئەم هەموو زەوی‌یەی بۆ چیە؟

چما نیازی هەیە لە دەشتی ئاناوارزا پاشایەتی بکا؟ وەسمانەزلە دەی گوت لە ژوور بەردەڵانەکانی ئاناوارزاوە قەڵایەك هەیە کە جێگای ئیمپراتۆرەکانی ئەرمەنی بووە. ئەودەم سەرانسەری چوکووراوا لەژێر فەرمانڕەوایی ئیمپراتۆرانی ئەرمەنی دا بەڕێوە دەچوو. داخوا عەلی‌سەفابەگیش دەیەوێ ئیمپراتۆری‌یەکی وا دامەزرێنێ؟ عەلی‌سەفابەگی زاڵم و بێ‌ئینساف کاری وای کرد کە لە ئینسانەتی بەدوور بوو. حکوومەتیش پشتیوانیی لەو دەکرد. وەسمانەزلە سێ شەو و سێ ڕۆژان چۆکی بە چۆکی حەمەدۆکەوە دابوو و لەبارەی خان و ئاغاکانی چوکووراواوە زۆر شتی بۆ باس کردبوو. دیارە حەمەدۆك بۆخۆی هەمووی دەزانین، بەڵام وەسمانەزلە لە سیرێ هەتا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ شی کردبووەوە. ئەو ئێستا بە باشی لە هەموو شتێك خەبەردار بوو و هەمووی هەست پێ‌دەکرد و ڕۆژ بەڕۆژ ڕق و قینی دەرهەق بە ئاغاکان زیاتر دەبوو. ئەوان هەموویان یەك بە یەك لە عەبدی‌خان خراپتر بوون. هەر ئەم عەلی‌سەفابەگە. بە بیستنی ئەم ناوە هەموو مووی لەشی لەبەر بێزاری دەبوونە نەشتەر. هەموو ئاغاکان لەبنی‌ڕا لەگەڵ وی دوژمن بوون. هەر ئەم عەلی‌سەفابەگە بوو کە عەبدی‌خانی لەبنباڵی خۆی گرتبوو. ئەمانە، ئەم خان و ئاغایانە، هەرچەندیش پێکەوە دوژمن بن، هەر بەو ئەندازەیە هاوپێوەندی‌یان پێکەوە هەیە.

مردنی عەبدیخان شێتی کردبوون. چەندین دەستەی چەکداریان پێك هێنابوون و چیای گەورەی توورووس کون بە کون و دێ بە دێ گەڕابوون. ئەگەر نەیتوانیبا ڕابکا، بێگومان دەیان کوشت. هەزاران لادێییو سەدان جەندرمە لەکێوو بەندەنان بەدوای حەمەدەزلەو حاجی دۆران و چەتە دورمووش دا نەدەگەڕان، بەڵکوو شتێکی ئەوانی گەیاندبووە سنووری شێت بوون، ئەوە بوو کە دەستیان بە حەمەدۆك ڕانەدەگەیشت. چووبایە هەرکوێیەك سەرەنجام دەیان دیتەوەو دەیان کوشت. چونکە ئەو، عەبدیخانی نەکوشتبوو، بەڵکوو هەموو ئاغاکانی کوشتبوون. لە ڕاستی دا ئەو لە قالبی عەبدیخان دا هەموو ئاغاکانی کوشتبوون، هەربۆیەش ئەوان هەرگیز لێی خۆش نەدەبوون.

بۆچی لەگەڵ ئەو هەموو زوڵمەی عەلیسەفابەگ لە دێهاتییەکانی کردبوو، یەکێك لەوان ڕاست نەدەبووەوە گوللەیەکی دە زاری کا؟ هەموویان چاوترسێن ببوون؟ ئەو ڕۆژانە زیاتر لە نیوەی خەڵکی چوکووراوا لە ژێر تەوژمی زوڵم و زۆر دا باریان کردبوو و لە دەشتەکان دا بۆ بستە عەرزێك دەگەڕان کە لەسەری بژین. نیوەی زیاتری گوندی وایوای چۆل ببوو.

بە جۆرێك چاویان لە عەلیسەفابەگ ترسابوو کە دوور نەبوو ڕۆژێك بەیانی کە چاوت هەڵدێنا، دیتبات هەمووان دێیەکەیان چۆل کردوەو ڕۆیشتوون. دێهاتییە سام گرتووەکان لە بیری ڕاکردن دا بوون و وەسمانەزلە تێمابوو کە چۆن پێشی ڕاکردنی جووتیارەکان بگرێ. وەسمانەزلە لەبارەی گوندی "ئاك مەزار"، "ئیدریس بەگ"ەوە کە بۆخۆی خەڵکی وێ بوو، دەیگێڕایەوەو دەیگوت:"سەربردەی ئیدریس بەگ دڵی ئینسانی بۆ دەبرژێ. هۆی هەموو بەدبەختییەکانی وی خانێك بوو بە ناوی "عارف صائم بەگ" کە لە دۆستانی نیزیکی مستەفاکەماڵ پاشا بوو، تەنانەت ترۆمبیلیشی هەبوو. لەڕێگا خاکییەکانی ئاناوارزادا هەمیشە بە ترۆمبیل هاتوچۆی دەکرد. حەمەد تا ئێستا ترۆمبیلی نەدیبوو. زۆر تامەزرۆی دیتنی بوو. لە سەرانسەری چوکووراوادا تەنیا یەك کەس ترۆمبیلی هەبوو، ئەویش عارف بەگ بوو. دێهاتییەکان و ئاغاکان هەموویان حیسابیان بۆ عارف بەگ دەکرد. عەلیسەفابەگیش زۆری لـێدەترسا.

لە حاڵێك دا حەمەد لە سووچێکی کەوێڵە تاریکەکەدا تفەنگ لەسەر کۆش دانیشتبوو، ئەو فکرە تێکەڵ پێکەڵ و شێواوانەی بەمێشك دا ڕادەبووردن.

بە قەڵشتی پەنجەرە دارینە پێوەدراوەکەی هۆدەکەدا جادەیەکی باریکی تیشك ڕاکشابوو، کە هەتا سەر خاکی نێو هۆدەکە درێژەی هەبوو. لەم جادە تیشکییەدا هەزاران وردیلەی

درەوشاوەی تۆزوخۆڵ لە جووڵان دا بوون. حەمەد چەندین جار دەستی لەبەر ئەو تیشکە راگرت، ئەو دەستەی لەنێو تیشکەکە بوو گەورەترو بەهێزتر دیار بوو. هەستێکی سەیری بۆ پەیدا بوو، بەرە بەرە ترس و ناهومێدیی دێهاتیەکان کاری دەکردە سەر ئەویش و هێندەی نەمابوو ئەویش وەك جووتیارەکان سەر لە دیواری تاریکایی بدا.

حەمەدۆك دوو جار لە قەڵشتی دەرگاوە مەلافەرهادی دیبوو. هیچ وەك مەلایان نەدەچوو. ریشێکی تێك ئاڵقاوی وەك عەبەنووسی رەش، کاکۆڵێکی رەشی بادراوو چاوێکی رەشی وەك گڕی ئاگر تروسکەداری هەبوون. ئەو بەو لووتە قەپۆز بەرانیەیەوە وەك پیاوێکی جێگای متمانە دەهاتە بەرچاو. وەك وەسمانەزلە دەیگێڕایەوە، رۆژێکی مانگی رەمەزان مەلافەرهاد کە لە ئاناوارزاوە هاتبوو، بە هەمبانەیەکەوە کە کتێب و جلکەکانی تێ نابوون، شەکەت و ماندوو هاتە وایوای و دەسبەجێ بۆ ئێوارەی ئەو رۆژە خانووە چۆڵێکی ئاوەدانیی کرد بە مزگەوت و خەڵکی بانگ کرد بۆ نوێژی جەماعەت و بۆخۆشی پێش نوێژیی بۆ کردن. لەو رۆژە بە دواوە ببوو بە ئیمامی ئاوەدانی. لەبارەی مەسەلە ئایینیەکانەوە زۆر نەدەدوا، نوێژی جەماعەتی دەکردو خەریکی کارو گوزەرانی خۆی دەبوو. هەر لەم دێیە کچێکی هێنا. ژنەکەی زەویەکی زۆر چووکەڵەی هەبوو. مەلافەرهاد لە جیاتیی پێش نوێژیەکە بەراتێکی وەرنەدەگرت. زەویە چووکەڵەکەی خێزانی رەنێو دێناو گوزەرانی پێ دەکرد.

لە سەرەتادا دێهاتیەکان هەموویان لێی بە گومان بوون و دووریان لێدەکرد. پاشان بەرە بەرە لەگەڵی رێك کەوتن بە جۆرێك کە ئێستا بە یەکێك لە خەڵکی وایوای حیسابی دەکەن. بەڵام ئێستاش لە ژێر تەئسیری شەخسیەتی ئەفسووناویی ئەودا بوون، و وەك کەسێکی نائاسایی و جێگای سەروسوڕمان چاویان لێدەکرد. تەنانەت وەسمانەزلەش لەگەڵ ئەوەی خۆشی دەویست و متمانەی پێ دەکرد، خۆی لێ دوور رادەگرت و نامۆیی لێدەکرد.

ئاغاکانی چوکووراواش وەختێك بیستیان پێش نوێژێك هاتوەتە وایوای لە پێش دا زۆری لێ بە شك بوون، بەڵام دوایە کە دیتیان پیاوێکی بێئازارە، لەبیر خۆیان بردەوە. بەوحاڵەش ناوبانگی لێوەشاوەیی مەلافەرهاد لە چوکووراوا گەڕابوو و رۆژبەرۆژیش زیادی دەکرد. بەتایبەتی بووە بنێشتە خۆشەی سەری زاری ژنان. ژنان و کچان بە بیانووی نووسینی نوشتەی چاوەزار لە گوندە دوورەکانەوە، لە ئەدەنە، کووزان، تارسووس و تەنانەت مێرسین و ئەسکەندەروونەوە دەهاتنە سەردانی. مەلافەرهاد بۆ ئەو نوشتەو دوعایانەی دەینووسین پارەو پووڵێکی وەرنەدەگرت و رۆژ بە رۆژ زیاتر لە چوکووراوا دا ناوبانگی دەردەکرد.

حەمەد لە نێو هەزاران هەستی شێواو و ئاڵۆزدا پەلەقاژەی دەکردو لەم کەوێڵە تاریکەدا فکری جۆراوجۆری یەك لە دوای یەك بە مێشك دا دەهاتن.

داخوا لەم دێیە دەنێژرێ؟ ئەگەر بریندار بوو، گوللە لە کوێی دەدرێ. مردنەکەی چۆن دەبێ، وەختێك مردن میوانی بوو، چۆنی میوان دەبێ. داخوا مردن وەك تاریکاییەیە؟ ئەم تاریکاییەیە چۆن دەبێ، داخوا مردن وەك خەو وایە؟ داخوا ئەو برینەی مرۆڤی پێ دەمرێ زۆر بەسۆیە؟ جارجار ترسی مردن دەچووە دڵیەوە. ترسی مردنی لە قووڵایی هەناوی دا هەست پێ دەکردو لەو هەست پێکردنە دەلەرزی و لە ترسان تەواوی مووی لەشی دەبوونە نەشتەر. ئەو، زۆر لەوە پێشتر بە خۆشیی خۆی حوکمی مردنی خۆی دابوو. بەڵام نەیدەتوانی بزانێ مردن چۆنەو زۆر زۆریشی حەز دەکرد بزانێ. بەڵام ئەوەندە هەبوو بڕیاری دابوو نەیەڵێ بیگرن و دەستی جەندرمەی بگاتێ، بیخەنە زیندان و لەلای قازی رایبگرن. خەجیج لەبارەی جەندرمەو بەندیخانەو قازییەوە زۆر شتی بۆ گێڕابووەوەو پێی گوتبوو:"حەمەد مردن هەزار جار لەمانە کە گوتم شیرن ترە. خوا بم کا بە قوربانی مردن!"

حەمەد جاروبار لە دەستی رقێکی بێئەنداز جاڕز دەبوو و لەدڵی خۆی دا هاواری دەکرد:"لە شەڕ دا دەمرم." لە دەروونی دا هەستێکی سامناکی تۆڵە ئەستاندن دەبزووت. ئەو هەستە بە کوشتنی عەبدیخان دانەمرکابوو. ئەو هەستە مەزنەی تۆڵە ئەستاندن لەوە زیاتر بوو کە لە سنوورێکی دیاریکراودا رایبگرێ. رقەکەی رووی کردە سەرۆکی مەخفەر، ئەو وەکیل باشییە کە یۆیازئۆغلیی وەبەر پێلەقە دابوو... رووی کردە حکوومەت... عەلیسەفابەگ و عارف صائم بەگ... هەستی رق و تۆڵە ئەستاندنەوەی لە یەکێکەوە دەچووە سەر یەکێکی دیکە.

هێندێك جاریش حەمەد هەروا بە خەیاڵ لەگەڵ عەلیسەفابەگێك کە قەت نەیدیبوو و نەیناسیبوو بەشەڕ دەهات و دەیکوشت وپاش ئەوەی کە کەللە سەرەکەی دێناو خلۆری دەکردەوە بۆ نێو گوندی وایوای، ملی ڕێگای دەگرت و دەڕۆیشتەوە چیاو وەسمانەزلەی دەدی کە بە گریانەوە دەیگوت: "شەهێنەکەم، ئەتۆ ئێمەت نەجات دا، ئەتۆ گیانێکی تازەت بەبەر دێهاتییەکان دا کرد."و باوەشی پێدا دەکرد. دیسان هەر بەخەیاڵ عارف بەگی دەکوشت و جووتیارەکانی گوندی ئاك مەزار لە خۆشیی مەرگی وی جێژنیان دەکرد. حەمەد لە کێشەو گێرەی ئەو شەڕە خەیاڵییانەدا لە حاڵێك دا شەڵاڵی ئارەق بوو، گوللەبارانی دەکردو دەیکوشت و دەی بڕی.

پاشان لە نەکاو سەری لە دیواری ناهومێدی دەدرا. وەسمانەزلەش ئیدی سەبرو سیکەدانەی نەدەما. هەرکە حەمەد دەهاتە نێو دێ، ئەو بەزمانی بێزمانی هەموو خەڵکی ئاوەدانیی تێدەگەیاند کە هاتوەو لەماڵی ئەوانە.

سەرەنجام رۆژێکیش لە زمانی دەردەچوو و نهێنییە گەورەکەی بە دەهۆڵ و زورناوە لەلای هەموان دەدرکاند. ئەودەم ئاغاکان و خانەکان و حکوومەت لەداستانەکە ئاگادار دەبوون و ئەوەی نەدەبوو، ڕوویدا، ڕووی دەدا. مانەوەی لەماڵی وەسمانەزلە زۆری کێشابوو. دیسانیش وەسمانەزلە هەرچەند زۆر تامەزرۆی درکاندنی ئەم نهێنییە بوو، پیاوەتی کردبوو و نەیهێشتبوو کەس هەستی پێبکا. بەڵام ئیدی لەوە زیاتر مانەوە بە سەڵاح نەبوو.

لە جێی خۆی هەستا، چووە بەردەرگا. لە درزی دەرگاوە تەماشای دەرێی کرد. لە حەوشەی پازدەبیست جووجیلە وەك گلۆڵەی زەردی کولکن بەدوای مریشکە کورکێك دا بەنێو خۆڵ دا خلۆر دەبوونەوە. کچێکی جحێڵی کورتەباڵا کە پرچە پەخشانەکانی پشتێنییان داپۆشیبوو، بە کۆڵانەکەی ئەودیو حەوشەی دا ڕابورد. سەگێك کە کلکی لە گەڵۆزی گرتبوو و خۆی خڕ کردبووەوە هەوڵی دەدا لەبن دیواری بخزێتە قوڕنەیەك و پەنای تێدا بگرێ. حەمەد کەوتە سەر یادی کوێرئۆغلی. پاش کوێرئۆغلی بیری لە دایکی و خەجیجێ کردەوە. دایە حۆری چەند ژنێکی ئازا بوو.

ئەگەر لە سەرانسەری چوکووراوا هەموو دێیەك ژنێکی وەك دایەحۆریی لێبووایە هەم عەلیسەفاو هەم عارف صائم بەگ هەقی خۆیان دەنرایە مستیان... پاشان دورمووش عەلیی پیرو دڵپاکی وەبیر هاتەوە... ئەمجار عەلیپەشەل، دۆستی کارزانی... و دوایە نایب ڕەجەب... جەبار... جەبار ئێستا هەر بە بیریشی نەماوە کە رۆژێك یاغی بووە. ئێستا لە دێ نیشتەجێ بووە، ماوەتەوە، بووەتە خاوەنی زەوییەکی گەورە کە کردوویەتە گەنمە شامی، ژنی هێناوەو دوو منداڵیشی بوون.

خەجیج، دایکی، عەبدیخان، کێوەکان، ئەشکەوت، کالاییی هەمووی ئەوانە لە بیرو مێشکی دا وەك دنیایەك لە تارمایی ڕووناك، تاریك، ئاشکرا، وەك سێبەر، تاڵ و شیرین و ناسك و لەبار، ڕەق وەکوو بەرد هەموویان بە تێکەڵ پێکەڵی دەهاتن و دەسووڕان و دەجووڵان. جارێك خۆشحاڵ دەبوو، جارێك غەمێکی قووڵ دایدەگرت. لەبەر دەرگا، دارێکی ئەقاقیا بۆنە گەرم و قورسەکەی لە هەوادا بڵاو دەکردەوە. ئاپۆرای هەزاران زەرگەتەو مێشەنگوینە لە دەوروبەرو لەسەر گوڵەکانی ئەقاقیا بە بۆنی توندو قورسی ئەقاقیا سەرخۆش ببوون و دەخولانەوە.

داره چناره بەرزەکەی هاتەوە بەرچاو. گەڵاکانی بە بایەکی توند لێك دەخشان و دەنگیان دەهات. لەنێو گابەردە بنەوشی‌یەکان دا گوڵاڵە بە بە ڕەنگی سووری خوێنەوە پشکووتبوون، دەت گوت کوورەیەکی سووری ئاگرینن و لە دوورەوە وەك بڵێسەیەك دەچوون کە لە نێو گابەردە بنەوشی‌یەکان هەستابێ. ئەوەندە زۆر بوون ئامێزیان لێ‌نەدەگەیشتەوە.

سوورایی‌یەکی توند لەبەر چاوانی بڵێسەی دا. دێ‌یەکە بە ئاوو ورتکەبەردەوە، بەسەربانە گڵێنەکان و منداڵە ورتکەکانیەوە، بە گوڵ وگیاو مێشەنگوینەکانیەوە، بە کێو و گابەردەکانی و بە ئینسان و پەلەوەرەکانیەوە لە پێش چاوانی ڕاوەستابوو و ڕوخساری ڕە ڕوخساری دەخشاند. ئارەزوویەکی پێش پێ‌نەگیراو لە دەروونی دا سەری هەڵدا. لە دڵی خۆی دا بیری کردەوە کە هەرچی بێ، بە زوویی دەکوژرێ. کەوابوو دەبێ جارێکی دیکە بە چاوی خۆی ئەم دێ‌یە ببینێ.

جەندرمەو دێهاتی‌یەکان وەك شارە مێروولە کێو و بەندەن و سەرانسەری چیای توورڕووسیان پڕکرد بوو. کون بە کون و ئەشکەوت بە ئەشکەوت بەدوای ئەم"چەتە"یەوە بوون. داخوا هەر لەم دێ‌یە ڕێی تێ نەدەچوو یەکێك بچێ و ڕاپۆرتی لێ‌بدا؟ یان هەر لێرە بە هەموو کەس بڵێ؟ هەردووکیان ڕێ‌یان تێ‌دەچوو. یاغی‌یەك هەرچی بێ، درەنگ یان زوو سەروکاری لەگەڵ گوللەیە. زۆر باشە. بەڵام ئەگەر قەرار بێ مردن میوانی بێ، دەبێ مردنێکی شیرن و ئینسانی و پڕشانازی بێ... لەو کاتەدا کە ئەو لەبن لێوانەوە دەیگوت:"ئەگەر وەسمانەزلە هاتەوە ئیزنی لێ‌دەخوازم و هەر ئەمشەو وەڕێ دەکەوم"، دایە قەمەر بە غاردان هاتەوە لای ماڵێ و بە کلیلە دەرگای کردەوە. وەختێك حەمەدی لەپشت دەرگا دی، گوتی:

"چ بووە کوڕم، بۆ لێرە ڕاوەستاوی؟"

حەمەد گوتی:

"دایە، بێ‌تاقەت بووم، تەماشای دەرێم دەکرد."

دایە قەمەر هاتە بن گوێی و بەسپایی گوتی:

"دێهاتی‌یەکان زانیویانە. هەستیان کردوە دەبێ لە ماڵی ئێمە خەبەرێك هەبێ. بەفکریان دا نایە کە ئەتۆ لێرە بی. بەڵام هەموو تەماشای ماڵی ئێمە دەکەن. ئاخ ئەم وەسمان منداڵە چۆنی سەرنجی هەمووان بۆلای ماڵی خۆمان ڕاکێشا. کوڕەکانم ئینیان بۆ هێناوم. هەر دەڵێن لە ماڵێ چ باسە؟ بابمان قسەیەکی لەسەر زارەو نایڵێ.

ئەمن هێندێك شتم تێك كردوەتەوە، بەڵام ئەوان باوەڕیان نەكردوە. پێم وایە ئەمڕۆ یان دێن ماڵەكە دەپشكنن، یان ماڵەكە دەخەنە ژێر چاوەدێری و ئێشكی لـێدەگرن. ئەتۆ هەتا وەسمان دێتەوە لە جێنوێنەكە مەیە دەرێ. باشە؟"

حەمەد گوتی:"باشە." بەڵام هەر لەو كاتەدا دڵی ترسا. ئەگەر لەو دەشتە هەموارەی چوكووراوا تووشی جەندرمە بووایە، هیچ كارێكی لەدەست نەدەهات. بێ ئەم لاو ئەولا دەكوژرا.

هیچ رێگا نەمابوون جگە لەوە چاوەڕێ بێ هەتا تاریك دادێ، تا بتوانێ بە كەلك وەرگرتن لە تاریكایی لە ئاوەدانی وەدەركەوێ: چەند سەعاتی رۆژ مابوو؟ لە قەڵشتی دەرگاكەوە تەماشای هەتاوی كرد. هەتاو ئاوا ببوو. خۆشحاڵ بوو لەوەی زۆری نەماوە تاریك دابێ. بەڵام هەر لەو كاتەدا بەرەبەرە هەستی بە غەم و خەفەت دەكرد. چۆن دەیتوانی بێ خواحافیزیو گەردن ئازایی لە كەسێك كە بە گیان و دڵ خۆشی دەویست" لە ئاوایی وەدەركەوێ؟ وەسمانەزلە بەقەد دایكی، بەقەد خەجیج ئەوی خۆش دەویست.

## (١٦)

عەلیسەفابەگ بە قەڵسی لە پێشخانەی خانووبەرەکەدا هاتوچۆی دەکرد. لەبەر خۆیەوە قسەی دەکردو دەیبۆڵاند و بە داخ و کەسەرەوە دەیگوت:

"کارەکان هیچ جوور نابن. دیار نیە ئەم ململانێیە بە کوێ دەگا! زەوییەکان بەیارو بێکەلك ماونەوە. ئەم دێهاتییە بێقیمەتانە نە بۆخۆیان ئەم زەوییانە ئاوەدان دەکەنەوە، نە دەش هێڵن ئێمە ئاوەدانیان بکەینەوە."

زەینەڵ بە کزی لسەر تەختەدارەکەی ئەوسەری داڵانەکە دانیشتبوو. لەگەڵ هەموو گۆڕانێکی قەڵسییەکەی عەلیسەفابەگ وەزعی ویش دەگۆڕا. ئەم وەزعە هەتا کاتێك عەلیسەفابەگ هات و ڕەق بەرامبەری ڕاوەستا، درێژەی هەبوو.

عەلیسەفا لە ژوور سەری زەینەڵەوە بە تانووتەوە گوتی:

"چ بوو زەینەڵ؟ دەت گوت هەر ئەم بەهارە دێهاتییەکان بار دەکەن و وایوای بەجێ دێڵن، زۆری لێحاڵی بووی ها؟! بەڕاستی هەموو شتێکت لە پێش دا دەزانی!! چی بوو؟ هەتا ئێستا خەبەرێك نیە. دەزانی چ بووە زەینەڵ؟ دەزانی؟ وەسمانەزلەو مەلافەرهاد لە پێش دا چوونە لای یۆبازئۆغلی کە بیهێننەوە وایوای... دوایەش چوونە ساریچام لەبەر خەڵکەکەی پاڕاونەوە کە بێنەوە وایوای... ئەتۆ دەت گوت هەتا بەهارێ کەس لە دێی نابێ. ها؟ چ بوو؟ بۆ ناڕۆن؟"

"وەڵڵا نازانم ئاغا، نازانم بۆ وای لێهاتوە. هەرچی بیر دەکەمەوە، هەرچی مەسەلەکە لێك دەدەمەوە هیچم دەست ناکەوێ. ئەمن پێم وابوو پاش ئەوەی خانووی یۆبازئۆغلیی سووتاو هەموو شەوێ وەك بارانە گوللە بەسەر دێدا بارین، دێهاتییەکان ئیدی لە دێدا بەند نابن. بەڵام نازانم چ بووە؟ لەپڕ وەزعەکە گۆڕا. لەپێش دا وەسمانەزلە لەنێو دێدا قیت بووەوەو

دوایەش مەلافەرهاد... دێهاتیـیە ترساوەکانیش غیرەتیان پەیدا کردەوەو گیانیان هاتەوەبەر ئاغا، بەخوا نازانم ئاغا، شتێك رووی داوە، بەڵام نازانم مەسەلە چیە. دەڵێم نەکا غەیری ئەم قایەقامە بێکیفایەتە، یاوەر یان حکوومەت، یەکێك ئەمانەی لە دژی ئێمە هان دابێ؟ بەڵام دەبێ کێ بێ؟ هەموویان بۆ ئێمە کار دەکەن، هەموویان لە ئێمە دەستوور وەردەگرن. نەکا عارف صائم بەگ بێ. ئەگەر ئەو بێ، حاڵمان شڕە. هەر خوابکا عارف صائم بەگ چاوی لەم خاکەوە نەبێ! نەکا ئەو ئەمانەی هان دابێ؟"

"لەبارەی عارف صائم بەگەوە زۆرم بیر کردوەتەوە. زۆرم لـێکۆڵیوەتەوە. تەنیا دە ساڵ پێش ئێستا جارێك لەگەڵ وەسمانەزلە قسەی کردوە. جگە لەو تا ئێستا چاوی بە هیچ کام لە خەڵکی ئاوایی نەکەوتوە."

"بە مەلافەرهاد چی؟"

"بە هیچ جۆر..."

"ئەم مەلافەرهادە چیی بووە، جاران خۆی دەو جۆرە کارانە هەڵ نەدەقوتاند؟."

"دەڵێن ئەم رۆژانە زۆر قەڵس‌وقۆڵە. بەتایبەتی لە بەسەرهاتی ئەسپەکە زۆر تووڕەیە، یەکیش لەوە کە هەموو شەوێ دێـیەکە وەبەر تفەنگان دەدەن. یەکیش دەربارەی یۆبازئۆغلی، لەوەش زۆر قەڵسە. دەڵێن وەختێك لە دەشتێ ئەسپەکەی دیوە وەك باران فرمێسکی بە چاودا هاتوە. دەڵێن ئەوەی تفەنگی لە وەکیل باشی داوە، وەسمانەزلە بووە. جاران وەسمانەزلە وا نەبوو. وەختێك دێـیەکەیان دەدایە بەر گوللە سەری لە ژوورێ نەدەهێنایەدەر، هەتا دەگا بەوەی تفەنگ لە وەکیل باشی بدا.

ئەمن پێم وایە هەرچی هەیە لەبن سەری وەسمانەزلە دایە. عارف صائم بەگ ئەوەندە خۆی چووك ناکاتەوە. پاشان پێویستیـیەکیشی بە زەویـیەکانی وایوای نیە. ئەمنیشی خۆش دەوێ. ئەگەر دڵیشی بە زەویـیەکانی وایوایەوە بووایە، بە خۆمی دەگوت. نا، نا... فکرم بۆ کەس ناچێ. لەوانەشە مەلافەرهاد ئەمانەی وەغیرەت خستبێ."

"رەنگە، بەڵام ئەمن هیچم دەست نەکەوتوە. ئەوەندە دەزانم کە مەسەلەکە لە وەسمانەزلەوە دەستی پێکرد."

ئەمجار زەینەڵ بە درێژی باسی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کرد کە بەسەر وەزع و حاڵی وەسمانەزلەدا هاتبوون و باسی کرد کە چۆن لیباسی رۆژانی جێژنی لەبەر کردبوو و قەڵنەی بە لێوەوە گرتبوو و بێئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکا سێ رۆژی تەواو لەنێو ئاوایی دا ڕاوێچکەی کردن و هەمیشەش

پێکەنینی لەسەر لێوان بوو، کە چۆن بەرامبەر بە خانووی ئاگرتێبەربووی یۆیازتۆغلی پێدەکەنی و قەلنەی دەکێشا. بە کورتی لە سیرێ هاتا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ عەلیسەفابەگ باس کرد.

عەلیسەفابەگ لە حالێك دا لەسەر نیوتەختێك هەڵ دەترووشکا گوتی:

"ئەمن هیچ سەر لە کاری ئەم وەسمانەزلەیە دەرناکەم."

زەینەڵ وەڵامی دایەوە:

"پیاوێکی زۆر ئازایە، زۆر نەترسە. لە پازدە شەڕان دا بەشدار بووە... هەموو گیانی جێبرینە. پێم وایە نەختێك تێك چووە. هێندێك جار ترسەنۆك دەبێ، لە سەری بدەن، نانی لە دەستی دەرێنن قسە ناکا. هێندێ جاریش زۆر بوێر دەبێ. وەختێك تووڕە دەبێ لـێنزیك بوونەوەی ناکرێ. شتێکی دیکەشی هەیە. پیاوێکە کە گیانی خۆی زۆر خۆش دەوێ. ئەوەی ڕاست بێ ئەمنیش سەر لە کاری دەرناکەم."

عەلیسەفابەگ لە حالێك دا چەنەگەو پشت ملی دەخوراند گوتی:

"ئێمەش لە زۆر شەڕان دا بووین. بەڵام وەك ئەم سەقەت بووە یارمان بە مافەکانی خەڵك نەکردوە، دەستمان بەسەر عەرزی کەس دانەگرتوە. وەك ئەم پیرە سەگە گاڵتەمان بەسەربەخۆیی مەملەکەت نەکردوە. وەکیل باشیی میللەتمان نەداوەتەبەر گوللە. جارێ با قەرز بێ لەسەرمان، هەتا لە وەختی خۆی دا هەقی ئەم پیرەسەگە دەنێمە مستی. بۆ ئەوەی دیکەشیان کە کەس نازانێ کێیەو لەکوێڕا هاتوە، ئەم کارە گران تەواو دەبێ . ئەو کابرایەی دەڵێم، ئەو پێش نوێژە کە کەس نازانێ چ کارەیەو لە کوێڕا هاتوە. نازانم مەلایە، چەتەیە چیە. ئی هەردووکیان با قەرز بێ لەسەرمان.

مشووریان دەخۆم زەینەڵ، مشووریان دەخۆم. بەڵایەکیان بەسەر دێنم ئەو شیرەی لە مەمکی دایکی خۆیانیان خواردوە، بە کونە تفنکانیان دا بێتەوە. هەتا لە گیانی خۆیان وەڕەز دەبن، هەتا وایوایـیان لـێدەبێتە جەهەننەم. یان دەست لە زەوییەکانی من هەڵدەگرن، یان دنیایان لـێدەکەمە جەهەننەم. زەینەڵ ئێستا پێم بڵێ لە کوێوە دەست پێ بکەین؟"

زەینەڵ گوتی :

"ئاغا نەخشەیەکم هەیە. دەچینە لای "یەغموورئاغا" پێیدەڵێین هەموو ئەسپەکانی ئاوەدانی بدزێ."

عەلی سەفا بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

"فکری چاکە. بۆ هەر ئەسپێکیش کە بیدزێ لیرەیەکی دەدەمێ، پاشان کارێکی وا دەکەم پیاوەکانی خۆشمان یاریدەی بدەن. زەینەڵ، ئەتۆش هاوکارییان لەگەڵ بکە."

"باشە، ئاغا."

"ئەم بەرنامەیە سەرەتای کارە. یان بە چۆك دا دێن و دێیەکە بە خوا دەسپێرن و دەڕۆن، یان ئەوە... یان ئەوە کە دەبێ چاوەڕوان بن هەزار جۆرە بەلآیان بەسەر بێ.

زەینەڵ چاوی پێکەوەنان، بە ئیشتیاوە لیچ و لێوی خۆی لستنەوەو گوتی:

"بەڵێ دەبێ چاوەڕوان بن هەزار جۆرە بەلآیان بەسەر بێ."

"ئەمشەو ئەمن دەچمە لای یەغموورئاغا. ئەتۆش بچووە گوندی "مەمەدین لی" و"چیك چیك لار" بە خزمەکانمان بڵێ بۆ شوێنەونکە ئەمشەو دێیەکە وەبەر تفەنگان بدەن، با دێهاتی‌یەکان نەزانن وەکیل باشی بوو کە شەوانە دێیەکەی وەبەر گوللە دەدا.

"ئەمن ڕۆیشتم ئاغا."

زەینەڵ لە پلیکانی خانووبەرەو باڵەخانەکە هاتە خوارو سوار بوو، ڕۆیشت.

عەلی‌سەفا بیری دەکردەوە کە ئەگەر دێهاتی‌یەکان بە پشتیوانیی عارف صائم بەگ لێی ڕاست بووبنەوەو ئەگەر عارف صائم بەگ چاوی لەو زەوی‌یانە بێ، کارەکە دژوار دەبێ. چونکە ئەو عارف بەگی باش دەناسی. پێشتر مولازیی جەندرمە بوو. لە شاری خزمەتی دەکرد. پیاوێك بوو ئازا، ئاژاوەگێڕ، چاوچنۆك و بە تەماع و بێ‌پەروا لە عەشیرەتی کوردەکانی "بین گوللی". وەختێك فەرانسەیی‌یەکان ئەدەنەیان داگیر کرد، لەگەڵ هێزەکانی خۆولآتی و فەرانسەیی‌یەکان تەون و بەستی هەبوو. زۆڵێکی زرینگ و بەهۆش بوو. ئەو ڕۆژانە حکوومەتی ئەنکەرە لەسەر قامکی عارف صائم بەگ دەسوڕا، چونکە نزیکترین کەس لە مستەفا کەمال پاشا بوو و بە چاو و گوێی وی لەنێو حکوومەت دا دەژمێردرا. خوابکا هان دانی وەسمانەزلە دەستی وی تێدا نەبێ. جگە لە عارف بەگ هەرکەس بایە پێی‌دەوێرا. تەنیا ئەوەندە بەس بوو کە عارف بەگ دەستی لەو کارەدا نەبایە، هەرکەسی دیکە بایە گرنگ نەبوو... بەلآم نا، عارف بەگ کەسێك نیە بیهەوێ لە بنەوە دێهاتی‌یەکان دنە بدا. ئەو ڕاست و ڕەوان دێتە مەیدان. بۆ وێنە وەلآم دەدا کە" زۆر سەر مەخە سەر دێهاتی‌یەکان و مودارایان لەگەڵ بکە." قایمقام... ناکا ئەم کارە فیتی قایمقام بێ! هەرچەند ئەو غیرەتی ئەو کارەی نیە، بەلآم وا دێتە بەرچاو ئاوری بن کایە بێ. دەبوو هەر ئەم ڕۆژانە بۆسەری قایمقامی لێ‌دابایە هەتا کەسێکی جێگای باوەڕ بنێرنە جێگاکەی. یاوەری فەرماندەری جەندرمە... ئەو لە جێ‌دا کاری بەسەر ئەو کارانەوە نیە. هیچی تێ‌ناگا. بەستەزمانە هەمیشە دەڵێی لە خەوێ دا بە ڕێ‌دا دەڕوا... ئەو نابێ دەستی لێ‌بدەی. لەو باشترو دەستەمۆتر پەیدا نابێ.

بەرەبەرە دڵی پڕ دەبوو لە خۆشحاڵی‌یەکی بێ‌ئەندازە. خەڵکی وایوای ڕۆژێك بەیانی کە لە خەو هەڵدەستن دەبینن کە بۆ نموونەش ئەسپێك لە ئاوەدانی‌دا نەماوە. تەنیا چەند سەر گوێ‌درێژیان بۆ ماوەتەوەو خەڵکی وایوایش کە ئەوەندەیان ئەسپ خۆش دەوێ... بەلآم تەنیا ئەسپێکی خەنەیی لە دەشتی ئاناوارزادا دەمێنێ. داخوا ئادەم توانی بە تفەنگ لێی دا یان نا؟

به وەبیرهاتنەوەی ئەسپی خەنەیی هەستی بە برژانەوەیەك لە دڵی خۆیدا کرد... پاشان ئەوەندە بەڵا بەسەر دێهاتییەکان دێنێ کە بە پێی خۆیان بێن و بڵێن:"ئاغا، ئێمە کردمان ئەتۆ نەیکەی. فەرموو، ئەمە زەوییەکان هەمووی بۆ جەنابت. ئێمە دەرهەقی تۆ خەراپەمان کرد. تەنیا دوو رۆژمان مۆڵەت بدە جێیەك بۆخۆمان پەیدا بکەین، ئێرە بەجێ دێڵین و دەڕۆین."

لە دنیای خەیاڵ دا لەبەرهەیوانی باڵەخانەکەوە تەماشای دێهاتییەکانی دەکرد کە ژن و منداڵ و پیرولاو هاتبوون لەبەر دەرگای ماڵەکەی کۆببوونەوەو پێی دەگوتن:

"زۆر باشە، لاچن لەپێش چاوم. دوو رۆژتان مۆڵەت دەدەم. بەڵام تەنیا دوو رۆژ. پاش دوو رۆژان ئیدی کەس لەم دێیەتان نەبینێ. ئێوە کارێکتان کرد ئەمن لەسەر زەوییەکانی خۆم خوێن بگریم! ئاخر براینە خوا هەڵدەگرێ ئەوەندە زوڵم دەرهەقی کەسێك بکرێ! ئاخر ئەو زەوییانە کە ڕەنێویان ناهێنن بە کەلکی چیتان دێن؟..."

پاش وایوای دەبوو زییەلێنەکە لە درك و داڵ پاك بکرێتەوە... پێنسەد هەکتار دەبوو... پاشان وردە وردە ئۆرە دەگەیشە زەوییەکانی ئاکچاساز... پاشانیش کێلگەکان... چونکە ئەگەر کەسێك لە ئاکچاساز و ئاناوارزاو چوکووراوا زەویی کشتوکاڵی هەبێ و خاوەنی کەردوکێڵ بێ، هەروا بزانە گەنجینەیەکی گەورەی هەیە...

"کوڕە! دێهاتییەکانی وایوای، هەی چەپەلێنە هاتوون وەك کێوی ئالاداغ"، وەك ئەم کێوە بلێندەی دولدوڵ پێشتان پێگرتووم... وەلاکەون، ڕێگابدەن... ئەم مەسەلەیە بۆ من شەڕی مان و نەمانە، بۆ ئێوە چی؟ هیچ، هیچ مانای نیە... لاچن لەسەر ڕێگام... چوکووراوا پڕ لە عەرزە! عەرزی چۆڵ و هۆڵ... هەر بژی یۆبازئۆغلی! ئەتۆ گەورەترین خزمەتت پێکردم!..."

قەباڵەی ئەو حەڤدە هەزار میترەی کە یۆبازئۆغلی دابوویە، بەدەستەوە گرت و ماوەیەکی زۆر تێیەوە ڕاما و پێکەنی. ئەگەر ئەم تاپۆیەی بەدەستەوە نەبا کارەکەی زۆر دژوار دەبوو...

لە نهۆمی خوارێ"وەلی"ی بانگ کرد. لاوێکی ڕەشتاڵەو باڵابەرز بە پانتۆڵێکی گوشاد و شرۆشرۆڵەوە لە پلیکانەکان وەسەرکەوت.

"وەلی کەنگێ دێن لە وەزعی زەوییەکانی ئاوەدانی بکۆڵنەوە؟"

"هەژدەی ئەم مانگە."

"شاهیدەکان باش حاڵی بوون؟"

"بەڵێ ئاغا"

## (١٧)

هەرچەند بە دەستی بەتاڵ گەڕابوونەوە، بەو حاڵەش وەسمانەزلە خۆشحاڵ بوو. لە بەستێنە وشکەکەدا لـێیان دەخوڕی و بەرەوپێش دەچوون. ئەسپی وەسمانەزلە لە پێشتر بوو، ئەسپی مەلافەرهاد لە دوای ئەوەوە دەڕۆیشت. روخساری موسوڵمانانەی مەلافەرهاد بەو ریشی تێك ئاڵقاوی رەشەوە کە لەبەر تیشکی هەتاو مەیلەوسەوز دیاربوو، زۆر دەرفکر دیاربوو. چاوە نیوەهەڵهێنراوەکانی لە بیرکردنەوەیەکی قووڵ دا نوقم ببون. بە بەستێنەکەدا خەریك بوون لە هەورازێك سەردەکەوتن.

چاو و گوێی ئەسپەکان لە مێشولەیەکی رەشی چووکەڵەدا ون ببوون.

لە قەراخی گۆلاوەکە لەسەر ئەو نێرگزانە کە هەتا بەرسنگی ئەسپەکان دەهاتن، بەسەر پنگەکان، دڕدووکەکان و گوڵە زەردەو خەلەنگەکانەوە ئاپۆرای مێشە جۆراوجۆرەکان، زەرگەتە، مێشە رەشکە، ژەنگەسوورەو مێشەنگوینە بە جۆرێك کە دەت گوت وەدوا شاژنەکەیان کەوتوون، هەڵدەفڕین و ئاوازەی بە شەپۆل و بەردەوامی باڵەکانیان وەك گرمەگرمێك لە گۆلاوی گەورەی ئاکچاسازەوە دەهاتە بەرگوێ.

لە بەستێنەکەدا ماری خۆڵە پۆتینە لە بەر سمی ئەسپەکان ڕادەخزین. بۆقی سەوزو فێنك ورد و درشت لە حاڵێك دا زگیان وەك هەمبانەدەمەی ئاسنگەران هەڵدەستاو دەپووکایەوە، لەسەر لق و پۆپەکان و لەبن تیشکی هەتاودا هەناسەبڕکەیان بوو.

لەبن سمی ئەسپەکان لەگەڵ هەر هەنگاوێك کە هەڵیان دێنایەوە، کۆمەڵێك کوللە وەك ئەسپەندەرێك کە لەسەر ئاگریان دانابێ، لە جێی خۆیان دەردەپەڕین. وەسمانەزلە گوتی:

"ئەی دادوبێداد، ئەی دادو بێداد. چاویان سەیر ترساوە. چاکیان سام ڕێنیشتوە."

لە دووری، لە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا دەنگی کەودەری دەهات. کەودەری دەیخوێند، تاوێك بێدەنگ دەبوو و نەختێك دواتر دووبارە ماوەیەکی درێژ بانگی هەڵدەدا.

لەسەر دەشتی ئاناوارزا، سێبەری هەورێکی سپی لە حاڵێك دا جارێك داوێنی بەسەر ئاوی ئاکچاسازدا بڵاو دەکردەوەو جارێك بەسەر قامیشە سەوزەکان دا، دەکەوتە سەر هەزاران مراویی کێوی کە لەسەر ئاوەکە نیشتبوون و سەر پەڵە گەنمەکان و لاولاوە کێوییەکان و دەشتە پڕ گوڵاڵەو نەسرینەکان، بەتاقی تەنیا وەك پەڵە دووکەڵێك لەسەر سوولەمیشەوە بۆسەر ئاوی جەیهان و لە ئاوی جەیهانەوە بۆ لێوارە شۆڕەکاتەکانی بووزکوویوو و لەوێوە بۆ "ئووك سووزلوو" دەهات و دەچوو.

پشووە بایەکی فێنکی دەهات کە یاریی بە تاڵ تاڵە مووی ریشی وەسمانەزلە دەکرد.

"ئەی خوایە ترسێکی سەیر سواریان بووە. دەك خوا توخم و تۆوتان ببڕێتەوە. برسی بوون، بۆ پارووەنانێك چاولەدەست بوون، بە بەدبەختی سەر دەنێنەوە، کەوتوونە غەریبایەتی. بەڵام حازر نین ئاوڕ وەدوای خۆیان بدەنەوە. دەك وەجاخت کوێربێتەوە ترسەنۆك. جارێك یەکێك چاوترسێن بکە، ئیدی کارت پێی نەبێ، هەر ئەوە بۆ حەوت پشتی بەسە. ئیدی هەتا دەمرێ، هەتا قیامەت دەتوانی هەڵیفریوێنی. کەسێك چاوی ترسا ئیدی ناکرێ بە بنیادەمی دابنێی. وانیە مەلافەرهاد؟"

مەلافەرهاد وەڵامی نەدایەوە. دیارنەبوو کە داخوا قسەکانی وی گوێ لێبووە یان نا.

"کەسێك چاوترسێن بووبێ بە بنیادەم دانانرێ کەهیچ، بەڵکوو دەبێتە شتێکی جیا لە بنیادەم. کەسێك چاوترسێن بووبێ، بمرێ باشترە، وانیە مەلافەرهاد؟"

مەلافەرهاد دیسان وەڵامی نەدایەوە. وەسمانەزلە گەڕایەوە سەری و دووبارە پرسی:

"بیروڕای تۆ چیە مەلافەرهاد. وادیارە ئەتۆ بنیادەمی ترسەنۆك بە ئادەمیزاد دادەنێی فەرهاد! کەسێك ترسابێ، کەسێك چاوترسێن بووبێ، بە فکری تۆ شتێکی جیا لە بنیادەم نیە؟"

وادیار بوو وەسمانەزلە کاتێك گوتبووی فەرهاد، هەتا تینی تێدابوو نەڕاندبووی. چونکە مەلافەرهاد سەریهەڵبڕی و بە دەنگێکی سەنگین و ئارام و باوەڕپێکراو لەسەرەخۆ گوتی:

"کەسێك ترس هەڵیگرتبێ دەبێتە ئافەریدەیەکی جیا لە بنیادەم."

وەسمانەزلە بەم وەڵامە خۆشحاڵ بوو:

"بەڵام هێندێ پیاویش پەیدا دەبن کە ترس هەڵیان ناگرێ. هەر کارێك بکەن ترس هەڵیان ناگرێ، وانیە مەلا؟"

"بۆچی، وایە."

"یەکێك هەیە کورتەباڵا. بەقەد منداڵێك دەبێ، منداڵێکی دوازدە ساڵە. دایکیيان کوشت چاوی نەترسا. پاشان خۆشەویستەکەی و ئازیزترین کەسیيان کوشت هەروا بزانە هیچ نەبووە. لە حکوومەتەوە بگرە هەتا دێهاتی و ئاغایەکان هێرشی بۆ دێنن. گوللەبارانی دەکەن، دیسان هەروا بزانە هیچ نەبووە، کێوەکان، شەوەکان، کون و کەلێنەکان، ئەشکەوتەکان و ئینسانەکان پەنای نادەن، بەڵام دیسان هەروا بزانە هیچ نەبووە. هەروا بزانە هیچ نەبووە مەلافەرهاد هەروا بزانە هیچ نەبووە. وەك مەمانان بێکیفایەت نیە. لەپێش زوڵم، بەریشەی هەزار ساڵە، دوو هەزار ساڵە، سێ هەزارساڵە، دە هەزارساڵە و سەد هەزارساڵەوە وەك کێو ڕادەوەستێ و وەدوای دەکەوێ و لە ریشەی دەردێنێ."

"رەگ و ریشەی زوڵم هەڵدەکەنێ. وانیە مام وەسمان؟"

"هەم رەگ و ریشەی هەڵدەکەنێ و هەم لەت وپەتی دەکا. پاشانیش دێتە ماڵی پیرە پیاوێکی هەژاری هەشتاساڵە. خۆی لەماڵی پیرە پیاوێکی هەشتا ساڵەی بێدەست و پێ داوێ. منداڵێك، بستە منداڵێك دێ لە ماڵی پیرەپیاوێك دەبێتە پەنابەر. ئەم بستە منداڵە دەزانێ ئەو پیرەپیاوە تەنانەت متمانە بە چاوەکانی خۆشی ناکا.

وەسمانەزلە لەگەڵ قسەکان بۆئەوەی بزانێ ئاڵ و گۆڕێك لە روخساری مەلافەرهاد دا پێك هاتوە یان نا، دەگەڕایەوەو تەماشای روخساری وی دەکرد. بەڵام لە روخساری مەلافەرهاد دا شتێك دەرنەدەکەوت. دەت گوت هیچ شتێك حاڵی نەبووە. تەنانەت چووکترین جموجۆڵێش لە گنجەکانی روخساری دا دیار نەبوو. وەسمانەزلە لە دڵی خۆی دا گوتی:"ماشەڵڵا ئیدی بە چ زمانێك پێی بڵێم کە حەمەدۆك هاتوەو ئێستا لە ماڵی ئێمەیە! مەلافەرهاد زۆر پیاوێکی زرینگە. ئەتۆ هەر بڵێ "ب" ئەو دەڵێ بەختیار. چۆنە کە قسەیەکی وا رێ و راست حاڵی نەبووە. وەختێك دەڵێم پیاوێکی بەغیرەتی ریوەڵە کە بە قەد منداڵێکی دوازدە ساڵە دەبێ، جگە لە حەمەدۆك دەتوانێ کێ بێ؟ ئەو کەسەی دایکیيان کوشت و خۆشەویستەکەیيان کوشت، ئەو دڵ پاکە کە کێوەکان و شەوەکان و ئینسانەکان پەنای نادەن، جگە لە حەمەدۆك کێی دیکەیە؟ چما خۆشحاڵیيەکەم، وەکیل باشی بریندارکردنەکەم، ئازایەتیيەکەم، ورەوەبەرهاتنەکەم هەمووی لە سایەی حەمەدۆکەوە نیە؟ چەند خەڵکێکی ناتێگەیشتوون! هیچ کەس لە هیچ حاڵی نابێ. ئەگەر ئەمانە هێندە گەوج نەبوونایە، ئەم دنیایەش هێندە گەوجانە نەدەبوو!"

"بزانە مەلافەرهاد! توو ئەو خوایە لەگەڵ ئەو هەموو قسەی بۆم کردووی، هێشتا هیچت لە قسەکانم دەست نەکەوتوە؟"

کە لە بەستێنەکە تێپەڕین مەلافەرهاد ئەسپەکەی بۆ لای ئەسپی وەسمانەزلە دەنگ دا. وەختێك گەیشتە پەنای و ڕکێف بە ڕکێف دەستیان بە ڕۆیشتن کرد مەلافەرهاد وەڵامی دایەوە:

"هێندێ شتم دەست کەوتوە مام وەسمان. هێندێ شت حاڵی بووم. هێندێ شتت لە بن زمان دا هەیە کە نایڵێی بەڵام دەتەوێ بەزمانی بێزمانی حاڵیمان بکەی. فکرم بۆ هێندێك شت چووە."

"زۆر شت هەیە. ئەو نوورەی کەوتە نێو تاریکایی... چاڵاوەکەی نێوەڕاستی بیابان... هومێد... و... وەختێك گەیشتیەوە ماڵێ دەیبینی و لە خۆشییان شێت دەبی. ئەسپەکەت دێنیە دەرێ و بە دوو چاوی خۆت دەبینی کە حەزرەتی خدر درووودی لێبێ لەماڵی ئێمەیە."

مەلافەرهاد لە قسەکانی وەسمانەزلە دەربارەی نوورو خدرو لەو نهێنییە کە دەیەویست بیدرکێنێ و نەیدەگوت، ئەوەندە وە هەژان کەوتبوو هەر هێندە بوو شێت نەدەبوو. بەڵام ئەو، باش شارەزای ئەخلاقی کەسانی وەك وەسمانەزلە بوو. دەیزانی ئەو جۆرە کەسانە هەر کە داوات لێکردن، زمانیان گرێ دەدەن. لەو جۆرە وەختانەدا نابێ سەر بخەیە سەر کەسانی وەك وەسمانەزلەو داوا بکەی پێت بڵێن. ئەوان درەنگ یان زوو، هەرچی لە دڵیان دایە دەیهێننە سەر زمانیان.

"لێخوڕە مەلافەرهاد، لێخوڕە!"

وەسمانەزلە خۆشی قەمچیی لە ئەسپەکەی دا. لەبەر هەژان پشووی سوار ببوو. ئەسپەکەی بە چوارناڵی دەڕۆیشت. مەلافەرهادیش هەروا لێی خوڕی و بەتەنیشت یەکەوە لینگیان دا.

"لە ماڵێ ئێمە کوڕێك دەبینی کە زۆری کوێرەوەری چاشتوە. لەماڵێ شەهێنێك دەبینی شیاوی چوکووراوا، لە ماڵێ شێرێك دەبینی دڵی وەك ئاوی زوڵاڵ. لەماڵێ جوامێرێك دەبینی کە بەڕاستی ئینسانە. لەماڵێ ئینسانێك دەبینی کە دۆستە، برایە. مەلا، ڕاست وەك هەڵۆی تیژباڵی شاخە بنەوشەییەکان... ئینسانێکی نەرم و نیان وەك لۆکە. بەڵام تەنانەت "عصمت پاشا" فەرماندەی لەشکر، یاووز عصمت پاشا لە ترسانی زراوی دەتۆقێ. دەزانی یاووز عصمت پیاوێکی بەغیرەتە، لە هیچ کەس ناترسێ. کەسێکە کە مستەفا کەماڵ پاشا تەگبیرو ڕای لەگەڵ دەکا. عصمت پاشا مێشکی سوپایەو مستەفاکەمال پاشا شمشێری. ئێستا تێگەیشتی کێمان لە ماڵێیە؟"

"نا مام وەسمان تێنەگەیشتم. بەڵام زۆر حەز دەکەم بزانم کێیە."

"چت گوت. ئەتۆ چت گوت؟"

"زۆرم پێ خۆشە بزانم کێیە. لە تاوان وەختە شێت دەبم."

"ئاوا. لە تاوان وەختە شێت دەبی!"

مەلافەرهاد هاواری کرد:

"بەڵێ لە تاوان مام وەسمان لە تاوان."

"ئێستا کەوایە، ئەسپەکەت لێخورە، قەمچی بوەشێنە بچین شەهێنەکەم ببینە."

مەلافەرهاد قەمچیی لە ئەسپەکەی راکێشا، هەتا ئاوەدانی بە جووتە سوارە زۆر بە پرتاو لینگیان دا.

لە حەوشەی، وەسمانەزلە لە پێش دا دابەزی. هێشتا لاقی نەگەیشتبووە سەر زەوی ئەژنۆی دوولا هاتنەوەو کەوتە سەر زەوی. سەری دەگێژەوە چوو. بەڵام زوو هاتەوە سەرخۆی و هەستایەوە سەرپێ.

بانگی کرد: "دایەقەمەر، دایەقەمەر هاتینەوە." بەڵام کەس جوابی نەدایەوە.

"دایەقەمەر، دایەقەمەر وەجاخت کوێر نەبێتەوە کچێ ئەوە لەکوێی؟ لەگەڵ مەلافەرهاد هاتینەوە."

لەو کاتەدا مەلافەرهادیش دابەزیبوو و هەوساری ئەسپەکەی لە تانێ خستبوو.

وەسمانەزلە گەیشتە بەردەرکی ژوورەکە. دەرگا دانەخرابوو، چووە ژوور:

"دایە قەمەر، دایەقەمەر لە کوێی؟"

بەڵام کەس جوابی نەدایەوە. دەرگای جێنوێنەکەی کردەوە، بە دەست نوێن و بانەکەی حەمەدی پشکنی، کەسی تێدا نەبوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:

"حەتمەن چووەتە تەویلە." غاری دایە تەویلەو بەسپایی گوتی:

"حەمەد، شەهێنەکەم جواب بدەوە، غەریبە نیە، مەلافەرهادە."

گوێی هەڵخست. بێدەنگیی تەواو بوو.

وەسمانەزلە لە حاڵێك دا وەك فرفرە بە دەوری خۆی دا دەسوورا: بێپسانەوە دەیگوت چ بووە، چ قەوماوە؟ لەو بەینەدا مەلافەرهادیش هاتبووە تەویلەو هەوڵی دەدا لە رەفتاری وەسمانەزلە شتێك هەڵکرێنێ. چوو باسکی وەسمانەزلەی گرت کە هەروا بەدەوری خۆی دا هەڵدەسووڕاو لەگەڵ خۆی لە تەویلەرا هێنایەوە ژووری هۆدەکە.

هەر لێی دەپرسی "ئەتۆ چت بووە؟" بەڵام وەسمانەزلە دەیـنەڕاندو وەڵامێکی نەدەدایەوە.

وەسمانەزلە شەڵاڵی ئارەق ببوو. مەلافەرهاد ئەوی لەسەر دۆشەکێك کە لە سووچێکی هۆدەکە بوو داناو چوو پیاڵەیەك ئاوی هێناو هەوڵی دا ئاوی دەرخوارد بدا. دەست و چەنەگەی وەسمانەزلە دەلەرزین و ئاوەکەی لـێدەڕژا.

لەو جەرگەیەدابوو کە دایەقەمەر هاتەوە. کز بوو. خەمناك بوو. خەم و خەفەت لە روخساری دا دیار بوو. وەسمانەزلە بە دەم ناڵەیەکەوە گوتی:

"زوو بڵێ چیی لـێهاتوە؟ چیی بەسەر هاتوە؟"

دایەقەمەر بە دڵ شکاوی هەروەك بیهەوێ بگری، وەڵامی دایەوە:

"هیچی نەبووە."

وەسمانەزلە کە هاتبووەوە سەر خۆی پرسی:

"لەکوێیە، ئێستا لە کوێیە؟"

دایەقەمەر تەماشایەکی مەلافەرهادو مێردەکەی خۆی کردو بێدەنگ بوو.

وەسمانەزلە گوتی:

"قسەبکە. مەلافەرهاد داستانی ئەم ون بووە دەزانێ، بەڵام نازانێ کێیەو چ کارەیە."

دایەقەمەر گوتی:

"وەڕەزیی دێیەکەی خۆیانی کردبوو. رۆیشتەوە بۆ وێ. زۆری لەبەر پاڕامەوە، گوتم راوەستە هەتا مام وەسمانت دێتەوە جا بڕۆ، نەمایەوە گوتی: زۆرم دڵ بۆ دێیەکەمان تەنگ بووە. قسەیەکی دیکەی نەکرد" نیوەشەوێ خۆی پێچایەوە، سەری خۆی هەڵگرت و رۆیشت. وەختێك خەریك بوو دەڕۆیشت گوتی زۆر سڵاوی بگەیەنە، دەستی ماچ دەکەم. گوتی دەمەوێ جارێکی دیکە دێیەکەمان بە چاوی خۆم ببینمەوە. گوتی رەنگە دوو رۆژ زیاترم پێ نەچێ، دێمەوە."

وەسمانەزلە ناڵاندی:

"ئەو تازە نایەتەوە، ئەو رۆیشت، ئەو دەست و باڵمی شکاندو رۆیشت..."

ئەمجار دەستی مەلافەرهادی گرت و گوتی:

"زۆرم حەز دەکرد شەهێنی منت دیتبایە، بەڵام وادیارە قیسمەت نەبوو."

بێدەنگ بوو، قسەیەکی دیکەی نەکردو تاوێك دواتر خەوی لـێکەوت.

## (١٨)

هەمیشە چارشێوێکی سەوزی بەسەرەوە بوو. بەژن و باڵا بەرزو گەنم ڕەنگ و کەزی رەش بوو. دوو شاکەزییەی بادراوی ئەستووری بەردابوونەوە کە لە پشتێنێی بەردەبوونەوە. دەم و چاوی کەمێك راکشاو و لە دەوری چاوە درشت و خومارەکانی سێبەرێکی خەفەت دەبینرا... برژانگی رەش و درێژو هەڵگەڕاوەوە بوون. لێوەکانی کەمێك گۆشتن بوون. لەسەر رورمەتی، کەمێك خوارتر لە شلکەی گوێی سێ وردە خاڵی دوور لە یەك هەبوون کە حاڵەتێکی جوان وئەفسووناوییان دەدا بە روخساری. سەیران ئافەریدەیەك بوو وەك لە ئاسمانان ڕا هاتبێ. تەنیا بوونەوەرێك بوو کە لەجیهانێکی دیکە، لە جیهانێکی پیرۆزەوە هاتبووە سەر ئەم جیهانە. ئەوەندە جوان بوو کە چ ژن چ پیاو نەیدەتوانی تێر تەماشای روخساری و بە تایبەتی چاوەکانی بکا.

چاوەکانی حاڵەتێکی سەیرو جادوویییان هەبوو کە ئینسانیان لەگەڵ خۆیان دەبردە جیهانێکی دیکەو دەیان کێشایە بەر خەفەت و دڵپەرۆشی و ئارەزوویەکی لە توانا بەدەر. ئەو وەك گۆرانیییەکی زۆر کۆن دەچوو کە لە شەو و لە پشتی چیاکانەوە بێتە بەر گوێ. هێندێك جار توندو زبرو جاروباریش نەرم و هێدی و ئەفسووناوی بوو.

زۆر کەم دوێ بوو و لێوەکانی لەگەڵ پێکەنین بێگانە، ئاهەنگی دەنگی وەك خەفەت و تازیەیەکی هەزار ساڵە دەچوو، بەڵام ئەگەر بە دەگمەن لەحزەیەك پێکەنین دەهاتە سەر لێوانی، فەزای دەوروبەری رووناکتر دەبوو، دنیا رەنگی هومێدی بەخۆیەوە دەگرت و روون دەبووەوە. کاتێك پێدەکەنی، لە قووڵایی دڵەوە پێدەکەنی و ئیدی جوانیییەکەی دووچەندانە دەبوو.

تەمەنی لە نێوان بیست و پێنج تا سی ساڵ دیار بوو. کەس نەیدەزانی چەند ساڵە لەم دێیە نیشتەجێیە. داخوا هەر لێرە لە دایك بووە، یان بە گەورەیی هاتوەتە ئێرەو لێرە

ماوەتەوە. لە سەرانسەری ئاناوارزادا کەس نەبوو بەهۆی ئەو پێشهاتە گەورەیەو ئەو بەڵاٸیانەی بەسەری هاتوون، ڕێزی لـێنەگرێ. لەم دێیەدا هەموو کەس ئەوی وەك کچی خۆی تەماشا دەکردو ئەویش هەر هەستێکی وای لە دڵ دا بوو. خەڵکی ئاوایی پێیان وابوو سەیران قیز نابێ هەرگیز لە دێیەکەیان بڕوا، چونکە لایان وابوو ئەگەر ئەو بڕوا، گوندەکە ناتوانێ درێژە بە ژیانی خۆی بدا. پاش ئەو هەموو بەڵایە کە بەسەری هاتبوون" براکانی، ئامۆزاکانی و خزمەکانی دیکەی لە چیاکانی "پازارجیك"ڕا بەدوای دا هاتن. بەڵام نەیان توانی ئەوی لە ئاناوارزا و لە گوندی وایوای جیا بکەنەوە. وەختێك لەدوای هاتن، قسەیەکی نەکردو بێدەنگ بوو، و پاش ئەوەش، چەند ساڵ ئەو بێدەنگییەی نەشکاند. وەختێك سەیران قیز حازر نەبوو بچێتەوە شوێنی لە دایك بوونی، براو کەس و کارەکانی لەبەر خاتری دایکەکەی کە زۆری بۆ بە پەرۆش بوو، بە تێکڕاو وەك عێلێکی گەورە لە چیای پازارجیك هاتنە خوارێ و لە خاکی پڕ پیت و بەرەکەتی وایوای دا نیشتەجێ بوون.

عەشیرەتێکی دەوڵەمەند بوون. خەڵکێکی زۆر ئازا، بەهێز، ساغ، سوارچاك و تفەنگچی و جوامێرو بە سۆز بوون. ئەوان تورکمەنەکانی چوکووراوایان هەر زوو بەردڵ کەوت و تورکمەنەکانی چوکووراواش، ئەو خەڵکە بەسۆز و ئازایە کە خاوەنی جوانترین داب و شوێن و پێوەندیی ئینسانی بوون، ئەو خەڵکە ئازایەی کێوپارەیان خۆش ویست. لە ماوەی سەدساڵ دا تورکمەنەکان و کێوپارەیییەکان پێکەوە گرێدران، بوونە یەك، وەك برایان لـێهات، ژن و ژن خوازییان لە نێودا زۆر بوو و بوونە برا. هەرچەند هێندێ ئاکارو خووی جیا لە یەکیان هەبوو، بەڵام لەبەر سۆزی هاوبەش، پیاوەتی و جوامێریی هاوبەش و داب و شوێن و بیروباوەڕی جوانی هاوبەش، پێکەوە بوون بە یەك.

سەیران قیز لەگەڵ براو کەس و کارەکەی و تەنانەت لەگەڵ دایکیشی قسەی نەدەکردو ئەوانی نەدەبەخشی. دایکی هەمیشە دەیگوت:

"سەیران قیز تەنیا یەك جار دەم بکاتەوەو یەك جار پێم بڵێ"دایە" حازرم لە جیاتان خوێنی سوورم بڕژێتە سەر زەوی."

بەڵام سەیران قیز هەر گوێشی لـێنەبوو، لێوی تەڕ نەدەکرد. دایە قەمەر یەکەم کەس بوو کە سەیران قیز قسەی لەگەڵ کرد. نێوانی دایەقەمەرو سەیران قیز تەنانەت لە نێوانی دایك و کچانیش خۆشتر بوو.

سەیران قیز خەبەری نەخۆش کەوتنی وەسمانەزلەی لە برایمی دراوسێی زانی.

برایم گوتبووی:

"وەسمانەزلە دەچێتەوە ماڵێ، وەختێك دەچێتەوە ، گۆیا لە ماڵێ شتێك هەبووە کە ئەو لێیدەگەڕێ و نایبینێتەوە. لەو وەختەوە کە ئەو شتە نابینێتەوە لە جێیدا دەکەوێ و بە تەواوی نەخۆش دەبێ. مەلافەرهادیش بە تەواوی گێژ بووە. گۆیا وەسمانەزلە جنۆکان دەستیان لێوەشاندوە... پاشان زۆر خەراپیش لە یۆبازنۆغلی و ئەو دێهاتییانە کە لەوایوای ڕۆیشتوون تووڕەیە... ئەوە ئەمن گوتم و ئەتۆش گوێت لێبوو..."

سەیران قیز بێئەوەی چاوەڕوانی قسەکانی دیکەی برایم بێ، غاریدایە ماڵی وەسمانەزلە. دایە قەمەر لە ژوور سەری وەسمانەزلە دانیشتبوو، لە حاڵێك دا دەستەکانی لەنێو دەستی خۆی گرتبوون، شیوەن و گریانی بوو، هەرکە سەیران قیزی دی، گوتی:

" کچەکەم! مامە وەسمانت خەریکە دەمرێ، ئەگەر نەش مرێ ئەم دەردە هەتا ئاخری ژیانی لە کۆڵی نابێتەوە. لە ڕەگی غیرەتی دراوە. لە ڕەگی غیرەتی مامە وەسمانت دراوە کچم. ئاخر ڕەوا بوو بەم ئاخری عومرییە بەڵای وای بەسەر بێ؟"

لەو جەرگەیەدا وەسمانەزلە چاوی هەڵێنان. ریشی لەرزی:

"سەیران قیز هاتوە؟ کچەکەم هاتوە؟"

دایە قەمەر گوتی:

" ئەدی، سەیران قیز هاتوە، کچەکەت هاتوە. ئەگەر ئەتۆ لە جێیدا نەکەوتبایەی چما سەیران قیز دەهات بەسەرمان بکاتەوە؟"

سەیران قیز لە پەنای دایە قەمەر هەڵ ترووشکا. دەستی وەسمانەزلەی کە لەنێو دەستی دایەقەمەردا بوو، گرت و لە ناخی دڵەوە بە دەنگێکی گەرم و میهرەبانەوە گوتی:

"بەڵا دوور بێ مام وەسمان، بەڵا دوور بێ."

وەسمانەزلە کەمێك ڕاست بووەوەو لە حاڵێك دا برۆ سپی و بە پشتەکانیی هەڵدەکێشان ماوەیەکی درێژ تەماشای چاوی سەیران قیزی کرد:

"ئا کیژە جوانەکەم. ئەم بەڵایە دوورکەوتنەوەی نیە، هیچ شتێك نەیتوانی من بکوژێ، نە شەڕ، نە بیابانی یەمەن، نە نۆبەتێ هیچیان نەیان توانی بم کوژن. بەڵام ئەم دەردە دەم کوژێ."

بەسپایی دیسان کەوتەوە سەر پشت و لە سەرەخۆ دەستی کرد بە گریان:

"ئەمن شەهێنێکم، شەهێنێکی پیر کچەکەم، باڵشکاو و پەڕوەریو، شەهێنێکم کە هەموو باڵ و پەڕی وەریوەو ناتوانێ بفڕێ. بەتایبەتی شەهێنێك کە جووچکەکەشییان لە هێلانەکەی

هەڵگرتوە، بۆخۆی وای کرد کە ئەوی لـێبدزن. شەهێنێك کە هومێدی خۆی و نووری دڵی لـێون بووە. سەیران، شەهێنەکەم دەکوژن، لەتکە جەرگەکەم، لـێوەشاوەترین بوونەوەری دنیا، سۆمای هەردوو چاوەکانم دەکوژن کچێ خۆم."

دەستی گەرم و لەرزۆکی وەسمانەزلە لەنێو دەستەکانی سەیران قیزدا دەلەرزی و لافاوی فرمێسك بە گۆنای دا دەهاتەخوار، سەیران قیزیش لەگەڵی دەگریا. وەسمانەزلە وەك وڕێنە بکا، دەیگوت:

"بچن شەهێنەکەم ببیننەوە. بڕۆن هیوایەکەم، نووری چاوەکانم، لـێوەشاوەترین بوونەوەری جیهان بدۆزنەوە. مەیەڵن جەندرمەکان بیکوژن. مەیەڵن ئەو بێدینانە، ئەو گورگانە شەهێنەکەم لەت و پەت بکەن. مەلافەرهاد ئەتۆ مامۆستای مامۆستایانی، ئەتۆ ئینسان ترین ئینسانی، ئەتۆ لە هەموو ئازایان ئازاتری... ئەگەر ئەمن مردم ئەمانەتت شەهێنەکەم بێ، ئەوە بە تۆم سپارد. مەیەڵە ئەو گورگە دڕندانە شەهێنەکەم لەبەریەك هەڵدڕن. قەمەر ئەمن شتێکم پێگوت، لە من زویر بووە؟"

قەمەر نەڕاندی:

"وەسمان منداڵ، وەسمان منداڵ، هەزار جارم پێگوتی زویر نەبووە."

"ئەگەر زویر نەبووە، ئەدی بۆ لەسەر من ڕانەوەستا؟ ترسا، ترسا بە گرتی بدەم، متمانەی پێم نەبوو؟ ها؟"

دایە قەمەر گوتی:

"هیچ شتی وانیە. کوڕەکە زۆریشی متمانە پێمان هەبوو. متمانەی پێمان بوو کە هەتا ئێستا لە لامان مایەوە. ئەتۆ نەدەبوو بە هەمووان بلێی."

وەسمانەزلە بەسپایی و بە ڕاوێژێکی خەتابارانەوە گوتی:

"ئەمن بە کێم گوتوە قەمەر، بەکێ؟"

"ئێستا هەر بە کێت گوتوە؟ بە هەموو ئاوەدانیت گوت."

"بە کێم گوتوە، کەنگێ بە زمانم دا هاتوە؟"

دایە قەمەر زۆری ڕق هەستاو هاواری کرد:

"بە زمانت دا نەهات. بەڵام چما ئەتۆ نەبووی کە باشترین جلکەکانت لەبەر کرد، قەلنەت بە لالێوتەوە نا، دەمانچەت لە کەلەکەت بەست. زنجیر سەعاتە زێوەکەت بە بەرۆکتەوە هەڵاوەسی، چەکمەکانت بۆیاخ کردن و وەك کووزان ئۆغلی سێ شەوو ڕۆژان لەنێو ئاوەدانی دا

پیاسەت کرد؟ پاشان دەتەوێ کابرای دێهاتی فکر نەکاتەوەو لە خۆی نەپرسێ کە وەسمانەزلە بۆ وا دەکا؟ چ بووە؟ دەتەوێ مندالّەکان لەو ماخولیابازارییەی تۆ نەترسن؟"

وەسمانەزلە بە پاڕانەوە گوتی:

"بێدەنگ بە قەمەر. بە قوربانت بم بێدەنگ بە. مەم کوڕە. بە زیندوویی مەم خۆ. کچم سەیران پێیبلێ لانی کەم لەم سەرەمەرگەدا لە کۆڵم بێتەوە."

دایە قەمەر نەڕاندی:

"بێدەنگ نابم وەسمان مندالّ، چما هەر دوێنێ ئەتۆ نەبووی دەتەویست ئەو کوڕە کە پەنای بۆ مالّی تۆ هێناوە، بە مەلافەرهاد نیشان بدەی؟ هاتبووە مالّی تۆ، پەنای بۆ دێی تۆ هێنابوو."

"بێدەنگ بە قەمەر. دەبەرت مرم! کچێ خۆم سەیران ئەم سەلّیتەیە منی کوشت. بە زیندوویی خواردمی. بەلّکوو بێدەنگی بکەی."

دایە قەمەر بە تووڕەیی هەستاو گوتی:

"فەرموو، ئەوە بێدەنگ بووم."

وەسمانەزلە لە حالّێك دا لە تەنیشتێکەوە دەهاتە سەر تەنیشتەکەی دیکەی گوتی:

"مەلافەرهاد! برالە کارێك بکە. بڕۆ شەهێنەکەم ببینەوە."

مەلافەرهاد کە لە ڕقان ڕیشە ڕەش و تێك ئالّقاوە مەیلەوسەوزەکەی دەلەرزی، بە لێبڕاوییەوە گوتی:

"ناڕەحەت مەبە مام وەسمان، ئەو هیچی نابێ. ئەو زۆر بەلاّی لەسەر خۆی لاداون. خۆی ناخاتە نێو مەترسییەوە. ئەتۆ هیچ خەفەت مەخۆ. وەختێك گوتوویە دێمەوە، دێتەوە. خۆی تووشی ژانەسەر ناکا. لێرە وەڕەز بووە یان کارێکی بۆ پەیدا بووە. دەنا هەتا مالّئاوایی لە تۆ نەخواستبا، نەدەڕۆیشت، ئەو دێتەوە."

وەسمانەزلە گوتی:"ئەتۆ ڕاست دەکەی"و لە جێی خۆی هەستا:

"مەلافەرهاد، پیاوی نازەنینی خوا، روخسار نوورانییەکەی خۆم. کەوابوو بەلاّیەکی بەسەر نایە؟"

مەلافەرهاد بە دلّنیاییەوە گوتی:

"نا هیچ بەلاّیەکی بەسەر نایە."

"دلّی لە من نەیەشابێ؟"

مەلافەرهاد هەر بەو راوێژەوە گوتی:

"دڵی نەیەشاوە."

"دووبارە دێتەوە؟"

"دێتەوە."

"بریا قەڵافەتیت دەدی. باوەڕت نەدەکرد خۆی بێ. روخساری بە هیچ جۆر لەگەڵ ناو و ناوبانگی یەك ناگرێتەوە. ئاخ خۆزگە قەڵافەتیت دەدی."

مەلافەرهاد گوتی:

"دەیبینم. درەنگ یان زوو دەیبینم."

لە دەنگی دا زرینگانەوەی باوەڕ و متمانەیەکی گەورە دیار بوو.

ئەم دەنگە دڵنیاکەرو بڕوابزوێنە وردە وردە وەسمانەزلەی هێنایەوە سەرخۆ:

"مەلا، خۆزگە چاوەکانیت دەدین. دەڵێی دوو پارچە پۆڵان. ناتوانی تەماشایان بکەی. چاوەکانی لەگەڵ ناو و ناوبانگەکەی رێك دەکەون."

"وایە."

کوڕەکانی وەسمانەزلە لەگەڵ بووکەکانی هاتن. سەیفەلی، دێهاتییەکانی دیکە، سەفچەکاهیا، براو خزمەکانی سەیران قیز، دایکی، زەینەڵ و سیلوێرگلین هەموویان هاتنە دیار وەسمانەزلە.

بە گشتی تەواوی ئەو کەسانەی بیستبوویان حەمەدۆك ماوەیەك لە ماڵی وەسمانەزلە بووەو دوێنێ کە دێتەوە ماڵێ تەماشا دەکا حەمەد لیی داوە رۆیوە، نەخۆش دەبێ و لە جێی دا دەکەوێ، هاتبوونە سەردانی وەسمانەزلە.

لە حەوشەی ماڵی وەسمانەزلە دا هەنگامە بوو. سەفچەکاهیا لە حاڵێك دا دەستی لە پاش خۆی گرتبوون و پێدەکەنی و بەخۆشحاڵی راوێچکەی دەکردن، بە شادمانییەوە دەیگوت:

"وادیارە کوڕەکەمان نەخەرفابوو! وادیارە هێندێ شتی لە بنی زمانیدا بوو، و بە کەسی نەدەگوت. خوایە شوکور."

دێهاتییەکان بە بیستنی خەبەری هاتنەوەی حەمەدۆك زۆر خۆشحاڵ ببوون. بەڵام دوایە سەریان سوڕمابوو، ئەمجار کەوتبوونە حاڵەتی گێژی و سەرلێشێوان. ئێستاش لە نێوان سەرسوڕمان و خۆشحاڵی دا سەرگەردان بوون. زەینەڵ بە بیستنی داستانەکە لەحزەیەك لە ژوور سەری مام وەسمان راوەستا، دەستی گرت و پاشان بێئەوەی کەس پێ بزانێ بۆی دەرچوو.

مەلافەرهاد لێی وریا بوو، لەبەر دەرکی ماڵی "کەرەمەکوردە" خۆی پێگەیاندەوە. دەستی بە قورسی خستە سەرشانی و بە هێدیترین و هەر لەو کاتەدا توندترین راوێژ پێی گوت:

"داستانی هاتنەوەی حەمەد نە بە عەلیسەفابەگ و نە بە هیچ کەسی دیکە ناڵێی. تێگەیشتی؟"

زەینەڵ راوەستا. لێوەکانی لەرزین، دەت گوت ئێستا نا ئێستا خەریکە بگری. تاوێك بیری کردەوەو ئەمجار گوتی:

"گوێ بگرە مەلا!"

پاشان لە حاڵێك دا ملە درێژەکەی درێژتر ببوو، لەسەری رۆیشت:

"ئەمن بە کەس ناڵێم، بەڵام هەموو خەڵکی دێی دەزانن، تەنانەت گوندەکانی دەوروبەریش. لە هەموو جێیەك بڵاو بووەتەوە. ئەگەر عەلیسەفابەگ و ئاغاکانی دیکە لەخەڵکی دیکەی ببیسن، ئەمن هەقم نیە. بەرپرسایەتییەکەی قبووڵ ناکەم. ئێستا لە پێش چاوی خۆت لێرەرا دەگەڕێمەوە."

ئەودەم بە دوای مەلافەرهاد دا وەڕێ کەوت و لەگەڵی هاتەوە ماڵی وەسمانەزلە.

هەر ئەو رۆژە نوقڵی مەجلیسی هەموو جووتیارەکان" بەختەوەرو دڵبەخەم، رق هەستاو و خۆشحاڵ، و بە کورتی بە هەستی جۆراوجۆری دەروونییەوە، باسی حەمەدۆك بوو. چەند کیژو کوڕی لاو ئەو گۆرانییانەیان بە نارەنار دەگوت کە لەبارەی حەمەدۆکەوە ساز کرابوون.

بەرە بەرە خەڵك رقیان لە وەسمانەزلە هەڵدەستا:"حەمەدۆك دێتە ئاوەدانی و دەچێتە ماڵێی. کەچی ئەو بە کەس ناڵێ، پیرەپیاوی ناجسن! قەڵنەکەی بە لالێویەوە دەنێ و بە باقە دووکەڵێ بە بادەکاو وەك کووزان ئۆغڵی لە نێو ئاوایی دا پیاسەی دەکا، بەڵام لەبەر حەسوودییان خەبەری هاتنی حەمەدۆك بە کەس ناڵێ کە بچن و تێر تەماشای کەن."

هەموو هەستە دەروونییەکان لە رق و خۆشەویستییەوە بگرە هەتا دڵئێشان و ترس روویان لە وەسمانەزلە کردبوو.

لانیکەم بیست کەس ئاگایان لە هاتنی حەمەدۆك بۆ نێو ئاوەدانی ببوو، تەنانەت لە لێوارەکانی ئاکچاسازەوە دیبوویان کە شەوێ لەنێو دێ دا گەڕابوو. دیبوویان کە سواری ئەسپێکی سپی بووەو بۆ لای بەردەلانەکانی ئاناوارزا لینگ دەدا.

ئەو کەسەی گوللەی لە وەکیل باشی دا، حەمەدۆك بوو.

لەنێو دێ دا هەرکەس هەرچی بە بیری دا هاتبایە لەبارەی حەمەدۆکەوە دەیگوت. تەنانەت لەبارەی ئەوەوە زۆر داستانیشیان دروست کردبوون.

ئەو شەوە تەنیا دایەقەمەر و سەیران قیز لە ژوور سەری وەسمانەزلە مانەوە. وەسمانەزلە بۆخۆی نەیویستبوو جگە لەو دوو کەسە هیچ کەسی دیکەی لەلا بمێنێتەوە. کوڕەکانی و بووکەکانی و هەموو کەسی ناردبووەوە. مەلافەرهادیش بۆخۆی ڕۆیشت.

وەسمانەزلە باسی حەمەدۆکی بۆ سەیران قیز دەکرد" لەبارەی ئازایەتی‌یەکەی، چاوەکانی، مووەکانی کە چۆن بوون، شێوەی دەنگ و قسەکردنی، ئەوینی دەرهەق بە ئینسانەکان و دڵی میهرەبان و سۆزو چاکەکانیەوە قسەی دەکردو دەکەوتە هەژان.

"پێت وانەبێ لەبەر خاتری گیانی لێی دەترسم. ئەو بە تەنێ خەنیمی لەشکرێکە. ئەو شەهێنێکە بۆخۆی. ئەوەندە زرینگ و چالاکە لە وەختی شەڕ دا ناتوانی بیبینی. ئێستا لێرەیەو هێندەی چاو لەسەر چاو دانێی لەوسەری دنیا، ئەگینا چۆن دەیتوانی لە دەستی ئەو هەموو دوژمنە گیان دەربەرێ. هەموو، باڵندەو پیڕۆ، بەردو خاك، چەقڵ و دار، مێروو و مارو هەموو ئافەریدەکان لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە دوژمنن. زۆریش دوژمنن..."

لە نەکاو بە نیگەرانی و دوودڵی‌یەوە گوتی:

"بەڕاست ئەگەر کوڕەکەم لە نێو "ئاکارجا" دا گەمارۆ بدەن، فەوجێك جەندرمە، هەزار کەس دێهاتیی نزمی گۆپاڵ بەدەست و ئەو سەگی ڕستەکراوی ئاغاکان" برایمەڕەش بە خۆی و بە پازدە بەرەڵڵایەکەیەوە... دابارنە سەری، بستە منداڵێك ئەویش بە تاقی تەنیا چیی لە دەست دێ، لەگەڵ ئەو هەموو سەگە کە لە چواردەوریەوە پێی دەوەڕن چ دەتوانێ بکا؟"

پاشان وەرگەڕایەوەو بۆ جاری هەزارویەکەم لە دایەقەمەری پرسی:

"بەڕاستی پێش ڕۆیشتن باشی نان خوارد، توێشووی سێ ڕۆژانت بۆ تێنا؟"

دایەقەمەریش زۆر بەحەوسەلەو لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە:

"تێرو پڕی خوارد. پڕی بوخچەیەکی زەلامیشم کاکڵەگوێزو پەنیری چەورو هێلکەکوڵیو و کووکی بۆ ساز کردو لە پشتیم بەست. سێ ڕۆژ هیچ، بۆ پێنج ڕۆژیشی بەسە..."

وەسمانەزلە ناهومێد بوو و تووشی دڵەخورپە ببوو.

بەرە بەری بەیانی بێحاڵ بوو و دوایە خەوێکی خۆشی لێ‌کەوت.

خەبەری چوونی حەمەدۆك بۆ ماڵی وەسمانەزلە دێ بە دێ لە وایوای بۆ "کەسیك کای"، لەوێ بۆ هەمیتە، لە هەمیتە بۆ بوزکوییو، "ئاك ماشات"، نارلی‌قشلا، "ئەدەك سووزلوو"،

"چیانلی"، و لە چیانلی بۆ حاجیلار لە سەرانسەری ئاناوارزا گەڕا. هەمووان پێیان زانی کە وەسمانەزلە شەش مانگ حەمەدۆکی لەماڵێ خۆی دا پەنا داوەو دوێنێ حەمەد لێی زویر بووەو چووەتەوە کێو و بەندەنان.

کەس ناوی حەمەدۆکی نەدێنا. وەختێك باسیان دەکرد، هەر دەیان گوت "شەهێن" یان "ئەو".

هەموو دەشتی ئاناوارزا، جووتیارەکانی چوکووراواو جووتیارەکانی دێهاتی کووزان لەگەڵ ناوی حەمەدۆك و ئەفسانەکانی و باسی ئازایەتیەکانی ناشنابوون و فێنکایی‌یان لە دڵ گەڕا. بەڵام نە یەك ئاغاو نە یەك پیاوی دەوڵەت پێیان نەزانی. جووتیارەکانی ئەو دەشتە ناوی حەمەدۆکیان وەك نهێنی‌یەکی پیرۆز لە سنگی خۆیان دا شاردبووەوە کە ئەگەر وەسمانەزلە ئەوەی دەزانی لە خۆشی‌یان شێت دەبوو.

## (١٩)

سەیران قیز خەڵکی "خەرمەن جا" بوو، یەکێکە لە دێیەکانی "پازارجیك" بە بەردەڵانێکی سوورەوە. خەرمەن جا لە بەردەڵانێك دروست کرابوو کە بە بەردئەستێ نووك تیژەکانی وەك چەقۆی بە رەنگی سپی و سەوزو شین و سوورەوەو وەك لێڕەوارێکی سەیر دەچوو. لەم دێیەدا ئەسپی تیژڕەو پەروەردە دەکران. ئاوەکەی پاش ئەوەی لە قەڵشتی تەختە بەردئەستێیەکان دەردەپەڕی دەبوو بە پارچە بلوورێك کە بە هەزارو یەك رەنگ دەدرەوشایەوەو بە دەشتێ دا دەڕۆیشتە خوار.

ساڵێ چوار جار قازو قولینگان زۆر ئەوی بەسەر ئاوایی دا رادەبووردن و لە کەلێنی بەردئەستێیەکان دا جۆرە گوڵێکی لاسك درێژ بە بۆنێکی قورس و رەنگێکی گەشەوە دەپشکووت. بەرهەمی ئەو گەنمەش کە لە بەتالآیی نێوان شاخەکان دا دەچێندرا زۆر درشت و بەرێژەو بوو. گاو مانگایەکان و ئەسپ و ماینەکان و بە گشتی هەرچی لە خەرمەن جا گەورە بووایە، راکشاو و بەهێزو جوان بوو. بەتایبەتی خەڵکەکەی لە جوانی دا بەناوبانگ بوون.

عێلاتی ماراش، دانیشتووانی خوارەوەی دەشت، خەڵکی خەرمەن جایان هەر بە جوانییەکەیان دەناسییەوە. تەنانەت باڵندەو جرِوجانەوەرەکانی خەرمەن جاش ئەندامێکی راکشاوو درێژیان هەبوو و رەنگاوڕەنگ بوون. دەنگیان دڵگرترو رەنگیان گەشتر لە هی جێی دیکە بوو.

خەڵکی ئەم دێیە وادیار بوو زۆر دەوڵەمەند نین، بەڵام خەڵکێکی حیسابگەرو دەست پێوەگر بوون و بۆیە هەژاری لەوێ زۆر بەرچاو نەبوو. بۆخۆیان دەیان تەنی، رەنگیان دەکرد، دەیان بڕی و دەیان دووری. بۆخۆیان دەیان چاندو بۆخۆیان رەنێویان دێناو بەرهەمیان هەڵ

دەگرت. هیچ کەس جووتیاری خەرمەن جای بە سەروسیمایەکی چڵکن و ئاڵۆزو جلکی شڕو شۆڵەوە نەدیبوو. خەڵکێك بوون پابەندی شەرەف و ناموس و زبرو توند. لە خەرمەن جا خوێنرێژی زۆر دەکرا. خوێنرێژی لە خەرمەن جا باو بوو، و هەربۆیەش بنیادەمی ترسەنۆکی کەم لیَ‌دەبینرا. رەنگە لەبەر زبرایی هەواو ئاوو خاکەکەی بوو کە هەموو شتێکی ئەو دێیە تورت و ئاسان شکێن بوو. هیچ شتێکی نەرم و قابیلی نوشتانەوەی لیَ‌دەست نەدەکەوت.

روخساری خەڵکەکەی بە رەنگی مس بوو. هەموویان ژن و پیاو چاویان گەورە بوون.

سەیران کچی مەلاخەلیل بوو. ئەو پێنج منداڵی بوون کە سەیران چووکەڵەکەیان بوو.

مەلا خەلیل بە ئەسڵ و نەسەب ترین خەڵکی ئەو کێوپارەیە بوو. بە پێی شەجەرەنامەکەی ئەسڵ و نەسەبی دەگەیشتەوە سەدان ساڵ پێشتر. ماڵی قەت بیَ‌میوان نەبوو. ماڵی مەلاخەلیل داب و شوێنێکی دیکەی هەبوو.

رۆژێکیان کوڕێکی منداڵ لە خەرمەن جا پەیدا بوو، تەمەنی پێنج شەش ساڵە دیاری دەکرد. کەس نەیدەزانی ئەو کوڕە چۆن و لە کام دیَ ڕا هاتوە. تەنیا منداڵەکە سەرە هەودایەکی بە دەستەوە دەدا. بەو مانایە کە وەختێك لە هەر جیَیەك دڵۆپە خوێنێکی دەدی دەیزیڕاندو رای دەکرد. بەتایبەتی ئەگەر کەسێکی خوێناویی دیتبایە ناڕەحەتی و هاوارهاوارەکەی چەند سەعات درێژەی دەکێشا.

منداڵەکە لە ماڵی "وەلیَیەکۆسە"دا گەورە بوو. وەلیَیەکۆسە دراوسێی ماڵی سەیران بوو. ماوەیەك سەری کوڕەکە کەچەڵیی لیَپەیدا بوو. دایکی سەیرانیَ دەرمان نەما لێی نەداو مەڵحەم نەما لەسەر سەری کوڕەکەی دانەنیَ هەتا کەچەڵیَیەکەی چاك بووەوە. کوڕەکەیان ناو نابوو "عەزیز". سەیران دوو ساڵ لە عەزیز گەورەتر بوو. لەبەر دراوسیَیەتی هەمیشە پێکەوە بوون. سەیران لەگەڵ ئەو منداڵە بیَکەسە وەك دایك رەفتاری دەکرد. نەیدەهێشت هیچ کەس نە منداڵ، نەگەورە تووشی ئەو منداڵە بیَ...

ئەگەر کەسێك نیازی ئازاردانی وی هەبایە، سەیران وەك جانەوەرێکی درندەی لیَ‌دەهات و قیامەتێکی بەرپا دەکرد. سەیران وەك دێلەپڵنگە توندو تیژو رق هەستاوەکانی بەردەلانەکانی خەرمەن جا بوو، کە ئەگەر کەسێك بیویستایە چووکترین ئازار بەو منداڵە بگەیەنیَ، بە هەموو دڕەندەیی خۆیەوە شالاوی بۆ دەبرد. دەت گوت عەزیز منداڵی سەیرانی وەحشیَیە. سەیران لەو شتە کە لە ماڵیَ دەیخواردو عەزیز دەستی نەدەکەوت بەشی ویشی دەبرد.

هەرچەندی گەورەتر دەبوون، دۆستایەتی‌یەکەیان قوولتّرو زیاتر دەبوو، بە جۆرێك کە هەمیشە پێکەوە بوون و بێ‌یەکتر تەنانەت ئاویشیان نەدەخواردەوە.

سەیران ببوو بە کچێکی قەیرەو عەزیزیش تازەلاوێك. سەیران کەڵەگەت بوو و عەزیز کورتەبالاّو وردیلە. روخسارێکی هەبوو دلگر، خەمگین و هەر لەو کاتەدا دەم بە پێکەنین. جێبرینێك کە لە گۆنای چەپیڕا هەتا چەنەگەی هاتبووەخوار، دیمەنێکی تایبەتیی دەدا بە روخساری. عەزیز لەگەڵ ئەوەی چووکەڵە بوو، وەك هەموو دانیشتووانی خەرمەن جا زبرو زرینگ راهاتبوو. ئەویش وەك وان سوارچاك و تفەنگچی‌یەکی کارامە بوو. هەر بەو ئەندازەیەش بێباك و دلێر...

وەختێك سەیران بوو بەگەورەکچ و عەزیزیش بوو بە تازەلاو، سەرچاوەی قسەی پڕوپووچی نێو دێش درا: "کچێکی گەورەو زەلام لەگەڵ کوڕەلاوێك لەو تەمەنەدا چۆن دەکرێ شەو و رۆژ پێکەوە بن؟"

ئەم قسەو قسەلۆکانە لە خەرمەن جا تێپەڕین و لە دێ‌یەکانی دوورو نیزیکیش دا بلاّو بوونەوە. هەرچەندی سەیران قیز جوان تر دەبوو و زیاتر دەکەوتە سەر زمانی چاك و خەراپ، ئەوینی وی دەرهەقی عەزیز زیاترو ئەفسانەیی‌تر دەبوو.

رۆژێکیان بابی سەیران قیز دایکیی بانگ کردە گۆشەیەك و پێی گوت:

"ئەو قسەو قسەلۆکانەت نەبیستوە؟"

دایکی گوتی:

"بیستوومن، بەلاّم عەزیز وەك کوڕی سەیران وایە. لە خوشك و براش لێك نیزیکترن."

"دەزانم. باش دەزانم. بەلاّم ئەمەی چۆن لە خەلکی حالّی بکەم. بەو کچەی بلێ ئیدی تـخوونی عەزیز نەکەوێ."

دایك مەسەلەکەی بە سەیران گوت. سەیران سەری سوڕما. تەنانەت بە فکریشی‌دا نەدەهات کە رۆژێك ئەو جۆرە مەسەلانە بێنە گۆڕێ. وەختێك سەرسوڕمانەکەی تەواو بوو، پێکەنی و پاشان زۆر خەفەتبار بوو. لەگەڵ دایك و بابی ماوەیەکی زۆر باسیان کرد. جارێکیان کە سێ رۆژ چاوی بە عەزیز نەکەوت لەتاوانی هاتە شەرایە مەرگی.

دایکی، بابی، براو کەس و کارو دۆستانی و هەموو ئاشناو رۆشناکانی چەندین رۆژ لەبەری پاڕانەوە، بەلاّم کاریگەر نەبوو. سەیران بە بێ عەزیز نە نانی دەخوارد، نە ئاوی دەخواردەوە، نە پێ دەکەنی و تەنانەت نە دەش گریا.

عەزیزیان نارده دێیەکانی دیکە. سەیران چوو دۆزیەوەو لەگەڵ خۆی هێنایەوە. سەیرانیان نیشانە کرد. دەزگیرانەکەی لاوێکی لێوەشاوە بوو لە یەکێك لە گوندەکانی دوور لە ناوایی خۆیان. دەزگیرانەکەی کوڕی "خورشیدخان" بوو کە ماڵ و زەوی و مەڕو ماڵاتێکی زۆری هەبوو. سەیران شەوێکیان هێندەی نەمابوو کوڕەکە وەبەر کوتەك و دار بدا هەر چونکە ویستبووی ماچی بکا. سەیران دوو ساڵی رەبەق لەگەڵ دێهاتییەکان و کەس و کاری خۆی مل بە ملەی کرد. ئەو شیرەی لە مەمکی دایکی خۆی خواردبوو، بە تفنگانیان دا هێنایەوە.

رۆژێکیان عەزیز ون بوو. دەیان گوت چووەتە چوکووراوا، لە دووری لە نێو عێلاتێك دا دەژی کە ناو و ناوبانگیشیانی نەدەزانی. سەیران وەختێك لە هاتنەوەی عەزیز تەمابڕاو بوو، رۆژێکیان ئەسپێکی لە تەویلەی ماڵێ بابی دەرکێشا، لێی سوار بوو و کەوتە رێگا. هەموو جێیەك گەڕا، لەهەموو شوێنێك سۆراغی پرسی، هەر کەس سەیرانی دەدی، دەست و لاقی رەق دەبوون و لە جوانییەکەی سەری سوڕ دەما. سەرەنجام عەزیزی لە وایوای دیتەوە. عەزیز پەنای بۆ ماڵێ موختار سەیفەلی بردبوو.

مەلا خەلیل لەگەڵ موختار سەیفەلی لە باب و باپیرانەوە دۆست بوون. بۆخۆی عەزیزی ناردبووە لای وی. سەیفەلی و بابی زۆر بە رووخۆشی وەریان گرت. ئەوینی لە رادەبەدەری سەیران و عەزیز کەوتە سەر زارو زمانی تورکمەنەکان.

تورکمەنەکان بە پێی داب و شوێنی خۆیان هەر کۆمەگێك لە دەستیان دەهات دەرهەق بەو دوو دڵدارە کردیان. ئەم دوو دڵدارە بەختەوەرترین ئەویندارانی سەر ئەم دنیایە بوون و ناوبانگی جوانیی سەیران لە هەموو جێیەك گەڕابوو. راست لەو جەرگەیەدا بەڵایەك بەسەر ئەم دوو دڵدارە هات کە کەس چاوەڕوانی نەبوو.

عەلیسەفابەگ برایەکی لە خۆی گەورەتری هەبوو کە سێ کوڕی هەبوون. کوڕەکان لەگەڵ مامیان دەژیان. هەرسێکیان خوێندەوار بوون، بەڵام خووی شارستانییانیان گرتبوو و پشتیان لە داب و شوێنی تورکمەنان کردبوو. لەنێودێی قوماریان دەکرد، مەشرووبیان دەخواردەوەو چاوبەستیان دەکرد. تورکمەنەکان کە تا ئەودەم ئەو جۆرە کەسانەیان نەدیبوو، بە سەرسوڕمانەوە لە خۆیان دەپرسی:"یانی لەدنیادا ئەم جۆرە کەسانەش هەن؟" ئەوان تەنانەت دەستیان بە دزی و پیاوکوشتنیش کرد.

وەختێك ئەمانە تاریفی جوانییە سەیرانێیان بیست کە هاتبووە لای سەیفەلی، لە وایوای مانەوە. بەیانی لە وایوای، شەوێ لە وایوای، کاروباریان بوو بە وایوای. بەرە بەرە جووتیارەکان

لەو سێ بەرەڵڵا نزمە کە سەیرانیان خستبووە ژێر چاوەدێری، وەجان هاتن. تەنانەت چەند جارێکیش لەنێو ئەوان و خەڵکی وایوای دا شەڕو ناخۆشی پەیدا بوو. ئێستا عەریفی جەندرمە، عەریف "زولفۆ"ش ڕەگەڵ ئەم سێیانە کەوتبوو. لە نێو دێی دا دەگەڕان، بەڵام بە هیچ جۆر نەیان دەوێرا لە سەیرانێ نیزیک ببنەوە. چونکە سەیران نەك هەر ڕووی نەدەدانێ، بەڵکوو تەماشای چارەشیانی نەدەکرد. هەتا شەوێکیان هێرشیان کردە سەر ماڵێ سەیفەلی. لەسەری شەوێ ڕا تا بەیانی ماڵەکەیان وەبەر تفەنگان دا. چەند کەسێکیش لە هەردوو لا بریندار بوون، هەم لە دێهاتیەکان و هەم لەوان و سەرەنجام سەیرانیان گرت و بردیان. پاش ئەوەی سەیرانیان هەڵگرت، دەنگۆیەکی زۆری وەدوا کەوت. یەکێك دەیگوت برازا گەورەکەی عەلیسەفابەگ ئاشقی سەیران بووەو بۆی شێت و شەیدا بووەو هەربۆیەش هەڵیان گرتوە، بەڵام سەیران خۆی بەدەستەوە نەداوە. یەکێکی دیکە دەیگوت هەموو شەوێ لە پێش دا عەریف زولفۆ و دوایەش سێ برازاکەی عەلیسەفابەگ تخوونی کەوتوون. هەرچۆنێك بوو، کەس لە ڕاستیەکەی ئاگادار نەبوو، و قەتیش هەر ئاگادار نەبوو.

پاش ڕاکێشانی سەیران، عەزیز وەك شێتانی لێهاتبوو. تفەنگێکی لە دەستان خۆشی ئەڵمانیی پەیدا کردو دەستی کرد بە فیشەك کڕین. ئەوەندەی فیشەك کڕی کە لەبەر قورسایی فیشەکدانەکانی خۆی نەدەتوانی. ڕۆژێکیان لای بەیانی عەزیز، عەریف زولفۆ و سێ برازایەکەی عەلیسەفابەگ و چەند کەسی دیکە لە هاوڕێکانیانی لە نەکاو لە خانوویەکی گوندی بوزکوویودا بەگیر هێنا. دەرگای کردەوەو لە شیپانەی دەرگادا چۆکی داداو یەك یەك هەموویانی کوشت. جگە لە سەیران نەیهێشت یەکێکیان بە زیندوویی دەرچێ. پاش تەواو کردنی کارەکەی زۆر بە پشوو لەسەرخۆیی چووە ژوور، دەستی سەیرانێی گرت و ماوەیەکی درێژ لە چاوانیەوە ڕاما، پاشان سەری بردە پێش و نێوچاوانی ماچ کرد. گەڕایەوەو بە غاردان لە بوزکوویوو دوور کەوتەوە. نیزیك نیوەڕۆیە بوو گەیشتە مەخفەر. یەکەمین جەندرمە کە هاتە سەر ڕێگای تفەنگێکی لێدا. جەندرمەکانی دیکە دەرگایان لەسەر خۆیان داخست و شەڕ دەستی پێکرد. ئەم شەڕە سێ سەعاتی خایاند. پاش ئەوە عەزیز زۆر ئارام هەستا، لەو دێهاتیانە کە لە دەوروبەری ڕاوەستابوون، داوای شقارتەو بەنزین و کۆنەپەڕۆی کرد. جووتیارەکان کە نوتقیان بەسترابوو بێدڵیان نەکرد. تاوێك دواتر شقارتەو بەنزین و کۆنەپەڕۆیان هێنان و دایاننە دەست عەزیز. عەزیز هەروا بێ پشوو سوار بوون چوو دەرگای مەخفەرەکەی ئاگر داو ئەجار لە بۆسەدا مایەوە. تاوێك دواتر جەندرمەکان خۆیان لە مەخفەر

فڕێ دایە دەرو عەزیزیش هەر جەندرمەیەکی دەهاتە دەرێ، بە تفەنگ لێی دەداو دەیکەشت. ئاخرین جەندرمەکانی کوشتبوو کە لە لایەن دەستە جەندرمەیەکی دیکەوە کە لە شار ڕا بە هاواری مەخفەرەکەوە هاتبوون، گەمارۆ درا. شەڕەکە بەردرێژ بوو. ژمارەیەکی زۆر جەندرمە ئەنگێوران. عەزیز پاش ئەوەی فیشەکی لێبڕان لەو خەندەکە کە تێی دا دامەزرابوو، هاتەدەرو ڕۆیشت بۆ لای جەندرمەکان" لێیان داو کەوت. لەشیان بە گوللە دابێژ دابێژ کرد. کەس نەیزانی چەند گوللەی وێ کەوتن.

تەرمی عەزیزیان بردەوە شارو دوو ڕۆژان بەرامبەر بە مەخفەری جەندرمە لە پێش چاوی خەلکیان داناو خەلك بە خەفەتێکی تێکەلّ بە ئەوین و ئۆگرییەوە تەماشای تەرمی وردیلەی ئەویان کرد، و بە چاوی شێخ و پیر تەماشای ئەو تەرمەیان دەکرد کە پاش مردن چووکترو وردیلەتریش ببووەوە.

سەیرانیان بردبووە بەندیخانە. تەرمەکە بێ خاوەن مابووەوە. جەندرمە کەلاکەکەیان لە دەرەوەی شار لە قوولکەیەك هاویشت و چەند پێمەڕە گلّیان وەسەر کرد. سەرو لاقی بەدەرەوە مابوون. پاش ئەوەی جەندرمەکان ڕۆیشتن، خەلّك هاتن، تەرمی عەزیزیان بردەوە مزگەوت، شتیان و کفنیان کردو بە ڕێزو حورمەتەوە لە گۆڕستان بە خاکیان سپارد.

مەلا خەلیلی بابی سەیران چەندین ڕۆژ دواتر ئەم خەبەرە ناخۆشەی بیست. ڕووداوەکە ئەوەندە کاری تێکرد، هەر کە خەبەرەکەی بیست نەخۆش کەوت و چەند ڕۆژ دواتر مرد.

دایك و براو قەوم و خزمی سەیرانێ لە چوکووراواوە چوونە بەندیخانە بۆ دیتنی سەیران. بەلاّم ئەو، لێوی هەلّنەپچڕی و نە لەگەلّ دایکی و نە لەگەلّ کەس و کاری یەك وشە چیە، قسەی نەکرد. دوای ماوەیەکی کەم سەیران هەر کە لە زیندان ئازاد بوو، چووە سەر گلکۆی عەزیز کە لە پشتەوەی شاری لەنێو دارە "مۆرد"ەکان دا نێژرابوو. بە دەنگێکی دلگر جوانترین، گەرمترین و ڕاستگۆیانەترین شیوەنی بۆ کرد. شیوەنەکەی ئەوەندە بەسۆز بوو کە هەر کەس دەیبیست خەریك بوو شێت بێ.

سەیران چەند ڕۆژێك لە شار مایەوە، پاشان چووەوە وایوای مالێ سەیفەلی. دایکی و براکانی و کەس و کارەکەی ویستیان بیبەنەوە خەرمەن جا، بەلاّم سەیران قبوولّی نەکرد، تەنانەت ئامادە نەبوو بیان بینێ و گوێ بۆ قسەکانیشیان ڕادێرێ و ئەوان بە دەستی بەتالّەوە گەڕانەوە ئاوەدانییەکەی خۆیان. هەر سێ مانگ جارێك دەهاتنە وایوای بۆ ئەوەی بیبەنەوەو هەموو جارێ بە بەتالّی دەگەڕانەوە. دایکی سەیران کە تێگەیشتبوو سەیران ناچێتەوە چیا،

رۆژێك لە رۆژان بەروبوخچەی تێك ناو هاتە وایوای. بە دوای وی دا براکانی و خزمەکانیشی کۆچیان کرد بۆ وایوای. هێندێ پاشەکەوتیان هەبوو، زێڕو مەڕومالاَتەکەشیان فرۆشت و زەوی‌یان لە تورکمەنەکانی دانیشتووی دەوروبەری ئاکچاساز کڕی. ئەوان خەڵکێکی زۆر زبرو توندو تیژ بوون. ژمارەیان کەم بوو، بەلاَم کەس نەی‌دەوێرا پێ‌یان بڵێ پشتی چاوتان برۆیە.

سەیران نەچووە ماڵێ هیچ کام لەوان و هیچیشی لە هیچیان وەرنەگرت و لەگەڵ هیچ کامێکیان تەنانەت دایکیشی قسەی نەکرد. تەنانەت تەماشای لای ماڵەکانی وانیشی نەدەکرد.

ئەم خەڵکە چیانشینە بە زەحمەت لەگەڵ ئاو و هەوای چوکووراوا راهاتن. سەیران و ئەوانی دیکەش دوو ساڵی تەواو لە دەستی نۆبەتێ‌یان ناڵاَندیان. پاشان بەرە بەرە ئەوانیش خوویان بە مێش و مەگەزو گەرمای چوکووراواوە گرت.

سەیران یەکەم هەینیی هەموو مانگێك دەچووە شارو شەوێ تا بەیانی لەسەر گلکۆی عەزیز شیوەنی دەکردو بە دەنگێکی خۆش پێی هەڵدەگوت.

سەیران بە تاقی تەنیا لە خانوویەك دا دەژیا. بۆخۆی کاری دەکردو تەنانەت کرێکاریی دەکردو هیچی لە کەس وەرنەدەگرت.

پاش مردنی عەزیز هیچ کەس پێشنیاری زەماوەندی بە سەیران نەکرد. سەیران ئەوەندە جوان بوو کە دانیشتووانی چوکووراوا وەك بوونەوەرێکی پیرۆز سەیریان دەکرد. تەنانەت بە فکری کەسیش دا نەدەهات کە بە چاوی ژنێك تەماشای بکا.

پاش کوژرانی کالایچی و ون بوونی حەمەد، دێهاتی‌یەکان خانووی حەمەدیان دروست کردو دایانە سەیران. ئەم جارە سەیران پێشنیاری نیشتەجێ بوون لە خانووی چۆڵ و بێ سەحەبی حەمەدی رەت نەکردەوەو، و لەو خانووەدا شەو تا بەیانی جوانترین و بەسۆزترین گۆرانی‌یەکانی بە یادی عەزیز دادەنان و دەی‌گوتن. کچە جحێڵەکانی ئاوەدانی شەو تا بەیانی لە دەوروبەری ماڵەکەی بەخەبەر دەبوون و ئەو شێعرانەیان لەبەر دەکرد کە ئەو بە گۆرانی دەی‌گوتن. شیوەنەکانی لە سەرانسەری چوکووراوادا کەوتبوونە سەر زارو زمانان.

پاش کوژرانی عەزیز سەیران تەنیا یەك جار پێ‌کەنی. ئەویش وەختێك بوو کە بیستی کالایچی بە دەستی حەمەدۆك کوژراوە. لەو وەختەوە کە هاتبووە وایوای ئارەزووی دیتنی کەسێك و شتێکی نەدەکرد. بەلاَم کاتێك کالایچی کوژرا، لەقوولایی دڵی دا هەستی کردبوو کە زۆر تامەزرۆی دیتنی حەمەدۆکە...

ئێستاش بۆ ئەوەی کە ئەو دەرفەتەی لە کیس چووبوو بە پەرۆش بوو و سەرکۆنەی خۆی دەکردولە دڵی خۆیدا دەیگوت:"دەم زانی، هەستم دەکرد لە ماڵی وەسمانەزلە شتێك هەیە. دایەقەمەر هەمیشە لە هاتوچۆدا بوو، لە هیچ کوێ بەند نەدەبوو، هەمیشە شەش دانگی بیرو هۆشی لەسەر ماڵێ بوو. بریا چووبامە ماڵێیان." دیارە چەندین جار نیازی هەبوو بچێتە ماڵی وەسمانەزلە، بەڵام هەر جارەی لەبەر هۆیەك پەژیوان دەبووەوە. زیاتر لەبەر ئەوەش بەداخ بوو. حەمەدۆك چۆن بوو؟ چ جۆرە پیاوێك بوو؟

وەسمانەزلە هەروەك هەستێکی بەم تامەزرۆیی‌یە کردبێ، هەر کە وەخەبەر هات دەستی کردەوە بەتاریفی حەمەدۆك:

"چاوێکی هەن چ چاو. وەختێك تەماشای روخساری دەکەی هیچ نابینی جگە لە جووتە چاوێکی گەورەو بریسکەداری وەك دوو بڵێسە ئاگر، جووتە چاوێکی زبرو تیژ کە ناتوانی زۆریان تەماشا بکەی، دڵت دادەخورپێ. دڵت رادەوەستێ. کەس ناتوانێ بە تفەنگ بیئەنگێوێ، ئەگینا ئەمن تا ئێستا لە نیگەرانی‌یان دەمردم. قامکی لەسەر پەلاپیتکە ئەوەندە چالاکە کە لەبەر چالاکی‌یان ناتوانی بیبینی. گوللە کاری لێناکا. دیسان دێتەوە."

وەختێك گوتی "دیسان دێتەوە" وەك بپارێتەوە چاوی لە چاوی مەلافەرهادەوە بری و مەلافەرهاد بە راوێژێکەوە کە تەواوی باوەڕی دڵی تێی دا کۆببووەوە، وەڵامی دایەوە:

"دیسان دێتەوە."

## (٢٠)

هەتاو بە توندی لەولاتی دەداو هەوا زۆر گەرم بوو. لەپەنای گۆمیلکەیەکی رەنگ سەوز کە وەك چالاوێکی قووڵ دەهاتە بەرچاو راوەستابوو، سێبەرەکەی دەکەوتە سەر ئاوەکە. لەئاسمان، زۆر دوور، لە پەرپەرۆچکەی ئاسمان پەڵە هەورێکی سپی کە لە رووناکایی دا نوقم بوو، دەبزووت. کەس نەیدەزانی سێبەری ئەو هەورە سپی‌یە کەوتوەتە سەر کوێ. چونکە لەو دەوروبەرە لە هیچ کوێیەك سێبەری هەور لەسەر زەوی دیار نەبوو.

بەسەر چڵە گۆزروان و بێژان و کلۆوکە شینەکانی ئەو پنگەوە کە لە لێواری گۆمیلکەکە سەوز ببوون زەرگەتە هێلانەیان دروست کردبوو، و هەزاران زەرگەتە بەسەر چڵەگیاکانەوە وزەوزیان بوو. کۆمەڵێك مێشە شینکەی درشت و زل زل لە هەوادا دەفڕین. جاڵجاڵۆوکە داوی پانی خۆیان لەبەر هەتاو راخستبوو.

جادەکان لەبەر تیشکی هەتاو بە جۆرێك دەدرەوشانەوە کە دەت گوت وردە شووشەیان لەسەر راخراوە. رەنگدانەوەی ئاوی جەیهان دەکەوتە سەر دەشت و نوورێکی وەك بریسکەی شمشێر دەدرەوشایەوەو دەکووژایەوە.

ئەسپ وەك بەردێك رەق لە جێی خۆی راوەستابوو، لەتکە لەتکە پووڵەکەی رووناکایی دەکەوتنە سەر چاوەکانی و دەکووژانەوە. چەرمی کەلەکەی راستی لە پەستا دەلەرزاندەوە، بەلام بەو حالەش کۆمەڵێك مێشە رەشکە لەسەر چەرمەکە دەنیشتن.

ئەسپ سەری هەڵبڕی، کونە لووتەکانی فش کردنەوە، ماسولکەکانی لەبەریەك کێشانەوە، چەند لەحزەیەك بۆنی بە هەوای گەرمەوە کرد. پاشان سەری بۆ سەر زەوی شۆڕ کردەوەو لە حالێك دا لە پڕماندنی خۆی تۆزوخۆڵی هەڵدەستاند، بۆنی بە زەوی‌یەوە دەکرد. چوار پێنج جار

سەری هەڵێناو هەناسەی قووڵی هەڵکێشاو پاشان سەری داخستەوە، لەسەر سەری مێشێکی زەلام خولی دەدان و وزەوزی باڵەکانی دەهات.

پاش ماوەیەك، ئەسپی خەنەیی هەروەك مێش چووبێتە تفنکانیەوە، بە توندی سەری راوەشاندو پاشان دیار نەبوو لەبەر چی هاتە سەر پاشووان و دوو جار بە دەوری خۆی دا سوورِا.

کەلەکەی تۆزێك تێك قووپین، بە پرِتاو سێ جار دەوری گۆمیلکەکەی دا. راوەستا. ئەمجار حیلەیەکی کێشا کە سەرانسەری دەشتەکەی پرِ کردو چەند لەحزە دەنگی دایەوە. پاش ئەم حیلاندنە دیسان بێجووڵە لە قەراخ گۆمیلکەکە راوەستا. سپێینەی چاوەکانی پرِ ببوو لە خوێن. خەتێکی سپیی جوانی وەك خرِخاڵ کە لە لاقی چەپی دابوو، لە گیاشین دا ون ببوو. ناڵی پاشووەکانی کەوتبوون.

شنەبایەکی نەرم هەڵی کرد. لە دووری، گێژەڵووکەیەکی چووکەڵە کە بە خێرایی دەرِۆیشت درەوشایەوە. ماسوولکەکان لەسەر پەراسووی ئەسپەکە دەخزین و مێش و مەگەزێکیش لە گۆرِێ دا نەبوو. ئەسپ بەسپایی و هاورِێ لەگەڵ ئەو شنەبایەی دەهات و ئەو گێژەڵووکەیەی دەدرەوشایەوە، کلکی راوەشاند. ئادەم بە سواری ئەسپە بۆرە سێ رۆژ بوو لێی دەگەرِا. کون و کەلێن نەمابوو سەری پێدا نەکاو بێشە نەمابوو سەنگ و سووژنی نەنێ، و چونکە ئەسپەکەی نەدیبووەوە، دووبارە ترس دایگرت و لە دڵی خۆی دا گوتی:"مومکین نیە، نهێنیەیەك لە کاری ئەم ئەسپەدا هەیە." بە هیچ جۆر نەیدەتوانی ئەم فکرە لە مێشکی خۆی بەرێتە دەر، ئەم فکرە هەموو کردارو رەفتاری وی وەبن خۆی دابوو:"سێ رۆژە لەدوای عەودالم. لەم دەشتەدا جێیەك نەما نەیگەرِێم. لە قامیشەڵانیش هەتا ئەو جێگایە کە گیاندار دەتوانێ برِوا، رۆیشتم. دیار نیەو نیەو نیە."

ئادەم ئەو شەوەی هاتەوە بەرچاو کە ماڵ و تەویلەی یۆبازئۆغلیان سووتاندبوو. هەرکە ماڵەکەیان ئاگر تێبەردا، بەجارێك بڵێسەی لێبەرز بووەوەو وەك بەفر توایەوە. بڵێسە ئاگر دەسبەجێ دەرگای تەویلەکەیان قووت دا. تەنیا مۆجیزە بوو کە ئەم ئەسپەی لەو سووتمانە نەجات دا. ئەسپی خەنەیی چۆن لەو سووتمانە بە سلامەتی دەرچوو؟ و چۆن ئەو سێ رۆژە نەیدیوەتەوە؟ "دەستی قودرەتی خوا لەم کارە دایە." ئەودەم شەپۆلێکی سام و ترس تەواوی لەشی وی دادەگرت و لاقی سست دەبوون. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"مومکین نیە بتوانم ئەو ئەسپە بکوژم، کەسی دیکەش ناتوانێ، ئەگەریش بتوانم بیکوژم دەستم ئیفلیج دەبن."

لێی روون بوو ئەگەر ئەسپەکە بکوژێ، دوارۆژێکی شوومی دەبێ. لەکاتێك دا هیچ حەزی نەدەکرد لەگەڵ ئەسپەکە بەرەورووو بێ، هەر لەو حاڵەدا زۆریش تامەزرۆی دیتنی بوو. پەرەسێلکەکان بە خێرایی‌و بەدوای یەك دا بە پێش ئەو ئەسپە بۆرەیەدا کە سواری بوو تێدەپەڕین. ئێستا خەریك بوو لە خوارەوەی "کەرەملی"یەوە دەچوو بۆ لای کێلگەکانی تارسووس لوو. لێرە لە قەراخی گۆلاوی ناکچاساز قامیشەکان هەریەکەی بە ئەستوورایی دارێك چووبوونە ئاسمان و ئێرە لێرەوارێکی قامیش بوو.

ئادەم لەبەر خۆیەوە گوتی:"با بچمە نێو قامیشەڵان، لەنێوەڕاستی قامیشەڵانەکە لە جێگایەك لەسەر تەپۆلکەیەك دەبێ کانیاوێکی فێنك هەبێ." هەوڵی دا ئەو جێگایەی وەبیر بێتەوە. لە ئەسپەکەی دابەزی. هەوساری ئەسپەکەی لە بیەیەك خست و بەرەو قامیشەڵانەکە وەڕێ کەوت. وەختێك گەیشتە قامیشەڵان راوەستا. دیسان ترسی رێ نیشتەوە. دەوران دەوری لێواری قامیشەڵانەکە ئاو دایگرتبوو. بێئەوەی پێڵاوەکەی دانێ و دەلینگی پانتۆڵەکەی هەڵکا، وەنێو کەوت و چووە نێو قامیشەڵان. نێو قامیشەڵانەکە پڕ لە هێلانە ژەنگەسوورەو هێلانە زەرگەتە بوو. جاڵجاڵووکە بە بەربڵاوی داویان راهێشتبوو. چەند ژووشکی وەبەر پێ هاتن کە خۆیان خڕ کردبووەوە. بە پەنای مەلێك دا تێپەڕی کە لاقی یەکجار درێژ بوون. باڵندەکە بە قەد ئادەم بوو. ئادەم راست بە پەنای دا رۆیشت، ئەگەر دەستی درێژ کردبا، دەیتوانی بیگرێ، بەڵام باڵندەکە نەسڵەمیەوەو تەنانەت لەجێی خۆشی نەبزووت. تەنیا چاوێکی هەڵێناو دەسبەجێ لەسەر یەکی دانایەوە. قامیشەڵانەکە فێنك و تاریك بوو، ئادەم بە پارێز دەڕۆیشت، بن قامیشەڵانەکە پڕ لە ماری کوشندە بوو. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ئەم ئەسپە ئەگەر لێرەش نەبێ، ئەدی لە کوێیە؟ ئەم ژەهرەمارە خۆ نەچووەتە ئاسمان. حەتمەن لەسەر عەرز دەبێ لە جێگایەك بێ."

کانییەکەی دیتەوە، لەسەر کانییەکە درێژ بوو، وەك شیری دایکی بمژێ، دەستی بە مژینی ئاو کرد. پاش ئاوێك لەسەر کانییەکە هەستا. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو ئەژنۆکانی کە تۆزاوی ببوون تەکاندن. بیری کردەوە: ئەم ئەسپە نادۆزرێتەوە، ئەگەریش بدۆزرێتەوە ناکوژرێ، ئەگەریش کەسێك بیکوژێ تا ئاخری عومری خۆشی لە خۆی نابینێ. رەنگە نەمرێ، بەڵام زەلیل و ئیفلیج دەبێ کە سەد جار لە مردن خەراپترە"و لەنەکاو هاواری کرد:"بۆ کەسێك ئەم ئەسپە بکوژێ مردن زەماوەندە."

سەرانسەری قامیشەلانەکەی پشکنی، هەتا نزیك گۆلاوەکە چوو، هەم ترساو هەم خۆشحاڵ بوو. لە کاتی گەڕان دا لێکدا لێکدا تووشی ئەو باڵندە ئارام و بێ جووڵانە دەبوو. کاتێك لە قامیشەڵان هاتە دەرێ هەتاو ئاوا ببوو. گوڵێکی زۆر گەورەی دی کە ڕەنگێکی ئاماڵ بنەوشی و نارنجیی هەبوو و بەو هەموو گوڵەیەوە وەك باڵندەیەك دەچوو:

"ئەسپی خەنەیی لە پڕ دەچێتە کەوڵی باڵندەیەکەوە. دەبێتە پەڕەسلێرکە بە بن لووتم دا تێدەپەڕێ. دەخوێنێ و دەڵێ:"بە پێش لووتی دا دەفڕم، لە سمێڵی ئادەم دەترم."

ئادەم یەك بین لە دڵی خۆیدا دووپاتی کردەوە:"چوومە کەوڵی پەڕەسلێرکە، پەڕەسلێرکەیەك، دوو پەڕەسلێرکە، سێ پەڕەسلێرکە، پێنج پەڕەسلێرکە، دە پەڕەسلێرکە، بە پێش لووتی دا فڕیم، لە سمێڵی ئادەم تڕیم."

هەرچەند هەوڵی دەدا نەی دەتوانی ئەم ڕستانە دووپات نەکاتەوە، تووڕە دەبوو، وەك شێتانی لێهاتبوو، بەڵام دیسان بە خۆی نەبوو پەیتا پەیتا دووپاتی دەکردەوە:"بە پێش لووتی دا فڕیم. لە سمێڵی ئادەم تڕیم." چەند لەحزەیەك نوقمی خەیاڵ بوو. وەك کەسێك دەچوو کە لە خەوێ دا بەڕێ دا بڕوا:"ئاکا ئەو تەیرە سەوزە لاق درێژە ئەسپی خەنەیی بێ؟" بە تفەنگ سێرەی لە باڵندەکە گرت، ترسی ڕێنیشت و تفەنگەکەی هێنایەوە خوار. دووبارە تفەنگەکەی هەڵێنایەوە، ئەم جارەیان زیاتر سام گرتی. وەك بنیادەمی دەسکرد تفەنگەکەی هەڵدێناو دایدەنایەوە، هەڵیدێناو دایدەنایەوە. ئەم کارە بەرەبەرە وا خێرا بوو کە دەستی سڕ بوو. لە نەکاو تفەنگەکە دەرچوو، و لەگەڵ دەنگی تەقە تەیرە سەوزە لاق درێژەکە بێگیان کەوتە سەر زەوی و هەر لەوێ بێهەست و خوست کەوت. ئادەم چوو تەیرەکەی هەڵگرتەوە. لاقی زۆر درێژی باڵندەکە تەنانەت دووهێندەی بڵیندایی ملی ئادەم بوون، لێك کرانەوە! باڵندەکەی فڕێدایە سەر عەرزو بە خێرایی لە قامیشەڵانەکە وەدەرکەوت و هەر بەو خێراییەش فکری جۆراوجۆری بە مێشك دا ڕابوردن، و هەر بەو خێراییەش ئەسپەکە بە بەر چاوی دا تێپەڕی. ئەسپی خەنەیی تەکانێکی دەدایە خۆی، باریك دەبووەوەو دەبوو بە ئاسکێکی سپی. ئاسکی سپی تەکانێکی دەدایە خۆی و دەبوو بە کچێك، دەبوو بە پەرییەك... و پەری دەبوو بە کۆترە شاخیلکە. کۆترە شاخیلکە دەچووە پێستی تەیری باران، تەیرێکی جوان بە دەندووکێکی ڕێك و پێك و ڕەنگێکی شینی یەك دەستەوە. تەیری باران دەبوو بە مژێکی شینی یەك ڕەنگ و سەرانسەری دەشتی ئاناوارزای دادەگرت. ئەسپ کە ئێستا ببووە پەڵە مژێك، کۆ دەبووەوەو دەبوو بە شەنگەبییەك... تاقەدارێك لە نێوەڕاستی دەشتیدا... شەنگەبی دەبوو بە ئاوێکی

ڕوون و بە دەشتیدا دەچووە خوار. ئاوەکە دەبوو بە بێشەو چیمەنێك و بێشە دەبوو بە هەور. هەور خۆی دەگەیاندە سەر قەڵای ئاناوارزاو دەبوو بە هەژدیهایەك. شەپۆلی ترسێکی بێئەنداز لەو هەژدیهایە ئادەمی ڕێك دەگوشی. هەژدیها زمانە حەفتاو دوو لکەکەی کە وەك گڕی ئاگر سوور بوو، دەردەکێشاو بۆلای دەهات. بە غاردان لە قامیشەڵان هاتەدەر. ڕووناکایی وەك بەردێك لە روخساری دراو چاوی بە تیشك ئەنگوتن. بە ناچار چەند لەحزەیەك چاوی لەسەریەك دانان. هەرکە چاوی هەڵێنان، ئەسپەکەی خۆی دی کە کەمێك لەولای خۆی ڕاوەستاوە. خۆی هاویشتە سەر ئەسپی بۆرەو زۆر بە پرتاو لینگیدا. دیسان پەڕەسلێرکە پۆل پۆل بە توندی بە پێشی دا تێدەپەڕین..." بە پێش لووتی دا فڕیم، لە سمێڵی ئادەم تڕیم..." ئادەم ئەسپی وەبەر قەمچی و ئاوزەنگییان دا. پیاو هەق بڵێ ئەسپە بۆرەش یەکە بارێ خۆی توند دەڕۆیشت، بەڵام لەگەڵ هەموو توند ڕۆیشتنەکەی دیسان پەڕەسلێرکە پۆل پۆل بە پێشی دا دەڕۆیشتن. دەنگێك لە دەروونی دا لە پەستا ئەو وشانەی دووپات دەکردنەوە، بە پێش لووتیدا... ئەسپ گەیشتە بەستێنێك. پاشان بە ئەستێریك دا ڕۆیشت و گەیشتە بیشەڵانێك. لە چەند خەندەك پەڕییەوە، پاشان وردە وردە لە پرتاو نیشتەوەو ئەمجار لە گەنداوێك کەوت کە هێندی باڵای ئەسپەکە قووڵ بوو. ئەسپ لەوێ نەیتوانی بێتەدەر و هەر لەوێ دا مایەوە.

ئەسپی خەنەیی دەچووە پێستی باڵندەیەکەوە:"بە پێش لووتت دا فڕیم." دەبوو بە لەك لەکێکی لاق سوور:"لەسەر سمێڵت تڕیم." دەبوو بە هەڵۆیەکی چاوزەرد، بیچمی سەگێکی عەرەبیی درێژو ڕاکشاوی بەخۆیەوە دەگرت:"بە پێش لووتت دا تێپەڕیم..." دەبوو بە ڕەشمارێك کە لە قەدی چنارێکی بەرز هاڵابوو و بەرەو هێلانەیەك دەخزی کە لە تلۆفکی چنارەکە بوو. بە نیازی قووت دانی ئەو جووچکانە بوو کەلە هێلانەکەی لەسەر دارەکەدا بوون، خەریك بوو سەری بۆنێو هێلانەکەو ڕاست بۆ لای ئەو جووچکانە درێژ دەکرد کە زمانێکی دووفلیقانەی سووری وەك گڕی ئاگریان هەیە. ئادەم ڕاست لەو لەحزەیەدا تفەنگەکەی داوێ. مارەکە بە گوللەیەك لەسەر دارەکەوە هەڵدەواسرێ و بەمردوویی بەردەبێتەوە سەر زەوی. مارێکی زۆر درێژە "بە پێش لووتی دا فڕیم..." ئادەم ئیفلیج دەبێ. دەست و لاقی ئادەم وەك دەست و لاقی "سمایلەلەرز" دەلەرزن. دەستی بە لایەك دا خوار دەبن و لاق و لەش و ملی بە لایەکەی دیکەدا.

سمایلەلەرز لاوێکی لێوەشاوەو بە دیمەن و تفەنگچییەکی کارامە بوو. لە هەوا چاوی قولینگی بە تیر دەنگاوت. ڕۆژێکیان کە سەرگەرمی ڕاووشکار دەبێ، گاکێویەك لە

رووبەڕووی پەیدا دەبێ. گاکێوییەکی زۆر جوان و درێژو باریك. بە دڵی سمایل دا دێ کە:"سمایل ئەمەی مەکوژە." گیاوگۆڵ و بەردو گڵ وەزمان دێن و دەڵێن:"سمایل نەکەی ئەو شوورەی بکوژی." بەڵام فایدەی چی، قامکی کە لەسەر پەلاپیتکە دەبێ کاری خۆی دەکاو سمایل لەنەکاو دەبینێ کە شوورەکە بوو بە دووکەڵێکی گەش و بە هەوادا چوو. تفەنگەکەی لە دەست دەکەوێ، تەواوی لەشی وەئازار دێ و زاری دەکەوێتە سەر کەف.

ئادەم ئەوەی دەیدی باوەڕی پێنەدەکرد. دەستی بۆ چاوی کردە سێبەرو دیسان بە وردی تەماشای کردو ئەمجاریش باوەڕی نەکرد. ئەوەی وا بێهەست و جووڵە لەبەر هەتاو بە گەردنی بەرزەوە بەجێ مابوو، بێجگە لە ئەسپی خەنەیی شتێك نەبوو. تاوێك دەست و پێی خۆی لێ ون بوون، تفەنگەکەی هێنایە سەر دەستی، هەرچەند مەودای لەگەڵ ئەسپەکە زۆر بوو، دیسان سێرەی لێگرت، دەست و لاق و تەواوی ئەندامی لەشی دەلەرزین. لەحزەیەك بیری کردەوە "بوومە سمایلەلەرز" تەماشای ئەسپەکەی کرد. ئەسپ لەسەر پاشووان راوەستابوو، دەستی هەڵێنابوون، دەت گوت دەیەوێ بە ئاسمان هەڵڵا بڕوا. وەك باڵندەیەکی ئەفسانەیی دەچوو کە باڵی بەرەو ئاسمان لێك کردبێتەوە. ئادەم نەیزانی ئەسپەکە چ ماوەیەك ئاوا بەرەو ئاسمان راوەستا. پێشووەکانی لە زەوی دەدان و دووبارە بەرەو ئاسمان بەرزی دەکردنەوە، دەت گوت خەریکی سەمایەکی سەیرو بێوێنەیە. لاقەکانی، ماسوولکەکانی پەیکەری بەرزو رەسەنی رادەکشان و ئەمجار بە نەرمی شل دەبوونەوە. ئادەم بە نیازی تەقە کردن دووبارە سێرەی گرت، بەڵام دەستی وا دەلەرزین کە نەیدەتوانی تفەنگەکەی راست راگرێ.

ئەسپ جارێکی دیکە هاتە سەر پاشووان. ئەمجار راوەستاو پاشان بە دەنگێکی پڕ ئاواز حیلەیەکی درێژی کێشا. حیلەکە لە سەرانسەری دەشتی ئاناوارزادا زرینگایەوەو دەنگدانەوەکەی لە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا گەڕا. ئەمجار ئەسپی خەنەیی بەرەو رۆژئاوا، بەرەو گوندی ئاناوارزا کەوتە لینگدان. ئەسپە بۆرەش هەروەك پەیڕەوی لەو بکا، کەوتە لینگدان. ئەگینا ئادەم لە وەزع و حاڵێك دا نەبوو کە بیهەوێ وەدوای ئەسپی خەنەیی بکەوێ. ئەسپی خەنەیی وا بە پڕتاو دەڕۆیشت کە ئەندامی راکشاوی راکشاوتر ببوو و دەت گوت زگی لەگەڵ رووبەری زەوی بووەتە یەك. ئەسپە بۆرەی ئادەمیش جانانە لینگی دەداو لە دەوروبەری خۆی هەوای وەك با وەجووڵانەوە دەخست، شنەی ئەو بایە بەرە بەرە ئادەمی وەهۆش خۆی هێنایەوە.

ئەسپی خەنەیی لە ماوەیەکی کەم دا بۆ لای گوندی ئاناوارزا کە لە پشتی بەردەڵانەکەی ئاناوارزا هەڵکەوتبوو، شۆڕ بووەوە. لە دەوروبەری گوندی ئاناوارزا بای دایەوە بۆ لای حاجیلارو

"کامیش لیقی" و هەر بەو خێراییەیە لە حاجیلار تێپەڕی و گەیشتە ئاکچاساز. وردە وردە لە خێرا ڕۆیشتنەکەی کەم دەبووەوە، بەڵام بە ڕادەی پێویست ئەسپە بۆرەی بەجێ هێشتبوو.

ئەسپی خەنەیی لە لێواری ئاکچاساز لە نیزیك پۆلە بیەکان ڕاست ڕاوەستا. وەختێك ئادەم دیتی ئەسپەکە ڕاوەستا، خۆشحاڵ بوو. نە دەستی دەلەرزی و نە دڵەخورپەیەکی هەبوو. پاش سێرە گرتنێکی ورد دەستی لێ‌کێشا. بەڵام لە نەکاو تەماشای کرد ئەسپەکە غەیب بوو. ڕقی هەستا. ترسی سوار بوو، بەزەیی بەخۆی دا هات. چەند ڕۆژە وەدوای ئەسپێك کەوتوە، وەدوای ئەسپێك کە کەس نازانێ ئینسانە، جندۆکەیە، شەیتانە، پەرییە، چیە؟... چەند ڕۆژە وەك سەگ زمانی بە دوای دا کێشاوە. ئەگەر بێ‌ئەوەی ئەسپەکە بکوژێ بچێتەوە نێو دێی ئابڕووی دەچێ و نانی دەبڕێ و دەبێ خۆی و ژنەکەی فەعلەیی بکەن. تەواوی بەختیارییەکەیان بە کوشتنی ئەم ئەسپەوە بەند بوو.

لە لایەکی دیکە بۆخۆشی بە شوورەیی دەزانی. چۆن ناتوانێ ئەسپێك بکوژێ، ئێستا ئەم ئەسپە با جندۆکەو پەری بێ، با تارمایی بێ، با بە هەزارویەك نەوع خۆی بگۆڕێ، حۆ کێچ نیە وەبەر گوللە نەیە...

چووە کن ئەو پۆلە بییە کە لەحزەیەك پێشتر ئەسپەکەی لە پەنا ڕاوەستابوو. لە ئەسپە بۆرە دابەزی و هەوسارەکەی لە دارێك خست. دنیا کەمێك تاریك و مژاوی بوو، داهاتەوەو لەو جێگایە کە پێش تەقەکردن ئەسپەکەی لێ‌ڕاوەستابوو، بۆ دڵۆپە خوێنێکی ڕوانی. پاشان بەدوای شوێنی ئەسپەکەدا بەرەو گۆلاو ڕۆیشت. ئەختێك چووە پێش، تووشی ئاوێك بوو کە قوڵت قوڵت هەڵدەقوڵی. لەنەکاو لە دەشتە سەوزەکە ڕاست پەنجا هەنگاو ئەولاتر دەنگی حیلەیەك هات کە تاریکایی شەق کرد. گەڕایەوە، جگە لە کۆمەڵە قامیشێك هیچی نەدی. بەغاردان لە گۆلاوەکە هاتەدەر. ئەسپی خەنەیی و ئەسپەبۆرە کە بە دارێوە بەسترابووەوە بۆنیان بە یەکترەوە دەکرد. ئەمە دەرفەتێك نەبوو کە بتوانێ لە کیس خۆی بدا. دەسبەجێ چۆکی دادا، سێرەی لێ‌گرت و دەستی لێ‌کێشا. بە دەنگی تەقەکەرا زانی نەی‌پێکاوە. چوار فیشەکی دیکەشی بە دوای یەك دا هاویشتن. لەپڕ دیتی کە هەردوو ئەسپەکە بە جووتە هەڵدێن. ئەسپە بۆرە هەوسارەکەی پساندبوو و لەگەڵ ئەسپی خەنەیی بەرەو نارلیقشلاخ لینگیان دەدا. ئادەمیش هەر لەوێ لە قەراخ گۆلاوەکە لەنێو پنگەڵ دا ڕەق ڕاما. ئەسپەکان لەخوار نارلیقشلاوە گەڕانەوەو ڕاست لەوکاتەدا کە دەیانەویست بە بەردەمی ئادەم دا تێپەڕن، ئەو کە وەك شێتانی لێ‌هاتبوو چۆکی داداو پاش سێرەگرتنێکی ورد دەستی لێ‌کێشا، پێنج فیشەکی لەسەر یەك هاویشتن. یەکێك لە ئەسپەکان کەوت. چەند جار بەسپایی حیلاندی و ماوەیەکی زۆر لە تاریکایی دا پەلەقاژەی کرد...

## (٢١)

شەوێکی تەم و مژو قورس و لە شان گران بوو. یەك دوو ئەستێرەی سیس لە ئاسمان دا زریوەیان دەهات. لەبناری کێوەکانی چەپ و ڕاست شوانان ئاگریان کردبووەوە. حەمەد زۆر باش ڕێگایەکە شارەزا بوو. ڕێچکەبزنێك بوو باریك و بەردبەرداوی کە دەچووە ماڵێ ئومەتەزەرد. جگە لە هاڕەی لێڕەوار دەنگێکی دیکە نەدەبیسترا. حەمەد هەرچەند کۆڵی زۆر قورس بوو، بێدەنگ و هەرا ڕێی دەبڕی. وا دەڕۆیشت دەت گوت هەنگاو هەڵناهێنێتەوە، بەڵکوو بەسپایی بەسەر زەوی دا دەخزێ. لە کاتێك دا زۆر قورس بوو. لەگەڵ ئەو شتە قورسانەی وەك تفەنگ، نێزە، دووربین و نارنجۆك سێ قەد فیشەکدانی لە قەدی بەستبوون و دوو قەدیشی ڕاست و چەپ بە شانی دا کردبوون. حەمەد باشی دەزانی چۆن وەك کەو بەو کوێرەڕێ باریکانەدا تێپەڕێ، چونکە خووی پێوەگرتبوو.

دوو ڕۆژ بوو لەو کێو و بەندەنانە بە ڕێدا دەڕۆیشت. بە توندی ڕێگای دەبڕی. بەهیچ جۆر تووشی سەربازو جەندرمەو جووتیارەکان نەببوو، بەڵام وەشك کەوتبوو. دەت گوت شتێك لە فەزای دەوروبەری هەیە، شتێکی وەك بۆسە، شتێکی وەك چاوەڕوانی. وەختێك کە لەو خوارە بە "نوورفەتێ" دا تێپەڕی، گوێی لە دەنگی تەقە ببوو. وادیار بوو شەڕێکی کورتیش بوو، و لەبەر ئەوەی دەنگی تەقە زوو کپ بوو، وێ دەچوو چەتەیەك کە لە داو کەوتوە یان کوژرابێ، یان گیرابێ. بۆیە حەمەد زۆر بە پارێز دەڕۆیشت و زیاتر بە لاڕێیان دا دەڕۆیشت:

بە لێڕەوارێکی بەرین و چوغردا دەڕۆیشت. دەنگی خشەو خشپەی لکە دارەکان کە بە شنەبایەکیش دەلەرزین، دەهاتە بەرگوێ.

لەماڵی ئومەت نیزیك ببووەوە. نیوەشەو درەنگتر بوو. حەپەی سەگ لەو شەوە درەنگەدا پێشهاتێکی خۆش نەبوو.

حەمەد بە بنەبانێ دا چووە سەربانی ئومەت. سێجار بەسپایی پێی بە بانە گڵەکەدا دا. ئومەت ئەگەر لە خەویش دا بایە، بەو دەنگە وەخەبەر دەهات و دەهاتەدەر. ئەگینا یان لە ماڵ نەبوو، یان مەترسی‌یەکی گەورە لەگۆڕێدا بوو. حەمەد بە پەلە سێ جاری دیکەش و ئەمجار توندتر پێی بە بانەکەدا دا، تاوێك دواتر هەستی پێ‌یەکی زۆر ئارامی گوێ لێبوو. ڕەشایی‌یەکە چووە پشت ماڵێ و لەسەر زگ بە بنەبانێ دا وەسەر کەوت بۆ سەربانی و گوتی:

"حەمەد لەسەر زەوی درێژ بە."

حەمەد دەسبەجێ بەسپایی ڕاکشا.

ئومەت لە حاڵێك دا دەمی بە گوێی حەمەدەوە نووساندبوو گوتی:

"ماڵەکەمان پڕ لە سەربازە. دەستەی برایمەڕەشیش لە تەویلەن... بە دوای تۆدا دەگەڕێن... ماڵ بە ماڵ و دێ بە دێ و کون بە کون بە دوات دا دەگەڕێن. ئیدی کەس نەماوە نەزانێ کە ئەتۆ هاتوویەوە تووڕووس، توو ئەو خوایە کێ تۆی دیوە؟"

حەمەد گوتی:

"نازانم، نازانم کێ دیومی. بەهەرحاڵ دەبێ یەکێك چاوی پێم کەوتبێ..."

ئەمجار بە جۆرێك بە دواتەوەن، بە جۆرێك هەموو فکرو خەیاڵیان لەسەر ئەم کارەیە هەر مەپرسە... تەنانەت عەلی‌سەفابەگ و ئاغاکانی دیکە خەڵاتیان بۆ سەری تۆ دیاری کردوە. وەختێك یاوەر فارووق باسی دەکرد، گوێم لێبوو. باش وایە چەند مانگێك لە تووڕووس دوور کەویەوە. بەدوات دا دەگەڕێن. وەختێك نەیان دیتیەوە، ئیدی ماندوو دەبن. هەتا ئەو لافاوە دەنیشێتەوە، لێرە دوور کەوەوە. لێرە ڕاوەستە فیشەکم بۆ پەیدا کردووی، لەوانەیە کە ڕۆیشتی تووشی تێك هەڵچوون بی."

ئومەتەزەرد بە دیواری دا چووە خوار. تاوێك دواتر هاتەوە. بە دەستێك توورەکەیەك فیشەك و بە دەستەکەی دیکە بوخچەیەك نان و پێخۆری هێنابوو. بە حەمەدی گوت:

"ها ئەمانە بگرە. مەچۆوە دێیەکەی خۆشتان. دوو مانگە جەندرمەی تێ خزاون."

وەختێك حەمەد گوتی:"خەبەری دێیەکەی خۆمان چیە"، ئومەتەزەرد قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

"ئیدی گیر مەبە، دێیەکەشتان لە جێی خۆیەتی! بەڵام توخوا پێی تێمەنێ، کوڕە بە دەستی خۆت خۆت تووش دەکەی. بە پارێز بە، کێو و بەندەن پڕن لە سەرباز. با پێت بڵێم، ئەم

دێهاتی‌یانە هار بوون. ئەگەر بابیشت بێ، ئەگەر براشت بێ، دیسان خۆت بە کەس نیشان مەدە. زوو لە تووڕووس دەربچۆ. زۆر باشە. خواحافیز."

دەستی درێژ کرد، لە تاریکایی‌دا دەستی حەمەدی کە وەك بەفری سارد بوو گووشی و بە دیواری دا خزیە خوار.

حەمەدیش دەسبەجێ بە بنەبانێ دا رۆیشتە خوارو چووە نێو لێڕەوار. بەکارامەیی رێچکە بزنێکی کە پێشتر شارەزای بوو، دیتەوەو کەوتە رێ، خێرا دەرۆیشت و ئەو ترسەی لەدڵی‌دا بوو سات بەسات زیادی دەکرد. فکرەکانی شێواوو تێکەڵ پێکەڵ بوون. تەنیاو بێ‌کەس و بێ‌پشت و پەنا لە نێو چواردیواری تاریکایی دا گیری کردبوو" لەگەڵ دنیایەك سەربازو لادێیی... کە هەموویان دژی بوون، کێو، بەرد، دێهاتی‌یەکان، دار، گیا، هەموو بوونەوەرەکان لە تەیری ئاسمانەوە تا مێروولەی سەر زەوی هەموویان لەگەڵی دوژمن بوون. ناهومێدی‌یەکی بەسام دنیای پێ تاریك کردبوو. بەرە بەرە تامەزرۆیی و ئەزرەتی بۆ دیتنی دێ‌یەکەیان زیادی دەکرد. هەرچەند دەی‌زانی ئەگەر بچێتەوە دێ چ چارەنووسێکی تووش دەبێ و گیانی بە سلامەت دەرنابا، بەلام بەو حالەش وەخت بوو لە تاو دێ‌یەکەیان شێت بێ:"دێهاتی‌یەکان چی‌یان بەسەر هاتوە؟ داخوا ئێستاش وەختی رێ‌وشوێنی جێژن درووەلانەکە دەسووتێنن و مام دورمووش عەلی لە حالێك دا لاقە پیرەلۆك و ماندووەکانی بلێند دەکا دیسان وەك جاران سەمای هالای دەکا؟ دایەحۆری هەروەك جاران تووڕەیە؟ ژنێکی سەیر تووڕەو تۆسن بوو. وەختێك قەلس دەبوو عەرز دەکەوتە لەرزین و عەرزو عاسمان ژێروزەبەر دەبوون. داخوا گای هەرکەس هی خۆیەتی؟ داخوا هەرکەس خاوەنی ئەو زەوی‌یەیە کە دەی‌کێلێ و دای‌دەچێنێ؟" لەو چەند ساڵەدا زۆر شت فێر ببوو، زۆر شت... ئەگەر یەکێك دە جاریش بێتە سەر دنیاو بژی، دیسان زەحمەتە بتوانێ بەقەد حەمەد لەم دنیایە ئەزموون کۆبکاتەوە.

عەلی‌سەفابەگ، عارف صائم بەگ و ئاغاکانی دیکەی چوکووراوا...

هەتا ماوەیەکی زۆر حەمەد نەی‌دەزانی ئاغاکان بۆ لەگەڵی دوژمنن. با عەبدی‌خانیشی کوشتبێ، خۆ عەبدی‌خان خزمی وان نەبوو، کەس و کاریان نەبوو... حەمەد ئازارێکی بەوان نەگەیاندبوو کە ئەوان سەرانسەری تووڕووسی لێ‌پڕ کەن لە جەندرمە. راستی‌یەکەی ئێستاش بەتەواوی بۆی روون نەبۆوە کە بۆچی ئاغاکان ئەوەندی لەگەڵ وی دوژمنن هێندە دوژمنایەتی‌یان لەگەڵ چەتەکان نیە؟ و تەنانەت ئاگاشیان لە هێندێك لە چەتەو رێگرەکان هەیە؟ باشە دەڵێین ئاغاو خانەکان هەقی خۆیانە، بەلام دێهاتی‌یەکان بۆ؟ لە دڵی خۆی‌دا

گوتی:"دەتوانم بچمە کوێ؟ هەموو دەوروبەری فورات، هەموو عێلاتە کوردە ناحاڵیەکان گەڕام، پەناگایەکم نەدۆزیەوەو هاتمەوە، دنیام لــێ وەدەنگ هاتوە، دیسان ئەمن و ئەو تووڕووسە پیرە ماوینەوە. هاتمەوە کە لە تووڕووس لەسەر خاکی باب و باپیرانم بمرم. بۆنی مردن بە بەرلووتم هەڵلادێ. مام ئومەتەزەرد! یاغییەك، یەکی وەك حەمەدۆك کە ئاغاو خانەکان بە پیاو نازانێ، کەس وەخۆی ناگرێ. کوێم هەیە بیچمێ مام ئومەت! تەیرێکی باڵ شکاوم، ئەگەر پڕ بە چنگێکیش بم، تەنانەت بڕکە چەقڵێك پەنام نادا...

لە جێگایەك دەگەڕا بۆی ڕابکا، بەڵام هیچ کوێی بە بیردا نەدەهات. جێیەکی نەدەهاتە بەرچاو. دەهری بوو:"چووینە ماڵی وەسمانەزلە خۆمان شاردەوە. پیاوێکی باش و ساغە، بەڵام منداڵێکە. ئارام و ئۆقرەی نەبوو. دەیەویست بە هەموو کەس بڵێ کە ئەمن لە ماڵێ ویم. دیسان ماڵی دایەقەمەر ئاوەدان بێ... ئەگەر لە دەشتی چوکووراوا دەگیر جەندرمە کەوتبایەم، ڕزگاربوونم مەحاڵ بوو، ئەودەم خان و ئاغاکان جێژن و زەماوەندیان دەبوو."

لەسەر ڕێچکەبزنێکی نێو لێڕەوار بەو نیوەشەوە ڕاوەستا. بۆکوێ چووبا؟ جێیەکی نەبوو بۆی بچێ، بچێتە کام لا؟ چەند لەحزە لەو تاریکاییەدا لە جێی خۆی ڕاوەستا. بیری لە زۆر مەسەلە کردەوە، فکری جۆراوجۆر بە خێراییەکی باوەڕپێنەکراو بە مێشکی دا دەهاتن و تووشی یەکتر دەبوون. دایکی، خەجیج، منداڵەکەی، پوورەئیراز، وەسمانەزلە... دەهاتنەوە بەرچاوی... هەرکە وەسمانەزلەی وەبیر هاتەوە، تیشکێکی هیوا لە دڵیدا درەوشا. ئەمجار کەریم ئۆغلی و جەباریش هەبوون... جەبار ئازاو جوامێر بوو... ژنی هێنابوو، دوومنداڵیشی هەبوون. کوڕێك و کچێك. ئەگەر بچێتە ماڵی جەبار؟... بێگومان ئەویش لەژێر چاوەدێری دایە، وەسمانەزلە و کەریم ئۆغلییش هەروا... چیا ئیدی بۆ مانەوە نەدەبوو. ئەی بچێتە کوێ؟

لەو نزیکانە دەبوو ئەشکەوتێك هەبێ. زۆریشی نەمابوو ڕۆژ بێتەوە و خەریك بوو دنیا روون بێتەوە. بۆلای ئەشکەوتەکە وەڕێکەوت. وەختێك دنیا رووناك بوو، ئەو گەیشتە ئەشکەوتێك کە لەنێو بەردەلانێکی بەرزدا بوو. دوو هەڵۆ لەبەر زارکی ئەشکەوتەکە بوون. لە هەردووبەری زاری ئەشکەوتەکە دارەبەنێك شین ببوو. حەمەد چووە ئەشکەوتەکە. دوو هەڵۆ ماندووەکە بە بێوازی باڵیان کردنەوەو هەڵفڕین و ئەولاتر نیشتنەوە.

حەمەد تفەنگەکەی لە شانی دەرهێنا. قایشەکەی لە دەستی هاڵاندو لەسەر عەرزی داناو هەرکە توورەکە فیشەکەکەی لەسەر تفەنگەکە دانا، خەوی لــێکەوت.

لای رۆژئاوایە وەخەبەر هات. برسی و تینوو بوو. هەوا بۆنی جاترەو پەریوەشانی لێدەهات. پێش ئەشکەوتەکە لە گوڵاڵەدا ون ببوو کە بەسەر شاخە بنەوشەیی‌یەکانی ئەشکەوتەکەدا بەو پەڵە ڕەش و سپی و سەوزانەوە داوێنی ڕاخستبوو. گوڵاڵەکان ئەوەندە سوور بوون کە بنیادەم باوەڕی نەدەکرد.

حەمەد تا ئێستا هەرگیز ئەوەندە گوڵی سووری لە جێیەك نەدیبوو. ئەم گوڵە سوورانە وەك گڕی ئاگر لە دووریشەوە دەکرا بیان بینی و بیان ناسیەوە. تفەنگەکەی بە شانیدا کرد. توورەکە فیشەکەکەی بەدەستەوە گرت و لە ئەشکەوتێ وەدەرکەوت. هەڵۆکانی بەیانی دووبارە هاتبوونەوەو لەسەر دەرکی ئەشکەوتەکە هەڵنیشتبوون، بە بێوازی هەڵفڕین و دە هەنگاو ئەولاتر بە جووتە لەسەر لووتکە شاخێك نیشتنەوە. هەڵۆیەکان زۆر پیر بوون. لە خوارەوە کانییەك بە خوڕەخوڕێکی نەرم دەڕۆیشتە خوار. حەمەد چووە خوار، هاتە سەر کانییەکە، لەسەر ئەو پنگەڵە بڵێندە کە گوڵی بنەوشەیی دەرکردبوون دانیشت. ئەو بوخچەیە کە ئومەتەزەرد دابووییەو لە پشتێی بەستبوو کردیەوە. چوارپێنج پیواز، شەش هێلکە، تۆراغێکی زۆرو سەلکە پەنیرێکی چەوری تورکمەنی و نانێکی زۆری تێدا بوو. بە ئیشتیا نانەکەی خوارد. ئەم توێشووە بەشی دوو ڕۆژی دیکەشی دەبوو. حەمەد پیاوێکی زۆرخۆر نەبوو. بەتایبەتی کاتێك دڵیتەنگ بایە زگی خۆی هەر وەبیر نەدەهاتەوە.

حەمەد هەستا، بەرەو شیمال وەڕێکەوت. بەنیازی دێیەکەی خۆیان بوو. دێیەکەی دێنایە بەرچاوی خۆی و ئاوری ئەزرەت لە هەناوی دا هەڵدەگیرساو دەیسووتاند و دەیتواندەوە، دەیزانی بە لاقی خۆی بەرەو مردن دەچێ، بەڵام نەشی دەتوانی نەچێ، دەبوو گوندەکەیان ببینێ:"ناکا پێش ئەوەی بیبینمەوە بمرم." ئارەزووی دیتنی هەموو شتێکی هەبوو: چنارە ئەستوورەکە، تافگەی چنارە گەورە، سمایلەزلە، ئاشی سمایلەزلە، گۆمی بن چنارە گەورە، جادەی ئاوایی بە خاکە خەنەیی‌یەکەیەوە، خاردەشتی پڕ لە چەقڵەشینکە، خانووەکان، خاکی پڕ نەخش و نیگاری، ئەو بەستێنە کە چۆم لە دەوروبەری دێی دروستی کردبوو، دارەکان، چڵە دڕکەکان، کەنگرەکان، مریشکەکانی ئاوەدانی، ئەو جووجیلانە کە وەك گلۆڵەموو کەوتوونە دوای مریشکە کورك،... ئارەزووی دیتنی هەموو شتێکی دێی هەبوو.

دوورمووش عەلی بەو ڕوانینی گەرم و پڕ خۆشەویستی، بەو چاوە دۆست و پڕلە سۆزو میهرەبانی‌یانەوە و زۆر ئینسان... دایەحۆری زۆر ئینسانتر، زۆر... زبرو کەللەڕەق، بەڵام

ئینسانتر لە هەمووان کە ئامادەیە گیانیشی لە ڕێی ئەو کەسانەدا کە خۆشی دەوێن، فیدا بکا. جارێکیان وەختێك حەمەد نووستبوو، دایەحۆری دەستی بە سەری دا هێنابوو...

حەمەد هەرگیز ئەو دەستە گەرمانەی، ئەو دەستانەی کە گەرمی و میهرەبانی و سۆزو خۆشەویستیی دەستی دایك و خوشك و برایان هەبوو، لەبیر نەچووبوو. پیاو حازر دەبوو گیانیشی بدا بەو مەرجە جارێك دایەحۆری ئاوا لە ناخی دڵەوە دەست بەسەر سەری دا بێنێ... خۆ ئەگەر ئەوەش نەبوایە، وا بە دڵەوە دەیگوت "کوڕم، حەمەد" هەموو دنیای دێنا. داخوا چۆن لەگەڵ حەمەد بەرەوڕوو دەبێ؟ لە خۆشیـیان خەریك بوو شێت بێ. نەیدەزانی دەبێ بڵێ چی و چ بکا. مستەفا چووبووك، مام حەسۆ، وەختێك مام حەسۆ چاوی پێیکەوت چ دەکا؟حەتمەن هەروەك هەموو جارێك بە سەرسوڕماوی ڕادەوەستێ و لە حاڵێك دا لە خۆشیـیان دەستەکانی ڕێك دەخشێنێ، بە شانازیـیەوە دەڵێ:" حەمەد تۆزێکی دیکە گەورە بووە، با گەورەتر ببێ. پیاوی بەسام و هەیبەت باشتر دەتوانێ چەتەیی بکا، هەموو عالەم لێی دەترسن. هەر ئەوانەی ئێستا لە حەمەد دەترسن ئەودەم ئیدی زراویان لێی دەچێ."ئەدی مستەفا، ئەو چیی دەکرد، چیی بە بیردا دەهات، داخوا ترس سواری دەبوو؟ دەچوو خەبەر بە جەندرمە بدا؟ ئەویش ژنی هێناوەو منداڵێکی هەیە. ئەگەر جەبار بزانێ دێتە لای؟ حەمەد زەردەیەکی کرد و بە باوەڕێکی پتەوەوە گوتی"دێ" ئەدی عەلیـیەشەل بەو چاوانەوە کە وەك چاوی ڕێوی بەهۆش و زیرەکن، بێئەنداز ئینسان و دۆستێك و برایەکی گیانی بە گیانی.. داخوا ئەو چۆن لەگەڵی بەرەوڕوو دەبێ؟ سەری دەباتە پشتەوەو پێدەکەنێ. بێپسانەوە وەك ئاوی کانی پێدەکەنێ، هەموو لەشی دەکەوێتە پێکەنین، دەستی، روخساری، چاوەکانی، لەشی، سەری و تەنانەت لاقە شەلەکەشی پێدەکەنێ و لە خۆشیـیان شێت دەبێ...

حەمەد نوقمی ئەوین و خۆشەویستی لەنێو تۆفانێکی خۆشحاڵی دا دەفڕی. ئەوەندە خێرا دەڕۆیشت کە دەت گوت لاقەکانی باڵیان لێڕواوە. بیری لە هیچ شتێکی ناخۆش نەدەکردەوە، تەنانەت لە فکری ئەوەش دا نەبوو کە دێ پرە لە جەندرمەو دەکوژرێ. بگرە ئەوەشی بە زەین دا نەدەهات کە ئەگەر نەش کوژرێ لانی کەم تووشی وەزعێکی دژوار و ناخۆش دەبێ. دەستی کردبوو بە گۆرانی گوتن. زۆر کەم ڕێدەکەوت گۆرانی بڵێ. چونکە دەرفەتی ئەوەی نەببوو... دەنگێکی خۆش و دڵگیری هەبوو.

خەریك بوو هەتاو بکەوێ کە گەیشتە"ئووزوون ئولووك". لەنێو ئاوی ئووزوون ئولووك دا ماسیـیە سوورە خاڵدارەکان مەلەیان دەکرد، بە جۆرێك ئەگەر دەستت درێژکردبایە دەت توانی

بیان گری. لەبەر هەر هۆیەك بوو کەس خۆی لە ماسیيەکانی ئووزوون ئوولووك نەدەگەیاندو لە ناکام دا هەمیشە لە زیاد بوون دا بوون. لەسەر کانیيەکە دانیشت، توێشەبەرەکەی لەپێش خۆی دانا، بە مست پێوازێکی پلیشاندەوەو بە نانی فەتیر دەستی بە خواردنی کرد. جارجاریش ورتکەنانی بۆ ماسیيەکان دە ئاوێ دەکرد و سەیری دەکردن کە چۆن بە کۆمەڵ هێرش دەکەنە سەر کوتە نانەکان و تێکەوە داوێن.

بە کاوەخۆ نانەکەی خوارد، تەماشای ماسیيەکانی کردو هەر لەوێ ڕاکشا. لە منداڵیيەوە ئۆگری ئەم کانیيە بوو، لەبەر هەرچیيەك بوو لەم دەوروبەرە هەستی بە ترس نەدەکرد. ڕاست وەك سەردەمی منداڵی بێترس و دڵەخورپە لەنیزیك کانیيەکە خەوی لێکەوت. لەو وەختەوە کە یاغی ببوو و چووبووە کێوان تا ئێستا خەوی وا قووڵ و ڕەحەتی لێنەکەوتبوو. وەختێك وەخەبەر هات بۆخۆشی پێی سەیر بوو. بەڵام هەرچی بێ، ئێرە خاکی باب و باپیرانی بوو، جێگایەکی ئاشنا بوو.

شەپۆلی خۆشحاڵی لەدڵی هەڵدەستاو گیان و لەشیی لە باوەش دەگرت. بەبێسەبری چاوەڕوان بوو تاریك دابێ. هەر دنیا تاریك بێ دەچێتە نێو ئاوەدانی و دەچێتە دەرکی ماڵێ دایەحۆری و دەڵێ:"دایە، دایە، هاتمەوە." داخوا دایەحۆری بە دەنگیڕا دەیناسێتەوە، یان نا؟" بابە، ئەو زۆر بەهۆشە!"

لەنێو لێڕەوار دا بە ئەسپایی دەڕۆیشت. لە ڕێی لێڕەوارەوە گەیشتە بنارێك کە بەسەر ئاوەدانیی دا دەڕوانی. لەبن تاتەبەردێکی بڵیند دەستی بە تەماشای ئاوەدانی کردو بە دیتنی، بیرەوەریيەکانی رابردووشی زیندوو بوونەوە. وەبیری هاتەوە کە بە منداڵی وەختێك لە دایکی زیز دەبوو، لە ماڵێ رای دەکردو دەهاتە بن ئەم تاتەبەردە دادەنیشت و لە حاڵێك دا پاڵی بەو بەردە دووکەڵاویيەوە دەدا تەماشای نێو دێی دەکردو لە فکرەوە دەچوو. ئەم تاتە بەردە بڵیندە لەگەڵ جاران هیچ فەرقی نەکردبوو. هەروا دووکەڵاوی بوو. جووتیارو شوانەکان حەزیان دەکرد لە بن ئەو تاتە بەردە ئاور بکەنەوە. حەمەد لە نێو دێی جەندرمەکانی دی کە هاتوچۆیان دەکرد، ئەمجار ماڵەکەی خۆیانی لەنێو ماڵەکانی ئاوایی دا ناسیەوە، گڵی سەربانەکەیان سوورو سەوزو شین و نارنجی بوو، کە لە بن تیشکی گەرم و سپی دا وەك وردە شووشە دەدرەوشا. بۆ ئەوەی بانەکەیان قایم بێ، بابی ئەو گڵەی لە جێیەکی زۆر دووڕڕا هێنابوو. دایکی جوان و میهرەبان و مولایم و گەرم و پڕسۆزی هاتەوە بەرچاوانی و بە جۆرێك خۆی تەنیاو بێکەس دی کە هەرگیز لەسەرانسەری ژیانی دا وای هەست نەکردبوو. دەوروبەری بە گوڵی پشکووتووی

"ئاسفووندل" داپۆشرابوو. هەزاران هەنگی جۆراوجۆر بە گرمەگرم لەبەر سپیەگەرما (حەمەد زۆری حەز لە وشەی "سپیەگەرما" دەکرد)، بەدەوری گوڵەکان دا دەسووڕان. سەرتلۆفکی لکە باریك و بڵیندو چڕەکان گوڵێکی سپیی بە قەد دوگمەیەکیان پێوەبوو.

تەماشا ماڵێ خەجیجێی نەدەکرد. توانای دیتنی ماڵەکەی وان و دارە بەرزەکەی بەردەرگایانی نەبوو. بەڵام سەرەنجام خۆی پێ ڕانەگیرا، دارەکە هات و راست لە بەرچاوی شین بوو. وەك شەوێکی بێبڕانەوە بەرامبەری راوەستا..." دڵی تازەلاوێك بە توندی لێی دەدا، دەنگی دڵی وەك دەنگی قومری وابوو، لاوەکە لەنێو تۆفانی شێتانەی چاوەکانی دا لەبن دارەکە وێستابوو، کیژۆڵە هات، ناسك و گەرم و بە دڵێکی پڕ لە ئەوینەوە..." شتێك بەری گەرووی حەمەدی گرت و دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوەکانی هەڵوەرین.

حەمەد بۆ هاتنەدەر لەم حاڵە چاوی لە خانووی عەبدیخانەوە بڕی. دووکەڵێکی خەست لە کولاوکەی ماڵەکەیان هەڵدەستا. سەرانسەری گیان و لەشی رق دایگرت. حەمەد بە دەنگێك کە دەت گوت دەناڵێنێ، گوتی:"ئەم توانی وەجاخی کوێر بکەمەوە، ئەم توانی ئەم توانی." بەو ئازارەوە کە هەناویی پڕ کردبوو، هەستاو کەوتە رێ. ئەختێك دواتر وەخۆی هاتەوەو زەردەیەکی هاتێ. بە رۆژی رووناك خەریك بوو دەچووە نێو دێیەك کە پڕ لە جەندرمە بوو! وەختێك دەگەڕایەوە بن تاتە بەردە بڵیندەکە، ئەختێك ئەولاتر لە پشت چڵە دڕکێکەوە چاوی بە چاوی زیت و بریقەداری کوڕیژگەیەك کەوت. منداڵەکە بە حەبەساوی چاوی تێوە بڕیبوو. زەردەیەکی هاتێ، ئەویش وەختێك منداڵ بوو، بە رۆژی رووناك دەهات لە بن ئەو چڵە دڕکە دەخزاو تەماشای ئەو رووداوانەی دەکرد کە لە بن تاتە بەردە گەورەکە روویان دەدا. تەنانەت جارێکیان هەر لە بن ئەو چڵە دڕکە خۆی شاردبووەوەو بە دزی چاوی لە ئاشقێنیی سولەیمان لەگەڵ کچی "تووپال ئانشاجان" کردبوو. بەڵام هەرگیز لە بن ئەو چڵە دڕکەوە بە دزی تەماشای یاغییەکی نەکردبوو. کێ دەیزانی تەماشا کردنی چەتەیەکی وردیلانەی دووربین لە مل بە خەنجەری چەرکەسی و جووتێك فانووسقەی زیوکاری کراو لە بن فیشەکدانانەوەو بە نارنجۆکەوە چ کەیف و لەزەتێکی هەیە.

حەمەد لە جێی خۆی راوەستابوو و بە میهرەبانییەوە تەماشای منداڵەکەی دەکرد. منداڵ کە تێگەیشتبوو چەتەکە دیویەتی، دەست و پێی خۆی ون کردبوون و خەریك بوو خۆی دەدزیەوە.

حەمەد بە دەنگێکی پێکەنیناوی و نەرم و میهرەبانەوە گوتی:

"کاکە چووکەڵە بە جەندرمەکان مەڵێ کە منت دیوە. ئەمن حەمەدۆکم."

حەمەد هێندەی روانینی بەدزیی منداڵەکە لە پشت ئەو چڵە دڕکەوە پێخۆش بوو کە تەنانەت ئەوەشی بۆ گرنگ نەبوو کە لەوانەیە منداڵەکە بچێ و خەبەر بە خەڵکی ئاوەدانی بدا. حەمەد بە دیتنی دێیەکە بە جۆرێك کەیفی بزووتبوو کە یاغی بوون و حەمەدۆك بوونی خۆی و ئەو حکوومەتە بەهێزەی کە بۆ گرتنی کێو و بەندەنی پڕکردبوو لە جەندرمەو برایمەڕەشی نۆکەرو بەکرێگیراوی ئاغایان کە بە خوێنی سەری تینوو بوو، و هەموو کەس و هەموو شتێکی لەبیر چووبووەوە. سەرانسەری وجوودی پڕ بوو لە دۆستایەتی، شادمانی و هومێدێکی منداڵانە. دڵ نەرمی و سۆزێکی گەرم دایدەگرت. بە جۆرێك کە لە نەکاو لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئەمن تەنانەت ناتوانم باڵندەیەکیش بکوژم، ناتوانم مێرووڵەیەکیش لە بن پێم دا بپڵیشێنمەوە، ناتوانم مێشێك و پەپوولەیەك و باڵندەیەك بگرم، نەوەك پێی ناخۆش بێ." لەو کاتەدا رەنگە لە دنیادا شتێك کە لە هەمووانی پێ سەیرتر بووبێ. تفەنگی دەستی و خەنجەری بەر پشتێنی و ئەو فیشەکدانانە بووبن کە لە خۆی دابوون. بە خۆی پێدەکەنی.

لەو بەینەدا منداڵەکە کە لە دەست روانینی حەمەدۆك رزگاریی ببوو، وەك رێوییەك لە بن چڵە دڕکەکە هاتە دەرێ، چەند هەنگاوێك بە کۆمەکۆم لە دڕکەکە دوور کەوتەوەو بە لینگدان هەڵات. بە دەم راکردنەوە بەردەوام ئاوڕی دەدایەوەو تەماشای حەمەدۆکی دەکرد. حەمەدۆك ئەم کارەی منداڵەکەی لە هەمووی پێ خۆشتر بوو. ئەو منداڵە کێ بوو؟ وەك ئەندامانی کام بنەماڵە دەچوو؟ چونکە زۆر لە قەڵافەتی منداڵەکە ورد نەببووەوە، نەیدەتوانی بۆی بچێ کە رەنگە منداڵی چ کەسێك بێ.

هەتاو دەت گوت نیازی ئاوابوونی نیە، بەرە بەرە حەوسەڵەی بەسەر دەچوو. لە رۆژنەی ماڵێ عەبدیخان لە پەستا دووکەڵ بەرز دەبوو. جەندرمەکان لێکدا لێکدا لەدێی دا بە نێو ماڵەکان دا هاتوچۆیان دەکرد. خەڵکی دێی کەس بە دەرەوە نەبوو، نە ژن، نە پیاو، نەمنداڵ. داخوا هەموویان زیندانی کردبوون؟ فکری لەو دووکەڵە دەکردەوە کە لە ماڵی عەبدیخان هەڵدەستا. هەر ئەم عەبدیخانە بووە هۆی ئەوە کە نەتوانێ بچێتەوە دێیەکەی خۆی و تەنانەت پێ بنێتە خاکی باب و باپیرانی خۆی. لەحاڵێك دا ددانی لە چیڕەوە دەبردن، هاواری کرد:"وەجاخی کوێر دەکەمەوە، نایەڵم یەکیشیان زیندوو بێ، تەنانەت یەکیشیان..."

خۆی لە بن تاتەبەردەکە خلۆر کردەوەو پشتی لە بەرد درا. رۆژ بە گەرمای هەتاو سووتاو تاریکایی شەو داهات. بایەك لە شیمالەوە هەڵی کرد، کە بۆنی قورسی پنگی کێوی و جاترەو پەریوەشانی لەگەڵ خۆی هێنا.

ئەو شەوەی وەبیر هاتەوە کە نایب رەجەب دەیەویست منداڵەکانی عەبدی بکوژێ، و حەمەد راست لەو لەحزەیەدا کە نایب دەیەویست دەست لەسەر پەلاپیتکە دابگرێ شەقی لە تفەنگەکەی هەڵدابوو و گوللەکان لە نیشانە نەدرابوون. داخوا بێکوشتبان باشتر نەبوو؟ منداڵەکان چ تاوانێکیان هەبوو. داخوا ئەوانیش وەختێك گەورە بوون، وەك بابیان نابنە بەلای گیانی ئەو خەڵکە؟ با گەورە بن بزانین. لە کۆنەوە گوتوویانە "گیا لەسەر پنجێ خۆی دەڕوێتەوە." بەڵام ئەمە تیۆرییەکی تەواو ناڕاستە. بیری لە رابردوو دەکردەوە، لە عەبدیخان، لەوەکیل باشی عاصم، لە یاوەر فارووق، لە زۆر شتی دیکە. خەجیج یاوەر فارووق کوشتبووی. وەختێك یاوەر فارووقی وەبیر دەهاتەوە، رقێکی وەك ژەهر تاڵ لە دڵی دا دەکوڵی و مووی لەشی دەبوونە نەشتەر. پێش کوشتنی فارووق و ئەستاندنەوەی تۆڵەی خەجیج نایەوێ لەم دنیایە بڕوا. "خوایە، ئەی خوای گەورە، هەتا فارووقم نەکوشتوە، مەرگم بە نسیب مەکە."

هەستایە سەرپێ. لە حاڵێك دا وەك سەرخۆشان بەلادا دەهات، شۆڕ بووەوە بۆ نێو دێ. لە پڕ دیسان دڵی پڕ بوو لە شادی. لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئەمساڵ پاییزێ دێمەوە دێی. ئەو رۆژە کە جووتیارەکان دەیانەوێ زەوییەکان وەرد بیرن. لەرێوشوێنی جێژن دا بۆخۆم لەگەڵ دایەحۆری یەکەمین ئاگر لە دڕووەڵان بەردەدەم..." هەتا لە دێی نیزیکتر دەبووەوە، لێدانی دڵی زیادی دەکرد.

لەبەر دەرگا راوەستا. نەیدەتوانی خۆی بەسەر پێوە رابگرێ. ئەگەر پاڵی وەدەرکەی نەدابا، دەکەوتە سەر عەرز. لە کاتێك دا هەناسەی گیرابوو، بە دەنگێکی پچڕ پچڕ گوتی:"دایەحۆری، دایەحۆری!"

دایەحۆری بە تەنیا لە ژوورێ بوو، خەریك بوو خەوی لێبکەوێ. پێی وابوو گوێچکەی زرینگاوەتەوە، یان خەون دەبینێ. چاوێکی هەڵێناو لەسەر یەکی دانانەوە.

حەمەد بیری کردەوە:"حەتمەن دایەحۆری پێی وایە ئەمن مردووم." "دایەحۆری، دایەحۆری!"

دایەحۆری دیسان بەو خەیاڵە کە خەون دەبینێ، چاوێکی هەڵێنا، لەبن لێوانەوە دوعایەکی خوێندو چاوەکەی لەسەر یەك دانایەوە.

"دایەحۆری، دایەحۆری، ئەمنم هاتوومەوە."

"خوایە، خوایەگیان، دەڵێی خەون نیە، دەنگەکە لە پشت دەرگاوە دێ، وەك دەنگی حەمەدۆك دەچێ، بەڵام مومکین نیە."

"دایەحۆری، دایەحۆری!"

"با هەستم تەماشایەکی بەردەرکەی بکەم." لە جێی خۆی هەستا. لە نێو خەو و بێداریدا بزووتە سنۆبەرێکی داگیرساوی بە دەستەوە گرت، چووە پاش دەرگاو بە دوودڵییەوە بانگی کرد:"کێیە؟"

حەمەد بەسپایی، بە دەنگێك کە بە زەحمەت دەبیسترا گوتی:

"ئەمنم دایە، دەرگام لێبکەوە، حەمەدۆکم، کوڕی دوونە."

دایەحۆری دارگەڵەکەی راکێشاو دەرگا کرایەوە. حەمەدۆك لەبەر دەرگا راوەستابوو. زمانی رەق بوو. نەیتوانی یەك وشەش قسە بکا. چەند لەحزەیەك هەروا بەرەوڕووی یەکتر راوەستان. پاشان حەمەد دەستی دایە بن پیلی دایەحۆری و بردیە ژوورێ. ئەو بزووتەی بەدەستیەوە بوو، لەدیواری دا، دایەحۆریی لەسەر دۆشەکێك کە لەبەر ئاگردانەکە راخرابوو، دانیشاند. ماوەیەکی زۆر هەردووکیان بێدەنگ بوون. پاش ماوەیەك دایەحۆری کە هاتبووەوە سەرخۆ زۆر بەگەرمی گوتی:

"بەخێر بێی کوڕم، حەمەد. کاری چاکت کرد هاتی. ئەمن پێم وابوو ئەتۆ رۆیشتی و بێسەروشوێن چووی، کوڕم بەخێر بێی، بەرەکەتت هێنا. دێ پڕ لە جەندرمەیە."

حەمەد گوتی:

"دەزانم."

"وەختێك دەهاتی، کەس نەیدیتی؟"

"منداڵێك دیتمی."

راست لەو دەمەدا لەبن "تاتەبەردەگەورەکە" پەیتا پەیتا دەنگی تەقە بەرز بووەوە.

"دایە جەندرمەکان ئەو تفەنگانە بە منەوە دەنێن. منداڵەکە ئەمنی لەبن ئەو تاتەبەردە دیبوو..."

دایەحۆری پێکەنی و گوتی:

"با بهاوێن، با فیشەکی ئەو حکوومەتە کافرەی بە فیڕۆ بدەن، با بەفیڕۆیان بدەن."

حەمەدیش پێکەنی. زۆر شت بوون دەیەویست لە دایەحۆرییان بپرسێ، بەڵام بە هیچ جۆر نەیدەتوانی بپرسێ. دەیەویست بپرسێ، دورمووش عەلی لە کوێیە؟ ـ ئەگەر مردوە بۆچی

دایەحۆری چارشێوی رەشی بە خۆیدا نەداوە؟ - داخوا هەموو ساڵێ درووەڵانەکە ناگر تێبەردەدەن؟ لەو رۆژەوە تا ئێستا جووتیارەکان بێئەوەی کەس ئازاریان بدا کشت و کاڵی خۆیان دەکەن؟ لە ترسی ئەوەی نەکا رووداوێکی ناخۆش لە دێی دا هاتبێتە پێش، نەیدەوێرا پرسیار بکا، بەڵام لەبەر نیگەرانییش خەریك بوو زراوی دەچوو. ئەگەر مانگێکیش چاوەڕوان باو ئەگەر بە چاوی پرسیارەوە مانگێکی دیکە لە چاوی دایەحۆرییەوە رامابایە دیسان نەیدەتوانی یەك وشەش چیە پرسیار بکا.

دایەحۆری چاوی لە چاوە کەم حەوسەلەو پڕپرسیارەکانی هەبوو، بەڵام بەهیچ جۆر زمانی بۆ گێڕانەوەی خەبەرە ناخۆشەکان نەدەکرایەوە. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"بەستەزمانە ورد بووە، تواوەتەوە، خەلاس بووە، دایکی و خۆشەویستەکەی کوژران. منداڵە تاقانەکەی کە تەنانەت پڕی چاوان تەماشاشی نەکردوە، کەس نازانێ لە کوێیە. دایەحۆری ئەگەر بەستەزمانە ئەو خەبەرە ناخۆشانەش ببیسێ، ئیدی چیی بەسەر دێ؟"

تەماشای چاوە خەمگینەکانی حەمەدۆکی دەکرد:"پیاو ناش توانێ نەیانڵێ، رەبی بە قوربانتان بم بڕواننە قەڵافەتی. دەڵێی منداڵە مەمکیان لە زاری دەرهێناوە. هێندەی نەماوە لێوان بکا، چڵمی هەڵلووشێو دەست بکا بە گریان."

"دەڵێم کوڕم، دەڵێم. دڵم بووەتە بەرد، بووەتە ئاسن. هەموو شتێکت پێ دەڵێم. شتی وات بۆ باس دەکەم کوڕم کە ئەگەر ئاسن بایەم دەتوامەوە، دەڕزیم. بەڵام بوومە بەرد، بوومە بەردی رەق و تەحەممولم کرد. بەڵام ئەتۆ بۆ دەتەوێ ئەو هەموو بەدبەختییە، ئەو هەموو بەڵایە ببیسی و تەحەمولی بکەی، بۆ کوڕم. بۆ؟ کوڕم بریا نەهاتبای. ئەتۆ کە وەك هەوری باران، وەك هەورێکی رەش سەری خۆت هەڵگرت و لەم دێیە رۆیشتی، بۆ هاتیەوە کوڕم؟ یەکێك گوتی چووی رەگەڵ چل سوارەی غەیبی کەوتووی، یەکێك گوتی چوویە لای مستەفا کەمال پاشا بوویە فەرماندەری سوپاکەی، یەکێك گوتی بوویە تەیرێکی گەورە هەموو شەوێ دەچیە سەر گڵکۆی دایکت و هەتا بەری بەیانی لەسەر قەبری دوونە چەرخان دەدەی و بە زمانی باڵندان دوعای بۆ دەکەی. لە سەر گڵکۆی خەجیجیش هەروا... بۆ هاتیەوە کوڕم؟ چۆنت پێ بڵێم کە لەم دێیەدا چ رووی داوە؟ تەماشای سەرم کە داخوا دەتوانی تاڵە موویەکی رەشی تێدا وەبینی؟ تەماشای روخسارم کە، دەتوانی جێی بێ چرچ ولۆچی تێدا وەبینی؟ وەختێك دەڕۆیشتی ئاوا بووم؟"

لە حەمەدی‌یەوە رامابوو و لە دڵی خۆی دا قسەی دەکرد. حەمەد دەستەکانی بە جۆرێك کەوتبوونە هەڵپەو روخساری بە جۆرێك نارەحەت و پڕ ئازارو تێك چوو بوو کە دەت گوت ئەوەی بە دڵی دایەحۆری‌دا دێ، دەی‌بیسێ و هەستی پێ دەکا. دایەحۆری بیری دەکردەوە کە بە هەرحاڵ سەرەنجام هەموو شتێك تێ‌دەگا، کەسێك توانیویەتی ئەو هەموو بەڵاو کوێرەوەری‌یە تەحەمول بکا، دیارە توانای هەڵگرتنی باری ئەوی دیکەشی هەیە، ئەمجا ئەوە حەمەدۆکە، خۆ منداڵ نیە.

دایەحۆری وەختێك بڕیاری دا ئەوەی بووە باسی بکا، پۆرگی چەندین ساڵەی دڕا. بەگریانەوە قسەی دەکردو دەردی دڵی هەڵدەڕشت و باسی هەموو بەسەرهاتێکیشی بە رستەی "ئەگەر ئاسن بام دەڕزیم، بەڵام بوومە خۆڵ و تەحەمولم کرد" تەواو دەکرد. بۆ دوونە، بۆ خەجیج، دورمووش عەلی و منداڵەکانی گریاو پێی هەڵگوتن.

حەمەد بێ‌ئەوەی ئاڵوگۆڕێك بەسەر وەزعی سەروچاوی‌دا بێ، وەك بەرد، وەك دیوارێك رەق رامابوو، گوێی دەدایە قسەکانی دایەحۆری. لەدەرێ دەنگی تەقە دەهات، بەڵام ئەم دووانە لە وەزع و حاڵێك دابوون دەت گوت گوێ‌یان لەهیچ نیە.

دایەحۆری پاش شیوەن و گریانێکی زۆر فرمێسکی چاوی و ئاوی لووتی بە لکی چارشێوەکەی سڕینەوەو لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

"خوا بم کوژێ کوڕم. لە خۆشیی تۆ لەبیرم چوو کە لە ڕێی دوورەوە هاتووی. خوا حۆریی بەخت رەش بکوژێ. لە برسانم کوشتی."

دەسبەجێ چوو سفرەی هێناو لە پێش حەمەد لێکی کردەوە. سفرەیەکی دەزووی جوانی پڕ نەخش و نیگار بوو. پیاڵە ماستێك و شیلەیەك و نەختێك هەنگوین و کەمێك پەنیری هێناو گوتی:

"ئەدی کوڕم، دایەحۆری بە قوربانت بێ... ئێ، دەبڵێ بزانم لەکوێ بووی. ڕۆیشتی و بە جارێك خۆت ون کرد. چوویە کوێ؟"

حەمەد وەڵامی نەدایەوە. گێژو حۆل بوو و روخساری وەك بەردی رەق وابوو.

پاروەە نانێکی لە شیلەکە هەڵکێشاو پاشان لە ماستەکەی دا، پارووی لە زاری خست و دەستی کرد بە جوینی، بەڵام نەی‌توانی قووتی بدا. پاروو بە گەرووی دا نەدەچوو. ئەوەندە روون بوو کە دورمووش عەلی بە مردنی خۆی نەمردبوو، بەڵکوو کوشتبوویان، بەڵام چۆن؟ پێ‌هەڵڵا گوتنەکەی دایەحۆرییش شتێکی روون نەدەکردەوە. تەنیا ئەوەندەی لێ‌دەرکەوت

کە:"دێهاتی‌یەکان لەگەڵ دایەحۆریت بوونە دوژمن،ماڵێ هەموو دێهاتی‌یەکان تالاّن کراوە."
کێ ماڵی دێهاتی‌یەکانی تالاّن کردبوو؟

ئەگەر پارووەکەی قووت نەدابایە، دایەحۆری نارەحەت دەبوو. دووبارە دەستی کردەوە بە جوین، سەرەنجام بە زۆر قووتی دا. بەلاّم کۆخەیەکی سوار بوو چ کۆخەیەك، دەت گوت قەت نابڕێتەوە. پاش ئەوەی کۆخەکەی نیشتەوە دەستی دایەحۆریی کە وەك ئاگر داییسا، گرت و گوتی:

"دایە، هەموو شتێکم پێ بڵێ. چارە نیە دەبێ هەموو شتێك تەحەممول بکەین. نانەکەم بە گەروودا ناچێتەخوار. نانەکەت ئەگەر زەهریش بایە دەم خوارد، بەلاّم بە گەرووم دا ناچێ."

دایەحۆری بە ئارامی، هەروا بزانە هیچ نەبووە ددانی بە جەرگی خۆی دا گرت و دەستی بە قسان کرد:

"کوڕم حەمەد، هەرکە ئەتۆ لە دێی وەدەر کەوتی... دێهاتی‌یەکان خۆشحاڵ بوون، بەلاّم دوایە ترسیان ڕێ نیشت. ئەوان پێ‌یان وابوو عەبدی نەمردوە، بەلاّم دوایەکەی تێ‌گەیشتن کوژراوەو ئەویش بە گوللەی وەرەندیل کە سەر دڵی گرتوە. زۆر حۆشحاڵ بوون. پاشان خەڵکی هەر پێنج گوندی خاردەشت کۆبوونەوە، جێژنیان کرد، جێژنێك کە ئەوەتا دنیا دنیایە شتی وای تێدا نەبووە. کچۆلاّن جوانترین جل و بەرگی خۆیانیان لەبەر کرد، پیرێژنان چارشێوی سپی‌یان لەسەر نا، چارشێوی سپیی وەك بەفر، دەهۆڵ و زوڕنا لێ‌درا، بوو بە سەماو هەڵپەڕینێك هەر مەپرسە. تەنانەت عەلی دورمووشی مامیشت بەو نەخۆشی‌یەی هەڵپەڕی. دوایەش بەیانی‌یەکی زوو پێش هەتاو کەوتن خەڵکی پێنج ئاوەدانی، ژن، پیاو، ساغ، نەخۆش و گەورەو چووك هەموو چوونە دڕووەلاّن و دڕووەلاّنەکەمان سووتاند. پێم وانیە هیچ بنیادەمێك تا ئەو ڕۆژە خۆشیی وای دیبێ. یەك دوو سالاّن وابوو، هەموو شتێك زۆرو زەوەند. شەوی ئەو ڕۆژەی دڕووەلاّنەکەمان سووتاند، لەسەر لووتکەی عەلی‌کۆ نوورێك دەرکەوت. سێ شەوو ڕۆژان لووتکەی عەلی‌کۆ لە نوور دا نوقم بوو، سێ شەوان سەری عەلی‌کۆ وەك ڕۆژ ڕووناك بوو. دێهاتی‌یەکان لەو بارەیەوە ئیدی خۆشحاڵ بوون. ساڵێك تێ‌پەڕی. ساڵی دواتر جێژنێکی باشترو جوانتریان گرت. دڕووەلاّنەکەش جوانتر دەسووتا! نوورەکەی سەر عەلی‌کۆش جوانتر دیار بوو، ساڵی سێهەم لەویش جوانتر...

جێژنێکی باش و حیسابی... عەلی دورمووش مەشخەڵی بەدەستەوە بوو هەڵدەپەڕی، دەزانی کە ئەو زۆر جوان هەڵدەپەڕی. بەدەم هەڵپەڕینەوە دەچوو ئاگر لە

دڕووەڵانەکە بەربدا. لەپڕ لەدوورەوە دەنگی سێ تفەنگان هات، تەماشای وێمان کرد دیتمان سوارێك لەنێو تەپ و تۆزدا وەك بریسکە دێ، گەیشتە جێ و ئەسپەکەی بۆ لای دورمووش عەلی لـێخوڕی کە لە پەنای پۆلە دڕوویەك ڕاوەستابوو. دورمووش عەلی کەوت، سوار ئەسپەکەی وەسەر دورمووش عەلی پەڕاندو لەبن چنگە ئەسپان دا شێلای. بە دوای وی دا دە سواری دیکە گەیشتنێ، چەکیان پێ بوو. ئەسپەکانیان بەرەو ژن ومنداڵ لینگ دان. ئەسپیان لینگ دان و تەقەیان کرد. زۆر ژن بریندار بوون، پێنج منداڵ کوژران، دوویان کچۆڵە بوون. مامە دورمووش عەلیت دوو ڕۆژی دیکە ژیا. زۆری سڵاو دەگەیاندی. گوتی بە کوڕەکەم بڵێن کاری چاکی کرد، هەرچەند ئاخرەکەی باش نەبوو، بەڵام کاری چاکی کرد. ئەدی کوڕم ئاوا، ئەو ساڵە دڕووەڵان نەسووتا. لەسەر عەلیکۆ نوور دەرنەکەوت. مامە دورمووش عەلییشت مرد. لە ئاخر هەناسەی دا هەر لە فکری تۆدا بوو. دەزانی ئەو سوارەی هات کێ بوو؟ هەمزە کەچەڵێك هەیە ها؟ برای عەبدی کە عەبدی لە دێی دەرکردبوو. هەتا عەبدی مابوو لەم دەوروبەرانە دیار نەبوو. وەبیرت هاتەوە حەمەد؟"

"وەبیرم هاتەوە دایە."

هەمزەکەچەڵ لەنێو دێی مایەوە. دەوروبەری پڕ بوو لە چەکدار، جەندرمەکانیش لەسەریان دەکردەوە. کارێکی کرد کە خەڵك سەد خۆزگەیان بۆ عەبدی خواست."

دایەحۆری بە سۆزی دڵەوە لە پەستا ئەو بەڵایانەی دەگێڕایەوە کە هەمزە بەسەر دێهاتییەکانی هێنابوو، دەیگوت و دەیگوتەوە، پاشان بێدەنگ دەبوو و ماوەیەکی زۆر لە حەمەدەوە ڕادەما.

هەمزەکەچەڵ برای هەقی عەبدیخان بوو. عەبدی خۆشی نەدەویست. بۆیە وەختێك دەبێتە پازدە ساڵە لە ئاسیاب چەشمە دەری دەکاو ڕێگای نادا بێتەوە خاردەشت. هەمزە کەچەڵ لەو کاتەوە تەنیا یەك جار دێتەوە خاردەشت، بەڵام دەسبەجێ دەیگرن و دەیبەنە لای عەبدیخان. بە دەستووری وی سێ شەو و سێ ڕۆژانی دارکاریی دەکەن و پاشانیش بە نیوەگیانی لە پشتی ئەسپێکی قایم دەکەن و وەك کەلاکە سەگێك لە خاردەشت فڕێی دەدەنە دەرێ. هەمزە کەچەڵ پاش ئەو دارکارییە سامناکە بێهۆش دەکەوێ. بنەماڵەی "یوورك" کە بە بێهۆشی دەیدۆزنەوە، پێی ڕادەگەن و پاش ئەوەی چاك دەبێتەوە ماوەیەك لەلای وان دەبێ بە شوان. پاشانیش لە دێیەکی نیزیك "تەل تەپە" دەبێتە وەرگێڕکە.

هەمزە، وەك عەبدی‌خان کورتەبالاّو خرپنە نەبوو. بالاّبەرزو چوارشانەو بەخۆوە بوو. بە خەبەری مردنی برایەکەی زۆر خۆشحالّ بوو، لەخۆشی‌یان نەی‌دەزانی چ دەکا. سێ‌ڕۆژان وەك سەرخۆشان بەنێو ئاوەدانی دا دەگەڕاو تووشی هەرکەس دەبوو، دەی‌گوت:"کاکمت کوشت" دوایەش ڕووداوەکەی لەبیر خۆی بردەوەو دیسان بووەوە بە وەرگێڕکە.

ڕۆژێکیان "پتراخ ئۆغلی" لە خاردەشتەوە هاتە سەردانی. پیاوێکی زۆربلێ و دەم هەراش بوو. هەر کە گەیشتە جێ پرسی:

"ئەتۆ پیاوێکی زۆر گەوجی. چما نەت بیستوە براکەتیان کوشتوە؟"

هەمزەکەچەلّ وەلاّمی دایەوە:

"بۆچی، بیستوومەو زۆریشم پێ‌خۆش بوو کە سەقەت بووە."

"پێ‌خۆش بوونەکەت بەجێی خۆی. چما نەت بیستوە دێهاتی‌یەکان زەوی‌یەکانیان لەنێو خۆیان دا دابەش کردوە؟"

"بۆچی، بیستوومە."

"ئەوەشت بیستوە کە هەموو سالێ جێژن دەکەن و دەچن دڕووەلاّنەکە دەسووتێنن؟"

"ئەوەشم بیستوە."

"ئەوە چۆن؟ ئەوەشت بیستوە کە لەسەر عەلی‌کۆ نوورێك هەلّدەبێ؟"

"ئەدی بیستوومە."

"دەزانی ژنەکانی عەبدی‌خان هەردووکیان بێوەژنن؟"

"دەزانم."

پتراخ ئۆغلی نەڕاندی:

"سەگباب، ئەگەر هەموو ئەمانەت بیستوەو دەزانی، بۆ لێرە شاگردی دەکەی، سەگبابی نەفام، ئەتۆ کە دەتوانی ببیە ئاغای خاردەشت، پاشایەتی بکەی، چۆن لێرە بوویە وەرگێڕکەو شاگردی دەکەی؟"

پتراخ ئۆغلی زۆر پیر بوو. هەمزە گوتی:

"ئەتۆ ڕاست دەکەی."

"ئێستا کە ئەمن ڕاست دەکەم، وەختێك کارەکان دروست بوون لەوێ زەوی‌یەکم دەدەیەی، زەوی‌یەکی بەدلّی خۆم؟"

"هەمزەکەچەلّ گوتی:"دەت دەمێ."

دەسبەجێ هەر ئەو ڕۆژە دەست بەکار بوون. هەمزەکەچەڵ بەو دراوە کە لە شاگردی پاشەکەوتی کردبوو، جووتێك چەکمە، پانتۆڵێکی لەبار، چاکەتێك و کڵاوێکی کڕین. پاشانیش بە قەرزو قۆڵە ئەسپێکی چالاکی ڕەگەز ئینگلیزی و تفەنگێکی ئەڵمانیی بەسەد فیشەکەوە پەیدا کردو حەوت هەشت بەرەڵڵای گوێبڕو پیاوکوژی لە دەوری خۆی هاڵاندن. پتراخ ئۆغڵی لە پێشەوەو ئەوانی دیکە بە دوای دا، چوون بۆ خاردەشت. چەند حەوتوویەك لەو خوارانە چاوەڕێ مان. هەمزەکەچەڵ هەر کارێك دەیکرد بە ڕێنوێنیی پتراخ ئۆغڵی بوو.

ڕاست لەو کاتەدا کە دێهاتی‌یەکان خەریك بوون دڕووەڵانەکە ئاگردەن...

بەم جۆرە دێهاتی‌یەکان چاوترسێن بوون... دەمایەوە حکوومەت، نۆرەی ویش دەهات...

دێهاتی‌یەکان دەستیان نەکردەوە. وەك بەرخ و مەڕ تەسلیم بوون، تەنانەت ژمارەیەکی زۆریان بە عوزر هێنانەوە چوونە لای هەمزەو لەکن وی جنێویان بە حەمەدۆك دان.

هەر ئەو ڕۆژە هەمزە کەچەڵ مەلای "گوێتفەك لی"ی بانگ کردو هەردوو ژنەکەی عەبدیی لە خۆی مارە کردن. سەری شەوێ لەگەڵ یەکێکیان و لای بەیانی لەگەڵ ئەوی دیکەیان سەرجێیی کردو بەم جۆرە ڕەزامەندیی تەواوی دڵی هەردوو ژنەکەی ڕاکێشا.

لە پاشانیش ڕەوەیەك جەندرمە، وەکیل باشی و مولازمی هێنانە ئاوەدانی و هەموو ڕۆژێ مەڕی بۆ سەر بڕین و باج و پێتاکی بۆ کۆکردنەوە.

"دەبەرت دەمرم حەمەد، ئیدی ئەوی دیکەی با نەڵێم کوڕم، حەز ناکەم گوێت لـێبێ. هەمزە کەچەڵ وەڵامی بۆ دێهاتی‌یەکان نارد کە سێ ساڵە چاندووتانەو کۆتان کردۆتەوەو ملکانەتان نەداوە. هەرچی لەم سێ ساڵەدا کۆتان کردوەتەوە لێتان دەستێنم. وەکیل باشی‌یەك و جەندرمەی وەپێش خۆی دان و ماڵ بە ماڵ ئاوەدانیی پشکنی. لەماڵی جووتیارەکان دا هەرچی ئاردو گەنم و ڕۆن و ئەسپ و گاو وڵاغ و سەرت نەیەشێنم هەرچی هەبوو و نەبوو خڕی کردەوەو بردی لە عەمبارێ عەبدیی کرد. ئەو ساڵە دێهاتی‌یەکان هەموویان تووشی برسیەتی بوون، وەك گورگی برسی دەیان لووراند. دێهاتی دەوروبەر کە خەبەریان بیستبوو، ئەوەندەی لە دەستیان هات نانیان بۆ هێنان. زۆر کەسیش باریان کرد بۆ گوندەکانی نیزیك ... زستانی ئەو ساڵە پازدە کەس لە برسان زگیان بای کردو مردن. ئەگەر هاتی کەسیانت لە دەرێ دی؟ ناش بێ بیان بینی کوڕم، هەموویان رووت و قووتن... روویان نیە بێنە دەرێ..."

حەمەد بە دەنگێك کەبە حاڵ و باڵ دەبیسترا، پرسی:

"عەلی‌یەشەل چی بووە؟"

"ئەو، ئەو بووەتە سەگی هەمزەکەچەلْ... هەر بۆخۆی دارونەداری دێهاتیەکانی بردە عەمباریْ عەبدی. ئەمن پێم نەگوتی بیکوژە، پێم نەگوتی ئەو خەنجەرە درێژەی دەزگی راکەو بیکوژە، پێم نەگوتی؟"

حەمەد لە حالێك دا بە لادا دەهات، لە جێی خۆی هەستا، وەك مردووانی لێهاتبوو، نەیدەتوانی بە پێوە راوەستیْ، دەستی بە ئەستوندەکەکەوە گرت. پاشان بە لاجەلاج هاتە دەریْ و وەك سەرخۆشان بەرەو خاردەشت شۆڕ بووەوە. ددانی بەسەر یەك دا چەسپیبوون، هەموو لەشی دەلەرزی. یەکەمین رووناکایی بەیانی حەمەدی دیت کە وەك تاتەبەردێك لە نێوەڕاستی دڕووەلاّن دا رەق راوەستاوە. روخساری بیْڕەنگ و وەك بەفر ساردو سڕ بوو، سێبەرە درێژەکەی کەوتبووە سەر زەوی. نیوەرۆ داهات حەمەد هەروا بێجوولە راوەستا، سێبەرەکەی خڕ بووەوەو وەك کەلاّفە دەزوویەك کەوتە بەر پێیانی. ئێوارە داهات و ئەمجار بوو بە شەو.

پاش رۆیشتنی حەمەد دایەحۆری دەرپەڕیە دەریْ، هەموو جیْیەکی بەدوادا گەڕا. وەختێك هەتاو کەوت دیسان وەدوای کەوت. لای ئێواریْ بەفکریدا هات کە سەرێکی دڕووەلاّنیش بدا، تەماشای کرد دیتی حەمەد لە نێوەڕاستی دڕووەلاّن دا چەقیوە. بە غاردان و کەوتن و هەستانەوە هاتە لای. حەمەدی بە کزی و بە ددانی قفلْ بووەوە دی.

"کوڕم ئەمن تۆم کوشت... یالّلا زووبە، جەندرمە دەت بینن، یەکێکیان بت بینیْ بەسە... قۆلّی گرت و بردیە سەر جۆگە ئاوێك کە بەو نیزیکانە دا دەڕۆیشت، لەسەر چلە ئالەتێك درێژی کردو ئاوی لەسەرو چاوان پڕژاند. قسەی خۆشی بۆ کردن، پیْکەنی، کاری سەیرو سەمەرەی کردن هەتا بەرە بەرە حەمەد هاتەوە سەرخۆی و گوتی:

"دایە، دایکە جوانەکەم، باشترین دایکی دنیا، زۆرم خەراپە دەرهەقی تۆ کرد."

سەری هێنایەپێش، دەستی حۆریی بۆ لێوی برد، ماچی کردو گوتی:

"دایە بە عەلیەشەل بلّیْ بیْ ببینیْ."

دایەحۆری خەریك بوو بلّیْ نا، بەلاّم پەژیوان بووەوە. ملی بەلاوە ناو گوتی:

"باشە کوڕم. ئێستا دەچم، شەویْ دەینێرمە لات. حەمەد بە قوربانت بم متمانە بەو کافرەی مەکە. هەربینا بەلاّیەکی بەسەر هێنای. دیْ پڕە لە جەندرمە. ئەو لەگەلّ هەمزەو جەندرمەکان گیانی بە گیانیە. بەقوربانت بم، وریای خۆت بە... تەنیا ئەتۆمان بۆ ماوی..."

ئاسن بوومایە دەڕزیم و دەبوومە خاك. بوومە مستێك خاك، بۆیە توانیم بمێنم... خاك، خاك. بوومە خاك و توانیم بمێنم.

## (٢٢)

"ئیدریس بەگ" سی ساڵ دیار بوو. پیاوێکی کەڵەگەت و باریکەڵە بوو. بە چاوی زەردو لووتی قەپۆزبەرانی و دەم و چاوی درێژووکەیەوە، وەك دەعبایەکی بە دەگمەن، وەحشی و لە رام کردن نەهاتوو دەچوو کە لە دنیایەکی نەناسراوەوە هاتبێتە سەر ئەم دنیایە. بوونەوەرێکی ئەفسووناوی و پیرۆز بوو. سمێڵە درێژەکانی داچۆڕابوون. قامکی زۆر شووش و باریك و جوان بوون. کەسێك یەکەم جار لەگەڵی بەرەوڕوو بووایە، نە ئەندامی دەدی، نە چاوە زەردەکانی سەرنجیان رادەکێشا، نە سمێڵە درێژو بریقەدارە زەردەکانی و نە مووەکانی. بەڵکوو لە یەکەم دیدار دا پیاو قامکە زۆر درێژو جوانەکانیی دەدی و مات و حەیران دەبوو.

بابی، یەکێك لە سەرۆك عێلەکانی چەرکەس بوو، کە لە زەمانی عوسمانیەکان دا لەگەڵ عێلی خۆی لە قەفقازەوە کۆچ دەکاو رووبەڕووی قەڵای ئاناوارزا لە بەری لای جنووبی چۆمی جەیهان نیشتەجێ دەبێ و دێیەك بە ناوی ئاك مەزار دروست دەکا.

لە سەرەتادا زۆریان لەبەر مێش و مەگەزو مالاریاو گەرمای چوکووراوا نەخۆش بوون، بەشێکیش لەبەین چوون. سێ چوار ساڵ پێ چوو هەتا خوویان بە ئاوو هەوای چوکووراواوە گرت. بەڵام لەو ماوەیەدا ژمارەیان هاتبووە سەر نیوەیی و هەموو ئەو ئەسپ و ماڵ و حەیوانەی لە قەفقازەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوو، لەنێو چووبوو. لە پاشان ئەو چەرکەسانەی لە چوکووراوا نیشتەجێ ببوون ئەسپی زۆر جوانیان لە رەگەزی چوکووراوا پەروەردە کردن. دایان چاند، هەڵیان گرت. هەتا ئەودەم لە چوکووراوا کەس باغی میوەی نەدیبوو. لە هەوای گەرمی چوکووراوادا داری میوەیان ناشتن. لە تەنیشت خانووی بە چرپ و چاڵی تورکمەنەکان دێیەکیان لە دارو بەردو قوڕ ساز کرد بە خانووی دوو نهۆمەوە کە کۆڵان و شەقامیشی هەبوون.

ئەوان لەسەر ئەو زەوییە بەخێرو بێرانە بناغەی ژیانێکی بەختەوەرانەیان دارِشت. لەبەر پەروەردە کردنی ئەسپی جوان جوان و میوەی درشت و باش و بەهۆی ئازایەتی و جوامێرییەوە لە سەرانسەری دەشتێ دا ناوبانگیان دەرکرد. ئەوان وەك چەرکەسەکانی دیکەی چوکووراوا دەستیان نەکرد بە ئەسپ دزین... فەرمانەکانی سەرکردەی خۆیان بێئەملاو ئەولا بەرێوە دەبردو داب و شوێنێك کە لە قەفقاز هەیان بوو، هەروا پاراستیان.

ئەم ژیانە رێك و پێك و بەختەوەرانەیە سالآنی سالّ هەتا رۆژێك کە ترۆمبێلێکی فۆردی رەش لەبەر دەرکی دوا سەرکردەیان ئیدریس بەگ راوەستا، درێژەی هەبوو. ترۆمبێلەکە پرِ لە تۆزو خۆلّ بوو. چاوە زەلامەکانی لەبن تۆزوخۆلّ دا لەبەر گەرمای چوکووراوا دەدرەوشان. هەتا ئەو رۆژە جگە لە چەند کەس کە چووبوونە سەربازی، هیچ کام لە دێهاتییەکان ترۆمبێلیان نەدیبوو. هەموویان پیرو لاو و ژن و پیاو و منداڵ بە ترس و سەرسورِمانەوە تەماشای ئەو شتە سەیرو سەمەرەیەیان دەکرد کە چاوێکی زەلام و بریسکەداری هەبوون. هێندێ کەس بە دیتنی ئەو بوونەوەرە سەیرە خۆشحالّ بوون و هێندێکیش ترس و سامێکی تالّ و شوومیان بەسەردا زالّ بوو.

دوو پیاو لە ترۆمبێلەکە دابەزین. یەکیان پیاوێکی بەخۆوە بوو، کە برۆیەکی رەشی پرِپشتی هەبوون، لیباسێکی رەشی لەبەردا بوو، کلآوێکی گەرِگەرِیی رەشی لەسەر نابوو. چەند هەودا زنجیر سەعاتی زێرِ لەسەر نێوکی بریسکە بریسکیان بوو. قیت راوەستابوو دەت گوت خەدەنگی قووت داوە، بە سیلەی چاو تەماشای دەوروبەری دەکردو نازی بەسەر عەرزو عاسمان دا دەکرد. دەت گوت کێو و دەشت و عەرزو عاسمان و هەموو بوونەوەرەکانی دنیا ئەو دروستی کردوون. پێشوازیی ئیدریس بەگ لەو کابرایەش سەرسورِهێنەر بوو. لەبەر ئەو نیوەخوایە دوولا هاتەوەو ئیکلامی بۆ کێشا. چەرکەسە بەساڵ داکەوتووەکان لەم کردەوەیەی ئیدریس بەگ زۆر توورِە بوون و لەو کاتەدا زۆریان پێ سەیر بوو. پیاوێکی خاکی لەبەر بە دوای پیاوە بەرگ رەشەکەدا لە ترۆمبێل دابەزی، دوگمەی چاکەتەکەی داخستن و لە حالێك دا دەستی لەسەر دوگمەی چاکەتەکەی بوو، وەدوای کەوت. ئەو وەك بازی راوێ ئامادەی بەرێوەبردنی فەرمان بوو.

چەرکەسەکان دەسبەجێ فکریان کرد کە ئەو پیاوە دەبێ پیاوێکی گەورەو گرانی وەك قەیسەر بێ، بەلآم داخوا کێ بوو؟. چ کارە بوو؟

ئیدریس بەگ ئەختێك بە حەبەساوی و زۆر بە سام رێنیشتوویی ئەوی بۆ مالّی خۆی بانگ هێشتن کرد. میوانی تازەهاتوو بێدەنگ بوو. کاتێك دەچوونە ژوورێ، ئەو پیاوەی لە دوای

میوانە قەڵەوەکەوە دەڕۆیشت ناوێکی بە گوێی ئیدریس بەگ دا چپاند. ئیدریس بەگ ڕەنگی بە ڕووانەوە نەماو چەند قاتی پێشوو هەژاو سام گرتی:

"زۆر بەخێر بێن خان، بەخێر بێن، خێرو بەرەکەتتان هێنا. دێیەکەتان گەورە کردین خان، شانازییەکی گەورەتان داینێ..."

پیاوە زەلامەکە دەستە قەڵەوەکەی لە سەرەخۆ بۆ لای ئیدریس بەگ درێژ کرد. ئیدریس بەگ دەستی وی گوشی بەڵام ماچی نەکرد. نیشانەی نارەزایی لە نێوچاوانی کابرای زەلامەدا بەرچاو کەوت. ئیدریس بەگیش دیتی و هەستی پێکرد. لە دڵی خۆی دا گوتی:"عێل و عەشیرەتی ئێمە تا ئێستا دەستی کەسیان ماچ نەکردوە، تەنانەت دەستی شاو قەیسەریش. هیچ کەس نابێ چاوەڕوان بێ ئێمە دەستی ماچ بکەین."

پیاوە زبرو درشتەکە کە سی ساڵە دیار بوو لە یەکەم تێڕوانین دا وەك پەیکەری ترس و سام دەهاتە بەرچاو. یەك وشە قسەی نەدەکرد. بە سەرلەقاندن بە کابرای بەرگ خاکی کە دەستەو نەزەر لەبەر دەستی ڕاوەستابوو، هەروەها بە ئیدریس بەگ کە بەوپەڕی ئەدەبەوە بە پێوە ڕاوەستابوو، ئیزنی دانیشتنی دا. ئەو دووانە لەسەر نیوتەختێك کە بەرامبەری بوو، دانیشتن و دەستیان لەسەر ئەژنۆیان دانا.

کچێکی جحێڵی سپی و سۆڵ و باڵابەرزو زۆر جوان و گەردن کێل کە گەردنی دەت گوت ملی قوویە لەسەر سینیەیەکی زێو قاوەی هێنا.

کابرای زەلامە بە سیلەی چاو کچە جحێڵەکەی دی، گنجی پڕ هەیبەتی نێوچاوانی کەمێك کرانەوەو دووبارە نێوچاوانی تێك نایەوە. بە ئارامی دەستی بۆ گیرفانی برد. قوتووە جگەرە زێڕەکەی دەرهێناو بە سەری دوو قامکان جگەرەیەکی هەڵگرت. تەق دایخستەوەو دوایە هەر بەو ئارامییە دووبارە لە گیرفانی نایەوە. ئیدریس بەگ بە سەرلێشێواوی ئەستێ و بەردی دەرهێنان و پووشووی لەسەر بەردئەستێ دانا. بەڵام هەر کە ویستی هەڵی بکا، میوان هەر بەو کەش و فشی پێشوویەوە چەرخە بەنزینییەکەی لەگیرفانی دەرێناو دەسبەجێ جگەرەکەی داگیرساند. چەرخەکەی زێڕ بوو. ئیدریس بەگ هەتا ئەو ڕۆژە چەرخی بەنزینیی نەدیبوو. لە تورکیە تەنیا ژمارەیەکی بە قەد قامکی دەستان چەرخی بەنزینییان هەبوو.

ئیدریس بەگ بە دیتنی گڕی چەرخەکە بە شەرمەوە زەردەیەکی هاتێ، سێبەری زەردەخەنەیەکیش بەسەر لێوی کابرای قەڵەوەدا تێپەڕی و گوتی:

"دیاریی پاشایە. پاشا حەز دەکا دیاریی جوان و بە قیمەت بدا بە دۆستەکانی. ئەمە بالێوزی ئینگلیز بۆ پاشای بەدیاری هێنابوو."

کابرای زبرو زەلام پاش ئەوەی قاوەو جگەرەکەی بەبێقسەکردن تەواو کردن، تاوێك دانیشت و دوایە هەروا قیت و قنج هەروەك خەدەنگی قووت دابێ، یەك پێ راست بووەوە، دەستی درێژ کردو پاش خاوکێش کردنی ماسوولکەکانی، نووکی قامکەکانی بۆ لای ئیدریس بەگ راداشت و دووبارە رایوەشاندو بە دەنگێکی زۆر ئەستوور گوتی:"بەخوامان سپاردن" و راستەڕێ و بێئەوەی تەماشای ئەم لاو ئەولای خۆی بکا لە پلیکانەکان چووەخوارێ. شۆفیرەکە دەرگای ترۆمبێلەکەی کە هەڵکرابوو، لـێکردبووەوەو بە ئەدەبەوە چاوەڕێ بوو. بەکەش و فشەوە سوار بوو. کابرای بەرگ خاکییش چوو لە پەنای شۆفیرەکە دانیشت. ترۆمبێل وەڕێ کەوت. کابرای قەڵەوە ئاوڕی نەدایەوەو تەنانەت چاوێکیشی لە ئیدریس بەگ نەکردو ترۆمبێلەکە لەنێو هەورێکی تۆزوخۆڵ دا لە حالێك دا تایەکانی لە خۆڵی جادەی رۆچووبوون، دێی بەجێ هێشت.

ئیدریس بەگ رووی کردە ئەو دێهاتییانەی لەدەوری کۆ ببوونەوەو گوتی:

"عارف صائم بەگ بوو. نوێنەری کووزانە."

دێهاتییەکان زۆر جاریان ناوی وی بیستبوو.

چەرکەسێکی دنیادیدەو بە ئەزموون و شەڕدیتوو گوتی:

"ئەوە دەستی راستی مستەفا کەمال پاشایە، هاوڕێی شەڕکەری مستەفا کەمال پاشایە. پێکەوە گیانێکن لە دوو قالب دا. لە دیاربەکر ئەو کەسانەم دی کە بە فەرمانی وی لەدار درابوون، ئەم سەرو ئەوسەری شار هەر دار بوو چەقابوو. سەرۆکی دادگای "مەحکەمەی گەورە"یە. زۆر جحێڵە، سی ساڵ نابێ."

هەموو دانیشتووانی چوکووراوا بە باشی عارف صائم بەگیان دەناسی. وەختێك فەرانسەیییەکان ئەدەنەیان داگیر کرد، ئەو فەرماندەری جەندرمەی سیس بوو. کاتێك فەرانسەیییەکان هاتن لە پێش دا لەگەڵیان کەوتە تەون و بەست، بەڵام وەختێك دیتی ئەوان نامێننەوەو نانێکی دەست ناکەوێ، بای دایەوە بۆ لای مستەفا کەمال پاشاو زۆری پێنەچوو بوو بە یەکێك لە باوەڕپێکراوترین پیاوەکانی. کوڕی یەکێك لە کوردە هەژارەکانی بێن گوللی بوو. بە زۆری کوتەك شتێکی خوێندبوو، بە هەزار زەحمەت توانی "مەدرەسەی حەربیە" تەواو بکا، زۆری واز لە خوێندن نەبوو، بەڵام حەزی لە تفەنگ هاویشتن دەکرد. گەورەترین شانازییەکەی ئەوەبوو کە دەتوانێ لە دوورەوە پارەی زێو بە تفەنگ هەڵبگرێ.

مستەفا کەمال پاشا ئەوی لەکووزانەوە هێناو بۆ ڕێكوپێك کردنی خەباتی خەڵك دژی فەرانسەیی‌یەکان ناردیە یەکێك لە شارەکانی جنووب. لە حاڵێك دا خەڵك بۆخۆیان چەند مانگ پێش ئەوەی ئەو بچێ خەباتی خۆیان دژی فەرانسەیی‌یەکان ڕێك خستبوو، و تەنانەت تێك هەڵچوونی چەکدارانەش لە نێوان وان و فەرانسەیی‌یەکان دا رووی دابوو، و لێکدا لێکدا ئەوانیان تێك دەشکاند. خەلکی دلێری شار بێ‌ئەوەی یارمەتی لەکەس وەربگرن، فەرانسەیی‌یەکانیان بەرەو دەریا راو نا. عارف صائم بەگ لە هەلومەرجێکی ئەوتۆ دا چوو بۆ ئەوێ و فەرانسەیی‌یەکان هاوکات لەگەڵ ئەو شکانەی لەهەموو ناوچە جنووبی‌یەکان دا تووشی هاتبوون، لەم شارەش دا شکان، دەستیان لەسەر ئەم وڵاتە هەڵگرت و ڕۆیشتن. عارف صائم بەگیش وەك هەموو ئەو فەرمانبەرانە کە لە شەڕ دا بەشدار ببوون "نیشانی سەربەخۆیی"ی وەرگرت، ناوی قارەمانی بەسەردا بڕاو بوو بە یەکێك لە نیزیکانی مستەفا کەمال پاشاو یەکەم جاریش کارێك کرا کە لەو شارەی تێی دا فەرماندەری جەندرمە ببوو بە نوێنەری مەجلیس هەڵبژێرێ.

یەکەم کاری عارف صائم بەگ پاش هەڵبژێرانی بە نوێنەری مەجلیس و چوون بۆ ئەنکەرە ئەوەبوو کە ترۆمبێلێکی کڕی و پاشان دەستی کرد بە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان. پاش دامەزرانی حکوومەتی کۆماری و ڕێكوپێك بوونی وەزعی وڵات یەکەم کاری ئەوەبوو کە بەردەوام هاتوچۆی چوکووراوای دەکرد چونکە لە نیزیکەوە شارەزای بوو. تەماعێکی بێ‌ئەندازەی لە خاکی بە پیت و بەرەکەتی چوکووراوادا هەبوو. ئەگەر "شەڕەکانی سەربەخۆیی" نەهاتبانە پێش، ئەو نەی‌دەتوانی بە خەونیش ببینێ کە بووەتە خاوەنی بستێك لە خاکی چوکووراوا. ئەم زەوی‌یانە لە پێش دا ملکی سوڵتان عبدالحمید، ئەرمەنی‌یەکان و ژمارەیەك عەرەب بوون کە پێ‌یان دەگوتن "میسری".

عارف صائم بەگ پسپۆڕێکی خاك و کشتوکاڵیشی لەگەڵ خۆی هێنابووە چوکووراوا. ئەم پسپۆڕە هەر ئەو پیاوە خاکی لەبەرە بوو کە لەگەڵی هاتبووە ئاك مەزارو هەمیشە دەستەونەزەری رادەوەستاو وریای دوگمەی چاکەتەکەی بوو کە نەکرێتەوە. ناوی ئەحمەدبەگ بوو. ئەحمەدبەگ دەرچووی قوتابخانەی بەرزی کشت‌وکاڵ لە "بوداپێست" و یەکێك لە چەند پسپۆڕی مەملەکەت بوو.

وەختێك لە ئەنکەرە وەڕێ کەوتن عارف صائم بەگ گوتبووی:"براله ئەحمەدبەگ، تۆیان وەك پسپۆڕێکی گەورەی خاك ناس بە من ناساندوە. ئێستا پێکەوە دەچینە چوکووراوا،

ترۆمبێلیشمان لەژێر پێدایە. هەنگاو بە هەنگاو چوکووراوا دەپشکنین. ئەتۆ خاکی زەوییەکان هەڵسەنگێنەو بەرپێژەوترینیان دەست نیشان بکە. ئەمنیش دەیکڕم و پێشکەوتووترین کێڵگەی وڵات دروست دەکەم."

ئەوان لە پێش دا دەشتی یوورەگیر و پاشان دەوروبەری کارسووس گەڕان. شۆڕ بوونەوە بۆ لای "کاراتاش" و ناوچە تەڕازنەکانی "ئاق با". دەچوونە هەر دێیەك ئەحمەدبەگ پاش هەڵسەنگاندنی خاکەکەو تەماشای گیاو رووەکەکان و قسەکردن لەگەڵ دێهاتییەکان، هەر عەرزی بە میترو سانتیمیتر دەپێواو هێندێ شتی لە دەفتەرەکەی دا دەنووسی. بێئەوەی قسەیەك بکا دوگمەی چاکەتەکەی دادەخستن، ملی بەلاوە دەناو دەیگوت:

"زۆر باشە ئاغا، دەتوانین بڕۆین." لە ئاکارو کرداری ڕا وادیار بوو ئەرکی خۆی بە باشی بەجێ دەگەیەنێ. لە ئاق باوە چوونە "یوومووورتالی" سێ رۆژان لەوێ مانەوە. عارف صائم بەگ ترۆمبێلی بۆ لای مەزرای "ئاپتی ئۆغلی" لێخوڕی. یەکێك لە کۆنە هاوڕێیەکانی کە پێشتر فەرمانبەری پەروەردەو فێرکردن بوو و ئێستا ببوو بە نوێنەری مەجلیس، مەزرای ئاپتی ئۆغلیی کردبوو بە هی خۆی. ئەم مەسەلەیە بە توندی قین و ئێرەیی عارف بەگی بزواند:"خۆ ئەو وەك من گیانی لەسەر بەری دەستی دانەناوەو نەچووە شەڕ بکا. چوو لە ئەنکەرە کەنگری خواردو لێی دانیشت و بوو بە نوێنەری مەجلیس. چۆن، بە چ حیسابێك و بە چ هەقێك بوو بە خاوەنی ئەم مەزرایە؟"

عارف صائم بەگ رووی کردە پسپۆڕەکەی کە خەریك بوو خاکی ئاپتی ئۆغلیی تاقی دەکردەوە، بە ددان لە چیڕەوە بردن و بە راوێژێك کە وەك لیکاو شل و شەوێق بوو پرسی:

"چۆنە؟"

ئەحمەدبەگ گوتی:"باشە، بێعەیبە."

"ئەو زەوییەی بۆ منی دەبینییەوە، دەبێ خاکەکەی لەمەش باشتر بێ."

"بەچاوان ئاغا!"

"باشترین زەوی دەبێ ئی من بێ. کەسێك کە لە بەرەی شەڕ دا خوێنی رشت ئەمن بووم. وەختێك ئەمن گیانم لەسەر لەپی دەستم دانابوو و شەڕم دەکرد، ئەو لە ماڵێ لە باوەشی ژنەکەی دا نووستبوو."

"بەڵێ ئاغا، پەیدای دەکەین ئاغا."

"دیارە پەیدای دەکەین."

عارف صائم ئەختێك لەهجەی کوردیی هەبوو. زەوییەکانی ئاپتی ئۆغڵیان بەجێ هێشت و بەرەو لێوارەکانی جەیهان وەڕێ کەوتن. سەریان لەکووزان و دووملی دەرهێناو لێوارەکانی ئاکچاساز گەڕان، هەتا ئەحمەدبەگ لە قەراخی ئاکچاساز زەوییەکی زۆر باشی دۆزیەوەو گوتی:

"ئاغا، ئەم خاکە نامرێ، هەتا دنیا دنیایە یەك و پەنجا بەرهەم دەدا. لەوانەیە یەك و حەفتاوپێنجیش ببڕێ."

عارف صائم بەگ پرسی:

"مەبەست لە یەك و پەنجاو یەك و حەفتاوپێنج چیە؟"

ئەحمەدبەگ جوابی دایەوە:

"مەبەست ئەوەیە دەنکێك تۆو دەچێنی، پەنجا دەنك بەرهەم هەڵدەگری."

"زەوییەکی مام ناوەندی، یان خەراپ چەند بەرهەم دەدا؟"

"زەوییەکی خەراپ عادەتەن یەك و یەك، یەك و دوو، یەك و سێ و ئەوپەڕەکەی یەك و پێنج دەبڕێ."

"خاکی کامە ناوچە وایە؟"

"دەوروبەری ئاناتولیی نێوەڕاست."

"جێی داخە."

"زەویی مام ناوەندیی یەك بە دە، یەك بە پازدە دەبڕێ."

"مەبەست لە زەویی زۆر باش و نەرم چیە؟"

"وەختێك زەوی زۆر داچێندراو داچێندرایەوە، ڕێژەوی نامێنێ و قەوەتی کەم دەبێتەوە. جا وەختێك دەڵێین ئەو زەوییە نامرێ، مەبەست ئەوەیە کە هەرگیز قەوەتی کەم نابێ، ماندوو بوونی نیە، وەك زەوییە ساغەکان، زەوییە ڕەڵمەکانی نیزیك گۆلاو کە بۆخۆی، خۆی تازە دەکاتەوە. ئەم جۆرە زەوییانە نامرن."

"ئەم زەوییانە وان؟"

"بەڵێ."

ئەو خاکە ئەمرەی ئەحمەدبەگ دۆزیبوویەوە، زەوییەکی بەیاری عێلی "ئاکساخووجاتووغوول لاری" لە ئاغایانی پێشووی تورکمەن بوو. زەوییەکانیان پارچە پارچە کرابوون و ئەو زەوییەی ئەحمەدبەگ پەسندی کردبوو، وەبەر سەلیم بەگ کەوتبوو. سەلیم بەگ کەڵکی لە مەزراکە وەرنەدەگرت و چووبووە گەڵ داروودەستەی یەغمووراغا ئەسپ دزی

بەناوبانگ و خەریکی ئەسپ دزین بوو. عارف صائم بەگ بە ئاگاداربوون لەو مەسەلەیە زۆر خۆشحاڵ بوو. بانگی "بەڕێوەبەری کاروباری ئەملاک"ی کرد.

بەڕێوەبەری کاروباری ئەملاك گوتی:

"عەرزی سەلیم بەگ بەشێك لە زەوییە دەوڵەتییەکان نیە. بەڵام لە دەوروبەری زەوییەکی سی هەکتاری هەیە کە پێشتر هی ئەرمەنییەکان بووەو ئێستا بووە بە بەشێك لە زەوییەکانی دەوڵەت. جێگای ئەو زەوییە سی هەکتارییە بە جۆرێکە کە دەتوانێ زەوییەکەی سەلیم بەگیش بگرێتەوە." دوایە مەسەلەکەی بە وردی بۆ عارف بەگ شی کردەوە کە ئەویش پێی ڕاست بوو.

مەزلووم بەگ بەڕێوەبەری کاروباری ئەملاك دەسبەجێ کارەکەی ڕێك خست و بڕیار درا زەوییەکە بخرێتە لەسەرزیادکردن "مزایدە"وە. ڕۆژی لەسەرزیادکردن هات. هیچ کەس لەو لەسەرزیادکردنەدا بەشدار نەبوو و عارف صائم بەگ بە بیست و سێ لیرە زەوییەکی سی هەکتاریی وەدەست کەوت. عارف صائم بەگ سنووری زەوییەکەی کێشاو مەزرایەکەی سەلیم بەگی ئەسپ دزیشی خستە نێو ئەو سنوورەوە. بنەماڵەی ئاکساخوجا پێیان زانی. عەزیزاغا کە سمێڵێکی درێژی هەبوون، پیرترین و بە ئەزموونترین کەسی بنەماڵەی ئاکساخوجا بوو. وەختێك لە مەسەلەکە ئاگادار بوو، بەتوندی کەوتە جموجۆڵ. زەوییەکە خەریك بوو لە دەست بچێ. هەرچەند زەوییەکە ملکی وی نەبوو، بەڵام ئەگەر عارف صائم بەگ هەروا زەوییی یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەکەی بکاتە ئیخۆی، دیارە لەمەودوا ناتوانن بستێکیش لەزەوییەکانیان بۆخۆیان بپارێزن. ڕەگی غیرەتی بزووت، سواری ئەسپ بوو و چوو بۆ ئەدەنە بۆ لای هێندێك لە دەرەبەگە گەورەکان و دێهاتییە لەمێژینەکان.

یەکێك لەو دەرەبەگانە سکرتێری گشتیی تەنیا حیزبی فەرمانڕەوای وڵات واتە "حیزبی گەل" بوو. ئەو دوو پیاوە کۆنە دێهاتییە پێکەوە زۆر دۆست بوون و لەمێژ ساڵ بوو قازانج و داهاتی هاوبەشیان پێکەوە هەبوو.

سکرتێری گشتی هەر کە لە مەسەلەکە ئاگادار بوو، ڕاستەڕێ چووە لای پاشاو مەسەلەی عارف صائم بەگی بۆ باس کرد. کەس نەیزانی پاشا چیی گوت و چیی کرد، بەڵام ئاکامەکەی ئەوە بوو کە عارف صائم بەگ دەستی لە مەزرای سەلیم بەگ کێشایەوە. تەنانەت یەك جاریش چیە پێی لەو زەوییە نەناو ئەو سی هەکتار زەوییەشی کە بە بیست و سێ لیرە کڕیبووی، لەبیر خۆی بردەوە.

پاش ئەو بەڵا سامناکە کە بەسەر عارف صائم بەگ هات، لەگەڵ ئەحمەدبەگ چوو بۆ "دوورت یۆڵ". حەوتوویەك لەوێ مانەوە. خاکی دوورت یۆڵ پڕ بوو لە باغی گەورەگەورەی پرتەقاڵ. عارف صائم بەگ لە ماوەی ئەو حەوتووەدا کە لەوێ مایەوە، بە قسەکردن لەگەڵ دەوڵەمەندو پیاوماقووڵانی دوورت یۆڵ بۆی دەرکەوت کە لەو ناوچەیەش هێندێ زەوی و باغی پرتەقاڵ هەن کە پێشتر هی ئەرمەنیەکان بوون و ئێستا بوونە ملکی دەوڵەت. لەنێو قسان دا عارف صائم بەگ پێشنیاری کرد کە باشترین و بە بەرهەم ترین ملك و باغی پرتەقاڵی ئەم ناوچەیە وەك دیاریی پێشکەشی پاشا بکرێ.

لە رقان کەفی دەپرژاندو لە شەرمان ئارەقی دەرِشت و دەیگوت:

"چۆن دەکرێ رزگارکەری گەل و وڵات لێرە باغێکی چوکەڵەی پرتەقاڵی نەبێ؟"

لە راستی دا دەوڵەمەندو پیاوماقووڵانی ئەو ناوچەیە بۆخۆیان بەدڵەوە حەزیان دەکرد دیارییەکی وا بدەن بە مستەفا کەمال پاشا. تەنیا لە ترسی ئەوە کە نەوەکا پێی ناخۆش بێ و لێیان توورە بێ، نەیان دەوێرا دەست پێش بخەن. لە حاڵێك دا لە ئاخرو ئۆخری پاشایەتیی عوسمانیەکان دا پێشکەش کردنی زەوی و باغ و کۆشك بە پادشاکان ببووە بەشێك لە داب و شوێنی دەرەبەگەکان.

پێشنیاری عارف صائم بەگ خۆشحاڵی کردن.

بەم بەرنامەیە عارف صائم بەگ بیانووی چاکی بۆ راووڕووت و زەوی داگیرکردنی خۆی لە دوارۆژدا دەست کەوت. چونکە ئەگەر مستەفا کەمال پاشا لە تالانچییەتی و زەوی داگیرکردنی وی لە چوکووراوا ئاگادار کراباو لێی توورە با، ئەویش لە وەڵام دا دەیگوت:

"پاشا. خەڵك بۆ رێزگرتن لە زەحمەتەکانی ئێمە هەروەك زەوییان بەدیاری داوە بە جەنابت، پارچە زەوییەکی چووکەڵەشیان بە دیاری داوە بە من. دەرەبەگەکان چونکە چاویان بە من هەڵنایە، هاتوونە لای جەنابت و شکایەتیان لەمن کردوە. دەکرێ پیاو دیاریی خەڵك قبووڵ نەکا؟"

دووهەمین زەوی کە ئەحمەدبەگ لە چوکووراوا پەسندی کرد، زەوییەك بوو لەنێزیك گوندی ئاك مەزار.

وەختێك ئەرمەنیەکان رایان دەکرد، خاوەنی ئەم زەوییە کە ئەرمەنی بوو، ئەوی بە دۆستێکی تورکمەنی خۆی فرۆشت، گوتبووی:"براڵە، ئەگەر رۆژێك، رۆژگارێك هاتمەوە، زەوییەکەم وێ بدەوە. ئەگەر نەش هاتمەوە زەوییەکە بۆخۆت. لە شیری دایکت حەڵاڵترت بێ و خێری لێ ببینی."

عارف صائم بەگ پەیتا پەیتا لە ئەحمەدبەگی دەپرسی:
"ئەم زەوییە ئەمرە؟ لەزەوییەکەی سەلیمیش چاکترە؟"
ئەحمەدبەگیش زۆر بە دڵنیایی دەیگوت:
"بەڵێ لە زەوییەکەی سەلیمیش باشترە. پارچە زەوییەکی وا باش لە دنیادا تەنیا لە چەند وڵاتێك پەیدا دەبێ. تەنانەت لە کەناری چۆمی "نیل"یش زەوییەکی وا باش بە زەحمەت پەیدا دەبێ."
عارف صائم بەگ هەر ئەو رۆژە لە شاری پاش هێندێك لێکۆڵینەوە بنچاخی زەوییەکەی دیتەوە. تورکمەنی بەستەزمانی بانگ کردو دە لیرەی بۆ هاویشت و گوتی:
"قەباڵەی مەزرای ئەو ئەرمەنییە بخە سەر ناوی من."
دوو جەندرمە تورکمەنی هەژاریان بە پەلە سواری ترۆمبێل کردبوو و هێنابوویانە لای عارف صائم بەگ. لە رێگادا لە ترسان زراوی تۆقیبوو. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"یان دەم کوژن، یان دەم نێرنە بەندیخانە. لانی کەمەکەی ئەمەیە." چونکە ناوبانگی عارف صائم بەگ لە سەرانسەری ئاناتوولی گەڕابوو. هەموو کەس دەیزانی کە هەرکەس لەگەڵی تێکەوتبێ گیانی بەسلامەت دەرنەبردوە.
تورکمەن وەختێك لە جیاتی تەناف و دارفەلاقە دە لیرەیەکی لە پێش خۆی دی، پێیوابوو چاوی بە هەڵە چووە. تەماشایەکی دە لیرەییەکەی دەکردو پاشان دەیڕوانیە روخساری قەڵس و قۆڵ و زبری عارف صائم بەگ بەو برۆ پڕ پشت و پەیوەستانەیەوە. بەشێوەیەکی گومانای کە نەکا ئەو ماستە بێ موو نەبێ، چاوێکی لە پارەکەو چاوێکی لە عارف صائم بەگ دەکرد.
عارف صائم بەگ کە فکری بۆ مەسەلەکە چووبوو گوتی:
"هەڵیگرە مەحموود ئەم پارەیە هەقی خۆتە."
مەحموود لەوە کە بەگ بەناوی خۆی بانگی کرد، خۆشحاڵ بوو و کەمێك غیرەتی هاتەبەر.
"مەحموود، پێت دەڵێم هەڵی گرە! هەڵیگرە برام. هەقی خۆتە. چەند ساڵە قەباڵەکەیت هەیە؟"
مەحموود هاواری کرد:
"دە ساڵە."
عارف صائم بەگ بە ئارامی و لە حاڵێك دا وا دیار بوو تەزووی پێدا هاتوە، نێوچاوانی تێك ناو بە دوو قامکان دە لیرەییەکەی هەڵگرتەوە، بۆ مەحموودی راداشت و گوتی:

"بیگرە. دە ساڵە قەباڵەکەی لەلای تۆیە. بۆ هەر ساڵەی لیرەیەك."

مەحموود پارەکەی وەرگرت، لەگیرفانی هاویشت و خۆی بەسەر کەوشەکانی بەگ دا دا. دەوروبەرەکەی مەحموودیان راست کردەوەو بەگ بە ئارامی دەستی دە گیرفانی راکرد پێنج لیرەی دیکەی دەرهێناو دای بە مەحموودو لە مەحموودی ـ کە رەفتارەکەی کاری تێکردبوو ـ پرسی:

"مەحموود سەربازیت کردوە؟"

مەحموود دەسبەجێ بەرامبەر بە عارف صائم بەگ خەبەردار راوەستا. وەك بزمارت لە زەوی داکوتابێ رەق راوەستابوو، جووڵەی نەدەهاتێ. هەر بەو حاڵەوە جوابی دایەوە:

"بەڵێ فەرماندەر!"

پاشان لە حاڵێك دا سەلامی عەسکەریی دەکرد، روتبەکەشی گوت:

"لەشەڕیش دا بەشدار بووی؟"

"بەڵێ فەرماندەر!"

"لە کوێت شەڕ کردوە؟"

مەحموود بێئەوەی پشوو بدا گوتی:

"کالیچای، چاناك کالە، کووتوولامارا، یۆنان..."

"هیچ جار بریندار بووی؟"

"بەڵێ فەرماندەر!"

"کوێت بریندار بوو؟"

"ملم، شلکەی رانم، باسکم و لاقم."

"پیاوێکی شەڕکەری، نیشانت هەیە؟"

"نەخەیر فەرماندەر!"

"مەحموود!"

"ئەمر کە فەرماندەر!"

"هەر ئەم رۆژانە مەزرایەکە ئاوەدان دەکەمەوە. ئەتۆم خۆش ویست. دێی لە لای من لەلای من لە مەزراکە کار بکەی؟"

فەرمانبەری تاپۆ دەفتەر بەدەست چاوەڕوان بوو. کاری گوازتنەوەی زەوییەکە هەر لەوێ تەواو بوو. مەحموود قامکی بە بن قەباڵەکەوە ناو عارف صائم بەگیش بە دنیایەك کەش و

فشەوە ئیمزای کرد. دەستی لەنێو دەستی مەحموود نا. مەحموود وەختێك لەلای بەگ ڕۆیشت ئەوەندە خۆشحاڵ بوو خەریك بوو شێت بێ. وەك با بەرەو ئاوایی دەفڕی و سەرانسەری وجوودی نوقمی خۆشحالی بوو.

بەم جۆرە گوازتنەوەی زەویی مەحموود تورکمەن بۆ عارف صائم بەگ بوو بە سەرەتای کارەساتەکانی دواتری جووتیارانی ئاك مەزارو لە سەرووی هەموویانەوە ئیدریس بەگی لاو. بەو زەوییە کە عارف صائم بەگ کڕیبووی بە فرت و فێڵ هەر دووسێ هەکتار زەوی زەوت دەکرا.

بەڵام داخوا زەوییەکی وا کەم شیاوی پیاوێکی وەك عارف صائم بەگ بوو کە لە بەرەکان خوێنی ڕشتبوو و گەیشتبووە پلەی قارەمانی نیشتمانی. ئەم تۆزە زەوییە پارووی زاری فەقیرو هەژاران بوو. چما قارەمانێکی نیشتمانی دەیتوانی پلەو پایەی خۆی ئەوەندە بێنێتەخوار؟ بەڕاستی شوورەیی بوو. جووتیارانی ئاك مەزار زۆریان زەوی هەبوو. عارف صائم بەگ لەو باوەڕەدا بوو:"عێلی چەچەن زەوییان بۆ چیە، با بۆخۆیان ئەسپ بەخێو بکەن، با بچنە نێو تاقمی یەغمووراغاو ئەسپان بدزن." پاشان پێدەکەنی و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"با زەوی بدەن بە کەسێك کە قەدری دەزانێ و خۆشی دەوێ، دوایە هەر کارێك پێیان خۆشە وەدوای کەون. یان وەدوای پیشەی باب و باپیرانیان بکەون."

یەکەم هەنگاوی عارف صائم بەگ بۆ ئەستاندنی زەوی لە جووتیارانی ئاك مەزار سەرکەوتوو بوو. چونکە ئەو قارەمانە لاوەی "خەباتی نیشتمانی" بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەل و مەرج زۆر زرینگ و بەهۆش بوو. ئەو لەپێش دا لەبارەی چەرکەسەکانی ئاك مەزارەوە لێکۆڵینەوەی پێویستی کردبوو و زانیبووی چەندە حەز لە بەخێو کردنی ئەسپ دەکەن. چەرکەسە پیرەکان و تەنانەت بەرەی لاویشیان زۆر لە فکری قەفقازو داب و شوێنی قەفقازدا بوون. هەرچەند لە قەفقاز تۆرابوون و وڵاتیان بەجێ هێشتبوو، بەڵام هێشتا قەفقاز لە پێش چاویان خەونێك بوو، خەونێك لە بەهەشت.

قەفقاز نیشتمانی وان بوو و سەری زمان و بنی زمانیان قەفقاز بوو. تەنیا ئەمانەتی پیرۆزیش کە لە قەفقازیان هەبوو، ئەسپ بوو. تەنانەت زۆر زیاتر لەو وەختەی لە قەفقاز بوون حەزیان لە ئەسپ دەکرد. بەگ کە ئاگاداری ئەم مەسەلەیە بوو، یەغمووراغای بانگ کردو شەوێکیش لە ماڵێ خۆی میواندارییی لێکرد. دانیشتن و چەندین سەعات باسی رابردوویان کرد. عارف صائم بەگ ئەو کاتەی فەرماندەری جەندرمەی شار بوو، یەغمووراغای دەناسی. چەند جاری بە خۆی و داروودەستەکەیەوە گرتبوو و ئازادی کردبوون.

بۆخۆی دەیگوت هەر لەبەر ئەوەی یەغمووراغای خۆش دەویست ئازادی دەکرد، بەڵام درۆی دەکرد. ئەم کارە لەبەر هاوکارییەك بوو کە لە نێوانیان دا هەبوو، کە بەشی زۆری لە دەغەڵ بازی و سەگ و سەگبابیدا بوو. باسی ئەو هاوکارییەش نە بە کەلکی یەغمووراغا دەهات و نە بە قازانجی عارف صائم بەگ بوو. تەنانەت هێمایەکیشیان بۆ ئەو باسە نەدەکرد، دەت گوت شەرم لە یەکتر دەکەن.

جارێکیان یەغمووراغا خەریك بوو دەمی بکاتەوە کە "بەگ، ئێمە لەگەڵ فەڕانسەییەکان . . ."

بەگ دەسبەجێ قسەکەی پێبڕیبوو و نەڕاندبووی:"فەڕانسەیی چی!" ئیدی یەغمووراغا تێگەیشتبوو کە "قارەمانی نیشتمانی"، عارف صائم بەگ حەز ناکا دووبەدووش باسی هاوکاریی وی لەگەڵ فەڕانسەییەکان بێتە گۆڕێ. قەتیش لەو بارەیەوە قسەیەکیان پێکەوە نەکرد. بەڵام هەموو دانیشتووانی چووکووراوا ئاگایان لەو هاوکارییە هەبوو.

عارف صائم بەگ بە ئۆگرییەوە پرسی:

"یەغمووراغا دارو دەستەکەت تەواو بووە؟ رۆژێ چەند ئەسپ دەدزن؟"

ئەویش هەروا بە ئۆگرییەوە وەڵامی دایەوە:

"بەگ، لە سایەی سەری جەنابتەوە دارو دەستەکەم زۆر تەواوە. ئێستا دەستەکەمان سێسەدو سی و شەش ئەندامی بەوەجی هەیە، هەمووشیان دزی بە ئەزموونن. هەرکام لەوانیش یارمەتیدەرێکیان هەیەو یارمەتیدەرەکانیش بۆخۆیان یارمەتیدەریان هەیە. ئێستا ئێمە سەرکردەی دەستەیەکی هەزارو پێنسەد کەسیین."

"لە راستی دا لەشکرێك."

"بەڵێ ئاغا، حاڵی حازر بە قەد لەشکرێکە. قەفقازو ئێران ئەسپی زۆر باشیان هەیە. دیارە دزینی ئەسپ لەو جێگایانە کەمێك دژوارە. بەڵام ئەمن دزی کارامەو بەتایبەتی چەرکەسەکان دەنێرمە ئەو جۆرە جێیانە. ئەو ئەسپانەی لە "قەرەدنیز"یان دەدزم، دەیان نێرمە "لەشکری چوار" ئاووهەوای نێرە بە کەلکی ئەسپەکانی وێ نایە. ساڵێکیان سێسەد ئەسپمان لە قەفقاز دزی هێنامانە چوکووراوا، بەڵام هەموویان تۆپین. بە مێش و مەگەزو مالاریا مردن. ئەو ئەسپانەی لە سووریەو عیراق و "ئەدەنە"یان دەدزم، دەیان نێرمە ئاناتولیی رۆژئاوا، ئەزمیر، ئایدین، دنیزلی و مانیا. شەڕ توخم و تۆوی ئەسپی لەوێ بڕیوەتەوە. لە ئاناتولیی رۆژئاوا ئەسپ زۆر گرانە، ئەو ئەسپانەش کە گوتم لەوێ ڕا دەیان هێنین لەگەڵ ئاووهەوای ئاناتولیی رۆژئاوا دەگونجێن، پاشان ئەو ئەسپانەی لە ئاناتولیی رۆژئاوایان دەدزین دەیان نێرینە

ناناتوولیی نێوەڕاست. ئەمن نەخشەیەکم بە دەستەوەیە کە دام و دەزگای پەروەردەکردنی ئەسپ هەتا ئێران و ئەفغانستان و هیندوستان پەرە پێ بدەین."

"یەغمووراغا، ئەم تێکۆشانە مەزنەی تۆ دەبێ بە پاشا بڵێم. پێم وایە پاشا لە پاداشی ئەو خزمەتەدا دەت کاتە نوێنەری جێگایەك. ئەتۆ خزمەتێکی گەورە بە نەتەوەی تورك دەکەی."

بەڵام پاش ئەو قسانەیان کە بە قەڵافەتێکی زۆر جیددیەوە دەیان کردن، لە قاقای پێکەنینیان دا.

پاش ماوەیەك گەپ و گاڵتە سەبارەت بە ئەسپ دزین و پێکەنینێکی تێرو تەسەل نۆرە گەیشتە قسەی بەڕاستی.

یەغمووراغا حەزی لە ئەسپ دزین دەکردو لە ڕێگای ئەم کارەشەوە هەموو ساڵێ سەدان و بگرە هەزاران ئەسپی لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکەو لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە رادەگواست. بەم جۆرە یەغمووراغا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا هەر کارێکی لە دەستی هاتبا، بۆ باشتر کردنی رەگەزی ئەسپ کۆتایی نەدەکرد! و بە زوویی هەموو دانیشتووانی "ئووزوون یایلا"و هەموو چەرکەسەکان و هەروەها بەشی زۆری خەڵکی چوکووراوا رەگەڵ داروودەستەی یەغمووراغا دەکەوتن.

لە مەزرا بەرینەکەی یەغمووراغادا ئەسپ دزە بە ناوبانگ و لەمێژینەکان دزەلاوو تازەکارەکانیان فێری شێوەی ئەسپ دزین دەکرد، و لەنێو وان دا دزە لێوەشاوەو بە تواناکانیان بە یەغمووراغا دەناساند. لەو مەزرایەدا "ئووزەبیر"ی هەشتا ساڵە، ئەو ئەسپ دزە باڵادەست و ئازایە چۆنیەتیی لەتوپەت کردنی سندم و رێگای دزینی ئەسپی سندم کراوی فێری دزە هەڵکەوتووەکان دەکرد. لەسەرانسەریٚ چوکووراواو بگرە سەرانسەری تورکیە دا خەڵك ئاگاداری کاروبارو بەرنامەی یەغمووراغا بوون. تێکۆشانی ئەو رایەڵکە بەرین و بەهێزە نهێنی نەبوو. ئەوان کاری خۆیان بێ لەروودامان لە پێش چاوی یەکتر ئەنجام دەدا.

ساڵی رابردوو ئەسپێکی زۆر رەسەنی شێخێکی عیراقیان دزیبوو. شێخ کە بۆ ئەسپەکەی شێت و شەیدا ببوو، وەڕێ کەوت و راست چوو بۆ مەزرایەکەی یەغمووراغا، بە چاوی بە فرمێسکەوە ـ مەڵێ چاو، بڵێ کانیی فرمێسك ـ دەردی دڵی خۆی بۆ یەغمووراغا هەڵڕشت و سەرەنجام گوتی:

"یەغمووراغا، ئەگەر ئەسپەکەم نەبینرێتەوە دیق دەکەم." ئەجار کیسەیەك زێری دەرهێناو گوتی:"ئەمە هەمووی بۆتۆ، بەس ئەسپەکەم بۆ بدۆزەوە." یەغمووراغا کە رەگێکی پیاوەتیی هەبوو، و لە وەزعی شێخیش نارەحەت ببوو، پارەکەی وەرنەگرت. دەستی شێخی گرت و بردیە

تەویلە. شێخ لە دوورەوە چاوی بە هەموو ئەسپەکان دا خشاندو گوتی:"ئەسپی من لەگەڵ ئەم ئەسپانە نیە."

یەغمووراغا یەکێك لە دزە بەناوبانگەکانی بانگ کرد، دایە دەستی شێخ و پێی گوت:"هەتا ئەسپی شێخ نەبینیەوە، نەیەوە ئێرە."

پاش شەش مانگ ئەسپی شێخیان لە چیاکانی "مارسین" لەلای یەکێك لە خانەکانی عێلاتی چادرنشینی یووروك دۆزیەوەو سڵاوی یەغمووراغایان بە خان گەیاند. خانی یووروك ئەسپەکەی دایەوە بە شێخ و تەنانەت دراوەکەشی لێ وەرنەگرت.

عارف صائم بەگ گوتی:

"یەغمووراغا، دەمەوێ بە دوو مانگ لانی کەم سەد ئەسپم بۆ پەیدا بکەی کە بە کەڵکی ئاووهەوای چوکووراوا بێن."

"بەچاوان، حەز دەکەی هەموویان یەك رەنگ بن."

"نا، پێم باشە رەنگیان جۆراوجۆر بێ. دە سەری کوێت، دە سەری بۆرە، پێنج سەری سوور، زەردو رەنگەکانی دیکە..."

بە دوو مانگان زیاتر لە سەد ئەسپ نێردرایە مەزراکەی عارف صائم بەگ.

عارف صائم بەگ لە پێش دا "یەعقووب چەرکەس"ی بانگ کردە لای خۆی. یەعقووب چەرکەس پیاوێکی زۆر پیرو کەنەفت بوو بە ریشێکی سوورو خەنەتێگیراوو جووتێك چەکمەی بریقەدارەوە کە هێشتا وازی لە سواری نەهێنابوو. دەچووە هەر جێیەك دادەنیشت، دەیگوت:"بابی من ئاغا بوو، نەك بابی ئیدریس بەگ. بابی وی نۆکەری بابی من بوو."

عارف صائم بەگ بە یەعقووبی گوت:

"یەعقووب بەگ چەندت زەوی هەیە؟"

"دوازدە هەکتار."

عارف صائم بەگ دەستی گرت و لەگەڵ خۆی بردیە تەویلە:

"قەباڵەی ئەو زەوییەم بدەیە، لە جیاتییان دوو ئەسپی بە دڵی خۆت لەنێو ئەم ئەسپانە هەڵبژێرە."

یەعقووب لە حاڵێك دا لە سەیران چاوی پێ داپچڕابوون، گوتی:

"بەڕاستتە ئاغا، ئەم ئەسپانە زۆر رەسەن و بە قیمەتن."

"کارت پێ نەبێ، ئەتۆ هەڵبژێرە، با بەقیمەت بن، ئەو باشتر..."

یەعقووب چەرکەس پاش ئەوەی حەوتوویەك لە تەویلەدا لەگەڵ ئەسپەکان بوو، دوو ئەسپی هەڵبژاردن. لە راستییش دا دوو ئەسپی زۆر رەسەن و جوانی سێ ساڵەی هەڵبژاردن، کە بابی حەوتوویەك خۆماندووکردن دەبوون. یەعقووب چەرکەس چووەوە دێی و داستانەکەی بۆ خەڵك گێڕایەوە. چەند کەسێك دەسبەجێ غاریان دا سواری ئەسپ بوون و بە تەقڵەکوت هاتنە لای عارف صائم بەگ کە:"ئاغا ئێمەش زەویمان هەیە."و بەگیش پاش پرسیارو لێکۆڵینەوە بە پێی زۆرو کەمیی زەوییەکانیان هەر کامەی ئەسپێك هەتا حەوت ئەسپی دانێ.

پاش چەند مانگ لە تەویلەی عارف صائم بەگ دا ژمارەیەکی زۆر کەم ئەسپی رەسەن مانەوە، بەڵام لە جیاتی ئەوە لە گوندی ئاك مەزار خەڵکێکی زۆر بوونە خاوەن ئەسپ.

بەم جۆرە لە سەرەتادا دەست بەسەرداگرتنی زەوی لە گوندی ئاك مەزار ئاسان بوو. بەڵام دوایە وردە وردە وەزەحمەت کەوت، و عارف صائم بەگ شێوەیەکی دیکەی رەچاو کرد، ئەویش چاوترسێن کردنی چەرکەسەکان بوو. ئەم شێوەیەش کاریگەر بوو و لەم رێگایەشەوە زەوییەکی زۆری وەدەست هێنا. بەڵام دەستەیەك لە جووتیارەکان و لە سەرووی هەموویانەوە ئیدریس بەگ هاوسوێند بوون کە تەنانەت تاقە بستێکیش لە زەوییەکانیان نەدەن بە عارف بەگ "زەوییەکانمان بەجێ بهێڵین، بچینە کوێ؟" ئیدریس بەگ نەیدەتوانی هەر بیریشی لێبکاتەوە.

عارف بەگیش دەیگوت:"کوێتان پێخۆش بێ، لەوێتان نیشتەجێ دەکەم."

ترۆمبێلی فۆردی رەشی عارف صائم بەگ بەو چاوە زەلامانەو بەو تایە لە خۆڵ دا ون بووانەیەوە چەندین جار هاتوچۆی ماڵێ ئیدریس بەگی کرد. زۆری هەوڵ دا. عارف صائم بەگ زۆر پێشنیاری بە ئیدریس بەگ کردن، کە هێندێکیان لە جێی خۆیان دا جێگای سەرنج بوون. تەنانەت گوتی:"بە پاشا دەڵێم لە جێگایەك تۆ وەك نوێنەری مەجلیس هەڵبژێرن." دیسان ئیدریس بەگ حازر نەبوو بستێك زەوی بدا. عارف صائم بەگ دەستی بە هەڕەشە کرد. ئیدریس بەگیش لە وەڵامی هەڕەشەکانی دا هەمیشە دووپاتی کردەوە:

"ئاغا، ملمان لە موو باریکترە... باشە ئاغا ملمان لە مووش باریکترە."

## (٢٣)

سامێکی کوشندە سەرتاپای گیانی ئادەمی داگرتبوو. لە دوێنێ شەوێوە هەروا بەسەر پێوە وێستابوو" هەتا لێوارەکانی ئاکچاساز دەڕۆیشت، لاقی دە گۆلاوەکە رۆدەکردن و دووبارە دەگەڕایەوە. لەبن ئەو دارە کە ئێستا لێی راوەستابوو مێشوولە حەشریان دەکرد. بە جۆرێك وزەوزیان دەهات دەت گوت فیتوو لێدەدەن. بە سەروچاوو دەست و لاقی دا دەنووسان. تەنانەت لەسەر سوخمە ئەستوورەکەی و کراسەکەشیەوە پێیانەوە دەدا. ئادەم گێژ بوو، داخوا ئەو ئەسپەی تفەنگی لێدابوو، ئەسپە بۆرەی خۆی بوو یان ئەسپی خەنەیی. بەردەوام لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"پێم وایە لە ئەسپی خەنەییم داوە، وەختێك دەکەوت وەك دارێکی رەش بە لا دا دەهات. رەش بوو. رەش رەش بوو. ئەگەر بورە بێ، لەبەر هەتاو دەبریسکێتەوە." بەم لێکدانەوەیە دڵی خۆی خۆش دەکرد. بیری دەکردەوە:"سبەینێ دەچمە لای بەگ. سەری ئەسپەکە فڕێ دەدەمە نێوەڕاستی حەوشەی، پێی دەڵێم ئاغا! عومری دوژمنانت وا کورت بێ. حەز دەکەی سەری یۆبازئۆغلی، وەسمانەزلە، حەمەدۆکیشت بۆ دێنم. کەیفت لێبێ سەری مستەفا کەمال پاشا..." لەبەر خۆیەوە پێدەکەنی و ماوەیەکی درێژ لە تاریکایی دا تەماشای ئەو جێیەی دەکرد کە کەلاکە ئەسپەکەی لێ رەش دەچوو. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"بڕوانە، بزانە! رەش رەش درێژاو درێژ لێی کەوتوە، فەرموو ئەمەش ئەسپی خەنەیی کە کوشتمان. تا ئێستا هەڵکەوتوە فیشەکمان بە خەسار بچێ؟" هەڵ دەستایە سەر پێ، بەنێو نێرگزەجاڕەکەدا تێدەپەڕی، گوڵەکانی لە بن پێی دا دەپلیشاندەوە، لە کانێیەکە ئاوی فێنکی دەخواردەوەو دەیگوت:

"لەمەش دا سەرکەوتین، لەم بابەتەشەوە رووسوور دەرچووین." ئەودەم لە قامیشەڵانەکەوە هەتا بن دارچنارەکە دەهات، بەڵام یەك هەنگاویش لە دارەکە ئەولاتر نەدەرۆیشت:"بچم چاوێکی لێ‌کەم" هەنگاوێکی بۆ لای کەلاکە ئەسپەکە هەڵدێنایەوە، بەڵام ترسێکی سوار دەبوو نەی‌دەتوانی هەنگاوێکی دیکە هەڵێنێتەوەو دەگەڕایەوە. لە پاشان لە نەکاو فکری بۆ پەیدا دەبوو و بە دەم ناڵینەوە لەبەر خۆیەوە دەی‌گوت:"ئەگەر ئەوەی کوشتوومە ئەسپە بۆرە بێ، هەتا ماوم ئاغا چاو لە چارەم ناکا، ناکاو ناکا. باشترین ئەسپی بەستەزمانەمان کوشتوە... چووینە تەویلەکەی باشترین ئەسپیمان هەڵبژارد، گرتمان، پاشانیش پێنج گوللە..." ئەگەر چووباو کەلاکە ئەسپەکەی دیتبایە، لەو ئەشکەنجە سامناکە نەجاتی دەبوو...

مژێکی قورس و داسەپاو لەسەر شەو نیشتبوو، مێشوولەکان و دەستەکانی کە لەبەر پێوەدانی مێشوولە دەبرژانەوە، جلکەکانی، کڵاوەکەی و لاقەکانی هەموو بە تێکرا لە ئاونگ دا خووسابوون. یەك تەکانیش ئارەقی دەرشت، پشووە بایەکیشی نەدەهات. چووکترین دەنگ بەرگوێ نەدەکەوت. تەنیا گەرمابوو، گەرمایەکی خنکێنەر. ئادەم دەستی برد یەخەو بەرۆکی کراسەکەی کردنەوە. لە ناڕەحەتی‌یان خەریك بوو دەخنکا. لە جێی خۆی بەند نەدەبوو.

هەوڵی دا بخەوێ، سەری وەسەر تەمباسکێك کرد، بەڵام خەبەرێك لە خەو نەبوو. لەکاتێك دا تا دوێنێ هەر کە سەری دەکردەوە خەوی لێ‌دەکەوت. کەمێك تەنیشتاو تەنیشتی کرد، بەڵام بێ‌سوود بوو. هەستا. بەرەو قەڵای ئاناوارزا شۆڕ بووەوە. هەرچەند شەو بوو، بەڵام دیسان پەرەسلێرکە بە بەردەمی دا تێ‌دەپەڕین. هەتا لە کەلاکە ئەسپەکە دوورتر دەکەوتەوە، ناڕەحەتی‌یە دەروونی‌یەکەی کەمتر دەبوو. شادی‌یەکی دڵگر دەورەی دەدا. هەتا بەیانی هەروا بەرێ دا رۆیشت. بەری بەیانی راوەستا. ئاوڕی دایەوە تەماشای ئەو شوێنەی کرد کە دوێنێ ئێوارێ ئەسپەکەی لێ‌کوشتبوو. کەلاکە ئەسپەکە دیار نەبوو، بەڵام دارچنارەکە بەو لك و پۆپی بەربڵاوی‌یەوە رەش دەچوو. کەمێك لەولای دارچنارەکە لە پەرپەرۆچکەی ئاسمان پۆلە داڵاشێك چەرخیان دەدا."

ئادەم چەند لەحزەیەك رەق لە جێی خۆی راوەستاو تەماشای پۆلە داڵاشەکەی کرد کە بۆ لای دارچنارەکە نەوی دەبوون. دەستی بەرەو ئاسمان راگرتن و بە دڵپاکی‌یەکی منداڵانەوە، وەك منداڵێك کە لە دڵێکی پاکەوە شتێك داوا بکا گوتی:"خوایەگیان! ئەتۆ بکەی ئەو ئەسپەی کوشتوومە ئەسپی خەنەیی بێ. خوایە، ئەگەر ئەو نەبێ ئەمن ئیدی ناتوانم چاو لە چاوی هیچ کەس بکەم، تەنانەت چاوی ژنەکەشم. خوایە بۆخۆت دەزانی کە ئەوم لە گیانی خۆم خۆشتر

دەویێ. ئیدی ناتوانم چاو لە چاوی ویش بکەم." زۆری وەڕەزیی دیتنی خێزانی کردبوو...
"خوایە! ئەگەر ئەو ئەسپەی کوشتوومە خەنەیی نەبێ، ئەمن دەمرم. خوایە یارمەتیم بدە!"

لەوێ لە نیزیك چنارەکە کەلاك خۆرەکان لەئاسمان دەهاتنە خوارو بە باڵی فشەوە بە هەڵبەز دابەز لەنێو گژو گیادا لەبەر چاو ون دەبوون.

غاری دا بۆلای کەلاکە ئەسپەکە. بڕیاری دابوو چاو لێك نێ و وەختێك گەیشتە نیزیك دارەکە، راست لەو جێیە کە کەلاکە ئەسپەکەی لێکەوتبوو، چاوی هەڵێنێ.

هەوا زۆر گەرم بوو. هەتاوێکی گەرم لە گۆڕایی دەشتی ئاناوارزای دەداو هەموو شتێکی سوور دەکردەوەو دەیبرژاند. هەتاو ئاور دەرشایەوە. زیندەوەر لە مەیدانێ نەبوو. ئەسپ، وڵاغ، باڵدار، پێرۆ، مێش و جڕوجانەوەرو کاکڵەمێشان و مار هەموویان پەنایان بۆ بەر سێبەرو جێگای فێنك بردبوو.

بە هانکە هانك گەیشتە دارچنارەکە. ئەوەندە ماندوو بوو کە نەیدەتوانی بە پێوە راوەستێ و لەبن دارەکە بێحاڵ کەوت. لە بێخەوییان خەریك بوو بمرێ. شەکەت بوو. سەری وەسەر رەگی چنارەکە کردو بە سیلەی چاو روانیە ئەو داڵاشانە کە لە هەواوە دەهاتنە خوار. لە کاتێك دا لەداڵاشەکانەوە رامابوو، خەوی لێکەوت. دەستی راستی توند لە قۆنداغی تفەنگەکەی قایم کردبوو.

کەلاك خۆرەکان لە ئاسمانەوە دەهاتنەخوار، سەدان داڵاش بە رەنگی رەش، خۆڵەمێشی و ئاماڵ نارنجی لەسەر زەوی نیشتن. دەنگی لێك درانی باڵەکانیان دەوروبەری داگرت. لەنێو وان دا چەند هەڵۆش دەبینران، هەڵۆی پیرو جحێڵ. بەڵام لە کەلاکی ئەسپەکە نیزیك نەدەبوون. لە دووری چاوەڕوانی هەڵفڕینی داڵاشەکان بوون.

بێسەرەوبەرەیی و تێکەوە هاویشتنی داڵاشەکان لەسەر کەلاکە ئەسپەکە ماوەیەکی زۆر درێژەی هەبوو. کەلاك خۆرەکان لەسەر کەلاکی ئەسپەکە سواری یەکتر دەبوون و کەڵەکە دەبوون. پاشان باڵەکان پەرش و بڵاو دەبوون و بێپسانەوەش لە ئاسمانەوە پۆل پۆل داڵاش دەهاتنەخوارو لەسەر زەوی دەنیشتنەوە. مەودای نێوان کەلاکە ئەسپەکەو ئەو دارە کە ئادەمی لەبن خەوتبوو، تەنانەت بن چنارەکەو دەوروبەریشی پڕ لە ئاپۆرای داڵاشەکان بوو کە باڵەفڕەیان دەکرد.

دەوروبەری نیوەڕۆیە بوو کە داڵاشەکان دەستیان کرد بە رۆیشتن و ئاخرین کەلاك خۆرە کە تۆسقاڵێك گۆشتی بۆ پچڕین لەو کەلاکە ئەسپە دەست نەکەوتبوو، لێی دا رۆیشت. لەوێ، لەو

کەلاکە ئەسپە تەنیا کاولێکی سپی، کەللەسەرێك و تۆزێك کلك و چەند هەودا یاڵ لەسەر زەوی مابوونەوە.

پاش داڵاشەکان چەند سەگی لەڕی نیوەمردوو هاتن و قاوغی ئەسپەکەیان بە راکێش راکێش بردە نێو قامیشەڵان و لەوێ لە سووچێکی بەلاوە لەبن دارە بیەیەك دەستیان کرد بە کرووسینەوەی ئێسکەکان.

هەتاو لە ئادەمی دا. لەگەرمان خەریك بوو ببرژێ، شەلاڵی ئارەق بوو. وەخەبەر هات، پاش لە خەو هەستان کاتێك بۆ کەلاکە ئەسپەکەی روانی، نە کەلاك مابوو، نە کەلاك خۆر...

ئێسك و پرووسکی ئەسپەکە چیان لێهات؟ لەوێ لە جیاتی ئێسکی ئەسپەکە تەنیا سێچوار هەلۆی پیر بە باڵی داچۆڕاوەوە دەسووڕانەوە. ئادەم لەو بارەیەوە خۆشحاڵ بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "سەرەنجام ئەسپی خەنەیی دایك ...م کوشت. گۆشتەکەی کەلاك خۆرە خواردیان و ئێسکەکانی سەگان بردیان."

چووە ئەو جێیەی لە پێش دا کەلاکە ئەسپەکەی لێکەوتبوو. چووکترین شوێنەواری ئەسپەکەی لێنەمابوو. لەسەر عەرزی و لەسەر گیاوگۆڵ نە پەڵە خوێنێك هەبوو، نە هەوساری ئەسپ و نە نیشانەیەك. داڵاش و سەگەکان هەموویان لەبەین بردبوون. دیارە ئادەمیش ئەوەی پێش بینی دەکرد. گوتی:

"خوایە هەزار جار شوکور. لەم گرفتارییەشت نەجات دام. ئاخرەکەی کوشتنی ئەسپی خەنەییت بە نسیب کردم. سەد هەزار جار سوپاس بۆ تۆ. هەر بگەمەوە ماڵێ کەڵەبابێك دەکەم بە خێر. بەڵام ئەسپە بۆرەی چۆن وەبینم؟ کەللەسەری ئەسپی خەنەیی لە کوێ پەیدا بکەمەوە. ئاغا چۆنم باوەڕ پێ دەکا؟"

زۆری برسی بوو. لە خوار گۆلاوەکەوە ماکاوێك هەبوو. لەخوار ماکاوەکە پنگ شین ببوو. هەر لەو نیزیکانە چەند دارەتوو دیار بوون. کانییەکی فێنك و خۆشیشی لێبوو. چووە وێ. دەسرۆکەی توێشووەکەی لە پشتێنێ کردەوە، دەسرۆکە جاوەکەی لە ئارەق دا خووسابوو، بەڵام نانەکە ئەوەندە رەق بوو کە ئارەقەکە نەرمی نەکردبووەوە.

ئادەم نانەکەی لە ئاوی کانییەکە رۆکرد. نانەکەی کە وەك ماسییەکی رەش دەچوو چەند لەحزەیەك لە ئاوەکەدا راگرت هەتا کەمێك نەرم بووەوە. ئەمجار دەستی کرد بە قەپاڵەلێدانی و بەم جۆرە نانە رەشەکەی خواردو خەلاسی کردو پاش ئەوەی ئەو شیرێژەش کە لە نێو دەسرۆکەکەدا بوو بە مستان وەزاری خۆی کرد، وەڕێ کەوت. لەگەڵ ئێوارە داهاتن، بەرە بەرە

دنیا فێنک دەبوو. ڕۆژبایەك هەڵی کرد. لە لای جنووب لە ئاسمان دا باڵی سپیی هەورەکان هەڵ دەکراو هەڵدەمسا، لەسەر جادە تۆزوخۆڵ هەڵدەستاو کۆڵەکەی گێژەڵووکە لە جنووبەوە بەرەو شیمال وەڕێ کەوتبوون.

لاقی نەبوون بچێتەوە ماڵێ. چیی جوابی بەگ دابایەوە، داخوا ئەسپە بۆرە ڕاستەڕێ چووبووە تەویلە؟ لە پڕ لە دەستی داڵاشەکان تووڕە بوو:"ئەو پیس و چەپەڵانە لـێناگەڕێن پیاو لانی کەم کەلاکی ئەسپێك کە کوشتوویەتی، ببینێ. تەنانەت ئێسکەکانیشی دەخۆن. ئاخر هەی چەپەڵینە، باڵندەش ئێسکان دەخوا؟ ئێوە باڵندە نین، سەگن... سەگبابینە... تووتکەسەگینە، کرمی نێو زبڵدان، هەی کەلاك خۆرە، مشوورتان دەخۆم." هەتا دەچووە پێش قەڵس ترو هەڵچووتر دەبوو.

وەختێك گەیشتە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا بوولێڵ داهاتبوو. لەنێو بەردەڵانەکە لەسەر قوولکەیەك کە دەوروبەرەکەی سوور بوو، پێنج کەلاك خۆرە باڵیان جووت کردبوون و ئەستۆیان ڕاکێشابوو. تفەنگی هێنایە سەر دەستی، سێرەی لەوی هەرە گەورەیان گرت و دەستی لـێکێشا. داڵاشەکە بە زیقەزیق لەسەر بەردەکانەوە خلۆر بووەوە. ئادەم لە بەردەکان وەسەر کەوت و گەیشتە سەر سەری داڵاشەکە کە هەتا نیوەڕێ هاتبووە خوار. داڵاشەکە هێشتا نەمردبوو. لە حاڵێك دا خەریك بوو وەسەر کەوێتەوە ئادەم سەرنووکی باڵی گرت و بە ڕاکێشان هێنایەخوارێ.

جار بە جار ڕقەکەی زیاتر دەبوو. لە ڕقان نەیدەتوانی بیریش بکاتەوە. لە ڕێیەدا لە ڕقان بە پاژنەی پێی سەری داڵاشەکەی کە هێشتا نەمردبوو، پان کردەوە، و ڕاستەڕێ ڕۆیشت بۆ ماڵی سەفەرە کوردە دۆستی سەردەمی سەربازیـیەکەی کە لە گوندی ئاناوارزا دەژیا. وەختێك سەری هەڵبڕی کە گەیشتبووە دەرکی سەفەر. سەفەر چاوی پێی کەوتبوو، خەریك بوو لە پلیکانی ساباتەکەی دەهاتەخوار:

"براله ئادەم زۆر بەخێر بێی. ئەمن پێم وابوو ئیدی ئێمەت لەبیر چووەتەوە. بزانە منداڵەکانمان چەند زوو گەورە بوون!"

بەدیتنی ئەو داڵاشە کە ئادەم باڵی گرتبوو و هەتا وێ ڕایکێشابوو، گوتی:

"پێم بڵێ ئەوە چیە؟ داڵاشت بۆ بە دیاری هێناوین؟"

"دەهاتم بۆ ئێرە لە ڕێیە کوشتم."

"ئێستا وەرە سەرێ، وەرە ساباتێ، ماندوو دیاری."

پاشان بانگی خێزانیی کرد:

"وەرە بزانە کێ هاتوە. ئادەمە. مەسینەیەك پڕ کە لە ئاو بیهێنە سەروچاوی بشوا."

ئادەم دەست و چاوی شوتن و وشکی کردنەوە. چووە ساباتێ. دۆکلیوی بە پنگێیان هەبوو. ئادەم چەند رۆژ بوو بە ئەزرەتەوە بوو جەمێك خواردنی گەرم بخوا. هەموو شۆرباوەکەی خواردو پاشان پاڵی وە پشتیەکە داو بە درێژی داستانی خۆی و ئەسپی خەنەیی و حیکایەتی داڵاشەکانی هەموو بۆ سەفەر گێڕایەوە. سەرەنجام قسەکانی بەم رستەیە تەواو کرد:"ئەتۆ دەڵێی چی سەفەر، ئەتۆ رێیەکم نیشان بدە."

سەفەر بیری دەکردەوە. ئادەم پرسیارێکی دیکەی لێکرد:"پێت وایە ئەسپی خەنەییم کوشتبێ؟"

سەفەر گوتی:"نازانم. کێ دەزانێ. هەرکام لەو ئەسپانە مابێ، دەبێ بیبینیەوە، ئەودەم مەسەلەکە روون دەبێتەوە. ئاوا بە دەستی بەتاڵ ناتوانی بچیەوە لای عەلیسەفابەگ. ژیانت تێك دەچێ. دەبی بە گاڵتەجاڕی خەڵك. بە هیچ کەس، تەنانەت بە ژنەکەشت مەڵێ کە چونکە ئەسپەکە داڵاش خواردیان نەت توانی بی بینی. خەڵك بە دەهۆڵ و زوڕناوە وەدوات دەکەون."

ئەو شەوە لە ساباتێ ئادەم لەبەر فکرو خەیاڵان هەتا بەیانی خەوی لێنەکەوت.

هەتاو نەکەوتبوو ئادەم لە ساباتێ هاتەخوار. توێشوویەك کە خێزانی سەفەری، شەوی رابردوو بۆی ساز کردبوو لێی وەرگرت و وەڕێ کەوت. دیسان خوا چاکە بۆ ژنێ سەفەری بکا، ئەگینا بەو حاڵەی ئەوی تێدا بوو توێشووی رێگای هەر وەبیریش نەدەهات.

هەروا کە بە لێواری جەیهان دا دەڕۆیشت، بەرەو رۆژهەڵات وەرسووڕا. بە تەنیشت بەرزاییەکانی ئاناوارزادا رابوردو بایدایەوە. گوێی لە دەنگێك بوو. وەك دەنگی ناڵی ئەسپ دەچوو. سەری هەڵبڕی. ئەسپی خەنەیی لە بەرامبەری خۆی دا دی. ئەسپەکە، راست لەسەر دوندی گابەردێك راوەستابوو، ئارام ئارام کلکی رادەوەشاند. ئادەم گێژو کاس ببوو. ئەژنۆکانی دوولا هاتنەوەو هەر لەوێ بێحاڵ لەسەر عەرزی دانیشت.

تاوێك دواتر ئەسپەکە جووڵا. بێ ترس و خۆف لە گابەردەکە هاتەخوار. پاش ئەوەی چەند جار بە دەوری خۆی دا سووڕا، بە لینگ دان بەرەو "کەسیك گلی" دەخۆی نووسا.

ئادەم لە کاتێك دا دەستی راستی لەخۆڵێ رۆکردبوو، هەوڵی دەدا راست بێتەوە گوتی:"ئەمن لە کوێ دەم زانی، ئا...خ ئەمن لە کوێ دەم زانی..."

## (٢٤)

ئالّ و گۆڕێکی بەرچاو بەسەر ورەی جووتیارەکان دا هاتبوو. گیانێکی تازەیان بە بەرداکرابوو. هەموویان دەم بە پێکەنین لە ماڵێکەوە دەچوونە ماڵێکی دیکە.

بەڵام لەبارەی وەسمانەزلەوە گلەیی لەدوای گلەیی بوو کە لێی دەکرا. دێهاتی‌یەکان دەیان گوت:

"وەسمانەزلەی نەحلەتی! لەبەر حەسوودی‌یان نیشانی کەسی نەدا. ئاخر نەحلەتی، چما چ دەبوو ئەگەر ئێمەش جارێك ئەو روخسارە جوانەیان دیبایە. هەر دەبێ بۆخۆی بی‌بینێ، پیرەپیاوی حەسوود."

"نەی‌دەتوانی تەحەمول بکا کەسی دیکە بی‌بینێ؟"

"پیاو ئەگەر پیر بوو قرنیس دەبێ."

"سێ رۆژان قەلنەی بە لالێویەوە ناو بە کەش و فشەوە بەنێو ئاوایی‌دا هات و چوو. وای خۆ هەڵمساندبوو دەت گوت پێی‌وایە هەربەراستی سوڵتان سولەیمانە."

"پیرەپیاوی بەدفەڕ... ئێستا کە شەهێنەکەی لەسەر هێلانە هەڵفڕاندوە هاتوە لە جێی دا کەوتوە."

"با بکەوێ!"

"با بکەوێ و سەقەت بێ!"

"ڕەببی ڕاست نەبیەوە پیرەپیاو، ئەگەر دێهاتی‌یەکانیش تاوێك روخساری وەك گوڵی وی‌یان دیبایە چ دەبوو؟"

"ئەتۆی پێ پیاو بوو، هاتە ماڵێت..."

"بۆ پێت حەسوودی بوو ئەو خەڵکە بی‌بینن؟"

"له جێی دا کەوتوە، ئیشەڵڵا لێی ڕاست نابێتەوە."

"کێ دەزانێ ئەو چ جۆرە پیاوێك بوو!"

"چەندیش جوان چاك بوو!"

"دەڵێن لە وەختی شەڕدا تفەنگەکەی بیست گەز درێژ دەبێتەوە!"

"دەڵێن گولله کاری لێ ناکا."

"دەڵێن شەوێکیان وەکیل باشی عاصم لە خەوێدا غافلگیری کردوە."

"ئەو هەروا نووستبوو..."

"بەستەزمانە بێخەبەر لە هەموو شتێك..."

"ڕاست دەتگوت منداڵێکی شیرەخۆرەیە."

وەکیل باشی عاصم فەرمان بە دەستەیەك سەرباز دەدا ورگی پڕکەن لە گولله..."

"گوللەکانیان لێدابوو."

"لەپڕ دیبوویان کە..."

"چییان دیبوو؟!"

"گولله ناچنە لەشیەوە."

"دیارە ناچن."

"ناش توانن بچن."

"دەك خوا عەمرت بڕێ وەسمانەزلە! پیرەپیاوی بەخیل نەیهێشت سەروەری خۆمان ببینین."

"بلێ ڕووحی خۆمان..."

"بلێ جگەر گۆشەی خۆمان..."

"بلێ شەهێنی خۆمان..."

"بلێ گوڵی خۆمان..."

بەو حاڵەش خۆشحاڵ بوون. هەرچەند لە دەستی وەسمانەزلە ناڕەحەت بوون، بەڵام ئەوە کە حەمەدۆك هاتبووە گوندەکەیان بۆ وان جێی شانازی بوو. لە وەسمانەزلە تووڕەو دەهری بوون: ئاخر چ دەبوو خەبەری بە وانیش دابایە کە بۆ تەنیا جارێکیش بێ قەڵافەتی حەمەدۆك ببینن؟

پێنج شەش ڕۆژ بوو لە دڵی وان دا خاترجەمی جێگای ترس لە عەلی سەفابەگی گرتبووەوە. تەنانەت لەبیریان چووبوو کە کەسێکی وا هەشە. دێیەکە ڕەنگی جێژن و زەماوەندانی گرتبوو و جووتیارەکان گیانێکی تازەیان بە بەرداکرابوو.

"مام وەسمان، بۆچی ئەگەر حەمەدۆك هات بە ئێمەت نەگوت؟"

"کوڕینە ئەوی ڕاست بێ نەم وێرا، نەم وێرا."

"چما ئێمە چیمان لـێدەکرد؟ لە هەردوو چاوی خۆمان باشترمان پارێزگاری لـێدەکرد."

"ئاومالەکان دڵیان لێت ئێشاوە."

"بزانە! هەرچەند ئەو، دێیەکەی بەجێهێشتوە، دیسان دێهاتییەکان زیندوو بوونەوە. هەرهاتن و ڕۆیشتنەکەی غیرەتی وەبەر ناون؟"

"نەم دەتوانی هیچ بە کەس بڵێم. ئەگەر ئاغایەك یان حکوومەت پێی زانیبا... دەڕژانە نێو دێی و شەهێنەکەمیان دەکوشت. نەم دەوێرا بیڵێم..."

"ئێمە ئەومان نەدەدایە دەستی پادشاو خونکاریش. دەبوو لە پێش دا ڕووحمان لـێبستێنن، دوایە ئەو..."

" ئەمن چووزانم، چووزانم. باڵندەیەك بوو هات لە هێلانەیەك دا پەنای گرت..."

"خۆ ئەو، گوللە کاری لـێناکا..."

"ئەو خەنیمی لەشکرێکە."

"ئەو گەنج عوسمانە."

"ئەمن نەم دەزانی کوڕینە، ئەمن نەم دەزانی!"

"باشە، ئاخر دەکرێ، ئەتۆ نەت هێشت سەری لووتیشی ببینین."

"بۆخۆی نەیویست. لەشکرێك جەندرمەی بەدواوە بوو. چەند مانگ بوو هیچی نەخواردبوو. تەنیا چنگێك ئێسك و پێستی لـێمابووەوە. پێی گوتم مام وەسمان بەم وەزع و حاڵەوە نیشانی دێهاتییەکانم مەدە."

"ئێمە خواردنی باشمان دەدایە، ڕووحی خۆمان دەدایەو قەڵەومان دەکردەوە."

جووتیارەکان تا ماوەیەك لەوە کە دەرفەتی دیتنی وییان لە دەست چووبوو، زۆریان خەفەت خوارد. تووکیان لە وەسمانەزلە کردو کێشایانە ژێر پرسیار. بۆچی. بۆچی نەیان توانیبوو بیبینن؟ داخوا جارێکی دیکە دەرفەتی وا ڕێ دەکەوێتەوە؟ خەڵکی گوندەکانی دراوسێیش زۆریان جنێو بە وەسمانەزلە دان و دڵیان لێی ئێشا. پاشان ژمارەیەك پەیدا بوون کە دەیان گوت ئەویان لە وایوای و گوندەکانی دیکە دیوەو چۆنیەتیی ئەو چاوپێکەوتنەیان گێڕایەوە. هەر کەسە ئەو دیتنەی بە جۆرێك دەگێڕایەوەو وەسمانەزلە لە جێوبانی نەخۆشی دا لەبیر چووەوە.

لە پێش دا وەلی، واتە ئەو کەسەی حەمەدۆکی بردە ماڵی وەسمانەزلە دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە:

"شەکەت و ماندوو لێی کەوتبووم و خەوم لێ کەوتبوو. لە خەوێم دا ـ خوا وەخێری گێڕێ ـ ئاوێکی رەوانم دی، روون روون. مەڵێ ئاوی رەوان، بڵێ هەتاوی رەوان. لەپڕ دیتم پیاوێکی باڵابەرز لە ئاوەکە دێتە دەرێ. دوو قەد فیشەکدانی راست و چەپ لە خۆی دابوون. تفەنگێکی سەوزی بە دەستەوە بوو. دەنگێکم هاتە بەر گوێ کە دەیگوت:"مام وەسمان! مام وەسمان! لە خەو راپەڕیم، گوتم داخوا خەون بوو، خەیاڵ بوو، چ بوو؟ کەچی دیتم یەکێك لەبەر دەرگا راوەستاوە. دەرگام کردەوە. دیتم پیاوێك ، پیاوێکی کەڵەگەت لە پشت دەرگایە. لەشی هەموو فیشەکدان بوو، ئەوەندەی فیشەك لە خۆی بەستبوون جێی نووکی دەرزییەی نەمابوو. بریسکەی دووربینەکەی لە چاوی پیاوی دەدا. دووربینەکەی زێڕ بوو. دەسکی دەمانچەو نێزەکەشی هەر زێڕ بوون. زێڕی خالیس. گوتم: فەرموو بۆ ژوورێ. هاتە ژوورێ. چرام هەڵکرد. دانیشت و پاڵی بە دیوارەوە دا. چاوێکی هەبوون هەر مەپرسە. نەت دەتوانی تەماشای بکەی. پیاو لێی دەترسا. چاوی وەك چاوی گورگی کێوی دەدرەوشانەوە. نوێژەکەی کرد. لە نوێژێ دا دەستەکانی هەتا جمگەی سەوز بوون. نانم هێنا. خواردی. یەك قسەی نەدەکرد. هەر لە فکردا بوو. ناویم پرسی. سێ جارم لێ پرسی وەڵامی نەدایەوە. وای نیشان دەدا کە گوێی لێ نەبووە. پاشان هەڵستا. سەری وە هەڵاشی میچی کەوێڵەکە کەوت. بەژنی ئەوەندە بەرز بوو کاتێك دەیەویست لە دەرگای ژوورەکەمان بچێتە دەرێ دوولا هاتەوە. دەرگای ئێمە سەیفەلی بە رەحەتی پێی دا دەڕوا. وەختێك بە قیت و قنجییش دەڕوا دیسان سەری دوو بستی بۆ سەردەرانەکە دەمێنێ. لەبەر دەرگا وەڕێ کەوت. گوتم:"بت بەمە لای مام وەسمان." گوتی:"ماڵەکەیم نیشان بدە. شتێکی دیکەشی گوت. پێی گوتم:"ئەم دێیە لە زوڵم دا خنکاوە، نابێ ئەوەندە زوڵم دەرهەقی بنیادەم بکرێ." ماڵێ وەسمانەزلەم پێ نیشان دا. نم نم باران دەباری. وەشك کەوتم. لەبەر دەرگای ماڵی وەسمانەزلە چاوەڕێ بووم. لەپڕ دیتم لەبەر دەرکی ماڵی وەسمانەزلە گوڵە ئەستێرەیەك بەقەدەر غوولێك درەوشایەوە، درەوشایەوەو کووژایەوە. لەپاش ئەو شەوە ئەو نوورە لەبەر دەرکی ماڵی وەسمانەزلە هەروا هەڵ دەبوو و دەکووژایەوە."

بەڵام پاش ئەم حیکایەتە داستانی شیرنی دیکەشی پێوە زیاد کردن. دووهەم کەس کە پاش وەلی حەمەدۆکی دیبوو، "سەروەر خاتوون" بوو. لە دێیەکەی تەنیشتیان "مەلا مستەفا"

دیتبووی. لەئاناوارزا جەبار، لە حاجیلار "ئەحمەدەکوێر"، لە نارلی قشلا "جەمشیدە کوردە"، لەوایوای زەینەلّ و "کورت تەمیر"و لە گوندی "ئووك سووزلی"یش مگلب دیتبووی. ژمارەیەکیش ئیددیعایان دەکرد کە ئەو شەوەی سوارەکان پەلاماری دێیان دابوو، ئەویان لە تەویلەی مالّی وەسمانەزلەدا دیتوە. زۆرانیش دەیان گوت ئەویان لە حەوشەی مالّی کەرەمە کوردە دا دیوە کە تەقەی لە سوارەکان کردوەو دیویانە کە چۆن تفەنگی لە وەکیل باشی داوەو وەکیل باشی وەك گا هۆڕاندوویە!

زۆر کەسیش هەبوون کە گۆیا نیوەشەوێ ئەویان دیوە کە لە قەراخی ئاکچاسازو لە قەلاّی ئاناوارزا پیاسەی کردوە. ئەویان دیوە کە لەسەر گابەردێك دانیشتوە، سەری لەنێو دەستانی گرتوەو لە دەریای فکرو خەیالّ دا نوقم بووە، لەحالێك دا سەدان هەلّۆ بەدەوری دا فڕیون. هەلّۆیەکان دەهاتن لەسەر ئەژنۆی دەنیشتنەوەو ئەویش هەلّۆ زەلامەکانی وەك بەرخ دەلاواندەوە.

جارێکیش دیبوویان کە سواری ئەسپێکی بۆرەی زەلامە بووە. ئەسپەکە بەو یالّانەیەوە کە دەت گوت هەورن ئەوەندە بە پڕتاو دەڕۆیشت هەروا بزانە بالّی گرتوون. بەم جۆرە وای لێ‌هات کە لە گوندی وایوای و دێیەکانی دیکە ژمارەیەکی کەم نەبێ، کەس نەبوو حەمەدۆکی نەدیبێ!

تەنانەت ئەو ژمارەیە لە جووتیارانی وایوایش کە دێیەکەیان بەجێ هێشتبوو و پەنایان بۆ ساری چام بردبوو، کاتێك خەبەریان زانی کە حەمەدۆك چووەتە وایوای، خەفەتیان خوارد کە بریا لە وایوای بان و روخساری شەریف و وەك پەڕەی گولّی وییان دیتبایە. دەیان گوت:"بۆچی قسەی وەسمانەزلەمان لە عەزری داو نەچووینەوەو دێی خۆمان." یۆبازئۆغلی کە لە کاری نەفامانەی خۆی زۆر بە ئازار بوو، هاتە لای وەسمانەزلەو بە داوای لێبووردنەوە گوتی:"وەك سەگ پەژیوانم ئەو رۆژە نەهاتمەوە. ئەمن چۆنم زانیبایە. خۆ ئەتۆ هیچت بە من نەگوت..."

هەموو منداڵەکانی دێش دەیان گوت دیومانە. رۆژ تا ئێوارێ باسیان دەکرد، لە گەلّی دەژیان و لە یارییەکانیان دا بەشدار بوو. منداڵەکانیش وەك گەورەکان ناویان نەدەبردو لە یارییەکانیان دا ناوی جۆراوجۆریان بۆ دادەنان. لە یارییەکانیان دا جەندرمەو ئاغاکان وەك سەگ لێی دەترسان و وەك مێرۆکە لەبەری دەلەرزین. خۆیان داویشتە سەر کەوشەکانی، لەبەری دەپاڕانەوە، لاقییان ماچ دەکردو لەسەر زەوی جینگلّیان دەدان و لە کاتێك دا هەنیسکیان دەدان و لووتیان پاك دەکردەوە، وەك کرم دەخزین.

پاشان دەستیان کرد بە دانانی گۆرانیی دێهاتی‌یانە لەبارەی حەمەدۆکەوە. هەموو رۆژێ شێعرو گۆرانیی تازەیان دادەنا، شێعرو گۆرانی لە عەرزێ شین دەبوون و دەڕوان و لە عاسمانێ دەبارین! شیوەن نامەی بەسۆز، داستانی سەرسوڕهێنەر، ئاوازی شادی بزوێن و گۆرانیی تێکەڵ بە هەڵپەڕین... تەنانەت منداڵانیش جۆرە هەڵپەڕینێك و گۆرانی‌یەکیان بۆ یاریی منداڵانەی خۆیان داهێنابوو.

ئەم هەست و سۆزەی جووتیاران بەرامبەر بە حەمەدۆك، وەسمانەزلەی زۆر حۆشحاڵ کردو هێزی بە بەردا کردەوە. ئەگەر وا نەبایە وەسمانەزلە بەو زەبرە توندە رووحی‌یە کە وێی کەوتبوو بە ئاسانی نەی دەتوانی لە نەخۆشی راست بێتەوە.

بەڵام شانازی فرۆشتن و شادمانیی جووتیارەکان زۆری نەخایاند. سێ شەو بوو دێیان وەبەر تفەنگان دەدا. بەڵام دێهاتی‌یەکان هەروەك هیچ نەبووبێ، نە ترسان و نە بایەخیان پێ دا. با بێن و گوللەباران بکەن، چەندی پێیان خۆشە با تفەنگان باوێن. ئاخرەکەی رۆژێك نۆرەی وانیش دێ.

وەسمانەزلە کە بە زەحمەت خۆی بەسەر پێوە رادەگرت، شەوانە وەختێك سوارەکان دێیان دەدایە بەر دەسڕێژ لە حالێك دا هاواری دەکرد:

"وەرن سەگبابینە وەرن، تفەنگان باوێن سەگبابینە، رۆژی ئێمەش دێتەوە"، لە ماڵێ دەهاتە دەرو هەردوو گوللەی دەمانچە دوو لوولەکەی پێوە دەنان.

جووتیارەکان هێرشی شەوانە بۆ سەر دێیان بە گاڵتەیەك دەزانی کە عەلی‌سەفابەگ هەموو شەوێ دووپاتی دەکاتەوە. بەڵام رۆژێکیان بەیانی وەختێك لە خەو هەستان، لەوەی کە دیتیان رەق رامان. ئەوەی دەیان دیت و دەیان بیست بۆیان جێی باوەڕ نەبوو. شەوێ هەموو ئەسپەکانی دێیان دزیبوون. بۆ نموونەش ئەسپێك نەمابوو. فکری هەموو شتێکیان دەکرد، هی ئەمە نەبێ. جووتیاری بێ ئەسپ چ خاکێك وەسەری خۆی دەکا؟ جێژنیان ببوو بە تازیە، ئێستا چی‌یان کردبا؟ ئەو رۆژە بێ‌ئەوەی هیچ کارێك بکەن یا قسەیەکیان لە زار بێتەدەر، تا ئێوارێ لە نێو دێی دا سووڕانەوە. هەموویان قڕو قەپیان کردبوو.

بەیانیی دووهەمین رۆژ خەبەرێکی سامناك لەنێو دێی دا گەڕا. دزەکان ئەسپە پیرەکانیان لەگەڵ خۆیان نەبردبوو، بەلکوو کوشتبوویانن و کەلاکەکانیان لە گەڵی چیك چیك لار هاویشتبوون. کە تەماشای دەوروبەریان کرد دیتیان داڵاش لەسەر تۆپراخ تەپە دەگەڕێ. بە غاردان چوونە وێ و دیتیان رەوە ئەسپێك بەسەر یەك دا کەوتوون.

بەم رووداوە هەر ئەو رۆژە بەیانی دوو ماڵ باروبنەیان تێکەوە پێچا: "ساری‌چام بگرەو هاتم." لە دێی رۆیشتن و رۆیشتن. ژمارەیەکی زۆریش بە نیازی رۆیشتن بوون کە مەلافەرهاد

پێشی پێ دەگرتن. ئەگینا نیوەی دێیەکە چۆڵ دەبوو. ئەو گوتی:"کفرە پیاو تەسلیمی زوڵم بێ. کەسێك لە ژێر تەوژمی زوڵم دا ڕۆژیی منداڵی و خاکی باب و باپیرانی بەجێ بهێڵێ و بچێتە غەریبایەتی، کافرە. بەربەرەکانی نەکردن بەرامبەر بە زوڵم وەك ئەوەیە ببیە شەریکی زاڵمەکە. ترسان و سام گرتوویی کفرە."

دەیگوت:

"خوا رزگارکەرێکمان بۆ دەنێرێ. دیتان کە ئەو چۆن هات بەڵام، ئێمە نەمان توانی ڕایبگرین. ڕێگامان دا شەهێنەکەمان لە دەستمان هەڵفڕێ و بڕوا. ئەگەر ئەو لێرە بووایە ئەم بەڵایەمان بەسەر نەدەهات."

زەینەڵ وێڕای گوێگرتن لە قسەکانی مەلا فەرهاد قسەی بێتامی دەکردو زراوی دێهاتییەکانی دەبرد:

"ئەمە هێشتا سەرەتای کارە. چ بەڵایەك کە بەسەرمان نایە. چ بەڵایەك، چ بەڵایەکمان بەسەر نایە؟ ترسان کفر نیە. ئەگەر پیاوی مەترسە!"

مەلا فەرهاد بێئەوەی وەڵامی بداتەوە لە حاڵێك دا تەواوی باوەڕی مەزنی خۆی لە دەنگی دا کۆ کردبووەوە، دەیگوت:"خوا بەندەی هەژاری خۆی بە تەنیا ناهێڵێتەوە، خوا هەمیشە پشت و پشتیوانی ئەو کەسانە بووە کە لەگەڵ زوڵم بەربەرەکانێیان کردوە. ئەگینا تا ئێستا سەرانسەری دنیا پڕ دەبوو لە زوڵم."

لە ماڵێ سەیفەلی کۆبوونەوەو باش باسێکی دووروودرێژ بڕیار درا بۆ وەرگرتنەوەی ئەسپەکان بچنە لای یەغمووراغا. هەموان دەیان زانی دزینی بەکۆمەڵی هەموو ئەسپەکانی دێیەك بە کەس ناکرێ بە یەغمووراغا نەبێ. مەلا فەرهادو سەیفەلی و سەفچەکاهیا سوار بوون و ڕاستەڕێ چوونە مەزرای یەغمووراغا. سەفچەکاهیا ئاشنایەتییەکی نیزیکی لەگەڵ یەغمووراغا هەبوو. لە وەختی ڕاپەڕینی گشتی دا هەردووکیان سەربازی ڕاکردوو بوون و ڕاست سێ ساڵ لە تووڕووس پێکەوە بوون. ئەودەم یەغمووراغا زۆر جحێڵ بوو.

سەفچەکاهیا هەر کە لە ئەسپەکەی دابەزی گوتی:

"هەتیوە یەغموور، ئەم کارە قۆڕە چ بوو کردت؟ پێت خۆشە هەموو ئەسپی دنیا بدزی، بلێ بۆت بدزن، بەڵام بۆچی بوویە داردەستی هەموو سەگ و تولەیەك و هێشتت ئەسپەکانی ئێمە بدزن؟"

یەغمووراغا لە حاڵێك دا لەسەر پلیکانی باڵەخانە ڕاوەستابوو و قاقا بە قسەکانی سەفچەکاهیا پێدەکەنی، گوتی:

"کێ دزیونی، کێ ئەسپی تۆی دزیوە؟ ئەگەر ئەسپەکەتیان دزیوە، ئەدی ئەوەی سواری بووی چیە؟"

سەفچەکاهیا نەڕاندی:

"تووتکەسەگی نەفام، بۆ ئەوەی بیّینە لای تۆ ئەم ئەسپانەمان لە نارلی قشلاّ لە "مەمی دیکاغا" وەرگرت، ئێستا تێگەیشتی، لە دێیەك دا ئەسپێکت نەهێشتەوە. هەرچی بوو کوێر، کەڕ، شەل و نەخۆش هەمووت دزی. پیرەکانیشت کوشتن هەتیوە کەچەڵە..."

"وەرنە سەرێ. ئێستا وەرنە سەرێ، دادەنیشین پێکەوە قسان دەکەین." لەسەر نیوتەختێك دانیشتن، قاوە خورایەوە، نانیان خوارد. یەغموراغا زۆری حورمەت گرتن، بەڵام ئەسپەکانی نەدانەوە. هەرچی پاڕانەوە، هەڕەشەیان کرد، تووڕە بوون، هەڵچوون نەیان توانی ئەسپەکان وەرگرنەوە.

مەلا فەرهاد لە یەغموراغای پرسی:

"یەغموراغا! ئەتۆ پێت وایە ئەو خوایە کە یووسفی لە چاڵاو نەجات دا، ڕۆژێکیش ئاوڕ وەسەر ئێمە ناداتەوە، پێت وایە خوا کەسێك نانێرێ ئێمەش نەجات بدا؟"

سەفچەکاهیا قسەکەی مەلافەرهادی تەواو کرد:

"خوا ڕزگارکەرێکی بۆ ئێمە ناردبوو. بەڵام کوێر بووین و نەمان توانی بیگرین، ئەگینا دزەکانی تۆ نەیان دەوێرا نیزیکی دێش بن..."

یەغموراغا پێکەنی، و بە پێکەنینەوە بەڕێی کردن و ئەوان ناهومێدو دڵشکاو گەڕانەوە بۆ ئاوایی.

## (٢٥)

عەلیسەفابەگ لە پەنجەرەوە تەماشای دەرێی کرد، دوور، لە دەرەوەی حەوشەی تارمایی سێ سواران دیار بوو. یەکێك لەوان زۆر بالآبەرز بوو، و قیت لەسەر ئەسپەکەی دانیشتبوو، و لە پێش ئەوانی دیکەوە راوەستابوو. سوارەکان لەمێژ بوو بێئەوەی قسەیەك بکەن لەوێ راوەستابوون. عەلیسەفابەگیش بێ هەست و خوست و نوقمی فکرو خەیالْ لە پشت پەنجەرەکە راوەستابوو.

خزمەتکارێك کە لە شیپانەی دەرگا دا راوەستابوو گوتی:"چ بە ئیدریس بەگ بلێم؟ لەمێژە لەوێ چاوەڕوانە."

عەلیسەفابەگ لەو فکرەدا بوو کە داخوا ئیدریس بەگ ببینێ یان نا. ئیدریس بەگ پێی لەسەر یەکتر دیتن دەچەقاند. لە ماوەی مانگێك دا ئەمە شەشەمین جار بوو کە ئیدریس بەگ دەهاتە سەردانی و هەموو جارێ گوتبووی پێی بلێن ئاغا لە مالْ نیە. ئێستا بیری لەوە دەکردەوە کە داخوا ئەم چاوپێکەوتنە کار دەکاتە سەر پێوەندیی ئەو و عارف صائم بەگ یان نا؟ پیاو نەی دەتوانی سەر لە کاری کابرایەکی قەلْس و تووڕەی وەك عارف صائم بەگ دەربکا.

لەوانەشە وەرگرتنی ئیدریس بەگ و لەگەلْ دانیشتنی، عارف بەگ تووڕە بکا.

هەتاو خەریك بوو ئاوا بێ. تاریکایی وردە وردە بەرەو دەشت دەهات و دوا رووناکایی رۆژ بەسەر زیوکاریی تفەنگ و خەنجەرو فیشەکدانی ئیدریس بەگ و لەغاوی ئەسپەکەیەوە رەنگی دایەوە.

عەلیسەفا دیسان لە خزمەتکارەکەی پرسی:

"ئیدریس بەگ چیی گوت؟"

"دەڵێ دەمەوێ سەفابەگ ببینم. گۆیا کارێکی زۆر گرنگی پێتان هەیە. بۆخۆی وای دەگوت."

عەلیسەفابەگ دیسان ماوەیەك فکری کردەوەو دیسان تەماشای ئەو سێ سوارە چەکدارە چەرکەسەی کرد کە لە دەرێ راوەستابوون. ئیدریس بەگ لەبەر تیشکی هەتاو راوەستابوو، دوا رووناکایی‌یەکانی رۆژ بەرە بەرە دەکووژانەوە.

عەلیسەفابەگ فەرمانی دا:"بە ئیدریس بەگ بڵێن بێتە سەرێ. بێحورمەتیی پێ مەکەن."

سێ پیاوەکە دابەزین. ئیدریس بەگ لە پێشەوەو هاورێکانی بە دوای دا لەسەرەخۆ لە پلیکانەکان وەسەر کەوتن. عەلیسەفابەگ لەسەر پلیکانان چاوەرێیان بوو. ئەو لە حاڵێك دا دەیگوت:"بەخێر بێن، بەخێر بێن، ئیدریس بەگ، براله." پێشوازیی لێکردو یەکتریان لە باوەش گرت. بە سەرلەقاندنێك بەخێراتنی پیاوەکانی ئیدریس بەگیشی کرد.

ئیدریس بەگ لەپێشەوەو عەلیسەفابەگ بە دوای دا چوونە ژوورێ. عەلی سەفابەگ هاورێکانی ئیدریس بەگی بانگ نەکردە ژوورێ. تا رادەیەك شارەزای داب و شوێنی چەرکەسان بوو، دەیزانی کە چەکدارەکان لە کن سەرکردەی خۆیان دانانیشن و لەبەر دەرگا بە پێوە چاوەروان دەبن.

ئیدریس بەگ بە راشکاوی و پیاوانە بەو دڵپاکیی منداڵانەوە کە بووی، گوتی:

"سەفابەگ، چەند جار هاتمە سەردانت، رەنگە دە جار هاتبم، بەڵام ئەم دیتی. هاتن بۆ ئێرە لەو دوورەوە، ئەویش بە نهێنی دەزانی بۆ من وەك چی وایە؟ لە سەداسەد وەك مردن، بەو حاڵەش هاتم."

"ئێستێ دانیشە، دانیشە. دوایە قسان دەکەین. دانیشە گیانەکەم، قاوەیەك بخۆوە. ئەتۆ کاری زۆر خەتەرناك دەکەی بە نوێژی نیوەرۆیە لە چوکووراوا خۆت دەردەخەی، ئاوا نابێ."

ئیدریس بەگ لە حاڵێك دا لەسەر نیوتەختەکە دادەنیشت گوتی:

"وەڵا پێم عەیبە بە شەو وەك گورگ بە دەشتێ دا بڕۆم. مانگێك لەمەوبەر لە گەلیەکەی خوار "بووزکوویی" لەگەڵ جەندرمە تێك هەڵچووین. چوار سەعات لێکمان دا. شوکور، شەو داهات و نەجاتمان بوو، هاتینە لای جەنابت. دیسان لە ماڵ نەبووی. چووینە ماڵی "مام عەلیە کوردە"، حەوتوویەك لە لای ماینەوە. میوانداری‌یەکی باشی لێکردین."

عەلیسەفابەگ بە راوێژێکی دڵسۆزانەوە گوتی:

"هەر لە فکری ئەوەدا بووم کە ئاخرەکەی دەبێ بە چی؟"

ئیدریس بەگیش لە حاڵێك دا پێدەکەنی بە راوێژێك کە نیشانی دەدا هەموو شتێکی لە خۆی گرتوە، گوتی:

"ئاخرەکەی دیارە، ئاخرەکەی بۆ من بە تەواوی روونە... دەبێ بۆ عارف صائم بەگیش روون بێ. بۆیە هاتوومە ماڵێتان کە ئەمەتان پێ بڵێم."

عارف صائم بەگ خەریك بوو شێت بێ، هار ببوو. بۆچی، بۆچی چەرکەسێکی هیچ و پووچ لە چوکووراوادا بەرەبەرەکانیی لەگەڵ دەکا، ئەویش چەرکەسێکی بێسەرەوبەرو تێنەگەیشتوو کە هێشتا تەمەنی نەگەیوەتە سی ساڵ...

دەیڕەنڕاندو بە هەڕو گیفەوە دەیگوت:"هەتیوی نەفامی بێچووە چەرکەس نیشانت دەدەم. ئەگەر نەم ناردیەوە قەفقاز، ئەگەر دوورم نەخستیەوە بۆ نێو بۆلشەویکان، ناوی خۆم دەگۆڕم."

لە مستەفا کەمال پاشاش زۆر تووڕە بوو. دەیگوت:"ئا...خ ئاخ پاشا. ئەمە چ لێکدانەوەیەکە. ئینسان ئەوەندە خەیاڵ پەرست دەبێ؟ ئینسان تا ئەو رادەیە خۆی بۆ گەل و وڵات بەخت دەکا؟ ئێمە خوێنی خۆمان بۆ ئەوە رشت کە بە برسیایەتی و تینوایەتی بژیین؟ ببینە گەپجاڕی دەستی بێچووە چەرکەسێك؟ هەر بۆ ئەوە گیانمان لەسەر لەپی دەست داناو نیشتمانمان رزگار کرد؟ رێزدانان بۆ نەزم و قانوون، زۆر باشە، شتی وا نیە... بەڵام منداڵەکانمان لە برسان دەمرن. سەرەنجام تووشی سواڵکەری دەبین، پاشا تووشی گەدایی دەبێ.

بێچوە چەرکەسی نەفام، ئەمن نایەڵم قارەمانێك لەبەر تۆ بشکێ! با پاشا سەرم ببڕێ. ئەو خۆ ئاشقی چاوو برۆی رەشی مەمانان نیە. پێویستیی پێمانە، ئەگەر پێویستیی پێمان نیە با لێمان گەڕێ بڕۆین. چی دیکە سواری کۆڵمان نەبێ! وازمان لـێبێنێ با ئێمەش لە فکری چارەسەری خۆمان دا بین."

عارف صائم بەگ ئەو جووتیارانەی ئاك مەزاری، کە دەیانەویست لە پێشی راوەستن، یەك بە یەك بانگ دەکرد. لە لایەك کەمێك پارەو لە لایەك دەسکێك شووتەرکی دادەناو پێی دەگوتن:"نۆکەری ئیدریس بەگ، یان پارە، یان دار. یەکێکیان هەڵبژێرە."

یەکێك دراوی هەڵدەبژاردو یەکێك دار! ئەوانەی داریان هەڵدەبژارد، بە شێوەیەکی وەحشییانە هەتا دەگەیشتنە شەرای مەرگ دارکارییان دەکردن و جنێوییان پێ دەدان. دارکاری کراوەکانیان داویشتە سەر ئەسپێکی رووت و لە نێو دێی دا بەرەڵلایان دەکرد.

لەنێو دێی دا بەرامبەر بەباڵەخانەی ئاغا دڕووەڵانێکی بەرین هەبوو کە بە زیپەگەرمێنی داپۆشرابوو. لە ئاخرەکەی دا عارف صائم بەگ، "چەرکەسە تێنەگەیشتووەکان"ی رووت دەکردەوەو لەحاڵێك دا پێنج قەمچی بەدەستیان بە دواوە بوون، وەنێو دڕووەڵانی دەخستن. لە لایەك زەبری قەمچی بەسەر پشتی رووتی چەرکەسەکان دا دەباری و لە لایەکی دیکەش دڕووەکان لەشی رووتیانیان هەڵدڕ هەڵدڕ دەکردو تەواوی لەشیان لە خوێن دا سوور هەڵدەگەڕاو هەتا وەختێك کە دەیان گوت:"ئاغا قەباڵەکەش بۆتۆ و زەوییەکەش بۆخۆت" ئەم ئەشکەنجەیە درێژەی هەبوو.

عارف صائم بەك بەم رەفتارە بوو بە خاوەنی زەوییەکی زۆر. تەنیا زەوییەکانی ئیدریس بەگ و ئەو خزمانەی مانەوە کە چاویان لە ئیدریس بەگ دەکردو بەرهەڵستییان دەکرد.

کێڵگەکانی عارف صائم بەگ دەوران دەوری مەزرای جووتیارە کەللەشەقەکانی ئاك مەزاریان گەمارۆ داو زەوییەکانی ئیدریس بەگ و خزمەکانی وەك دورگەیەك کەوتنە نێو زەوییەکانی عارف صائم بەگ:"ئێستا زەوییەکانیان نادەن؟... ئەگەر دەتوانن با نەیان دەن!" عارف صائم بەگ بە نەڕە نەڕ دەیگوت:"ئێستا دەتوانن نەیان دەن سەگبابانە، بزانم چۆنیان دەکێڵن، چۆنیان دادەچێنن."

فۆردەڕەش جارێکی دیکەش هاتەوە گوندی ئاك مەزارو لە کاتێك دا لە تۆزوخۆڵ دا ون ببوو و تایەکانی هەتا نیوەیان بە خۆڵ دا چووبووە خوار لەبەر دەرگای ماڵی ئیدریس بەگ راوەستا. چاوە زلەکانی هێندێکی دیکە گەورەتر ببوون.

جووتیارەکان و ئیدریس بەگ لە جاران زیاتر بە حورمەتەوە پێشوازییان لە عارف صائم بەگ کرد، ئەویش هەروەك جاران بە فیزو دەمار بوو و قسەی نەدەکرد. تەنیا وەختی رۆیشتن بە دەنگێکی زۆر بەرز گوتی:

"ئیدریس بەگ، زەوییەکانی تۆو ژمارەیەك لە خزمەکانت لەنێو زەوییەکانی من دا ماونەوە. هەقتان نیە بە نێو زەوی و زاری من دا هاتوچۆ بکەن. ئەمن رێگاتان نادەم. ئەو مەزرایە کە لەنێو مەزراکانی من دا ماوەتەوە ناتانەوێ بە من بفرۆشن؟ نەزەرتان چیە؟"

ئیدریس بەگ بە توندی دواقسەی خۆی کرد:

"ئاغا! ئەمن و دۆستەکانم زەوییەکانمان کە لە نێو زەوییەکانی تۆ..."

"لەنێو زەوییەکانی من."

"کە لەنێو زەوییەکانی تۆ دا ماونەوە، نافرۆشین."

عارف صائم بەگ لە حالێك دا دەستی بۆ لای ئەو درێژ دەكرد بە قینەوە پێی پێکەنی و گوتی:

""ئەتۆ زۆر لاو، زۆر ئازاو پیاوی، زۆرم حەز دەكرد لەگەڵت ببمە دۆست بەڵام دەرچوو، خواحافیز."

عارف صائم بەگ دەسبەجێ دوازدە كەسی چەكدار كردن، بەرگی سەوزی تایبەتی ئێشكی پێ لەبەر كردن و فەرمانی دا:

"هەركەس ویستی بەنێو زەوییەكانی من دا بڕوا، یان هەركەس ویستی مەزراكانی من بپەستێوێ بە تفەنگ لێی دەن."

وەرزی پاییزو كاتی وەردو شێو بوو. چەركەسێكی لاو بە ناوی "فەهمی"بە گاجووت و نیرونامووروەوە دەچووە مەزراكەی. ئێشك چییەكانی عارف صائم بەگ دەنگیان دا كە بگەڕێتەوە. فەهمی گوێی نەدانێ و بە رێی خۆی دا رۆیشت.

ئێشك چییەكان بێ سێ و دوو لێیان داو كوشتیان. تەرمی فەهمی سێ رۆژان لەنێو كێڵگەی عارف صائم بەگ كەوت. بە شكایەتی ئیدریس بەگ یەكێك لە ئێشك چییەكانی عارف صائم بەگیان گرت و ناردیانە بەندیخانە. ئێشك چییەكە سێ مانگ لە بەندیخانەدا مایەوە.

عارف صائم بەگ چووە سێواس. ئەودەم دادگای بەرز لە سێواس بوو. وای كرد پیاوەكەی بە بێ‌گوناح بناسرێ. چوو دەستی گرت لە بەندیخانە هێنایەدەرو لەگەڵ خۆی هێنایەوە كێڵگەكەو كردیە سەرۆكی ئێشك گرەكان.

پاشانیش هەر ئەو ساڵە سێ كەسی دیكە كە ویستبوویان بە نێو مەزراكانی عارف صائم بەگ دا بچنە سەر زەوییەكانی خۆیان كوژران و هەتا چەند رۆژ كەس نیزیكی تەرمی چەركەسەكان نەكەوت. تەرمەكان لەنێو مەزرای عارف صائم بەگ دا بۆنیان كردبوو. ئەوەی ئەوانیشی كوشتبوو سێ مانگ كەوتە بەندیخانەو بەسەفەرێكی عارف صائم بەگ بۆ سێواس هەموو شتێك جوور بوو.

ئەو ساڵە لەو زەوییانەدا كە كەوتبوونە نێو زەوییەكانی عارف صائم بەگ هیچ كاسبییەك نەكرا. ساڵی دواتریش هەروا بوو. هەرچەند ئەو زەوییانە نەكێڵران و دانەچێندران، بەڵام لە نێو مەزراكانی عارف صائم بەگ دا وەك لوویەك، وەك برینێك كە خوێنی لێ‌بچۆڕێ، دەهاتنە بەرچاو.

ساڵێکی دیکەش دیسان چەرکەسەکان دێن بۆ کێڵانی زەوییەکان و دیسان دەکوژرێن، و پاشا لەکارەساتەکە ئاگادار دەبێ و دەڵێ:"کوڕە، ئەو کارە قوڕە چ بوو کردت". زۆر لە پاشا دەترسا. ئەودەم ئیدی ناتوانێ وەك جاران بڵێ:"پاشا، ئەم دێهاتییانە، ئەم دێهاتییە دواکەوتووانە زوڵمم لێدەکەن...، وابوو، و واچوو..." دەبوو هەتا زوویە لە فکری چارەی ئەم برینە خوێناوییە دا بێ.

فۆردەڕەش کە چاوەکانی دیسانیش نەختێك گەورەتر ببوون، جارێکی دیکە لەبەر دەرگای ئیدریس بەگ راوەستا، عارف صائم بەگیش کەمێك قەڵەوترو بەسام تر ببوو. چەرکەسەکان و ئیدریس بەگ دیسان بە حورمەتەوە وەریان گرت. عارف صائم بەگ ئەم جارەیان نەچووە سەرێ:

"ئیدریس بەگ، هاتووم لەبارەی ئەو مەزرایەوە قسەت لەگەڵ بکەم. ئەو زەوییە کە وەك دورگەیەك لەنێو زەوییەکانی من دا ماوەتەوە، بە کەلکی چیت دێ؟"

ئیدریس بەگ بەراوێژێکی زۆر رەق و وشك گوتی:

"ئەمن و دۆستەکانم ئەو زەوییە کە لەنێو زەوییەکانی..."

عارف صائم بەگ لە حاڵێك دا بە قینەوە پێدەکەنی، دەستی بۆ لای ئەو درێژ کردو گوتی:

"زۆرم پێ خۆش بوو پێکەوە ببینە دۆست. بەڵام حەیف کە زۆر کەم ئەزموونی."

ئیدی فۆردە ڕەش نەهاتەوە ئاك مەزار.

"فەزلی بەگ" نووسەری دادگای شار، بەرپرسی تاپۆی ئەو شارەش بوو. پیاوێك بوو لیکن، فێڵباز، ترسەنۆك و ئارەق خۆر. چونکە لە پاشماوەکانی حکوومەتی عوسمانی بوو، وەك سەگ لە حکوومەتی تازەو پیاوەکانی دەترسا.

عارف صائم بەگ بانگی کردە مەزراکەی خۆی و پێی گوت:

"فەزلیبەگ، وەك بۆخۆت دەزانی لەئاك مەزار ئەمن سەدو پەنجا هەزار لیرەم لەسەر ئیدریس بەگە. قەباڵەکەش بۆخۆت نووسیبووت."

"بەڵێ ئاغا راستە. دەزانم ئاغا، ئاغا" نەکا قەباڵەکەت لێ ون بووبێ؟"

عارف صائم بەگ بە زەردەخەنەیەکەوە کە نیشانەی رەزامەندی بوو، دەستێکی باوکانەی لەسەر شانی فەزلی بەگ داناو پرسی:

"رێك و پێك کردنی ئەم قەباڵەیە خەرجی چەندە؟"

فەزلی بەگ بە سەری قامکان حیسابی کردو گوتی:

"به شاهیدو ماهیدو پارەی پوول و هەموو قەللەو دەللەکەیەوە سەدو یازدە لیرەو دوو قرۆش."

"هانێ ئەو سێسەد لیرە... پاشان هەر پلەو پایەیەك کە ویستیشت دەنگ بکە..."

فەزڵی بە هەژانێکەوە گوتی:

"سوپاس ئاغا. ئەمن لە نان و ئاو و قەساب و نانەواو هەموو خەڵکی ئەم شارە رازیم."

قەباڵەی سەدو پەنجا هەزار لیرە قەرزداریی ئیدریس بەگ پاش سێ رۆژان گەیشتە دەستی عارف صائم بەگ و ئەویش دەسبەجێ دۆسیەی ئیدریس بەگی لەبەر ئەوە کە قەرزەکەی نەداوەتەوە، دا بە دادگا. کاتێك ئیدریس بەگ لە بەسەرهاتەکە ئاگادار بوو گوتی:

"چاوەڕوانیم دەکرد، دەم زانی ئەو جۆرە کارانە دەکا. لە دادگا حیسابی خۆمی لەگەڵ یەك لا دەکەم. ئیسباتی دەکەم کە قەباڵەکەی ساختەیە. لە پێش چاوی خەڵك سووکی دەکەم: دەیکەمە پووڵە رەشکەیەك."

چەند ساڵ بوو ئیدریس بەگ هەر شتێك رووی دابایە برووسکەی بۆ ئەنکەرە، بۆ مستەفا کەمال پاشا، نوێنەرانی مەجلیس و ئەو نوێنەرانەی دەیناسین، لێدەدا. دیسان چەند برووسکەی دیکەی ناردە دەریای بێ بنی ئەنکەرە. هەرچەند هەمووی ئەو برووسکانە بێئاکام بوون، بەڵام ئیدریس بەگ خووی بەم کارەوە گرتبوو.

عارف صائم بەگ بە بیستنەوەی قسەکانی ئیدریس بەگ گوتی:

"ئێمە دەمان توانی پێکەوە دۆست بین، بەڵام حەیف زۆر لاو و کەم ئەزموونە."

هەر ئەو شەوە "خدرن ئۆغلی"ی بانگ کرد، ئەو یەکێك لە سەگە هەرە خەتەرناکەکانی ناوچە بوو. بەگ پێی گوت:

"بزانم دەتوانی هەر ئەمرۆ لە ئاك مەزار یەکێك وەبینی کە ناکۆکی و دوژمنایەتیی لەگەڵ ئیدریس بەگ هەبێ؟"

"بەگ، هەر ئەوەندە بەسە فەرمان بدەی، لە جیاتی دیتنەوە بۆت دروست دەکەم. ئەتۆ داوای رووح بکە ئاغا!"

"وەختێك دیتەوە دەیکوژی."

"بەچاوان ئاغا."

"دەیکوژی و دوایەش لە حەوشە یان بەردەرگای ماڵ، یان هەر جێیەك لە ماڵی ئیدریس بەگ دەیشاریەوە."

"بەچاوان ئاغا."

چەند رۆژ دواتر جەندرمە لە پشکنینی تەویلەی ماڵی ئیدریس بەگ دا تەرمێکیان دۆزیەوەو دەسبەجێ ئیدریس بەگ گیرا. ئیدریس بەگ لە دەستی ئەو جەندرمانەی دەیان بردە شار رای کردو ئەمەش راست ئەو شتە بوو کە عارف صائم بەگ دەیویست. خدرن ئۆغلی هەموو شتێکی بە پێی مەیلی عارف صائم بەگ رێك خستبوو و هەموو شتێك بە پێی بەرنامە دەچووە پێش. داوای قەرزی ئیدریس بەگ زۆری نەکێشاو چونکە رای کردبوو نەیتوانی ئیسبات بکا کە قەباڵەکە ساختەیەو سەدوپەنجا هەزار لیرە وەك قەرز لە ئەستۆی ئیدریس بەگ پەستێورا. لە پاشان چەند پارێزەری ناسراو مەسەلەی تاوانەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان و شەش مانگ پاش دۆزرانەوەی تەرمەکە ئیدریس بەگ بە بیست و چوار ساڵ حەبس مەحکووم کرا.

ئیدریس بەگ کە رۆژ بە رۆژ بە درێژی لە مەسەلەکە ئاگادار دەبوو، وا رقی هەستا کە شەوێکیان چووە نێو شار، چەند تەنەکە بەنزینی لە بەنزین فرۆش وەرگرت و خانووبەرەی دادگای ئاگر داو هەتا خانووەکە بە تەواوی نەسووتاو نەبوو بە خۆڵەمێش، نەیهێشت کەس لێی نیزیك بێتەوە. خانووبەرەی دادگا لە راستی دا خانوویەکی کۆن و رزیو بوو، لە ماوەیەکی کەم دا سووتاو بوو بە خۆڵەمێش. وەختێك خانووبەرەکە بوو بە خۆڵەمێش، نیوەرۆ بوو. ئیدریس بەگ و سێ هاورێیەکەی بە قوونەشەڕ لەگەڵ جەندرمە لەشار وەدەرکەوتن و چوونە چیا.

هەموو رۆژنامەکان سووتاندنی دادگا بە دەستی ئیدریس بەگیان بە دووروودرێژی بڵاو کردەوە. ئەمەش ئەو شتە بوو کە عارف صائم بەگ دەیویست. وەختێك بیستی کە ئیدریس بەگ خانووبەرەی دادگای ئاگر تێبەرداوە گوتی:"دەم توانی لەگەڵی ببمە دۆست، بەڵام حەیف و مەخابن کە زۆر کەم ئەزموون بوو..."

ئیدی ئیدریس بەگ بوو بە گورگی زەردی چیاکان، گورگێکی رق هەستاو و دڕندە...

"هاتووم تکایەکت لێبکەم. هەموو دنیا دەزانێ کە ئەمن تەنانەت سەدوپەنجا پاپاسیشی پێ قەرزدار نیم. هەموو دەزانن کە ئەو کابرایە ئەمن نەم کوشتوە. بەڵام دادگا ئەمن سووتاندم، سزایەکەی هەرچی بێ، قبووڵمە.بەڵام بستێك چیە زەوی نادەم بە عارف صائم بەگ. پێی بڵێن قەباڵەی قەرزەکە بدڕێنێ، سەدو پەنجا پاپاس، تەنانەت پووڵە رەشکەیەکیشی پێ قەرزدار نیم. لەم دەشتەش دا هەموو کەس دەزانێ کە ئەمن مێرووولەیەکیشم نەکوشتوە. ئەمە

خەڵكی دەشتێ و تەنانەت ئەو قازییانەش كە منیان مەحكووم كردوە دەیزانن. با بێ و حوكمی بێگوناهیی من دەربكا. ئەگەر ئەمانەی گوتم نەیكردن، هۆیاڵی بەستۆی خۆی. ئەو بۆخۆی لە هەموو كەس و تەنانەت لە خۆشم باشتر دەزانێ كە كارەكە بە كوێ دەگا. ئەتۆ دۆستی نیزیكی عارف بەگی. برۆ ئەمانەی پێ بڵێ."

دەسبەجێش هەستاو لە حاڵێك دا وەرێ كەوتبوو بۆ لای پلیكانەكان گوتی:"خواحافیز عەلیسەفابەگ قسەكەم ئەوەندە بوو."

ئیدریس بەگ لە چوكووراواو لە تووڕووس تووشی هەركەس بووایە ئەم قسانەی پێدا رادەسپاردە لای عارف صائم بەگ و زۆر بە حەوسەلەوە چاوەڕوانی وەڵامەكەی بوو. بەڵام هەرگیز ئەو جوابەی چاوەڕوانی بوو دەستی نەكەوت.

چەند جار پەیامی ئیدریس بە گوێی عارف صائم بەگ گەیشت و هەموو جارێ لە حاڵێك دا دەستی بە زگیەوە دەگرت قاقا پێدەكەنی. ئەو لەمێژ بوو زەوییەكانی ئیدریس بەگ و خزمەكانیی خستبووە سەر زەوییەكانی خۆی.

هاتنی ئیدریس بەگ بۆ لای عەلیسەفابەگ بەسوود بوو. دەسبەجێ سواری ئەسپ بوو و چوو بۆلای عارف صائم بەگ، چونكە وێڕای گەیاندنی پەیامی ئیدریس بەگ دەیتوانی لەبارەی مەسەلەكانی خۆشیەوە قسەی لەگەڵ بكا.

ئێوارەیەك عەلیسەفابەگ گەیشتە مەزراكەی عارف صائم بەگ. عارف صائم بەگ بابێكی هەبوو بەناوی "زەكۆیەگ" كە كابرایەكی زۆر زەلام بوو. یەك وشەش توركیی نەدەزانی. لەزەمانی لاوەتییەوە تا ئێستا شانازیی بە سمێڵە چەخماخییەكانیەوە دەكرد. ئەو لە بازاڕی "دەهار پووت" دەلاڵ بوو. كاتێك كوڕەكەی بوو بە پیاوێكی گەورەو بە دەسەلات زۆر خۆشحاڵ بوو، و ئەو كارەی لە بازاڕ دا بووی و زۆریشی حەز پێ دەكرد، وازی لێهێناو هاتە لای كوڕەكەی. ئێوارەی ئەو رۆژە زەكۆیەگ كورسییەكەی لەبەر دەرگای باڵەخانەكە دانابوو و پاڵی وێ دابوو. پانتۆڵێكی فش و فۆڵی شینی لەپێدا بوو كە زارگیرفان و دەلینگەكانی زێڕكفت كرابوون، زنجیر سەعاتە زێڕەكەی بە قەد سێ گرێ قامكان ئەستوور بوو كە بەسەر سوخمە سەوزە ئاوریشمە خالیسەكەیەوە هەڵواسرابوو. كرێكارانی كێڵگەكە لەرو لاوازو بە جلكی دڕاوو لێوی قەڵشیوەوە شەكەت و ماندوو لە كار دەگەڕانەوە. یەك یەك لە بەرامبەر زەكۆیەگ دا ئەژنۆی راستیان دادەدا، بەرێزو حورمەتەوە سێ جار دەستیان ماچ دەكردو لەسەر سەریان دادەناو دەچوونەوە ماڵێ.

ئەم رێ و شوێنی دەست ماچ کردنە رۆژێ دوو جار بەیانی و ئێوارێ بەرێوە دەچوو. زەکۆبەگ بۆ بەشداری لەو رێوشوێنە دا بەیانیيان زوو پێش تاوهەڵات لە خەو هەڵدەستا. قەلناوییەکەی تێدەکرد، قاوەکەی دەکولاندو دەهات لەبەر دەرکی باڵەخانە دادەنیشت و بەفیزو دەمارەوە چاوی لەسەر یەك دادەنان و دەستی بۆ کرێکارەکان رادەداشت. ئەوانیش لە حاڵێك دا دەستە دەستە دەستییان ماچ دەکرد، بە بەردەمی دا تێدەپەڕین.

زەکۆبەگ بەدیتنی عەلیسەفابەگ چاوەکانی بە شەوقێکی زیاترەوە لەسەر یەك دانان و بە ئیشتیایەکی زۆرەوە دەستی بۆ لای کرێکارانی کێلگەکە درێژ کرد.

لە دەرفەتێك دا کە بۆی رێ کەوت بە دەنگێکی ئەستوورو نەتاشراوەوە فەرمانی دا:"کوڕۆ، حەسپەکە بقەهرن"و چەند پیاوی بەخۆوە بۆ گرتنی جڵەوی ئەسپەکە غاریان دایە لای عەلیسەفابەگ. عەلیسەفابەگ لە ئەسپەکە دابەزی و غاری دایە لای زەکۆبەگ. زەکۆبەگ لەسەر کورسییەکە بە لاقی راکێشراو و لێك کراوەوە، بە سینگ و بەرۆکی ئاوەڵاو ملی قیت و بە دەمی لەبەر پێکەنین داپچڕاوەوە کە بریسکەی ددانە زێڕەکانی لە چاوی بنیادەمیان دەدا، دەستی بۆ لای عەلیسەفابەگ درێژ کردو چاوەڕوانی ماچ کردنی بوو. عەلیسەفا دەستی گرت، ئەژنۆی دادا، کڕنۆشی بردو سێ جار لەسەر یەك دەستیی ماچ کردو لەسەر سەری دانا. پاش تەواو بوونی رێوشوێنی دەست ماچ کردن، زەکۆ بەگ پێی گوت:

"لاوۆ عەلیسەفا، توو سەر سەران هاتی، سەرچاڤان هاتی، ڤرا روونێ!"

ئەوی لە پەنای خۆی دانا:

"چاوانی؟"

هاوڕێیەکانی بۆیان وەرگێڕا:

"دەپرسێ چۆنی؟"

"توو هاتی باڵ بەگ؟"

گوتیان:"دەپرسێ هاتوویە لای بەگ؟"

"بەگ ڤرایە؟"

"بەگ لەماڵێیە؟"

زەکۆبەگ وێڕای ئەوەی دەستی بۆ لای کرێکارەکان درێژ کردبوو تا ماچی بکەن لەگەڵ عەلیسەفابەگیش قسەی دەکرد. ئەم وتووێژە تا وەختێك عارف صائم بەگ لە نهۆمی سەرەوەی باڵەخانەکەڕا چاوی بە عەلیسەفابەگ کەوت درێژەی هەبوو. بەگ بانگی کرد:

"بابە، ئیزن بدە عەلیسەفابەگ بێتە سەرێ. پێکەوە هێندێ کاری گرنگمان هەیە."

قسەکانی کوڕەکەییان بۆ زەکۆبەگ وەرگێڕا. نێوچاوانی تێك نا، لێوی داچۆڕان. بەو حاڵەش بە توندی دەستی درێژ کردو گوتی:"هەرۆ لاوۆ ژووریّ."

عەلیسەفابەگ دیسان چۆکی راستی دادا، کڕنۆشێکی بردو سێ جاری قامکی درێژو ئەستووری ئەو دەستە ناقۆلایەی بۆ لای درێژ کرابوو، ماچ کردو لەسەر سەری دانا.

دوو دۆست، دوو بەسەرداکەوتووی خاوەن مڵك، دوو "خەباتکەری نیشتمانیی پێشوو" پێکەوە نانیان خوارد. سفرە پڕ بوو لە گۆشتی نێچیری جۆراوجۆر وەك کەودەری، کۆتری کێوی، کەو و کەروێشك... چوار راوچیی کارامە هەمیشە لە بەیانی تا ئێوارێ خەریکی راو بوون بۆ رازاندنەوەی سفرەی عارف صائم بەگ.

گۆشتی تازەی نێچیریان لەگەڵ شەڕابی کۆنی فەڕانسەیی خوارد.

عەلیسەفابەگ بە جۆرێك هەڕەشەکانی ئیدریس بەگی بۆ عارف صائم بەگ گێڕانەوە کە بە رێکەوت بوونە هۆی کەیف و خۆشحاڵیی ئەو، دەستی بە زگیەوە گرت و قاقا پێکەنی. عەلیسەفابەگیش بە چاولێکەریی وی دەستی کرد بە پێکەنین. لە پاشان دەستی لە پێکەنین هەڵگرت و لە حاڵێك دا دڵسۆزییەکی بەراستی لە روخساری دا دیار بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:"مەخابن، کە زۆر بێئەزموونە. دەکرا پیاو لەگەڵی ببێتە دۆست."

## (٢٦)

بەرە بەرە حەمەد دەهاتەوە سەرخۆی و هەستی بە مەترسی دەکرد. هەوڵی دا ئەو رووداوانەی بەسەری هاتبوون وەبیر خۆی بێنێتەوە بەڵام هەموو شتێك لە مێشکی دا شێواوو تێکەڵ پێکەڵ بوو. لە دووری رووناکاییەکی زەرد دەسوورِا، تاریکایی دەقەڵاشتەوەو لە شکڵی چەند دڵۆپێکی درەوشاوەدا بەسەر هێندێ نوختەی نادیاردا دەباری. هەموو لەشی گڕی گرتبوو و دەسووتا.

هەستایە سەرپێ، دەستی بۆ چاوی کردە سێبەرو روانیە ئاوەدانی. دێیەکە لە قووڵاییدا بوو و بێجگە لە دووکەڵێك کە لە چەند رۆژنەوە بەرەو ئاسمان هەڵدەستا، هیچی نەدی. هەموو شتێك بێدەنگ و راوەستاو بوو. چووکترین ورتەورتیش نەدەهات.

خاکی بەهارێ لەبەر هەتاو خۆی هەڵخستبوو و زەوی دەنگی چرقەچرقێکی ئارامی لێدەهات. کۆمەڵێك پەپوولە زۆر بەرز بە ژوور سەری دا تێپەرِین. رووبەرِووی خۆی پەپوولەیەکی رەش کە سەربالی ئاماڵ سوور بوون، لەسەر گوڵێکی شین نیشتبوو، ئەمە یەکەم جار بوو کە حەمەد پەپوولەیەکی رەشی زەلامی دەدی. شتێکی وەك ترس و ئازار هاتە دڵیەوە. لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئاکامەکەی دەرکەوت" پاشان لێی زیاد کرد:"دەی جا باشتر، چ دەکرێ. قەزاو قەدەر وابوو. هەم خەجیجم بە کوشتن داو هەم دایکم. بۆخۆشم ئاوارەی کێو و بەندەنان بووم. دێهاتییەکانم تووشی ئەم رۆژە کرد. لە ژێر باری زوڵم دا دەناڵێنن. پێش من هەرکەسە بۆخۆی ژیانێکی هەبوو. نەحلەت لە من. ئەمن دەبێ برۆم گۆرِەهوو بم!"

هەموو ئەو پێشهاتانە وەختێك دەستیان پێ کرد کە حەمەد بۆ یەکەم جار چووە شارو لە هۆدەی میواخانەدا لەگەڵ نایب حەسەن قسەی کرد. هەموو ئەو بەڵایانەی دوای ئەو رۆژە

بەسەر هاتن:"بریا وەختێك دەچوومە شاری لاقم شکابایە. بریا چاوم کوێر بایەو نایب حەسەنم نەدیتبایە. بریا کەڕ بام و قسەکانی ویم نەبیستنایە. بڕوانە حاڵی پەرێشانی دێهاتیەکان! ڕۆژو ڕۆژگاریان ببینە، تەماشای ئەو ژیانەیان بکە!"

ئەو ڕۆژەی وەبیر هاتەوە کە چووبووە دڕووەڵان. کێو و شاخ و خەڵك لە خۆشحاڵیان ئارامیان نەبوو. تەنانەت گڕی ئەو ئاورەش کە لە دڕووەڵانەکە بەربببوو لە خۆشیان سەمای دەکرد. دورمووش عەلی لە کاتێك دا بە لاقە پیرەکانی هەڵدەبەزی، سەمایەکی کۆن، سەمایەکی زۆر کۆنی تورکمەنانی دەکرد، و لە گۆڕایی دەشتەکە لە پەنای ئاگر بە هەوای بلێسە ئاگرەکان هەڵدەپەڕی. دادەنیشت و هەڵدەستایەوە، ئاگرو دورمووش عەلی ببوون بەیەك.

وەك بۆی دەرکەوتبوو، لەو کاتەدا کە دورمووش عەلی بە ئاهەنگی بلێسە ئاگرەکان هەڵپەڕیبوو، هەمزە کەچەڵ دابوویە بەر چنگە ئەسپان و پلیشاندبوویەوە. دوو دڵۆپە فرمێسکی درشت لە کالانەی چاوی حەمەددا قەتیس مان. لە بن لێوانەوە پێکەنی و هەستا. تفەنگەکەی لە شانی کردو بە هەورازەکەدا بەرەو گەڵی وەڕێ کەوت، ئاخری گەڵیەکە بەردەڵان بوو. دەبوو لە پشت گابەردە بەرزەکانەوە خۆی حەشار بدا. بە کۆمەکۆمەو بێدەنگ بەرەو ئەوێ دەخۆی نووسا.

هەر گەیشتە وێ و دەنگی تەقە هەستا. لەنێو گەڵیەکەدا کانیەکی گەورە هەڵدەقوڵیەکە خیزە ڕەنگاوڕەنگەکانی بنی لەبەر هەتاو دەبریسکانەوە. حەمەد تاوێك ڕاکشا. دەمی بە کانیەکەوە ناو بە ئیشتیا تێر تێر ئەو ئاوە ساردەی خواردەوە. گوللەکان بە ویزە ویز بە ژوور سەری دا تێپەڕین. لەحزەیەك خۆی هاویشتە پشت تاتەبەردێکی بنەوشی خاڵدار. ئەگەر جەندرمە سەرەوەی گەڵیەکەیان نەگرتبێ، دەکرێ بڵێین نەجاتی بووە.

دایەحۆری لە دوورەوە دەهات. لە حاڵێك دا دەستی هەڵدەتەکاند، هەتا تینی تێدا بوو هاواری دەکردو دەیگوت:

"ڕاکە حەمەد، ئەو شەلە کافرە بەداویەوە کردی. بێکوڕە، بێکوڕە، ئاخر پێم نەگوتبووی؟"

حەمەد کە گەیشتە پشت تاتەبەردەکە دڵی ئاسوودە بوو. ئەو لە پێش دا بۆ پەناگایەك دەگەڕا کە لە پێش و پشتەوەڕا قایم بێ، بۆ ئەوەی هەتا شەو دادێ تێی دا بحاوێتەوە. هەر کە چاوی بەو تاتە بەردە کەوت بەزگە خشکە خۆی گەیاندێ، پشتی بە بەردەکەوە داو هەناسەیەکی ڕەحەتی هەڵکێشا.

لە خوارێ ژمارەی جەندرمەکان زۆر بوو، تەقەیان دەکرد. شەڕێکی توند دەستی پێکرد. حەمەد زۆر بە ئارامی و بێ پەلەپەل وریای چەپ و ڕاستی خۆی بوو. ئەو نەیدەویست لەو

شەڕەدا ئازارێك بە كەس بگا. ئەگینا هەر لەو چەند لەحزەیەدا دەیتوانی دە جەندرمە وەسەریەك گێڕێ. چونكە جەندرمەكان بێ ئەوەی سەنگەر بگرن، یان وریای خۆیان بن، دەهاتنە پێش. حەمەد هەر بۆ ترساندنی جەندرمەكان و كات بەسەربردن تەقەی دەكرد. جەندرمەكان گەیشتنە بن بەردەلآنەكە. یاوەر فارووق لە پێشیانەوە بوو. حەمەد جارێك چاوی بە یاوەر كەوت و لێی ون بووەوە. پاشان عەلیەیەشەلی بە تفەنگەوە لە پشت بەردێك دی. زۆر ئارام بوو. لە دوورەوە دەكرا سێبەری زەردەخەنەیەكی لەسەر لێوان ببینی. لەوانەشە هەر لەبەر چاوی حەمەد وا بووبێ.

دایەحۆری لە دوورەوە دەهات، لە پەستا دەستەكانی رادەوەشاندن و وەك تۆفانێكی هات و هاوار دەهاتە پێش. تاوێك راوەستا، دەستی لەبەر پشتێنێ ناو ماوەیەك چاوی لەو جەندرمانەوە بڕی كە حەمەدیان لە پشت بەردەكەوە دابووە بەر تفەنگ. ئەمجار گوتی:

"هۆی جەندرمەكان، منداڵە بێگوناهەكان، ئازارێك بە حەمەدی من نەگەیەنن. چاوتان لێنیە ئەو رەحمتان پێ دەكا؟ ئەگەر ویستبای تا ئێستا هەمووتانی دەكوشت. بڕوانن ئێوە لە كوێن و ئەو لە كوێیە؟ گوللە كاری لێناكا... هۆ جەندرمەكان، منداڵە بێگوناهەكان، بەخۆڕایی خۆتان زەحمەت دەدەن، لێی گەڕێن لە كوڕەكەم، پێشی پێ مەگرن با بڕوا، ئەگینا بەدبەختتان دەكا. حەمەدم كاری زۆرە. ئەو زۆر تووڕەیە زۆر، لەو رووداوانە زۆر قەڵسە، هۆی جەندرمەینە، كوڕینە، منداڵە بێگوناهەكان، ئێوە لە ژێر زوڵم دا خەریكن دەپلیشێنەوە، فریوی ئەو یاوەرە بێدینەی عوسمانی مەخۆن. عوسمانی دین و ئیمانیان نیە، بۆیە نابێ متمانەیان پێ بكەی!"

لە چەپ و راستی دایەحۆری گوللە لە زەوی دەدران، بەلآم ئەو گوێی نەدەدایە. تەنیا یەك جار گوتی:

"ئەوە چیە، دەتانەوێ چ بكەن حەرامزادەینە، دەتانەوێ من بكوژن؟"

پاشان بەرەو بەردەلآن رۆیشت. تەقەیەكی توند دەستی پێكردبوو. حەمەد تاوێك رادەوەستاو ئەمجار وەلآمێكی باشی ئەو بارانە گوللەیەی دەدایەوە كە بە سەری دا دەباری و بێدەنگ دەبوو.

حەمەد سێرەی لە لاقی جەندرمەیەك بە ناوی "پایاسلی" كە بێپەروا بە پێوە تەقەی دەكردو دەهاتە پێش، گرت و تفەنگێكی لێدا. ئەو گوللانەی لە دەوروبەری حەمەدو لە شاخەكان دەدران دووكەڵیان لێهەڵدەستاو بۆیە تاتەبەردەكان لەدووكەڵ دا ون ببوون. گوللەكان بە ویزە ویز لە چەپ و راستەوە بە بن گوێی دایەحۆری دا دەڕۆیشتن.

"لێم دەن، بم کوژن تووتکەسەگینە، چتان پێ دەبڕێ؟"

پایاسلی لەسەر عەرزێ جینگڵی دەدان و لەبەر ژانی لاقی چنگی لەزەوی قایم دەکرد.

دایەحۆری هاتە لای و گوتی:

"وەی منداڵی بێگوناح وەی، ئەگەر کاری قۆڕت نەکردبایە حەمەد تفنگی لێ نەدەدای. هیچ مەترسە. ئەگەر چووینەوە دێی مەڵحەمت بۆ لەسەر دادەنێم بەدوو رۆژان چاکتر دەبی. ئەتۆش ئیدی قەت تفەنگ بە حەمەدی منەوە مەنێ."

جەندرمەکەی هەر لەوێ بەجێ هێشت و بەرەوپێش چوو کە لە نەکاو گوێی لە هاواری حەمەد بوو:

"دایە هەر لەوێ دانیشە، ئەو بێ دینانە دەت کوژن دایە!"

دایەحۆری:

"ها... با بم کوژن کوڕم، لەمەودوا بۆچی بمێنم... با بم کوژن کوڕم... ئەوە دێمە لات."

گوللەکان بە ویزە ویز بە بن گوێی دا تێ دەپەڕین و دایەحۆری هەروا بزانە هیچ نەبووە، هەروا بزانە پیاسە دەکا، یان گوێلکان دەباتە لەوەڕێ، بێ پەروا بەرەو پێش دەچوو.

یاوەر فارووق لە وەکیل باشی عاصمی کە لە پەنای بوو، پرسی:

"ئەم ژنە شێتە کێیە؟"

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"دایەحۆریی حەمەدۆکە. کەسێکە کە دوژمنی سەری عەلیەیەشەلەو حەز دەکا تەنانەت چارەی جەنابیشت نەبینێ."

"بەڵام ژنێکی ئازایە. شێتە؟"

وەکیل باشی عاصم بە پێکەنینەوە گوتی:

"زۆریش ئاقڵە."

دایەحۆری هەڵنەنگووت و کەوت و بە عەرزییەوە پان بووەوە. حەمەد دڵی داخورپا. دایەحۆری دەسبەجێ هەستایەوە. بەڵام دووپارە کەوتەوە. حەمەد هاواری کرد:"ئەگەر دایەتان ئەنگاوتبێ، نایەڵم یەکێکتان زیندوو بن. نایەڵم تاقە یەکێکتان بە زیندوویی لەم گەڵییە بچنە دەر."

دایەحۆری هەستایەوە سەرپێ و گوتی:

"نارەحەت مەبە حەمەد، ئەو سەگانە ناتوانن من بکوژن. ئەمن پێش ئەوەی بمرم تۆ دەبینم. لە خوام داوا کرد، لەبەری پاڕامەوە کە هەتا تۆ نەبینم و ماچت نەکەم و بۆنت پێوە نەکەم، گیانم لێ نەستێنێ."

حەمەد تەقەی وەستاند. جەندرمەکانیش هەروا. ئەم ڕێك کەوتنە دوولایەنیەیە بێ دەنگ و هەرایە هەتا کاتێك دایەحۆری لەوێ لاچوو، درێژەی کێشا.

یاوەر لە وەکیل باشی عاصمی پرسی:

"دەتوانین بیگرین؟"

"پێم وانیە جەنابی یاوەر. ئەو وەك مار دەخزێ، بە جۆرێك کە چاو نایبینێ. ئەگەر بیویستایە دەیتوانی هەموومان قەلاچۆ بکا. پێش ئەوەی ئەو شاخانەمان لێبگرێ، ئەگەر توانیبامان لەخڕەکەدا گەمارۆی بدەین رەنگە توانیبامان ناچاری بکەین تەسلیم بێ."

"بۆچی تفەنگی لە پایاسلی دا؟"

"رەق بە پێوە راوەستابوو، یەك بین بەیت و باوی دەگوت و جنێوی دەدا."

"ئەگەر ئەتۆش بەیت و باو بلێی و جنێوی پێبدەی لێت دەدا؟"

وەکیل باشی عاصم بە باوەڕێکی پتەوەوە گوتی:

"نا، لێم نادا."

"بە هیچ جۆر تفەنگ بە تۆوە نانێ؟"

"لە خەراپترین تەنگانەدا بۆ لای چووم، دیسان لێی نەدام، لەگەڵ مردن بەرەورووبوو، بەڵام هەر لێی نەدام."

"بۆچی وەکیل باشی، هۆیەکەی چیە؟"

"نازانم جەنابی یاوەر!"

"بلێ پایاسلیی بەرنەوە نێو دێ."

"خەریکن دەیبەن جەنابی یاوەر."

دایەحۆری بە پشووسواری گەیشتە لای حەمەد. دەست و لاقی بریندارو خوێناوی بوون. کراسە چین دارە نوێیەکەی لە پشتێن بەرەژێر ریشاڵ ریشاڵ ببوو.

حەمەد گوتی:"دایە شتێکت بووە؟" و هەستا بەرەو پیری غاری دا.

دایەحۆی هاواری کرد:"هەر لەوێ بە، بە قوربانی چاوە رەشەکانت بم."

حەمەد زەدەیەکی هاتێ، دەستی گرت و بردیە پەنا گابەردێك.

"خۆ هیچت نەبووە؟ لێرە مەبزوو. ببزووی بە کوشتم دەدەی."

دایەحۆری گوتی:

"لێرە نابزووم. ئەتۆ رامەوەستە، هەر باوێ. بڕوانە عەلیەشەل لە پاش هۆو دارەیە. وەسەر یەکی گێرە. ئەوی وەسەر یەك گێرە. ئێستا باشترین دەرفەتە. توو گیانی من، توو گیانی من."

پاشان لەسەری رۆیشت:

"لێرەش بوومە مایەی ژانەسەرت... هەر جۆر پێت سەلاّحە وابکە. باوێ، رامەوەستە. دەرفەت لە دەست مەدە..."

حەمەد دەستی کردەوە بە تەقە. جەندرمەکانیش وەلاّمیان دایەوە. دەورووبەر لەبەر ئەو گوللانەی لە بەردەکان دەدران تۆزاوی بوو. تەڵەزمە بەرد وەك گوللە بە ویزەویز بەم لاو لادا دەبارین. دەنگی ئەو گوللانەی لە بەردەکان دەدران گوێی کەڕ دەکرد. پاش ماوەیەك یاوەر فارووق هەر لە وەکیل باشی عاصمی دەپرسی:

"دە...ی وەکیل باشی دەبێ چ بێ؟ ئێمە سەدو هەشتا کەسین، ئەو تاقە نەفەرێکە... هێرش بکەین؟"

"جەنابی یاوەر جێی وی بڵێندە. هەتا ئێمە لەو بەردانە وەسەر دەکەوین، هەموومان دەدروێتەوە. تەنانەت یەکێکیشمان نایەڵێ زیندوو بین."

"ئەوە ئێوارەیەو شەو دابێ، رادەکا."

"بەڵێ جەنابی یاوەر ئەو رادەکا. لە وەختێکی خەراپ دا لەگەڵی بەرەوڕوو بووین. هەر بەخۆڕایی فیشەکان بە فیڕۆ دەدەین. دیارە حەمەد فیشەکی زۆر پێیە."

هەتا درەنگتر دەبوو یاوەر پتر قەڵس دەبوو. چۆن خەریك بوو ئەم دەرفەتەی لەکیس بچێ؟ ئەگەر نیو سەعات زووتر هاتبانە ئەو شوێنە... هەر نیو سەعات... ئەمە دووهەمین تێك هەڵچوونی یاوەر لەگەڵ حەمەد بوو. لە تێك هەڵچوونی پێشوودا بوو کە خەجیجیان کوشت.

گوللەیەك تەنیا بستێك لە پشت سەری یاوەر لە عەرزی درا. دووبارە گوللەیەکی دیکە... دیسان هەر لەو جێیە...

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"زۆر لەمێژە دەمان بینێ."

"با لە جێیەك سەنگەر بگرین."

"لە هیچ جێیەك ناتوانین خۆمان بشارینەوە. هەروەخت بیهەوێ دەتوانێ مان پێکێ. بەو دووسێ گوللەیە دەیەویست ئەوەمان پێ بڵێ."

" لە حاڵێك دا ئێمە ژنەکەی ئەومان... کوشتوە..."

وەکیل باشی گوتی:

"ئەم کوڕە ئەخلاقێکی سەیری هەیە. هیچ وەك رێگران ناچێ. وەك جندۆکەیە. بنیادەمێکە وەك پەری، وەك فریشتە، ئەو دەبوو ببێتە شێخ و مشایخ نەك چەتە."

لەم قسانەدا بوون کە گوێیان لێ‌بوو یەکێك گوتی:"وەی دایە کوژرام... بە دوای وی دا یەکی دیکە... یەکی دیکە...

حەمەد تفەنگی لە لاقی چوار جەندرمە دابوو.

دایەحۆری دەیگوت:

"ئەم گوت، ئەم گوت بە هەمزە باوەڕ مەکەن؟"

پاشان جەندرمەیەکی کە بێ‌پەروا لە حەمەدی نیزیك دەکەوتەوە، نیشان دەداو دەیگوت:

"یاڵڵا زووبە..."

حەمەدیش دەسبەجێ نیشانەکەی دەپێکا. کابرای بریندار لەحزەیەك هاواری دەکردو دایەحۆری وەك منداڵان چەپڵەی لێ‌دەدا. روخساری ئارەق کردووی حەمەد رەش داگیرسابوو.

هەتاو گەیشتبووە سەر کەلەپۆ، خەریك بوو ئاوا بێ، شتێکی وای رۆژ نەمابوو. هەوا بەرەو تاریکی دەڕۆیشت. تفەنگی حەمەدیش گەرم ببوو، بۆیە جار جار نەبێ تەقەی نەدەکرد. بە بریندار کردنی هەر جەندرمەیەك دەرفەتێکی وەدەست دێناو تفەنگەکەی فێنك دەکردەوە. هەر لەو کاتەش دا چاوی لەو خۆرەتاوە کە خەریکی ئاوابوون بوو، وەرنەدەگێڕا.

لە نەکاو جەندرمەکان دەستیان لە تەقە هەڵگرت. حەمەدیش بە سەرسوڕماوی تەقەی راگرت. تاوێك دواتر وەکیل باشی عاصمی دی، کە دەستی راستی بە دەسرۆکەیەکی سپی‌یەوە هەڵێناوەو بە هاوارکردن دێتە پێش:

"کوڕم حەمەد، دێمە لای تۆ، تەسلیم بە! نامەوێ بکوژرێی!"

وەکیل باشی راستەڕێ دەهاتە سەرێ بۆ لای حەمەد.

"وەکیل باشی، مەیە."

"کوڕم حەمەد، شەڕ لەگەڵ حکوومەت ناکرێ، کێو و بەندەن پڕن لە سەرباز. یان دەکوژرێی یان بریندار دەبی. جەنابی یاوەر حوکمی لێ‌خۆشبوونت بۆ وەردەگرێ."

"وەکیل باشی مەیە ـ لە دەنگی دا ترس و داماوی و ناهومێدی شەپۆلیان دەدا ـ چ دەکەی وەکیل باشی؟ مەیە."

دایەحۆری گوتی:

"لێی دە کارەکەی یەك لا بکە. لێی دە با فێر بێ ئەگەر پێیان گوت مەیە قسە لە گوێ بگرێ!"
وەکیل باشی قیت و قنج و بێکڵاو دەهاتە پێش.

"وەکیل باشی تکات لـێدەکەم مەیە. کوڕە لێت دەدەم. وەکیل باشی ناچارم مەکە ئەم کارە بکەم. وەکیل باشی ئەو خەراپەیەم لەگەڵ مەکە. وەکیل باشی دەست و لاقت ماچ دەکەم. روحم پێ بکە ـ لەدەنگی دا پاڕانەوەیەکی سامناك هەبوو ـ وەکیل باشی وەکیل باشی عاصم، ئەتۆ هیچ ئینسانەتی نازانی؟ ئەتۆ هیچ دین و ئیمانت نیە؟"

وەکیل باشی بە بەژنێکی راست و مەحکەمەوە لە حالێك دا دەستی راستی بە دەسرۆکەی سپیەوە بڵیند کردبوو دەچووەپێش:

"هەر ئەمڕۆ دەبێ تەسلیم بی. بۆخۆت دەزانی لەم دنیایەدا یەك کەس هەیە کە لەگیانی خۆمم خۆشتر دەوێ. ئەویش ئەتۆی."

"دەزانم وەکیل باشی، بەخوا دەزانم. روحم پێ بکە، ئەمن کارم هەیە."

ئەمجار دەنگی بەرزتر کرد. دەنگی لە شاخەکان گەڕاو دەنگی دایەوە. راوێژی بە تەواوی گۆڕابوو:"وەکیل باشی لەگەڵ تۆمە، باشت گوێ لـێبێ. ئەو قسانەی کردت هەموویان راستن، دەزانم کە ئاخرەکەی دەکوژرێم، بەڵام پێش ئەوەی بمرم هێندێك کارم هەن دەبێ تەواویان بکەم. ئەگینا هەر ئێستا خۆم تەسلیم دەکردی... ئەگەر کارم نەبایە، تەنەخیم نەدەکرد. لێم ببوورە. لەبەر گیانی خۆم نیە. ئەگەر مەسەلە رووح بایە، هەر ئێستا بە قوربانی تۆم دەکرد. وەگەڕێ وەکیل باشی."

دوو گوللە بە بن گوێی وەکیل باشی دا تێپەڕین. وەکیل باشی بێئەوەی گوێ بداتێ، چووە پێش. حەمەد دوو بەستە فیشەکی لە بن لاقی وەکیل باشی دان، وەکیل باشی دیسان گوێی پێ نەدا.

"یاوەر، ئەمن کارم هەیە. ئەگینا بۆ وەکیل باشی عاصم چاوم لە رووحی خۆم نەبوو. فەرمانی پێ بدە راوەستێ." ئەمجار سێرەی گرت. شوێنەوارێك لە لەرزینەکەی تاوێك لەمەوبەر لە لەشی دا نەمابوو. دەستی بە پەلاپیتکە دا هێنا. وەکیل باشی عاصم هاواری لـێ بڵیند بوو. دەستی راستی کە بە دەسرۆکەی سپیەوە هەڵی هێنابوو، بەربووەوەو دەسرۆکەکە خوێناوی بوو.

یاوەر فەرمانی دا:

"بگەڕێوە وەکیل باشی."

وەکیل باشی راوەستا. زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد. هەوا خەریك بوو تاریك بێ. وەکیل باشی وردە وردە دەگەڕایەوە.

حەمەد بە دەنگێك كە زیاتر وەك نالە دەچوو گوتی:

"بم بەخشە وەكیل باشی. ئەمنت كوشت. بریا كوشتباتم و ئەم بەلایەت بەسەر نەهێنابام."

یاوەر فەرمانی دا جەندرمەكان بە بەربلاوی و لێكرا تەقە بكەن. حەمەد جوابی ئاگرەكەیانی نەدایەوە. دەستی دایەحۆریی ماچ كردو دوایەش ئەوی لە باوەش گرت. حەمەد گوتی:

"دایە گەردنم ئازاكە."

"گەردنت خۆش و ئازا بێ كوڕم. عەلیەیەشەلت لەبیر نەچێ بێكوژە، بۆخۆت دەزانی هەموو ئەم بەلایانە ئەو بەسەری هێناوی!"

حەمەد وەك سمۆرەیەك خۆی بە نێو تاریكایی دا كردو لە چاو لێك نانێك دا لە گەلێیەكەی بەرامبەری كە بەردەلانێكی حەستەم و پڕ لە دارو درەخت بوو، تێپەڕی. ئێرە وەك بەری دەستی خۆی شارەزا بوو. ئەگەر لە جیاتی دەستەیەك، فەوجێك جەندرمەش هاتبان، دیسان لەم كێوانەدا نەیان دەتوانی بیگرن.

هێشتا جەندرمەكان تەقەیان دەكردو حەمەد ئەوەندەیان لێ‌دوور كەوتبووەوە كەبە حاڵ گوێی لە دەنگی تەقەكەیان دەبوو.

دایەحۆری لەجێی خۆی نەبزووتبوو، لە خۆشییان لە كەولی خۆی دا جێی نەدەبوو. هەر دەیگوت:

"بەخەساریان بدەن، فیشەكی دەولەت بە خەسار بدەن. بە خەساریان بدەن بێ‌دینینە! لەمێژە تەیرەكە لەسەر هێلانەی هەلفڕیوە." پاشان لێی زیاد كرد:

"دوایە دێنە لای من و دەڵێن:"دایەحۆری برینەكانمان بۆ دەرمان كە" ئاوا؟ لامەزەبینە ئەگەر كوڕەكەم لێرە نەدەبوو، ئەگەر وەك سەگ لێی نەدەترسان، ئەمنتان كوشتبوو، ئەو وەخت فكری ئەوەتان نەدەكرد كە كێ دەرمانتان بكا ها... هاها... حەمەد بریندارتان بكاو دوایەش ئەمن بێم دەرمانتان بكەم؟ بەڵێ؟ زۆر باشە!! زۆر زۆر باشە كوڕینە!!"

## (٢٧)

سەرە مارە گەورەو سەوزەکان بە زمانێکەوە کە وەك بڵێسەی ئاگر لە زار هاتوەتەدەر، بە هەراو هەنگامەیەکی زۆرەوە لە چیا ڕا دێنەخوار. هەورێکی ڕەشیش لە کێو هەڵدەستێ و دەنیشێتە سەر دەشتایی.

لەنێو ئەو هەورە سەری مارەکان بە چاوی زەلام و سووری وەك مەرجانەوە دێنە دەرێ، سەدان سەری چاو مەرجانی بە زمانی وەك چنگورك و درەوشاوەو ئاگرینەوە. مارەکان کلکە درێژەکەیان لەزەوی دەدەن و بەزەبری کلکیان تۆزوخۆڵ بە حەوادا بڵاو دەکەنەوە.

شمشێرێك دێتە خوارو یەکێك لە سەرەکان دەبڕێ. لە جێی سەرە بڕاوەکە دووسەری گەورەتر بە زمانی ئاگرین ترەوە سەوز دەبنەوە. سەرەکان دەبڕرێن، گەورەتر دەبن، دەبڕرێن و خلۆر دەبنەوەو زۆرتر و گەورەتر دەبن. هەژدیهایەکی هەزار سەر... سەرە هەژدیهایەکان بەرە بەرە گەورەتر و زۆرتر دەبن، شمشێرەکان دادەبارنە سەر سەرە هەژدیهایەکان.

هەژدیهایەکە دەچێتە نێو هەورێك و بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان. ئەمجار کۆمایەك لەهەورەکان ڕەش، سپی، خۆڵەمێشی، نارنجی و زێرکفت لەسەر جادەکان، لەسەر زەوی و لەسەر ئەو دەشتە تۆزاوییانە کە ڕێکی جادەکان درێژەیان هەیە، دەنیشنەوە. هەزاران دەست و شمشێر هێرش دەکەنە سەر ئەو سەرانە کە لەنێو هەورەکان دان، سەرەکان دەکەونە سەر زەوی، بەڵام دیسان ژمارەیان زۆرتر دەبێ.

پشت کێوی قاف، گابەردی زل زل، هەڵۆی زەلامی بە قەد فڕۆکە، و هەژدیهایەکی زۆری کە هەریەکەی هێندەی شەمەنەفەرێك درێژن، هەن لەگەڵ هەتاوەکانی و مانگەکانی و تاریکاییەکانی...

باسکی حەمەد سڕ ببوو. لوولەی تفەنگەکەی تازە فێنك دەبووەوە. مانگەشەو بوو و تیشکی مانگ لەسەر تفەنگ و فیشەکدانەکانی ڕەنگی دەدایەوە. حەمەد ئەژنۆی کە لەتاتەبەردێکی دابوو، ژانی دەکرد. دەستەکانی خوێنیان لـێدەرژا، لە پێش دا پێی وابوو تفەنگی وێ کەوتوە. دوایە تێگەیشت بە هەڵە چووە، چونکە تەنیا دەستەکانی بریندار بوون و خوێنەکەی وانیش زوو ڕاوەستا.

لە دووری هێشتا دەنگی تەقە دەهات. جەندرمەکان بێ پسانەوە تەقەیان دەکردو وا دەهاتە بەرچاو کە یەکێك جوابی تەقەکەیان دەداتەوە، داخوا کێ بوو؟ حەمەد فکری کردەوە:"ناکا عەلیەیەشەل بێ؟" شەلی زرینگ و حەرامزادە چووبووە نێو جەرگ و هەناوی دوژمن.

حەمەد دڵی ئاسوودە بوو، دەستی لە غاردان هەڵگرت. لەگابەردە حەستەمەکان تێپەڕی و بە ڕێچکە بزنێك دا ڕۆیشت:"ئێستا عەلیەیەشەل لە پاش بەردێك درێژ بووەو تەقە لە جەندرمەکان دەکا."

یاوەر فارووق لە وەکیل باشی عاصمی پرسی:

"وەکیل باشی، دنیاش تاریك بووە، ئەم کوڕە دیسان تەقە دەکاو لـێنادا بڕوا؟"

وەکیل باشی گوتی:

"تێی ناگەم. ڕەنگە پێی وابێ پشتیشمان لـێگرتوە."

"ئەگەر ئەمشەو لەگەمارۆ دا وەمێنێ، مردنی مسۆگەرە."

"جەنابی یاوەر، کەس نازانێ چۆن بیر دەکاتەوەو خەریکی چیەو بەنیازی چ کارێکە؟"

"پێت وایە لە کەللەی داوە؟"

چەند گوللەی بەدوای یەك دا لە ژوور سەریانەوە تێپەڕین.

وەکیل باشی عاصم دەیگوت:

"ئەمن لە سەرانسەری ژیانم دا لەگەڵ بەڵای وا، لەگەڵ بنیادەمی وا سەیرو سەمەرەو بە حەوسەلە بەرەوڕوو نەبووم. دەڵێن فلانەکەس هێلکەی لە قەلـێ دەدزێ... ئەمە لەو جۆرە کەسانەیە... وەك مار بێدەنگ دەخزێ، وەك تەیر دەفڕێ... حەتمەن فکرێکی لە مێشك دا هەیە."

"ئەگەر بیویستایە نیوەمانی دەکوشت. پێت وایە مەسەلە چیە؟"

"دەنگی، ترسانی پێوە دیار بوو. وەك دەنگی کەسێك دەچوو کە خۆی بۆ مردن حازر کردبێ."

"ئەمنیش هەر بۆیە گوتم بگەڕێوە. تۆی دەکوشت وەکیل باشی."

وەکیل باشی عاصم بە دەم هەناسەیەکەوە گوتی:

"ئەرێ. دەیکوشتم."

لەدڵی خۆی دا گوتی:"ئەم کوڕە زۆر گۆڕاوە، شتێکی بەسەر دێ."

عەلیەشەل بۆ ئەوەی حەمەد بتوانێ رابکاو خۆی بشارێتەوە، بە زگەخشکە خۆی گەیاندبووە جێ سەنگەرەکەی حەمەدو لەوێڕا تەقەی لە جەندرمەکان دەکرد و پێشی پێگرتبوون. زەردەخەنەیەکی سەیری لەسەر لێوان بوو. بەنیاز بوو هەتا تاوهەڵات تەقە لە جەندرمەکان بکاو پێش ئەوەی دنیا رووناك بێ تێکەڵ بە جەندرمەکان بێتەوە. ئەودەم لەگەڵ جەندرمەکان لەنێو گابەردەکان دا بەدوای حەمەد دا دەگەڕێن کە هەتا بەیانی تەقەی کردبوو.

یاوەر بە هەژانێکەوە گوتی:

"وەکیل باشی عاصم، نەکا بریندار بووبێ کە ناتوانێ رابکا؟"

"وێ دەچێ جەنابی یاوەر."

"وەکیل باشی عاصم!"

"ئەمرکە."

"لەوانەیە یەکێك لە دۆستەکانی لەوێ دانابێ کە ئێمە بخافڵێنێ بۆ ئەوەی بتوانێ رابکا؟"

وەکیل باشی عاصم گوتی:

"حەمەد کاری وا ناکا. دەزانێ لەم وەزعەدا دۆستەکەی یان دەگیرێ، یان لەنێو دەچێ. حەمەد هیچ وەخت دڵی بەرایی نادا کاری وا بکا."

"کەوابێ، بریندار بووە."

"رێی تێدەچێ."

مارەکان بە دەشتێکی گەرم دا شۆڕ دەبوونەوە. هەر هەژدیهایەك سەدان سەری هەبوو.

حەمەد پێکەنی و لە دڵی خۆی دا گوتی:

"ئەی شەلی زرینگ و وریا. هەتا بەری بەیانی جەندرمەکان وەبەر دەسرێژ دەدا. پێش ئەوەی رۆژ بێتەوە دەست لە تەقە هەڵدەگرێ. ئەودەم جەندرمەکان بەیانی بەدوای من دا دەگەڕێن. لەوانەشە رۆژێك دوو رۆژ لەنێو بەردەکان دا بۆ تەرمی من بگەڕێن. وەختێك سۆراغی تەرمی منیان نەکرد ترسیان سوار دەبێ. جەندرمەکان لە دڵی خۆیان دا دەڵێن کابرا نەزەرکردەیە، جادووگەرە! و "شەلە"ش پێکەنینی پێ دێن. ئەگەر "شەلە"ی بگرن؟... لاقە

شەلەکەی دەشکێنن و وردوخاشی دەکەن..." حەمەد دەنگی تفەنگەکانی عەلی‌یەشەلی لەگەڵ دەنگی تەقەی جەندرمەکان لێك دەکردەوە. پاڵی بە دارچنارێکی ئەستوورەوە داو ماوەیەك لەسەر عەرزی دانیشت و هەوڵی دا خاوەنی ئەو گوللانە کە داویژران لێك جیا بکاتەوە. فکرەکانی تێکەڵ پێکەڵ و شێواو بوون. هەمزەکەچەڵ، چوکووراوا، ئەسپێك کە رای دەکرد، سووتمان، ئیدریس بەگ، داستانی ئیدریس بەگ وەسمانەزلە بۆی باس کردبوو. دایەحۆری چەند روخسارێکی جوان و میهرەبان و دڵگری هەبوو. عەلی‌یەشەل چ جۆرە پیاوێك بوو؟ پیاو نەی‌دەناسی. گۆڵاوی ئاکچاسازو سەیران. دەڵێن تا ئێستا ژنی وەك سەیران جوان دروست نەکراوە. جووتیارە ترساو و سام گرتووەکان. ئەو جووتیارانە کە پیرەکانیان زۆر ئازان، وەك وەسمانەزلەو دایەحۆری... پیرەکانیان زۆر ئازاترن... تەنانەت ژنەکانیشیان هەزار جار لە پیاوان ئازاترو بێباکترن و بەرامبەر بە بێدادی رادەوەستن. دۆردووەشێت و کوژرانەکەی، هەژدیهای هەزارسەر...کە ئەگەر هەر هەزار سەرەکەی ببڕی، دەسبەجێ لە جێیەکەیان لێرەوارێکی سەران شین دەبێ و ئەگەر ئەوانیش ببڕی، لێرەوارێکی گەورەتر دروست دەبێ... لە نەکاو سەدان کەس پیر و لاوو منداڵ وەك داڵاش دادەبارنە سەر دۆردووەشێت و لە پاشان هەڵدەستنەوەو شوێنەوارێك لە دۆردووەشێت نامێنێ... بێجگە لە لاقێکی خوێناوی لەنێو چەکمەیەك دا کە لەنێو تۆزوخۆڵ دا کەوتوە. لە چوکووراوا، لە چیاکان و لە دنیادا ژمارەی ئەوان زۆر لە هیی ئاغاکان زیاترە. ئەدی بۆچی وەك داڵاش داناوەرنە سەر ئاغاکان؟ حەمەد لە خۆی دەپرسی:" ئەوە هاتن و داوەرینە سەر ئاغاکان؟ ئاکامەکەی چی؟...

هەژدیهای هەزارسەر، هەورێکی ئەستوورو ڕاخراو... شمشێرێك سەری هەژدیهایەکان دەپەڕێنێ، لە پەستاو بێپسانەوە دەیان پەڕێنێ. شمشێرەکە کوڵ دەبێ، ماندوو دەبێ، لەگەڵ بڕینی هەر سەرێکی ئەو هەژدیهایە چەند سەری دیکە جێی دەگرنەوە... فکری شێواوو تێکەڵ پێکەڵ... قەسری سوڵتانی توورڕووس لە قەڵای ئاناوارزا... ڕۆژگارێك حکوومەتی بەسەر چوکووراواوە دەکرد...

لەبەردەمی، لە رووبەڕووی ڕەشایی‌یەك هاتە بەرچاوی حەمەد. لە نەکاو لە ترسان هەستایە سەرپێ. ڕێوی‌یەك بە ملۆمۆ راستەڕێ بۆ لای حەمەد دەهات. بە هەستانی حەمەد کلکە درێژەکەی بڵیند کرد، گەڕایەوەو رایکرد. حەمەد دڵەکوتەیەکی توندی بوو.

پاش ماوەیەك حەسانەوە لە جێی خۆی هەستا. هەموو لەشی ژانی دەکرد. پێش حەسانەوەکە نەی‌دەتوانی هەنگاوێکیش هەڵێینێتەوەو هەر لەوێ دانیشتبوو. کارەکانی

هەمزەکەچەڵ، مردنی مام عەلی دورمووش، وەزعی دایەحۆری، وەزعی ئاسیاب چەشمە، دڕووەڵان، مەزراکان، زوڵم و زۆر، جووتیارانی برسی، هەژدیهای هەزارسەر...

بە گەلیەیەکەدا ڕۆیشتەخوار. بە داهاتنی شەو و تاریك بوونی هەوا دۆڵەکەش قووڵتری دەنواند و تاریکتر دەبوو. لە ژوور سەریەوە لە لای ڕاست لێڕەوار دەخرۆشاو لەبەر تیشکی مانگەشەو وەك بارانێکی ڕەش لە ئاسمانەوە دەباریە سەر زەوی. سەرانسەری دۆڵەکە دەیئەڕاندو دەیگوڕاند، وێك دەهات و لێك دەبووەوە. دەکرایەوەو دادەخرا. دارەکان، ئاوەکان، گابەردەکان وێك دەکەوتنەوەو لێك دوور دەکەوتنەوە. لێڕەوار بە نەڕو هۆڕ بۆ لای دەهات... سەری لە گێژەوە دەهات. لێڕەوار، ئاوەکان، باڵندەکان، گوڵەکان، چلە دڕکەکان، قەڵای ئاناوارزا کە لە گەرمان گڕی گرتوە لەگەڵ ئەو گابەردە بنەوشانە، عەلیکۆ، ڕووناکاییەکان، سووتمان، ئەو ئەسپانەی بەردەوام بە دەوری خۆیان دا دەسووڕێن... ئەسپەکان" ئەسپەکان بە دەنگ و هەرا بە دۆڵەکەدا شۆڕ دەبوونەوەو دەهاتنەخوار. دنیایەکی شێواو و تێکەڵ پێکەڵ بە دەوری سەری حەمەد دا دەسووڕا، هازە هازی لە گوێیان دەهات، گوێی پڕ بوون لە دەنگی گوللە... حەمەد لەنێو چەند لافاوی گەورەدا دەتلایەوە... لاقێکی گیرابوو، رایدەکێشا بۆ نێو قووڵایی گەلیەکە. بۆنی گیرو توندی گوڵێکی بە بەر لووتی هەڵڵا هات. پاشان بۆنێکی توندو تاڵ لە هەوا گەڕا، هەوا بۆنی باڕووتی لێدەهات. ئەمجار بۆنی باڕووت لەگەڵ بۆنی ئارەقی لەشی تێکەڵ بوو.

مانگ ئاوا بوو و تاریکایی زیاتر خرۆشاو حەمەدی لە خۆیەوە پێچا. دڕندەو باڵندە، چەقەڵەکان، ورچەکان، ئاسکە چاو بەکلەکان، کاریلەکان، بزنە کێوییەکان، شوورە شاخ درێژەکان، پڵنگەکان، هەژدیها، ئەسپەکان، هەموو بوونەوەرە کێوی و کەوییەکان بە هەڵڵاو هەنگامە شۆڕ بوونەوە قووڵایی تاریکی گەلیەکە. حەمەد سەری دەگێژەوە دەهات و چاوەکانی دەخێلەوە دەهاتن. ئەستێرەکان و لێڕەوار کەوتبوونە جموجۆڵ و دەڕژانە قووڵایی گەلیەکەو نێو تاریکایی.

بەردەکان لەبن پێی حەمەد دا دەخزین و وەك لافاو دەڕۆیشتنە خوارو بۆخۆشی لەسەر بەردە راخزیوەکان بەرەو خوار دەخزی.

هەوڵی دەدا هەمزە کەچەڵی وەبیر بێتەوە. قەڵافەتەکەی دەهاتەوە بەر چاوان و لادەچوو. هەر ئەوەندەی لەبیر بوو کە سەری پڕ بوو لە لەپکەو دەستی هێند درێژ بوون دەگەیشتنە سەر ئەژنۆی. شتێکی دیکەشی لە بارەی ئەوەوە لەبیر مابوو: لە قوژبنێك لەبەر هەتاو دادەنیشت و

قسەی لەگەڵ کەس نەدەکرد. لەبەر هەتاو زۆر بە کەللەشەقی گڕی دەگرت و نارەقی دەڕشت... زستان و هاوین کاری ئەوە بوو. پێستی بە قەد چەرمە کەڵێك ئەستوور بوو. دێهاتی‌یەکان هەمیشە دەیان گوت:"گوللە کار لە پێستی ناکا." بەڵام وەبیری نەدەهات کەنگێ و لەسەر چی عەبدی‌خان دەری کرد.

رووبەری ئاوی گۆمێکی گەورە ئاگری گرتبوو، کۆمەڵێك هەژدیهاو هەور بەسەر ئاوەکەدا شۆڕ دەبوونەوەو دەهاتنەخوار... کۆمەڵێك هەوری سپی... هەوری سپی لەنێو تاریکایی‌دا، گڕیان گرتبوو...

لە نەکاو هەموو نەڕەو گوڕەو هات و هاوارەکە بێدەنگ بوو، و حەمەد لە نەکاو خۆی لەنێو بێدەنگی‌یەکی باوەڕپێنەکراو دا دیتەوە. بێدەنگی لە دنیا گەڕا. حەمەد تووشی حاڵێکی سەیر بوو. هەرچی لە دەوروبەری بوو، تاریکایی، شەو، رووناکایی، لێڕەوار، زەوی کە پێی لەسەر دانابوون، بیرو ئەندێشەکانی، هەموویان سڕانەوە. دەت گوت بۆخۆشی نەماوە. حەمەد چەند هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشان. بێدەنگی‌یەکەی بێبڕانەوە بوو. تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، هەموو جێیەك تاریکایی تەواو بوو. دوو هەنگاوی هەڵێنانەوە، بەسپایی دەنگی چرقەچرقێکی هاتە بەر گوێ، پاشان گوێی لە دەنگێکی وەك کۆخە بوو. دەرگایەك کرایەوە، باوەشێك رووناکایی دەربەڕی‌یە دەرێ. چاوەکانی بە تیشك ئەنگووتن. گوێی لە دەنگێك بوو. یەکێك قۆڵی گرت و بردیە ژوورێ. ریشێکی سپی و درێژی وەك ئاوی روونی بەبەرچاوان دا تێپەڕی.

خاوەنی ریشە سپی‌یەکی گوتی:"کوڕم چت بەسەر هاتوە؟" دڵخۆشیی دەدایەوە. دەنگێکی زۆر گەرمی هەبوو. جۆرێکی قسە دەکرد دەت گوت لای لایی بۆ دەکا. حەمەد نەی‌دەزانی دەڵێ چی، بەڵکوو خۆی دابووە دەستی شیرینیی ئەو دەنگەو لە هۆش خۆی دەچوو.

دەنگی شیرنی ژنەکە گوتی:"لە خوێن دا شەڵاڵ بووی کوڕم، هەموو گیانت خوێنە."

ددانەکانی حەمەد بەسەر یەك دا چەسپابوون، هەرچەندی دەی‌کرد بۆی هەڵنەدەپچڕان. هەموو وەختێك لە کاتی خەم وخەفەتی زۆر دا تووشی ئەم حاڵە دەهات.

ئێستا حەمەد دەنگی وتووێژێکی ـ کە لە رێیەکی زۆر دوورەوە دەهات ـ گوێ لێبوو:

"کوڕەکەی راکێشن."

"گوللەیە لێی دراوە؟"

"بریندار نیە."

"چیی بووە؟"

"کێ دەزانێ؟"

"لە کوێی دانێین؟"

"لەوانەیە جەندرمەکان ئێرە بگەڕێن؟"

"هێشتا منداڵە."

"هیچ گەورە نەبووە."

"ئەو هەموو خوێنە هی چیە؟"

"هی برینی گوللە نیە، لەدڕك و داڵ دراوە، بەردان رووشاندوویانە"

"ئێستا باشی لێبڕوانە."

"هیچ جێیەکی گوللەی وێ نەکەوتوە."

"بەم حاڵ و وەزعەوە ئێرەی چۆن دۆزیوەتەوە؟"

"ماڵی ئێمەی چۆن دیوەتەوە؟"

"ئەویش بەو حاڵەوە..."

ئیدی دەنگەکان لێك نەدەکرانەوە. حەمەد چەندین جار تەنیشتاو تەنیشتی کرد. ناڵەیەکی کرد. ورتە ورتێك بوو، وەك قسەکردن، بەڵام ددانەکانی هێشتا پێك دا نووسابوون. نەختێك دواتر ددانەکانی کرانەوە. وڕێنەی دەکرد:"هەژدیها... هەمزەڕەش... کەچەڵ... چ دەبێ؟ چ دەبێ؟ قەمەر، سەیرا..." بێدەنگ بوو و خەوی لێکەوت. رەحەت خەوتبوو و رەحەت و ئارام هەناسەی دەهات.

هەتا لای نیوەڕۆیە نووست، پاشان لە نەکاو لە خەو راپەڕی و ئەو تفەنگەی لە پەنای بوو پڕی دایە. بەڵام سەری دەگێژەوە چوو و بە لادا هات. لەو کاتەدا سلەمان گرتی. حەمەد چاوی هەڵێناو بە دیتنی سلەمان زەردەی هاتێ، شل بوو و بە سەرسوڕماوی تەماشای دەوروبەری خۆی کرد. ژنە پیرەکەی سلەمان هات و بە راوێژێك کە هەروا بزانە هیچ نەبووە گوتی:

"بەخێراتی کوڕم."

حەمەد بە بیستنی دەنگی شیرن و نەرمی وی کە وەك لای لایی دەچوو، هەموو شتێکی وەبیر هاتەوە. سلەمان گوتی:

"ئێ... بەخێراتی کوڕە گەورەکەم! ئەتۆ هیچ ئێمەت لەبیر بوو؟ تواینەوەو بەقەد چۆلەکەیەکمان لێ مایەوە. سوپاس بۆ خوا کە تۆمان دیتەوە."

پاشان ئاوڕی دایەوە لای ژنەکەی و گوتی:"بۆ راوەستاوی کچێ، کوڕەکە برسیەتی. بەستەزمانە خەریکە لە برسان دەمرێ..."

ژنەکە گوتی:

"دۆینەم وەسەر ناوە، حازرە."

سلەمان لە حالێك دا حەمەدی توند بەخۆوە دەگوشی، دەیگوت:

"کوڕە گەورە، کوڕە گەورەکەی خۆم، ئەو ماوەیە لە کوێ بووی؟ لەکوێ بووی؟ لەکوێ بووی؟ لەکوێ بووی؟"

ژنەکە دەسبەجێ سفرەکەی راخست و سلەمان لە حالێك دا حەمەدی لە باوەشی خۆی ئازاد دەکرد گوتی:"دانیشە کوڕە گەورەکەم." حەمەد بە پەلە لەسەر سفرەی دانیشت. دۆینەکە لە دەفرێکی قووڵی مس دا رۆنی قاڵ کراوو بیبەری بەسەردا کرابوو. نەعنایەکی زۆرو سیریشی تێدا بوو. چێشتەکە هەڵمی لێ‌هەڵدەستاو هەڵمێکی شینی باریك بەرەو میچی هۆدەکە بەرز دەبووەوە. ژوورەکە پڕ ببوو لە بۆنی دۆینەیەکی بەتام.

ژنەکە کەوچکی دایە دەستی حەمەدو گوتی:"زۆری بخۆ" - داخوا حەمەد بەو دۆینەیە رابردووی وەبیر دەهاتەوە؟ چەندین ساڵ لەمەوبەریش قاپە دۆینەیەکی گەرم و هەڵماوی‌یان لە پێش حەمەد دانابوو. حەمەد بە میهرەبانی و چاوی بە پێکەنینەوە تەماشای وی کرد. کەوتەوە بیری رۆژگاری زۆر کۆن و گوتی:"خێرا بخۆین."

سلەمانەزلە بە قاقاوە گوتی:"حەمەدۆکی خۆم دیسان بە قسەی من بکە. چێشتەکە گەرمە، وا بە پەلە مەخۆ، زارت دەسووتێ ها!"

حەمەد بە کەیفەوە گوتی:"چما دەکرێ زاری منیش بسووتێ؟"

حەمەدو سلەمانەزلەو خێزانی بە پێکەنینەوە تەماشای یەکتریان کرد.

ئەم جارە سلەمانەزلە بە راوێژێکی جیددی گوتی:

"بڕوانە حەمەدۆك هیچ نارەحەت مەبە. ئەمڕۆ بەیانی بەتەواوی پرسیومە. عەلی‌یەشەل ئەو جەندرمانەی بەدوای تۆوەن بردووینە گەڵی "چیمکلی". کەوابێ چێشتەکەت لەسەرەخۆ بخۆ."

حەمەد دیسان پێ‌کەنی و گوتی:

"باشە بە کاوەخۆ دەخۆم."

سلەمانەزلە بەدیتنی روخساری شادو بە پێکەنینی حەمەد، لەسەر قسە خۆشەکانی رۆیشت:

"ها... میوان له کوێوه دێی؟ بۆ کوێ دەچی؟"

چاوەکانی حەمەد بریسکەیان دا. تیشکێکی زەرد لەچاوانی دا بلێسەی دا، بڵاو بووەوەو له فکرەکانی دا درەوشایەوە. بریسکەی پۆڵا هاتە چاوەکانیەوە. ملی بەلاوە ناو گوتی:

"مامە، لە ئاسیاب چەشمەوە دێم. دەمەوێ بچمە ئەو دێیە."

"دەزانم ئاسیاب چەشمە لەکوێیە. بەڵام دەتەوێ بچیە کام دێ؟"

خەمێکی بێئەنداز دڵی حەمەدی داگرت، بەڵام دەری نەبڕی بۆ ئەوەی سلەمان نارەحەت نەبێ گوتی:

"دەمەوێ بچمە ئەو دێیە، دەبێ یەکێك پەیدا بکەم."

"کوڕە دەتوانی پەیدای بکەی؟"

حەمەد بە باوەڕێکی پتەوەوە گوتی:"پەیدای دەکەم."

سلەمان بیری کردەوە ـ داخوا ئاگای لە وەزعی ئاسیاب چەشمە هەیە ـ و پرسی:

"لە ئاسیاب چەشمە کەست دی؟"

"کەسم نەدی مامە ـ چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك ـ هیچم نەدی مام سلەمان!"

سلەمان تێگەیشت کە حەمەد لە هەموو شتێك ئاگادارە. لەسەری نەڕۆیشت و باسەکەی گۆڕی:

"ئیشەڵڵا دەچیە ئەو دێیەو ئەو پیاوەش دەبینیەوە."

"دەیبینمەوە."

سلەمانەزلە لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ئەو دێیە پەیدا نابێ. ئەمن حەفتا ساڵە لەو دێیەو لەو پیاوە دەگەڕێم. کوڕم لەم جیهانەدا دێیەکی وا نیە. بگەڕێ بزانم، جارێکیش ئەتۆ بگەڕێ. لەوەتا دنیا دروست بووە هەموو لەو دێیە دەگەڕێن، لەو پیاوە دەگەڕێن."

حەمەد دۆینەکەی کە هەڵمی لێهەڵدەستا، خواردو خەلاسی کرد.

"ئۆززی... زگم بوو بە دەهۆڵ."

ماوەیەك بێدەنگ بوون. خێزانی سلەمان هات سفرەکەی خڕ کردەوەو ڕۆیشت. بێدەنگیەکە هەروا درێژەی هەبوو. کوڕو بووکەکانی سلەمانەزلە هاتن. بە ترسەوە تەماشای حەمەدیان دەکرد. خەبەریان لە تێك هەڵچوونی دوێنێ هەبوو. حەمەد سەری داخستبوو و سلەمانەزلە چاوی لێدەکرد.

پاش ماوەیەك حەمەد سەری هەڵبڕی. چاوەکانی دەدرەوشانەوەو پڕ لە پرسیار بوون. دەستی بە قسە کرد، یەك بێن قسەی دەکرد، هەستی خۆی، ئەندێشەو بیروباوەڕەکانی، ئەو ڕووداوانەی بەسەری هاتبوون، هەموویانی ڕاست و بێپەردە باس کردن.

لەبارەی وەسمانەزلە، خەلکی وایوای، سەیران، خەلکی ئاك مەزار، ئیدریس بەگ، عەلیسەفابەگ، عارف صائم بەگ، دایەحۆری و هەمزە کەچەلەوە قسەی کرد، لە سیرێ تا پیوازێ هەموو شتێکی باس کردو پۆرگی دلی خۆی دری.

"عەبدیم کوشت. پیاوێکی زالم بوو. ئینسانەتیی نەدەزانی. دایکمم لە دەست چوو. خەجیجیش کوژرا، بۆخۆشم چوومە چیاو بەندەنان وەدوای مردن کەوتم! ئاخرەکەی بوو بە چی؟ هەمزە کەچەل پەیدا بوو. هەر بە فکریشم دا نەدەهات کە هەمزەکەچەل بێ و دەست بەسەر دێیەکەدا بگرێ... بێ زەوییەکان وەرگرێتەوەو دێهاتییەکان تووشی رۆژرەشی بکا. هەرگیز بە فکرم دا نەدەهات... ئێستا لە دلی خۆم دا دەلێم ئەوە هاتم هەمزە کەچەلیشم کوشت هەمزە کەچەلێکی دیکە جێی دەگرێتەوە کە هەزار جار لەو خەراپتر دەبێ. ئەتۆ دەلێی چیی مام سلەمان. ئەتۆ رێیەکم پێ نیشان بدە."

سلەمانەزلە گوتی:

"دابی ئەم دنیایە هەمیشە وایە. ئاو هەمیشە دەرواو چالەکان پڕ دەکاتەوە. ئینسانەکان دێنە سەر دنیاو دەمرن، هەتاو هەلدێ و ئاوا دەبێ، دار دەروێن و گەورە دەبن و گەندەل دەبن. ئاوەکان دەرۆنە خوار، هەور دەگرین. ئاغایەك بکوژی ئاغایەکی دیکە جێی دەگرێتەوە، دووبارە بیکوژە، دیسان یەکی دیکە دێتە جێگای."

حەمەدیش وەك ورێنە بکا گوتی:

"ئەگەر دیسان بیکوژین، دیسان بیکوژین، یەکی دیکە دێ، دیسان یەکیدیکە، دیسان یەکی دیکە. عەبدی دەمرێ، هەمزە دێ، هەمزە دێ، هەمزە دێ..."

سلەمانەزلە هاواری کرد:

"هەمزە دێ، هەمزەی لامەزەب."

لە جێی خۆی بلیند بوو، دووبارە دانیشتەوەو ریشە سپییە درێژەکەی شەپۆلی دا.

# (٢٨)

عەلیەیەشەل بە دوای شوێنەکەوە بوو. پانتۆڵێکی خوریی دەستچنی خەت خەتی قاوەیی لە پێ دابوو کە بە تویکڵەگوێز رەنگ کرابوو و پشتێنێکی رەشی لە پشتێ بەستبوو. دەمانچەیەکی رووتی لەبەر پشتێنێ نابوو و لە حاڵێك دا لاقە شەلەکەی بە دوای خۆیدا رادەکێشا، بەرەوپێش دەڕۆیشت. بەم جۆرە بە دوای شوێنەکەدا بەرەو گوندی کەسمە دەچوو. هەمووان و یەك لەوان عەلیەیەشەل دەیان زانی کە حەمەد بەرەو ئەو لایە چووە. جگە لەوە، ئەو، تەنانەت دەیزانی کە حەمەد لە ماڵێ سڵەمانەزلەشە. عەلیەیەشەل شوێن گێڕێکی زۆر بەناوبانگیشی لەگەڵ بوو. ئەو شوێن گێڕە "مووسا سەرسەرِ" خەلکی "البستان" بوو. پیاوێك بوو تا رادەیەك وەنێو کەوتوو، کەلەگەت و باریکەلە، رەقەلەو رەشتالە. رۆژێکیان بەیانی عەلیەیەشەل دیتی کە ئەو پیاوە لەگەڵ یاوەر فارووق پەیدا بوو. گۆیا یاوەر لە کۆنەوە مووسا سەرسەری ناسیوە. لەگەڵ بەسەرهاتەکانی ئەم دواییەی حەمەدۆك بە دوای دا ناردبوو بۆ "البستان". مووسا سەرسەرِ لە سەرانسەری چوکووراوا، ماراش و ئەنتەپ دا بە شوێن گێڕی بەناوبانگ بوو. عەلیەیەشەلیش خەلکی خاردەشت و بەشێك لە دانیشتووانی چیاکانی تووڕووس دەیان ناسی.

مووسا سەرسەرِ پیاوێکی کەم دوێ بوو، و عەلیەیەشەل کە تێگەیشتبوو ئەو کابرایە شوێن هەلگرێکی زۆر زۆر شارەزایە، بەرە بەرە ترسی رێ نیشت.

بۆ شوێن گێران لەو بەردەلانەوە دەستیان پێ کرد کە رۆژی پێشتر حەمەد خۆی تێدا حەشار دابوو. رۆژێکی خۆش و تاووساو بوو. لەبەر تینی گەرمای بەهار بۆنی گوڵان بلاو ببووەوە، بایەکی نەرمی وەك شووبای بەیانی دەهات و باڵی ئەو مێشانەی دەلەراندەوە کە لە گوڵێکەوە دەفڕینە سەر گوڵێکی دیکە.

لەنێو چیمەنە سەرسەوزو کورتەکانی نێوان شاخەکان دا سوێسنەی کێویی زۆر زەردو لاسك کورت، گوڵە وەنەوشە، گوڵە گیاسالمەو گوڵاڵەی زۆر سوورو درەوشاوەو گوڵە گوێنیی زۆر بەرز پشکوتبوون. گوڵەکان لە مێشەنگوینەدا ون ببوون. بۆنی جاترە لە هەوادا بڵاو دەبووەوە. هەر جێگایەك، دەشت، کێوپارە، کێڵگەکان، دەوروبەری کانیەکان، بەستێنەکان و لێرەوارەکان هەرکامە گوڵێکی تایبەتیی خۆیان بە بۆن و بەرامەی تایبەتییەوە هەیە. بە تایبەتی رووەکەکان و بۆنی ئەو گوڵانە کە لە نێو بەردەڵانەکان دەپشکوون لە هی شوێنەکانی دیکە جیان. بەهار لە شاخ و بەردەڵان دا لای لایی دەکا. ئەو بۆنەی لە بەردەڵانەکان دەگەڕێ و رەنگی ئەو گوڵانەی لەوێ دەپشکوون، ئەوەندە تەڕو تازەن هەناسە لە سینگی بنیادەم دا ڕادەگرن، بەتایبەتی ئەگەر بەهار بێ، ئەویش رۆژێکی تاووساوی بەهاری، بەتایبەتی ئەگەر بایەکی وەك شووبای بەیانیی بێ و بەتایبەتی ئەگەر بۆنێکی خۆشیش لە هەوادا بڵاو بووبێتەوەو مژێکی تەنك سەر بەردەڵانەکە داپۆشێ... ئەویش لەو وەختەدا کە بەهار لای لایی بە گوێی بەردەڵان دا دەخوێنێ...

گابەردەکان لە نێو گیای پڕو بەپشت و گوڵەکان دا، لەنێو گوڵ و ڕەنگەکان دا جوانی و دیمەنێکی دیکەیان هەبوو. جاروباریش بۆنی خەلەنگ دەهات و دەبڕایەوە. لەبن چڵە گوڵەکان دا باڵندەی چووکەڵە بەڕەنگی نایاب و سەیرو سەمەرەوە هێلانەیان هەبوو. لە گوڵێکەوە بۆ گوڵێك و لە لاسکە گوێنییەکەوە بۆ لاسکە گوێنییەکی دیکە جاڵجالوکە وردەکان بە ڕەنگی شین و سوورو سەوزی بریقەدارەوە هەزاران داوی بەقەد لەپی دەستیان تەنیبوو لە بن تیشکی هەتاوی بەهاری دا لە قوژبنێکی دا خۆیان کوشم هەڵێنابوو. وردە کارگ گۆشەیەك لە خاکی وەك بڕوێشی زەوییان قەڵاشتبوو و سەریان دەرهێنابوو.

عەلیەشەل زۆر دەترساو بە توندی لە فکردا بوو. ئەو مووسا سەرسەرە سەگبابە شوێن گێرێکی بێرەزا بوو. بەبێ هیچ هەڵەو لارێ بوونێك شوێنی حەمەدی هەڵگرتبوو و بەدوای دا دەرۆیشت. ئەگەر هەروا ڕۆیشتبایە، شوێنەکە یەك سەر دەچووە بەردەرکی ماڵی سڵەمانەزلە.

یەك دووجار هەوڵی دا بە هەڵەی بەرێ و ڕووی پێ لە جێگایەکی دیکە بکا. بەڵام هەموو جارێ مووسا سەرسەرِ بە جۆرێك بە چاوی سووك تەماشای دەکرد کە ئەگەر بەرد بووایە لە شەرمان دەبوو بە ئاو. عەلی بێدەنگ ببوو، لە فکری چارەیەکی دیکەدا بوو. لە خوارەوە یاوەر فارووق، وەکیل باشی عاصم و هەمزەخان و جەندرمەکان بە ڕێچکە بزنێك دا دەرۆیشتن.

عەلی‌یەشەل لەو ڕۆژە جوان و تەڕ و پاراوە بەهاری‌یەدا و لەنێو ئەو هەموو بۆن و ڕووناکایی‌یەدا بەردەوام ئارەقی دەڕشت. لە هەموو ژیانی‌دا تووشی تەنگانەی وا نەببوو. تەنیا یەك ڕێگای هەبوو. ئەویش ئەوە کە بە هەر جۆرێك بێ، حەمەدی کە لە ماڵی سلەمانەزلە بوو، ئاگادار بکا. ئەگەر مووسا سەڕسەڕ شوێن گێڕێکی ئاسایی و نێونجی بووایە دەی‌توانی هەتلەی بکاو بە ڕێگایەکی دیکەی دا بەرێ هەتا شەو دادەهات. ئەودەم پاش ئەوەی هاوڕێ‌یەکانی دەنووستن دەی‌توانی بچێتە ماڵی سلەمانەزلە حەمەدی هەڵگرێ و بڕۆن... بەڵام ئەوە مومکین نەبوو، هیچ شوێنێك لە چاوی مووسا سەڕسەڕ ون نەدەبوو.

لەنەکاو لەنێو پۆلە بەردێك دا شوێنەکان زۆرتر بوون. شوێنەکان بە چوار لادا بڵاو دەبوونەوە. مووسا سەڕسەڕ ماوەیەکی باش لەسەر ئەو شوێنانە کەوتە شك و گومانەوەو ڕاوەستا. ماوەیەکی زۆر لە شوێنەکان و دەوروبەر ورد بووەوە. عەلی کە دەرفەتێکی زێڕینی چنگ کەوتبوو، شوێنێکی پێ‌نیشان دا کە بەرەو چیایەك تێ‌هەڵ دەبوو. مووسا سەڕسەڕ بە هەر هۆیەك بوو، پەیڕەویی لە ڕایەکەی عەلی کرد و ملی هەورازی گرت. هێندەی نەمابوو عەلی لە خۆشیان دڵی بتۆقێ.

مووسا سەڕسەڕ هەتا بن گابەردێکی سپی، کە خاڵێکی قاوەیی ڕەنگی وەك ئاردی هەبوو و تەنانەت یەك چڵە گیاشی لێ‌نەڕوابوو، بەدوای شوێنەکەدا ڕۆیشت. ئەم خاکە سەدان شوێنی لەسەر بوو. عەلی، شوێنەکانی یەك بە یەك لێك دەکردنەوە. شوێنی گورگ، ڕێوی، چەقەڵ، ئەسپ، پڵینگ...دالاش، کۆتر، سمۆرە، هەڵۆو سەدان شوێنی دیکە مۆری خۆیان لەو خاکە نەرمە دابوو. مووسا سەڕسەڕ لێرەش ماوەیەك ڕاوەستا.

شوێنە ئینسانەکە هەتا دوندی شاخەکە دەڕۆیشت.

عەلی یەك بین قسەی دەکرد. باسی حەمەد، سەردەمی منداڵیی حەمەد و ئازایەتیی ئەوی گێڕایەوە. لەبارەی عەبدی‌خان و ئەو زوڵم و زۆرەوە کە لە جووتیارەکانی کردبوو، قسەی کرد. گێڕایەوە کە حەمەد چۆنی عەبدی‌خان کوشت. بەسەرهاتی خەجیج، ئیراز، دڕووەڵانەکە، ئەو نوورە کە لە لووتکەی عەلی‌کۆ هەڵببوو و چۆنیەتیی ون بوونی حەمەدی هەمووی بە دووروودرێژی باس کردن. مووسا لە زۆربلێ‌یی ئەو کابرایە گێژ ببوو، و عەلییش باشی دەزانی ئەگەر بەو زۆربلێ‌ییەی خۆی گێژی نەکردبایە، شوێن گێڕێکی وەك وی ئەوەندە تووشی هەڵە نەدەبوو، و نەدەکەوتە دوای ئەو شوێنە کە دەچوو بۆ لووتکەی کێوەکە.

لە حاڵێك دا مووسا سەرسەرِ هەتا سەر شاخە سپییەکە یەك تەکان وەدوای شوێنەکە کەوتبوو و ئێستا بە هەزار زەحمەت لە شاخەکە وەسەر دەکەوت، عەلی تەنانەت دەمە ساتێکیش دەمی لە کالان نەکەوت، یەك بێ قسەی کردو بەسەرهاتەکانی حەمەدی گێڕانەوە. ئێستاش خەریك بوو دەیگوت:

"ئەگەر کەسێك یەك تۆسقاڵ، بڕوانە! ئەوەندووسکە خەراپەی لەگەڵ بکا، ئاخر خێر نابێ. بێ ئەم لاو ئەولا سزاکەی دەبینێ. وەڵڵا هاوڕێ، ئەمن زۆری لێدەترسم. ئەو، دەڵێی نەزەرکردەیە. بەو ئاسانییە دەگیر ناکەوێ. لە پێش چاوان غەیب دەبێ. کەس ناتوانێ ئازاری پێ بگەیەنێ. ئەگەر ئازارێکی پێ گەیشت، مسۆگەر بزانە کە بێپارێزیی کردوە، واتە پارێزەرانی کە دیارە بە چاو نابینرێن، ئەوان بێپارێزییان کردوە. خۆ ئەگەر یەکێك دەرفەتی دەست کەوێ و بتوانێ چووکترین ئازاری پێ بگەیەنێ، هاوار بە ماڵی، تازە ئەو بنیادەمە ڕێگای نەجات بوونی نیە، کاری کراوە. "وەسمان جا" بۆچی لە هەردوو چاوان کوێر بوو. بەڕاستی کاکە ئەوەت دەزانی؟ ڕاوەستە با پێت بڵێم بۆچی... عەرزی بە خزمەتت کەم، وەختێك لەسەر لووتکەی عەلیکۆ نوورێك دەرکەوت و سێ شەوو ڕۆژان عەلیکۆ لە ڕووناکایی دا نوقم بوو، وەسمان جا لەسەر "کانیکەشیش" چاوی پێی دەکەوێ. وەختێك چاوی پێی دەکەوێ، دێ و خەبەر بە یاوەر دەدا. وەختێك خەبەر بە یاوەر دەدا، یاوەر بە خۆی و جەندرمەکانیەوە گەمارۆی دەدەن. حەمەد بە سووکی بریندار دەبێ و خوێنی سووری دەڕژێتە سەر خاکی ڕەش. سبەینێ بەیانی وەختێك وەسمان جا لە خەو هەڵدەستێ، دەزانی چ دەبینێ؟ دوژمن لە ماڵێت نائومێد بێ، دەبینێ کە لە هەردوو چاوان کوێر بووە. ئێستا ڕاوەستە بەسەرهاتێکی "سەن سیز دۆران"ت بۆ بگێڕمەوە. ئەویش یەکێك لەو کەسانە بوو کە جێگای حەمەدیان بە یاوەر گوتبوو. ئەم کارە بوو بە هۆی ئەوە کە جەندرمەکان خەجیجی ژنی حەمەدیان کوشت. خوێنی سووری خەجیج ڕژایە سەر خاکی ڕەش. ئەو جەندرمەیەی خەجیجی کوشتبوو هەر لەوێ فجووی کردو کوژراو لەپڕ لەسەر عەلیکۆ کێژەڵووکەیەك بەرز بوو. هەوران گرماندیان و بریسکە لێیان دا. عەرزو عاسمان وەك تاریکەشەوی لێهات. عەلیکۆ لە جێی خۆی بزووت، هاتە خوارێ و چۆوە سەرێ و نەڕاندی و لەرزی. بارانێکی سامناك باری کە تا ئێستا نەبینرابوو. لافاو هەستان. وەختێك خەبەرمان زانی سەن سیز دۆرانی بە خزم و تایفەو دراوسێکانیەوە هەڵگرت و بردی. لافاو تەنانەت گاوگۆل و ئێسترەکەشی بردن. تەنانەت کەلاکیشیان نەدۆزرایەوە. ئێستا گوێ بگرە کارەساتێکت بۆ بگێڕمەوە کە بەسەر خۆم هاتوە.

حەمەد کچێکی هەڵگرتبوو. ئەو کچە دەزگیرانی برازای عەبدی بوو. حەمەد حەزی لێدەکرد. کچەکەی هەڵگرت و خۆی بە لێڕەوار دا کرد. ڕۆژێکی تۆف و باران بوو، کە خەبەریان بە من دا دەبێ شوێنیان بۆ هەڵگرم. هۆو گابەردانەی ئەوبەرمان دەبینی؟ لەوێ ڕا شوێنەکەم هەڵگرت. لەنێو گابەردەکان دا "حەسۆ شێلم" هاتە پێش چاوم. دەزانی کێیە؟ یەکێك لە نەزەرکردە گەورەکانە، رووحانەتێکی هەیە وەك شمشێر! شێخمان بەمنی گوتی:"عەلی! نەچی وەدوای ئەو فکرە کەوی کە حەمەدی بدۆزیەوەو ئاشقەو ماشقان لێك بکەی! ئەو کوڕە ئەو پیاوە نیە کە ئەتۆ لە زمانی خەڵکەوە تاریفت بیستوە، تووشی ژانەسەرت دەکا." ئەمەی گوت و لە پێش چاوم غەیب بوو. بەڵام سەرم پڕ سەودا بوو و لە خۆبایی بوونی دەورانی لاوەتی. قسەکەیم لە گوێ نەگرت. وەدوای شوێنەکەیان کەوتم و دۆزیمەوە...

حەمەد لێی دا عەبدیی بریندار کردو برازاکەشیی کوشت. وەختێك لەوێ ڕا دەگەڕامەوە، ژانێك لە لاقم گەڕا، تووشی ئازارێك بووم تووشی دوژمنیشت نەبێ. هاوارم دەگەیشتە ئاسمان. مانگێکی تەواو شەوو ڕۆژ وەك کوند ناڵاندم. شێخمان حەسۆ شێلم لەوە زیاتر ناڵەی منی تەحەممول نەکرد، هات دوعایەکی بەسەردا خوێندو فووی لێکرد، ژانەکەم هێدی بوو. بەڵام لەو ڕۆژەوە لاقم ئاوا شەل بووە. بەکورتی لەو ڕۆژە بەدواوە ئەمن شوێنی حەمەدم هەڵنەگرت. زۆرم زەبر وێ کەوتوەو ژانەسەرم تووش بووە. بەڵێ شوێنیم هەڵنەگرت، هەرچەند حکوومەت یەخەم بەرناداو بە ناعیلاجی وەدوای دەکەوم. بەڵام ئەگەر شوێنەکە بۆ ڕۆژهەڵات چووبێ، ئەمن دەزانم کە دەبێ لە ڕۆژئاوا بە دوای دا بگەڕێم. چونکە دەزانم حەمەد شتێکی دیکەیە، لەگەڵ ئەوانی دیکە فەرقی هەیە. لەسەر عەلیکۆ، تۆپەڵە نوورێك بە قەد منارەیەك دەرکەوت کە سێ شەوو ڕۆژان دنیای رووناك کردەوە... هەموو خەڵکی تووڕووس ئەو نوورەیان دی. سەر هاویشتنە سەر ئەم کوڕە فەڕی باش نیە، هیچ فەڕی باش نیە!..."

مووسا سەرسەرەڕ گەیشتە لووتکی شاخە سپیەکەو دانیشت و سەری لەنێو دەستانی گرت. ڕەنگی وەك زەعفەران زەرد بوو و لێوەکانی دەلەرزین. عەلییش کە لەبەر زۆرگوتن هەناسەی گیرابوو، گەیشتە سەر شاخەکە. ڕووبەڕووی مووسا سەرسەرەڕ دانیشت و لاقە شەلەکەی هەتا بن لووتی ئەو درێژ کردو مووسا لە بنەوە لە پەستا هەر چاوێکی لە سەروچاوی عەلی دەکردو چاوێك لە لاقە شەلەکەی.

عەلی دەیگوت:

"ماندوو بووین. لەوانەشە کوڕەکە لەسەر ئەو کێوە بێ، لای ئێوارێ لە لووتکەی کێوەکە نیزیك دەبینەوە. ئەگەر کوڕەکە لەوێ بێ، شەڕێکی گەرم دەبینین، ئەگەر تا ئەو وەختە جێیەکی لەشمانی نەقوستان نەکردبێ... چونکە ئەو کوڕە زۆر ئازایە، وەك شێر شەڕ دەکا... ئەوە دەبینین کە جەندرمەکان چۆن لەو کێوەوە رادەکەن. وا هەڵدێن تاژیی رەش کوژ تۆزیان نەشکێنێ. جا راوەستە با بیبینین."

مووسا سەرسەرِ ئاورێکی ئەوەندە پڕ فیزو بە کەم زانینی وەسەر عەلی دایەوە کە دەست و پێی خۆی لێ ون بوون. لە پێش دا دەستی لەسەر ئەژنۆی دانان، لەپاشان هێنانیە سەر بەردێك، پاشان بۆنی بە گوڵێکەوە کردو پەرپەری کرد، هەستاو دووبارە دانیشتەوەو تەماشایەکی مووسای کرد. دیسان ئەو پێکەنینە پرسووکایەتییەی لەسەر لێوانی دی. سەری داخست. پاشان لە نەکاو لاوفای وشە لە زاری وەڕێ کەوت. مووسا سەرسەرِ بە بێدەنگی و سەرسوڕماوی تێیەوە راما.

مووسا پانتۆڵێکی دەزووی لەپێدا بوو کە هێندە کۆن بوو، رەنگی خۆی نەمابوو و رەنگێکی خۆڵەمێشیی گرتبوو. کەوشە سوورە ماراشییەکانیشی کاڵ ببوونەوەو وەك بێژینگ کون کون ببوون. ریشێکی ماش و برنجیی تەنك و ئاڵۆزی هەبوو. سەروچاوی مووسا بەو جووتە چاوی لە قووڵ کەوتوو و لووتی هەڵگەڕاوەوەو برۆی راکشاو و چەنەگەی باریکیەوە وەك باڵندەیەکی سەیرو سەمەرە دەچوو. باڵندەیەکی پیر، دەرفکرو خەفەتبار...

مووسا سەرسەرِ دووسێ جار وەك باڵندە قۆڵی راوەشاندن و هەستایە سەر پێ. عەلی هەموو جموجۆڵێکی وی خستبووە ژێر چاوەدێری. مووسا لە پێش دا بای دایەوە بۆ لووتکەی کێوەکەو لە بەردەڵان هاتە خوار. عەلی هێندەی نەمابوو لە خۆشییان دڵی راوەستێ. لە حاڵێك دا بازەڵەی بە کلکی خۆی دەکرد، بە دوای دا هاتە خوارێ. مووسا سەرسەرِ لە لووتکەی کێوەکەوە رامابوو و تەماشای هەورە سپییەکەی سەر دوندەکەی دەکرد. چەند لەحزەیەك هەروا لە لووتکەکەوە راما، لە بەرامبەری بڕکە گۆزروانێکی بە قەد دارێك و چەند گوڵی زۆر گەورە زەرد دەچوون. مووسا سەرسەرِ چەند هەنگاوێکی دیکەی بەرەو دوندی کێوەکە هەڵێنانەوەو دوایە لە نەکاو گەڕایەوەو بە غاردان لە چیای هاتە خوار. عەلی لە ترسان هەناسەی راوەستا. تەماشای هەتاوی کرد. زۆر درەنگ بایە نیوەڕۆیەکی زوو بوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:"وا باشە ئەم پیاوە بکوژم، بیکوژم و حەمەدی نەجات بدەم. با بم نێرنە بەندیخانە. حەمەد دێ لە بەندیخانە رزگارم دەکا. روو دەکەینە کێو و بەندەنان و ئەمنیش دەبمە یاغی. شوێن گێڕێکی

یاغی کە بۆخۆیان کەیفی پێ بکەن." دوایە فکری کردەوە: هەموو شتێکی رێك و راست پێ بڵێم؟ لەبەری بپاڕێمەوە؟ بۆ لەبەر پاڕانەوە دەبێ؟ لە پێش دا لەبەری دەپاڕێمەوە، هەموو شتێکی راست و رەوان پێ دەڵێم. تکای لێدەکەم. ئەگەر هەر دەستی هەڵنەگرت لێی دەدەم دەیکوژم. پاشانیش وا نیشان دەدەم کە ئێرەییم پێ بردوە، بۆیە کوشتوومە. دەڵێم پیاوی حەمەدۆك بوو و شوێنەکەی بە ئەنقەست هەڵە دەکرد."

مووسا سەرسەرِ گەیشتە جێگایەك کە بەردەکانی وەك خەرمان کۆکۆ بوون. لەسەر عەرزێ لە شوێنەکان ورد بۆوە. تەماشای رووبەرووی خۆی کردو بەرەو گەڵێیەك کە قووڵاییەکەی تاریك بوو وەرێ کەوت. زۆر خێرا دەڕۆیشت. لە خوارەوە دوور یاوەر بانگی کرد:

"شوێن گێڕینە! کوڕینە وەرنە ئێرە. جارێ بەسە. وەرن نانی بخۆین، دوایە وەدوا شوێنەکە دەکەوین. یاوەر چەندین جاری بانگ کرد. بەڵام مووسا سەرسەرِ گوێی لێنەبوو. لەوانەشە گوێی لێبووبێ و گوێی خۆی کەڕ کردبێ. عەلی کە لە کاری مووسا قەڵس ببوو، خۆی گەیاندێ و توند قۆڵی گرت، رایکێشاو نەڕاندی:

"ئەتۆ لە فەرمان حاڵی نابی. ئەتۆ چ شوێن هەڵگرێکی؟ یاوەر بانگت دەکا."

مووسا سەرسەرِ راوەستا. بە کەللەشەقییەوە لە بنی چاوەکانی عەلییەوە راما. تەکانێکی دایە خۆی. قۆڵی لە چنگی وی راپسکاوت و گوتی:

"حەمەدۆکی دەبینمەوە. ئەگەر سوور بزانم سەقەتیش دەبم، دەمرم، لە هەردوو چاوان زەلیل دەبم، خوێن دەرشێمەوە، دیسان دەیبینمەوە."

عەلییەشەل بێدەنگ بوو. وشك هەڵاتبوو.

بە دڵی داهات:"وەستای شوێن گێڕ ئەوەندە بزانە پێش ئەوەی حەمەدۆکی بدۆزیەوە، بۆخۆم دەت کوژم."

مووسا سەرسەرِ لە پێش داو عەلییەشەل بە دوایەوە دەهاتنە خوارێ بۆ ئەو جێگایە کە جەندرمەکانی لێهەڵترووشکابوون. مووسا کە لە پێشەوە بە غاردان دەڕۆیشت وەك باڵندەیەکی درێژ دەچوو کە هەڵفڕیبێ. وەختی رۆیشتن قۆڵەکانی وەك باڵی پەلەوەر رادەوەشان.

یاوەر، وەکیل باشی عاصم و هەمزەو چەتەیەکی کۆن و لەمێژینە چوار بە چوار لە بن سنۆبەرەکان دانیشتبوون "ڕاکی"یان دەخواردەوەو ئەو گۆشتە کە جەندرمەیەك لە پەنایان لەسەر پۆلووان دەیبرژاند، دەیان کردە مەزە.

یاوەر گوتی:"وەرن بزانم. ئێوە کە تەنانەت شوێنی باڵی پەلەوەریش دەدۆزنەوە، پێم بڵێن چیتان کردوە؟"

مووسا سەرسەرِ خەبەردار راوەستاو لەحاڵێك دا سەلامی عەسکەریی دەکرد، گوتی:

"شوێنەکەیم دیوەتەوە فەرماندەر، پێش ئەوەی شەو دابێ نێچیرت دەدەمە دەست."

عەلی کە پێی وابوو مووسا سەرسەرِ مەسەلەکە بە یاوەر دەڵێ، لەبنەوە تەماشای دەکرد. دانیشتن و دەستیان کرد بە گۆشت برژاندن. مووسا سەرسەرِ لە هەموو کارێك دا نازا بوو. لە رێ رۆیشتن دا نازا بوو، لە نان خواردنیش دا هەروا، لە گۆشت برژاندنیش دا تەردەست بوو. هێند خێرا خێرای قسە دەکرد، دەت گوت وشەکان لە زاری هەڵدەقوڵن و دێنە خوار... وەختی نان خواردن عەلی کە هەوڵی دەدا لاسای بکاتەوە، پاروەکانی بە نەجووراوی قووت دەدان. مووسا سەرسەرِ پارووی هەر لە دەم دا بوو کە راست بووەوە:

"خوایە هەزار جار شوکور. برایمی خەلیل بەرەکەت بدا بە سفرەتان. خوا رزق و رۆزیتان زیاد بکا."

وەرێ کەوت. عەلیەیەشەلیش بە دوای دا وەرێ کەوت، بەڵام هەتا خۆی پێ گەیاندەوە شەلاڵی ئارەق بوو.

نەراندی:

"چتە؟ بۆ غار دەدەی، چما رێت کەوتوون؟ شووتیت بۆ نەخۆشی هێناوە؟ کەمێك بەسپایی برۆ با بت گەمێ!"

مووسا سەرسەرِ بە عادەتی خۆی چەند جار لە دەوری ئەو شوێنە کە لەسەر خۆڵەکە دیار بوو سووراو پاشان وەرێ کەوت، پێنج شەش هەنگاو هەورازتر دیسان شوێنێکی وەك شوێنەکەی پێشووی دی. ئەم شوێنە لە تەنیشت تاتەبەردێکی خەنەتیلکەگرتوو بوو کە بەرزاییەکەی هەتا پشتێنێ دەهات.

هەورێك بەری هەتاوی گرت. سێبەرەکەی تێپەرِی و دووبارە هەتاو دەرکەوتەوە. مووسا گوێزینگی بەدەرەوە بوو. پشتێکی پرِ چرچ و لۆچی هەبوو کە رووشاڵی قووڵی لێهەڵ ببوون و خوێنیان پێوە وشك ببوو... مووسا سەرسەرِ لە پەستا دادەهاتەوەو تەماشای زەویی دەکردو راست دەبووەوە. لە پەنای بەردێکی سپی راوەستا. لە قەڵشتی سەرەوەی بەردە سپیەکەدا سنۆبەرێکی چووکەڵە شین ببوو. خەبەرێك لە گڵ و ئەم جۆرە شتانە نەبوو. رەگەکان بە تەواوی وەدەر کەوتبوون و دەوری بەردە سپیەکەیان دابوو. مووسا بە توندی بە

گەلی‌یەکەدا تێدەپەڕی و بەرەو خوار دەچوو. قەرار وابوو ئەمشەو جەندرمەکان لە گوندی کەسمە وەمێنن. یاوەر گوتبووی:"کوڕینە لەوێ چاوەڕوانتان دەبین. ئەگەر شتێکتان دیتەوە، لەوێ خەبەرمان پێ بدەن."

یاوەر گوێی نەدەدایە ماندوو بوونی خۆی:"غیرەتی دۆزینەوەی حەمەدۆك لە مووساڕا گەیشتوەتە تۆش، کوڕی سەی؟!"

عەلی رۆیشت و لە پێش مووسا کە وەدوای ئەو شوێنە کەوتبوو کە دەچووە نێو ئاوایی، راوەستا. چاوەکانی ببوونە دوو پیالە خوێن:

"مووسا! گوێت لە من بێ مووسا. شوێنەکە بەرەو لێڕەوار دەچێ. ئەم شوێنە یەکسەر دەچێتە نێو لێڕەوار. ناکا لە ترسی ئەوەی حەمەدۆك نەقوستانت بکا، بە ئەنقەست شوێنەکە هەتلە بکەی؟"

مووسا سەرسەرێ جوابی نەدایەوە. نووکی داردەستەکەی لەسەر قەلشتێکی قووڵ کە لەسەر عەرز هەبوو، دانابوو. دووبارە وەڕێ کەوتەوە.

عەلی‌یەشەل دەستی کرد بە لەرزین:

"بە قوربانت بم مووسا بەرەو لێڕەوار، ئەتۆ چتە... شوێنەکە بەرەو لێڕەوار دەڕوا..."

مووسا سەرسەرێ دیسان گوێی نەدایە قسەکەی و بە رێی خۆی دا رۆیشت.

وەختێك گەیشتنە پشت مالان خەریك بوو رۆژ ئاوا بێ. بیری کردەوە کە:"جەندرمەکان هیشتا نەگەیشتوونە ئاوایی. لەنێو لێڕەواری خەریکی ئارەق خواردنەوەن. گوندی کەسمە بێدەنگە. ئەگەر جەندرمەکان گەیشتبانە نێو دێی، دێیەکە جموجۆڵێکی تێدەکەوت و وا بێدەنگ نەدەبوو." کولاوکەی مالەکان دووکەلی لێ‌هەلدەستا. عەلی لەبن لێوانەوە گوتی:"هۆوە مالی سلەمانە. دووکەلێکی ئەستووریش لە کولاوکەکەیان هەلدەستێ. هەتیوە شێتەکەی ئێمەش لە ژوورێ شەش دانگ کەیفی کردوەو خەریکی ئیسراحەتە... ئەگەر دەیزانی تا ئێستا چ رەنجێکم کێشاوە..." خەریك بوو دەست بکا بە گریان.

ئەگەر مووسا سەرسەرێ دووسەد هەنگاوی دیکە بەرەژێرتر چووبایە، کار لە کار دەترازا... دەمانچەکەی لەبەر پشتێنێ دەرهێنا، فیشەکێکی وەبەرداو لەو وەختەدا کە سێرەی لێ‌گرتبوو و خەریك بوو دەستی لێ‌بکێشێ، مووسا سەرسەرێ بە گورج و گۆلی‌یەکی وا کە بە بیریش دا نەیە، ئاوڕی دایەوە. روخساری تێك چووبوو. لەحالێك دا دەستی هەلدێنا، گوتی:"رەحم پێ بکە عەلی، ژن ومندالم هەیە. ئەم کارەم لەگەل مەکە... شوێنەکە دەچێتە لێڕەوار. ئەمن وا

لە مەسەلەکە حاڵی نەبووم. پێم وابوو دەتەوێ ئەمن بە هەڵە بەری و بۆخۆت حەمەدۆك بدۆزیەوە. بڕوانە. شوێنەکە دەچێتە لێڕەوار. زۆر باشە؟"

عەلی دەمانچەکەی لەبەر پشتێنێ نایەوە. هەردووکیان رووبەڕووی یەکتر راوەستابوون و هەتا ماوەیەك دەلەرزین. سەرەنجام مووسا سەرسەرێ لە حاڵێك دا ماڵێ سلەمانەزلەی نیشان دەدا، گوتی:

"حەمەدۆك لە هۆو ماڵەیە."

عەلیەیەشەل گوتی:

"دەزانم لەوێیە."

شان بە شانی یەك بەرەو ماڵی سلەمانەزلە وەڕێ کەوتن. لە رێیەدا رادەوەستان، تەماشای یەکتریان دەکردو پێدەکەنین.

## (٢٩)

قایمەقام پیاوێك بوو قەڵەو، بەژێر چۆڵەمەیەکی چین لەسەر چین، جووتە چاوێکی هەڵمساو و ریپۆقاوی، جووتە لێوێکی ئەستوورو شین، جووتە گوێیەکی گەورەو جووتە برۆیەکی پڕپشتەوە کە وەك خەتێکی پان بە نێوچاوانیەوە دیار بوون. قوڵەبنە بوو. پیاوێك بوو ساردوسڕو نەگونجاو. کت و مت قەڵافەت و شەخسیەتی عوسمانییەکی هەبوو، عوسمانییەکی تازە بەسەرداکەوتوو کە وابزانە هەر دوێنێ تەقیلەکەی فڕێ داوەو لە جیاتییان کڵاو گەرگەرییەکی خواستوەتەوەو بە شێوەیەکی ناشییانە لەسەری ناوە.

لە قووڵایی دڵەوە وەك شێتان لە مستەفا کەمال تووڕە بوو. چونکە نەشی دەتوانی تووڕەییەکەی دەربڕێ، قەڵسیەکەی هەتا سنووری هاری زیادی دەکردو ڕۆژ بە ڕۆژیش رق و قینەکەی لە زیاد بوون دا بوو. لە دێهاتییەکانیش یەکجار تووڕە بوو، و هەموو رق و قینەکەی رووی لەوان بوو. چونکە پێی وابوو ئەوان بوون سەربازییان بۆ مستەفا کەمال کرد، یۆنانییەکانیان رشتە دەریاوەو شایان لە وڵاتەکەی وەدەرنا. وەختێکیش دڵنیا دەبوو هاودەمێکی دەمارگرژ (متعصب)ی چنگ کەوتوە کە دوژمنی مستەفاکەمالە، بوخچەی دڵی لەلا دەکردەوەو چەندین سەعات لەبارەی بنەماڵەی عوسمانی، لەبارەی "عبدالحمیدخان"و "وحیدالدین خان"ەوە قسەی دەکردو بەم جۆرە نیمانی خۆی بەوە کە ڕۆژێك لە چنگ ئەو شەیتانە چاوشینە رزگار دەبن، تازە دەکردەوەو هاواری دەکرد:

"نیشتمانی جوانی "یاووز"، "قانوونی"، و "فاتح" لە دەست ئەم هەرچی و پەرچییانە... ئەم چەتانە... ئەم بۆلشەویکانەدا نامێنێ. ئەم ڕۆژانە تێدەپەڕن، تەنیا خوایە کە دەسەڵاتەکەی بێ هەورازو نشێوە... ئەم نیشتمانە بۆ ئەمانە نابێ! ڕۆژێك ئەم مارە

چاوشینه، مووزەردە لەنێو دەچێ! فەرانسەیی‌یەکان، ئینگلیزی‌یەکان و ئەمریکایی‌یەکان دێن و ئێرە داگیر دەکەن. ئەوانە، ئەو بۆلشەویکانە، ئەو هەرچی و پەرچی‌یانە، ئەو کرمە پیسانە، ئەو کافرانە ناتوانن حکوومەت بەسەر ئەم وڵاتەوە بکەن."

هیوایەکی لەرادەبەدەری بە دوژمنانی مستەفا کەمال هەبوو. بەرواڵەت سەریشی چووبا، نوێژی نەدەچوو. زۆر رقی لە جووتیاران بوو، و هەتا بۆی کرابایە هەولی دەدا چاوی بە "چارەی دزێو"یان نەکەوێ و لە هەر جێیەك جووتیارێکی دەدی بە نیشانەی بێزاری نێوچاوانی تێك دەنا، دوعای "دفع شیگان"ی دەخوێندو تفێکی گەورەی لە زەوی دەکردو دەیگوت:

"هەروەخت یەکێك لەم دێهاتی‌یانە دەبینم، حاڵەتێکم بەسەر دێ، دەڵێی ئەو مووزەردە دەبینم. مووی لەشم دەبنە نەشتەر. بە دەست خۆم نیە کاکە گیان! لە رقان هەموو مووی لەشم دەبن بە نەشتەر.

زۆری مەرایی لەبەر عارف صائم بەگ دەکردو لانی کەم پێنج هەنگاو لە دوایەوە دەرۆیشت و هەر کە ئەو زاری دەکردەوە، ئەم وەك فەنەر لە جێی خۆی دەردەپەڕی. هەموو کارە چەپەڵەکانی عارف صائم بەگ ئەو رێگای بۆ خۆش دەکردن و ئەنجامی دەدان.

بەڵام لە پاشەملەی دەیگوت:"ئەم حەیوانانە، ئەو هەرچی و پەرچی‌یانە مووزەردی دەرووخێنن. دەوروبەری پڕە لە ئی وەك عارف صائم بەگ. هەموویان لە عارف صائم بەگ نزم ترو پیس ترن. ئەوانە مووزەردی سەرەوخوون دەکەن. جارێ راوەستە. خوا تەختەتاش نیە، تەختە رێکخەرە. هەر ئەم عارف صائم بەگە بۆ رووخاندنی مووزەرد بەسە. لەکاتێك دا هەزاری وەك عارف صائم بەگ خەریکن ریسەکەی لێ‌دەکەنەوە بە خوری. جارێ راوەستە، دەیبینی."

شەوانە وەختێك دەچووە سەر جێی، لەو خەیاڵ و ئارەزووەدا بوو کە بەیانی وەختێك لەخەو هەڵدەستێ، خەبەری رووخانی مووزەردی ببیسێ و ببینێ کە "وحیدالدین افندی" جێی وی گرتوەتەوە. دیسان لە عالەمی خەیاڵ دا خۆی بەختەوەرو سەرکەوتوو لەنێو جل و بەرگی زێرکفت و زنجیرسەعاتی زێڕو میداڵیو نیشان دا دەدی و خەوێکی خۆشی لێ‌دەکەوت:"ئەمانە ناتوانن لە مەملەکەتی "ئاڵ عیسمان" دا بمێننەوە. هەموو شەوێ بە باوەڕی پتەو بەوەوە کە بەیانی دەگاتە پلەی "پاشایی" خەوی لێ‌دەکەوت. ئەو زیاتر لە هەمووان متمانەی بە ئینگلیزی‌یەکان هەبوو. ئاخر چما دەکرێ ئیمپراتۆری‌یەکی وا پان و بەرین کە هەتاوی لێ ئاوا نابێ بدرێتە دەست ئەم بۆلشەویکە بێسەرەوبەرانە؟ ئەوانەی عەرەبستانیان داگیر کرد، چما هێشتیان ئەولادی پێغەمبەر لەسەر تاج و تەختی خۆیان بمێنن؟

به زوویەکی زوو لەم زبڵدانە کە نە جادەی هەبوو، نە ئاوو کارەبا، لەم شارە بچووکە کە هەتا بینەقاقەی بە قوڕو زەلەق و پەین و پاڵ دا چووبووەخوار نەجاتی دەبوو. چونکە دەسەڵات و فەرمانڕەوایی مووزەرد بە تاڵە موویەکەوە بەند بوو.

"رامیزبەگ"ی قایمەقام لە نارەحەتی‌یان خەریك بوو دەتەقی. شەوو رۆژ مەشرووبی دەخواردەوەو لەگەڵ پاشماوەی دەرەبەگەکانی سەردەمی عوسمانی قوماری دەکرد. فەرمانی دەدا لە ئەسکەندەروونەوە خەراپەیان دێنان و تا بەیانی لی‌یان دەداو دەیان کوتاو سەمایان دەکرد...

لەو رۆژەوە کە هاتە شارۆچکە پێی لە یەك دێ نەنا. واتە لە راستی دا نەیدەوێرا بچێتە دێهات. چونکە جارێکیان چاکی چاو لە دێهاتی‌یەکان ترسابوو. جگە لەوەش، حەزی لە چارەی سەربازەکانی "مووزەرد" نەدەکرد. بەڵام هەمووی ئەمانە بیانوو بوون. لە قووڵایی دڵی دا ترسێکی لە جووتیاران هەبوو کە بۆ داپۆشینی ئەو ترسە بیانووی جۆراوجۆری دەدۆزیەوە.

عەلی‌سەفابەگیش زۆر جاری تکا لی‌کردبوو کە سەرێکی لادێ بدا: "ئەم عەلی‌سەفابەگە سەگەش یەکێك لە نۆکەرانی مووزەرد بوو. لە کاتی "کێشەی نیشتمانی"دا رووی کردە چیاکانی تووڕووس و بە ناوی وەرگیراوی "تایفۆن"ەوە لەگەڵ فەڕانسەیی‌یەکان بەشەڕ هات و مووزەردیش هەر لەبەر ئەوەی ئەو لە چیاکان بە گژ فەڕانسەیی‌یەکان دا چووەتەوە، شانازیی وەرگرتنی نیشانی پێ‌بەخشی. دیارە مووزەرد لەم نیشانە تەنەکانەی زۆر هەبوو. تووشی هەرکەس دەبوو یەکێك لەوانەی دەدایە. هەرچەند عەلی سەفابەگ سەگی پەت کراوی مووزەردو بوونەوەرێکی نزم و ساختەچی بوو، بەو حاڵە بە کاکی خۆم بڵێم دەماری سەربازە خۆشەویستەکانی مووزەرد، واتە ئەو دێهاتی‌یە بێ‌ئەقڵ و بێ‌نامووس و نزمانەی دەردێنا.

هەر دوێنێ بە فەرمانی وی، یەغموورئاغا هەرچی ئەسپ لە دێی دا هەبوو دزینی. فەرمانی داوە هەموو شەوێ هێرش بکەنە سەر گوندەکەیان و دێ‌یەکە وەبەر دەسرێژی گوللە بدەن. کارێکی کردوە لە ژیانی خۆیان بێزار بوون. هەموو شتێك خەریکە وێران دەبێ، وێران وێران وێران.

کاکی خۆم، نووری چاوم، وەختێك خاوەن ملکێکی حەوسەد ساڵە لە وڵاتە خۆشەویستەکەی دەربکەی ئاخرو ئاقیبەتمان لەمە باشتر نابێ. کاکی من بۆخۆتان ئینسافتان هەبێ داخوا مەملەکەتی ئالی عوسمان لەو حەوسەد ساڵەدا کەسی وەك یەغموورئاغای تێدا هەڵکەوتوە؟

کاکی خۆم، نووری چاوم، داهاتوومەوە تەماشای حاڵ و هەواڵی ئەو مارە شینە دەکەم کە کەوتوەتە گۆمیلکە ئاو. نووری چاوم! خەریکە دەخنکێ، خەریکە بۆگەن دەبێ. ئەم مووزەردە بابایەکی سەیر بە چاوورووییە، نایەوێ ئەو بۆگەنە کە لە دەوروبەری گەڕاوە ببیسێ.

زۆر یەغموراغاو عارف صائم بەگ و تایفۆن پەیدا دەبن... هەموو شتێك تووشی بۆگەن بوون دەکەن..."

عەلیسەفابەگ خەریك بوو دەیگوت:

"جەنابی قایەقام ئەگەر ئێوە نەیەن نابێ. لە هیچ و خۆڕایی زەوییەکانی منیان داگیر کردوەو خانوویان تێدا دروست کردوون. بە قامیش و جەگەن دروستیان کردوون. ئێمە بۆ ئەوە شەڕمان کرد؟ باوەڕ بفەرموون جەنابی قایەقام. لە بن هەر بەردێکی چیای توورووس کوتە گۆشتێکی لەشم بەجێ ماوە. لە "هاچین" شەڕم کردوە. لە "ئەنتەپ" لەگەڵ "شاهین بەگ" و لە "قەرە عیسالی" لەگەڵ "سەنعان پاشا" شەڕم کردوە. وەختێك ئێمە شەڕمان دەکرد، خوێنمان دەدا، ئەوانەی ئەمڕۆ زەوییەکانی منیان داگیر کردوە، سەربازی راکردوو بوون. لە پشتەوە خەنجەریان لێدەداین. ئێستاش بوونە ئاغاو سەروەرمان. هەر ئەوانەش لە راستی دا بوونە ئاغاو گوڵەجەرگەی ئەم مەملەکەتە. بێزەحمەت ئێوە تەشریفتان بێ و بە دوو چاوی خۆتان ببینن، وەرن و شاهید بن کە چۆن خەریکین لە بن زوڵم و زۆر دا ورد دەبین. وەرن بزانن ئێمە لەگەڵ چ جۆرە کەسانێك بەربەرەکانی دەکەین و لەو رێگایەوە چ خزمەتێك بە مەملەکەتی خۆمان دەکەین. وەرن بزانن. بەربەرەکانێیەك کە ئێمە دژی ئەوانە دەیکەین لە شەڕی فەرانسەییەکانیش دژوارترە. ئەوان دوژمن بوون. بەڵام ئێستا دوژمن خەنجەری لە دڵی نیشتمان رۆکردوە. بۆ ئەوەی جەنابت لەگەڵ خۆم بەرم بۆ دێ، تکام لە عارف صائم بەگ کرد کە ترۆمبێلەکەی بداتە خزمەت ئێوە. ئێستا ترۆمبێل بە شۆفێرەوە لەبەر دەرگا چاوەڕێی ئێوەیە."

قایەقام کە لە پشت مێزەکە دانیشتبوو، دەسبەجێ دەرپەڕی، دوگمەی چاکەتەکەی داخستن:

"ترۆمبێلی عارف صائم بەگ چاوەڕێی منە؟ ئێستا، هەر ئێستا دێم. ترۆمبێلەکەتان لەبەر خاتری من لە بەگ وەرگرتوە؟"

"بەڵێ لەبەر خاتری تۆ."

"ترۆمبێلەکەم زۆر مەحتەل کردوە؟..."

"نەخەیر جەناب."

"کاتب، جەندرمەکان، وەکیل باشی و ئەوان چی؟"

"ئەوان لە دوێ شەوێوە لە دێن جەناب. هەموو شتێك ئامادەیە."

قایەقام سواری ترۆمبێل بوو، زۆر خۆشحاڵ بوو. کێ دەیزانی، لەوانەبوو خەبەرێك ببێ. کێ دەزانێ... بە فیزو دەمارێکەوە بۆ لای ترۆمبێلەکە رۆیشت. جگەرەکەی داگیرساندو بای

دەخۆی کرد. سواری ترۆمبێل بوو. لە حالێك دا رێگاکەی بە پێچەوانە بە شۆفێرەکە نیشان دەدا، گوتی:

"لێرەوە برۆ کورم."

شۆفێرەکە بەرەو ئەولا رۆیشت. ترۆمبێل بە نێوەراستی بازار دا تێپەری. شۆفێرەکە سێ جار هۆرنی لێ دا کە ئەم کارەی زۆری قایەقام خۆشحاڵ کرد. هەموو دوکاندارو کاسبکارەکان لە دوکانەکانیان هاتبوونەدەرێ، لە حالێك دا هەتا پشتێنێ دوولا هاتبوونەوە، سلاویان لە قایەقام دەکرد. عەلیسەفابەگیش ئەم بەرنامەیەی زۆر پێ خۆش بوو. چونکە وەختێك خەڵك ئەویان لە نێو ترۆمبێلی عارف صائم بەگ و لە تەنیشت قایەقام دەدی، نفووزی لە نێویان دا سەد چەندان دەبوو. ئەو زۆر لەمێژ بوو حیسابی ئەوەی کردبوو کە بتوانێ بە بەردێك دوو نیشانە بپێکێ. بۆ وەرگرتنی ترۆمبێل لە عارف صائم بەگ ئەوەندەی لامە لامە لەبەر کرد هەتا سەرکەوت.

شۆفێرەکە کە لە نیازی قایەقام حالی ببوو، لەوسەری بازارەوە دووبارە گەرایەوەو لە پێش چاوی سەرسورماوی دوکاندارەکان هەتا ئەوسەری بازار لێی خوری.

"جەنابی قایەقام دووبارە بگەرێمەوە؟"

"بگەرێوە کورم."

دەرفەت و شانسی سوار بوونی ترۆمبێلی عارف صائم بەگ شتێك نەبوو کە جارێکی دیکەش بۆی رێ کەوێ و ئەگەر شەرمی نەکردبایە، تکای لە عەلی سەفابەگ دەکرد لە بەیانیەوە تا ئێوارێ بە پێش چاوی مۆلەق ماوی دوکاندارەکان دا بە سواری ترۆمبێل خۆی فش کاتەوەو بێت و بچێ.

جاری دووهەم کە دەگەرانەوە قایەقام بە دەست سلاوی لە یەك یەکی ئەو کاسبکارو بازاریانە کرد کە هەموویان دوگمەی چاکەتەکانیان دادەخست. پاشان بە دەم هەناسەیەکەوە گوتی:

"لێرە برۆین کورم، برۆین بۆ دێ."

هەتاو بەرز ببوو کە گەیشتنە گوندی وایوای. دێهاتیەکان و ژن و منداڵ و پیرو لاو لە دەرەوەی ئاوایی پێشوازییان لە قایەقام کرد. لە سووچێکیش دەهۆڵ و زورنایان لێدەدا. سەیفەلی، دەهۆڵ کوت و زورناژەنی لەگەڵ خۆی هێنابوون.

قایەقام تەماشایەکی حەشیمەتەکەی کردو گوتی:

"چەند هەژارو بەدبەختن، بەڵام هەقی خۆیانە..."

عەلی سەفابەگ دووپاتی کردەوە:

"هەقی خۆیانە. منیان بریەوە. ئەوان بوونە هۆی نابووت بوونم. نە بۆخۆیان زەوییەکانم دادەچێنن، نە دێڵن بۆخۆم دایان چێنم. ئەگەر زەوییەکان بدەن بە من و بۆخۆشیان بێن لە کێڵگەدا کارم بۆ بکەن، وەك گلێنەی چاوی خۆم پێیان رادەگەم. نە هەژاریو بەدبەختی دەمێنێو نە هیچ..."

"خۆ ئەمانە تێ ناگەن نووری چاوم. ئەمانە بنیادەم نین... کەچی حەزرەتی مستەفا کەمال پاشاش دەفەرموون دێهاتییەکان سەروەری ئێمەن!"

"هە. هە... سەروەری ئێمە!"

"ئەگەر بێن و حاڵی شپرزەی سەروەرەکانمان ببینن..."

"ئەمانە بنیادەم نین، جندۆکەن، ئافەریدەیەکی دیکەن..."

ئەوان کۆمەڵێك ئینسانی شڕوشۆڵ، لەڕو وەك داری رەق بوون. رەنگی روخساریان وەك روخساری مردووان زەردێکی ئاماڵ ئەسمەر بوو."

ترۆمبێلەکە لەبن دارێکی ئەستوور کە لە نێوەڕاستی ئاوایی بوو، راوەستا. جووتیارەکان دەست لەسەر سینگ و مل کەچ راوەستابوون. قایمەقام بە راوێژێکی وشك و بە دەنگێکی وەك کەڕەنا پرسی:

"شاهیدەکان لێرەن؟"

عەلیسەفابەگ گوتی:

"لێرەن."

قایمەقام لەخۆوە بێ دەلیل نەڕاندی:

"بێدەنگ بن!"

بێدەنگییەك بەرپا بوو دەنگی باڵی مێشوولە نەدەبیسترا. هەمووان بە ترس و پارێزەوە هەناسەیان هەڵدەکێشا.

"کاتب، قەباڵەکە بخوێنەوە."

"بە چاوان قوربان."

"عەلیسەفابەگ شاهیدەکانت کامانەن؟"

"مەحموود سورمەلی ئۆغلی لە گوندی چیك چیك لار."

پیرەپیاوێکی پشت کۆمە کە ریشێکی سپی، جووتە چاوێکی شین و دەم و چاوێکی گەورەی هەبوون بە کەللەیەکی زەلامەوە هاتە پێش. چونکە نەیدەتوانی سەری راست راگرێ، بەلایەك دا خواری کردبوو. پشتێنێکی سپیی لە پشتێ بەستبوو کە دەمانچەیەکی لەسەر بەستبوو. دەمانچەیەکی ساچمەزەنیشی لەبەر پشتێنێ رۆکردبوو.

"لە گوندی چیك چیك لار حاجی دۆراك..."

حاجی دۆراکیش پیر بوو و بەژنێکی زۆر بەرزو ریشێکی کۆسەی هەبوو.

"مەلا عبدالرحمن لە گوندی تۆپراخ تەپە..."

ئەویش پیر بوو، دەم و چاوێکی زۆر ئەسمەرو ریشێکی سپی و توپنەی هەبوو.

"کولەمەمەن ئۆغلی لەگوندی چان قازان..."

کولەمەمەن ئۆغلییش هاتە پێشەوە. پشتی دوولا هاتبووەوە. بۆخۆشی چنگێك ئێسك و پێست بوو.

"موختار، شاهیدەکانی تۆ کێن؟"

"سەفچەکاهیا، وەسمانەزلە، مەلامحمدو عەلی ئۆن باشی..."

"کاتب بخوێنەوە!"

کاتب دەستی بە خوێندنەوە کرد:

"قەبالەی زەوییە دوو هەکتارییەکەی عەلیسەفابەگ لە جنووبەوە دەگاتە رێگای گشتی..."

"کوێ؟"

دەستیان بۆ خوارەوەی ئاوەدانی راداشت. لە زۆر دووری جادەیەك سپی دەچوو. سورمەلی ئۆغلی ئەو جادەیەی نیشان داو گوتی:

"لە سی ساڵ لەمەوبەرەوە، ئێمە هەر بەو رێگایەدا هاتوچۆمان دەکرد..."

بەڵام سەفچەکاهیا، وەسمانەزلە، عەلی ئۆن باشی و مەلا محمد جادەیەکیان نیشان دا کە لە لای چەپی ئاوەدانییەوە بوو. لەسەر ئەم مەسەلەیە باس و کێشەیەکی توند لە نێوان شاهیدەکان دا دروست بوو.

قایمەقام دەسبەجێ باس و وتووێژەکانی کۆتایی پێ هێنا.

"لە رۆژهەڵاتەوە دەگاتە رووباری یالنزووت..."

شاهیدەکانی عەلیسەفابەگ لافاوگەیەکیان لە پشتەوەی ئاوایی نیشان داو شاهیدەکانی جووتیارانی وایوای دەستیان بۆ لای گوندی یالنزدووت راداشت..."

"لە شیمالەوە دەگاتە ئاکچاساز."

دیسان شاهیدەکانی هەر لایەك جێگایەکی جیا لەوی دیکەیان نیشان دا.

"لە رۆژئاواوە دەگاتە "یازیلی‌تاش"."

دەستیان بۆ جێگایەك لە خوارەوە راداشت کە هەتا خوار ئاناوارزا درێژەی هەبوو. دیسان لەنێو شاهیدەکان دا باسێکی دوورودرێژ دەستی پێ‌کرد. قایمەقام بە راوێژێکی توندەوە گوتی:

"قسەکانتان تەواو بوو؟"

ئەمەی گوت و ئەوانی بێ‌دەنگ کرد.

هەموویان بێ‌دەنگ بوون.

"لە قسەی شاهیدەکان وا دەردەکەوێ کە قەبالەی عەلی‌سەفابەگ هەموو گوندی وایوای دەگرێتەوە. بە پێی شاهیدیی شاهیدەکان ماوەیەکی کورتە کە دێهاتی‌یەکان هاتوونە ئێرەو لەنێو زەوی‌یەکانی عەلی‌سەفابەگ لە پووش و پەلاش هێندێ خانووی شەق و شڕیان پێکەوە ناون. هەروەها دەردەکەوێ کە خەلکی گوندی وایوای زەوی‌یەکانی عەلی‌سەفابەگیان بەبێ رەزامەندیی خۆی بە دەستەوە گرتوە. بڕیار درا بۆ لەنێو بردنی ئەو دەست بەسەرداگرتنە ئەو کەپرانە کە خەلکی وایوای لە داروپووش و پەلاش سازیان کردوون بڕووخێندرێن.

ئەمجار رووی کردە جووتیارەکان و گوتی:

"بەربەرەکانی لەگەل حکوومەت دەکەن؟ زەوی و زاری خەلك بە بێ‌ئیزنی خۆیان داگیر دەکەن؟ ئەمن ناتوانم هەر چونکە ئێوە لەنێو زەوی و زاری خەلك دا لەدارو پەرتکە مالتان ساز کردوە، زەوی‌یەکانیان لێ‌بستێنم و بیان دەم بە ئێوە. مانگێك مۆلەت تان پێ دەدەم. ئەگەر هەتا مانگێکی دیکە دێ‌یەکە چۆل نەکەن و نەڕۆن، جەندرمە دەنێرم ئەم کەوێلانەتان بەسەردا بڕووخێنن. ئێوە زۆر روودار بوون. نە گەورەو چووکە دەناسن، نە حکوومەت و نەخوا... نە حەق و حقووق دەزانن و نە دادپەروەری..."

خەلکی دێ گوتیان:

"کەس بە بیری نایە دێ‌یەکە کەنگێ دروست کراوە. ئەم گوندە باپیری باپیرمان لە زەمانی "فیرقەی ئیسلاحیە"دا دروستیان کردوە."

قایمەقام نەڕاندی:

"لەرووی من هەلدەگەڕێنەوە؟ قسە لە قسەی من دەکەن، پێتان وایە دەتوانن فریوم بدەن. چما رێی تێ دەچێ ئەم گوندە هی سەد سال لەمەوبەر بێ؟ ئاخر هەر ماوەیەك پێش ئێستا

نەبوو کە بۆ زەوت کردنی زەوییەکانی عەلیسەفابەگ ئەم خانووانەتان پێکەوەنا؟ ئەم دێیە بە هیچ جۆر وەك دێی سەد ساڵە، دە ساڵەو تەنانەت دە رۆژەش ناچێ. بەمەش دەڵێن دێ؟"

دەنگی بەرە بەرە بەرز بوو. کەفی پرژاند. کونە لووتی فش کردن، بوورایەوە، پێی بە زەویدا داو دەستی راوەشاندن:

"درۆزنینە، دەغەڵینە، بێسەروبەرینە، بێ دین و ئیمانینە! مانگێك مۆڵەت تان دەدەمێ. ئەگەر دەتوانن مەڕۆن، مەڕۆن با ئاکامەکەی ببینن. دەتان پلیشێنمەوە. وەك مێروو لە بن پێم دا دەتان پلیشێنمەوە..."

"سەرتان ئەئاوا... وەك سەری مار چاك چاك پان دەکەمەوە." بە هەموو تاقەتی خۆی لاقی بە زەوی دا دەداو پێی ڕەعەرزی دەخست.

دێهاتییەکان ترسیان ڕێ نیشت، سام گرتنی و دۆش دامان.

قایمقام هێندەی نەمابوو لە رقان بتەقێ:

"ئەمن دەبێ ئێوە لە چاکەی حکوومەتی کۆماری حاڵی بکەم!"

لە حاڵێك دا لە ڕقان هەموو گیانی وەك...ی هەلاج دەلەرزی، لەبن دارە ئەستوورەکە ڕاوێچکەی دەکردن، دەینەڕاند، تەشەری دەوەشاند، جنێوی دەدان و لافاوی دەستوورو فەرمانی وەڕێ دەخست.

سەرەنجام عەلی سەفابەگ و سەیفەلی توانیان لێی نزیك ببنەوە. عەلی سەفابەگ گوتی:

"ئەم دێهاتییانە بە شانازیی جەنابت بەرانێکیان کردۆتە گاوگەردوون. موختار سەیفەلی دەڵێ کە نزیك نیوەڕۆیە. ئاغا بۆ نان خواردن تەشریفی بێ و لە گوناهمان ببوورێ.

قایمقام بێدەنگ بوو، نەختێك بیری کردەوەو دوایە هەتا تینی تێدا بوو نەڕاندی:

"گاوگەردوونەکەیان بدەن بە سەگ. گاوگەردوونی ئەم درۆزنە بێشەرمانە بۆ سەگ باشە... تەریق نابنەوە، دەڵێن ئەم گوندە سەدساڵ لەمەوبەر دروست کراوە. بێشەرمانە، تەریق نابنەوە. دەیانەوێ من فریو بدەن. ئەم کۆختە سەگانە... گوێتان لێبێ تووتکە سەگینە، ڕاستییەکەی بڵێن ئەم کۆختە سەگانەتان چەند رۆژ لەمەوبەر دروست کردوەو ناوتان ناون خانوو؟ ئەگەر ئەم خشت و خاڵە سەدساڵ لەمەوپێش لێرە دروست کرابێ، کەوایە ئێوە سەدساڵە لە زبڵدان دا دەژین، کەوابێ شیاوی سووکایەتین. دەبێ تف لە ڕووتان بکرێ. گاوگەردوونەکەتان سەگ بێخوا."

عەلی سەفابەگ قۆڵی بەگی گرت و ئەوی بۆلای ترۆمبێلەکە ڕاکێشا. بردیە نێو ترۆمبێلەکەو بۆخۆشی لە پەنای دانیشت.

قایەقام لەسەرەخۆ بە شۆفێرەکەی گوت:

"ترۆمبێلەکە هەڵکە کورم. تکاشت لێدەکەم با عارف صائم بەگ پێنەزانێتەوە کە ئەمن خۆم لە دێهاتی‌یەکان تووڕە کردوە. چونکە دەزانم ئەو، دێهاتی‌یەکانی زۆر خۆش دەوێ. دیارە ئێمەش خۆشمان دەوێن بەڵام درۆزنی‌یەکەیان و زەوی داگیرکردنەکەیان بنیادەمی لە دین دەردەکا..."

هەرچەند ڕقەکەی نیشتبووەوە، بەڵام هێشتا هەموو لەشی دەلەرزی، شوفێر بە سێجار سووڕاندنی هەندیل ترۆمبێلەکەی هەڵکرد. هات سوار بوو و ترۆمبێل وەڕێکەوت. جەنابی قایەقام دەستی درێژ کرد، دەستی عەلی سەفابەگی گرت و گوتی:

"لەگەڵ ئەمانە، لەگەڵ ئەم هەرچی و پەرچی‌یانە دەبێ ئاوا ڕەفتار بکەی وانیە نووری چاوم؟"

پاشان لە حاڵێك دا بە هەموو هێزی خۆی دەستی وی دەگووشی، گوتی:

"تکایەکم لە جەنابت هەیە."

عەلی سەفابەگ دەسبەجێ خۆی خڕ کردەوەو گوتی:

"بفەرموو جەناب."

قایەقام سەری بردە بن گوێی و بە سرتە پێی گوت:

"زۆر تکات لێدەکەم کارێك بکە کاکی شوفێر لە زمانی دەرنەچێ و کردەوەی ئەمڕۆی من، ئەم تووڕە بوونە بەجێیەم بۆ عارف صائم بەگ نەگێڕێتەوە... زۆرت تکا لێدەکەم... ناکرێ بەجۆرێك زمانی ببەستی؟"

"ڕامیزبەگ! لەو بارەیەوە هیچ نیگەران مەبە، قسە لە زاری دەرناچێ."

بەڵام قایەقام بەهیچ جۆرێك قەناعەتی نەدەهات و سات بەسات ترس و نیگەرانی‌یەکەی زیاتر دەبوو:" ئەگەر عارف صائم بەگ مەسەلەکەی بە گوێ بگاتەوە... یان شۆفێرەکە جاسووسی عارف صائم بەگ بێ، چی؟"

سەری بردە بن گوێی عەلی سەفابەگ و گوتی:

"عەلی سەفابەگی خۆشەویست، نەکا ئەم هاوڕێیەمانیان بە نهێنی ناردبێ کە ئاکارو کرداری ئێمە بخاتە ژێر چاوەدێری، تابزانێ چۆن لەگەڵ دێهاتی‌یەکان دەجووڵێینەوە؟... ڕێی تێدەچێ؟"

عەلی سەفابەگ زۆر بە دڵنیایی گوتی:" ڕێی تێناچێ" و بۆ ماوەیەك ڕامیزبەگی ئارام کردەوە. بەڵام دیسان سات بە سات ترسەکەی زیادی دەکرد، هەناسەی هەڵدەکێشاو

دەیگوت:"ئەگەر ببیسنەوە کە رەفتارێکی وام لەگەڵ دێهاتیەکان کردوە، لەسەر کارم لادەبەن، لام دەبەن... ئەو جنێوانەی دامن، ئەو کارانەی کردمن..."

دیسان سەری بردەوە بن گوێی عەلی سەفابەگ و پرسی:

"ناکرێ ئەو دێهاتیانە لە دێیەکەیان بێننەوە؟ ناتوانن رێگایەك بدۆزنەوە؟ یان ئەمن خۆی تێهەڵ نەقوتێنم و ئێوە خۆتان بە رەشەکوژی و ترس وەبەرنان ناچاریان بکەن برۆن؟"

عەلی سەفابەگ گوتی:

" ناکرێ. کار لە کار ترازاوە. ئەگینا سام و ئابرووی حکوومەت کەم دەبێتەوە، پێشێل دەبێ. ئێوە ناتوانن کاری ئەوتۆ دەرهەقی حکوومەتی کۆماری تورکیە بکەن. ئێوە نابێ کارێك بکەن کە قایمەقامێکی رەسەنی ئەم حکوومەتە قسەی خۆی بخواتەوە."

قایمەقام کە دیار بوو بڕیاری خۆی داوە، گوتی:

"دەیخواتەوە عەلیسەفابەگ، وەك گوڵیش دەیخواتەوە. قایمەقام هیچ، والی و وەکیلیش دەیخواتەوە. تەنانەت سەرۆك..."

چون تێگەیشت کە زۆری پێ لێهەڵێناوە، قسەکەی خۆی راست کردەوەو گوتی:"ئەمن بەش بەحاڵی خۆم دەیخۆمەوە."

"پیاوێکی وەك عارف صائم بەگ چۆن ئەقڵ دەیگرێ ترۆمبێلی خۆی، ئەویش بە شۆفێرەوە بدا بە ئاغایەکی بێ سەرەوبەرە کە ئەویش قایمەقامی شارێك لەگەڵ خۆی هەڵگرێ و بچن خەڵکی گوندێك دەربکەن؟ شتی وا قەت رێی تێ ناچێ. ئەم کارە کارێکی ئاسایی نیە خۆشەویستەکەم. ئەم شۆفێرە پیاوێکی زۆر زرینگە. لەوانەیە یەکێك لە سەرۆکەکانی "ئەمنی عام" بێ."

"ئاغای بەرێز! برای خۆشەویستم! ئێوە لە ئەورووپا خوێندنتان تەواو فەرمووە؟"

شۆفێرەکە گوێی لێبوو، بەڵام وەسەر خۆی نەهێنا.

"لەگەڵ ئێوەمە، لە ئەورووپا خوێندنتان تەواو فەرمووە؟"

شۆفێر ئاورێکی دایەوە دوای خۆی، زەردەیەکی هاتێ و بەزاراوەیەکی خەستی "تەرابووزانی" وەڵامی دایەوە:

"قەت نەچوومە ئەورووپا. خوێندنەوەو نووسینیش نازانم."

قایمەقام بەم وەڵامە زیاتر وەشك کەوت:"درۆ دەکا. بێ ئەم لاو ئەولا فەرمانبەری ئەمنی عامە. چما ئەقڵ دەیگرێ شۆفێری پیاوێکی وەك عارف صائم بەگ نەخوێندەوار بێ؟ چما دەکرێ تا ئێستا ئەورووپای نەدیبێ؟ چاکی خۆی ئاشکرا کرد. چەندیش جوان لاسای زاراوەی

تەڕابووزانی دەکاتەوە. براڤۆ. ئەم خائینانە جاسووسی باش پێ دەگەیەنن. ئەگەر جەنابی "وحیدالدین"یش لەو جۆرە پیاوە زیرەکانەی هەبایە، دەیتوانی  بە وەخت دەستی مستەفا کەمال پاشا بخوێنێتەوە. یاریدەدەرێکی بەهۆشی بۆ دادەناو بە دوو ڕۆژان لە هەموو کارو کردارەکانی حالی دەبوو."

"ئاغای بەڕێز! زۆر باش ترۆمبێل لێدەخوڕی" تەنیا ئەوانەی لە ئەورووپا خوێندوویانە، ئاوا جوان و لەبار ترۆمبێل لێدەخوڕن."

شۆفێر قاقایەکی سامناکی لێدا، دەمی هەتا پەنای بنانگوێی لێك کرایەوە. ترۆمبێلەکە لە ڕێی لاداو لە چاڵێك کەوت:

"وەستای من، وەستاخەلیلی ئەرزەڕۆمییە. هەموو ئەورووپا گەڕابوو. پێی دەگوتم جەمال لە ئەورووپاش لینگەت نیە، ئەتۆ خوای ترۆمبێلی."

"ئاغای بەڕێز! ئێوە زاراوەی ئەرزەڕۆمی باش دەزانن؟"

"دیارە، زمانی زگماکیمە."

"براڤۆ، بەخوا براڤۆ. فەرمانبەرەکانیان باش پێ دەگەیەنن."

"جەمال ئاغا، ئێوە دێهاتییەکانتان خۆش دەوێ؟"

"زۆرم خۆش دەوێن. دێ نیشتمانی منە. کەسێك نیشتمانی خۆی خۆش نەوێ بیژوویە."

"ئەمن ئەمرۆ لە دێهاتییەکان تووڕە بووم، وانیە؟"

"نا جەناب تووڕە بوونی چی؟ زۆریش بە مەحەببەتەوە ڕەفتارتان لەگەڵ کردن. عارف صائم بەگی ئێمە بە کوتەك و گۆپاڵ لێیان دەدا. عارف صائم بەگ دەڵێ خەڵکی لادێ تەنیا بە کوتەك وگۆپاڵ حالی دەبن. بەگ زۆر لە خەڵکی گوندی ئاك مەزار تووڕە بوو. زۆریانی ئەوەندە دارکاری کرد کە مردن."

"هەقی خۆیانە."

زاراوە تەڕابووزانییەکەی خەست تر بوو:

"بەڵێ، هەقی خۆیان بوو."

قایمقام لەدڵی خۆی دا گوتی:"گاڵتەم پێدەکا. ماڵ وێران بووم. بۆچی لە پێشەوە بە ئەقڵم دا نەهات کە شۆفێری ئاغا دەبێ فەرمانبەری ئەمن بێ!"

"جەماڵ ئاغا، ئەگەر تکام لە ئێوە کردبا کە ئەمشەو پێکەوە یەك دوو پێك هەڵدەین، ئەو شانازییەتان دەدامێ؟"

"ئەو شانازی‌یەم پێ دەدای. بەڵام ئەگەر ئاغا بزانێتەوە، دایکم (...)."

"سەگبابە گاڵتەم پێدەکا، گاڵتەم پێدەکا... ئەمنیش ئەگەر لە جێگای وی بام و گەوجێکی بێ ئەقڵم وەگیر کەوتبایە گاڵتەم پێدەکرد."

"تکات لێدەکەم ئاغای خۆم. عارف صائم بەگ نابیسێتەوە."

عەلی‌سەفابەگ گوتی:

"ئەتۆ هیچ نارەحەت مەبە جەماڵ. نایەڵم بە گوێی عارف صائم بەگ بگاتەوە."

قایمقام تووڕە بوو:"وەڵاغی نەفام بە سەرۆکێك دەڵێ "ئەتۆ"! نازانێ کێ‌یەو چ کارەیە! ئێستا دەی‌بینی. ئەمن بڕیارەکەی خۆم وەردەگرمەوە. بەڵێ گوندی وایوای سەد ساڵە لەنێو ئەم قوڕو قاڵە، لەنێو ئەم باتلاغەو ئەم مێش و مەگەزەو لەنێو ئەم جەهەننەمەدا بۆ ژیانی دێهاتی‌یەکان دروست کراوە، ئەوانەی مێژوویان خوێندوەتەوە دەزانن. سام و هەیبەتی حکومەت ناکەمە داردەستی سەگێکی وەك عەلی‌سەفابەگ. با بۆخۆی بە شێوەو تاکتیکی خۆی چۆنی دەیەوێ دێهاتی‌یەکان لەدێی وەدەر بنێ، ئەمەیان ئیدی پەیوەندیی بە ئێمەی فەرمانبەری دەوڵەتەوە نیە."

"جەماڵ ئاغا. منیش زۆرم خەڵکی لادێ خۆش دەوێ. باب و باپیرانم هەموویان دێهاتی بوون."

ترۆمبێلەکە لە قوولکەیەك کەوت. شار کە بە بناری چیاکەوە نووسابوو، لە دوورەوەو لەو بەرزایی‌یە بەو سواڵەتە سوورانەی سەربانەکانیەوەو بە بانە گڵێنەکانی و بە شووشە پەنجەرەکانیەوە کە لەبەر تیشکی هەتاوی نیوەڕۆ دەتروووسکانەوە، دەت گوت شاری شای پەری‌یانەو ئاگری تێبەربووە.

# (٣٠)

عەلی‌یەشەل لە دەرگای ماڵێ سڵەمانەزلەی داو گوتی:

"مام سڵەمان هۆزۆی مام سڵەمان. ئەمنم عەلەیەشەل."

سڵەمانەزلە برۆ سپی و پڕ پشتەکانی هەڵکێشاو هەستایە سەرپێ.

"ئەمنم، ئەمن، عەلی‌یەشەل."

سڵەمانەزلە لە حاڵێك دا لەنێو ژوورەکەدا راوێچکەی دەکردن، لەبن لێوانەوە گوتی:

"هەی بێچووە سەگ، هەی سەگی رست کراوی هەمزە کەچەڵ! پێی وایە ئەگەر زانیم ئەوە دەرگای لێ‌دەکەمەوە. هەی نزمی بێ‌ویژدان (...)م کردە لاقە شەلەکەت. هەی داردەستی دەستی زۆردار. ئەتۆی لە ئاسیاب چەشمە دڵی هەموو خەڵکەکەت پڕ کردوە لە خوێن."

"مام سڵەمان دەزانم لە ماڵەوەی. دەرگام لێ‌بکەوە کارێکی پێویستم هەیە. بە پەلەشم. دەمەوێ میوانەکەت ببینم."

سڵەمانەزلە چوو بۆ لای دەستە نوێنەکەی، تفەنگێکی جوانی کە لە کۆنەوە هەیبوو، دەرکێشاو بە ئەسپایی پڕی کرد لە فیشەك:"سەگەشەلە، چۆن هاتووی میوانەکەم ببینی؟ وادیارە شوێنەکەیت هەڵگرتوە... ئێستا پێت نیشان دەدەم میوان چۆن دەبینرێ."

لە دەرگاکە نیزیك کەوتەوە. لوولەی تفەنگی بەقەڵشتی دەرگاوە ناو بۆخۆشی لە کەلێنی دەرگاوە تەماشای کرد، سێرەی لێ‌گرت و کشایەوەو راست لەو کاتەدا کە دەیەویست دەستی لێ‌بکێشێ، حەمەد هات لە پشتەوەڕا دەستی گرت و کێشای:

"دەست راگرە مامە. دەرگاکە بکەوە. عەلی لە خۆمانە."

سڵەمانەزلە لە مەبەستی حەمەد حاڵی نەبوو.

"دەرگای لێبکەوە مام سلەمان. ئەمن لێرە چاوەڕێی بووم."

"چی... ئەمن خەریك بوو بیکوژم."

"هەڵەیەکی گەورە بوو."

"ئەتۆ نای ناسی، هیچ هەڵە نەبوو..."

سلەمانەزلە بە پرتەوبۆڵە چوو دەرگاکە بکاتەوەو حەمەدیش بە دوای دا ڕۆیشت...

هەر کە سلەمانەزلە دەرگای کردەوە، شەلە لە پێشەوەو مووسا سەرپسەرِ بە دوای دا وەژوور کەوتن. حەمەدو عەلیەشەل یەکتریان لە ئامێز گرت.

سلەمانەزلە لە کاتێك دا گێژو وڕ مابوو، دەیگوت:

"ئەم هەتیوە زۆر بەدفەرە. مەڵێ یاغی بلێ "سەرلەشکر"ە..."

عەلیەشەل خێرا خێرا حەمەدی لە بەسەرهاتەکە ئاگادار کردو داستانی مووسا سەرپسەرپیشی گێڕایەوە. سلەمانەزلەو حەمەدیش ناوی مووسا سەرپسەرپیان بیستبوو.

سلەمانەزلە بە پێکەنینەوە گوتی:

"لەحەمەدی بپرسە. خەریك بوو بت کوژم سە شەلە. پێم وابوو لە سەگەکانی دەوروبەری هەمزە کەچەڵی و خەریك بوو بت کوژم. دیارە خەراپیش نەبوو. دنیا لە شەڕی کافرێك رزگاری دەبوو. تەنیا مووسا سەرپسەرِ دەمایەوە. ئەمە هەقی مووسا سەرپسەرە کە لە دنیادا تەنیاو بێلینگە بێ."

عەلیەشەل گوتی:

"ڕاست دەکەی. وەستاییەکەیم دیوە، ئیمانم پێی هێناوە. بەڕاستی تاقە. هەقی خۆیەتی..."

حەمەد بە پەرۆشەوە گوتی:

"ئەگەر لەحزەیەك درەنگتر جوولابام گوللە ڕاست لە قەوەزی سنگت دەدرا. چما ئەتۆ شێتی؟ لەم دێیانەدا بە جۆرێك ناوبانگت دەرکردوە ئەگەر بکەویە دەستی دێهاتییەکان لەتکی گەورەت شلکەی گوێت دەبێ. بۆچی هەروا بێ بوار وەنێو ئاو دەکەوی؟"

"ئەگەر حەمەد نەگەیشتبایە ئێستا لەبەر دەرگا تخێڵ ببوو و لاقە شەلەکەی لە هەوا کردبوو."

شەلە گوتی:

"ئەو چاکانەی کردوومن، گیانیان نەجات دام."

ماوەیەکیان بە گاڵتەو پێکەنین رابوارد. پاشان سڵەمانەزلە پرسی:

"کاك مووسا ئەوەی لەبارەی تۆوە دەیڵێن راستە؟ دەڵێن ئەگەر بەیانی لەگەڵ تاوهەڵات لە ماراش وەڕێ کەوی بۆ ئێواریێ لە ئەدەنەی، ئەمە راستە؟ باڵداریش ناتوانێ ئەو هەموو رێگایە بە رۆژێك ببڕێ، بەڕاستی وایە؟"

مووسا سەرسەر پێ کەنی و گوتی:

"بەڵێ راستە. هەقیقەتی هەیە. بەڵام ئیدی پیر بووم مام سڵەمان!"

سڵەمانەزلە بەوپەڕی کون پشکنی‌یەوە پرسی:

"ئەوەش راستە کە دەڵێن تا ئێستا نەبووە وەدوای شوێنێك بکەوی و خاوەنەکەی نەدۆزیەوە؟"

مووسا سەرسەر بە شەرمێکی منداڵانەوە لە کاتێك دا سەری لێ‌شێوابوو گوتی:

"جارێکیان هەتا نیزیك چۆمی "دیارسووات" کە ئێستا پێی دەڵێن جەیهان وەدوای شوێنێك کەوتم کەچی ئەو شوێنە شوێنی چەتەیەکی دیکە بوو. تۆمەز خاوەنی ئەو شوێنە کە ئەمن هەڵم گرتبوو لەنێو گابەردەکانی ئاناوارزادا خۆی حەشار دابوو. دیارە دوایە وەدوای شوێنەکەی کەوتم و دۆزیمەوە، بەڵام هەرچۆنێك بێ لە ژیانم دا جارێك بە هەڵە چووم."

عەلی‌یەشەل گوتی:

"ئەمن بەڕاستی وەستایەتیم لێ‌دی. لێی تۆقیبووم. لە رێگادا زۆرم هەوڵ دا بە هەڵەی بەرم. بەڵام شوێنی حەمەدی هەڵگرت و راست هاتە بەر ئەم دەرگایە. براله حەمەد، راستە کە ئەتۆ ژیانی منت نەجات دا، بەڵام ئەمنیش ژیانی تۆم نەجات دا." پاشان هەموو بەسەرهاتەکەی رێگای تا ئەو جێگایە کە بریاری کوشتنی مووسا سەرسەری دابوو، موو بە موو گێڕایەوە. بەو داستانە کە عەلی‌یەشەل دەیگێڕایەوە مووسا سەرسەر جار بە جار رەنگی زەردتر دەبوو و چاوی زیاتر پێ دەردەپەڕین. مووسا سەرسەر لە حاڵێك دا بە تەواوی نێوچاوانی تێك نابوو زۆر بە سەرسوڕمانەوە پرسی:

"هەر بەڕاستی دەتەویست بم کوژی؟"

عەلی‌یەشەل گوتی:

"باشە بۆخۆت پێم بڵێ لەوە زیاتر دەم توانی چ بکەم؟ چیی دیکەم لە دەست دەهات؟"

پاشان لە کاتێك دا دەستی بۆ لای سڵەمانەزلە درێژ کرد، گوتی:

"ئەویش دەیەویست من بکوژێ، لە کاتێك دا بێ‌گوناح و بێ‌خەتا بووم."

سڵەمانەزلە گوتی:

"بە خوا دەم کوشتی. بەرێکەوت زۆر باشیش دەبوو. قەیدی نیە با ناردنی عەلیەشەل بۆ جەهەننەم بێنێ بۆ جارێکی دیکە. قەرزبێ لەسەرم. پێت قەرزدار بم!"

پاش نان خواردن عەلیەشەل حەمەدی بانگ کردە سووچێك و پێی گوت:

"ئەم دێیە ماڵ بە ماڵ دەپشکنن. یاوەر فارووق عادەتێکی هەیە: بچێتە هەر دێیەك خەڵکەکەی وەبەر کوتەك و گۆپاڵ دەدا. هیچ نازانێ، نە پیر، نە ژن، نە منداڵ. ئەتۆ گیر مەبە، سواری ئەسپێك بەو برۆ."

حەمەد پرسی:

"بچمە کوێ؟"

عەلیەشەل گوتی:

"کێو و بەندەن پڕن لە جەندرمە. ئەوانەی بە دڵخوازیش بە دوات دا دەگەڕێن دنیایان پڕ کردوە. نازانم ئەو برایمەرەشە چیی لە گیانی تۆ دەوێ. هەمیشە دەڵێ بە خوێنی سەری تینووم. هیچ قسەیەکی دیکەش ناکا. ئەتۆ چیت لەگەڵ کردوە؟"

حەمەد نەڕاندی:

"تووتکەسەگ چیم لەگەڵ کردوە؟ ئەویلەم بەسەر دا رووخاندوە؟ خەرمانم لێسووتاندوە؟ تەماحم لە ناموسی ژن و بووك و کچەکانی کردوە؟ ئەمن چووزانم چیم لەگەڵ کردوە؟ باشە ئێستا بچمە کوێ؟"

عەلی لە فکرەوە چوو:

"ناتوانی لێرە بمێنیەوە، خەتەرە. هەموو کەس دەزانێ لە ماڵێ سڵەمانەزلەی. ناتوانی هەڵێی بۆ نێو لێرەواریش. لەوێ دەکەویە تەنگانەو لەبرسان دەمری. ئێستا هەرکەس لێرە بت بینێ دەچێ و خەبەرت لێ دەدا. ئیدی ئەو حەمەدۆکی جاران تەواو بوو، رۆیشت. خوا نەکا لە خەڵکی ئاسیاب چەشمە کەسێك بت بینێ. بکەویە دەستیان پارچە پارچەت دەکەن."

"بچمە کوێ عەلی؟"

عەلی لە فکرەوە چووبوو و قسەیەکی نەدەکرد:

"ئەم رۆژانە چوون بۆ چیاکان ئیمکانی نیە. بریا لەو جێگای خۆت لێحەشار دابوو یەك دوو ساڵ مابایەوەو خۆت ئاشکرا نەکردبا هەتا بە یەکجاری لەبیریان دەچوویەوە."

حەمەد گوتی:

"له چوکووراوا بووم."

پاشان له سووچێکی ژوورەکه دانیشت و تەواوی ڕووداوەکانی چوکووراوا، وایوای و عەلیسەفابەگ، عارف صائم بەگ، ئیدریس بەگ و ئاغاکانی دیکەی چوکووراواو سەیرانی یەك بە یەك بۆ عەلی باس کرد.

عەلی گوتی:

"بریا ئەم ڕۆژانە نەهاتبایە کێوپارە. وەسمانەزلەو خەڵکی دێهاتی چوکووراوا تۆیان بە گرتن نەدەدا. ئەوان جارز ببوون و چاوەڕوانی یارمەتییان لە تۆ هەبوو، تەنانەت ئەگەر هەموو خەڵکی گوندەکەشیان لەنێو بردبایە، دیسان کەس تۆی بە دەستەوە نەدەدا. بەڵام خەڵکی ئێرە... ئەگەر بە گیرت بێنن، لە کەچکە ئاوێك دا دەت خنکێنن. مەڕوانە سڵەمانەزلە. ئەو تۆی خۆش دەوێ. ئێستا بزانین ڕێگا چارە چیە؟ ڕاستییەکەی جگە لە ماڵی ئومەتەزەرد جێیەکی دیکەم بە فکردا نایە. ئەو لە پێناوی تۆ دا گیانیشی فیدا دەکا. وەختێك ڕۆیشتی چەند مانگ تازیەی داگرت. چاوەکانی بە قەدەر دوو کانی فرمێسکیان لێ‌هات. بەڵام دەوروبەری پڕ لە جەندرمەیە. ناتوانێ بت شارێتەوە."

بانگی سڵەمانەزلەیان کردو تەگبیریان پێ کرد، ئەویش زۆری بیر کردەوە، بەڵام پەنایەکی بە فکر دا نەهات. مووسا سەرسەرێ قسەیەکی نەدەکرد، بەڵام جاروبار دەیگوت:"ئاخ عێلاتی ماراش، یادیان بەخێر. خوا دەزانێ ئەم حەمەدە وردیلەیە کە هیچ، دەم توانی لەشکرێکیان لەنێو دا بشارمەوە."

چوار پیاوی کارکوشتە، چوار گورگ کۆبوونەوەو هەتا لای نیوەشەوێ بیریان کردەوەو نەخشەیان کێشا، لەکاتێك دا جەندرمەکان لەمێژ بوو لە نێو ئاوایی دامەزرابوون، نانیان خواردبوو و نووستبوون. یاوەر فارووق و هەمزەو وەکیل باشی عاصم لە ماڵی کوێخا خەریك بوون "ڕاکی"یان لەگەڵ کەباب دەخواردەوە. سڵەمانەزلە سات بە سات ئاگای لە دەنگوباسی ماڵی کوێخا هەبوو.

پاش ماوەیەك بیر کردنەوە لە نەکاو حەمەد هاواری کرد. دیمەوە، دیمەوە. دەچم لە ئاشی سمایلەزلەدا خۆم دەشارمەوە. کەس بە بیری دا نایە لەوێ بم."

شەلە گوتی:

"بۆچی، بەبیریشیان دا دێ. بەڵام چارەیەکی دیکە نیە. چەند ڕۆژ لەوێ بمێنەوە تا بزانین چ فکرێکت بۆ دەکەینەوە. لە هەل و مەرجی ئێستا دا باشترین جێگا هەر ئەوێیە."

سڵەمانەزلە گوتی:

"بەڵێ جێی چاکە. دوایە ئەمن و عەلی فکرێکی لێ دەکەینەوە."

حەمەد لە پەنای ئاگرەکە دانیشتبوو. وا لە گژ فکران راچووبوو کە تەنانەت گوێی لەو فەرمانانەش نەبوو کە سلەمان بە کوڕەکانی و بووکەکانی دەدان:"ئەسپەکە ساز بکەن، توێشووی تەواو دابنێن، رۆنەکەرە، هەنگوین، قاورمەش دابنێن."

پاش ماوەیەك حەمەد سەری هەڵێناو گوتی:

"براله عەلی باشت گوێ لێ بێ - پاشان رووی کردە مووسا سەرسەرێ- ئەتۆش باش گوێ بگرە - ئەمجار رووی لە سڵەمانەزلە کرد- ئەتۆش باشت گوێ لێ بێ مام سڵەمان."

پاشان تفی قووت دایەوە، خۆی حازر کردو قەڵافەتێکی بەخۆیەوە گرت وەك ئەوەی بیهەوێ مەبەستێکی گرینگ باس بکا. دەت گوت دەیەوێ وەسیەت بکا، دەستی بە قسە کرد:

"ئێوە هەرسێکتان، دەستتان، چاوتان، بیرتان کیمیایە. زۆرتان دنیا دیوە، تەمەنێکتان رابواردوە، ئێستا هەرسێکتان لە جێیەك کۆ بوونەوە. هەمووتان دەزانن ئەمن چەندەم بەلا بەسەر هاتوون. دیارە ناڵێم ئەو بەلایانەی بەسەر من هاتوون بە سەر هیچ دیل و کۆیلەیەك نەهاتوون. بەلام دەتوانم بلێم ئەمنیش رۆژی زۆر لەتوانابەدەرم رابواردوون هەمووتان هەمووی دەزانن. ئاخرەکەشی عەبدیخانم بەو مەبەستە کوشت کە فەقیرو هەژار رزگارییان بێ و رزگارییشیان هات... پاش مردنی عەبدی، خەڵك شادمانییان کرد، زەوییەکانیان لەنێو خۆیان دا دابەش کرد. هەم گوندنشینەکان و هەم ئەمن پێمان وابوو دنیا هەروا دەبێ... پاشان چ بوو؟ پاشان هەمزە کەچەڵ پەیدا بوو. هەزار جار خراپتر لە عەبدی دەستی بە خوێن سوور بوو. دڵی خەڵکی پڕ کرد لە خوێن. ئێ... باشە ئاخرەکەی چی؟ عەبدی رۆیشت، هەمزەکەچەڵ هات هەزار جار لەو خراپتر... باشە... ئاکامی زەحمەتەکانم بە چی گەیشت؟ ئێوە پیاوی ژیرو بەتەگبیرن، زۆرتان ئەزموون هەیە. ئێوە پێم بلێن بزانم ئەمن دەبێ چ بکەم. رێگایەکم نیشان بدەن."

سڵەمانەزلە بە راوێژێکی توندەوە گوتی:

"ئەمن ئێستا پێت دەڵێم، ئاو هەمیشە سەرەوخوار دەڕوا، دەڕواو دەریای مەرمەرە پڕ دەکا. تا ئێستا قەتت دیوە ئاو سەرەوژوور بڕوا؟"

"کەوابوو هەمیشە عەبدی دەڕواو هەمزە دێ؟ وانیە؟"

سڵەمانەزلە تووڕەو ناعیلاج و ناهومێد لە حاڵێك دا ریشی دەلەرزی، گوتی:

"ئەرێ، هەروایە."

مووسا سەرسەرِ گوتی:

"ئاغایەك دەڕوا، ئاغایەکی دیکە دێ. لە هەموو جێیەك هەروایە. ئیرادەی خوایە کە باڵندە بە باڵ دەفڕێ، با بە بێ باڵ دەڕوا، بنیادەم بە لاقی دەڕوا، مانگ و رۆژ هەڵدێن و ئاوا دەبن."

حەمەد بە نێوچاوانێکی گرژەوە قسەکەی ئەویشی بڕی و گوتی:

"کەوابێ عەبدی بڕوا، هەمزە دێ، وانیە؟"

مووسا سەرسەرِ ملی بە لاوە ناو گوتی:

"هەروایە."

شەلە قسەی نەدەکرد. دیار بوو لەو بارەیەوە زۆری بیر کردوەتەوە. سەرەنجام گوتی:

"وەختێك ئەتۆ رۆیشتی و هەمزەکەچەڵ هات، هەر بیرم لەوە دەکردەوە. شەوانە تا بەیانی خەوم لێنەدەکەوت. بەڵام رێگاچارەیەکم نەدۆزیەوە. ـ هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا ـ زۆر زۆرم بیر کردەوە. فکرم نەگەیشتە هیچ کوێ، ئەقڵم هیچی نەبڕی."

حەمەدۆك گوتی:

"عەبدی دەڕوا هەمزە دێ، هەمزە دەڕوا سلێمان دێ، عەلی دەڕوا وەلی دێ..."

سڵەمانەزلە وەڵامی دایەوە:

"راست وابوو. عەلی رۆیشت وەلی هات. باپیرت رۆیشت بابت هات. بابت رۆیشت تۆ هاتی. ئەتۆ دەڕۆی کوڕەکەت دێ."

حەمەد گوتی:

"هەر ئێستا ئەتۆ، ئەمن، مووسا سەرسەرِو عەلی یاری بە گیانی خۆمان دەکەین. ئەگەر وایە، بۆچی هێندە تەقەلا دەکەین؟" ئەمجار بە دڵنیایی‌یەوە گوتی:"هەوڵدان کارێکی بەجێیە، ئەمە هەقی خۆمانە."

ماوەیەك بوو ئەسپەکە لەبەر دەرگا راگیرابوو. حەمەد هەڵستا، هەرسێکیانی یەك یەك لە ئامێز گرت. روخساری حاڵەتێکی تاڵی تێدا دیار بوو، تاڵی‌یەکی تێکەڵ بە گاڵتە پێهاتن کە وەك ژارێکی سەوز بە روخساریەوە چەسپابوو...

کە لە دەرگا چووەدەر گوتی:"خواحافیزتان بێ." چووە دەرێ و خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکە:

"هەوڵدان، شەڕکردن، گیان دان و خوێن دان... بەخۆڕایی... تێکۆشان هەقە... بەرەبەرە ئەم پرسیارە لە فکری دا دروست بوو کە:"ئەگەر تێکۆشان سوودێکی نەبێ؟ چۆن هەقە؟"

هەستێك كە تا ئەو رۆژە وێنەی نەدیبوو، سەرانسەری گیانی داگرتبوو. بە تاسەیەكی بێئەندازەو بە هەموو هەستیەوە تامی بیركردنەوەی دەچاشت و لە ئاكامی داماوی دا جینگڵی دەداو بە چۆك دا دەهات.

گەیشتبووە بەر دەرگای ئاشی. لەبیری نەبوو لە ئەسپەكەی دابەزێ. لە پەستا فكری دەكردەوەو نەخشەی دەكێشا، بە جۆرێك تووشی سەرلێشێوان و پەرێشانی ببوو كە وا دەهاتە بەرچاو رزگاربوونی لێی نیە. نەیدەتوانی فكرەكانی رێك و پێك بكاو نەدەهاتەوە سەرخۆی. بەسەرهاتی ئیدریس بەگ فكرەكانی ئەوی شێواندبوو.

ئیدریس بەگ بۆ خاتری ئەندامانی عێلەكەی چووبووە كێو و بەندەنان و مردن هەنگاو بە هەنگاو بەدوایەوە بوو.

حەمەد هەتاو كەوتنی زۆر پێخۆش بوو. لەپێش دا لووتكەی كێوەكان بە هێڵێكی شین، پڕ ڕەنگ و روون بوو. ئەمجار سەروخواری ئەو هێڵە شینە زێڕكفت بوو و كێوەكان لە پێش دا بە رووناكایی‌یەكی زۆر درەوشانەوەو پاشان لە مژ دا ون بوون. ئەستێرەی بەیانی وەك هەتاوێكی لە سەرما جاڕز درەوشایەوەو دامردەوە، دامردەوەو درەوشایەوە. ئەمجار دنیا رووناك بوو. حەمەد تەنانەت ئاگای لە هەتاوكەوتنیش نەبوو. پشتی بە ئاونگ خووسابوو، بێجوولە لەسەر ئەسپەكە مابووەوە. كاتێك هەتاو لە پشتی داو ملی بە تیشكی هەتاو برژایەوە، هاتەوە سەرخۆی و دەسبەجێ لە ئەسپەكەی دابەزی. چوو بۆ لای دەركی ئاشەكەو بە لاق پاڵی بە دەرگاوە نا. لایەكی دەرگاكە كرایەوە، دەنگێكی خەواڵوو، لە سووچێكی دوورو تاریكی ئاشەكە كە گوێی لە هەست و خوستەكە ببوو گوتی:

"كێیە."

حەمەد پرسی:

"مام سمایل ئەتۆی؟"

دەنگێكی كزو بێهێزو خەواڵوو جوابی دایەوە:

"ئەدی براله خۆمم، ئەتۆ كێی، باراشت هێناوە؟ گەنمت لە كوێ پەیدا كرد؟ هەمزە روحمی بە دڵ دا هاتوە؟ ئەوە دێم. راوەستە پانتۆڵەكەم دەپێ كەمەوە."

سمایل لە كاتێك دا پانتۆڵەكەی هەڵدەكێشا، هاتە بەردەرگا. وەختێك گەیشتە رووناكایی رەق راما. تاوێك چاوی هەڵگلۆفین، دەستی راستی كردە سێبەری چاوی و توانی نەختێك قەڵافەتی حەمەدی لێك بكاتەوە. پرسی:

"ڕێبواری؟"

حەمەد گوتی:

"مام سمایل ئەمنم، حەمەد."

سمایلەزلە تێك ڕابوو، ئەختێك هاتەوە سەرخۆی و زۆر لەسەرەخۆ پرسی:

"کام حەمەد، ئەتۆ کام حەمەدی؟"

"مام سمایل ئەمن حەمەدۆکم، ئەمن هاتمەوە."

"چی؟ حەمەدۆك؟ کامە حەمەدۆك؟"

حەمەد گوتی:

"مام سمایل حەمەدۆك چەندن؟"

سمایلەزلە لە حاڵێك دا لە سەرتاپای ورد دەبووەوە گوتی:

"ئەو حەمەدۆکە کە خەریکی چەتەیی و ڕێگرییە؟"

حەمەد گوتی:

"ئەرێ، هەوم."

سمایلەزلە ڕاوەستا. تاوێك تێیەوە ڕاما. دەسبەجێ چووەوە ژووری ئاشی و گەڕایەوە. دارێکی بە دەستەوە بوو. لە حاڵێك دا هاواری دەکرد "هەی کافر"، پەلاماری حەمەدی دا "هەی کافرباب! (...)ت کردە وەجاخی ئێمە، ئەتۆ ئێمەت کوشت، پێنج گوندت تووشی برسیەتی کردو ئێستاش هاتوویەوە ئێرە، ئێرە، هاتوویەوە ئێرە، دەگەڕێی و دەڵێی ئەمن حەمەدۆکم؟"

ئەگەر حەمەد دەسبەجێ باوەشی پێدا نەکردبایەو دارەکەی لە دەست دەرنەهێنابایە سەروگوێلاکی شکاندبوو.

سمایلەزلە کە نەیتوانی جمگەی دەستەکانی لە دەستی حەمەد دەربێنێ، هەتا تین لە گەرووی دابوو دەستی کرد بە هاوار هاوار:

"فریام کەون، فریام کەون، کەس نیە ڕزگارم بکا، حەمەدۆکی چەتە هێرشی کردوەتە سەر ئاشەکەم، خەریکە بم کوژێ، فریام کەون، فریام کەون! کەسێك بێ نەجاتم بدا..."

حەمەد جمگەی دەستی سمایلەزلەی بەر نەدەداو ئەویش هات و هاواری وەڕێ خستبوو، دەنگی، وەك دەنگی کەسێك دەچوو کە تووشی لەرزوتا بووبێ، لەکێوێکەوە دەیدا بە کێوێکی دیکەو لە شاخەکان دا دەنگی دەدایەوە.

سمایلەزلە هاواری دەکرد، پەلەقاژەی دەکردو حەمەدیش هەر ئەوەندەی دەتوانی بڵێ:

"مام سمایل، چما شێت بووی، چما ئەقڵی خۆت ون کردوە؟"

"فریام کەون، خەریکە بم کوژێ! خەریکە بم کوژێ، خەریکە بم کوژێ..."

سمایلەزلە خۆی خستبووە سەر زەوی، پەلی دەکوتاو پەلەقاژەی دەکرد، بە کورتی قیامەتێکی ساز کردبوو. حەمەد تووڕە بوو، خوێن بەری چاوی گرت و پێلەقەیەکی توندی لە سمایل دا کە خۆی لەسەر زەوی درێژ کردبوو، دەمانچەکەی دەرهێناو گوتی:

"بێدەنگ بە سەگ دین!... ئەگەر وست نەبی، هەر ئێستا بۆخۆم بێدەنگت دەکەم."

سمایلەزلە دەسبەجێ لاڵ بوو و متەقی لێبڕا. هەر لەوێ لەسەر عەرزەکەو لەنێو پەین و پاڵ ڕەق بوو. ملە کزو پڕ چرچ و لۆچەکەی درێژترو خوارتر بوو. قەڵشتی پاژنە پێیەکانی قامکیان تێوە دەچوو، گۆشتی لەشە کزو چرچەلۆکەکەی لەنێو رندۆڵی جلکە دڕاوەکانی وەدەرکەوتبوو و ریشە درێژو سپیەکەی بە دووکەڵ زەرد هەڵگەڕابوو. حەمەد ماوەیەك تێیەوە ڕاما. ئاگر لە دڵی بەربوو، گریان بەری ئەوکیی گرت. داهاتەوەو لەسەر عەرزەکە راستی کردەوەو بردیەوە ژووری ئاشەکە. بادیە ئاوێکی هەڵگرت، سەرو چاوی خۆی شوتن و ئەسپەکەی هێنایە ژوورێ و بەستیەوە.

سمایلەزلە پالی بەدیوارەوە دابوو، دەگریا. بەدەم هەنیسکی گریانەوە دەیگوت:

"حەمەدۆکە چڵمن! کێ بە تۆی گوت بێی ئاغاکەمان بکوژی و ئێمە تووشی زوڵم و زۆری هەمزە کەچەڵ بکەی؟ کێ پێی گوتی."

"مەگری مام سمایل، مەگری. گوێ بگرە بزانە چت پێ دەڵێم."

"پێویست نیە هیچ بڵێی... دوو ساڵە دەنکە گەنمێك نەچووەتە گەرووی ئەم ئاشەوە. نە دەنکە گەنمێك، نە دەنکە زوڕادێك، نە جۆ، نە هەرزن. ئەوە دوو ساڵە ئەم ئاشە دەنکە گەنمێکی نەهاڕیوە. ئەتۆ ئێمەت تووشی ئەم رۆژە کرد. خەڵکی خاردەشت دوو ساڵە وەسواڵێ کەوتوون... هەموویان رووت و پێخواسن... ئەدی، ئەتۆ تووشی ئەم حاڵ و رۆژگارەت کردین..."

"مەگری مام سمایل مەگری! گوێت لێبێ بزانە چت پێ دەڵێم، گوێ بگرە!"

"چم پێ دەڵێی کافر، بێدین، پیاوکوژ... دەستت هەتا ئەنیشکێ بە خوێنی سووری ئاغای ئازا، ئاغای میهرەبان و بە ویژدانی ئێمە سوور بوون، چت هەیە پێم بڵێی کافر؟ مندالەکان لە برسان وشك هەڵاتن و مردن. تەنیا عەمبارو چاڵەکانی هەمزە کەچەڵ پڕ لە دانەوێڵەن،

دارونەداری دێهاتیەکانی تالآن کرد، هەرچی بوویان لێی ئەستاندن. دەنکێك گەنم، زوراد، جۆ، هەرزن چیە، بۆی بەجێ نەهێشتن. هەموو لە برسان مردن. خەڵك هەموویان بوونە حەیوان و پاتاڵ، لەو کێوانە گیامان رنیەوەو خواردمان. گەزگەسك و وێنجەمان خوارد، توێکڵی دارانمان خوارد، هەرچی وەدەستمان کەوت خواردمان. هەرچی مانگاو مەڕو بزن و ئەسپ و وڵاغی هەمانبوو، هەمزە کەچەڵ هەمووی بە زۆری حکوومەت لێ‌ئەستاندین. دێهاتیەکانی ریز کردن، حەوتوویەك نۆکەرو بەکرێگیراوەکانی لەیان دان. پاشانیش حەوتوویەك جەندرمە لێیان دان، ئەوەندەیان لێ دان کە پشتیان شەقار شەقار بوو، ئەدی حەمەدۆکی خۆم، ئەدی رێگری خۆم، ئەدی هەڵۆی راوکەری سەر چیا بەرزەکان ئەدی! گریانێك بۆ من نەبێ، بۆ کێ باشە؟ شەش مانگە ژەمە خۆراکێکی بەراستیم لەگەروو نەچووەتە خوار. هەمووی خەتای تۆیە... وەجاخت کوێر کردینەوە، ماڵت وێران کردین. دێیەکەمانت وێران کرد. ئەم بەدبەختیە ئەتۆ بەسەرت هێناین، ئێمەت لەنێو برد. کێ گوتی، کێ، کێ، کێ پێی گوتی گلێنەی چاوی ئێمە، ئاغا زێرەی ئێمە بکوژی؟ ئێمە ئاوا هەتیو و بێ‌کەس بکەی، کێ، کێ پێی گوتبووی؟"

دەستی کرد بە تاریفی عەبدی‌خان. فرمێسکی دەڕشت و بەدەم گریانەوە بە عەبدی‌خانی هەڵدەگوت. لە ناخی دڵیەوە شیعری لە تاریفی عەبدی‌خان و ئینسانەتی‌و میهرەبانیەکانی عەبدی‌خان دا دەخوێندنەوەو دەی‌گەیاندە عەرشی عەزیم. حەمەد گوتی:

"مەگری مام سمایل، بەسە، چی دیکە مەگری. وەرە پێکەوە یەك دوو پاروو نان بخۆین."

بوخچەنانی لە خورجێنەکەی دەرهێناو لێکی کردەوە. بوخچە نانەکە مریشکێکی برژیویشی تێدا بوو کە لە نانی تەندووری وەرپێچرابوو.

سمایلەزلە بە سیلەی چاو تەماشایەکی خواردنەکانی کرد. هەستا. چووە سەر ئێلێ ئاشی، بە شڵپ و هۆڕ دەست و چاوی شوتن و هاتەوە.

حەمەد گوتی:

"فەرموو مام سمایل."

سمایلەزلە وەك گورگی برسی پەلاماری مریشکەکەی دا. حەمەد رامابوو و تەماشای دەکرد کە بە ئیشتیاو تامەزرۆییەکی سامناکەوە مریشکەکەی قووت دەدا. ئەو بە هەردوو دەستان، بەزاری، بە لووتی و بە چەنەگەی و بە برۆکانی خەریك بوو مریشکەکەی دەخوارد. لە ماوەیەکی کەم دا مریشکەکە تەواو بوو، سمایلەزلە دەستی بە کرووسینەوەی ئێسکەکانی کرد. یەك یەك ئێسکەکانی کرووسینەوە. لە ماوەیەکی زۆر کەم دا هەرچی خواردن لە بوخچەکەدا

بوو خواردی و تەواوی کردو پاش ئەوەی ئاوێکی زۆری لەسەر خواردەوە گوتی:"ئۆزۆخەی، ئۆزۆخەی! زیندوو بوومەوە. رەحمەت لە گۆڕی مردووانت. ئۆزۆخەی تێرم خوارد. لێم ببوورە کوڕم. بابتم زۆر خۆش دەویست. باشترین پیاوی ئەم دنیایە بوو. ئەو کاری بەم جۆرە کارانە نەبوو. پیاوێکی باش و میهرەبان بوو. ئەتۆ کارێکی باشت نەکرد حەمەد، ئێمەت ماڵوێران کرد. لێم ببوورە کوڕم. یا...خوا بەخێر بێی! ئای بۆ جگەرەیەك... لەکوێ بووی براله؟ یا...خوا بەخێر بێی، خێرو بەرەکەتت هێنا."

## (٣١)

ئەو شەوە دایدایە بارانێکی بەسام. دەت گوت لە حەوت ئاسمانان لە جیاتی باران رووبار دێنە خوارێ. بایەکی توندی دەهات، کە هەموو شتێکی بەسەر یەك دا دەداو دەیشکاند، سەربانی خانووەکانی هەڵدەگرت و دەیبرد، لکیدارەکان و سپیدارە بڵیندەکانی دەشکاندو دەیڕووخاندن. لە دووری ئاسمان بریسکەی دەداو هەورە تریشقە دەیگرماندو گرمەکەی لە کێوەکانەوە لەدەشتەکان و لە دەشتەکانەوە لە خڕو دۆڵەکان دەگەڕا. ئەمە یەکێك لە بارانە پڕ بەڵاکانی چوکووراوا بوو.

لای بەیانی بارانەکە نەرم تری کرد. خڕو دۆڵ و چۆمەکان لافاویان تێدا هەستا، بە جۆرێك کە پەڕینەوەیان لێنەدەکرا. لەگەڵ تاوهەڵات بارانەکە لێی کردەوەو هەتاوێکی گەرم و تەڕو تێکەڵ بە مژێکی قورس سەری وەدەرنا کە بە زەحمەت لە پشت مژەکەوە دەبینرا.

لە "تووراسی" جەندرمەکان بە هاوکاریی برایەڕەش دەستەی هەشت کەسیی"کوڕی زالا"یان شەق و شڕ کردبوو و هەموو لەشیانیان بە گوللە دابێژ دابێژ کردبوو. کوڕی زالا لاوێك بوو حەڤدە ساڵە، باڵابەرزو بە دیمەن بە لووتێکی قەپۆزبەرانییەوە. ئەو، کابرایەکی خەڵکی شاری کوشتبوو کە کاتی خۆی بە زۆرو بە کوتەك زەوییەکەی باوکیی داگیر کردبوو.

دایکی زۆری خۆش دەویست. وەختێك منداڵ بوو هەمیشە لە باوەشی دەکردو بە دەم لاواندنەوەوە پێی دەگوت:"کوڕە تاقانەکەی زالا. تاقانەکەی زالا..."و هەر بۆیە خەڵکی ئاوایی ناوی کوڕی زالایان بە سەردا بڕی. بەرە بەرە ناوەکەی خۆی لەبیر برایەوەو هەموو کەس بەم ناوەیان ناسی.

بابی کوڕی زالا پیاوێکی شەریف و میهرەبان بوو. مەزرایەکی زۆر بەرێژەوو سەحەب ئاوی لە گوندی "چنارلی" هەبوو. کابرایەکی خەڵکی شار بەناوی "عبدالله ئۆغلی" تەماعی لەو

مەزرایە کردو ویستی بیکاتە باغ. بابی کوڕی زاڵ حازر نەبوو زەوییەکەی بفرۆشێ. بەڵام کابرا کۆڵی نەداو دەستی لە کەڵلەشەقی هەڵنەگرت. بێجگە لەوەش بەرتیلی دا بە چەند بەرەڵڵای مل ئەستوور کە چوون دارکارییەکی زۆر باشی بابی کوڕی زاڵیان کرد. بابی کوڕی زاڵ نەی دەوێرا بچێتە شار، هەر وەختێك دەچوو بۆ شار لێدانێکی چاکی دەخواردو بە سەروگوێلاکی خوێناوییەوە دەگەڕایەوە ئاوەدانی.

کوڕی زاڵ فیلینتایەکی لە دەستان خۆشی ئەڵمانیی پەیدا کرد، سواری ئەسپێکی چالاك بوو کە هی دراوسێکەیان بوو، بە چوارناڵی ڕۆیی بۆ شار. عبدالله ئۆغڵی لە دوکانی کەوش درووی‌ەك دانیشتبوو. کوڕی زاڵ دەیزانی هاتوچۆی کوێ دەکا. دوکانی کەوش درووییەکەی هەروەك بۆخۆی دروستی کردبێ، بە ئاسانی دۆزیەوە. لوولەی تفەنگەکەی لە سنگی عبدالله ئۆغڵی کردو پێنج گوللەی لێدان. عبدالله ئۆغڵی بێگیان کەوتە سەر زەوی و کوڕی زاڵ بە سواری ئەسپ ڕووی کردە کێوو بەندەنان.

✧ ✧ ✧

تەرمەکانیان بەسەر چەند ئەسپێکی رووت دا هێنابوون. سەریان بە کەلەکەیەك و لاقیان بە کەلەکەیەکی دیکەی ئەسپەکانەوە هەڵواسرابوو. گەردنی درێژو داچۆڕاوی کوڕی زاڵ رادەژاو لەگەڵ هەموو راژانێك لە بەرزگی ئەسپەکە دەدرا.

هەتاو کەوتبوو کە تەرمەکانیان هێنایەوەو لەبەر دەرکی حەوشەی گەورەی مەخفەری جەندرمە فڕێیان دان. هەشت جەندەك لەسەر زەوی لەبەر گەرما کەوتبوون. زۆری پێنەچوو چەند مێشە شینکەی گەورە گەورە پەیدا بوون و بە وزەوز لە دەوری تەرمەکان دەستیان کرد بە سووڕان. هەتاو گەرم و هەڵماوی بوو. ئاسمان لە گەرمان ڕەنگی خۆڵەمێشی گرتبوو و داگیرسابوو، چ داگیرسانێك!

کوڕی زاڵ پانتۆڵێکی خوریی زووری لەبەردا بوو لەگەڵ چاکەتێك لە قوماشێکی باشی ئینگلیزی لەوانەی بە قاچاغی دەیان هێنن. لەسەر چاکەتەکەیەوە سێ قەد فیشەکدانی لە خۆی دابوون. جێی بەستە فیشەکەکان هەموو زێوکاری کرابوون و دەسکری چەرکەس بوون. خەنجەرە دەسك زیوە چەرکەسییەکەی بە قایشێکی درێژ بە قایش پشتینە پانە سەربازییەکەیەوە هەڵواسرابوو. دووربینێکی چووکی قاوەیی هەبوو. جووتێك کەوشی سووری دەست درووی

ماراشی بەرقەڵتاغ و جووتێك گۆرەویی نەخشینی کوردیی لەپێدا بوون. جوانیی دەسکی سەدەفی دەمانچەکەی لە چاوی دەدا.

ئەو یاغیيانەی دیکەش کە تەرمەکانیان لە حەوشی مەخفەرەکەدا کەوتبوو، هەموویان جل وبەرگێکی لەو بابەتەیان لەبەردا بوو. سەری یەکێك لە یاغیيەکان مووی پێوە نەبوو، وەك بەری دەست لووس بوو... ئەو پیاوە" یاغیيە کەچەل"ی بەناوبانگ بوو.

حەوشی مەخفەری جەندرمە خەریك بوو پڕ بێ لە لادێیی. هەرکەس خەبەرەکەی زانیبوو، هاتبوو کە کوڕی زالا ببینێ. خەڵکی گوندەکەی کوڕی زاڵاش پێیان زانیبوو. دایکی کوڕی زالا بە گریان و سینگ کوتان لە پێشەوەو ژن و پیاوو گەورەو چووکی ئاواییش بەدوای دا وەڕێکەوتن. خەڵکی گوندەکانی نزیك شاریش ئاگادار بوون و ئەوانیش چوون بۆ دیتنی تەرمی کوڕی زالا. لە حەوشی مەخفەری جەندرمەی شار دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە زەوی. خەڵك رژانە کۆڵان و شەقامەکان.

جەندرمەکان نەیان هێشت دایك و باب و خزم و ئاوماڵەکانی کوڕی زالا لە تەرمەکەی نزیك کەونەوە. نەیان دەهێشت خەڵکی دیکەش لە تەرمی یاغیيەکانی دیکە نزیك ببنەوە. هەڵلاوهەنگامەیەکی سەیر بەرپا ببوو. دەنگی شیوەن و گریان دەگەیشتە ئاسمان و ژنان لەسەرو سینگی خۆیان دەدا. بەژنی کوڕی زالا بەرزترو ڕاکشاوتر دەهاتە بەرچاو. لاڕوومەتی ڕاستی لەسەر خاك بوو و لەبەر تیشکی لێڵی هەتاوی مژگرتوو وا دەهاتە بەرچاو کە ئارەقەی کردبێ، پێکەنینێکی منداڵانە لە سەر روخساری وشك ببوو.

جلکە تەڕەکانی کوڕی زالا هەروەك جل و بەرگی تەرمەکانی دیکە بە ئەندامی ڕێك و پێکیەوە نووسابوون. بە گەرم بوونی هەتاو جلکەکان هەڵمیان لێهەڵدەستاو ژمارەی ئەو مێشە شینکانە کە لەسەر تەرمەکان دەنیشتن و هەڵدەفڕینەوە زیادی دەکرد.

زاڵا کە ڕێگای نەبوو لە تەرمی کورەکەی نزیك بێتەوە، بە دەوری دا دەسووڕاو وەك باڵندە باڵەفڕەی دەکرد، دەگریاو بە کوڕەکەی هەڵدەگوت:" تاقانەکەی زاڵا بۆچی ڕەحمیان پێنەکردی تاقانەکەی زاڵا... مێش و مەگەزت لەسەر نیشتوون تاقانەکەی زاڵا... دڵم نەدەهات ماچت کەم دەم گوت نارەحەت دەبێ... بەڵام ئێستا تۆیان بە خوێنە سوورەکەت پێچاوەتەوە... دڵم نەدەهات ماچت کەم کەچی ئێستا لە نێو خاك و خۆڵ دا فڕێیان داوی. لەبەر هەتاوی لای نیوەڕۆ بۆ لەنێو ئەو خۆڵەدا خەوتووی، بۆچی لەبەر دەرکی جەندرمە خەوت لێکەوتوە؟"

زاڵا هەتا دەنگی گیراو بێهۆش کەوت گریاو لەسەرو سینگی خۆی دا.

پاشان "مام جام گەز"ی وێنەگر هات. لە پێش دا کوڕی زاڵآیان ڕاست کردەوەو هەوڵیان دا بە دیوارەکەوە لەسەرپێ ڕایبگرن. کوڕی زاڵآ ئەوەندەی گوللە وێ کەوتبوون کە لەشی دابێژ ببوو...

جلەکانی لەخوێن و خۆڵ وەردرابوون. جلەکانیان ڕاوەشاند. زاڵآ بە دەنگە نووساوەکەی هاواری دەکرد:

"ئازاری مەدەن، تاقانەی من ئازار مەدەن."

دوو پیاوی بەهێز کوڕی زاڵآیان پشت بە دیوار بەسەر پێوە ڕاگرت. جەندرمەیەك هاتە پێشەوە. کڵاوە دەست درووە گوڵینگەدارەکەی کوڕی زاڵآی لە سەری کردەوەو مام جام گەزی وێنەگر وێنەکەی گرت. وێنەی تەرمی هەموو یاغییەکان ئەو دەیگرت. پاش وێنە گرتن، تەرمی کوڕی زاڵآیان بەردا، تەرمەکە دوولا هاتەوەو لەبن دیوار گرمۆڵە بوو، و ملی بەسەر شانی چەپیدا شۆڕ بووەوە. دیسان پێکەنینە منداڵانەکە لەسەر لێوانی وەدەر کەوت و دیسان زاڵآ دەستی کردەوە بە شیوەن و گریان.

ئەمجار جەندرمەکان یاغییە کەچەڵیان هەڵێنا. دوو نەفەر قۆڵیان گرت و ئەویشیان بە دیوارەکە هەڵپەسارد. جەندرمەکان کڵاوە دەست درووەکەی ئەویشیان هێناو لە سەرییان نایەوە. بەم کارە هەموو ئەوانەی کۆ ببوونەوە پێکەنینیان هات. پاش ئەوەی وێنەکەییان گرت ئەویش لەبن دیوارەکە گرمۆڵە بوو و سەری کەوتە سەر سینگی.

تەرمی یاغییەکان دوو ڕۆژی دیکەش لە حەوشەی مزگەوت مایەوە. لە گەرمان بۆنیان کردو هەڵمسان، بە جۆرێك کە لەشی هەڵمساویان لە جلکەکانیان دا جێی نەدەبووەوە.

"کامبوور ئەحمەد تەلال" کە لە جیاتی نیشان خول خولەیەکی ئەستوونی کارەبای بە بەرۆکیەوە هەڵاوەسیبوو، لە بەیانی تا ئێوارێ لە کۆڵانان هاواری دەکردو دەیگوت:

"بچنە سەیرێ خەڵکینە! تەرمی دەستەی کوڕی زاڵآ لە پێش مەخفەر فڕێ دراوە. تابلۆی عیبرەتە، بڕۆن تەماشایان کەن. بچن بزانن دایکان کوڕی چۆنیان بوون... کوڕی زاڵآ هەر ڕۆژێکی دیکە لەوێ دەبێ. خەریکن بۆن دەکەن، هەڵدامسێن، دوایە نەڵێن نەمان دیتن، بچنە سەیرێ خەڵکینە!"

زاڵآ سێ شەو و ڕۆژان لە حەوشەی مەخفەر دا خەو و خۆراکی نەبوو. کوشم هەڵات و دانیشت، لە کوڕەکەیەوە ڕاماو کەس نەیتوانی لەوێی دوور بخاتەوە.

پاش سێ ڕۆژان تەرمەکەیان دایەوە بە زاڵآ. زاڵآ وەك هەڵۆی بریندار خۆی بەسەر کوڕەکەی داداو دەستی کرد بە بۆن کردنی تەرمی هەڵمساو و بۆن کردووی... جگە لە تەرمی یاغییە

کەچەڵ تەرمی هەرحەوت یاغی‌یەکەیان دایەوە کەس و کاریان. جەندرمەکان تەرمی یاغی‌یە کەچەڵیان ـ کە کەس و کارێکی نەبوو ـ لە کۆنە کوورە قسلێکی دەرەوەی شار فڕێ داو سەگان خواردیان.

وەکیل باشی "ئاکتیو حەنقی" زۆر پیر بوو، مووی رەشی لەسەرو ریشی دا نەمابوو. ئەو یەکێك لەو کەسانە بوو کە وەختێك کوڕی زالآیان کوشت پێ‌یان وابوو حەمەدۆکیان کوشتوە. لەنێو بازاڕی شار هەنگامەی بەرپا کردبوو، وەك حیکایەت خوانێکی کارامە داستانەکەی دەگێڕایەوە:

"لە خۆشی‌یان دەست و پێی خۆمان لـێ ون ببوو. پێمان وابوو حەمەدۆکمان ئابلووقە داوە. بەڵێ حەمەدۆکمان لە گەڵی تووراسی دا گەمارۆ دا، هەموو جێگایەك عەرزو عاسمان بەردەڵان بوو. ئەگەر حەمەدۆکیش بووایە، رزگار بوونی نەبوو. یاغی‌یەکان لەنێو بەردەڵان دا بەگیر هاتبوون. لێکدانەکە سەعاتێکی کێشا. لەپڕ دیتمان حەمەدۆك دەسرۆکەیەکی بەسەر لوولەی تفەنگەکەیەوە کردوە، بەرەو لای ئێمە دێ و هاوار دەکا:"تەسلیم، تەسلیم" داروودەستەکەشی بە دوایەوە بوون... یاوەر گوتی:"راوەستن، ئەمن حەمەدۆکی بە دیل ناگرم، هەرکە نیزیك کەوتەوە تەقەی لـێ‌بکەن..." هەموویانمان هەر لەوێ کوشت. تەنیا یاغی‌یە کەچەڵ تەسلیم نەببوو. هەتا ئێوارێ شەڕی کرد. پاشان فیشەکی لـێ‌بڕان. ئەویشمان گرت و کوشتمان. خۆشحاڵ بووین کە حەمەدۆکمان کوشتوە. کاتێك دێهاتی‌یەکان گوتیان:"ئەمە حەمەدۆك نیە! کوڕی زالآیە" یاوەر لە داخان خەریك بوو دیق بکا. هەر دەی‌گوت:"چ نهێنی‌یەك لە کاری ئەم هەتیوەدا هەیە، کەوا دەگیر ناکەوێ؟"

ئەم شارۆچکەیە تەرمی زۆر لەو یاغی‌یانەی بەخۆیەوە دیبوو کە خۆیان تەسلیم کردبوو. چەند ساڵ لەمەوبەر دەوڵەت لەچیاکان دا بەیاننامەی بڵاو کردەوە کە:"هەرکەس لە کێوەکان دا خۆی حەشار داوە، ئەگەر بێت و خۆی تەسلیمی حکوومەت بکا، دەبەخشرێ"و یاغی‌یەکان خۆیان تەسلیم کردەوە. دەوری سی کەس لەو یاغی‌یە تەسلیم بووانەیان لە گرتووخانەی کووزان دا حەپس کرد. "حاجی وەلی" یاغیی بەناوبانگیشیان لەگەڵ بوو. رۆژێکیان بەیانی قۆڵی ئەم یاغی‌یانەیان بە تەنافێکی ئەستوور پێکەوە بەست و بە بیانووی ئەوەی دەیان گوێزنەوە بۆ بەندیخانەی ئەدەنە، وەڕێ‌یان خستن. لەنێوان کووزان و ئەدەنەدا جێگایەك هەبوو بە ناوی ساری‌چام کە خاکەکەی شۆرەکات و دارەکانی کورتە کورتە بوون. لە دۆڵی ساری‌چام ئەو یاغی‌یانەیان گوللەباران کردو پاشان راپۆرتیان نووسی کە گوایە یاغی‌یەکان لە کاتی راکردن دا

کوژراون. تەرمەکانیشیان لەدۆڵی ساریچام دا ژێر خاك کرد. دیارە هەموو جووتیارانی ئەو دەوروبەرە بە چاوی خۆیان تەواوی کارەساتەکەیان دیتبوو.

قایمەقام بە بیستنی ئەم جۆرە رووداوانە زۆر خۆشحاڵ دەبوو و دەیگوت:"با بکوژن، با ئەو کارە بێقانوونیيانە بکەن، هەر ئەم جۆرە کارانە بە زوویی گۆڕیان بۆ هەڵدەکەنێ. زوڵم هەرگیز بەردەوام نەبووە. بەڵام کاربەدەستانی جومهووری ئەوە نازانن، ئەویش لەبەر تازەکاری و لاوەتی و بێئەزموونیيانە. ئەمانە وەك شمشێری زوڵم لەسەر خەڵك دەدرێن ئاغای خۆم، نووری چاوم، راست وەك شمشێری زوڵم!"

زۆریش بە مەسەلەی حەمەدۆکەوە سەغڵەت بوو. ئاواتی بوو بزانێ ئەو کێيەو چ کارەيەو چ کارێکی لە دەست دێ:"دەڵێن زۆر لاوە، ماوەیەك خۆی پەنا دابوو و خەبەری نەبوو، بەڵام دەڵێن دیسان گەڕاوەتەوە "مەیدانی شەڕ" هەربینا دیت ئەم رۆژانە تەرمی ویشیان هێنایەوە بۆ شار." دەیگوت "کۆمارەکەمان زۆر بەهێزە، هەر ئەم رۆژانە ئەویش دەگرن و گوللەبارانی دەکەن. ئەویش دەبینم ئاغای خۆم، نووری چاوم، هەر ئەم رۆژانە دەیبینین" لەو کاتەدا بە ئیشتیا چاوەکانی لەسەر یەك دادەنان و دەستەکانیی رێك دەخشاندن.

پاشان بە سەرسوڕمان و ترسەوە گوێی بۆ ئەو بەسەرهاتانە دەگرت کە لە شاردا لەبارەی حەمەدۆکەوە دەیان گێڕانەوە، و لەبارەی شەخسیەتی حەمەدۆکەوە دەکەوتە باس و لێکۆڵینەوەو دەیگوت:

"ئاغای خۆم، جگەرگۆشەکەم، ئەو کابرایە بنیادەم نیە. زۆر زاڵم و بێویژدانە. لە جێدا ئاغای خۆم، دێهاتیيە تورکەکان بنیادەم نین ئەگەر هەلیان بۆ هەڵکەوێ چاوی بابیشیان بە نینۆك دەردێنن."

لەبارەی حەمەدۆکەوە شتی سەیریان بۆ دەگێڕایەوە. بۆ وێنە دەیان گوت:

"شەوێکیان حەمەدۆك لە گوندی"تاش ئوولووك" هێرش دەکاتە سەر ماڵی ئاغایەکی دەوڵەمەند. ئاغا دەڵێ دراوی نەغدم لە ماڵێدا نیە. حەمەد دەپرسێ: ئاوا، دراوت نیە؟ پاشان بە هاورێیەکانی دەڵێ: "دەرگاکە دابخەن و چاوەڕێ بن" ئاغا سێ کچی هەبوون شازدە ساڵەو هەژدە ساڵەو بیست و سێ ساڵە. لە پێش دا کچە شازدە ساڵەکە لە نێوەڕاستی هۆدەکەدا درێژ دەکاو لەبەر چاوی دایك و باب و براکانی وەسەری دەپەڕێ، دەڵێن بەدەم ئەو کارەوە پێش کەنیوە. دایك و باب و براکانی کچەکە دەستیان بە چاوی خۆیانەوە گرتبوو. پاشان کچەکە دەداتە دەست هاواڵەکانی و ئەوانیش تخوونی دەکەون. حەمەد کچە نێوەنجیيەکەش درێژ دەکاو کچێنیيەکەی هەڵدەگرێ، دوایەش نۆرە دەگاتە کچە گەورەکە...

کچە گەورەکە ئاشقی حەمەد دەبێ و پێی دەڵێ ئەمن لە تۆ جیا نابمەوە، و وەدوای دەکەوێ. حەمەد پاش هەموو ئەو کارانە ڕوو دەکاتە ئاغاو پێی دەڵێ:" ئەگەر دراوەکەت نەدەی، بەڵایەك بەسەر خۆشت دێنم کە ئەمانە لە چاوی جێژنەپیرۆزە بن."

"زوڵمە، گلێنەی چاوم، نووری چاوم! زوڵم زوڵم. دێهاتییە تورکەکان مەکینەی زوڵمن..."

"... ئاغا هەرچی دارو نەداری هەبوو، زێڕ، زێو، ئەڵماس... هەمووی دەداتێ. حەمەد هەمووان وەردەگرێ و دەڵێ" خواحافیز" و دەڕوا. کچە گەورەش کە ئاشقی ئەو کافرە دەبێ بەدوای دا دەڕوا. ملی ڕێیا دەگرن، وەختێك حەمەد ئاوڕ دەداتەوە دوای خۆی دەبینێ کچەکە، کچە گەورەی ئاغا لەگەڵیان هاتوە. ئاخر ئاشقی ببوو. حەمەد تفەنگی تێدەگرێ و لێیدەدا دەیکوژێ."

" سزایەکەی دەبینێ... گلێنەی چاوم، سوڵتانەکەم! حکوومەتی کۆماریمان توانی دەرەقەتی دەوڵەتێکی گەورەو گرانی وەك یۆنان بێ، ئێستا بە تولەیەکی یاغی و ڕێگر ناوێرێ؟ ڕاوەستێ، زۆری پێناچێ کە ئەو مەکینە زوڵمانە..."

" ڕۆژێکیان حەمەد دەچێتە ماڵێك دەبینێ بێجگە لە منداڵێکی شیرەخۆرەی سەر بێشکە کەس لە ماڵ نیە. منداڵەکە لە خەودا لەگەڵ فریشتەکان یاریی دەکرد و پێدەکەنی. دەزانی ئەو کافرە چ دەکا؟ خەنجەرەکەی هەڵدەکێشێ و گۆش تا بەگۆش سەری ئەو منداڵە دەبڕێ."

" جێی باوەڕ نیە، گلێنەی هەردوو چاوم! سوپاس، چی دیکەی باس مەکە... موسیبەتە... دڵی بنیادەم هەڵیناگرێ سوڵتانی خۆم! بنیادەم جەرگی دەبرژێ. هەر لادێیی تورك دەزانێ زوڵمی وا بکا! ئەوەی عەرزتان دەکەم درۆی تێدا نیە، خەبەرێکی باوەڕپێکراوە..."

" لەگەڵ دەستەیەکی دوازدە کەسی دەچێتە دێیەکی گەورە، هەموو خەڵکی ئاوایی لە ژن و پیاوو منداڵ و پیرو لاوڕا بگرە هەتا نەخۆش و دەردەدار و گۆج و ئیفلیج لە گۆڕەپانی نێو ئاوەدانی کۆ دەکاتەوە. لە پاشان فەرمان دەدا بچن هەرچی گاسن و سەر ئاورەی هەیانە، بیان هێنن، هەموو دەچنەوە ماڵێ و گاسن و سەرئاورەکانیان دێنن. پاشان حەمەدۆکی کافر دەستوور دەدا هەرچی دار لەنێو دێدا هەیە بیان هێنن و لەنێو گۆڕەپانەکە لەسەریەکیان دانێن. خەڵکی ئاوایی ئەم کارەش دەکەن. ئەمجار فەرمان دەدا ئاگر لە دارەکان بەردەن و خەڵکی دێ ئەمەشی بە قسە دەکەن. دارەکان دەسوتێنن و تەپۆلکەیەك پرلووی سوور لە نێوەڕاستی گۆڕەپانەکە دەکەوێتە سەریەك. دوایە بە فەرمانی حەمەدۆك هەموو گاسن و سەرئاورەکان لەنێو ئاگرەکە داوێن. پاش ئەوەی گاسن و سەرئاورەکان وەك پۆلووی سووریان لێدێ فەرمان

دەدا لە ئاگرەکەیان دێننە دەر. ئەمجار دەڵێ ئێستا سەرناورەکان لە ملتان کەن و بە پێخاوسی بچنە سەر گاسنەکان. یەك دوو کەس حازر نابن ئەو کارە بکەن. دەسبەجێ بە گوللە لێیان دەدا و لەشی نیوەگیانیان لەنێو ئاگرەکە داوێ. دنیا پڕ دەبێ لە جزەجزو بۆنی ڕۆنی سووتاو. دێهاتی‌یەکان بە دیتنی ئەو دیمەنە دەسبەجێ سەرناورەکان لە ملیان دەکەن و بە پێخواسی دەچنە سەر گاسنەکان. دێ پڕدەبێ لە جزەجزو بۆنی گۆشتی سووتاو. چەند حەوتوو پاش ئەو بەسەرهاتە، هێشتا ئاوایی بۆنی گۆشتی سووتاوی بنیادەمی لێ‌دەهات."

"ئەمانەی باسیان دەکەن جێی باوەڕ نین، ناکرێ پیاو باوەڕ بکا گلێنەی هەردوو چاوم، سوڵتانەکەم! بۆ باوەڕ پێ‌کردن نابن، بەڵام سەرچاوەی خەبەرەکە جێی باوەڕە ئاغای من! زوڵمە، زوڵم... لادێیی تورك مەکینەی زوڵمە... بەڵام شتی وا لەم شارۆچکەیە روو دەدا پیاو ناتوانێ باوەڕی پێ‌بکا. زوڵمە، زوڵم..."

قایمقام و دەنگۆسازان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر زەینی خەڵکیان دەرهەقی حەمەدۆك بەلاڕێ دا دەبردو بە هاوکاریی یەکتر ئەفسانەی وا سامناکیان لەبارەی حەمەدۆکەوە ساز دەکرد کە نە ئەقڵ قبووڵی دەکرد و نە بە فکری بنیادەم دا دەهات. ئەو ئەفسانانەیان ئەوەندە بڵاو کردەوە هەتا هەموو شارەکانی دەوروبەرو تەنانەت ئەدەنەو ئەنکەرەش پێیان زانی. بەڵام ئەم ئەفسانە سازکراوانە کاریان نەدەکردە سەر دانیشتووانی چوکووراواو ئاناوارزا. دێهاتی‌یەکان بەم گوێیە دەیان بیست و لەو گوێیەیان دەچووەدەر. ئەم جووتیارانەی دەچوونە شار وەختێك گوێیان لەو ئەفسانە دەستکردانە دەبوو بێ‌ئەوەی بیروڕای خۆیان دەربڕن دەیان گوت:"زۆر سەیرە" و لە دڵی خۆیان دا گاڵتەیان بە خەڵکی شار دەهات و بە خۆشحاڵی لە دڵی خۆیان دا دەیان گوت:"ئەم هەتیوە شێتەی ئێمە زراوی ئەو بێ‌ناموسانەی بردوە."

خەڵکی شار وەختێك دەیانەویست باسی قەڵافەتی حەمەدۆك بکەن دەیان گوت:"ناوی حەمەدۆکە. بەڵام کابرایەکی زەبەللاحە بەقەد غوولی بیابان، قەڵەو و ئەستوورە وەك بەراز، زۆریش ناشیرنە، چاوەکانی خواروخێچ و دەرپەڕیون، بنیادەمی وا ناحەز نە تا ئێستا هاتوەتە سەر دنیاو نە قەتیش دەبێتەوە. دەستێکی پێوەن وەختێك بە پێوە ڕادەوەستێ، سەرە قامکی لەزەوی دەدرێن. لووتی بەری زاری گرتوە، چاوی دەڵێی دوو پیاڵە خوێنن. دوو چاوی پێوەن حیزو داقەڵشیو."

لەبارەی قەڵافەتی حەمەدۆکەوە لە هەمووان زیاتر خێزانی عەلی‌سەفابەگ قسەی بۆ خەڵك دەکرد. لە کەڵەباب خوێندنانەوە تا ئێوارێ ماڵ بە ماڵی شار دەگەڕا. لەبارەی قەڵافەتی حەمەدۆکەوە هەزار جۆرە قسەی دەکرد.

ترس و سامێکی بێئەنداز لە حەمەدۆك بەسەر ئەو شارۆچکە نیوە وێران و تاریك و لە قوڕ دا چەقیوەدا، کە کووچەو کۆڵانەکانی بۆپەینیان لێدەهات و چڵك و چەپەڵیان پێدا دەڕۆیشت، باریبوو. ئەم شارۆچکەیە کە وەك مردوو دەهاتە بەرچاو، ببوو بە هێلانەی پاشملەدووان و تۆمەت لێدان و هەمبانەی فێڵ و تەڵەکەو سیحرو جادوو. هەمووان ئاگایان لە چووکترین نهێنیەیەکانی یەکتر هەبوو، و هیچ کەس لە چووکترین خەتاو هەڵخلیسکانی کەسێکی دیکە خۆش نەدەبوو. ڕۆژێ هەزاران قسەی پاشملەو پڕوپووچیان هەڵدەبەست. کەس نەبوو مردووی قسەی پڕوپووچ و پاشملەدووان نەبێ و کەس نەبوو بۆ ترساندنی کەسانی دیکە پەنا بۆ تۆمەت و بوختان نەبا. لەم شارۆچکەیە وەستاو و دڵتەنگەدا هەرکەس چاڵی بۆ یەکێکی دیکە هەڵدەکەندو کەس چارەی کەسی نەدەویست.

ئەگەر ڕووداو و پێشهاتەکانی یاغیگەری و ڕێگری نەبوونایە خەڵکی ئەم شارە چووکەڵە لە دڵتەنگیەیان دەتەقین. بەنێو شاری وەردەبوون و یەکتریان لەنێو زەلکاوە پڕ لە چڵك و چەپەڵەکان دا دەخنکاند. فکری ئەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەموو ئەو یاغیەیانە دەکوژرێن و تەواو دەبن، ئەوانی شێت دەکرد. چونکە بەسەرهاتی یاغیەیەکان نوقڵی مەجلیسان بوو. لەبارەی وانەوە زۆر بە ئیشتیاوە باسیان دەکرد، پێکەوە دەدوان و قسەی پڕوپووچیان هەڵدەبەست. هەموو ڕۆژێ لەنێو شاری کۆدەبوونەوەو بە ترس و تامەزرۆییەیەوە باسی یاغیەیەکانیان دەکردو بە بەدگۆیی و پاشەملە دووان وەختی خۆیان بەسەر دەبرد. پیاوانی شار لە قسەی پڕوپووچ و پاشەملەدووان دا دەستێکی باڵایان هەبوو. بەڵام ژنەکان لە پاشەملەدووان و قسەی پڕوپووچ دا دەستی پیاوەکانیان لە تەختە بەستبوو. لەحزەیەك دەمیان لە کالان نەدەکەوت و هەمیشە چەنەگەیان بۆ قسەی پڕوپووچ دەبزووت. لە باسی یاغیەیەکان دا قسەکەرو سەردەستەی پیاوانی دەنگۆساز عەلیسەفابەگ و دەمەوەری نێو ژنانیش، ژنی عەلیسەفابەگ بوو. ئەمە داستانێکە کە خێزانی عەلی سەفابەگ لەبارەی حەمەدۆکەوە سازی کردبوو:

"ڕۆژێکیان منداڵە دێهاتیەیەکی زەبەللاح و ناقۆڵا لە چیارا دێتە ئاوەدانی و دەچێتە لای ئاغا. ئاغا لێی دەپرسێ:"هاتووی کارت بدەمێ؟" ئەو دەڵێ:"نا، هاتووم ببمە چەتەی تۆ. هەر ئاغایەك چەتەیەکی لەو کێوانە هەیە، تەنانەت هێندێ چەتە هەن کە کار بۆ حکوومەت دەکەن، ئەمنیش هاتووم ببمە چەتەی تۆ. هەرچی بڵێی بە قسەت دەکەم، هەرکەس بڵێی بۆت دەکوژم". سەفابەگ پێی دەڵێ ئەم فکرە لە کەللەت بەرە دەرێ، مل و مل ئەستووری، لاوێکی وەك دێو. وەرە لە مەزراکەی من دا کار بکە. بەڵام لاوەکە ئەو پێشنیارە ڕەت دەکاتەوەو

هەردوو لاقی دەکاتە کەوشێك کە:"ئەگەر قبووڵ بکەی چەتەییت بۆ دەکەم". ئاغاش پێی دەڵێ کە ئەمن پێویستیم بە چەتەو مەتە نیە. ئەمن یەکێك لەو کەسانەم کە ئەم کۆمارەیان دامەزراندوە، ئەمن دژی ئەم کۆمارە چەتەو یاغی راناگرم. دێهاتێیە زەبەللاحەکە بە قەد دێوێك دەبوو، پشتی کۆپارەی هەبوو، زۆریش ناشیرن بوو. عەرزی بە خزمەت دەکەم خواحافیزی لە ئاغا دەکاو دەڕوا. دوو رۆژ دواتر دیسان دێتەوە لای ئاغاو پێی دەڵێ:"پەژیوان دەبیەوە، لە ئەنگێوەیی دا کەس نام گاتێ، پووڵە سوورکە لە هەوادا دەنگێوم. هەرکەسە لەو کێوانە چەتەیەکی هەیە، ئەمنیش دەبمە چەتەی تۆ. هەرکەس بەگۆت دا بێ، دەیکوژم، تفەنگێکم بدە دەست و لەو کێوانە بەرەڵڵام بکە بزانە چ ئاگرێك دەکەمەوە..." ئاغا قبووڵی ناکا. مانگێکی رەبەق هەموو رۆژێ جارێك هات، بەڵام دیسان ئاغامان قبووڵی نەکرد. ئەویش رقی لە عەلی سەفابەگ داگرت و رۆیشت. خوا روحمی کرد عەلی سەفابەگ پێشنیاری وی قبووڵ نەکرد. چونکە سەرەنجامی عەبدیخانمان، کە ئەوی کردە چەتەی خۆی، بە چاوی خۆمان دیت. کابرا وەختێك لە ئاغای خۆمان تەمابڕاو دەبێ دەچێتە کێوپارە بۆ لای عەبدیخان. عەبدیخان پیاوێکی ساویلکە بوو. دەڵێ باشە قبووڵمە. بەکرێت دەگرم. ئەتۆش برۆ قورس و قایم لەو کێوانە بگەڕێ، هەر رەعیەتێکت دی بە دژی من قسە دەکا لێی دەو بیکوژە. چەند تفەنگی تازەو فیشەکێکی زۆریشی دەداتێ. ئەو دێهاتییەش وەکێوان دەکەوێ، ناوو ناوبانگێك پەیدا دەکاو دەبێتە حەمەدۆك. وەختێك دەبێتە حەمەدۆك دەچێتە گوندەکان و بە رەعیەتەکان دەڵێ، هەرکەس دژی عەبدیخان قسە نەکاو جنێو بە ژنەکەی نەداو قسەی خراپی پێ نەڵێ، دەیکوژم. دێهاتییەکانیش دەسبەجێ دەست دەکەن بە جنێودان و قسەی کاڵ گوتن بە عەبدیخان. ئەدی گیانە دانی بدە بە قشقەڵەو پەرەوازەی بکە بۆ ئەوەی چاوت هەڵکۆڵێ. لادێییەکان بە مەرجێك دەیان توانی بە سلامەتی بە لای حەمەدۆك دا تێپەڕن کە لەگەڵ دیتنی ئەو لە دوورەوە جنێو بە عەبدیخان بدەن. ئەدی خۆشەویستەکەم! سەگی قەڵەو بکە بۆ ئەوەی لاقت بگرێ. لەکێوپارەی، لە ترسی حەمەدۆك کاتێك دێهاتییەکان یەکتریان دەدی، لە جیاتی سلاو جنێویان بە عەبدیخان دەدا. عەبدیخان وەلامی بۆ حەمەدۆك ناردبوو کە دەست لەم کارانە هەڵبگرێ. حەمەدۆك بەو پەیامە تووڕە دەبێ و هێرش دەکاتە سەر ماڵی عەبدیخان و دەیداتە بەر دەسرێژ. عەبدیخان دوو ژنی هەبوون، هەردوو ژنەکە لە ژوورێك دەکاو سەگبابی زەبەللاح وەسەر هەردووکیان دەپەڕێ. سەگبابی زەبەللاح هەردوو ژنەکە لە پەنای یەکتر درێژ دەکاو هەتا بەیانی بە نۆرە لەگەڵیان رادەبوێرێ.

عەبدیخان لە دەرفەتێکی لەبار کەڵك وەردەگرێ و دێتە ماڵی ئێمە. بەستەزمانە وەك مێژۆکە دەلەرزی. سەفابەگ حەوتوویەك لە ماڵێ لە لای خۆی رایگرت. رۆژێکیان بیستم کە حەمەدۆك بە دوای عەبدیخان دا دەگەڕێ. گوتم دەغیلت بم، تەسلیمی بکە، ئەگینا لەوانەیە ئەو زەبەللاحە هێرش بکاتە سەر ماڵەکەی خۆشمان.

ئاغا خانوویەکی لە نیزیك مەخفەر بۆ عەبدیخان دۆزیەوە، راستە ئەو کارەی کرد، بەڵام سەرەنجام نەیتوانی نەجاتی بدا. پاشماوەکەی هەمووتان دەیزانن کە شەوێکیان حەمەدۆك پەلاماری بردە سەر ماڵەکەی و هەر چاوەی گوللەیەکی لیدا. ئاغامان هەمیشە دەڵێ زۆرم ناقڵەتی کرد کە نەم کردە چەتەی خۆم. ئەو دوژمنی شارستانەتی و مرۆڤایەتییە. ئەگەر زەوییەکانم لە رەعیەتەکانی وایوای پاك بکەمەوە بۆ نموونەش چەتەیەك بەو کێوانەوە نامێنێ... تەنانەت یەغموراغاش. ئەویش لە تەویلەی دەکەم."

ژنە قەڵەوەکەی عەلی سەفابەگ ئەم داستانەی هەر جارە بە رەنگ و بۆنێك دەگێڕایەوەو کاتی گێڕانەوەی سەر کولمە سوورەکانی زیاتر دادەگیرسان، و بە راوێژێکی تێکەڵ بە گریان موو بە موو باسی دەکرد کە چۆن حەمەدۆك لە چوکووراوا دێ بە دێ بە دوای عەبدیخان دا گەڕاو چۆن ئەو پیرەپیاوە بەستەزمانە لە ترسانی ماڵەوماڵ گەڕاو پەنای بۆ ئەم لاو ئەولا برد. لەگەڵ قسەکردن جاروباریش خۆی پێ راگیر نەدەکراو فرمێسکی هەڵدەوەراندن، هەمیشەش داستانەکەی بەم رستەیە تەواو دەکرد:

"ئەویش هەقی خۆی بوو. ئاخر کێ پێی گوتی چەتەیەکی وا زەبەللاح، دێوێکی وا خوێن خۆر بە کرێ بگرە؟ ئاغای خۆمان کە نازاترین پیاوی دنیایە، نەیوێرابوو بیکا بە چەتەی خۆی. هەقی خۆی بوو. عەبدیخان هەقی خۆی بوو، هەم سەری خۆی خواردو هەم ئەو لاوەی لە گیانی خەڵك بەردا."

لەچیاکانەوە دەنگ و باسی سەیرو سەمەرە دەگەیشتنە شار:"جەندرمەکان هەموو رۆژێ سێ جار گەمارۆی حەمەدۆك دەدەن و هەموو جارێ وەك مار لە ئەڵقەی گەمارۆیەکە دەرباز دەبێ و وەك باڵندە هەڵدەفڕێ و دەڕوا." یان "هەر جەندرمەیەك و هەر کەسێك چاوی پێی دەکەوت لە ترسان لێوی دەقەڵشین و توانای نەدەما کە پەلەپیتکەی تفەنگەکەی بچرکێنێ. چاوێکی هەبوون وەختێك تەماشای کەسێکی دەکرد، کابرا لە جێی خۆی وشك دەبوو. هەر کەس چاوی پێی دەکەوت لە ترسان زراوی دەتەقی. جەندرمە بەستەزمانەکان لە ترسان جۆرێك دەستیان دەلەرزین کە تفەنگیان پێ نەدەتەقی..."

"شەوێکیان چووبووە سەر قایەقام، دەستی دە تێن تینوکەی نابوو و پێی گوتبوو:"ئەمن حەمەدۆکم، سەر مەخە سەر سەری من، دەمەوێ هەرچی خان و ئاغا لە چوکورراوا هەیە لە ریشەی دەربێنم." قایەقامیش بەڵێنی دابوو کە ئیدی لە کۆڵی بێتەوە. هەر بۆیە قایەقام..."

"حەمەد دایکی و خەجیجی ژنی و منداڵەکەی بە دەستی خۆی کوشتبوون هەتا وەدەستی جەندرمەکان نەکەون. دەڵێن بابیشی هەر بۆخۆی کوشتوویە. رەنگە درۆش بێ. چونکە دەڵێن بابی پێشتر مردوەو حەمەدۆك بە هەتیوی گەورە بووە. برایەکی هەیە لە ترسانی شار بە شارو ناوچە بە ناوچە رادەکا. ئەگەر وەدەستی کەوێ ئەویش دەکوژێ..."

یان "لە قەڵای بوویی دا بۆسەی دانابوو. هەرکەس بەو رێگایەدا رادەبورد ئەگەر ژن بایە دەستدرێژیی بە ناموسی دەکردو ئەگەر پیاو بایە دەستی راستی دەبڕی. وەڵامی بۆ مستەفا کەمال پاشا ناردبوو کە کارت بە کاری من نەبێ، ئەو خان و ئاغایانەی ئەتۆ دەرەقەتیان نەهاتی، ئەمن یەك بە یەك مشووریان دەخۆم. سەری دەرەبەگەکان دەبڕم، دەیان خەمە واگۆنێکی شەمەنندەفەرو بۆتی دەنێرم. مستەفا کەمال پاشاش وازی لێ‌دێنێ.

مستەفا کەمال پاشاش پەیامێکی بۆ ناردبوو کە:"کەس کاری بە کارت نیە. فەرمانڕەوایی چوکووراوای پیرو چیا بەرزەکانی تووڕووس بەخۆتە."

"براله! ئێمە دەبێ خۆمان لە فکری چارەسەردا بین، خۆمان."

هێندێ جار هومێدیان لێ‌پەیدا دەبوو، هێندێ جار ناهومێد دەبوون. جارێك دەترسان و جارێك وەغیرەت دەکەوتن. لەبەر دڵتەنگی خەریك بوو دیق بکەن و وەقسە دەهاتن. بێ‌ئەندازە تامەزرۆی ئەو ئەفسانە پووچ و بێ‌بناخانە بوون کە لەبارەی حەمەدۆکەوە ساز دەکران.

ئەگەر رۆژێك رۆژگارێك لە رۆژێکی ئاوا بارانەدا تەرمی حەمەدۆکیان لەسەر پشتی ئەسپێکی رووت هێنابایەوە شارۆچکەکەیان نەیان دەزانی دەبێ چ بکەن، خۆشحاڵ بن و پێ‌بکەنن یان بگریەن؟

باران دەباری، زەوی هەڵمی لێ‌هەڵدەستا، ئاوێکی لێڵ لە ئاسمانی چوکووراواوە بەرەو دەریای مەڕمەڕە لە فڕین دا بوو. بریسکەی دەدا، هەورە تریشقە دەیگرماندو ئاسمان کەم کەمە دەکرایەوە. تەرمی خەمگین و بێ‌کەسی یاغیەکان لە حەوشەی جەندرمەدا لە پەنای بەردێکی مەڕمەڕی سپی لەبەر بارانی بەردەوام تەڕ دەبوو.

باران دەباری و ئاسمان دەبوو بە ساو.

## (٣٢)

پاش ئەوەی قایمەقام هاتە وایوای و ڕۆیشتەوە هیچ پێشهاتێك ڕووی نەدا. عەلی سەفابەگ دوو جار بە سواری ئەسپ لە کاتێك دا تەماشای ڕاست و چەپی خۆی دەکردو هەرکەسی لەسەر ڕێی خۆی دیبایە تێیەوە رادەما، هات و بەنێو ئاوەدانی دا تێپەڕی. پاش هاتنی قایمەقام خەڵکی ئاوایی ترسیان ڕێ نیشت. ئەم ترسە جارێك کەم دەبوو، جارێك زیادی دەکردو جارێك لە توندو تیژی دەکەوت. هەموو ڕۆژێ چاوەڕوان بوون عەلی سەفابەگ کارەساتێك بقەومێنێ و کاتێك هیچ ڕووی نەدەدا هەستیان بە بۆشاییەك دەکرد.

لەو جەرگەیەدا بوو کە ئیدریس بەگ لەگەڵ دوو سواران هاتە ئاوەدانی و لەبەر دەرگای وەسمانەزلە دابەزی، و پاش ئەوەی ئۆگرییەکی زۆری دەرهەقی وەسمانەزلە نیشان داو ئافەریی پێ گوت، تاریفی راوەستانی وی بەرامبەر بە عەلی سەفابەگی کردو گوتی:

"ئێمە نەمان توانی لە ڕووی عارف صائم بەگ دا ڕاوەستین. خۆمان فرۆشت و ئاخرەکەشی تووشی ئەم ڕۆژە هاتین. ئاوا ئاوارەی کێو و بەندەنان بووین."

قسەی دەکردو هەناسەی هەڵدەکێشا. سیمای لەبەر دڵانی تێك تەپیبوو و چاوەکانی دەقووڵ کەوتبوون:

"بەڵام ئێمەش بڕیارمان داوە هێندێك کار بکەین. وەڵامم بۆ عارف صائم بەگ نارد گوتم دەست لە زەوییەکانی من نەدا. ئەم بەرنامەی بیست و چوار ساڵ زیندانە بۆخۆت دروستت کرد. قەباڵەی قەرزە سەدو پەنجا هەزار لیرەییەکەی منت چۆن دروست کرد، ئاواش هەڵی وەشێنەوە. ئەمن چاوەڕوانم. ئەگینا دوایە هەرچی بەسەرت هات هۆباڵی خۆت بەستۆی خۆت. ئەم قسانەم بە هەموو کەس گوتوەو دیسانیش ئەم وەڵامەی هەر بۆ دەنێرم. ئەگەر ئەقڵی

نەهاتەوە کەللەی بە زمانێکی دیکە تێی دەگەیەنم. مام عەلیەیە کوردە دەڵێ عارف صائم بەگ خەریکە بیری لێدەکاتەوە. مەسەلەکەشی زۆر بە جیددی گرتوە. ئەمن حەوسەلەم زۆرە، ئێوەش حەوسەلەتان هەبێ."

ئەو ئاوماڵانەی زانیبوویان ئیدرس بەگ هاتوەتە ماڵی وەسمانەزلە، روویان کردە ماڵێ. سەیفەلی، سەفچەکاهیاو، مەلافەرهادیش هاتبوون.

ئیدریس بەگ بە دیتنی دێهاتیەیەکان چاوی پڕ بوون لە فرمێسک، خۆی پێ رانەگیراو دەستی بە قسە کرد:

"ئێرەیی‌تان پێ دەبەم. عەلی سەفا زوڵمتان لێدەکا، زۆر زیاتر لەو زوڵمە کە عارف صائم بەگ لە ئێمەی دەکا. یەك بە یەك زەوییەکانمان دا بە عارف صائم بە ئەسپ. لە ترسان فرۆشتمانن. هێندێك کەس وەك خۆم یاغی بوون و ژمارەیەکی دیکەش زەوییەکانیان فرۆشتن و ئێستاش ئاوارەی چیاکانین. ئافەریمتان بۆ دەنێرم، ئێوە لە پێشی راوەستان. دارێك هەرچەندیش ئەستوور و ساغ و بەقەوەت بێ، ئەگەر لە زەوی بێنیە دەر وشك دەبێ. ئێمەیان لە زەوییەکانمان دەرکرد، ئێمەش وەك دار خەریکە وشك دەبین و لەنێو دەچین."

دێهاتیەیەکان لەو قسە شیرن ودڵگرانەی ئیدریس بەگ و لە چاوەکانی کە وەك چاوی گاکێوی جوان و زەلام بوون و لە قامکە شووش و باریك و درێژەکانی سەریان سوڕمابوو. کاتێك ئەو بەسواری ئەسپ گوندەکەی بەجێ دەهێشت وەك ئەوەی شتێك لە دڵی دێنشینەکان بێننەدەر، تووشی هەستێکی بە ئێش و ئازار هاتن. دەیان زانی ئیدریس بەگ دوارۆژێکی باشی نابێ بەتایبەتی لەبەر ئەوە کە بەشی زۆری بە سواری ئەسپ لەو دەشتەدا دەگەڕا. دوور نەبوو هەر لەم رۆژانەدا وەك کەوێ راوی بکەن.

ئیدریس بەگ تاوێك دوای ئەوەی لە دێهاتیەیەکان جیا بووەوە سەرلەنوێ گەڕایەوەو لە ئەسپەکەی دابەزی. بن پیلی وەسمانەزلەی گرت و گوتی:

"مام وەسمان وەرە نەختێك هەتا دەرەوەی ئاوەدانی پێکەوە پیاسە بکەین."

کاتێك لە ئاوایی وەدەرکەوتن، پرسی:

"مام وەسمان دەزانی ئەمن بۆچی هاتبوومە ئێرە؟ بە منیان گوت کە حەمەدۆك هاتوەتە ئێرەو لە ماڵێ تۆیە. هاتم بیبینم. دیتنی وی بە قازانجی هەردووکمانە."

وەسمانەزلە بیری لەوە دەکردەوە کە چ وەڵامێکی بداتەوە. لە دڵی خۆیدا دەی گوت:"ئێستا کە ئاوماڵەکان خەبەری هاتنی حەمەدۆکیان پێداوە، دەبێ پیاوێکی باش و جێگای متمانە بێ." کەوابێ دەبێ هەموو بەسەرهاتەکەی بۆ باس بکا.

لەبن دارێك دانیشتن و وەسمانەزلە لە سیرێ هەتا پیوازێ هەموو شتێکی بۆ ئیدریس بەگ گێڕایەوە.

ئیدریس بەگ وەختێك دەستی وی ماچ کردو خەریك بوو لێی دوور کەوێتەوە گوتی:"مام وەسمان هیچ خەفەت مەخۆ. ئەمن ئەوت بۆ دەبینمەوە." ئەمجار سواری ئەسپەکەی بوو و بەرەو دەشت پێی پێوەنا.

دەسبەجێ دوای رۆیشتنی ئیدریس بەگ جەندرمە رژانە نێو ئاوایی و هەر کە زانیان ماوەیەکی کەمە ئیدریس بەگ لە دێی وەدەر کەوتوە، بێ ماتڵ بوون وەدوای کەوتن.

دوو رۆژ دواتر خەبەر هات کە لەقەڵای ئاناوارزا شەڕێك لەنێوان ئیدریس بەگ و جەندرمەکان دا رووی داوە. شەڕەکە زۆر بەردرێژ ببوو. ئیدریس بەگ هێندە ئازایانەو دلێرانەو بێپەروا شەڕی کردبوو کە جەندرمەکان تێك شکابوون. ئەمجار بۆخۆشی لای نیوەڕۆیە بە سواری ئەسپ لەوێ دوور کەوتبووەوە.

پاییز داهات. گەرمای هەتاو کەمی کرد. ئاوەکانی ئاکچاساز کەوتنە قوڵتەقوڵت و هەڵقوڵین. سەدان گێژەڵووکە بە تەندوورەزەنە وەك دێوی نێو ئەفسانەکان لە بیابان دا دەستیان کرد بە سووڕان.

سەر گۆلاوەکەو ئاسمانی ئاکچاساز پڕ بوون لە لەك لەك و ماسیخۆرکەو شانەبەسەرەو کۆتری کێوی و هەزاران باڵندەی کۆچەری. هەورەکان لە دوور، لە جنووب لەسەر دەریای مەرمەرە پەڵەپەڵە کەوتنە سەر یەك. رەشەبا هەڵی کرد. دەستە دەستە بەرازی کێوی قەڵەو و زەلام لە کێوەکانەوە شۆڕ بوونەوە پێدەشتەکان بە بڕە درێژو بەهێزەکانیان خاکی گەرمی ئەو دەشتەیان کێڵا. کوللەکان گەورەتر بوون. خاك، گیاوگۆڵ، باڵندەکان، جڕوجانەوەرو هەموو شتێك دەستیان بە زەووزۆیەکی بێبڕانەوە کرد. خاکی ئاناوارزا زیاتر گیانی هاتە بەرو زیندووتر بوو، کەوتە جۆش و خرۆش و هەموو شتێك دوو هێندەو سێ هێندە زیاتر بوو" جاڵجاڵووکەکان، داوی جاڵجاڵووکەکان، مێشەنگوینەکان، خەلێفی مێشەنگوینەکان زیاترو چەند هێندە بوون و خاکی ئاناوازرا لە جموجۆڵ و جۆشانی ژیانێکی نوێ دا کەوتە گرم و هۆڕ.

ئەو ساڵە بەرهەمی کێڵگەکانی ئاناوارزا زۆرو زەوەند بوو. گەنمەکان باڵاپیاوێك زیاتر هەستان، لە زۆربەی کێڵگەکان دا گەنمەکان لەبەر دانی زۆر کەوتن. شووتییەکان ئەوەندە گەورە بوون کە پێش ئەو ساڵە وێنەیان نەبینرابوو. کاڵەکە زەردو درشت و گەیوەکان لەبەر گەرما بۆنی شیرنی هەنگوینیان لێهەڵدەستا. تەنانەت ئەو کەسانەی زۆر دووریش بە پەنای بێستانی

کاڵەك دا تێدەپەڕین بۆنی قورسی کاڵەکیان دەکرد کە لە هەواو خاك دا بڵاو ببووەوەو ماوەیەکی تەواو بە ئیشتیا بۆنیان بە هەواوە دەکرد. پەپوولە سپیەو درشتە پاییزییەکان وەك باڵندە بە ئاسمان دا دەفڕین. مێرووله درشت و ڕەش و تیرو بریقەدارەکان دەستە دەستە خەریکی گەنم کێشانەوە بوون. بەڵام دەنکە گەنمەکان هێندە گەورە بوون کە بە چەند مێرووله دەنکە گەنمێکیان هەڵدەگرت، ئەویش بە زەحمەت. کەلاکی جانەوەرێکی پێست ڕەق و نەخشینیشیان بە حەوت هەشت مێرووله بەسەر زەوی دا رادەکێشا. داوی جاڵجاڵۆوکەکان لە مێش و مەگەز دا ون ببوو. جاڵجاڵۆوکە قەڵەوو زگ زلەکان خۆیان خزاندبووە سووچێك و لەسەر ئەو سفرە لە بڕان نەهاتووە چووبوونە خەوی هەزم کردنەوە. سفرەی جاڵجاڵۆوکە خەوتووەکان بەردەوام مێش و مەگەزی دادەباریە سەرو داوی جاڵجاڵۆوکەکان ڕۆژ بە ڕۆژ قورستر دەبوو، مێشەکان وەك میوەی گەیشتووی سەر لکە دارەکان بە خوارەوە هەڵواسرابوون و هێندێ جار داوەکان ئەوەندە قورس دەبوون کە نێویەندەکەیان بادەدراو دەدڕا. ئەو جاڵجاڵۆوکانەی داوەکەیان لەبەر بەرەکەت و قورسی دەدڕا، خێراو بە تەقەلایەکی سەرسوڕهێنەر دووبارە دەیان تەنیەوەو بە دیتنی ئەو دارە پڕ لە خۆراکانە دووبارە خەوێکی قووڵیان لێدەکەوتەوە.

لکە دارەکان قورسایی هێلانەی مێشەنگوینەکانیان بۆ هەڵنەدەگیرا. لەنێو زییەڵێن و لە نێو زەوییە باتلاغییەکانی ئاکچاساز سەدان لکەدار کە مێشیان تێدا بوو، کەوتبوونە سەر زەوی و گەندەڵ دەبوون. لەنێو ئەو کلۆرە دارانەدا بەمیلیۆن مێشەنگوینە کەوتبوونە سەر یەك، باڵە تڕووسکەدارەکانیان لەسەر پشت خەواندبوو و بە تەمبەڵی وەنەوزیان دەدا.

وەسمانەزلە بەدەم دروێنەی گەنمی ڕەش و ڕەقی چوکووراواوە کە گوڵە پڕ دانەکانی شۆڕ ببوونەوە سەر زەوی، دەیگوت:"ئەی ماشەڵڵا"و دەسکە سواڵەی بەرز دەکردەوەو هاواری دەکرد:"ئەی ماشەڵڵا، لەخوای بەزیاد بێ، ئەمساڵ دەشت و دەر پڕ دەبێ لە گەنم، بە قوربانی خوایەکەی بم..."

وەسمانەزلە دڵی زۆر خۆش بوو، و تووشی هەر کەسێك و هەر شتێکیش بووایە، باڵدارو پێڕۆ، مارو دووپشك و ئادەمیزاد ئەو دڵخۆشییەی پێ دەدا. دەتوانین بڵێین سەرانسەری گوندی وایوایش لە گەرمایی شادمانییەکی لەو بابەتەدا دەژیا.

هەرچەند ژمارەیەکی زۆر تووشی مالاریا ببوون، و دەستە دەستە مێشوولەیەکی زۆرو بێئەژمار وەك پەڵە هەور لەگۆلاوەکە دەهات بۆ ئاوایی و شەوانە هیچ کەس بە ئاسوودەیی نەدەخەوت، بەڵام دێهاتییەکان ڕۆژ لە ڕۆژ خۆشحاڵ تر دەبوون و دێیەکە ڕەنگی شایی و زەماوەندی بەخۆیەوە دەگرت. دێهاتییەکان بە دەماغ و پڕ تەقەلاو دڵ پڕ هیوا، دەغڵەکانیان

دەدروونەوەو خەرمانیان دروست دەکرد. لەمێژ بوو رۆژگاری رەشی رابردوو، دزرانی ئەسپەکانیان، گوللەبارانی شەوانەی ئاوەدانی و رەفتاری ناشیرنی قایمەقامیان لەبیر چووبووەوە. بۆ جەنجەڕ پێویستی‌یان بە ئەسپ هەبوو. تەنانەت ئەوەشیان لەبیر نەبوو کە ئەمساڵ جەنجەڕەکانیان بە چی وەگەڕ بخەن.

عەلی سەفابەگیش لە خۆشیی بەرەکەت و زۆروزەوەندیی بەرهەمی ئەمساڵ خەریك بوو شێت بێ. لەو نێوەدا تەنیا ئەو بوو کە دەی‌ڕوانیە ئەو خاکە پڕ پیت و بەرەکەتەو ددانی لە چیرەوە دەبردن و مستی راست دەکردەوەو دەی‌گوت:"ئاخ تووتکە سەگینە! ئا...خ لادێی‌یە توخمەسەگینە، راوەستن تا پێتان نیشان بدەم."

خەبەرێك کە ئیدریس بەگ دابووی راست بوو. دیسان سەروکەللەی حەمەدۆك لە چیاکان پەیدا ببووەوە. هەموو رۆژێ لە چیاکانەوە دەنگوباسی تازە لەبارەی حەمەدۆکەوە دەهات، و ئەم دەنگوباسەش[؟] دەسبەجێ و خێرا لە دێهاتی کووزانەوە دەچووە دێهاتی جەیهان و لە جەیهانەوە دەچوو بۆ دێهاتی عوسمانیەو قەدیرلی و لەوێ ڕا دەگەیشتە "بوولاتك باخچە".

لە وایوای دەربارەی حەمەدۆك و هەروەها خان و ئاغاو جەندرمەکان گۆرانیی خۆماڵی‌یان ساز دەکردن کە مەزرا بە مەزراو زار بە زار دەگەڕان. ئەو گۆرانی‌یانەی لەبارەی حەمەدۆکەوە ساز دەکران گەرم و پڕ لە ئافەرین بوون و ئەوانەی بۆ خان و ئاغاو جەندرمەکان ساز دەکران تێکەڵ بە گاڵتەو گەپ و خۆهەڵکێشان بوون...

لە دەشتێ ئەفسانەی جۆراوجۆریش لەبارەی چیاکانەوە بڵاو دەبوونەوە، ئەفسانەی جۆربەجۆرو باوەڕ پێ‌نەکراو کە لەگەڵ ئەقڵ و لێکدانەوە رێك نەدەکەوتن:"عەرزو عاسمان پڕ لە جەندرمە بوو، دەستە دەستە رژابوونە دێهات و کوێستانەکانی تووڕووس. کون بە کون و بەرداو بەرد بە دوای حەمەدۆك دا دەگەڕان. بە هەزار دەردی‌سەر لە جێگایەك ئابلووقەیان دەداو حەمەد لە نێوان ئەو دیوارە بنیادەمەی بە دەوری دا کێشرابوو، ناهومێدو بێ‌داڵدە دەمایەوە، بەڵام هەموو جارێ ئەو دیوارەی دەبڕی و خۆی نەجات دەدا."

رۆژێکیان بەیانی خەبەر دەهات کە حەمەد لە جێگایەکی وەك "ئاواراسن" یان "ساورروون گزی"[؟] یان "بابی کیل" یان "قزڵجەداغ" گەمارۆ دراوە. جووتیارانی ئاناوارزا بە دڵەکوتەوە دەست لە کار دەکێشنەوەو چاوەڕێن. نان و خەوو خواردنیان لەبیر چووەتەوەو هەر چاوەڕوانی خەبەرن. هەرچەند دەزانن خەبەری سەرکەوتنی حەمەدیان پێ‌دەگا، بەڵام بەو حاڵەش خەو لە چاویان ناکەوێ.

کەس نەیدەزانی خەبەری ئابلووقە درانی حەمەد کێ دەیهێنێ و کێ بڵاوی دەکاتەوەو پاشان خەبەری دەربازبوونی چۆن و بە هۆی کێوە دەگاو لە چوکووراوادا بڵاو دەبێتەوە. خەلکەکە هەردوو خەبەریان بە پاکی و دڵسافییەوە وەردەگرت.

کەس تێنەدەگەیشت دەنگوباسی حەمەد کام سەفەری و کام ڕێبوار، کام منداڵ و کامە ژن گێڕاویەتەوە، یان لە کوێ ڕا هاتوە. لە جێ دا هەر بە فکریان دا نەدەهات لەو بارەیەوە بکۆڵنەوە. گرنگ ئەوەبوو لە جێیەکەوە خەبەرێك بێ، ئێستا لە هەر سەرچاوەیەك و بە هەر جۆرێك دەبێ با ببێ، کەس ئەمەی پێ گرنگ نەبوو. گرنگ ئەوەبوو گوند لە دەنگوباسی حەمەدۆك بەتاڵ نەبێ. ئێستا ئەم خەبەرە چ جۆرە خەبەرێکە، گرنگ نەبوو. بۆ وێنە:

حەمەد خەریك بوو لە چیایەك وەسەر دەکەوت. جەندرمەکان بە دوایەوە بوون. ژمارەیان یەکجار زۆر بوو... لەبەر جەندرمە دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە سەر زەوی. ژمارەیەك خەلکی دێهاتیشیان لەگەڵ بوون، ژمارەیەك دێهاتی کەرو نەفام کە یاخوا لە هەردوو چاوان کوێر بن و وەجاخیان کوێر بێتەوە... ئاخر نەفامینە ئێوە چیتان بەسەر حەمەدۆکەوە داوە؟

هەی وەڵاغی دە بێ میشك، لادێیی دە کەرو نەفام، ئەو چ خەراپەیەکی دەرهەق بە ئێوە کردوە؟ داوێنی چیاکەیان گرتبوو، کێوەکەیان لە هەر چوار لاوە گەمارۆ دابوو، بە دوای حەمەد دا دەگەڕان. حەمەدیش لە ترسی گیانی خۆی رای کردبوو. ڕێگای دەربازبوونی نەبوو. باشە ئەوە دامان نا حەمەد تا لووتکەی چیاش رۆیشت، ئەی دوایە چی. خۆ ناتوانێ لەوێڕا وەك باڵندە هەڵفڕێ...

یاوەر فارووق بە پێکەنینەوە لە پشتەوەڕا بانگی دەکرد:"زۆرمان نەماوە حەمەدۆك. شتێکی وامان نەماوە، ئێمە ئەوا لە ژێڵلا دێین. پاش لووتکەی چیایەکە دەچیە کوێ؟ دەت گرم، پەتێکت لە مل دەخەم و دێ بە دێ دەت گێڕم. وەك مەیموون هەڵت دەپەڕێنم. دێهاتییەکانیش پێدەکەنین. ئاخر دێهاتییەکان ئێوە بۆ؟ ئێوە چ ژەهرەمارێکتانە؟ حەمەد پەیتا پەیتا ئارەقی دەڕشت و هەڵدەنگووت. ئێستا لەسەر لووتکەی چیا لە پشت گابەردێك دامەزرابوو، تەقەی دەکرد. حەمەد لە سەرەوە بوو، جەندرمەکان لەخوارێ. تەقەو لێکدان دوو رۆژو دوو شەو درێژەی کێشا. حەمەدی بەستەزمان سێ رۆژ بوو پارووە نانێك لەگەرووی نەچووبووەخوار، زۆری برسی بوو، بەڵام لە ترسی گیانی زگی لەبیر چووبووەوە. حەمەد نە تفەنگی لە جەندرمەکان دەداو نە تەقەی لە دێهاتییەکان دەکرد. ئا...خ ئاخ! خۆزگە سەرو گوللەی لەسەر دڵی ئەو دێهاتییە بێقیمەتانە دەدا، ئاخ لە دەستی ئەو دێهاتییە نزم و بێناموسانە... دوایە فیشەکەکانی حەمەد تەواو

دەبوون. ئێستا نە فیشەکی پێ بوو، نە تەقەمەنی. بەستەزمانە بە تاقی تەنیا چیی لەگەڵ ئەو هەموو بنیادەمە پێ دەکرا؟ لەنەکاو فکرێکی بە دڵ داهات. دەستی کرد بە خلۆر کردنەوەی بەردەکان، چما رێگایەکی دیکەی هەبوو؟ هەر بەردێك بەردێکی دیکەشی لەگەڵ خۆی جاڵە دەکردەوە. ئەم بەرد ئەو بەردو ئەویان یەکی دیکە... لەسەر چیاو لە داوێنەکان قیامەتێك بەرپا بوو. ئیدی هەر بەرد بوون کە یەك لە دوای یەك لە سەرێ ڕا تاوێر دەبوونەوە. جەندرمەو دێهاتی‌یەکان یەکی دوو لاقیان بوون، دووی دیکەشیان پێوە قەرز کردن و هەڵاتن... هەڵاتنێك بۆ ئێستا نەبێ بۆ کەنگێ باشە؟ وەختێك پشوویان دا کە لە داوێنی چیایەکە بەر ببوونەوە. ئەم بەرد ئەو بەردی جاڵە کردەوەو ئەویش یەکی دیکە... جەندرمەو دێهاتی‌یەکان یەکیشیان نەبوو بریندار نەبووبێ. ئاخ لە دەست ئەو دێهاتی‌یە نەفامانە، ئۆخەی دڵم دامرد. بەکورتی عەرزو عاسمان ببوون بە یەك. دەنگێکی وەك هەورە تریشقە لە وڵاتی گەڕا. شەوێکی تەواو لافاوی بەردان لەو کێوەڕا بەرەو خوار وەڕێ کەوت."

✧ ✧ ✧

لە نێوان حەمەدو جەندرمەکان دا دەبێتە تەقە. حەمەد دیسان دەکەوێتە تەنگانەوە. بەڵام سەرەنجام ئەلقەی گەمارۆ دەشکێنێ. لای بەیانی بوو، خەریك بوو تاو بکەوێ. حەمەد بە غاردان رای دەکردو جەندرمەکانیش بەدوایەوە بوون. هەتاو کەوت. حەمەد بە کوێرەڕێ‌یەك دا دەڕۆیشت، تووشی پیرەژنێك بوو... ژنەکە باراشی بردبووە ئاشی کە نەوەکانی لێی بکەن. لە ئاشی ڕا دەهاتەوە کە جەندرمەکان وڵاغەکەی‌یان کوشت... کەلاکی وڵاغەکە لەلایەك کەوتبوو و جەواڵە ئاردەکان لە لایەك. پیرێژن دەستی لەبن هەنگڵی نابوون و بە خەمناکی لەسەر کەلاکی وڵاغەکەی دانیشتبوو. بە حەمەدی گوت:"ئەگەر دەتەوێ ناوم بزانی، ناوم زێنەبە، ئەگەر پێت خۆشە بزانی خەڵکی کوێم، لەو گوندەی رووبەڕووتان دەژیم. پێنج نەوەی هەتیوم هەن. وڵاغم لە دراوسێ‌یەکەمان خواستەوە، باراشم هێنا لێم کرد، لەگەڕانەوە دا بووم کە جەندرمەکان تفەنگیان لە وڵاغەکەم داو کوشتیان. بۆچی کوشتیان؟ نازانم. تووشی رۆژڕەشی بووم. بە چ ڕوویەکەوە بچمەوە ئاوایی؟ جوابی دراوسێ‌یەکەمان چ بدەمەوە؟ منداڵەکان لە ماڵێ برسی و تینوو چاوەڕێن. ئەی سەرۆکی دزەکان بیکە پیاوەتی مەم کوژە. جەندرمەکان وڵاغەکەمیان کوشت، دزەکەشیان دەیەوێ خۆم بکوژێ. کوڕم پیاوەتی بکەو مەم کوژە."

حەمەد جەواڵە ئاردەکان لە کۆڵێ دەنێ و دەڵێ:"

هەستە دایە، هەستە بڕۆین. پارەی خاوەنی وڵاغەکە من دەیدەم."

پیرێژن هەر تاوە نا تاوێك دەستی حەمەدی دەگرت و دەیپرسی:"ئەتۆ جندۆکەی یان ئادەمیزادی، نەکا حەزرەتی خدر بی." حەمەد لە حالێك دا لەبن ئەو کۆڵە قورسە دا چەمابووەوە، رێگای دەبڕی و ئەو جەندرمانەش کە بەدوایەوە بوون تەقەیان لێدەکرد.

پیرێژن تێگەیشت ئەو کەسەی جەندرمەکان دوای کەوتوون و تەقەی لێدەکەن، دەبێ ئەم پیاوە بێ. هەر کە لە مەسەلەکە حالی دەبێ لە سەروسنگی خۆی دەداو دەڵێ:"جەواڵە ئاردەکان فڕێ دە بەقوربانت بم کوڕی خۆم. چەتەی خۆم جەواڵەکان فڕێ دەو هەڵێ. ئێستا جەندرمەکان تۆش وەك وڵاغەکەی من دەکوژن. منداڵەکانم هیچیان لێنایە، لە برسان نامرن... کوڕە جوانەکەم، چەتە دڵپاکەکەم، خۆت بۆ من بە کوشت مەدە، هەڵێ!"

بەڵام حەمەد گوێ ناداتە قسەکانی دایەپیرەو هەرچەند لەبن جەواڵە ئاردەکان دا پشتی چەمابوو هەتا نێو ئاوەدانی دەچێ و پارەی خاوەنی وڵاغەکەش دەدا. خەڵکی دێهاتی کێوپارەی دەیناسن، دەیگرن کە تەسلیمی حکوومەتی بکەن. حەمەدیش تفێکیان لە روو دەکوتێ و دەڵێ:"تف لە رووتان تووتکەسەگینە! چ خێرێکتان لە حکوومەت دیوە کە دەتانەوێ منی بدەنە دەست؟ تف لە رووتان." بە کورتی هەرچی دێتە سەر زاری بە دێهاتییەکانی دەڵێ. دێهاتییەکانیش پەژیوان دەبنەوە، بەخۆدا دەشکێنەوە. حەمەدیش لێیان زویر دەبێ و تەنانەت پارووە نانێکیشیان لە کن ناخوا، دەڕوا."

✧ ✧ ✧

حەمەدۆك پیاوێك بوو قارەمان، هێدی و لەسەرەخۆ قسەی دەکرد. بەڵام وەختی قسەکردن سەری دادەخست و تەماشای روخساری کەسی نەدەکرد. کە قسەی دەکرد، وەك کچان سوور هەڵدەگەڕا. کە لەدوورەوە تەماشات دەکرد وەك کێو بە سام بوو. ئاگری لە چاوان دەباری. بەڵام کە نیزیکی دەبوویەوە بیچم و قەڵافەتی منداڵانی هەبوو، دیارە وەختێك کە ئارام دەبوو. لە کاتی تووڕە بوون دا مووی سەری وەك نەشتەر راست دەبوونەوە. مووی لەشیشی دەبوونە نەشتەر. وەختێك تووڕە دەبوو، ئەگەر لە نیزیکیشەوە بت دیبایە، قەڵافەتی زەلام و بەسام بوو. زۆر وەخت خەفەت دایدەگرت. دیارە جاروباریش خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. شتێکی دی" گوللە

کاری لـێنەدەکرد. گوللەبەندو نوشتەی چاوەزاری پێ بوو، تەلەسمی پێ بوو. نووکی چەقۆ کاری لە لەشی نەدەکرد، ئاگر نەیدەسووتاندو ئاو نەیدەخنکاند. وەختێك عەبدیخانی کوشت چووە نێو ئاوایی و خەلکەکەی کۆکردەوەو بردنی بۆ خاردەشت. لەنێو درووەلاٌنەکە ئاگرێکی کردەوە، هێندی کێوێك. پاشان راست چوو لە نێوەندی ئاورەکە دانیشت. ئەوانەی چاویان لـێبوو دەیان گوت:"ئێمە بەم دوو چاوەی خۆمان دیتمان، ئەگەر درۆ بکەین خوایە هەردوو چاومان دەرتۆقێ و بکەوێتە بەر پێمان." دەیان گوت:"تەنیا یەك جێگای لەشی هەیە کە گوللە کاری لـێ بکا، ئەویش چاویەتی، دیارە ئەویش وەختێك کە چاوی هەڵێنابێ، لەو کاتەدا هەم ئاگر دەیسووتێنێ، هەم چەقۆی تێ ڕۆدەچێ و هەم گوللە کاری لـێدەکا."

"دەبێ چارەیەك بۆ چاوی حەمەد بدۆزینەوە."

"هیچ چارەیەك نیە. وەختێك تفەنگ داوێ خۆ ناتوانێ چاو لێك نێ. چما دەتوانێ بە چاوی نووقاوەوە سێرە بگرێ؟"

"چارەیەك بۆ چاوەکانی حەمەد."

"باشە وامان دانا چاویلکەی لەچاو کرد، بە گوللەیەك دەشکێ و وردوخاش دەبێ."

"چارەیەك بۆ چاوەکانی حەمەد."

"ئەودەم ئیدی کەسی پێ ناوێرێ. لەگەڵ لەشکرێکیش بەشەڕ بێ هەموویان قەلٌت و بڕ دەکا."

"چارەیەك بۆ چاوەکانی حەمەد."

"ئەودەم ئیدی ناچێتە نێو سەنگەریش... راستەڕێ بەر بە لەشکرێك دەگرێ، خۆی بەنێو لەشکرێك دا دەکاو دەیان داتە بەر دەسرێژ. ئەوانیش گێژو وێژ دەبن. ئەو گوللانەی لێی دەدرێن کلوو کلوو وەك لۆکەی کراوەوە هەڵدەوەرنە سەر زەوی."

"چارەیەك بۆ چاوەکانی حەمەد."

"ئەو ئەسپانەش کە حەمەد سواریان دەبێ، گوللە کاریان لـێناکا لەچاوانیان نەبێ. ڕۆژێکیان سواری ئەسپێکی خەنەیی عەرەبی دەبێ. وەك سەوڵ و سنۆبەر، راست لەسەر پشتی ئەسپەکە لە پێش لەشکرێك رادەوەستێ و یاری بە ئەسپەکەی دەکا. لەشکرییەکان، فەرماندەرەکان و فەرمانبەرەکان هەمووان سەریان سوڕ دەمێنێ، تەنانەت پەری و جندۆکەش کە بە چاو نابینرێن، سەریان سوڕ مابوو. هەتاو لە ئەسپەکەی دابوو... ئەو خۆرەتاوەی هەڵدێ، ئەو گوڵەی دەپشکوێ و ئەو بارانە کە دەبارێ، ئەوانیش سەریان لە کاری ئەم کوڕە سوڕماوە."

"چارەیەك بۆ چاوەكانی حەمەد."

"بەزەیی بە هەموو كەس دا دێ. تەنانەت لەو كەسانەش كە ویستوویانە بیكوژن، دەبووریێ."

"سواری ئەسپە خەنەیییە جوانەكەی دەبێ و كێو بە كێو هەڵدەفڕێ."

"چارەیەك بۆ چاوەكانی حەمەد."

"مووە بادراوەكانی دەكەونە سەر نێوچاوانی. كاكۆڵە رەشەكانیدەداتە دەم با، چاوە زلەكانی وەك چاوی جوانووی سێ بڕی عەرەبی رەش و زل و خەماوین..."

"چارەیەك بۆ چاوەكانی حەمەد."

"هەمیشە شەهێنێك لە ژوور سەری زۆر بەرز دەفڕێ. حەمەد هەر كاتێك ئەو شەهێنە دەبینێ خۆشحاڵ دەبێ، دەزانێ كە هەتا ئەو شەهێنە بەسەر سەریەوە بفڕێ هیچ گیاندارێك ناتوانێ وەزەندیی پێ بگەیەنێ."

"رۆژێكیان زۆر كەوتبووە تەنگانەوە، فیشەكی لێبڕابوون و جەندرمەش گەمارۆیان دابوو. جەباری دۆستیشی لەگەڵی بوو. جەبار گوتبووی:"برالە، كارمان كراوە، دەمان گرن، وەرە با تەسلیم بین." حەمەد سەری هەڵبڕیبوو، دیتبووی كە لە ژوور سەری، لە پەرپەرۆچكەی ئاسمانێ شەهێنەكەی چەرخان دەدا. گوتبووی:"جەبار، وەرە پشت منەوە، ئەمن بكە لەمپەری خۆت، هیچمان بەسەر نایە"و ئەجاتیشیان دەبێ. هەتا ئەو شەهێنەی لە ژوور سەرە هیچی بەسەر نایەو چاوەزار نایگرێ. تەلەسمەكەی ئەو شەهێنەیە كە هەمیشە لە ژوور سەریەتی."

ئاخ چارەیەك بۆ چاوەكانی حەمەد هەبایە ئا...خ چارەیەك..."

✧ ✧ ✧

حەمەد پیاوێكی ئاوایە:

منداڵەكە لە خەو دابوو. تازە خەویلێكەوتبوو. چراكانی شارۆچكە كووژابوونەوە. لە گەڕەكێكی دوور یەك دوو سەگ دەوەڕین. دەنگی فیكەی شەوگەڕەكان دەبیسترا. حەمەد لە شەش مانگ لەمەوبەرەوە لەم شارۆچكەیە، لەژێرخانەكەی ماڵی "شەمسیبەگ" دا خۆی حەشار دابوو. مستەفا برازای هەتیوی شەمسیبەگ كە تەمەنی هەشت ساڵ بوو، بێ ئەوەی كەس پێبزانێ ئاوو خواردن و هەموو پێویستییەكانی دیكەی حەمەدی جوور دەكردو بۆی

دەبرد. نایب جەباریش لەگەڵ حەمەد بوو. مستەفا هەم خواردنی بۆ دەبردن و هەم ڕووداوەکانی دەرێ و هەرچی لە دەرێ دیتبووی و بیستبووی موو بە موو بۆی باس دەکردن و خەبەری پێ دەدان. ئەم سێ کەسە زۆر ئۆگری یەکتر ببوون. منداڵەکە لەخەو دابوو، حەمەد وەخەبەری هێناو گوتی:

ــ خواحافیز مستەفا...

منداڵەکە خۆی پێوە هەڵواسی. حەمەد لێی پرسی:

ــ مستەفا، ئەگەر هاتمەوە چت بۆ بێنم؟

مستەفا هەمیشە پێخواس بوو. هەمیشە خەونی بە جووتێك کەوشی سووری دەست درووی ماراشەوە دەدی. منداڵەکانی هاوتەمەنی هەمیشە لەو کەوشانەیان لەپێ دەکرد.

ــ مستەفا، ئەگەر هاتمەوە حەز دەکەی چت بۆ بێنم؟

ئەگەر مستەفا هێندە خەواڵوو نەبووایە شتێکی لە حەمەد داوا نەدەکرد. بە وەزعێکەوە وەك ئەوەی خەونی خۆی بۆ بگێڕێتەوە گوتی:

ــ مام حەمەد، جووتێك کەوشی ماراشی وەك کڵووکێ سوورم بۆ بێنە...

دووبارە خەوتەوە.

حەمەد ڕووی کردە چیاو بەندەنان. تووشی زۆر شەڕان بوو. زۆر کارەساتی بەسەر هاتن. برسیەتی و تینووەتیی چاشت، نەخۆش بوو، ڕاویان ناو ڕای کرد، بەڵام ئەو کەوشانەی مستەفا لێی داوا کردبوون، لەبیری نەچووەوە. ئەو نەیدەتوانی بە کەسی دیکە دا ڕابسپێرێ، چارەیەکی نەبوو جگە لەوەی بۆخۆی بچێ و لە ڕاستە بازاڕی ماراش کەوشەکان بکڕێ. بۆ کڕینی کەوشەکان لە چیاکانی "بریت"ڕا چوو بۆ ماراش. کەوشەکانی کڕی و گەڕایەوە. حەمەد چەند مانگ ئەو کەوشانەی وەك ئەمانەتێکی پیرۆز لەگەڵ خۆی بردە ئەم لاو ئەولا. بەڵێ! حەمەد پیاوێکی وایە."

هەتا ڕۆژێکیان جەندرمە وەدوای کەوتن. لە "کرك سوو" گەمارۆ درا. حەمەد ڕای کرد بۆ "تاواراسین". جەباریشی لەگەڵ بوو لەگەڵ یاغیەکی زۆر پیر کە پێیان دەگوت نایب ڕەجەب. لەتاواراسین دیسان گەمارۆ دران. دەستەی حەمەدۆك شۆڕ بوونەوە بۆ لای چوکووراواو چوونە ئاکارجا.

حەمەد لە ئاکارجا لە ماڵێ خانەخوێیەکەیان "دۆران حەسەن" هەردوو پێی کردە کەوشێکەوەو گوتی:

"ئەمن ئەمشەو دەچمە شارو دەگەڕێمەوە."

دۆران حەسەن گوتی:

ــ ناکرێ یاغی! ئەگەر ببیە مارو بخزی، ببیە باڵندەو بفڕی دیسان ناکرێ بچیە شار... شار هەتا بینەقاقەی پڕ لە جەندرمەیە. دوێنێ دەستەیەك جەندرمەی گەڕۆکیشی بۆ هاتوە. دەرو ژووری شار پڕە لە جەندرمە. باڵندە ناتوانێ باڵ لێك دا. تەنانەت سێبەرێکی چووکیش ببینن تەقەی لـێدەکەن.

ــ ئەمشەو دەچمە شار.

نایب رەجەب نەڕاندی:

"هەتیوە نەفامە، گوێت لـێبێ بزانە ئەم پیاوە دەڵێ چی... چما ئەتۆ مێشکت نیە؟

ــ دەبێ بچمە شار.

ــ دوێنێ شەو دوو پیاوی سەفەری چوونە شار، هەردووکیان کەوتوونە بەر گوللەو کوژراون. ئەم جەندرمانە زۆر توندن، هێشتا تارەقی رێگایان لـێ وشك نەبووەوە دەستەی شازدە کەسیی "حاجی وەسمان"یان قەلاچۆ کرد.

نایب رجەب دووبارە گوڕاندی:

ــ کوڕە! ئەمشەو کەس ناتوانێ بچێتە شار، کەسێکیش پێی بگاتە وێ بە زیندوویی ناگەڕێتەوە.

ــ رەنگە بە ساغی نەیەمەوە، بەڵام دەچم.

زۆریان کێشە کرد، بەڵام حەمەد نەیبیست. خۆی پۆشتە کردەوە، چەکی لە خۆی داو بەو شەوە رۆیشت بۆ شار. چووە نێو شار. شار لە بێدەنگیی گۆڕستان دا بوو. لەو بێدەنگییە قورسە زۆر ترسا. مستەفا لەخەودا بوو. دڵی نەهات وەخەبەری بێنێ. کەوشەکانی لە پشت سەری دانان و ماچی کردو گەڕایەوە.

"بەڵێ حەمەد پیاوێکی وایە."

وەختێك حەمەد گەڕایەوە لە خوارەوەی ئاکارجا جەندرمە رێیان پێگرت. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. نایب رەجەب هەر لەوێ بریندار بوو. یەك بێ جنێوی بە حەمەد دەدا. جەندرمەکان وەدوایان کەوتن و لە ئاکارجاوە هەتا چوکووراوا راویان نان. لە ئاکچاساز دا خۆیان شاردەوە. حەمەد لەوێ تووشی لەرزو تا بوو. نایب رەجەب زۆری جنێو پێ دا. جەباریش لەرزو تای گرت، لەبەر هەتاو لە کاتێك دا لە سەرمان هەڵدەلەرزی لەسەر زەوی تلی دەدا. برینی ملی نایب رەجەب بەرە بەرە

هەڵمساو ئەستوور بوو هەتا بە ئەندازەی مووره دارێکی لـێ‌هات. نایب رەجەب نەی‌دەتوانی ملی بیزێوێ. نایب رەجەب هەرچی کەوش و مستەفاو حەمەد لە دنیادا هەیە دەی‌دایە بەر جنێو و حەمەدیش هەر پێ‌دەکەنی. پاشان نایب رەجەب مرد. نایب رەجەبیان لە خاکی ئاکچاساز دا ناشت. حەمەد بۆ مردنی نایب رەجەب زۆری خەفەت خواردو گریا.

"بەڵێ حەمەد ئەو پیاوەیە."

عەلی سەفا، ئیدریس بەگی بانگ کردو پێی گوت:

"تکایەکم لێت هەیە. دیسان سەروگوێلاکی حەمەدۆك دەرکەوتوەتەوە.

ئیدریس بەگ گوتی:"دەی باشە."

- مەبەستم شتێکی دیکەیە. هەر کە سەروگوێلاکی وی لە چیاکان پەیدا بوو، دێهاتی‌یەکانی ئێرە بازەڵە بە کلکی خۆیان دەکەن و بایان ڕەگوێیان دەکەوێ. دێهاتی‌یەکان بەو پشت ئەستوورن... هەتا ئەو لە نێو نەچێ ئاسوودەیی‌مان نیە. نە ئەتۆ نە ئەمن و نە هیچ کەسی دیکە. ئیدریس بەگ براله! با بێ پێچ‌وپەنا پێت بڵێم، ئەو دێهاتی‌یانە ئەو کردوونیە کەللا. بە دەردی عەبدی‌خان دەی‌گوت ئەوە توێکڵە شووتی وەبیر ئەم ولآغانە دێنێتەوە. حەمەدۆك بۆخۆی هیچ نیە، ئەو بەدبەختە هەژارە کەمێك زاڵم و ترسەنۆك و نەختێك خوێن خۆرە. دێهاتی‌یەکان لێی دەترسن و پەنای دەدەن. دڵخۆشیی خۆیان بەو دەدەنەوە. دەیانەوێ لە پێش چاوی مستەفا کەمال پاشا بیکەن بە شتێك.

لەو کاتەوە کە حەمەدۆك لە چیاکان بینرابوو، عەلی سەفابەگ نەی‌دەوێرا وەدەر کەوێ. وەختێکیش وەدەر دەکەوت شەش پارێزەری چەکدار، بە دەوریەوە بوون. لە ترسان خەریك بوو زراوی بچێ. ترسی حەمەدۆك لە خەویش دا بەری نەدەدا. لە ترسی گیانی خۆی جینگڵی دەدان و ڕێگاچارەیەکی نەدەدۆزیەوە. برووسکە لە دوای برووسکە بۆ ئەنکەرەی لـێ‌دەدا:"فریا کەون. حەمەدۆك لە چیای بینراوە. گیان و ماڵمان لە مەترسی کەوتوە، فریامان کەون. فەوجێك یان دەستەیەك، یان لەشکرێك یان... سەربازێکی زۆر بنێرن. هەموو جووتیارەکانی چوکووراوا پشتیوانی ئەون. ئەمان، زوو کۆمەگمان بۆ بنێرن. سەری مارەکە هەتا گەورە نەبووە بە بەرد پان بکەنەوە. ئەوانە وەك مێروولە وان، ئەگەر ڕاپەڕن ئیدی کەس باشاریان ناکا. بە هاوارمان بگەن!"

فەرمانی دابوو لە پێش هەموو دەرگاو پەنجەرەکانی ماڵێ تەلیسە خیز هەڵچنن. چەکدارەکان شەوێ تا بەیانی لەبەر دەرکی ماڵێ ئێشکیان دەدا. بەو حاڵەش خەو نەدەچووە

چاوی عەلی سەفابەگ و هەتا بەیانی لە ترسی گیانی خۆی بیری لە چارەیەك دەکردەوە. "حەمەدی خۆم، شەهێنەکە، شێرە ئازاو بە جەرگەکەم."

هەموو کەس دەڵێن سەرەنجام ئەم پیاوە لە ترسان خۆی دەخنکێنێ.

... ئەدی ئیدریس بەگ! هەموو ئاغاکانی چوکووراوا، خاوەن زەوییەکان، خاوەن دێیەکان و خاوەن شارۆچکەکان هەموومان کۆبووینەوە، بە تێکڕا گەیشتینە ئەم ئاکامە کە بڕیارمان دا ئەگەر ئەتۆ حەمەدۆکمان بۆ بکوژی هەموومان پێکەوە بچین هەقی تۆ لە عارف صائم بەگ وەرگرینەوە. هەرچۆنێك بێ ئەتۆش خانێکی. تەنیا خوایە کە لە قەرارێك دەمێنێ و پلەو پایەی نایەتە خوارێ. هەربینا دیت ئەم لەعنەتییە رەعیەتەکانی تۆشی هەڵگێڕایەوە. لە چوکووراوا تەنیا یەك کەس هەیە کە دەرەقەتی بێ، ئەویش ئەتۆی. ئەگەر حەمەدی بکوژی، هەموو خان و ئاغاکانی چوکووراواو تەنانەت حکوومەتیش لە منەتت دەرناچن. هەر دوێنێ عصمت پاشا گوتوویە دەبێ سەری ئەم مارە پان بکرێتەوە. وەختێك عصمت پاشا ببیسێ کە ئەتۆ حەمەدۆکت کوشتوە، چیت بۆ ناکا! ئێمەش پشتت دەگرین. حەمەد بنیادەمێکی زۆر نزم و خراپە. ئەگەر ئەو شتانەی لەشار لەبارەی دا باس دەکەن ببیسی... ئەگەر بزانی ئەو کاری چۆنی کردوە! بنیادەم لە داخی کارەکانی وی مووی لەشی دەبنە نەشتەر.

"ها ئیدریسی کافر! نەکەی حەمەدۆکی بکوژی. ئەتۆش بۆخۆت یەکێکی وەك ئەو. بەزەییت پێیدا بێ!"

ــ بڕوانە ئیدریس بەگ، کوشتنی حەمەدۆك بۆ تۆ دەرفەتێکە. ئەگەر لە دەست خۆتی بدەی تازە لە دەستی حکوومەت رزگار نابی.

ــ سەفابەگ دەبێ فکری لێبکەمەوە.

ــ کوشتنی حەمەدۆك بۆ تۆ وەك ئاو خواردنەوە وایە.

ــ سەفابەگ، دەبێ بیری لێبکەمەوە.

ــ دەزانی کوشتنی حەمەدۆك یانی چی؟ هەرکەس بیکوژێ، دەبێتە قارەمانێك.

ــ دیسانیش رێگا بدە نەختێك بیری لێبکەمەوە.

ــ بڕوانە ئیدریس بەگ، وەزعی تۆش زۆر باش نیە. ئەتۆ چارەنووست بە موویەکەوە بەندە.

ــ سەفابەگ، دەبێ بیری لێبکەمەوە.

ئیدریس بەگ فکری کردەوە، لەمێشکی خۆی دا هێنای و بردی، لێی کۆڵیەوەو سەرەنجام گەیشتە ئەم ئاکامە کە: سەری خۆی یان سەری حەمەدۆك.

ئەگەر حەمەدۆکی نەکوژێ، ژیان لەم دەشتەی بۆ ناگونجێ. بەڵام ئەگەر حەمەدۆکی بکوژێ... ژیانی لە جاران باشتر دەبێ. حەمەد منداڵێکی ساکارو ساویلکەیە، کوشتنی زۆر دژوار نیە.

ــ ئیدریس بەگ، بیرت لێ‌کردەوە؟

ــ ئەرێ.

ــ کەنگێ دەچیە کێوپارە؟

ــ هەر ئەمشەو

✧ ✧ ✧

تاواراسی بنەوشەیەو ڕەنگان دەگۆڕێ. تاواراسی لە چەند دۆڵی قووڵ پێك هاتوە، چەند دۆڵی قووڵ و شۆرەکات... لەم دۆڵانەدا جگە لە گوڵاڵە سوورە گوڵێکی دیکە ناڕوێ. خاکی هەر دۆڵێك ڕەنگی تایبەت بە خۆی هەیە" سەوز، زەرد، سەوزی توند، خاکی بە هێندێك هێڵی باریکی سوور، یان پەڵەپەڵەی گەورەی شینەوە. تورکمەنەکان ئەم گڵانە دەبەن بۆ ڕەنگ کردن. لەتاواراسی هێندێك گوڵی پڕ نەخش و نیگاریش هەن. ئەمجار تاواراسی ئاوو هەوای کوێستانیشی نیە، لەوێ هەوا زۆر گەرمەو شاخە سوورە حەستەمەکانی لەبەر تیشکی خۆر وەك گڕی ئاگر سوور دەبنەوەو هەڵدەبن. شاخی نووك تیژو دڕی هەن. کوندە سوورە چاوزلەکانی لەگەڵ شاخەکان لێك ناکرێنەوە.

حەمەدو ئیدریس بەگ لەدۆڵێکی پڕ شاخ و بەردی تاواراسی چاویان پێك کەوت. لە پشت حەمەدەوە سێ کەس لە هاوڕێیەکانی لە بن بەردێك دەست لەسەر پەلاپیتکە وریا بوون. حەمەد زۆر باش دەیزانی کە ئیدریس بەگ بە چ نیازو مەبەستێك هاتوەتە لای. دەیزانی بەنیازە پاش کوشتنی، سەرەکەی بۆ عەلی سەفابەگ بەرێتەوە.

بێ‌ئەوەی دەست لە نێو دەستی یەکتر نێن ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتن، حەمەد، ئیدریس بەگی زۆر بەردڵ کەوت و لە دڵی خۆی دا گوتی:"چەند پیاوێکی هەڵکەوتوویە، وەك منداڵان ساکارو ساویلکەیە. چۆن توانیویەتی تا ئێستا لەو کێوانە هەڵبکا. ئەم جۆرە کەسانە سێ چوار ڕۆژ زیاتر لە کێو و بەندەنان نامێننەوە، دەکوژرێن."

حەمەد موو بەموو ئاگای لەو بەڵایانە هەبوو کە بەسەر ئیدریس بەگ هاتبوون. بەزەیی پێدا دەهات، بەڵام نەدەکرا کەسێك کە هاتوە بیکوژێ، ببەخشێ. چار ناچار دەبوو بیکوژێ.

چاوە خەماوییەکانی حەمەد خەماویتر دیار بوون. دەستیان بە قسە کرد. حەمەد لە ئیدریس بەگی پرسی کە مەبەستی لەم چاوپێکەوتنە چیە، بەڵام ئیدریس بەگ نەیتوانی وەڵامێکی وا بداتەو کە حەمەد باوەڕی پێبکا:

"لێرەوە تێدەپەڕیم، گوتم با سەرێکی حەمەدۆکیش بدەم، بزانم چۆن پیاوێکە، ئەمنیش بیبینم."

حەمەد لەو هەموو ساویلکەیی و دەست و پێ سپیلکەیییە سەری سوڕمابوو. لەبارەی یاغییەتی لەو دەشت و کێوانەدا قسەیان کرد. ئیدریس بەگ زۆری قسە نەدەکرد. جاروبار چەند وشەیەکی بەدەم دا دەهاتن. جار لە جار زیاتر دەستی دەلەرزین. پاشان ڕەنگی لێوانی پەڕی و ئەمجار ڕەنگی روخساریشی سپی سپی بوو.

"ئەو شەهێنەی لە ئاسمان دا دەگەڕا وەك بریسکە دەهاتەخوارو وەختێك بە ئەندازەی باڵاپیاوێك لە شاخەکان نیزیك دەکەوتەوە دووبارە هەر بەو چوست و چالاکییە دەگەڕایەوەو دەچووەوە عەویتقی عاسمان. شەهێن پەیتا پەیتا ئەوەی دووپات دەکردەوەو لە نێوان عاسمان و شاخەکان دا دەهات و دەچوو. هەرکاتێك مەترسی زۆری هەڕەشە لەحەمەد دەکرد شەهێنەکە بەم جۆرە وەك شێتان تووڕە دەبوو.

حەمەد بێدەنگ بوو. بەڵام ئیدریس بەگ ئاگای لەوەش نەبوو. ماسوولکەکانی سەر گۆنای راستی هەڵیان داویشت. بەخۆی نەوەستا، دەستەکانی هەتا قۆڵی لەرزین. لاقیشی بە توندی دەستیان کرد بە لەرزین، لاقی راستی بە جۆرێك دەلەرزی دەت گوت نیازی هەیە بفڕێ. حەمەد چاوی بڕیبووە ئەو پیاوە کە بەرامبەری دانیشتبوو، دەلەرزی و ماسوولکەکانی هەڵیان داویشت، تەماشای دەکردو چاوەڕوانی سەرەنجامی کارەکە بوو. لەنەکاو دیتی کابرا ئارام بووەوە، لەرزینی ئەندامەکانی راوەستاو بەرە بەرە خوێن زایەوە روخساری.

"شەهێنەکەش لە ئاسمان دا باڵی لێك کردبوونەوەو بە خەیاڵی ئاسوودەوە خۆی دابووە بەر بای شەماڵ و دەسووڕاو سێبەرە ڕەشە چووکەڵەکەی بە حاڵ و باڵ لەسەر شاخان دیار بوو."

ئیدریس بەگ سەری هەڵبڕی. لە حەمەدەوە راماو ماوەیەکی زۆر تەماشای کرد. پاشان لە نەکاو هەستا. حەمەدیش لە جێی خۆی هەستا. ئیدریس بەگ خەنجەرەکەی هەڵکێشاو دەسبەجێ قامکی شادەی خۆی بریندار کرد. ئەمجار دەستی حەمەدیشی گرت و قامکی ویشی لە خوێن هێنا. حەمەد پێکەنی. ئیدریس ئەو خوێنەی لستەوە کە لە برینەکەی حەمەد

هاتبوو. پاشان قامکە خوێناوییەکەی خۆی بۆ لای حەمەد راداشت. حەمەدیش زمانی لە قامکە خوێناوییەکەی وی دا.

ئیدریس بەگ بە ساکاری و ساویلکەیی منداڵێکی خوێن گەرم حەمەدی لە باوەش گرت و گوتی:

"براله، ئەمن هاتبووم تۆ بکوژم. بەڵام ئێستا بە خوێن پەیمانی برایەتیمان بەست."

حەمەد گوتی:

"ئەمن دەم زانی بۆ کوشتنی من هاتووی. هەربۆیەش وریاو لەسەر هەست بووم و پێش ئەوەی ئەتۆ من بکوژی، ئەمن دەم کوشتی. بڕوانە..."

لێرەدا دەستی بۆ لای بەردەکە درێژ کردو نیشانەی دانێ. سێ پیاوی چەکدار بە تفەنگی ترووسکەدارەوە لەبن بەردەکە هاتنەدەر:

ـ پێت چۆن بوو براله. ئیدریس بەگ پێت خۆش بوو؟

ئیدریس بەگ گوتی:

"پێم خۆش بوو، زۆریشم پێ خۆش بوو. بەڵام با ئەوەت پێ بڵێم کەسێك تۆ ببینێ و بت ناسێ ناتوانێ دەستت بۆ درێژ بکا، ناتوانێ ئازارت پێ بگەیەنێ. ئەمن تۆم نەدیبوو و نەم دەناسی. بەڵام ئەتۆ ئەمنت دەناسی. ئەمن دەبوو بزانم هەرکەس بۆنی مرۆڤایەتیی بۆ هاتبێ ناتوانێ وەزەندی بە تۆ بگەیەنێ."

حەمەد دەستی درێژ کرد. قامکە چووکەی دەستی راستی وی گرت و بەسپایی گوشی:"شەهێنەکە لەسەرەخۆ لە ئاسمان دا دەفڕی. باڵە نووك تیژەکانی خۆی بە تەواوی لێك کردبوونەوە. دەت گوت لەو سەرە بە هەورێکەوە نووساوە."

بەردەڵانەکانی تاوارانسی بە گوڵاڵەو پۆل پۆل گوڵی شین، و پەمەییو زەردی دڕکاویی گوێنی رازابوونەوە.

ئیدریس بەگ هەموو بەسەرهاتەکەی مووبەمووو بۆ حەمەد باس کرد. حەمەدیش وێڕای ئامۆژگاری کردن پێشنیاری پێکرد کە چونکە لە دەشتێ دەرەتانی ژیانی بۆ نەماوە، باشترە بێتە چیا.

ئیدریس بەگ وەختێك ماڵئاوایی لێدەخواست گوتی:

"براله ئێستا دەڕۆم. لە چوکووراوا هێندێك کارم هەن کە دەبێ تەواویان بکەم. هەر ئەم رۆژانە کە کارەکانم تەواو بوون دێمەوە لات. چما ئەتۆ برای خوێنیم نی؟ تازە تا ماوم بەجێت ناهێڵم."

حەمەد لە سەر کانییەکەی تاواراسی گۆشت نێچیرێکی خۆشی دەرخوارد دا.

لێك جیابوونەوە.

حەمەد پێیوابوو تازە هەرگیز نایبینێتەوە. لە قووڵایی دڵیەوە زگی بەو پیاوە دڵپاك و جوامێرە دەسووتاو قورسایی خەفەت و تازیەبارییەکەی لەسەر لەش و گیانی هەست پێ دەکرد.

" شەهێنەکەش لە ئاسمان بە باڵی داچۆڕاوەوە هەروەك تازیەخوێنییەکی دڵگر بەدوای ئیدریس بەگ دا دەڕۆیشت و بەڕێی دەکرد."

هاوین بە جوانییەوە داهات، و زۆر خەبەری خۆش و هیوابەخشی لەگەڵ خۆی هێنان. وەسمانەزلە بیست ساڵ گەنج تر ببووەوە. مەلافەرهاد ورەیەکی تازەی پەیداکرد. ئەو کە دروێنەوانێکی کارامە بوو، ئەو ساڵە جگە لە دەغلەکانی خۆی مەزرای دراوسێیەکانیشی درووەوە. گوڵە گەنمە گەیشتوو و پڕدانەکان بەردەوام لەنێو شان و باهۆی دەخزین و دەکەوتنە سەر خەرمان. مالاریا گاڵەی دەکرد. زۆر ژن و منداڵ و پیری نۆبەتی دار لەبەر هەتاو هەڵدەلەرزین... بەڵام ئەو ساڵە تەواوی ئەو شتانە لەبەر چاوی جووتیارەکان بێبایەخ بوون... وەك شاخێکی پتەوی سەر چیای توورووس وابوون... ئەو ساڵە بە پێچەوانەی ساڵەکانی دیکە چوکووراوا هێندە گەرم نەبوو. گەرماو چوکووراوای هەمیشە لە گەرمادابرژاو گۆڕابوون و ئەم خاکە زوڵم ئاوایە بەرگێکی دیکەی کردبووەبەر. چوکووراوا بەرگی جێژن و زەماوەندی لەبەر کرد بوو. ئاسمان قورسایی دەخستە سەر چوکووراواو هەوری بەبارانە بەسەر پانایی دەشتەکەدا بڵاو ببوونەوە.

شەوێکی بێدەنگ و بێئەستێرەو شەدار بوو. لەنەکاو شیوەنێکی بەردرێژ کە شەوو هەورەکانی قەڵاشتنەوە، وەك شمشێرێك بەسەر دەشتی ئاناوارزادا کەوت و ئەو کەسانەی تەماشای دەشتییان دەکرد، پەڵەپەڵە تەقینەوەی بێپسانەوەی بڵێسە ئاگرەکانیان دی کە تەندوورەی دەکرد و پێوە دەچوو. هەموو خەرمانەکانی گوندی وایوای دەسووتان. دێهاتییەکان دەستیان لەبەر پشتێنێ نابوو، لە دەرێ لەسەر تەپۆلکە گلێکی دەسکرد کە هەتا دوور درێژەی هەبوو، کۆ ببوونەوەو بێدەنگ و بێقسەکردن تەماشای دەشتییان دەکرد. دەشتی ئاناوارزا لە خوارەوەی وایوای هەتا ئاکچاساز، لە ئاکچاساز هەتا زییەلێن، لە زییەلێن هەتا بەستێن هەمووی لە ئاگردا ون ببوو. خەرمانەکانی گەنم و جۆ، لاسکی گەنمە شامییەکان و گیشە گیایەکان گڕیان لێهەڵدەستا. بەرینایی گڕی ئاگرەکە هەتا بەرماڵان هاتبوو. لە مەزراکانەوە

قریوەیەکی نارام دەهاتە بەرگوێ. جروجانەوەر، مارەکان، جالّجالّۆکەکان، پەلەوەرەکان، کیسەلّەکان، چەقەلّەکان، ڕێوییەکان و هەموو گیاندارەکان دەسووتان و ڕایان دەکرد.

جووتیاران تا ڕۆژ تەماشای ئەو ئاگرەیان کرد کە دەجوولاّ و پێوە دەچوو. نە قسەیان کردو نە دادو هاواریان وەڕێخست و نە بیریان لە هیچ کردەوە، هەروا لە جێی خۆیان ڕاوەستان، خوێن لە دەمارەکانیان دا بەستبووی. ئەگەر دەستت بڕیبان دلّۆپێك خوێنی لـێنەدەهات.

بەرەبەری بەیانی با هەلّی کرد، و گڕی ئاگرەکەی هەتا بن قەلاّی ئاناوارزا لەگەلّ خۆی برد.

وەسمانەزلە کە پشتی وەژان کەوتبوو، دەستی بە پشتێنیەوە گرت و بۆلای مالّێ وەڕێ کەوت. دەیگوت:

" باشە، هەرچی لەدەستی دێ با کۆتایی نەکا."

سێکەس لە پشتەوە بە ڕاوێژێکی خەفەتاوی و بێگیان و بە تانووت و تەشەرەوە گوتیان:

"بەلّێ بەلّێ با کۆتایی نەکا. ئەمسالّ زستانێ چمان هەیە بخۆین؟"

سەری" گاووورداغی" خەریك بوو ڕووناك بێ و لە تاریك و ڕوونی هەوای بوولێلّ دا پوولّەکەی تیشك دەکەوتنە سەر خاکی ڕەش.

## (٣٣)

له سەرەتادا کاتێك له وەرزی شێوبڕین دا سەروسەکوتی هەمزە دەرکەوت و بە سواریی ئەسپ غاری دایە لای ئەو جووتیارانە کە دڕووەڵانەکەیان ئاگردابوو، و دەسبەجێش هەردوو کۆنە ژنی برایەکەی مارە کردەوە، جووتیارەکان ئەویان بە هێند نەگرت. هەمزە کاتێك ژنەکانی عەبدیخانی مارە کردنەوە، زەماوەندێکی گەورەی سازکرد. له خەلکێکی زۆری گێڕایەوەو خەرج و موخاریجێکی زۆری کرد.

جووتیارانی ئاسیاب چەشمە هەڵپەڕین و هونەریان نواند. تەنیا یەك کەس نەچووە سەر زەماوەند، ئەویش دایەحۆری بوو. دایەحۆری کە نەیدەتوانی ڕووداوی کوژرانی مێردەکەی لەبیر بەرێتەوە، لەو دێهاتیانە تووڕە بوو کە چووبوونە بانگ هێشتنەکەی هەمزە، و ڕقێکی زۆریشی لەو دێهاتیانە داگرتبوو کە لە زەماوەندەکەدا بەشدار ببوون، دۆستایەتیی هەمزەیان دەکردو فەرمانەکانی ئەویان دەسبەجێ بەڕێوە دەبرد.

نە چاوی لە کەس دەکرد و نە تەنانەت بەلای ماڵەکانیشیان دا ڕادەبرد. لەنێو ئاوایی دا دایەحۆری وەك کەسێك دەچوو کە بە تەنیا کەوتبێتە نێو بیابانێکی بێدەنگ، بیابانێك کە نە مرۆڤ و نە جەندۆکە و نە هیچ زیندەوەرێکی تێدا نەبێ. دەهاتنە لای، لەبەری دەپاڕانەوە، خۆیان لێنزیك دەکردەوە، بەڵام دایەحۆری هەروەك هیچ نەبووبێ، لێوی هەڵنەدەپچڕی. زمانی خۆی گرێ دابوو. تەنانەت گوێی نەدەدایە منداڵ و پەلەوەرو مێروولەکانی ئاواییش:" با بم کوژن، خوێنی سوورم بڕێژن، ئەوان بەم کارە خۆیان لە سەگیش نزم تر و گڵاوتر کرد. با بم کوژن. ئەگەر قەرار بێ لەگەڵ ئەم بێقیمەتانە بژیم، پێم باشترە بچمە لای دورمووش عەلی، حەمەدۆك، دوونەی جوان، و لای خەجیج."

کاتێك جوتیارەکان بە پەنایدا دەرۆیشتن، جاروبار پلاریان تێدەگرت:

"بۆچی ناچێ شکایەت لەو کەسانە بکا کە مێردەکەی، واتە دورمووش عەلێیان کوشت؟ ناکا بترسێ. ناکا لە ترسی تووڕەبوونی ئاغامان نەوێرێ."

دایەحۆرییش وەڵامی دەدایەوە:

"دیارە کە دایەحۆری دەترسێ. هەمزە، هەمزە کەچەڵ پێنج گوندی پڕ لە سەگی بە نەمەگی هەیە، حکوومەتیشی لە پشتە. حکوومەت هیچی لێناکا، دەست خۆشانەشی دەداتێ. پێیدەڵێ:" کوشتنی پیرەپیاوێك بۆتۆ کەمە، دەبێ لاوەکانیان، ناقڵەکانیان و نازاکانیان بکوژی. دەبێ دوو سەد، پێنسەدیان لێ بکوژی... خەڵکی لادێ بە کوشتن تەواو نابن." دایەحۆری هەر دەبێ بترسێ. دیارە دەترسێ، نەترسێ چ بکا؟"

ڕوانینی ناهومێدانەو پلارو تەوس و تەشەرو قسەی بە توێکڵی دێهاتییەکان لەبارەی حەمەدۆکەوە وەك خەنجەرێکی ژاراوی لە دڵی دەدران و شێت و شەیدایان دەکرد. ئەم قسانە لە مردنی مێردەکەی زیاتریان ئازار دەدا:

"حەمەدۆك دێتەوە، ئەدی خەریکە دێتەوە!"

"سواری دولدول بووە."

"وەك حەزرەتی عەلی."

"لە "قزڵ گدیك" دیتراوە."

"سمێڵەکانی باداون و خەریکە دێتەوە."

"دێ زەوییەکانی ئاغامان لە فەقیرو هەژاران بەش دەکا!"

دایەحۆری هەرکاتێك ئەم هاتەران پاتەرانەی دەبیست، یەك دوو ڕۆژان ددانی بە جەرگی خۆیدا دەگرت و خۆی دەخواردەوە. دوایە جارز دەبووو دەچووە نێو ئاوەدانی" کراسە شین و پاك و خاوێنەکەی لەبەر با دەشەکایەوە، کەزییەکانی کە وەك لۆکەی سپی وابوون، لەبن چارشێوەکەیەوە دەهاتنە دەرو وەك هەورێکی سپی دەکەوتنە سەر ڕوخساری. ئەم کەزییە سپی و لوول دراوانە لەگەڵ ئەو ڕوخسارە تاوەگازە پڕ گنج و لۆچەدا زۆر جوان لێك دەکاڵانەوە. لە کاتێك دا بە نێو دێ دا دەگەڕا، هەتا تینی لەبەردا بوو هاواری دەکردو دەیگوت:

"دیارە دێتەوە. ئەمن چاوەڕوانمی. پێش ئەوەی چاو لێك نێم و بم خەنە ژێر گڵ دێتەوە. یانی ئێوە دەڵێن ئەو خوایە کەیوسفی لە چاڵاو ڕزگار کرد، ڕوحمێك بە ئێمە ناکا! یانی دەڵێن ناکرێ ڕۆژێك لە ئاسمانی ئێمەش هەتاوێك دەرکەوێ؟"

دێتەوە... ڕۆژێك لە ڕۆژان حەمەدۆك لە حاڵێك دا کوڕە جحێڵەی ئازاو بوێر بە سواری ئەسپی کوێت دەورەیان داوە، بە شکۆیەکی تەواوەوە دێتەوە.

دێتەوە تۆڵەی دایکی و خەجیج دەستێنێتەوە. ئایەڵێ خوێنی دورمووش عەلی بەفیڕۆ بچێ. تف لە ڕووی ئەو دێهاتیە نزمانە دەکوتێ کە وەك کرم دەجوولێنەوەو پێیان دەڵێ تف لە چارەتان... ئەودەم هەمزەتان کونەمشکی لێ دەبێ بە قەیسەری... حکوومەتەکەشتان هەروا. چۆن ڕۆیشتوە ئاواش دێتەوە. هەروەك ڕۆیشت، دیسان دەگەڕێتەوە."

بەڵام دێهاتیەکان مێشێکیشیان لێ میوان نەبوو، تەنانەت گوێیان لە قسەکانیشی نەدەگرت. دەیان گوت:

"هەرکەس سزای کاری خۆی وەردەگرێ. عەلی دورمووش کردی و سزاکەشی دیت. بەسە ئیدی. چەند ساڵ زەویی خەڵکمان چاندو دروومانەوە. ئێستاش خاوەنی زەوییەکان هەمزاغای ئاغامان هاتوەو زەوییەکانی خۆی وەرگرتوەتەوە. دیسان خواماڵێی ئاوەدان کا. عەمبارەکانمان پڕ لە دەغڵن. مانگاکانمان جووت جووتیان گوێلك لەبەرن، خەڵیفەکانمان هەنگوینیان لێدەڕژێ، ماین و مانگاکانمان هەموو جوانوو و گوێرەکەیان هەن... ئاخر چما دەکرێ دێ ئاغای نەبێ. بێسەرپەرست و بێکەس مابووینەوە، خەریك بووین یەکتری لەت و پەت بکەین. چاك بوو هەمزاغا هات. ئەگەر نەختێك درەنگ هاتبایە، ئێمە چاوی یەکترمان دەردێنا. سوپاس بۆ خوا کە زوو هات و هەوساری گرتین."

جووتیارەکان پێیان وابوو دنیا هەروا دەبێ و هەمزەش هەروا لەگەڵیان وەك دۆستێکی میهرەبان دەجوولێتەوەو ئەوانیش هەروا خاوەنی ئەسپ و ماین و گاو مانگا و جوانوو و گوێرەکە و خەڵیفەمێش دەبن...

بەڵام ڕۆژێك دیتیان دەستەیەك جەندرمە هاتنە ئاوەدانی... پاش وان دەستەیەکی دیکە... فەرماندەرەکەشیان نایبێك بوو کە پەیتا پەیتا زێدە مەعاشی بۆ دەهات. نایب پیاوێکی ریش سپی بوو کە زۆر تووڕە و تۆسن دیار بوو. دووسێ ڕۆژان بێئەوەی قسە لەگەڵ کەس بکا لە دێدا گەڕا. هەمزاغا ڕۆژێ مەڕێکی بۆ سەردەبڕی. کەباب، قاورمە، کارگ، ڕاکی و هەموو شتێك بۆ جەنابی نایب حازر بوو... نایب لە کەیف و دەماغی خۆیدا بوو و کەس نەیدەوێرا لێی نزیك بێتەوە.

ڕۆژێکیان بەیانی نایب هەموو دێهاتیەکانی بانگ کرد و پێش هەمووان عەلیەشەلی کێشایە بەر پرسیار و وەڵام:

"ئێوە عەبدیخانتان کوشت و دارایییەکەتان زەوت کرد. زەوییەکانی، گەنم و جۆیەکەی، قەرزەکانی، خانووەکەی، دێیەکانی و بە کورتی دارونەداریتان زەوت کرد. خەڵکی هەر پێنج گوندەکەی خاردەشت لەسەر دزی و خەراپە تاوانبارن. عەلییەشەل وەرە ئێرە بزانم. ئەوانەی گوتم راستن یان نا؟"

عەلییەشەل کە دووسێ هەنگاو هاتبووە پێش، گوتی:

"ڕاستن."

ئەمجار نایب وەرگەڕایەوە لای جووتیارەکان و گوتی:

"ئێوە دەڵێن چی؟"

ئەوانیش گوتیان:"ڕاستن."

"ئێستا کەوایە هەرچی ئەستاندووتانە دەبێ بیدەنەوە.

لە حکوومەتی کۆماری تورکیەدا ئیدی ئەو خەبەرانە نین. کەس ناتوانێ ماڵ و دارایی خەڵك زەوت بکا. لە پێش دا ئەو پیاوە، واتە عەبدیخانی بەڕێز دەکوژن و دوایەش دارایییەکەی زەوت دەکەن. سزای ئەم کارە ئیعدامە. ئێستا دەبوو هەمووانتان بە ژن و منداڵ و پیرو لاوەوە بەرم و لە دارتان بدەم، بەڵام ئەگەر ئەو کارە ناکەم لەبەر ئینسانەتی و لێبووردنی هەمزاغایە. ئەو پێیگوتم:"ئەمانە لەبەر نەزانی و تێنەگەیشتوویی کارێکیان کردوە، جارێ کارت پێیان نەبێ." ئێستاش دوو ڕۆژتان مۆڵەت هەیە، لەم دوو ڕۆژەدا هەرچی زیندەماڵی گەورەو چووکتان هەیە کۆی کەنەوەو بیهێننە ئەم بەردەرگایە."

یەك دوو کەس وەجواب هاتن و گوتیان:

"ئێمە عەبدی خانمان نەکوشتوە، حەمەدۆك کوشتوویە."

بەڵام جەندرمەکان داباڕین، دەسبەجێ گرتیانن و بردیاننە ژوورەکەی پشتەوەو دەستیان کرد بە لێدانیان. هەمزاغا دەسبەجێ گەیشتە سەریان و گوتی:"کاری وا مەکەن، ئەمانە نەفامن، ئەقڵیان پێ ناشکێ. ئەوان نە ئاگایان لە قانوون هەیەو نە هیچ دەزانن. ئەوان نازانن قانوون لە جیاتی حەمەدۆك کە رای کردوە، ئەوان مەحکووم دەکا. بەریان دەن، ئەقڵیان پێ ناشکێ." پاشان رووی کردە جووتیارەکان و گوتی:

"چما حەمەدۆك پاش کوشتنی عبدیخان نەهاتە ئێرەو مزگێنیی پێ نەدان؟ چما ئێوە هەرچی ئەو پێی گوتن موو بە موو جێبەجێتان نەکرد؟ جا هەر لەبەر ئەوە بە بڕوای حکوومەت هەموو تاوانی حەمەدۆك لە ئەستۆی ئێوەیە. بەڵام ئەمن نێوبژیم کردو بە حکوومەتم گوت

ئەوانە تاوانێکیان نیە. گوتم بۆخۆم ئەو ماڵ و دارایی‌یەی لە عەبدیخانیان دزیوە، لـێیان دەستێنمەوە. گوتم ئەگەر ئێوە بتانەوێ هەموو دێهاتی‌یەکان لە دار بدەن، ئەدی کێ زەوی‌یەکانی من ڕەنێو بهێنێ؟ حکوومەت گوتی راست دەکەی و قبووڵی کرد."

دێهاتی‌یەکان بڵاوەیان کردو رۆیشتن. هەموویان گێژو کاس بوون. جارێك هەقیان لە دووی هەمزە دەداو جاری واش بوو بە پێچەوانە هەقیان لە دوو نەدەدا. پیاوەکانی هەمزە لە ماوەی دوو رۆژدا هەرچی ماڵ و حەیوان لە دێ دا هەبوو، کۆیان کردەوەو بردیانە ماڵی هەمزە.

ئەو، هەموو ماڵاتی هەر پێنج دێیەکەی زەوت کردو دەسبەجێ دێ پڕ بوو لە بازرگانی ئەسپ و گاو مەڕو بزن. هەمزە ئاژەڵی هەر پێنج دێیەکەی مێگەل مێگەل لە پێش چاوی دێهاتی‌یەکان بە بازرگانان فرۆشت.

ئەمجار پیاوان و نۆکەرانی هەمزە عەمباری پڕ لە دەغڵ و دانی دێهاتی‌یەکانیان بەتاڵ کردو عەمبارو چاڵەکانی هەمزە پڕ بوون لە دەغڵو دان. بەدوای ئەوەدا سەروسەکوتی کاروانی ئێسترو بازرگانەکانی دەغڵو دان لە دێی دا پەیدا بوو.

هەمزە دەستی پێکردبوو و دەست بەردار نەبوو. دارونەداری دێهاتی‌یەکانی دەبردە ماڵێ خۆی. ئەم تاڵان و برۆیە بۆ دێهاتی‌یەکان جێی باوەڕ نەبوو و رەفتارو کرداری هەمزەو نایب لەبەر چاویان وەك گاڵتە، یان خەون و خەیاڵ دەچوو.

هەمزە تۆو و جووتی دایەوە بە جووتیارەکان بۆ ئەوەی زەوی‌یەکان بکێڵن و دایان چێنن و پاشان لـێیان وەربگرێتەوە:

"پاش ئەوەی خان مرد ئێوە دەنکە دەغلێك چیە نەتان دا بە منداڵەکانی، هەمووتان بۆخۆتان هەڵگرت، ئێستاش دەبێ پێنج ساڵان کاسبی بۆ من بکەن و بۆ ئەوەی هەق بە هەقدار بگاتەوە، ئەمنیش دەنکێك چیە ناتان دەمێ."

رەعیەتەکان گوتیان:

"راستە، دەبێ هەق بە هەقدار بگا. ئێمە خراپەمان دەرهەقی ئاغای خوالێخۆشبوومان کرد." گێژی‌و کاسیی دێهاتی‌یەکان هەتا زستان داهات و بەفر باری و زمهەرپیان لـێبڕا، هەروا درێژەی هەبوو. وەختێك بژیویان لـێبڕا رۆژێکیان تێکڕا بە مل کەچی لەبەر دەرکی هەمزاغا کۆ بوونەوەو گوتیان:

"راستە ئێمە خراپەمان کرد، بەڵام ئەتۆ لێمان خۆش بە. هەر بەڵایەکمان بەسەر بێنی هەقی خۆتە، هەرچیمان لەگەڵ دەکەی بیکە، بەڵام لەم زستانە سەختەدا مەیەڵە برسی بین."

هەمزە، ئەوانەی دراویان هەبوو دەغلّی پیّ فرۆشتن و ئەوانەش کە پوولّ و پارەیان نەبوو، ئەوەی خۆشی دەویست قەرزی لەگەلّ کردو ئەوەش کە رقێکی لیّیهەبوو بە دەست بەتالّی بەرێی کردەوە.

جووتیارەکان، سەرانسەری زستانیّ دەچوونە دەرکی هەمزە، دەستیان بە سنگیانەوە دەگرت و دەپاڕانەوە. هەمزەش لەوە کە جووتیارەکان تووشی ئەو رۆژە رەشە هاتبوون بیّئەندازە خۆشحالّ بوو. سیّ مانگەی زستانیّ جووتیاران لەبەری پاڕانەوەو ئەو کەیفی پیّ هات.

دەوروبەری مانگی رەشەمە مردن دەستی پیّ کرد. منداڵان و کۆنەساڵان یەك لەدوای یەك دەمردن.

جووتیارەکان ئێسك و پێستیان بەسەر یەك دا وشك بوون و توانای بەریّ داروێشتنیان نەما. ئاوایی هەرگیز زستانی وا سەختی بەخۆیەوە نەدیبوو. نایب بەو دراوەی لە هەمزەی وەرگرتبوو خانووبەرەیەکی لە شارۆچکەکەیان دروست کرد. جووتیارەکان هەتا دەست کورت تر دەبوون، گۆشەگیرترو کەم دوێتر دەبوون. رەنگە زۆربلێترین خەڵکی دنیا جووتیارانی تووڕووس بن، بەڵام ئەو ساڵە کەس زاری هەڵنەپچڕیو قسەیەکی نەکرد. دێهاتیەکانی دەوروبەریان کە لە حالّ و وەزعیان ئاگادار ببوون، هەوڵیان دەدا بە پێی توانا یارمەتییان بدەن، بەڵام دێیەکانی دوورتر گوێشیان پیّنەدەدان. پێکەنین نەدەهاتە سەر لێوی کەس و هەموویان لێکتر زویر بوون. هەموویان لە هەموو شتێك، لە بەردو گلّ و لێڕەوارو هەورو باڵندەو پیّڕۆ زیز بوون.

ئەم ساڵ، بەهار بەزەحمەت بە فریایان دەگەیشت. هەموو ساڵیّ لە بەهاران دا هەژاریی خۆیان لەبیر دەچووەوە. ئەمساڵیش بەهار بە هاواریانەوە هات. ئەویش چۆن! بەهاری ئەمساڵ جوانترو گیانبەخش تر لە هەموو ساڵێك بوو... کەس نەیزانی زویری و دڵئێشاوی کەنگیّ تەواو بوو، و هاودەمی و هاونشینی کەنگیّ دەستی پیّکردەوە. بە جۆرێك لەگەڵ یەکتر دەستیان بە قسە کردبوو کەس لەسەر قسەی کەس رانەدەوەستا. هەرکەس تووشی هەرکەس دەبوو قسەیەکی دەکردو دەڕۆیشت. کەس لە زۆربلێیی جاڕز نەدەبوو. چەندین شەو خەو لە چاویان نەکەوت، دانیشتن و قسەیان کرد.

ماوەیەك باس هەر باسی حەمەدۆك بوو. چ ما لەبارەی دا نەڵێن و چ ناو و ناتۆرەیەك ما لێی نەنێن:

"حەمەدە گۆج."

"سواری ئەسپی بۆرە بووە..."

"وەك مێشێك لەسەر ئەسپ نیشتبێ."

"حەمەد یەك لا."

"کوڕینە ئاغام کوشتوە، زەوییەکان ئی خۆتانن، ئاگر بکەنەوە!..."

"بڕوانە دەعیەو دەماری!"

"ڕەعیەتی کەللەکەرو نەفام."

"هەرچی بەسەرتان دێ هەقی خۆتانە."

"کوڕە! ئێوە موستەهەقی بەڵان، هەقی خۆتانە... ئاخر چۆن وەدوای بستە منداڵێك دەکەون؟..."

"وەختێك ئاغامان کوژرا کردتانە جێژن؟!"

"... جێژن و زەماوەند..."

"ئاغامان دەکوژرێ و ئێوەش جێژن دەکەن؟"

"جێژن و زەماوەند بەرپا دەکەن؟"

کەسێك بچێتەی راوەماسی، قوونی تەڕ دەبێ!"

"قوونی تەڕ دەبێ و خەراپتریش."

"خۆ ئێمە لە چاکە بەولاوە لە ئاغامان نەدیبوو."

"لە سەردەمی ئاغامان دا کێ لووتی دەخوێن هات؟"

"هەتیوێك راست دەبێتەوە..."

"بەناوی حەمەدۆك!"

"ناوەکەی سەری بخوا."

"دەردو بەڵای من و تۆ لەسەری بکەوێ."

"هەتیوی برایم سواڵکەری. ئاغامانی کوشت و رۆیشت، نووری چاومانی بردو رۆیشت."

"باشترین ئاغای دونیای کوشت."

"ئاغای خۆمان."

"عەبدیخانی خۆمان."

"بەستەزمانە کاری بە کاری ئێمە نەبوو. بەخۆڕایی هێشتمان ئەو بستە منداڵە بیکوژێ..."

"هەر ئەم حەمەدۆکە..."

"ڕەبی زەلیل بی، وەجاخی کوێر بێتەوە."

"ئەی پیاوکوژ!"

"خوا کوێرت کا..."

"جەرگت سووتێ و ئەجەلت نەیە."

"ڕەبی بە نۆبەتێیان بتوێتەوە."

"یاخوا بای سوور بگرێ."

"جەرگی لەت لەت بێ و بە زاری دا بێتەدەر."

"چۆن ڕوحمت بە ئاغامان نەکرد، بۆچی نانی فەقیرو هەژارانت بڕی؟"

"چۆن توانیت ئاغا گوڵەی ئێمە بکوژی؟"

"پێنج گوندی خاردەشت هەتیو بکەی؟"

"چما ئەتۆ هیچ دین و ئیمانێکت نیە؟"

"ویژدان و بەزەیی و پیاوەتی ناناسی؟"

"ئەتۆ وەك تاریکەشەوی."

"وەك مشکە تۆپیوی."

"وەك شمشێری ڕووتی."

"شمشێری خوێناوی."

"لێت داو لەت و پەتت کردین."

"وەك سەرمای مردنی."

"وەك بوومەلەرزەی."

"وەك برسیەتیی منداڵی برسی وای."

"ناقۆڵای نالەبار."

"دەڵێی جنداری."

"دەڵێی کرمی گڵی."

"چۆن دڵت هات ئاغامان بکوژی؟"

"کە دەت گوت سروەی بەیانیێیە."

"وەك نانی گەرم وابوو."

"وەك جێژن و زەماوەند بوو."

"وەك ئاوی پاكی سەرچاوەی زوڵاڵ بوو."
"وەك نەوەی پاكی پێغەمبەر بوو."
"ئا...خ عبدی‌خان، ئاغاگیان..."
"گوڵی سەرتۆپی ئاغایان، ئازاترینی ئازایان."
"گۆڕەكەت پڕ بێ لە نوور."
"چۆن دڵی هات ئەو كارە بكا؟"
"ئەویش كەسێك كەگیانی بابی سەگێك نابێ."
"هەر شەیتان دەتوانێ جوامێرێكی وا بكوژێ."
"ئەتۆ وەك ئەو نوورە بووی كە كەوتوەتە سەر كابە."

بەم جۆرە پاش چەندینساڵ لەپڕ لەبارەی عەبدی‌خانەوە چەندین تازیەنامەیان داناو چەندین گۆرانی‌یان ساز كردن. ئەمجار عەبدی‌خان دەهاتە خەوی جووتیارەكان. پیرو لاو و ژن و منداڵ عەبدی‌خانیان دەهاتە خەو:

"دوێشەوێ خەونم پێوە دی. ئاغامان پێ‌دەكەنی. گوتی:"ئەمن قاتڵی خۆم حەمەدم بەخشیوە، بەڵام نیگەرانی ئێوەم رەعیەتەكانی خۆم، خۆشەویستەكانم، لە قەبریش دا گریانم بۆتان دێ. دیارە ئێوەش دەرهەقی من خەتابارن." پاشان لە خەرمانەیەكی نوور دا ون بوو."

بەم شێوەیە تا ماوەیەك دێهاتی‌یەكان هەزارو یەك جۆر خەونیان بە عەبدی‌خانەوە دی و گێڕایانەوە. لەپاشانیش عەبدی‌خانیان بە سواری ئەسپ دی كە جل و بەرگێكی سپیی بێ‌دروومانی لەبەردا بوو و بەسەر ئاوەدانی دا دەفڕی. لە مانگەشەو و تاریكەشەو داو نیوەشەوێ و بەری بەیانی عەبدی‌خانیان بە سواری ئەسپ دیبوو كە لە لای عەلی‌كۆوە بۆ لای ئاوەدانی هاتبوو. هێندێك جار دەهات و لەسەر تەپۆلكەكەی بەرامبەر ماڵێ خۆیان هەتا بەری بەیانی بە سواری ئەسپی رەش كوێت رادەوەستاو لەگەڵ كازیوەی بەیانی دەرۆیشتەوە عەلی‌كۆ.

هەموو خەڵكی عەبدی‌خانیان بە سواری ئەسپە كوێت دیبوو، دایەحۆری نەبێ، لەگەڵ "حەسۆ شێلم"و "حەسەن جیك" و مستەفا كە هەردوو پێ‌یان كردبووە كەوشێكەوەو دەیان گوت دیتنی عەبدی‌خان ـ كە هەموو كەس دیبووی ـ درۆیە.

دێهاتی‌یەكان دەیان گوت:

"ئاغامان دڵی لەوانە ئێشاوە، لێ‌یان زویرە، بۆیە خۆیان نیشان نادا."

"حۆری دەبێ بچێتە سەر گلكۆی ئاغامان كەڵەبابێك بكاتە خێر، بەڵكوو ئاغامان بی‌بەخشێ و بێتە بەرچاوی. ئەگینا ئەم زاتە مەمبارەكە گەردنی ئازا ناكا!"

پاش ماوەیەك خەونەكان و عەبدیخان و ئەسپە كوێت و حەمەدۆك هەموو لەبیر چوونەوە. زەبرو زۆری هەمزە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبوو و جووتیارەكانیش ڕۆژ لە ڕۆژ هەژارتر و داماوتر دەبوون. جووتیارانی گوندەكانی خاردەشت ببوونە داردەستی هەمزە. گوتبای كار بكەن، كاریان دەكرد. گوتبای بنوون، دەنووستن. هەستن، هەڵدەستان. دانیشن، دادەنیشتن. فەرمانەكانی بێئەملاو ئەولا بەڕێوە دەچوون. جووتیارەكان بەرە بەرە دەچوونە قووڵایی تاریكی گۆشەگیری و بێمویالاتی و بێ ئەوەی هەست بە هیچ بكەن، نە پێكەنین، نە گریان، نە تووڕەیی، نە شادی، بە ناهومێدی پەلەقاژەیان دەكرد، و چووبوونە دەریای ناهومێدییەوە.

شەوێكیان خەبەری هاتنەوەی حەمەد لە چاوترووكاندنێك دا لە سەرتاسەری ئاوەدانی گەڕا، بەڵام كەس بایەخی پێ نەداو چووكترین سەرنجیان نەدایە. هەروەك خەوێكی خۆشیان لێكەوتبێ، ئەم خەبەرە تەنیا بە زمانیان دا هات و بەگوێیان دا رابورد. بەڵام پاشان وەزعێكیان پەیدا كرد هەروەك گیانیان بە بەردا بكرێتەوە. شتێكی وەك شادمانی و هومێد لە هەناویان دا بزووت و ئەمجار ئەو شادمانییە دەروونییە لەنەكاو بەوپەڕی گەیشت و لە كانگای دڵەوە دەستیان كرد بە پێكەنین و خۆشحاڵی و تا ماوەیەك دێ پڕ بوو لە دەنگدانەوەی پێكەنین. دەنگی جۆش و خرۆشێكی بێوێنە لە ئاوایی گەڕا. هەموو پێدەكەنین، قسەیان دەكرد، رقیان هەڵدەستا، دەگریان، شادمانییان دەكردو وەكەیف دەكەوتن.

لای ئێوارێ بوو كە دێهاتییەكان تووشی رقێكی بێوێنە بوون. بە دارو گۆپاڵ و چەك و شمشێرە كۆن و تەورەوە هێرشیان كردە سەر ماڵی دایەحۆری، و چونكە حەمەدیان لەوێ نەدی، ئاغەڵ و دەرگای ماڵ و تەنیا پەنجەرەی ماڵی دایەحۆرییان وەبەر دارو بەرد داو شكاندیانن و لەنێویان بردن. خانووی باب و باپیری حەمەد چۆڵ بوو. داباریـنە سەری و هێندی بلێی یەك و دوو خانووەكەیان بە دارو دیوارو كاریتەو كۆڵەكەو سەربانەوە كردە خۆڵەمێش. ئەمجار لەبەر ئەوەی رقیان نەنیشتبووەوە، بە دارو بەرد بەربوونە گیانی یەكتر. خوێن بەری چاوانی گرتبوون. دۆست و هاوڕێ و دایك و كچ و باب و كوڕیان نەدەناسی. هەركەس، هەركەسی بەردەست كەوتبایە لێی دەدا.

جەندرمەكان و هەمزاغا لە سووچێك مات ببوون و بە ترس و سامەوە دەیان ڕوانیە رقی هارانەی جووتیارەكان و نەیان دەوێرا لێیان نیزیك ببنەوە.

لێك دان و پێك دادان تا لای نیوەشەوێ درێژەی كێشا. هەموو شتێكی دێیان شكاندو تێكیان دا... و خەڵكەكەش كەسیان نەمابوو لێی نەدرابێ و بریندار نەبووبێ. كەس نەیزانی نیوەشەوێ چۆن لێك بوونەوەو بڵاوەیان كرد.

ئەو شەوە جووتیارەكان پاش چەند ساڵ خەوێكی ئاسوودەو بێ دڵەخورپەیان لێكەوت.

## (٣٤)

لای ئێوارێ بوو کە دەستەی برایمەڕەش و جەندرمەکان ئاشیان گەمارۆ دا. هاواریان کرد:"حەمەد تەسلیم بە"و حەمەدیش بە گوللەیەك وەڵامی دانەوە. پێکەنینیان بەو کارەی حەمەد هات، چونکە ئەمجارە حەمەد زۆر خەراپ پێوە ببوو، و رزگاربوونی لەو تەنگانەیە بە دوور دەزانرا. ئاخر زۆری پێنەدەچوو کە هەرچی جەندرمەو شڵەو قوڵەو هەرچی دێهاتیی پاچ و پێمەڕەو چەك بەدەست لەو دەوروبەرە بوون، دادەبارین و ئاشەکەیان ئابلوقە دەدا.

حەمەد هەرچی بیری دەکردەوە رێگا چارەیەکی بە مێشك دا نەدەهات. لە چەپ و راستی وەك باران گوللە دەبارییە سەر ئاش و برایمەڕەش هەر تاوە نا تاوێك بەدەنگە ئەستوورەکەی هاواری دەکرد:"حەمەد، بە خۆڕایی فیشەکەکانت خەسار مەکە. ناتوانی بە زیندوویی لەم ئاشە بچییە دەر."

حەمەد وەڵامێکی نەدەدایەوە. لەپەنا پەنجەرەی ئاشی دامەزرابوو، و لە هەر جێیەك دووکەڵی بارووت بەرز بووایە، دەیدایە بەر دەسرێژ. سەربانی ئاشەکە گڵ بوو. داخوا رێی تێدەچوو لە سەربانەوە تەقەی لێبکەن؟ ئەگەر ئەمەیان بەبیردا بێ بەڕاستی دەربازبوونی لەو ئاشە لە توانادا نابێ. حەمەد بەردەوام لەنێو پەنجەرەی پێشەوەو پەنجەرەی دواوەو دەرگای ئاشەکەدا هاتوچۆی دەکرد. چەند فیشەکی لە پەنجەرەی پشتەوە بە هێرش کەرانەوە دەنا، چەند فیشەك لە پەنجەرەی پێشەوەو چەند گوللەش لەدەرگای ئاشەکەوە. هەتا کەنگێ دەیتوانی درێژە بەو کێشەیە بدا؟ لە پێش دا تووشی ناهومێدییەکی دژوار هات. پاشان خۆی دایە دەستی قەزاو قەدەر. لەبەر خۆیەوە پێکەنی و چەند جار دووپاتی کردەوە:"رزگاربوون مەحاڵە... ئێمە رێگایەکی دەربازبوونمان بۆ نەماوە..."

سمایلەزلە چووبوو لە قوژبنێکی تەریکی ئاشەکەدا بێ دەنگ و ئارام دانیشتبوو. دەت گوت لە دەوروبەری هیچ رووی نەداوە. ئەژنۆی بە سنگیەوە نووساندبوون و بەهەردوو دەستی لەباوەشی گرتبوون. سەری وەسەر ئەژنۆیانی کردبوو و بەردەوام چاوی دەترووکاندن.

برایمەڕەش بە قینەوە دەیگوت:

"ئاشەکەی بە نارنجۆك لەبەر یەك هەڵتەکێنن. ئەگەر ئەو دەویتە نەفامە رای نەکرد، لەبن بەردان دا دەپلیشێتەوە. ناوی خۆشی ناوە یاغی، ئەمە چ جۆرە یاغییەکە؟ کامە یاغی دێ لە قەوەزی وا دا بە دەستی خۆی، خۆی بە کوشت دەدا؟"

حەمەد بە بیستنی ئەم قسانەی برایمەڕەش دەسبەجێ تەقەی راگرت و چاوەڕێ ما. کاتێك حەمەد تەقەی راگرت، ئەوانی دیکەش بە هەر هۆیەك بوو، دەستیان لە تەقە هەڵگرت.

حەمەد کە هەمیشە لە نێوان دوو پەنجەرەی ئاشیدا هاتوچۆی دەکردو وریای دەرەوە بوو، لە پشت بەردێك برایمەڕەشی دی، بە پێوە وێستابوو تەماشای دەوروبەری خۆی دەکردو بیری لە دژکردەوەکانی حەمەد دەکردەوە. روومەتی ئەسمەرو تێك قوپیو بوون و چەنەگەی بێددانی بەرەو زاری تێهەڵگەڕابووەوە. ئیدی پیر ببوو. حەمەد لە کۆنەوە، لەو کاتەوە کە ئەو چەتەیی دەکرد، دەیناسی. لەو سەردەمەدا برایمەڕەش بەناوبانگترین چەتەی بە زەبروزەنگی کوێستانەکانی تووڕووس بوو. دوایە وەبەر لێبووردن کەوت. هاتە دەشتێ دەستی لە چەتەیی هەڵگرت و ژیانی خۆی لە رێگای راوی ئەو یاغییانەوە کە لە چیاکان دەبوونە مایەی دەردیسەری ئاغاکان، بەرێوە دەبرد. بە دیتنی برایمەڕەش لێدانی دڵی حەمەد توندتر بوو. بیری کردەوە نەکا لە ناسینەوەی برایمەڕەش دا بە هەڵە چووبێ. بەوردی تەماشای کردەوە" برایم نارنجۆکێکی بەدەستەوە بوو، لە کاتێك دا ئەم دیو ئەودیوی پێ دەکرد بە گومانەوە دەیڕوانیە دەوروبەری خۆی. حەمەد لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئەم کابرایە بە هیچ جۆر ئەمن بە پیاو نازانێ. ئەگینا چەتەیەکی کۆنەکاری وەك وی ئاوا بێمویالات نابێ. لەوانەشە برایمەڕەش نەبێ."

پاشان دووبارە بە وردی تێی فکری. بە دیتنی سمێڵە داچۆڕاوەکانی گومانەکەی لاچوو. لەو دەوروبەرە بە دەگمەن کەسێك ئەو جۆرە سمێڵانەی دەهێشتەوە.

حەمەد تفەنگی راست کردەوەو راست لەو لەحزەیەش دا هێرش کەران ئاشەکەیان دایە بەر دەسرێژ. لەو لەحزەیەدا کە برایمەڕەش وەرسووڕا بۆ لای راست و نیازی بوو تەقە لە ئاشی بکا، حەمەد تەقەی لێهێنا. برایمەڕەش وەك لەسەر فەنەرێك دانیشتبێ و فەنەرەکە بەرەڵڵا کرابێ، حەوا دراو کەوتەوە سەر زەوی. حەمەد هەر لەو کاتەدا چەند گوللەی دیکەشی لێدان.

برایمەڕەش بە دەنگێك كە عەرزو عاسمانی وەناڵە دەخست، دەیـنەڕاند، چنگی لە عەرزو لە بەردو دار قایم دەكردو قەپاڵەی لە گیاوگۆڵ و لكە داران دەگرت. تاوێك دواتر لە نەكاو لە پەنای گابەردێك گرموولە بوو و جووڵەی لـێبڕا. دەمەساتێك وڵات بێدەنگ بوو. حەمەد دیتی كە دەستەیەك جەندرمەو چەند كەس لە دارودەستەی برایم رایان كرد. بیری كردەوە:"ئێستا وەختیەتی كە فیزماڵكی بدەمێ." بەڵام نا، دەرەتانی راكردن نەبوو. تەنانەت ترسەنۆكترین جەندرمەو بێوورەترین كەسی دەستەی برایمەڕەشیش دەیان توانی لە پشتەوەڕا تەقەی لـێبكەن و بیكوژن. باشترین كار ئەوەبوو كە لە ئاشی دا مابایەوەو چاوەڕوانی مردن بووایە. تاوێك دواتر دنیا تاریك دەبوو. بەڵام ئەوەندەش روون بوو كە پێش دنیا رووناك بوون لە گوندی كەسمە ڕا، یاوەر فارووق و وەكیل باشی عاصم بە نەفەرەكانیانەوە دەگەیشتنە ئاشی. حەمەد وێڕای ئەوەی لە ژووری ئاشەكەدا هاتوچۆی دەكرد خۆی پێنەدەگیراو لێكدا لێكدا لە پەنجەرەوە تەماشای كەلاكی برایمەڕەشی دەكرد كە لەبن بەردەكە گرموولە ببوو. زۆری پێنەدەچوو كە ئەویش لەو ئاشە دووكەڵ گرتووەدا كە بە داوی جاڵجاڵۆوكە رازابووەوە راست وەك كەلاكی برایم لەبن دیوارێك دەگەوزی و هەموو شتێك كۆتایی دەهات. لەنەكاو رستەی "عەبدی رۆیشت، هەمزە هات، عەبدی رۆیشت، هەمزە هات"ی وەبیر هاتەوەو بە خۆی نەبوو دەستی كرد بە دووپات كردنەوەی. بە دڵەوە ئاواتی بوو ئەم مەتەڵۆكەیە هەڵێنێ. داخوا بەڕاستی ئەمە وایەو خۆلـێلادانی ناكرێ؟ داخوا هەموو شتێك و هەموو ئەو هەوڵ و تێكۆشانە پووچ و بێسوود بوون؟ یانی رێگاچارەیەك نەبوو؟ تاوێكی چاك دەستەكانی رەق بوون و نەیتوانی تەقە بكا. ماوەیەك هەروا بە راماوی لە جێی خۆی مایەوە.

سەیر ئەوەبوو كاتێك حەمەد لە تەقە كردن وەستا، ئەوانی دیكەش گوللەباران كردنی ئاشیان راگرت. تەماشایەكی جەندەكی برایمەڕەشی كرد. سێبەری بەسەر كشابوو. سەری بەسەر سنگی دا شۆڕ ببووەوەو لاچاوی بە لای راست دا كەوتبوو. سمێڵە داچۆڕاوەكانی داچۆڕاوتر دیار بوون. حەمەد وای هاتە بەرچاو كە زەردەخەنەیەك لەسەر لێوانی وشك بووە. حەمەد شەلاڵی ئارەق بوو، و ئەم ئارەقە وردە وردە سارد بووەوە. نەختێك دواتر شتێكی وەك ئاوی سارد تەواوی لەشیی داگرت و هێنایە لەرزین. لەرزینێك بوو كە لە قووڵایی هەناوی هەڵدەستا. چاوی بە سمایلەزلە كەوت كە لە قوژبنێكی تاریك دا وەك كوندێك بێجووڵە هەڵنیشتبوو، و چاوەكانی لە كالانەدا دەدرەوشانەوەو بسكە بسكیان دەهات. پێكەنینی هات و پاشان كە بیری لەوە كردەوە ئاشەكە گەمارۆ دراوەو لەوانەیە دوای تاوێكی دیكە بكوژرێ، هەژانێكی كورت

خایەن وەك بریسكە لە لەشی ساردو سڕی گەڕا. نەیدەویست تەسلیمی مەرگ بێ. لە حاڵێك دا لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"عەبدی ڕۆیشت، هەمزە هات..." چوو بۆ لای پەنجەرە. دەنگی گرمەیەكی بەسام لە دەرێ هەستا، دەنگی گرمەی هەورەتریشقە لەگەڵ حیلەی ئەسپ و تەقەی تفەنگ تێكەڵ بوون و دەنگی خوڕەی ئەو ئاوە كە بە بن ئاشەكەدا دەڕۆیشت، توندتر بوو. حەمەد تەقەی لە ڕەشاییەك كرد كە دەیەویست لە پشت بەردێكی گەورە دامەزرێ. ئەم ڕەشاییەش بە هاوارێكەوە كە گوێی بنیادەمی كەڕ دەكرد وەك تۆپ چووە حەوا. خەریك بوو تاریك دادەهات. هەورە تریشقە گرماندیان، بریسكە درەوشانەوە. دنیا بەتەواوی تاریك بوو. حەمەد گوێی لە دەنگی وەكیل باشی عاصم بوو كە دەیگوت:

"دوو نارنجۆك باوێنە ئەو دەرگایە"

كەمێك دواتر دەرگای ئاشەكەو لاشیپانەكانی بە دەنگە دەنگێكی زۆرەوە تێك ڕووخان و قەڵشتێكی فرەوان دروست بوو كە حەمەد دەسبەجێ ئەوێی دایە بەر دەسڕێژ. بەڵام پەنجەرەكان و كولاوكەی سەربانی بێدیفاع مابوونەوە.

وەكیل باشی عاصم هاواری كرد:

"حەمەد ئەتۆ كوڕێكی ئاقڵی. یاوەر حەز ناكا تۆ بكوژرێی. سەدان كەس ئاشیان گەمارۆ داوە. ڕێی دەربازبوونت نیە. وەرە تەسلیم بە! یاوەر حوكمی لێبووردنت بۆ وەردەگرێ. ئەو ئاگای لە هەموو شتێك هەیە. ئەگەر تەسلیم نەبی، بەنارنجۆك ئاشەكەت بە سەردا دەڕووخێنین."

دنیا ئیدی بە تەواوی تاریك ببوو. بەرە بەرە بارانەكەش توندی دەكردو لە هەموو جێیەك ئاو بە لافاو بەسەر زەوی دا دەڕۆیشت. ئەسپەكان لە پەستا دەیان حیلاند ، حەمەد نەیدەتوانی لێكی داتەوە كە ئەسپەكان چەند دەبن ـ لافاوێكی باوەڕ پێنەكراوی گوللەی ئەو جەندرمانە كە لەبەر باران مابوونەوە، بەرەو دەركە ڕووخاوەكەی ئاشی وەڕێ كەوتبوو.

وەكیل باشی عاصم نەڕاندی:

"ئاوەكەی وەسەر ئاشی گێڕن."

حەمەد زانی كە وەكیل باشی دەیەوێ بیترسێنێ، چونكە ئەو كارە بە هیچ جۆر ڕێی تێنەدەچوو. ئەگەر دنیا تاریك نەبایە دەیتوانی گوللەیەك بە قوربانی یاوەر بكا. ئەگەر یاوەری بە دیل گرتبایە لێی دەپرسی:"هۆی چیە كە وەختێك عەبدی ڕۆیشت، هەمزە هات؟..." لەوانە بوو ئەو وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. ئاخر هەرچی بێ، ئەو یاوەرێك بوو، سێ

ئەستێرەی لەسەر شان بوون. دەستەکانی حەمەد وەك مەکینە کەوتنەکار. لەو بەینەدا دوو نارنجۆکی دیکە هاوێژرانە بن دیواری پەنا دەرگا رووخاوەکە. لەگەڵ دیوارەکە، بەشێك لە بانەکەش رووخاو راست لەو لەحزەیەدا دەستێك کەوتە سەر شانی و حەمەد راچەنی. سمایلەزلە کە لەو تاریکاییەدا بەزەحمەت روخساری دەبینرا، بە دەنگێکی کزەوە گوتی:"راوەستە حەمەد، تاوێك گوێت لە من بێ. سێ مانگ لەمەوبەر یاغییە کەچەڵ تفەنگێکی بە سەدوپەنجا فیشەکەوە لەکن من داناو رۆیشت. وەختی رۆیشتن گوتی:"با لێرە بن حەوتوویەکی دیکە دێم دەیان بەم. ئیدی نەهاتەوە. ئێستا دەچم ئەوانت بۆ دەردێنم. ئەتۆ تەسلیم مەبە. حەمەدی من، ئەتۆ نابێ تەسلیم بی. نە دەبێ تەسلیم بی و نە دەبێ بکوژرێی."

پاشان هاواری کرد:"وەرە لێرە دامەزرێ. هەتیوە ولاغە ناوی خۆشی ناوە یاغی! ئەگەر ئەوانەی دەرێش وەك تۆ کەر نەبان تا ئێستا سەد جاریان لەم ئاشەدا راو کردبووی!"

دوایە قۆڵی حەمەدی گرت و لەگەڵ خۆی بردیە بن گومبەزێکی دارین و گوتی:"جا ئێستا با ئەو تووتکەسەگانە هەرچەندی پێیان خۆشە نارنجۆك باوێن."

ئێستا حەمەد بێنیشانە تفەنگی بە تاریکییەوە دەنا. وەکیل باشی عاصم بە دەنگی بەرز هاواری دەکردو هێندێك شتی دەگوت کە حەمەد لـێیان حالّی نەدەبوو، دەنگەکەی لە چۆڕەچۆڕی باران و حیلەی ئەسپان و ویزەویزی گوللان دا ون دەبوو.

سمایلەزلە بە خۆی و فیلیننتایەکی نوێی ئەڵمانییەوە هاتەوە. تفەنگەکەی پڕ کرد لە فیشەك و دوو تفەنگی بە تاریکییەوە نان و گوتی:

"کەچەڵ تفەنگێکی چەند لە دەستان خۆشی هەیە."

پاشان دیسان قۆڵی حەمەدی گرت:"ئەمن لێرە تا بەیانی ئەم سەگانە دەخافڵێنم. ئەتۆ هەر لێرەوە خۆت بدە دەم ئاو. مەترسە، لە هیچ کوێ گیر ناکەی. خۆت بدەم دەم ئاوەکە... مەترسە، ئەمن وریا دەبم و نایەڵم هیچ کەس نیزیك بێتەوە. لەگەڵ ئاوێ بڕۆ، ئەتۆ بڕۆ... رێگای دیکەت نیە. وەختێك ئەتۆ رۆیشتی ئەمن تەسلیم دەبم."

سمایلەزلە جەندرمەکانی بەر بارانی وەبەر گوللە دابوو. حەمەد لە نێوەڕاستێ ئاشی راوەستابوو بیری دەکردەوە. جاری وابوو شەپۆلێکی حۆشحالّی سەرانسەری ئەندامیی دادەگرت و بالّی پێ دەگرت، جاری واش بوو خەفەت دایدەگرت، خەفەتێکی وەك برژانەوە، وەك ئێش و ئازار رێکی دەگوشی و شتێك بەری ئەوکێی دەگرت.

سمایلەزلە نەڕاندی:

"بۆ راوەستاوی هەتیوە چڵمنە. ئێستا وەختی راوەستانە؟ وەرێ کەوە بڕۆ."
حەمەد گوێی لە هیچ نەبوو. ئەفسوونی لـێکرابوو. لە نێو ئەو هەنگامەیەدا بێخەیاڵ لە جێی خۆی رەق رامابوو.
سمایلەزلە دەیگوت:
"کوڕە رامەمێنە! بڕۆ کوڕە... کوڕی خۆم، جگەرگۆشەکەم، حەمەدۆکی خۆم، ئاوا لەوێ رەق مەبە، بڕۆ! مەترسە!"
سمایل وێڕای تەقەی بێپسانەوە لە تاریکایی و باران پەیتا پەیتاش لەبەر حەمەد دەپاڕایەوە:
"دەبەر ئەو چاوانەت مرم، کوڕی خۆم، جەرگەکەم، حەمەدی خۆم، باران تۆی رزگار کرد. ئەگەر ئەم بارانە نەبایە ئاشەکەیان بەسەر دا دەڕووخاندین. توخوا بڕۆ، سمایلەزلە بە قوربانت بێ بڕۆ! باران نەجاتی دای. ناشکوری بەم نیعمەتەی خوا مەکە، بڕۆ!"
دەچووە دەرێ، تەقەیەکی لە تاریکی دەکردو دەگەڕایەوە لای حەمەدو لەبەری دەپاڕایەوە:
"بڕۆ برالە! باران دەربازی کردی بڕۆ. ئەمن تا بەیانی دەیان خافڵێنم بڕۆ! ئەجەلت نەهاتوە بڕۆ! باشم بیر کردەوە، لەگۆ فکران ڕاچووم، لەم هەل و مەرجەدا ئەتۆ نابێ بمری! باران باری و نەجاتی دای، بڕۆ!"
غاری دەدا، دووسێ بەستە فیشەکی داویشتن و دەهاتەوە، بە تووڕەیی دەیگوت:
"بڕۆ ئیدی چەتەی شێتی نەفام! هەر بەو کەرییەتییە بوو کە ئێمەشت لە ئاگر هاویشت، دەبڕۆ!"
وەختێك دیتی بێسوودە قۆڵی حەمەدی گرت و هەوڵی دا رایکێشێ بۆ ئاوەشەمی ئاشی. بەڵام نەیتوانی لە جێی خۆی ببزێوێ:
"هەی ماڵێ بابت خەرا بێ هەی. بەڵام قسەی خۆمان بێ زۆر بەتاقەتی ها!"
پاشان هەر لەوێ لە تەنیشت حەمەدی دانیشت و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ: "ئەمن چ بکەم. نایەوێ بڕوا. کەر بووە. گەوج بووە، ناڕوا. بە دەستی خۆی، خۆی بە کوشت دەدا. ئەی ئوممەتی محمد! تا ئێستا کەری واتان دیوە؟ بەتەما بوون هەتیوی برایم سوالکەری لەمە باشتر بێ؟"
راست لەو کاتەدا لە دەرگا رووخاوەکەوە رێژنە بارانێکیگوللە هات و لە پەنای لاقیان لە دیواری تەنیشتیان درا:
"فەرموو بگرە! ئێستا مەڕۆ. هەردووکمان لێرە دەکوژن. بڕۆ کوڕم، حەیفە! لەبەر بەری پێیانت مرم خۆت بە کوشتن مەدە! باران باری و نەجاتی دای. خۆت بە کوشت مەدە. حەمەد دەست و لاقت ماچ دەکەم بڕۆ خۆت بە کوشت مەدە! هەتیوە گەوجە بڕۆ خۆت بە کوشتن مەدە!"

دیسان دەنگی وەکیل باشی عاصم بەرز بوو. حەمەد گوێی لێنەبوو. سمایلەزلەش لێی حاڵی نەبوو. ئەگەر سمایلەزلە خۆی لە پشت سەکۆ بەردەکەی پەنا دەرگای ئاشی نەگرتایە، بارانەی گوللە دابێژ دابێژی کردبوو. لە دەرێ ئاگری لوولەی چەکەکان لە پەستا بەردەکان و باران و دارو ئاو و کاولە ئاشەکەی رووناك دەکردەوە. باران وردە وردە نەرمی دەکردەوە.

سمایلەزلە بیری کردەوە:

"چ بکەم. رێگا چیە، چۆن ئەو کوڕەی لێرە رەوانە بکەم. ئەو کوڕە زۆری بەڵا دیوە، ئەمنیش کە هیچ پێشوازی‌یەکی باشم لێنەکرد، کارێکی ناحەزم کرد. بە قسەی قۆڕی دێهاتی‌یەکان هەڵخەڵەتابووم. پاشان برسیەتییش مێشکمی لەقاندبوو."

بریسکەیەکی توند ئاسمانی قەڵاشتەوە. لەحزەیەك دەوروبەری وەك رۆژی رووناکی لێهات. حەمەد بزووت، خەریك بوو بکەوێ، خۆی گرتەوە. لە نەکاو لەشی هەتا بەری پێی شەڵاڵی ئارەق بوو و دەسبەجێ ئارەقەکەش سارد بووەوە. رەق بوو. سەرما دایگرت و دەستی کرد بە هەڵلەرزین. ددانی، ددانی نەدەگرت:

"حەمەد کوڕی خۆم. مەیەڵە بت کوژن. بڕوانە بارانەکە خەریکە لێی دەکاتەوە، وەرێ کەوە بڕۆ!"

حەمەد دوو هەنگاوی بۆ لای سمایلەزلە هەڵێنانەوە. ئەوی لە باوەش کردو بە راوێژێکی گەرم و خەفەتاوی گوتی:"بژی، خۆش بی مام سمایل، خوا بت پارێزێ. دیسان دێمەوە. ئەمن بە نیو سەعات لێرە دوور دەکەومەوە، ئەتۆ زۆر تەقە مەکە. پاش نیوسەعات تەقە راگرە. تفەنگەکەش تاقەت کە، تفەنگێکی باشە. خواحافیزت بێ..."

قسەیەکی دیکەی نەکردو رۆیی بۆ لای ئاوەکە. سمایلەزلە بە دوایەوە بوو. حەمەد بێ هەست و خوست لە کونەکەوە خۆی دایە دەم ئاو.

سمایلەزلە کەیفی ساز بوو، بێپسانەوە تەقەی لە تاریکایی دەکرد. لەوە کە حەمەد رزگاری ببوو لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بوو. دڵی لێواو لێو لە خۆشی و شادی بوو.

سمایل هەتا بەیانی تەقەی کرد. بارانەکە راوەستا. کازیوە ئەنگووت. هەوا خەریك بوو بوولێڵ دەبوو. یاوەر فارووق بەهەمموو داروودەستە چەکدارەکەیەوە پەلاماری ئاشیدا. دەوری دە دەقیقە بارانەی گوللەو نارنجۆك بەسەر ئاشی دا باری. دەنگێك لە ئاشی نەدەهات. چاوەڕێ مان، دیسان دەنگێك نەهات. چاوەڕوانی‌یەکە لە توانادا نەبوو. وەکیل باشی عاصم بانگی حەمەدی کرد. وەڵامێك نەبوو. دەترسان فێڵێك لە کاری حەمەد دا هەبێ. بە هەمموو هێزیانەوە ئاشیان وەبەر نارنجۆك و گوللە داو دیواری پشتەوەشیان رووخاند. بەشێك لە ئاشەکە بوو بە

تەپۆلکەیەکی گڵ و بەرد، بەڵام دیسان دەنگێك لە ژووریّ ئاشی هەڵنەستا. وەکیل باشی عاصم و یاوەر فارووق بانگی حەمەدیان کرد، دەنگ لە داروبەردی هات، لە ئاشی دەنگێك نەهات.
وەکیل باشی عاصم گوتی:

"کوشتوومانە، زۆرم پەرۆشی ئەو کورەیە یاوەر! حەیف!"

ئەمجار دوو دڵۆپە فرمێسکی درشت بە روومەتی دا هاتنەخوار.

یاوەر پرسی:

"یانی ئەوەندەت خۆش دەویست؟"

"نازانم."

بە بێسەبری چاوەڕوانی تاوهەڵات بوون.

هەتاو کەوت. وەکیل باشی عاصم بانگی کرد. جوابێك نەبوو. وەکیل باشی هەستا. لاقی دەلەرزین. لەڕێ دا بەلادا دەهات. لە دوورەوە دیار بوو بە ترسەوەو بە خەفەتباری هەنگاو هەڵدێنێتەوەو توانای دیتنی تەرمی حەمەدی نیە. لەو ساتەوە کە دەنگی تەقە لە ئاشی بڕا، لەوانە بوو بە ئەندازەی پازدە ساڵ پیر بووبێ. دڵی پڕ لە خوێن بوو. خەفەت وەك داوی جاڵجاڵووکە دەوری دڵی تەنیبوو. دە هەنگاوی مابوون بگاتە ئاشی، راوەستا. ویستی جارێکی دیکە بانگی حەمەدی بکا. بەڵام ددانی بەسەر یەك دا رەق بوون. زاری هەڵنەپچڕا. هەر لەوێ لە جێی خۆی رەق بوو. نەیتوانی هەنگاوێکی دیکە بچێتە پێش. ئەو دەیزانی حەمەد لەوێ بە تەنیایەو پاش ئەوەی تەقەشی راگرت، ناتوانێ رابکا. ئەگەر نەکوژرابا، حەتمی جوابی دەدایەوە. کەوابێ، دیارە کوژراوە.

وەکیل باشی عاصم بە دڵی داهات:"ئیشەڵڵا هەر بریندار بووە."

یاوەر لە پشتەوە گوتی:"چتە وەکیل باشی عاصم، دەترسێی؟ بە مردوویش لە حەمەدی دەترسی؟"

وەکیل باشی ئاوڕێکی دایەوە لای یاوەرو پاشان چووە ژووریّ ئاشی. لە نەکاو زەردەی هاتێ و روخساری پڕ بوو لە شادی و هاواری کرد:

"جەنابی یاوەر ئەنگواوەو مردوە... ـ یاوەر غاری دایە لای ئاشی ـ بەڵام ئەوەی پێکراوە، حەمەد نیە."

سمایلەزلە لەسەر چۆکان کەوتبووە سەر زەوی. قۆنداغە تفەنگەکەی لەلای راستی سینگی بوو و لوولەی تفەنگەکەی لە عەرزی چەقیبوو و دەستیشی لەسەر پەلاپیتکە بوو. گوللە لە لای چەپی سینگی درابوو، لە پشتێی دەرچووبوو. کەمێك خوێنی لەبەر رۆیشتبوو و ئەختێك ئەولاتر کۆیەك قاوانە بەتاڵ کەوتبوونە سەر یەك.

## (٣٥)

مــەیــدانە ئـەسپـی ئـانـاوارزا!
کراسێکی لە خوێن دا شەلاڵ!
بـەزەیی عاشیرەت، بـەزەیی!
وەکازی دەستی ژنێکی کوێر!

ئادەم پاش ئەوەی ئەسپی بۆرەی کوشت، رووی نەکردەوە کێلگەکەیان. چونکە ئەگەر چاوی بە عەلی سەفابەگ کەوتبایە بیانوویەکی نەبوو خۆی پێ وەپەرێنێ. وەڕەزیی خێزانیی کردبوو. هێندێك شەوان ئەو تامەزرۆییە لە دەروونی دا دەجوولا کە بە دزییەوە بچێتەوە سەردانی ژنەکەی، بەڵام بە هیچ جۆر نەیدەتوانی بچێ. بە بێ کوشتنی ئەسپی خەنەیی، چۆن دەیتوانی بچێتەوە ئاوەدانی و بە چ روویەکەوە چاوی لە چاوی ئاغای و ژنەکەی و خەڵکی ئاوایی کردبایە. لە راوچییەکی کارامەی وەك وی کە هەرگیز تفەنگی بەخەسار نەدەچوو. دوور بوو کە نەتوانێ ئەسپێك بهەنگێوێ، ئەویش لە دەشتێکی رێك و هەموواردا! داخوا هەقی خۆی نەبوو بە هەمووان تف لە رووی راوچییەکی وا بکوتن؟ چما ئەو نەیدەزانی ئەم رۆژانە لە ئەدەنەوە بگرە تا مێرسین و تارسووس، لە جەیهانەوە تا کووزان و قەدیرلی، لە عوسمانیە تا دوورت یۆل و تا "پایاس" لە چیاکانی "کاڤوو" تا "ئالاداغی" چ لادێیی و چ شارستانی هەموویان باسی وی دەکەن و دەڵێن:"بەڕاستی ئابڕووچوونە کە ئادەمی مێرشکاری عەلی سەفابەگ نەتوانێ ئەسپێك بکوژێ"؟ چما نەیدەزانی کە هەمووان چاویان لە رێیەتی؟" چما ئەقڵ دەیگرێ کە راوچییەکی وا نەتوانێ لە ساکە دەشتێ دا ئەسپێك کە بە رێ دا دەڕواو غار دەدا بە تفەنگ بپێکێ؟ شتی وا قەت رێی تێ ناچێ." خەڵك هەقیانە.

ئەوان چۆن تێبگەن کە ئەو ئەسپە ئەفسوونی لێخوێندراوەو گوللە کاری لێناکاو تفەنگی وێ ناکەوێ. چۆن بزانن ئەو گوللەیەی هاویشتتە ئەسپی خەنەیی، کەوانەی کردو لە ئەسپەکەی خۆت درا. ئەوان هەر ئەوەندە دەزانن پاشملە باست بکەن و گاڵتەت پێ بکەن. ئاغا دەست رۆیشتووەکان، خانەکان، کەسانی وەك عارف صائم بەگ دەوری عەلی سەفا بەگیان گرتوەو لە پەستا خەبەری ئادەمی لێدەپرسن. عەلی سەفابەگی بەستەزمان چ جوابێکیان بداتەوە؟ مینگە مینگ دەکا، تفی خۆی قووت دەداتەوە، بەڵام قسەیەکی نیە بیکا. بێچارە چیی هەیە بیڵێ، بڵێ:"ئادەم رۆیشت و ئیدی نەهاتەوە."؟ رەنگە هێندێك شتیش ساز کاو تەحویلیان بدا. بەڵام نا، عەلی سەفابەگ پیاوێکی زۆر بەحەیاو بە شەرمە. درۆو چاوڕاو نازانێ. ئێمە چاك بۆ ئەو بەستەزمانە بووینە مایەی ژانەسەر."

ئادەم سات بە سات زیاتر و زیاتر رقی لە خۆی هەڵدەستا: یان ئەسپی خەنەیی دەدۆزێتەوەو دەیکوژێ، یان فیلینتا لە شان ئاوارەی دەشتی ئاناوارزا دەبێ.

ئەسپی خەنەیی بە شێوەیەکی ئەفسووناوی ون ببوو. ئادەم چەندین رۆژ بۆ دیتنەوەی هەموو جێگایەکی پشکنی. بەڵام تەنانەت جێپێیەکیشی دەست نەکەوت. چەندین سەعات لەنێوەڕاستی دەشتێ لەبەر هەتاوی سووتێنەر رادەوەستا، بەدەم فکرو خەیاڵەوە ئارەقی دەڕشت و لە گەرمان رێك دەهات.

لەبەیانییەوە تا ئێوارێ چەندین سەعات لەبەر هەتاوی سووتێنەر دەمایەوە. ئەوەندەی لەبەر هەتاو ڕابکاتە ئەم لاو ئەولای دەشتێ و ببێتە سەگی هاهایە، جلەکانی بەری شەڵاڵی ئارەق ببوون. ئەسپی خەنەیی ببووە ئاو و بە عەرزێ دا چووبووە خوار. ئادەم بیری دەکردەوە:"نەکا ئەسپەکە چووبێتە "ئۆرفە" مەوتەنی خۆی؟ نەکا چووبێتە کەوڵی باڵندەیەك، مارێك، جانەوەرێك، پەپوولەیەك یان رێوییەك و لە پێش چاوم بەم لاولادا بڕوا؟ ناکا ئەو پەڕەسێلکەیە بێ کە راست بە بەر لووتم دا تێپەڕی، نەکا ئەو هەڵۆ زەلامە بێ کە هەمیشە لەسەر شاخەکانی ئاناوارزا چەرخان دەدا؟"

ئادەم شەوێکیان نووستبوو. لەخەوێ دا هەستی کرد کە حەیوانێکی زەلام روومەتی دەلێسێتەوە، هیچ وەك بەرازو سەگ و گاو گورگ و ئەو جۆرە شتانە نەدەچوو، وەك هیچ گیاندارێك نەدەچوو. رەنگی سپی بوو و زۆریش زەلام بوو. زەلام تر لە ئەسپێك. ئادەم تفەنگەکەی دەست دابوویەو رای کردبوو، و لە بەردەڵانەکانی ئاناوارزا هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشابوو. ئەو جانەوەرە سەیرە ماوەیەك وەدوای کەوت. پاشان گەڕایەوەو رۆیشت:"ناکا ئەو بووبێ؟"

بەشێکی دەشتەکە ئاگری گرتبوو. وەختی سووتمانەکە ئادەم خەوتبوو. خەونی دەدی کە کەوتوەتە نێو کۆیەك ئاگر. لە نەکاو لە خەو ڕاپەڕی، ئەگەر لەحزەیەك درەنگتر وەخەبەر هاتبا، لەنێو ئاگردا دەسووتا. بڵێسە ئاور لە چاولێك نانێك دا دەورەیان گرت. ئادەم بەم لاو لادا دەستی کرد بە غاردان. بڵێسە ئاگر لە هەموو لاوە لەنێو خۆیان گرت و لەنێو خەرمانەیەکی ئاوردا گەمارۆ دراو لەنێو ئاگرێکی وادا بەم لاو لادا غاری دەدا. گڕی ئاگر دەشتی دەلستەوەو دەچووە پێش. ئادەم بێخەبەر لە خۆی لەنێو ئەڵقەی ئاگر دا مایەوەو گوێی بۆ دەوروبەری هەڵخست. دەشت پڕ لە زیرو هۆڕی حەیوانات و دەنگی جڕوجانەوەر بوو... دەنگی باڵندەو مارو جڕوجانەوەر تێکەڵ دەبوو، زەوی بە ئاگری سوور دادەپۆشرا، دەسووتاو دەیناڵاند.

لە پڕ ئەسپی خەنەیی وەك هەورێك، وەك سێبەرێك لە بەرامبەری دەرکەوت. سێبەرەکە گەورەو گەورەتر بووەوەو هەزاران بیچمی گۆڕی. سێبەرەکان پان تر دەبوون، درێژ دەبوونەوە، کورت دەبوونەوەو لەدەوروبەری ئەسپی خەنەیی هەڵدەپەڕین و ئەسپی خەنەییش بێ ئەوەی لە جێی خۆی ببزوێ، پان دەبوو، درێژ دەبوو، گەورە دەبوو و چووکەڵە دەبووەوە.

شەپۆلێك بڵێسە ئاگر بە ژوور سەری ئادەم دا تێپەڕی کە ئەگەر دەسبەجێ خۆی لە باتڵاغەکەی نیزیك خۆی نەهاویشتبایە، دەسووتاو دەبوو بە خۆڵەمێش. ئادەم تا بەیانی لەنێو ئەو باتڵاغەدا کە پڕ بوو لە حەیوان و جانەوەری ڕاکردووی دەستی سووتمان، لەنێو هەزاران بوونەوەردا کە دەیان ناڵاند، هاواریان دەکرد، دەیان نەڕاند، مەلەیان دەکردو پەلیان دەکوتا، مایەوە. وەختێك تاو کەوت هەتا پشتێنێ بە باتڵاغەکەدا چووبووە خوار.

ئادەم هەتا ئاخری ژیانی هەرگیز ئەو شەوەی سووتمانەکەی لەبیر نەچوو.

سەرانسەری بەردەڵانەکانی قەڵای ئاناوارزا بە هەموو کەلێن و قوژبنەکانیەوە گەڕابوو، هەموو کەلێن و قوژبنێکی ئاکچاسازی بە قامیشەڵان و لێڕەوارو باتڵاغ و دەشت و دەرەوە بست بە بست پشکنیبوو، بەڵام تووشی ئەسپی خەنەیی نەبوو. جاری وابوو ناهومێد دەبوو، لە شەرمان دەبوو بە ئاو و بەعەرزێ دا دەچووە خوار. دیسان لە نێو دەشتی ئاناوارزا، لەبەر خۆرەتاو لەو فکرە دا کە دەبێ ئەسپی خەنەیی لە کوێ بێ، لە جێی خۆی ڕەق ڕادەما.

لەنیوەڕۆیە بەم لاوە لە بەستێنێك دا بێجووڵە ڕاوەستابوو:"دەبێ خەنەیی لە کوێ بێ؟" ئەگەر ئەسپەکە لەو دەشتە بایە لانیکەم جارێك تووشی دەبوو. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"کوڕە، با وازی لـێبێنم و بڕۆم، بە گۆڕی بابی ژن و عەلی سەفابەگ و میرشکاری... سەری خۆم هەڵگرم و بچمە یوورەگیر لەلای ئاغایەك ببمە مەیتەر. لە کۆنەوە

لە مەیتەری دا لینگەم نەبووە... لەوانەشە لە داخی ئەو ئەسپە ئەحلەتی‌یە نەتوانم مەیتەری بکەم..."

لەسەر جادەیەکی خۆڵ جووتە جوانوویەکی سێ ساڵەی چاو گەورەو لاق باریك و راکشاو بە دوای جووتە ماینێکی کوێتی زەلام دا دەڕۆیشتن. کەفەڵی پان و قەڵەوی ماینەکان لەبەر تیشکی هەتاو دەبریسکانەوە. جوانووە ئەسپەکان لەدەوری ماینەکان کە بەسپایی بە جادە خۆڵاوی‌یەکەدا دەڕۆیشتن، خولیان دەدان و هەڵدەبەزین و لەگەڵ دایکەکانیان یاری‌یان دەکرد.

ئادەم فکری کردەوە کە ئێستا بەو گەرمایە ئەسپی خەنەیی لە قوژبنێکی فێنك و بەلاوەیە. ئەو ئەسپە زۆری گیانی خۆی خۆش دەوێ. مسۆگەر جۆگەلە، یان کانی‌یەکی روون و فێنکی وەك سەهۆڵیشی بەبن پێ دا دەڕوا کە وردە بەردەکانی لەبن دا دیارن:"دەبێ لە کوێ بێ؟" ئادەم هەموو کەلێن و قوژبنە چۆلەکانی ئەو دەشتەی هێنایە بەرچاوی خۆی، نەی‌توانی لەسەر هیچیان ساغ بێتەوە.

دەبێ لێ‌دا بڕوا، بڕواو هەموو شتێك بەجێ بهێڵێ و وازی لێ‌بێنێ... هەموو شتێك، ژنەکەی، ماڵەکەی، عەلی سەفابەگ و دەشتی ئاناوارزا. بەڵام بە دڵی‌دا هات کە لەم دەشتە نەبێ لە هیچ کوێ‌یەکی ئەم جیهانە ناتوانێ بژی. لەفکری خۆی دا هەموو شتێکی بەجێ دەهێشت و دەڕۆیشت، سەری خۆی هەڵدەگرت و دەچوو بە سواری کەڵەك لە جەیهان دەپەڕیەوە ئەوبەرو دووبارە دەهاتەوە دەشتی ئاناوارزا، هەودایەك لە لاقی و لە رەگ و ریشەی دڵی هاڵابوو کە ئەوی دەگێڕایەوە.

ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە بزانێ هۆی ئەم ئۆگری‌یە بە ئاناوارزاوە چیە، بەڵام بێ‌ئاکام بوو. هەتا رۆژێکیان هەروا کە راوەستابوو لەبەر هەتاوی گەرم چۆڕ چۆڕ ئارەقی دەڕشت و لە فکری دۆزینەوەی جێگای ئەسپی خەنەیی‌دا بوو، لە نەکاو تروسکەیەك لە زەینی دا درەوشا:"ئەو شتەی ئەوی بە ئاناوارزاوە دەبەستەوە، ئەسپی خەنەیی بوو."

دەی‌توانی واز لە هەموو شتێك بێنێ و هەموو کەس بەجێ بهێڵێ، بەڵام نەی‌دەتوانی ئەو ئەسپە خەنەیی‌یە لەنێو دەشتی ئاناوارزا بەجێ بهێڵێ و بڕوا. هەتا ئێستا ئەم هەستە دەروونی‌یەی نەناسیبوو. هاواری کرد:"کوڕە، لێ‌دەدەم دەڕۆم چما ئەو ئەسپە دایك و بابی منە، مەگەر دەست و لاقی منە؟ وازی لێ‌دێنم و دەڕۆم کوڕە!"

لە لێواری جەیهان سواری کەڵەك بوو، پەڕیەوە ئەوبەرو دووبارە گەڕایەوە. هەر دوو رۆژ جارێك سواری کەڵەك دەبوو، دەپەڕیەوە ئەوبەری چۆمی و پاشان دووبارە دەهاتەوە.

خەو لەبن سێبەری شاخی چەند خۆشە ئەگەر شاماری نەبێ. جوانی کورتەبالاّ بۆ حەزلێکردن چەند باشە ئەگەر کەم شەرت نەبێ! خۆ ئەسپ لە شامار ناترسێ... "کێ گوتوویەتی ئەسپ لە ماری ناترسێ؟" لە خوار شاخەکانی ئاناوارزاوە بایەك هەڵی کرد، گێژەڵوکەیەك هەستاو دەسبەجێ کەوتەوە.

"دنیا زۆر گەرمە، بڵێی ئەسپی خەنەیی لەنێو شاخان دا لەبن سێبەری تاتەبەردێك مابێتەوە؟"

گابەردەکان گەرم و تواوەوە بوون. دەت گوت لە گەرمان دووکەڵیان لێهەڵدەستێ. هەوا پڕ بوو لە بۆنی جاترەی وشك. قووڵکە بەردەکان و دەوەنەکان و نینۆکە شەیتانەکان بۆنی جاترەیان لێدەهات. هەموو شتێك وشك ببوو. لە شاخەکان دا چووکترین شوێنەواری سەوزایی و ژیان نەدەبینرا. شاخی بنەوشی، خاکی، شینی کاڵ، سوورو زەرد هەموویان لە گەرمان دەتەقین. ئادەم لەبن شاخێك شوێنی ئەسپێکی لەسەر گڵ دی. وەدوای شوێنەکە کەوت. شوێنەکە دەچووە ئەشکەوتەکەی رووبەڕووی. هەرچەند لەدۆزینەوەی ئەسپی خەنەیی تەمابڕاو ببوو، بەلاّم دیسان خۆشحاڵ بوو. لەلایەکی دیکەش ترسی رێنیشت. دەستەکانی کەوتنە لەرزین. شاخ و داخ بەری پێیانی شەقار کردبوو.

شاخەکان لە گەرمان دەتوانەوە، نەدەکرا پێیان لێنێی چونکە ئێشەکەی کاری لە ئێسکی بنیادەم دەکرد. ئادەم ددانی لە چیڕەوە دەبردن. چاوی پڕ ببوون لە ئارەق و دەبرژانەوە. شوێنەکە ئەوی هەتا زاری ئەشکەوتێ بەکێش کرد. لە قەڵشتە شاخەکان دا درووی وەك دەرزی تیژ شین ببوون. کاتێك لە ئەشکەوت نیزیك بووەوە، ماری ژاراوی خۆڵەپۆتینەی دیتن کە بەسەر شاخەکان دا دەخزین. لەبەر زارکی ئەشکەوتێ لەسەر عەرزی نەرمی قاوەیی تۆزاوی شوێنی باڵندەیەك دیار بوو. لەدەوروبەری شوێنی باڵندەکە هێندێك جێ پێی گەورەو چووك وەك شوێنی چەقەڵ و رێوی دەبینران... راست لەنێوبەندێش دا جێ سمی ئەسپێك کەوتبووە سەر زەوی. سێ پەلی ئەسپەکە ناڵیان پێوە نەبوو. ئادەم شوێنەکەی هەڵگرت، گەیشتە دەرکی ئەشکەوت قووڵکەیەکی درێژو تاریکی پڕ لە شەمشەمەکوێرە بوو. شەمشەمەکوێرەکان بەمیچی ئەشکەوتەکەوە نووسابوون و پێیەوە هەڵواسرابوون.

رەشاییەك لە تاریکایی دا بزووت، لە قووڵایی تاریکایی ئەشکەوت دا دەنگی حیلەیەك هەستا کە بە حاڵ و باڵ دەبیسترا. لەنێو تاریکایی دا رەشایی ئەسپەکە روون ترو پڕڕەنگ تر بوو. پاشان هێدی هێدی لەبەر چاو ون بوو.

ئادەم هەر لەوێ لەسەر بەردێك دانیشت، فیشەكی وەبەر تفەنگێ دا، دەنگی چەخماخێ بەرز بووەوە، پاشان پێنج تفەنگی بە بنی ئەشكەوتەكەوە نان. دووبارە فیشەكی وەبەر دایەوە. سێ كەروێشك لە ئەشكەوتێ دەرپەڕین بە سەرەوژێری دا داپەڕین و لەبەر چاو ون بوون. مارێك بە ئەسپایی بەسەر شوێنەكان دا تێپەڕی و نیزیك كەوتەوە. سەری بەرز كردو روانیە دەوروبەری. ئادەم سێرەی لەسەری مارەكە گرت و مێشكی پژاند. تەقەی تفەنگ لە شاخەكانی ئاناوارزا دەنگی دایەوە. لەگەڵ خۆرئاوابوون دنیا بەرە بەرە فێنك دەبوو. كزەبایەكی دەهات، بە ئارامی بۆنی جاترەو پووش و پەڵاش عەرزی سووتاو و شاخ و بەردی بەدەوروبەردا بڵاو دەكردەوە.

ئەسپی خەنەیی وەك سێبەرێكی خاكی لە ئەشكەوتێ هاتە دەر. كاتێك لە زاركی ئەشكەوتەكە دەهاتە دەر، لەشی پان بووەوە، درێژ بووەوەو بە ژوور سەری ئادەم دا بازی داو پێش ئەوەی ئەو دەست بۆ پەلاپیتكە بەرێ، لەبەرچاو ون بوو. ئادەم بە دوای دا پێنج تفەنگی بە خوارێ وە نان، تەقەی تفەنگەكان لەشاخەكان دەنگی دایەوە. دەنگی تەقە لە بەرد بە بەردی بەردەڵانەكە گەڕا. ئادەم تاوێك گوێی بۆ دەنگدانەوەی تەقەی تفەنگەكان هەڵخست. بایەكە توندی كردبوو و گابەردەكانی وەك كووپەی بەتاڵ وەدەنگ هێنابوو.

ترس و دڵەخورپەی ئادەم بەرە بەرە كەمی كرد. زۆری برسی بوو. لێرەوە دەبوو راستەڕێ بچێتە ماڵی سەفەر. شەرمەزاری ئەویش بوو. حەزی دەكرد زەوی قەڵشیبایەوەو قووتی دابایە. داخوا بەو نیوەشەوە كارێكی جوان بوو بچێ بۆ خاتری ژەمەنانێك چەند بنیادەمی شەكەت و ماندوو لە خەو هەستێنێ؟ گریمان دۆستیشی بێ، بەڵام ئەگەر ماڵێ بابی ئادەمیش بێ، دیسان كارێكی دروست نیە... هاواری دەكرد:"ئاخ... ئا...خ ئەسپی خەنەیی، پێش ئەوەی حیسابی خۆم لەگەڵ تۆ یەك لا بكەم، دەبێ بڕۆم، باشە خەنەیی! لێ‌دەدەم دەڕۆم. ئەمنت لە پێش چاوی دۆست و دوژمن، لە پێش چاوی خەڵكی دنیا كردە پووڵە سووركەیەك! حەز دەكەی جندۆكە بە، بنیادەم بە، پەری بە، هەرچی پێت خۆشە ئەو بە، خۆ ماڵوێرانت كردم! كوڕە با قەرز بێ لەسەرم." دەی‌نەڕاندو بەو هات و هاوارە ئەو ترس و سامەی سواری ببوو، لە خۆی دوور دەخستەوە، بەڵام بۆ دەمەساتێك... پاشان دووبارە ترس لەو ئەسپە دەهاتەوەو هێلانەی لە دڵی دا دەكرد. ترسێك كە دەست و لاقی گۆج و ئیفلیج دەكردن."

لە بەردەڵانەكە هەنگاوێك دەهاتەخوارو دەی‌گوت:"كوڕە! لێ‌دەدەم دەڕۆم". پاشان رادەوەستاو رووی دەكردە شاخەكان و هاواری دەكرد:"ناڕۆم كوڕە! دەت كوژم." ئەمجار گوێی بۆ دەنگدانەوەی توندی قسەكانی خۆی رادەگرت.

"لێ‌دەدەم دەڕۆم کوڕە، شاخەکانی ئاناوارزا پێشکێشی تۆ بن. ئاکچاسازیش بۆ تۆ، هەمووی بۆ تۆ. منت ئاوارەی وڵاتان کرد، منت لە ماڵ و خێزان و ئاغاو لە دۆست و ئاشناو نان و پێخۆرم و تەنانەت لە مێش و پەلەوەرەکانیشم جیا کردەوە. لێ‌دەدەم دەڕۆم کوڕە... ئا...خ کە نەم توانی مشوورت بخۆم. برۆ تا ماوی کەیف بکە. ئەمنت بەزاند، نابووتت کردم، پشتت لە زەوی دام، یوورەگیر بگرەو هاتم..."

بەزینی قبووڵ کردبوو، رووی کردە لای رۆژهەڵات. ئەو دەشتە لەبەر تیشکی هەتاو، چاوەکانیی بەخۆیەوە خەریك دەکردو دەی‌برژاندەوە. لە رێگادا جاروبار دەگەڕایەوەو غاری دەداو بە خۆی هەڵدەگوت. بە دەنگی بەرز روو بەشاخەکان هاواری دەکرد:"کوڕە! ناڕۆم." دەنگەکە لە شاخەکان دەگەڕا، دەنگدانەوەکەی بەقەوترو بەرزتر دەبوو و غیرەتی وەبەر دەنا. ماوەیەك گوێی بۆ دەنگدانەوەی قسەکانی رادەگرت کە لە شاخێکەوە دەچووە شاخێك و بەرە بەرە لەنێو دەچوو، ئەمجار دووبارە هاواری دەکردوە:"کوڕە! ناڕۆم!" ئادەم هەتا دەنگی نووسا درێژەی بەم یارییە دا، و ئەم جار لەبەر خۆیەوە دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ:"هەتیوە گەوجە! ناڕۆم نا! یان ئەتۆ من دەکوژی، یان ئەمن تۆ. یەکێك لەم دووانەمان دەبێ بمرێ. یەکێك لەم دووانەمان... کوڕە! ئەتۆ ئەگەر جندۆکەو پەری نەبووایەی، ئەگەر غەیب نەبووایەی، ئەگەر حەیوانێکی ئاسایی، یان بنیادەمێك بای... یەکێك لە ئێمە... یەکێك لەم دووانەمان..."

سێبەری ئادەم لەبەر تیشکی هەتاو بەرەو رۆژئاوا درێژ ببووەوە. سێبەرێك بوو، باریك و چەماوەو شل و شەویق! ئادەم بەدوای سێبەری خۆیدا دەڕۆیشت. مژی چێشتەنگاوێ بەرەبەرە دەبوو بە هەڵم و لەگەڵ تاو گەرم بوون لەنێو دەچوو. هەتاو هەڵکشیبوو، دەشتی برژاوو قرژهەڵاتووی ئاناوارزاو بەردەڵانەکان نوقمی تیشك بوون بە جۆرێك کە چاویان لەبەر هەڵنەدەهات، هەتاو و گابەردەکان هەڵمیان لێ‌هەڵدەستا.

ئادەم لە دڵی خۆی دا دەی‌گوت:"کوڕە! لە هەموو جێ‌یەك گیا پەڕیوە، تەنیا لە یەك جێگا مێرگێکی سەوز هەیە، ئەویش لەنێوەڕاستی گۆلاوەکەی ئاکچاسازە. لەوێ مێرگێکی تەخت هەیە کە پڕە لە گیای تەڕو تازە. نەکا ئەسپەکە لەوێ بێ؟" بە وەبیر هێنانەوەی "مێرگی تەخت" ـ ئەمە ناوێك بوو کە بۆخۆی لەسەر مێرگەکەی دانابوو ـ خۆشحاڵ بوو. ئادەم لە ئاکچاسازو ئاناوارزا بۆ هەر شوێنێك کە لەوانە بوو ئەسپەکەی لێ‌بدۆزێتەوە، ناوێکی تایبەتیی دانابوو. بەنێو ئاوی گەرمی گۆلاوەکەدا تێ‌پەڕی. بن ئاوەکە خیز بوو. ئاوەکە کە دەت گوت کوڵیوە، هەتا کڵاوەی ئەژنۆی دەهات و لاقەکانیی دەبرژاندەوە. گامێشەکان بێ‌جووڵە لەنێو

ئاوی کولێو دا نووستبوون. لە ئاوە گەرمەکە پەڕیەوە. گەیشتە عەرزێك کە گوڵی بنەوشیی هەبوون، رووەکەی وشك هەڵاتبوو و کاتێك پێی لەسەر دادەنا، وەك تەنەکە سەهۆڵێك دەتەقی و درزی دەداو لەگەڵ هەر درزێك کە ئەو توێ وشك بووە دەیدا لاقی لە گڵی شل و پرواو رۆدەچوو. سەرانسەری توێ وشك بووەکە بە گوڵی بنەوشی داپۆشرابوو کە هەتا بێیەڵێنەکەی ئەوبەر درێژەی هەبوو.

گەیشتە بێیەڵێنەکە. جێیەکی بەسام بوو. مەودای نێوان دارە بێیەکان ئاوێکی سەوز دایگرتبوو. سەر ئاوەکە بە توێیەك قەوزە داپۆشرابوو. لەسەر ئەو توێ قەوزەیە پەلەوەری جۆراوجۆر بە باڵی رەنگاورەنگەوە کورت و درێژ مەلەیان دەکرد. ئادەم هەمیشە لەم ئاوە دەترسا. بنی ئەم ئاوە پڕ بوو لە قوولکەی گەورەی وەك چاڵ، کە لەوانە بوو بێکێشنە نێو خۆیان، بۆیە ئادەم بە پارێزو بە دەست گرتن بە رەگە بێیەکان بە هەزار دەردی سەری لەو ئاوە پەڕیەوەو چووە نێو بێشەی "بێئاسمان"ی ئاکچاساز. ئەم ناوە ئادەم لەسەر ئەو بێشەیەی دانابوو و ناوە ئەسڵییەکەی نەدەزانی. لە راستییش دا ئەو بێشەیە ئەوەندە پڕ بوو کە ئەگەر تەماشای سەرەوەت کردبایە، ئاسمانت نەدەدی. بێشەکە پڕ لە رەقەو مارو رێوی و بەرازو پەلەوەری هەمەچەشنە بوو. هەر لکە دارێك و توێی هەر چڵە لاولاوێك پڕ لە هێلانەی پەلەوەر بوو. لە تەنیشت هەر کۆلکەدارێکی گەورە هێلانەی باڵندەیەك دەبینرا. ئەم بەشەشی بەجێ هێشت. رۆژ لە نیوەڕۆ تێدەپەڕی. گەیشتە پەنای چنارێکی ئەستوور. راست لەسەر تلۆفکی دارەکە هێلانە لەك لەکێکی گەورە هەبوو. لکەکانی دیکەش بە زۆر هێلانەی گەورەو بچووك رازابوونەوە. لە هەموو هێلانەیەك جووچکە سەریان دەرهێنابوو و زارە زەردو گوشادەکەی خۆیان لێك کردبووەوەو لە جیکەجیکی هەزاران جووچکە قیامەتێك بەرپا ببوو. ئادەم پاڵی بە چنارەکەوە داو نەختێك حەسایەوە. ئەستوورکێکی گەورە کە لە ماڵە عێلاتییەکی وەرگرتبوو و لە دەسرۆکەیەکی چووکەڵەیەوە پێچابوو و لە پشتی خۆی بەستبوو، هێشتا دەستی لێنەدرابوو. لەدەوروبەری باتلاغەکە دارە هەنجیرێکی زۆر سەوز ببوون. دارە هەنجیرێکی هەڵبژاردو بڕیاری دا هەنجیری زەردی شیرن وەك هەنگوین بکاتە پێخۆری نانەکەی. ئادەم لە دەنگی جیکەجیکی باڵندەکان سەری سوڕمابوو. بە پێکەنینەوە سەیرێکی لکەکانی کرد. سەدان جووچکە بە زاری گوشادو ئاوەڵاوە قاوو قیژیان وەڕێ خستبوو.

ئادەم گوتی:"ئەی دواتان بڕێ، بەم قاوو قیژە عەرزو عاسمانتان لێك دووری." هەتا لە مێرگەکە نیزیك دەکەوتەوە، بێسەبرتر دەبوو. دڵی بە هەژانێکی شیرنەوە لێی دەدا. لە پێش

داش چەند جارێك تووشی ئەم چنارە ببوو، بەڵام ناوێکی پڕ بە پێستی بۆ نەدۆزیبووەوە. ناوی چنارەکەی نا "باڵندەجار". لە دڵی خۆی دا گوتی:"لێرە لە عەرزو عاسمان باڵندە سەوز دەبێ، ئەمە مەزرای باڵندەیە، مەزرایەك کە جووچکە پەلەوەری جۆراوجۆری بە زاری زەردو گوشادەوە تێدا رواوە." زاری فرەوان و کراوەی باڵندەکان ئەوی وەپێکەنین دەخست و لە ناخی دڵەوە قاقای لێدەدا. جارێکیان تارمایی گەورەی ئەسپەکەی لەم قوولکە تاریك و لێڵەدا دیبوو. ئاوەکە رەش بوو و ئەسپەکە رەش، هەردووکیان پێکەوە تێکەڵ ببوون و رۆیشتبوون! ئادەمیش بە ترس و سڵەمینەوەوە گوللەکانی بەم قولکەیەوە نابوون. ئاوەکە ئەوەندە خەست و قوڕاوی بوو کە کاتێك گوللەی وێ دەکەوت دڵۆپە ئاوێك چیە نەدەپڕژایە دەرەوە.

ئادەم کاتێك لە قوولکە رەشەکە پەڕیەوە لە نەکاو خۆی لەگەڵ مێرگەکە بەرەوڕوو دی. چیمەنێکی سەوزو تازە زەوی‌یەکەی داپۆشیبوو. لەو مێرگەدا خەبەرێك لە گوڵ و پەپوولەو مێشەنگوینە نەبوو. تەنیا چیمەنێکی رێك و یەکدەست پان ببووەوە. شەکەت و ماندوو لە نێو چیمەنەکە دانیشت. هەتاو دیار نەبوو. بەڵام لەوەڕا کە بەرە بەرە دنیا تاریك دەبوو، دیار بوو کە هەتاو خەریکە لە پشت ئاناوارزا ئاوا دەبێ. تیشکی هەتاو بەشێك لە مێرگەکەی رووناك دەکردو بەشەکەی دیکەی سێبەری بەسەر کشابوو. سێبەر وردە وردە بە پانایی و درێژایی پێوە دەچوو. لە ئاسمانی مێرگەکە پەلەوەرێك باڵی لێك نەدەدا.

ئادەم بە دەم هەناسەیەکەوە گوتی:"لێرەش نیە." لە کاتێك دا لەم دەوروبەری تەنیا جێیەك کە لەوانەیە ئەسپێك رووی تێکا، هەر ئەم مێرگەیە. باڵندەو مێشەنگوینە نایەتە ئێرە... هیچ گیانلەبەرێك نایەتە ئێرە."

پاش حەسانەوە لە جێی خۆی هەستا، بە خێرایی هەموو مێرگەکەی پشکنی. لە قەراخ مێرگەکە ئاوێکی روون کە بنەکەی خیز بوو بە خوڕەخوڕ دەچووە خوار. ئادەم چووە نێو ئاوەکەو وەڕێ کەوت، ئاوە روونەکە دەگەیشتە گوێزینگی، شوێنی هیچ گیاندارێك نە ئەسپ، نە باڵندەو نە کیسەڵ بەرچاو نەدەکەوت. ئادەم گەڕایەوەو لەسەر خیزی نێو ئاوەکە شوێنەکەی خۆی دی. لە ئاو چووە دەرێ و گەیشتەوە چیمەنەکەو هەتا ئەوسەری رۆیشت. وەختێك بە مێرگەکەدا رادەبورد بۆنی توندی خەلەنگی بەبەر لووتی هەڵلا هات. هەرچی گەڕا خەلەنگەکەی نەدۆزیەوە. لەوسەری مێرگەکەش نەختێك دانیشت.

پاشان بیری کردەوە:"پێش رۆژ ئاوا بوون دەبێ خۆم بگەیەنمە "کوێرووك سیزناغاج" (داری بێکلك). لەوانەیە ئەسپەکە لەوێ بێ." لەبن دارەکە، کانی‌یەکی فێنك و زوڵاڵ هەڵدەقوڵی.

ئادەم شەلاڵی ئارەق بوو. هەموو گیانی بۆترشی ئارەقی لـێدەهات. هەرچەند لووتی ئادەم بەو بۆنە راهاتبوو، دیسان بۆنی توندی ئارەقەی لەشی خۆی هەست پێ دەکرد.

بێ ئەملاو ئەولا دەبوو ئەسپەکە لە کوێرووك سیز بێ. مومکین نەبوو لە جێیەکی دیکە بێ. مسۆگەر لەوێ لەبن دارێك لەلێواری پڕ گوڵی ئەستێرەکە لاقی راستی وەبن زگی داوەتەوەو لێی پاڵ کەوتوەو بە چاوە زلەکانی وریای دەوروبەری خۆیەتی. ئەگەر لەوێ نەبوو، دەبێ لە "مستەفا کەچەڵ" بێ. لەوێش نەبێ حەتمەن لە "کوردقیزی" (کچەکورد)ە. خۆ ئەگەر لەوێش نەبێ، دەبێ لە "گەرمەن چیچکی" بۆی بگەڕێی. ئەگەر لەم شوێنانە لە هیچیان نەبوو، مانای ئەوەیە بووەتە دووکەڵ و بە هەوادا چووە. تەنانەت عومرێکیش بە دوای دا بگەڕێی ناتوانی بیدۆزیەوە:"کوڕە! ئەگەر پێویست بێ، عومرێکیش بەدوات دا دەگەڕێم! کوڕە خەنەیی! هەتا سۆمای چاوم دەچێ، هەتا ریشم وەك لۆکە سپی دەبێ و دەگاتە سەر نێوکم، هەتا ئەژنۆم ئەستوور دەبن و ئاوێ رەش دێنن، هەتا دوا هەناسەم هەڵدەکێشم وازت لـێنایەنم و لە دووت دەگەڕێم. کوڕە! ئەو گاڵتانەی بە منیان دەکەی، ناوت ناون ئازایەتی، کەللەرەقی و کەللەشەقی، بەڵام ئەوەی ئێمە دەیکەین گووی سەگیش نیە؟ ئێمەش بە قەد تۆ غیرەتمان هەیە!"

لای ئێوارێ گەیشتە کوێرووك سیز. شوێنەوارێك لە ئەسپەکە نەبوو. شەکەت و داماو لەسەر کانێیەکە چۆکی دادا. لەتێکی گەورە لە ئەستوورکەکەی بە نەختێك پەنیرەوە خوارد. ئادەم لە نێو هەورێکی مێشوولەدا ون ببوو. مێشوولەکان لە دەوروبەری دەخرۆشان. هێشتا دوا پارووی بە باشی قووت نەدابوو، لە جێی خۆی خەوی لـێکەوت. کاتێك وەخەبەر هات شەلاڵی ئارەق بوو و هەتاو لێی دابوو. گەرماکەی قورس و شەدارو زەردو هەڵماوی بوو.

چاوەکانی گوشین. بەرەو "مستەفا کەچەڵ" کەوتە رێ. لەبەر ئەوەی مستەفا کەچەڵ هەمیشە گەڵایەکی وشکی لە یەخەی چاکەتەکەی دەدا، ئادەم ئەم تەپۆلکەیەی ناو نابوو مستەفاکەچەڵ. چونکە لە داوێنی ئەو تەپۆلکەیە کە لە نێوەڕاستی باتلاغەکە بوو دارێك هەبوو کە لك و پۆپی سەر تلۆفکەکەی وشك ببوون و تەنیا لای خوارەوەی دارەکە هێندێ گەڵای سەوزی پێوە مابوون و راست وەك مستەفا کەچەڵ دەچوو. ئەو جێگایەش کە ناوی نابوو کچە کورد، جێگایەك بوو پڕ لە گوڵی رەنگاوڕەنگ و تێکەڵ پێکەڵ، رەنگی قەدو لاسك و بڕکەی گوڵەکان جۆراوجۆرو رێك و پێك بوو. زوو تووشی کچە کوردێك ببوو کە جل و بەرگێکی رەنگاوڕەنگ و پڕ نەخش و نیگاری لەبەردا بوو. لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ئەمڕۆ

دەیبینمەوە". چووە نێو بێشەیەکی باریک و درێژی وەك تونێل (نەفەق) لە ناوێك ڕۆچوو کە پڕ بوو لە لەیلووپەڕ. ئاوەکە قوڵت قوڵت لە زەوی هەڵدەقوڵی. سەری لە مستەفا کەچەڵ و کچەکورد دا. خەبەرێك لە ئەسپی خەنەیی نەبوو. چوو بۆ "دەلی ئاغاچ" (داری شێت)، سێ جاری سەری "سومبول تەکەسی" دا.

لە سومبول تەکەسی تووشی باڵندەیەکی ڕەنگ خۆڵەپۆتینە بوو. کە پەیکەرێکی زل و لاقێکی ئەستووری هەبوون و باڵای بەقەد باڵا پیاوێك دەبوو. بۆخۆشی نەیدەزانی بۆچی ئەم جێگایەی ناو ناوە سومبول تەکەسی. ئەم ناوە هەر لەو لەحزەیەدا بە مێشکیدا هاتبوو. لە باڵندەکە نیزیك کەوتەوە، باڵندەکە سڵەمیەوە. دەستی لەسەر ئەستۆی درێژی باڵندەکە دانا، دژکردەوەیەکی نیشان نەدا. باڵێکی بریندارو داچۆڕاو بوو. تەماشای برینەکەی کرد، برینەکە کرمێ ببوو. لە هەمبانەکەی هێندێکی خوێ دەرهێناو بە برینە کرمێیەکەی کرد. باڵندەکە لە ترسی گیانی دەرپەڕی و خۆی لە دەستی ئادەم ڕزگار کردو نەختێك ئەولاتر نیشتەوە، بە تاقە باڵێك زۆر باش هەڵفڕیبوو و ڕۆیشتبوو.

"کوڕە! ئەو ئەسپەی ئەمڕۆ لە "قورت لار ئۆیماقی" (کونەگورگ) دەبینمەوە."

هەتا زیاتر هومێدی پەیدا دەکرد خۆشحاڵ ترو بە دەماغ تر دەبوو. بە ڕۆیشتنێك کە دەت گوت هەڵ دەپەڕێ، چوو بۆ لای کونەگورگ:"لەوێیە، بێ ئەم لاو ئەولا ئەسپی خەنەیی لەوێیە." تفەنگەکەی لە شانی دەرهێنا، تاقیی کردەوە، ئامادەی تەقە پێکردن بوو. کێردەکەشی لە جێی خۆی بوو:"ئەمڕۆ سەری ئەسپەکە دەبڕم و دەچمەوە لای خێزانم." هەستی دژ بە یەکی هەبوون. جارێك ڕقی هەڵدەستاو جارێك خۆشحاڵ دەبوو. هەتا لە کونەگورگ نیزیکتر دەکەوتەوە ئاگری تاسەو تامەزرۆیی بۆ ژنەکەی لە هەناوی دا زیاترو سووتێنەرتر دەبوو.

لەبەر خۆیەوە بۆڵاندی:"لەوێیە. ئەگەر لەوێ نەبایە، وا لە دڵم نەدەچەقی، لەوێیە، لەوێیە!"

وەختێك گەیشتە نیزیك کونە گورگ چاوی پێکەوە نان و هەروا ڕۆیشت، وەختێك چاوی هەڵێنان لە جیاتی تەماشای ڕووبەڕووی بکا، ڕوانیە بەر پێی خۆی. دنیا زۆر گەرم بوو. جار بە جاریش گەرمتری دەکرد. کاتێك گەیشتە کونەگورگ لە نێوبەندی مەڵبەندەکە ڕاوەستا. تفەنگەکەی لە دەستی ڕاستی دا سەنگ و سووك کرد. تەماشای دەوروبەرو پشتەوەی خۆی کرد. تاوێك بە دەوری خۆی دا سووڕا. نە سێبەرێکی دی و نە شتێك کە بجوولێتەوە. هەتاو هەڵماوی بوو. لەسەر زەوی چۆکی دادا.

لەبەر خۆیەوە گوتی:"دەبێ بچمە یوورەگیر. ئەم کافرە نادۆزرێتەوە."

بە گوتنی وشەی "کافر" هەروا بزانە جنێوی بە شتێکی پیرۆز داوە، ترسی رێنیشت، کەمێك حەسایەوە. بە ددان لە چیرەوە بردن لە دڵی خۆی دا دووپاتی کردەوە:"کافر، کافر، گووت کردە دیزەو گۆزەم... لە پێش چاوی دۆست و دوژمن کردتمە پووڵەسوورکەیەك، لە کن کەس چاوم هەڵنایە. عومرێك رەنجم کێشا پارووە نانێکم پەیدا کرد، ئەویش ئەتۆ لە دەستت رفاندم، دەربەدەرو ماڵوێرانت کردم... لە ژنە نازەنینەکەم جیات کردمەوە." شتێکی خڕ هات، بەری ئەوکێی گرت. ئەگەر گریابا، باری سووك دەبوو. ماوەیەك لەبەر هەتاو بە ئارەق رشتن و بێ جموجۆڵ مایەوە. ئارەق بە جۆلاوکە لە سەرو چاو و پشت و لاقی هەڵدەرژا. بە خۆشحاڵی لە جێی خۆی دەرپەری:"بێ ئەملاو ئەولا لە ـ گوڵی فاتمە ـ یە."!

ئەودەم کە لە چیاکانی "بوولوور جەندرمە" بوو، تووشی چڵەگوڵێکی زۆر گەورە بوو کە بالاپیاوێك بەرز بوو، لە جوانیی ئەو گوڵە سەری سوڕمابوو. لە ئاکچاسازیش گوڵی وا گەورەی نەدیبوو. ناوی ئەو گوڵەی لە دێهاتیەکان پرسیبوو، گوتبوویان ناوی "گوڵی فاتمە"یە. یەك دانە لەو گوڵە هێشوویییانە باوەشێك دەبوو. ئەو شوێنە کە ئادەم ناوی نابوو گوڵی فاتمە، گوڵی وەك ئەو گوڵە گەورە هێشوویییەی زۆر هەبوو.

ئادەم لە گوڵی فاتمە بە نێو گوڵەکان دا دەرۆیشت. بەژنی ئەو گوڵانە لە بەژنی ئادەم بەرزتر بوو و لەنێو گوڵەکان دا ون ببوو.

تاریکاییەکی تررووسکەدار دادەهات. تاریکاییەکی دڵگری وەك رۆژی رووناك... بەشێك لە شەو رووناك بوو. رووناکایی زیاترو زیاتر دەبوو، و لە بەشەکەی دیکەش تاریکایی توندترو بەربڵاوتر دەبوو. ئادەم لەو تاریکاییە سەیرو سەمەرەیە ترسا، خەریك بوو لە ترسان زەندەقی بچێ‌و راست لەو لەحزەیەدا گوێی لە دەنگی سمی ئەسپەکە بوو. ئەسپ بەسەر گوڵەکان دا خزی و تێپەری و دەسبەجێ وەك دووکەڵێکی باریکی لـێ‌هات و دوور کەوتەوە.

هەتا ئادەم تفەنگەکەی راست کردەوە، ئەسپەکە لەبەر چاو ون بوو.

ئادەم لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئەمرۆ دووبارە دێتەوە. فێری ئێرە بووە. ئێرەی پێ‌خۆشە. ئاشقی گوڵی فاتمەیە. گەرما وەك بەردێك قورسایی دەخستە سەر شانی. بە حاڵ و باڵ هەناسەی دەهات، دیسان درێژەی بە رێگای خۆی دا.

گوڵە گەورەکانی فاتمە لەبەر ئەو گەرما هەڵماوییە جوانترو ئەفسووناویتر دەهاتنە بەرچاو.

## (٣٦)

حەمەد لە حالێك دا هەتا پشتێنی قوڕاوی بوو، لەبەر دەرکی مالّی کەرەم کوردە ڕاوەستا. هەرچەند هێشتا زیاتر لە نیوەی خۆرەتاو لە پشت چیاکانی " گاورداغی" دەرنەکەوتبوو، بەڵام گەرماکەی وەك شمشێر دەیبڕی. نێوان مالّەکان تاو و سێبەر بوو. حەمەد لە دەرکی مالّی کەرەم کوردە وەڕێکەوت. هەروا بەلادا دەهات، بە جادەی نێو ئاوەدانیدا کە هەتا گوێزینگی پێی تۆزوخۆڵ بوو، ڕۆیشت تا گەیشتە دەرگای مالّی سیلوێرگلین. تاوێك لەبەر دەرگاکەی ڕاوەستا. پاشان دووبارە بایدایەوە. مالّەکان باش دیار نەبوون. حەمەد بۆخۆی پێی سەیر بوو کە چۆن بەو حالّەو بەو تاریکەشەوە توانی گوندی وایوای بدۆزێتەوە، و چۆن و بە چ ڕێگایەك دا بێئەوەی جەندرمە بیگرن، یان تووشی کەسێك بێ، خۆی گەیاندوەتە ئێرە. ئاکا ئەو کاتەی خۆی دابووە دەم ئاوی ئاشەکە، ئاو هێنابێتی. داخوا هەروا بە ڕێکەوت و لەخۆوە هاتبووە ئێرە یان ئومەتەزەرد هێنابووی. بە شێوەیەکی لێلّ و ناڕوون روخساری ئومەتی هاتەوە بەرچاو.

لەبەر دەرکی مالّی سەیفەلییش ماوەیەك ڕاوەستا. بە ڕاماوی تەماشای دەوروبەری دەکردو هیچی نەدەدی. پاشان هاتە کن دارە ئەستوورەکەو ڕاوەستا. قوڕی باتلاغەکە لە جلەکانی هەلّدەوەرییە سەر زەوی. قۆنداغی تفەنگەکەشی قوڕاوی بوو. لێلاییەکان ڕوون بوون. هەتاوی گەرم وەك کۆمایەك ئاگر کەوتە سەر پووش و پەلاش، جادەی خۆلاوی و ئەو خانووانە کە دەت گوت برژاون.

حەمەد بەو تفەنگ و دووربین و چەند ریز فیشەکدانەوەو بە خەنجەری بەرپشتێنی و بە کلاوی تەقیلەی سووری سەری وەك منداڵێکی باوخۆش دەچوو کە لاسای یاغییەك بکاتەوە.

پێشتر، بەر لە خۆرهەڵات چەند ژن و پیاو حەمەدیان لەنێو ئاوایی دیتبوو، بەڵام سەرنجی ڕانەکێشابوون و بایەخێکیان پێنەدابوو.

حەمەد کە ماوەیەك لەبن دارە گەورە ڕاوەستابوو، دووبارە وەڕێکەوتەوە. گێژو وێژو بێ ئامانج بە نێو دێدا کەوتەڕێ.

یەکەم کەس کە حەمەدی دیت" برایم چووجووك" بوو. پاشان حسام دیتی. هات بە مەلافەرهادی گوت:

"پیاوێکی چەکدار کە بیچم و قەڵافەتی منداڵانی هەیە، لەنێو دێی دەگەڕێ. ئەتۆ بڵێی کێ بێ؟"

مەلافەرهادی ڕووگرژو خەمناك لەبەر دەرکی ماڵێ ڕاوەستابوو. سووتانی خەرمانەکان پشتی شکاندبوو، و هیچ ڕێگا چارەیەکی نەدەهاتە بەرچاو تەماشایەکی نێو دێی کرد. پیاوێکی گچکەڵانەی دی سەرتاپێ قوڕاوی و کۆم بووەوە، کە بە لاتەلات لاقە سڕو بێهێزەکانی لەنێو تۆزوخۆڵ دا لەدوو خۆی دەکێشان. دەسبەجێ چووە لای سەیفەلی و گوتی:

" سەیفەلی، سەیفەلی، دەقیقەیەك تا دەرێ وەرە. وەرە بزانە مەسەلە چیە... تەماشایەکی ئەم کابرایە بکە"

حسام لەگەڵ مەلافەرهاد لە پیاوە نەناسیاوەکە نزیك بوونەوە. حسام گوتی:

"هەروا لەنێو ئاوەدانیدا سەرگەردانە. دەچێتە بەردەرکی ماڵێك، نەختێك ڕادەوەستێ و دووبارە دەڕوا."

ئەمجا هاواری کرد:

"سەیفەلی، سەیفەلی ئێستا وەرە دەرێ."

پاشان تەماشایەکی ئەو پیاوەی کرد کە دەت گوت لە خەودا بە ڕێدا دەڕوا، گوتی:

"چەند سەرنج ڕاکێش و سەیرە. سەرتاپای چەکدارە. دەبێ کێ بێ؟"

دوایە هەموو دێهاتیەکان لە مەسەلەکە ئاگادار بوون. بۆ ماوەیەکی کەم بن دارەکە پڕ بوو لە خەڵك.

هەموویان هەناسەیان ڕاوەستابوو، بە ترس و پرسیارەوە تەماشای ئەو پیاوەیان دەکرد کە بە لاتسیاولاتسیاو هەروا بزانە خەوی لێکەوتوە دەهات و دەچوو. کابرا ڕۆیشت، گەڕایەوە، ڕاوستا، وەڕێکەوتەوە، ورتەورتێکی لێدەهات، ڕاست بە پەنای ئاپۆڕایەکەدا تێپەڕی، بێ ئەوەی هیچ ببینێ و هیچ ببیسێ. ئەم وەزعە تا کاتێك وەسمانەزلە بە دیتنی حەشیمەتەکە بە وەکازکوتان گەیشتە بن دارەکە، درێژەی کێشا. وەسمانەزلە گەیشتە بن دارێ. دەستی برد برۆی ڕاستی

هەڵدایەوەو ڕوانیە ئەو لایە کە ئاپۆرایەکە تەماشای دەکرد. تەماشای کردو گوتی:"ئەی خوایە گیان، ئەمان، خەون دەبینم یان بەخەبەرم؟ خەونە یان خەیاڵە؟ خەون دەبینم؟"

دەست و لاقی کەوتنە لەرزین. وەکازەکەی لە دەست هەڵوەری. برۆی ڕاستی هەڵکێشاو تەماشای کردو بە حەشیمەتەکەی گوت:

"خوایە گیان، بڕوانن چەکیشی پێیە؟"

حەشیمەتەکە بە هەژانێکەوە گوتیان:"چەکدارە."

وەسمانەزلە بە شەلەشەل و پشووسواری غاری دایە لای حەمەد، خۆی گەیاندێ و باوەشی پێداکردو گوتی:

"کوڕم، بەخێربێی. هیوای ڕۆژانی ناهومێدیم. دەم زانی دێی. دەم زانی لەم ڕۆژە ڕەشانەدا نایەڵی تەنیا بین."

وەسمانەزلە بە ناڵینەوە لەسەری ڕۆیشت:

"سووتاندی، خەرمانەکەمان، قووتی زستانمانی سووتاندو کردیە خۆڵەمێش. ئاوری بەردایە سەرانسەری دەشتی ئاناوارزا. دەبینی کەوتووینە چ ڕۆژێکی ڕەشەوە؟"

لەو بەینەدا مەلافەرهادیش گەیشتە لایان. وەسمانەزلە لە کاتێك دا بە دەستێك باوەشی بە حەمەد داکردبوو، بە دەستەکەی دیکەی دەستی مەلافەرهادی گرت و گوتی:

"وەرە، ئەمەش شەهێنەکەم، هاتوەتەوە، پێم نەگوتی؟ نەم گوت ئەو لە ڕۆژی تەنگانەدا نایەڵێ تەنیا بین، پێم نەگوتی؟"

هەموو دێهاتییەکان ژن و پیاوو پیرو لاو هاتنە لایان و کۆزیلکەیان لە دەورە بەستن. ماوەیەك لە گەمارۆی حەشیمەتەکەدا بوون. حەمەد بە حەبەساوی و بێحاڵی چاوی لە حەشیمەتەکە دەکرد. لە روخساریدا هیچ دژکردەوەیەك بەدی نەدەکرا. هێڵەکانی دەم و چاوی چووکترین بزووتنەوەیان نەبوو.

حەشیمەت بێدەنگ بوو. هیچ کەس ورتەی لێوە نەدەهات. مەلافەرهاد گوتی:

"وەسمانەزلە، ئەم کوڕە بەڵایەکی بەسەر هاتوە. بڕوانە سەرتاپێی قوڕاوییە. جلەکانیشی لەت و پەت بوون.

وەسمانەزلە کە تا ئەودەم سەرنجی وەزعی نائاسایی حەمەدی نەدابوو، هاوارێکی کرد و بن پیلی گرت:

"شەهێنەکەم، کوڕم، چت بەسەرهاتوە؟ ئەمە چ وەزعێکە؟ پاڵەوانەکەم، شەهێنەکەم... مەلای خۆم بە قوربانت بم تەماشا کە بزانە شەهێنم بریندار نەبووبێ."

مەلافەرهاد دیسان قۆڵی حەمەدی گرت و بەڕاکێش ڕاکێش بردیە ماڵی وەسمانەزلە.

پاش ئەوەی حەمەدیان برد، حەشیمەت دەستی بە قسان کرد. بەڵام کەس ناوی حەمەدۆکی بە زمان دا نەدەهات و بە"شەهێن" و "ئەو" ناویان دەبرد. هەموویان وێکڕا قسەیان دەکرد و کەس گوێی لە قسەی کەس نەبوو. جووتیارەکان لە یەکەم چاوپێکەوتنی حەمەد دا تووشی چەشنە دوودڵی و دڵساردییەك بوون. تەماشایان دەکردو دەیان گوت:"ئەم منداڵە ڕیوەڵە، پەرێشانە کوشم هەڵاتوە، ئەو حەمەدۆکی بەناوبانگە؟!"

جووتیارەکان هاتن و لەبەر دەرکی ماڵی وەسمانەزلە کۆ بوونەوەو دیسان بێدەنگ بوون. ماوەیەك بە پێوە ڕاوەستان دوایە لەسەر عەرزی پاڵیان وە پەرژینی داو دانیشتن و دووبارە بێدەنگ بوون. تەنانەت منداڵەکانیش بێدەنگ بوون و بگرە منداڵی قۆنداغەش ورتەی نەدەهات.

لە ماڵێ، مەلافەرهاد بۆخۆی جلەکانی لەبەر حەمەد داکەندو پانتۆڵە قوڕاوییەکەی وە دایە قەمەر داو گوتی:" هەر ئێستا بیشۆ."

هەموو گیانی پشکنی. لە ماسولکەی لاقی ڕاستی جێ برینێکی چووکەڵەی دیتەوە. برینەکە قووڵ نەبوو. جگە لەو برینەو هێندێك ڕووشاویی لاق و لەتەری شتێکی جێگای نیگەرانی نەبوو.

هەرچی لە حەمەدیان دەپرسی، وەڵامی نەدەدایەوە. پاش ماوەیەك مەلافەرهاد تێگەیشت کە حەمەد ددانی بەسەریەك دا ڕەق بوون.

گوتی:

"مام وەسمان. ئەم کوڕە دەبێ بەڵایەکی گەورەی بەسەر هاتبێ. ئەوەی ئەم منداڵەی تووشی ئەم ڕۆژە کردوە، نە ترسی مردنەو نە شەڕ لەگەڵ جەندرمە. بێگومان بەڵایەکی بەسەر هاتوە. بڕوانە، نەهیچ دەبینێ و نەهیچی گوێ لێدەبێ."

دایە قەمەر دەست و لاقی حەمەدی هەروەك منداڵێك شوت، دەم و چاوی بە ئاوی گەرم و سابوون خاوێن کردنەوە. جێیان بۆ ڕاخست و مەلافەرهاد بە دەستی خۆی لەسەر جێیەکە درێژی کرد. حەمەد هەر سەری گەیشتە سەرینەکە خەوی لێکەوت.

نیوەڕۆ داهاتبوو. ئەو حەشیمەتەی لەبەر هەتاو ڕاوەستابوو دەنگی لەبەر دەرنەدەهات. خاکی حەوشەی ماڵی وەسمانەزلە وەك تەندوور سوور ببووەوە. هەتاو مێشکی پیاوی وەکوڵ دێنا. لەنەکاو"دەلیموسلوو" هەستایە سەر پێ. ئەو زۆر کەڵەگەت بوو. ڕوخساری تاوەگاز بوو، بە لینگە درێژەکانی هەر دەت گوت تاژییە.

لە کاتێك دا باسکە درێژەکانی ڕادەوەشاندن گوتی:

" ئەوە دەڵێن چی هەی بێئەقڵینە! شەهێنیش چووکەڵەیە، بەڵام نێچیری لەدەست دەرناچێ. لەو کێوانە لەگەڵ لەشکرێك شەڕی بووە. هۆردوویەکی گەورەی تێك شکاندوەو گەڕاوەتەوە. بۆچی وا شەمۆتەتان داگرتوە؟ بۆچی ناهومێد بوون؟ سەرەنجام هاتەوە وایوای... هاتوە فریامان کەوێ. شەهێنم چووکەڵەیە، بەڵام هەڵۆشی پێناوێرێ. ئەی بێهومێدینە، خوا توخم و تۆوتان لەسەر زەوی ببڕێ."

حەشیمەت کەوتە جموجۆڵ. دیسان هەموو دەستیان کرد بە قسان. ماوەیەك دواتر لە ماڵی وەسمانەزلە بوو بە هەنگامە. هەموو پێکەوە خەریکی قسەو وتووێژ بوون. شادی و هومێد لە دڵیان دا بەرەبەرە بەرینتر و قووڵتر دەبوو.

لەپێش دا ژنان و پاشان پیاوان و منداڵانیش لە دڵەوە دەستیان کرد بە پێکەنین. ئەو وەزعی تازیەبارییە کە قورسایی دەخستە سەر ئاوەدانی لەنەکاو وەك مژ ڕەوییەوەو ئەو هەورە ڕەشە خنکێنەرە کە ئاسمانی دێیەکەی داگرتبوو، بڵاو بوو.

دەیان گوت:" خەوتوە. حەتمەن بەڵایەکی گەورەی بەسەر هاتوە، ئێستا خەوی لێکەوتوە. لە چیای لەگەڵ لەشکرێك شەڕی کردوە، لەشکرەکەی شکاندوە، تەنیا بەلەکی کەمێك بریندار بووە. کەس نازانێ چ بەڵایەکی بەسەر هاتوە. هەربۆیە وا گێژو وێژ بوو. دەت گوت لە خەوێدا بە ڕێدا دەڕوا."

حەشیمەت کەم کەم بڵاوەی کرد. دێ دەبووژایەوە. دێ وەك هەڵۆیەك دەچوو کە ئارام و لەسەرەخۆ خەریك بێ چنگوڕکی لێك بکاتەوە. ئەو ڕۆژە لە هەموو ماڵەکان خۆشترین چێشت لێنران. ماڵبەماڵ خەڵك پێکەوە خەریکی گاڵتەو جەفەنگ بوون و ئەم گاڵتەو گەپە هێندێ جنێوی تەڕو تازەشی لەگەڵ تێکەڵ بوون." ئاپتال ئاشەر" کە لای ئێوارێ بە خەبەرەکەی زانیبوو، دەهۆڵەکەی خۆی ئاودایەو لەگەڵ کوڕە زوڕناهەنگێوەکەی وەنێو ئاوەدانی کەوت. دەسبەجێ هەڵپەڕینی خۆولاتی دەستی پێکرد. "سین سین" یان گرت (چەشنە هەڵپەڕینێکە، لە دەوری ئاگر هەڵدەپەڕن). لەو شەوە گەرم و شەدارە هاوینییەدا لە دەوری ئاگرێکی بەقەد جێخەرمانێك دەستیان بە سەما کرد و لە ئارەق دا شەڵاڵ بوون. ڕەنگە ئەو شەوە یەکەم جار بووبێ کە لەو دێیە هەڵپەڕینی سین سین بگیرێ. عادەتەن لە هاوینان دا بە دەگمەن جێژن و زەماوەند سازدەکرێ و ئەگەر داوەتێکیش ساز بێ، کەس هەڵپەڕینی سین سین ناگرێ. خەڵکی گوندەکانی نارلیقشلا، یالنزدۆت، ئووت سووزلی، ئاك ماشات، شێخ مەمەدلی و دەدەفاکلی

له هاتنه‌وه‌ی حه‌مه‌د بۆ وایوای ئاگادار بوون و هه‌ر ئه‌و رۆژه به سواری ئه‌سپ و عاره‌بانه خۆیان گه‌یانده وایوای و له جێژن و خۆشی‌یه‌که‌دا به‌شدار بوون. ئه‌وانه‌ش که بۆیان نه‌کرابوو بچنه وایوای، له گونده‌کانی خۆیان شایی‌یان گرت.

پاش ته‌واوبوونی ڕێوشوێنی جێژن و شادمانی دیسان دێهاتی‌یه‌کان له حه‌وت ساڵه‌وه بگره تا حه‌فتا ساڵه ترسیان ڕێنیشته‌وه‌و له فکره‌وه چوون. ئه‌م ترسه چووه دڵی هه‌موو ئه‌و دێهاتی‌یانه که خه‌به‌ریان زانیبوو حه‌مه‌د هاتوه‌ته وایوای. ده‌یان گوت:

"باشتر نه‌بوو به شه‌و بێته نێو ئاوه‌دانی تا که‌س نه‌ی‌بینێ؟ به رۆژی ڕووناك هاتوه‌ته نێو ئاوایی. ئه‌مه پێی ناڵێن ئازایه‌تی. ئه‌م جۆره ئازایه‌تی‌یانه نه‌کا باشتره."

"ئه‌گه‌ر ئاغایه‌ك پێ‌بزانێ."

"یان یه‌کێك له‌و سه‌گه خه‌به‌ربه‌رانه‌ی ئاغاکان بۆن بکا."

"ئه‌گه‌ر جه‌ندرمه‌یه‌ك بی‌بینێ."

"پیاو هێنده بێ‌بوار وه‌نێو ئاو ده‌که‌وێ؟"

"ئاخر ئه‌وه جوانه، کارێکی دروسته؟"

"رۆژی ڕووناك بێ‌خه‌یاڵ..."

"پیاو دێته نێو دێی؟"

"هه‌رچه‌ندیش ساویلکه‌و بێ‌فکر بێ، ئاخر پیاوێکی یاغی به رۆژی ڕووناك دێته نێو ئاوه‌دانی؟"

"ئه‌گه‌ر دێ ماڵی بابیشی بێ، دیسان یاغی ئاوا به رۆژی ڕووناك نایه‌ته نێو دێ."

"چه‌ته‌یه‌ك به‌ده‌نی پۆڵاش بێ، دیسان به رۆژی ڕووناك له چوکووراوا ئاوا به پانه‌وه ناگه‌ڕێ."

"ئه‌گه‌ر پیاو شه‌هێنیش بێ..."

"شه‌هێنیش بێ دیسان ئاوا ئینکه‌به‌ری له‌گه‌ڵ حکوومه‌ت ناکا."

له‌گه‌ڵ هه‌مووی ئه‌م ورده بۆڵه‌یه‌ش دیسان هه‌ستیان به شانازی ده‌کرد. ئه‌گه‌رچی هاتنی حه‌مه‌د به ڕۆژی ڕووناك بۆ گوندی وایوای ببووه هۆی ترسان و نیگه‌رانیی جووتیاره‌کان، به‌ڵام هه‌رله‌وکاته‌دا که‌وتبوونه دڵخۆشی و به‌خۆنازینه‌وه... ده‌یان گوت:

"نه‌ختێك کورته بالایه، به‌ڵام گرنگ نیه، کوڕه‌که دڵێکی هه‌یه به‌قه‌د ده‌زگایه‌کی ئاسنگه‌ری. ئا... ئه‌مه‌نده گه‌وره."

سیلوێرگلین گوتی:

"حەمەدۆك هەر دەبێ وا بێتە نێو ئاوەدانی."

دێهاتی‌یەکان بە بیستنی ئەم ڕستەیە بە قینەوە چاویان لە سیلوێرگلین مۆڕ کردەوە. سیلوێرگلین تێگەیشت کە قەول و قەرارەکەی شکاندوە. گوتی:

"یانی "ئەو"... یانی شەهێن دەبێ هەر ئاوا بێتە نێو دێ."

لەبەر ئەوەی لە چاوی دێهاتی‌یەکان دا خوێندیەوە کە هێشتا لێی خۆش نەبوون، بە داخ و کەسەرێکەوە گوتی:" ماڵێ پیری‌یە خرابێ، لێم ببوورن جارێکی دیکە قە...ت ناوی"ئەو" نایەتە سەر زمانم."ئەو" شەهێنەکەمان هەروا بە ڕۆژی ڕووناك دێتە چوکووراوا و کەسیش ناتوانێ پێی‌بڵێ پشتی چاوت برۆیە."ئەو" شەهێنی خۆمان..."

مووسلوو غاری‌دایە نێو دێ. وەڕێ‌کەوت. ماڵبەماڵ دەگەڕاو دەی‌گوت:"بۆ کوێ چوو؟ زەینەڵ بۆکوێ چوو؟ یاڵڵا بزانن زەینەڵ بۆکوێ چوو؟ ئەوی نەدیوە؟ ئەودەم کە ئێمە تەماشایمان دەکرد، زەینەڵ لەبن دارێ نەبوو؟ ملی درێژ نەکردبوو؟ وەك ئەوەی بیهەوێ قووتی دا تێ‌یەوە ڕانەمابوو؟"

دەلی مووسلوو شەش کەس لە لاوەکانی دێی کە لە سەربازی ڕایان کرد بوو، لە دەوری خۆی خڕ کردەوەو بەرەو ئاکچاساز وەڕێ کەوتن.

سەعات و نیوێك دواتر گەیشتنە لێواری قامیشەڵانەکە. چوونە نێو بێشەی و لە قامیشەڵانێك دا لە دەوری یەك دانیشتن و لەبارەی زەینەڵەوە کەوتنە تەگبیرڕا. بێ‌گومان زەینەڵ عەلی‌سەفابەگی لە هاتنی"ئەو" بۆ نێو دێ ئاگادار دەکرد. ئەویش دێهاتی‌یەکان و جەندرمەکانی ژێر فەرمانی خۆی دەنارده وایوای و دەیان گرت. ئەوان پاش ئەوەی لەبارەی زەینەڵەوە بڕیاریان دا، لە قامیشەڵانێ لێك جیا بوونەوە.

زەینەڵ بە دیتنی حەمەدۆك لە حاڵێك دا دڵەکوتەیەکی گرتبوو، بە غاردان ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی عەلی‌سەفابەگ. وەختی ڕێ‌ڕۆیشتن لەبەر هەژانی دەروونی لاقی تێك دەئاڵقان. بە دەم غاردانەوە لە دەروونی خۆی‌دا هەستی بە سستی و نەرمی‌یەك دەکرد. بێ‌ئەوەی بە خۆی بزانێ شتێکی وەك پەژیوانی دەچووە دڵیەوەو لەنێو دەچوو. بەڕاستی ئەو حەمەدۆکەش بابایەکی سەیروسەمەرە بوو. حاڵەتێکی لە گیان بووردوو و لە دنیاماندووی هەبوو. ژنەکەی و دایکی‌یان کوشت، ئەو کوڕە بەستەزمانەیان ئاوارەی کێو و بەندەنان کرد. وەك دەڵێن وەکیل باشی‌عاصم خۆشی دەوێ. ئەگەر وەکیل باشی‌عاصم لێی وریا نەبا، لە کەنگێ‌وە کوژرابوو:" زۆر لە مێژ بوو کوشتبوویان. بنیادەمێکی ڕیوەڵەیە، لووتی بگری گیانی دەردەچێ."

زەینەڵ گەیشتە حەوشی باڵەخانەکە. هەر لەوێ چەقی. هەستی پەژیوانی بەرەبەرە لە دڵیدا بەهێز دەبوو. هەستی بە نزمی و تاوانباری دەکرد. بە هاتنی حەمەدۆك تەنانەت لە دڵی ویش دا ترووسکەی هیوایەکی هەرچەند کەم درەوشابوو. ئێستا شادمانی لە دڵی دا جێگای پەژیوانیەیەکەی گرتبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی:

"خوای گەورە! لەم دەردە رزگارم بکە. ئەمن بۆ وام لێهات؟ یانی ناتوانم خەبەر بە ئاغا بدەم."

چ نهێنیەك لە کاری ئەم کوڕەدا هەبوو؟ جادوو بوو، کەرامەت بوو؟ زەینەڵ تا ئێستا قەت وا نەگۆڕابوو. لە دڵی خۆی دا گوتی:" خۆشم ویستوە؟" ئەگەر وا دابنێین هیچ خۆشیشی نەویستوە، زۆر باشە! ئەدی هۆی ئەم گۆڕانە دەروونیەیە چ بوو:"نەکا بەزەییم بەو هەتیوە بستەبالآیەدا هاتبێ کە دەستی تا ئانیشکی خوێناویەیە؟" هەستە دەروونیەیەکەی هەڵسەنگاند، هەستی بەزەیی نەبوو، زگ پێسووتان نەبوو. بەڵکە هەموو جارێ کە ناوی ئەوی وەبیر دەهاتەوە، دەروونی پڕ دەبوو لە شادمانی و باوەڕبەخۆبوون و ترووسکەی هیوایەك لە دەروونی دا هەڵ دەبوو و دەکووڕایەوە:" خوایە گیان یانی چی؟ ئەم کارە مانای چیە؟"

لە کاتێك دا زەینەڵ لەم فکرەدا بوو کە:" بگەڕێمەوە؟ بچمە سەرێ عەلیسەفابەگ ببینم؟..." لە سەرەوەی باڵەخانەکە دەنگی عەلیسەفابەگ بەرز بووەوە کە بە پێکەنینەوە دەیگوت:

"مەسەلە چیە زەینەڵ، بۆچی لەوێ وشك بووی؟ بەڵام بەینی خۆمان بێ زۆر لە فکردا بووی ها، وەرە سەرێ بزانم."

زەینەڵ سەری هەڵێنا. بە روخسارێکی شێواوو تێکچوو بەدەم عەلیسەفابەگەوە پێکەنی. عەلیسەفا ڕاچەنی. تا ئێستا زەینەڵی بەم وەزعەوە نەدیبوو. دەستی بۆلای دەمانچە دەسك سەدەفەکەی چوو. هاتە سەر پلیکانەکان و گوتی:

"زەینەڵ چیە؟ چ بووە؟"

یەك لەحزە بە دڵی زەینەڵ دا هات کە:" دەبێ پێیبڵێم، گەمارۆی دێیەکە دەدەن و دەیگرن و شەڕی حەمەدۆك لەسەر ئەو خەڵکە کەم دەبێتەوە." پاشان لە دڵی خۆی دا هاواری کرد:"نابێ، نابێ، نابێ، نابێ.!"

زەینەڵ چوو لەسەر قەنەفەیەکی ڕووبەڕووی ئاغا لەسەر چۆك دانیشت، زەردەیەکی هاتێ و هەوڵی دا بەسەر خۆی دا زاڵ بێ. سەری قسەی داگیرساندو گوتی:

"پاش سووتانی خەرمانەکان دێهاتی‌یەکان پشتیان شکاوە، لەبەین چوون. ڕۆژێکیان بەیانی دیتم دێهاتی‌یەکان هەرچی خرت و پرتی هەیانە هەڵیان گرتوەو دەیانەوێ دێ‌یەکە بەجێ‌بهێڵن. لە قسەکانیان ڕا تێ‌گەیشتم کە دەیانەوێ پێش ڕۆیشتن خانووەکان بسووتێنن. ئەمنیش کەل و پەلی ماڵێم کۆکردەوە، باروبنەم لەبەر دەرگا دانا. بەڵام نازانم مەلافەرهاد لە کوێ پەیدا بوو، هات لەگەڵ دێهاتی‌یەکان زۆری قسە کرد. ئاخرەکەی لای نیوەڕۆیە پەژیوانی کردنەوە. دێهاتی‌یەکان کەلوپەلەکانیان بردنەوە ژوورو وازیان لە ڕۆیشتن هێنا. مەلافەرهاد بۆ ئێمە بووەتە ژانەسەر. تەنانەت وەسمانەزلەش بارگەوبنەی لەبەر دەرگا دانابوو و بە مل کەچی لەسەری دانیشتبوو، دوعای دەخوێندو دەیگوت:" هیچ ناکرێ، قیسمەت و نسیبمان ئەمە بوو." چاوەڕوانی عارەبانە بوو لە نارلی‌قشلا بۆی بێ و بیبا. ئاغا، ئەم مەلافەرهادە جگە گورگێکی پێ‌یە. هەموو خەڵك بەقسەی دەکەن."

عەلی‌سەفابەگ کە بەبیستنی قسەکانی زەینەڵ وەك چەوەندەر سوور هەڵگەڕابوو، وەك فەنەر لە جێی خۆی دەرپەڕی و بە نەڕاندن گوتی: "ئەمن، ئەمن... ئەمن..."

پاشان لە حاڵێك دا لاقی بە زەوی‌دا دەدا وەك شێتان دەستی دەکرد بە هاتوچۆ. بنی ژوورەکە کە تەختەبەند بوو، وەك بوومەلەرزەی لێ‌هاتبێ دەستی کردبوو بە لەرزین.

"ئەمن. ئەمن مشووری دەخۆم. کابرایەکی پێش نوێژی‌کەر کە کەس نازانێ کێ‌یەو لەکوێ‌ڕا هاتوەو ئەسڵ و نەسەبی چیە، پێش نوێژی‌کەرێك بە من... بەمن... وا دەکەم ئەو شیرەی دێهاتی‌یەکان لە مەمکی دایکی خۆیانیان خواردوە بە تفنکانیان دا بێتەوەدەر. وایان بەسەر دێنم پەژیوان ببنەوە کە بۆ لە زگی دایکیان هاتنەدەر... باش گوێ بگرە زەینەڵ، یان ئەمساڵ زستانێ دێهاتی‌یەکان لێرە باردەکەن، یان بەڵایەکیان بەسەردێنم بە داستان بی‌گێڕنەوە. ئەمن نایەڵم ئەوان لەسەر زەوی‌یەك کە بەقیمەت ترین شتی خۆم واتە ئەسپەکەمم پێ‌داوە، لەوە زیاتر بمێننەوە. ئەمن ناتوانم ڕێگای ئەو کارەیان پێ‌بدەم. لەم دەورو زەمانەیەدا هەق و ئینسانەتی و پیاوەتی هیچی نەماوە. ئەم حکوومەتەو ئەو قایمقامەش زۆر بێ‌دەسەڵاتن... وەختێك ناتوانن مافەکانی خەڵك بپارێزن، ناچار نین حکوومەت بکەن، با حکوومەت نەکەن، خۆ کەس مەجبووری نەکردوون کاکی خۆم!"

ددانی لە چیڕەوە دەبردن، ئارەق لە سەروچاوی هەڵدەچۆڕاو ماسوولکەکانی بنانگوێی هەڵیان داویشت، پێلووی هەڵمساوی چاوەکانی هەڵدێناو وێکی دەنایەوەو بە قەمچی‌یەك کە لە چەرمی بەرزگی گاجووت دروست کرابوو، لە چەکمەکانی خۆی ڕادەکێشا.

"ئەوانە هێشتا منیان نەناسیوە، نازانن دەتوانم چ بەلآیەکیان بەسەر بێنم. ئەگەر حکوومەت لە هەقی من نەپرسێتەوە، ئەمن زۆر باش دەزانم لەسەر هەقی خۆم وەجواب بێم... ئەمن نایەڵم هیچ کەس پێ لە سێبەرەکەشم بنێ، تەنانەت سێبەرەکەشم... ئەمن ئەو دێیە... ئەو دێیە... زۆری پێناچێ..."

قسەی دەکرد، کەفی هەڵدەخڕاند، راوێچکەی دەکرد، جنێوی بە وەسمانەزلەو مەلافەرهاد داو بۆ هەزارو یەکەمین جار دووپاتی کردەوە کە چۆن دێهاتیەکان لەسەر عەرزی خۆی دەردەکا. وەختێك لەبەر ماندوویی لە جێی خۆی دانیشتەوە، وای لێهاتبوو دەت گوت خەریکی گیان دەرچوونە.

"وایان لێدەکەم خوێن بڕشێنەوە. خوێن، خوێن، خوێن، خوێن بڕشێنەوە، خوێن، خوێن، خوێن، خوێن... خۆشیەکانیان وەك پلێتە لە لووتی دەردەکێشم، پلێتە، پلێتە، پلێتە، پلێتە... سزای ئەو خەراپەیەی دەرهەقی منیان کردوە خەراپ وەردەگرنەوە، خەراپ، خەراپ وەردەگرنەوە. خوێن، خوێن، خوێن، خوێن دەرشێنەوە!"

جگەرەیەکی لە گیرفانی دەرهێناو بە وردی بە مۆدنە کارەبایەکەیەوە کرد. زەینەڵ دەسبەجێ هەستاو بە مەقاشێکی چووکەڵە پۆلوویەکی لە کوورەخانەکە دەرهێنا. ئاغا جگەرەکەی بەو پۆلووە داگیرساندو پاشان گوتی:

"ئێ... زەینەڵ براڵە، کوڕە شێرەکەم، ئەتۆش نەت توانی دەرەقەتی ئەو بێ مێشکانە بێی... وانیە؟ لە کاتێك دا ئەگەر بە قسەی تۆیان کردبایەو رۆیشتبان ئێستا لەمێژ بوو ببوونە خاوەنی دێ و ماڵ و ژیانی خۆیان. باشە، باس و خەبەر؟ دوێنێ شەو لە دێیەکەتان لە دوور دەنگی دەهۆڵ دەهات. مەسەلە چیە؟ ئەم هەرچی و پەرچیانە لە خۆشیی ئەوەی خەرمانەکانیان سووتاوە جێژنیان گرتبوو؟"

زەینەڵ بە راوێژێکی ساردو بێ موبالات گوتی:

"هێندێك چیانشین لە دێیەکەمان هەن، وەك ئەمن بیستم گوایە کوڕی یەکێکیان لە سەربازی هاتوەتەوە. جێژنیان بۆ ئەو کردبوو... مەسەلەیەکی گرنگ نەبوو."

بەم جۆرە سەروکلکی مەسەلەکەی پێك گرت.

عەلی سەفا دیسان گوتی:

"ئەمن، ئەمن مشووری ئەو چیانشینانەش دەخۆم. چەند جارم بەو تووتکەسەگانە گوت وەرن رێك کەوین سەرانسەری ئەو دەشتە زەوت کەین، بەڵام ئەو دەویتە بێئەقڵانە نەیان

کرد... ئەمن، ئەمن بەوانە نیشان دەدەم... زەینەڵ، چوارپێنج رۆژی دیکە سەرێکم لێ‌هەڵێنە. دەبێ ئەم مەسەلەیە ببڕینەوە. خۆ ئەمن ناتوانم عومرێك لەگەڵ ئەو هەموو کەسانە مل بە ملە بکەم. هەر ئەو رۆژانە دەبێ دوا زەبری خۆم لە وایوای بدەم."

"بەسەرچاو ئاغا."

"هەم ئەتۆ ئاسوودە دەبی، هەم ئەمن."

"بەڵێ ئاغا."

"ئەم رۆژانە زیاتر وریای وەزعی ئاوایی بە. وادیارە لەوێ خەریکە خەبەرێك پەیدا بێ. دەبوو پاش سووتانی خەرمانەکان لێ‌دەن بڕۆن. کەچی باش بەربەرەکانی دەکەن. مەسەلە تەنیا مەلا فەرهاد نیە... دەبێ شتی دیکەش هەبێ. چاك خۆ رادەگرن. نەختێك گوێ پێدا بگرە. خەڵکی لادێ چاوترسێن دەبێ. تا سەر ناتوانێ ئاوا بەربەرەکانی بکا. بچووە بنج و بناوانی مەسەلەکە، باش چاوو گوێت بکەوە.

بریا ئەو فکرەی ئێستا هەمە دوو ساڵ لەمەوبەر جێ‌بەجێم بکردایە، یانی ئەگەر دووساڵ لەمەوپێش توانیبام جێ‌بەجێی بکەم، زۆر باش دەبوو. دەزانی چی؟ ئاخر یەك دوو ساڵ لەمەوبەر مەسەلەکە دژوار بوو، ئەودەم حکوومەت وەك ئێستا نەبوو، دەست و لاقی مەمانانی بەستبوو، بەم حەیوانانەی دەگوت سەروەری ئێمەن. دێهاتی‌یەکانیش خۆیان لێ‌گۆڕابوو، تەنیا خوالێخۆشبوو کالایجی دەرەقەتیان دەهات. تەنیا ئەو کالایجی‌یە یاغی‌یە بە تاقی تەنیا نیوەیانی لە دێ وەدەرنا. بەڵام ئێستا هەرچەند وەزعەکە زۆر لەبارترە، وادیارە هیچیان لێ حاڵی نیە! ئەسپەکانیان دەدزن، دێیەکەیان وەبەر تفەنگان دەدەن، خەرمانەکانیان دەسووتێنن، جەندرمە بە کوتەکان نیوە گیانیان دەکەن، دیسان هەروا بزانە هیچ نەبووە. زەینەڵ باش چاو و گوێت بکەوە. بزانە هۆی چیە ئەو ترسەنۆکە زراوتۆقیوانە ئەوەندە کەللەشەقی دەکەن."

"بە چاوان ئاغا."

"زەینەڵ، ئەمن بۆخۆم زۆری وەدوا کەوتم بەڵام هیچ سەرم لێ دەرنەکرد. نەم زانی کێ ئەوانەی وا وەغیرەت خستوە؟"

"ئەمن دەی‌دۆزمەوە ئاغا."

لە ژووری بۆنی گۆشتی سوورەوەکراوی نێچیر، بۆنی دۆینەو بۆنی پیوازو رۆن دەهات.

"زەینەڵ، با یەك دوو ئیستیکان هەڵدەین."

"بە چاوان ئاغا."

زەینەڵ لە نێو ئاگری جەهەننەمی دوودڵی دا دەسووتا:"بیڵێم، نەیڵێم؟ ئەگەر یەکی دیکە بێت و خەبەر بە ئاغا بدا، ئەودەم ئاغا چ بە من دەڵێ؟، ناڵێ نمەکی من چاوت کوێر کا؟ ئەمنیش دەڵێم ئاغا دێهاتی‌یەکان شکیان لە منە، هەموو شتێك لەمن دەشارنەوە، مەسەلەی هاتنی حەمەدۆکیش هەر وابووە! ئەمن بڵێم چی!"

## (٣٧)

سێ کەس، مووسلوو، سلەمان موورزەردو ئەحمەد هەرسێکیان لەنێو زێیەڵێن دا لەبن دارەکەی پشتی بەستێن دانیشتبوون و بەسپایی قسەیان دەکرد. مووسلوو کاتی خزمەتی سەربازی نایب ببوو و تەمەنی بیست و هەشت ساڵ بوو" بە بەژنی بەرزو ئەندامی راکشاو و نێوشانی پان و لاقی خواروخێچی هەروەك تاژی دەچوو. پانتۆڵی مەخمەرو چەکمەی لاسك چین داری لەپێ دەکردو پێش ئەوەی ئەسپەکانی ئاوایی بدزرێن، سواری ئەسپێکی سووری دوورەنگ و جوانی عەرەبی دەبوو. تاقانە کوڕی دایك و بابی خۆی بوو و لە ژیانی خۆشی رازی بوو. بە سواری ئەسپ دێ بە دێی دەشتی ئاناوارزا دەگەڕا. هێشتا ژنی نەهێنابوو، و تەنیا لاوی قەیرەی ئاوەدانی بوو کە هەتا ئەو تەمەنە بە رەبەنی مابووەوە. پیاوێك بوو توندە تەبیات و رووشکێن کە لە سەرانسەری دەشتی ئاناوارزادا بە ئازاو بوێر بەناوبانگ بوو. خۆی لە کاروباری عەلی سەفابەگ هەڵنەدەقوتاندو بەرامبەر بە زوڵم و زۆرێك کە ئەو لە دێهاتیەکانی دەکرد، دژکردەوەیەکی لە خۆی نیشان نەدەداو گوێی خۆی لێ داخنی. وەختێك ئەسپەکەشیان دزی، چەند رۆژێك توورە بوو، جنێوی دەدان و قسەی سووکی دەکردن، و دوایە بێدەنگەی لێکرد. مووسلوو ناهومێد بوو، پێی وابوو سەرەنجام عەلی سەفابەگ هەر جۆرێك بووە رەعیەتەکان لە وایوای وەدەر دەنێ و مل بە ملە لەگەڵ ئەو کابرایە بێسوودە. هەربۆیە کاری بە هیچ کارێك نەدابوو، بەڵام لە دوورەوە ئاگای لە هەموو رووداوەکان هەبوو و هیچی لەبەرچاو ون نەدەبوو.

سلەمان موورزەردو ئەحمەد بیست، بیست و یەك ساڵ تەمەنیان بوو. ئەوانیش تا ئەو رۆژە خۆیان لە هیچ کارێك هەڵنەقوتاندبوو و بە پەلە چاوەڕوانی چۆڵ بوونی ئاوایی بوون. ئەوانیش وەك مووسلوو بیریان دەکردەوەو پێیان وابوو کە حکوومەتێکی بەدەسەڵات پشت و پشتیوانی

عەلی سەفابەگەو هەموو جەندرمەکان گوێ لە مستی ئەون و جگە لەوەش، رەوەیەك سەگی چەك لە دەست و گوێ لە مستی لە دەرکی خۆی هەیەو سەرباری ئەوەش خەلکی گوندی چیك چیك لاری لەگەلٚ بوون کە هەموویان بە دزی و چەتەیی دەژیان. بەم وەزعەوە چۆن دەکرا پیاو قەرە لە قەرەی عەلی سەفابەگ بداو دەرەقەتی بێ؟ درەنگ یان زوو خەلٚك دێیەکەیان چۆلٚ دەکردو دەڕۆیشتن. ئەم سێ پیاوە هەتا ئەو کاتەی حەمەدۆك هاتە وایوای هەروا بێلایەن و دوورەپەرێز مان. مووسلوو بە دیتنی حەمەدۆك بۆ یەکەم جار بەخۆی دا شکایەوەو لە حەوشی مالٚی وەسمانەزلە لەگەلٚ هەستی ناهومێدیی خۆی کەوتە بەربەرەکانی.

مووسلوو رووی کردە سلٚەمان و گوتی:

"برالە موزەرد، ئێستا ئێمە قەلاٚو پالٚپشتێکمان هەیە، دەتوانین پێی پشت ئەستوور بین. ئەو هات، لەسەر چیا بەرزەکانی چوکووراوا هاتە خوار. ئەو ئێستا چاوەڕوانی دەرفەتێکی لەبارە کە بۆی هەلٚکەوێ."

ئەحمەد گوتی:

"باشە."

سلٚەمان گوتی:

"ئەو دەبێ جارێ چاوەڕوانی دەرفەت بێ."

"دەبێ لە پێش دا ئێمە گیانی وی بپارێزین و نەهێلٚین حکوومەت بۆن بکا کە ئەو لە دێی ئێمەیە."

ئەحمەد گوتی:

"چۆن نازانن، بە رۆژی رووناك هاتوەتە نێو دێی."

سلٚەمان:

"ئەدی، بە رۆژی رووناك هاتوەتە نێو ێ."

مووسلوو:

"زۆر کاری چاکی کرد. لە ژن و مندالٚەوە بگرە هەتا پیرەپیاوی سەد سالٚە ئەگەر هەموو گۆشتی لەشیان بە مەقاش لێبکەنەوە، دەتوانن شتێکیان لە زمانی دەرکێشن؟"

سلٚەمان:

"ئەگەر دێهاتی‌یەکان قیمە قیمەش بکەن، دیسان کەس بە گرتی نادا."

مووسلوو:

"ئەفەرێك نەبێ."

ئەحمەد:

"زەینەڵ نەبێ."

سڵەمان:

"زەینەڵ نەبێ."

مووسلوو:

"ئێستا ئەو سێیەمان دەبێ گیانی وی رزگار بکەین."

ئەحمەد گوتی:

"ناچارین ئەو کارە بکەین."

سڵەمان:

"خوا هەقە شێرە."

مووسلوو بە پێکەنینەوە گوتی:

"شێرەو دەبێ نەجاتی بدەین."

"زەینەڵ چاوی پێی کەوت؟"

سڵەمان:

"وەختێك ئەو لە نێو ئاوایی راوێچکەی دەکرد، زەینەڵ لە پەنای بوو. کاتێکیش وەسمانەزلە هات و خەڵکەکەی تێگەیاند کە ئەوە حەمەدۆکە، زەینەڵ رەنگی سپی هەڵگەڕاو هەر دیم غەیب بوو. دەت گوت بووەتە دڵۆپێك ئاو و بەزەویدا چووەتەخوار."

"پێتان وایە چووە خەبەر بە عەلی سەفابەگ بدا؟"

"دەکرێ خەبەر نەدا؟"

"کاری هەر ئەمەیە."

"لەوانەشە جارێ پێی نەگوتبێ و بەنیاز بێ پێی بڵێ."

"لەوانەشە چووبێ و عەلی سەفابەگی نەدۆزیبێتەوە. دەیەوێ بیدۆزێتەوەو پێی بڵێ."

"ئەگەر پێی گوتبا، تا ئێستا جەندرمە دێیان گەمارۆ دابوو."

"لەوانەیە عەلی سەفا چووبێتە شار."

"ئاخرەکەی دێتەوە."

مووسلوو:

"پێش ئەوەی مەسەلەکە ئاشکرا بێ و جەندرمە دێیەکە گەمارۆ بدەن..."
"پێش ئەوەی بەگیری بێنن..."
"دەبێ زەینەڵی بدۆزینەوە."
"ئەی ئەگەر شتێکی بە عەلی سەفا نەگوتبوو؟"
"ئەمڕۆش نەیگوتبێ سبەینێ دەیڵێ، سبەینێش نەیڵێ ڕۆژێك هەر دەیڵێ..."
"ئەدی هەر دەیڵێ."
"دەبێ زەینەڵی بدۆزینەوە."
مووسلوو پیاوێك بوو توندە تەبیات و کەم دوێ. بێ پێچ و پەنا قسەی خۆی دەکردو چووکترین عەیبی لە کەسێك دا دیبایە، ڕاست بەرەوڕوو پێی دەگوت و هەر بۆیە پێیان دەگوت دەلی مووسلوو (مووسلووە شێت).
دەلی مووسلوو وەك تاژیيەکی باریکەڵەی لاق درێژ دەچوو. دەم و چاویشی هەروەك دەم و چاوی تاژی دەچوون. لە غاردانیش دا وەك تاژی چوست و چالاك بوو.
بڕیاری یەکجارییان دا. خەنجەرێکیان هەڵکێشا، دەستیان لەسەر داناو سوێندیان خوارد. پاشان هەستان و بەرەو ئەو شوێنە کە چۆمی چیك چیك لار دەڕژایە دەشتێ، وەڕێ کەوتن. قەرار وابوو لەوێ چاوەڕوانی زەینەڵ بن. چونکە زەینەڵ چار ناچار دەبوو بەو ڕێگایەدا بڕوا. زەینەڵ بۆ دیتنی عەلی سەفا ناچار بوو بەم شوێنەدا هاتوچۆ بکا.
ئەو جێی چۆمەکە لێی دەڕژایە دەشتێ، قامیشەڵانێك بوو، وەك لێڕەوار. لای نیوەڕۆیە گەیشتنە قامیشەڵانەکەو سێ چوار هەنگاو دوور لە ڕێگا لەنێو قامیشەڵانێکی چوغر دا خۆیان مات دا.

✧ ✧ ✧

سەیفەلی هاتە لای مەلا فەرهادو گوتی:
"زەینەڵ لەنێو دێی دیار نیە. ڕۆیوە."
مەلا فەرهاد بەدەم هەناسەیەکەوە گوتی:
"زۆر خراپ بوو. "ئەو"یش وەزعی باش نیە، زۆر کزە، بەستەزمانە نەخۆشە. دەڵێی ئیفلیج بووە! تەنانەت هێزی ئەوەی لەبەردا نیە دەست بە پەلاپیتکەش دا بێنێ. چۆن دەتوانێ دەرەقەتی جەندرمەکان بێ، ئەویش ئەو هەموو جەندرمەیە؟"

سەیفەلی پرسی:

"چۆنی بشارینەوە؟"

مەلا فەرهاد گوتی:

"وەختێکی خەراپی هەڵبژارد. ئێستا وەختی ئەوە نەبوو بێتە خوارێ بۆ دەشتێ. وەختی نەبوو، بەڵام بەستەزمانە هێزی لەبەردا نەمابوو. ددانی بەسەر یەك دا رەق ببوون، ئێستا ئەوە خەریکە بەرە بەرە لێك دەکرێنەوە. دەم لە هیچ نادا. بە فکری تۆ لە کوێی بشارینەوە؟"

لە چاولێك نانێك دا هەموو خەڵکی دێ و یەك لەوان وەسمانەزلەو سەیران پێیان زانی کە زەینەڵ ون بووە. هەمووانیش بە باشی دەیان زانی بۆ کوێ چووە. هەموو دێیەکە بە جارێك هەژا.

"لە کوێی بشارینەوە؟"

"لە کوێ؟"

"هەربینا جەندرمە هاتن."

"هەربینا بەنێو دێی وەربوون."

"وەی شەهێنەکە وەی!"

"وەی براگیان وەی!"

"وەی کە نەمان توانی تێری چاوان تەماشات بکەین..."

"تەنانەت گوێمان لە دەنگیشی نەبوو."

"جارێکمان گوێ لە قسە خۆشەکانی نەبوو."

"لەم رۆژە رەشانەدا..."

"باڵندەیەکی چووکەڵە هاتوەو پەنا بۆ پنچکە دروویەك هێناوە."

"حەیف نەمان توانی لە چنگی مەلی راوکەر نەجاتی بدەین."

"حەیف نەمان توانی لە غەم و شادی دا لەگەڵی ببینە هاوبەش."

"لەکوێی بشارینەوە؟"

"لە کوێی بشارینەوە کە نەیدۆزنەوە؟"

"لە کوێ؟"

"ئەو زەینەڵە هیچ ئینسانەتی نازانێ؟"

"ئینسانەتی نازانێ؟"

هەموو خەڵکی ئاوەدانی وەك تاقە یەك مێشك بیریان دەکردەوە. نارەحەت دەبوون، غەم دایدەگرتن و بەسەرسوڕماوی چاوەڕوانی هێرشی جەندرمەکان بوون. لە فکری جێگایەك دا بوون کە "ئەو"ی لێ بشارنەوە، و وەختێك دەستیان نەدەکەوت، ناهومێد دەبوون. جارێك هیوادار دەبوون و جارێك دڵشکاو. جارێك وەغیرەت دەکەوتن و بڕیاری بەربەرەکانێیان دەداو جارێك تووشی ترس و لەرز دەبوون و دەکشانەوە دوایە.

"دەبێ لە کوێی بشارینەوە؟"

"لە کوێ؟"

وەسمانەزلە گوتی:

"دەقیقەیەك بێدەنگ بن خوا بتان بڕێ، دەقیقەیەك لێ وەبڕن..."

بەڵام ڕێگا چارەیەکی نیشان نەدا.

"جەندرمە لە کوێ دەزانن لەماڵی کێیە؟"

"وەختێك ئەو ماڵە دەگەڕێن، دەیبەینە ئەو ماڵە."

"ئەم ماڵە..."

"دەقیقەیەك بێدەنگ بن خوا بتان بڕێ، دەقیقەیەك لێ وەبڕن..."

"تەنانەت ئەگەر ئێسکیشمان بهاڕن..."

"لەت و پەتمان کەن."

"لەبن داران دا بمان کوژن."

"جێیەکەی بە کەس ناڵێین."

"هەموومان لاڵ دەبین."

"هەموومان، تەنانەت ئەسپ و سەگ و پشیلەکانیشمان قڕوقەپ دەکەین."

"ئەو ئەسپیشی نیە."

"تەنانەت پەلەوەرو مێروولەشمان دەم هەڵناپچڕێ."

"دەقیقەیەك بێدەنگ بن خوا بتان بڕێ، دەقیقەیەك لێ وەبڕن."

"بیبەینە ئاکچاساز لەوێ بیشارینەوە."

"بیبەینە قەڵای ئاناوارزا."

"خەڵکی ئووك سووزلی خەڵکێکی باشن."

"دۆست و بران."

"پشتی قەڵای ئاناوارزا گوندی حاجیلارە."
"پشتی قەڵای ئاناوارزا مەوتەنی کوردانی "لەك"ە"
"کوردە لەکەکان وەك هەڵۆ وابوون."
"ئەو کوردە لەکانە ئێستا تەنیا لە داستانان دا ماون."
"لە کوێی بشارینەوە."
"چەتەیەك هەبوو بە ناوی رەشیدە کوردە. ئەگەر دەچووە نێو شاخەکانی ئاناوارزا کەس نەیدەدۆزیەوە."
"جاران ئەو دێهاتە لێرەوار بوو. لەشکرێك چووبایە نێوی، تێیدا دەشاردرایەوە."
"ئێستا دەبێ چ بکەین."
"ئەو کەسەی هێندە تامەزرۆی بووین هات."
"بە قوربانی بەری پێیانی بین."
"دەقیقەیەك بێدەنگ بن خوا بتان برێ، لـێوەبرن ئێستا، لە پشت هەر تەپۆلکەیەك هەتاوێك دەردەکەوێ. ئێستا بێدەنگ بن، نەختێك سیکەدانەتان هەبێ."
دێهاتییەکان دەستە دەستە لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوەو لەبارەی زەینەڵەوە باس و وتووێژیان دەکرد. ژنان دەوری ژنێ زەینەڵیان دابوو، و لێکدا لێکدا لـێیان دەپرسی:"بە عەلی سەفابەگ دەڵێ، وەنا؟"
"ئەو"یش کوشم هەڵاتبوو، لەنێو جێی دا لە پەنای کوورەخانە بێجووڵان و بە لێو و لیچی داچۆڕاوەوە خەوی لـێکەوتبوو. خەڵکی ئاوایی لە منداڵانەوە بگرە هەتا بەساڵداچووان تووشی چەشنە خەفەت و چاوەڕوانی و هەژانێك بوون. هەموویان تووڕەو بێ ئارام بوون.
ئەو شەوە تا بەیانی جووتیاران بێ ئەوەی چاو لێك نێن بە نارەحەتی و دڵەخورپەوە دانیشتن و چاوەڕوانی هێرشی جەندرمەو دەنگی تەقە بوون. کەچی شتێك رووی نەدا. کاتێك بەیان ئەنگووت هەموویان ماندوو، بەڵام خۆشحاڵ بوون.
سەرانسەری ئەو رۆژەو بە درێژایی شەوی دواتر دیسان چاوەڕێ بوون، بەڵام دیسان چووکترین پێشهات رووی نەدا. لەبارەی ئەوە کە زەینەڵ لە کوێیەو دەبێ لە کوێ بێ، کەوتنە تەگبیرو ڕا. زەینەڵ ون ببوو. ئێستا کە سەروسەکوتی جەندرمەکان لە دێی دا پەیدا نەبوو، ئەدی زەینەڵ بۆ کوێ چووە؟
"دەبێ جێیەکی بۆ پەیدا بکەین خۆی تێدا حەشار بدا."

هەموو زیکرو فیکری جووتیارەکان ئەوە بوو کە بتوانن لە چوکووراواو دەشتی ئاناوارزا لە هەر جێیەك بکرێ، پەنایەك بۆ حەمەدۆك بدۆزنەوە، بەڵام بێئاکام بوو. دیارە هێندێك جێیان بە فکردا دەهاتن، بەڵام لێیان دڵنیا نەبوون.

لەبارەی "ئەو" دا تەنانەت متمانەیان بە چاوی خۆیان و بە دایك و بابی خۆشیان نەدەکرد.

دەلی مووسلوو بە لینگە درێژەکانی هەروەك تاژی دەچوو. بە دەم و چاوی درێژو لووتی پان و چاوی راکشاویەوە هەروەك ئەو تاژییانە دەچوو کە بۆ دیتنەوەی نێچیر مڵۆمۆ لە زەوی دەکەن. پێنج شەش رێبوار بە جادەی دا تێپەرین. شوانێك مێگەلەکەی بە قامیشەلان دا پەراندەوە، بەڵام خەبەرێك لە زەینەلّ پەیدا نەبوو. هەتاو بەرەو کەلەپۆ شۆر بووەوەو سێبەرەکان درێژ بوونەوە، بەڵام زەینەلّ نەهاتەوە. لەنێو خۆیان دا یەکێکیان بە نێشك داناو ئەوانی دیکە خەوتن. لە خەو هەستان، دیسان زەینەلّ نەهات. لە نەکاو دەنگی پێی رێبوارێك کە بە جادەی دا دەرۆیشت، ئەوانی راچڵەکاند. هاتنە نێوەراستی جادەو بانگیان کرد:"راوەستە رێبوار". رێبوار راوەستا.

مووسلوو گوتی:

"ماندوو نەبی زەینەلّ!"

زەینەلّ:

"بۆخۆت ماندوو نەبی!"

"زەینەلّ چاوەرێی تۆ بووین. درەنگ هاتیەوە."

زەینەلّ:

"ها؟"

"درەنگ هاتیەوە."

زەینەلّ بە ئەژنۆیەکی سست و بێهێزەوە دانیشت.

مووسلوو گوتی:

"هەستە زەینەلّ، هەستە لەگەڵمان وەرە. کارێکمان پێت نیە. هەستە زەینەلّ."

سڵەمان و ئەحمەد بن پیلیان گرت و راستیان کردەوە. زەینەلّ بە زەحمەت دەیتوانی بڕوا. لاقی تێك بادەدران."

مووسلوو گوتی:

"مەترسە زەینەلّ. دەبێ بە قەزاوقەدەر رازی بی. هەرکەس سزای کردەوەی خۆی وەردەگرێ. هیچ مەترسە باشە؟ ترسان سوودی نیە..."

لای نیوەڕۆیە گەیشتنە ئاکچاساز. چوونە نێو لێڕەواری تاریکی سنەوبەر. لەبەر چڕوپڕیی سنۆبەرەکان ئاسمان دیار نەبوو.

مووسلوو گوتی:

"دانیشە زەینەڵ، ماندوو بووی."

پاشان سیغارێکی پێچایەوەو بە لێوی زەینەڵییەوە کرد. زەینەڵ لێوەلەرزەی بوو. لەسەر زەوی دانیشت و گوتی:

"مەم کوژن، ئەمن زۆر شت دەزانم. ئێوە لەمەودوا دەتوانن کەلك لەمن وەربگرن. دەزانم منتان هێناوەتە ئێرە بم کوژن. بەڵام تکا دەکەم ئەوەم لەگەڵ مەکەن."

مووسلوو گوتی:

"بەڵێ هێناومانی بت کوژین."

سنۆبەرەکان، ئاسمان، مووسلوو و ئەوانی دیکە تێکەڵاو بوون. پەپوولەیەکی زۆر گەورەی نارنجی باڵەکانی جووت کردبوون و لەسەر لکە دڕدووکێك هەڵنیشتبوو و لاقی بەسەر سەرە زەلامە شینەکەی و چاوە درشتەکانیدا دێنا. زەینەڵ تەنیا پەپوولە نارنجییەکەی دەدی کە لاقە باریکەکانی بەسەر چاوە گەورەکانی دا دێنا. پەپوولەکەش ئاسوودەو ئارام لە جێی خۆی مابووەوەو هەڵنەدەفڕی.

لەحزەیەك پەپوولەکەی لە پێش چاو ون بوو. هەموو شتێك تێکەڵاو بوو و مێشێکی درێژی وەك مێشەنگوینە بە رەنگێکی سەوزی پۆڵاییەوە لەسەر گلووکی رەنگ پەمەیی تووترك خۆی دەنواند. مێشە شینەکە بەرەبەرە رەنگی پۆڵای بەخۆیەوە دەگرت و زیاتر دەبریقایەوە.

"مەم کوژن."

مووسلوو دەمانچەیەکی هەڵکێشا. دوو گوللەی لە سەری زەینەڵ دان. زەینەڵ هەر لەو جێی لێی دانیشتبوو لە خۆڵ گەوزی. سڵەمان و ئەحمەدیش یەکی دوو گوللەیان لێدان.

پەپوولە نارنجییەکە بە تەقەی دەمانچەکان هەڵفڕیبوو و لەسەر چڵە گۆزروانێك نیشتبووەوە، خەریك بوو لەسەر چڵە گۆزروانەکە هەڵدەفڕیەوە. لە پەستا هەڵدەنیشت و هەڵدەستایەوە، هەڵدەنیشت و هەڵدەستایەوە. پاشان هەستا، هەتا سەر بێشەکە هەڵفڕی و لە کاتێك دا بەدەم فڕینەوە بەرز دەبوو و دەهاتەوە خوار، بەرەو خۆرئاوا رۆیشت.

مووسلوو گوتی:

"تۆپی."

ئەحمەد:

"بۆخۆی وای دەویست."

سلەمان:

"هەموو رێبوارێك دەبێ بگاتە مەنزڵی خۆی."

لەوسەری باتلاغەکە، نەختێك لەولای ئەو شوێنە کە ئاوێکی قوڕاو لە زەوی هەڵدەقوڵی، قوولکەیەکی فرەوانیان هەڵکەندو زەینەڵیان هەروا بە قانگڵەبوویی لە قوولکەکە هاویشت و گڵیان وەسەر کرد. مووسلوو گوتی:

"بەهارێ بۆخۆشمان ناتوانین بیدۆزینەوە. ئاوەکە هەڵدەستێ و ئەوێ دادەگرێ."

ماندوو بوون. وەختێك هاتنەوە نێو دێ، خۆیان بەسەر پێوە رانەدەگرت.

مووسلوو وەك تاژی باریك و راکشاو بوو. شانەکانی نەختێك کۆم ببوونەوە.

سلەمان مووسلووی لە خەو هەستاند:

"زریانێکی توندی دێ. یالڵا راست بەوە درەنگمان لـێداهات."

"ئەحمەد لە کوێیە؟"

سلەمان گوتی:

"لێرەیە، لەبن کەپرێ چاوەڕوانە."

مووسلوو دەسبەجێ هەستا. خۆی پۆشتە کردەوەو کەوتنە رێ.

خەرمانەکانی عەلی سەفا هێشتا گێرە نەکرابوون، تەنیا لە دوێنێوە یەکێك لە خەرمانەکان جەنجەڕی لەسەر بوو.

مووسلوو گوتی:

"سلەمان، ئەتۆ مەزراکەی سەرێ ئاگر دە. لە پێش دا خەرمانەکان بسووتێنە پاشان کەردەکەی ئاور تێبەردە. ئەحمەد ئەتۆش دەچی بۆ لای "مەستیك ئوولۆن" و خەرمان و کەردەکانی وێ دەسووتێنی. ئەمنیش جەنجەڕەکە دەسووتێنم."

نیوەشەو بوو کە خەرمانەکانی کێڵگەی عەلی سەفا بەگ ئاگریان لـێبڵێند بوو. زریانێکی توندی کە دەهات بڵێسە ئاگری خەرمانەکانی لەگەڵ خۆی بردە نێوەڕاستی کێڵگەکەو ئەو شەوە تا بەیانی مەزراکانی عەلی سەفابەگ لەنێو گڕی ئاگردا دەسووتان و لەو دەشتە هەموارەدا دەریایەکی ئاگرین شەپۆلی دەدا.

خەڵکی گوندی وایوای و دێیەکانی دەوروبەر لە خەو راپەڕین:

"خەرمانەکانی عەلی سەفا دەسووتێن." هێندێك لەسەر کەپران، هێندێك لەسەر بانان و ژمارەیەکیش لەسەر داران ڕا هەتا تاوهەلاَت تەماشای خەرمانە ئاگرگرتووەکانیان کرد.

وەسمانەزلە لەکەولَی خۆیدا جێی نەدەبوو. دەچۆوە مالێ، دەهاتەوە دەرێ. دەمانچە ساچمەزەنەکەی کە دایگرتبووەوە، لەبەر پشتێنێ رادەکردو دەری دەکێشایەوە. دەیگوت:

"ئاوا، مەلا فەرهاد پیاوی بە ئیمانی خوا، قسەی تۆیە. هەموو کەس دەبێ سزای کردەوەی خۆی وەرگرێتەوە، بەلێ، ئەی پیاوی خواو ئایین، کە دەستەکانت پڕ لە نوورن، ئەی مورشیدی کامل... هەتا شەهێنم لە خەو هەلدەستێ، هەر خوا دەزانێ چەند شت روودەدا. هەر ئەوەندە بەسە سێبەرەکەی بکەوێتە سەر دەشتی چوکووراوا. تەنانەت ئەگەر تا قیامەتیش هەر ئاوا چلم هەلَلووشێ و بخەوێ، دیسان هەر سێبەرەکەی بۆ مەمانان بەسە. هەر سێبەرەکەی... هەر ئەوەندە بەسە کە خەلَك بزانن ئەو پێی ناوەتە سەر دەشتی چوکووراوا. هەر ئەوەندە بەسە. ئەو کێوەکان کون دەکاو رێگا بۆخۆی دەکاتەوە. خەلَکی لادێ چەند ترسەنۆکن، ئەوەندەش بەغیرەتن. هەر ئەوەندە بەسە پالَپشتێکیان هەبێ، تەنانەت ئەگەر ئەو پالَپشتە لاسکە چێودانێکش بێ.

لای نیوەڕۆیە خەبەرێکی دیکەش لە دێهاتی گەڕا. دوێنێ شەو هاوکات لەگەلَ ئاگر تێبەردانی خەرمانەکانی عەلی سەفابەگ مالَەکەشیان وەبەر گوللە داوەو هەرچی ئەسپ و ماین لە تەویلەکەی دابووە بردوویانە. خەبەرەکە راست بوو. عەلی سەفابەگ کە هەرگیز چاوەڕوانی پێشهاتێکی وا نەبوو هار ببوو و لە حالێك دا بە چنگان مووی سەری خۆی دەڕنیەوە بە ژنەکەی خۆی دەگوت:"ئەمن، ئەمن، ئەمن، خانم! چما ئەمن، ئەمن، ئەمن لەچاکە بەولاوە چیم لەگەلَ ئەو نمەك بە حەرامانە کردوە؟"

ژنەکەشی بەنیوە گریانەوە لە کاتێك دا وێڕای مێردەکەی تووکی لە دێهاتیەکان دەکرد، دەیگوت:"چیمان بەسەر دێ، هاوار چیمان بەسەر دێ؟"

"ئەم کارەیان بێوەلاَم ناهێلَمەوە. وەلاَمێکی پڕ بەدەم بەو دێهاتیە هاربووانەی وایوای دەدەمەوە. ئەگەر عەلی سەفا بەگ بم ئەم کارەیان لە سەرەوە ناچێ..."

## (٣٨)

عەلی سەفابەگ باوەڕی نەدەکرد ئەوەی دەیبینێ و دەیبیسێ، ڕاست بێ. دەیگوت:

"چۆن وێراویانە خەرمانەکانی من، خەرمانەکانی من بسووتێنن، ئەسپەکانم بدزن، چۆن شتی وا دەبێ؟ چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟ پشتیان بە کێ قایمە؟"

ژنەکەشی وێڕای هاوفکری و هاودەردی لەگەڵی دا دەیگوت:

"پشتیان بە کێ قایمە؟ دیارە پشت قایمییەکیان هەیە. دیارە یەکێك هەیە کە وەك چنار پاڵیان پێوە داوە، یەکێك هەر هەیە..."

"هەرچی بیری لێدەکەمەوە فکرم بۆی ناچێ کە پشتیان بە کێ قایمە. ڕۆژی وایە دەبینی هەموویان کز داماون و ترساون، و خەریکن دێیەکە بەجێ بێڵن و بڕۆن و ڕاست لەو کاتەدا کە ترسیان ڕێنیشتوەو کاریان کراوە، نازانم چ ڕوودەدا کە ڕووحیان دێتەوە بەرو یاخی دەبن و بەربەرەکانیم لەگەڵ دەکەن، ئەویش چۆن! خەرمانەکانم ئاگر دەدەن، ڕۆژێکیش بێ سێ و دوو کردن ماڵەکەم وەبەر گوللە دەدەن و خۆشم دەکوژن. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەمانە، ئەم هەرچی و پەرچییانە، ئەم ئەمەگ نەناسانە، ئەم نان خۆرو ناندێن دڕێنانە بە ڕووهەڵماڵاوی بێن و بیانەوێ بم کوژن، هیچ پێم سەیر نابێ."

"ئەم خوا نەناسانە دیارە دەکوژن. ئەمانە چاکەیان لە چاودا نیە. ئەگەر ئەتۆ نەبای، عارف صائم بەگ وەك ڕەعیەتەکانی ئاك مەزار دەماری هەموویانی دەردێنا. بریا هەر واشت کردبایە، بریا پێشت پێ نەگرتایە. ئا...خ حەیف بۆ میهرەبانی و ئینسانەتی! ئا...خ کە چاکەو ئینسانەتی بۆ ئەمانە نەهاتوە..."

"زەینەڵیش نەهات. چی بەسەر هاتوە؟ لەم جۆرە وەختانەدا زەینەڵ بەجێی نەدەهێشتم، خەبەرو باسی بۆ دێنام. دەترسم بەڵایەکی بەسەر هاتبێ. کێ، کێ، کێ ئەم کارەی کردوە؟

کێ ئەم هەرچی و پەرچییانەی ئاوا هان داوە؟ کێ ئەوەندەی ئەمانە پڕ ڕوو کردوە کە خەرمانەکانم بسووتێنن و ئەسپەکانم بدزن، ئەمە کێیە؟ ئەو مەلا فەرهادە بێدین و خوانەناسە بە من ناوێرێ. ئەو وەسمانەزلە خەرفاوەش هەر قسە دەکاو خۆی هەڵدەکێشێ. ئەدی کێیە؟ کێیە؟ کێیە؟"

ژنەکەی بە لارەملی و بە راوێژێکی جیددی گوتی:

"بەگ، یەکێك هەر هەیە ئیدی. هەموو ئێرەییمان پێ دەبەن. بریا هەر نەهاتباینە ئێرە. کەسیش نازانێ ئێمە لێرە چ دەچێژین. کەس نازانێ ئێمە لێرە لەنێو تاو لەرزو گەرماو تەپۆدا چ ژیانێکی سەگ مەرگیمان هەیە. هەموو ئێرەییمان پێ دەبەن. بە چاوانیان خەریکە بمان خۆن. هەر دەڵێن "کێڵگەی عەلی سەفابەگ". ئیدی خەبەریان لەوی دیکەی نیەو نیەو نیە. ئا...خ ئەو رۆژانەیان لەبیر چووە. ئەو رۆژانە کە ئەتۆ بەناوی نهێنیی "تایفۆن" لە شاخەکانی توورووس سنگی خۆت لە پێش فەرانسەیییەکان کردە قەڵغان و دوژمنت لە دەریا کرد، بە دەستەیەکی چل کەسی کە چەکی دەستیان تەنیا تفەنگی چەخماخ دار بوو، فەوجی "مانیل"ت ئەسیر کرد. ئەو رۆژانە، ئەو رۆژانەیان لەبیر نەماوە. ئا...خ ئەو وەختەی ئەتۆ بێ ترس و بێپەروا یاریت بە گیانی خۆت دەکردو دەت گوت:"ئەسپم دەنگ ئەدەم بۆم ناچێتە پێش، گوللەی فەرانسە نام هێنێتە ئێش"، ئەوان لەکوێ بوون؟ ئەتۆ خاکی نیشتمانت بەو گەورەییە بەخوێنی خۆت نەجات دا، بەڵام ئەوان چاوی دیتنی ئەو زەوییە دوو هەکتارییەی تۆیان نیە... ئاخ... ئەتۆ دەستت لە گیانی خۆت شوت و نیشتمانت نەجات دا... ئەو رۆژانە کە فەرانسەیییەکان دەستدرێژییان کردە سەر حورمەتی خاك و نیشتمانمان ئەوانە، ئەوانە کە ئێستا چاویان نیە ئێمەی پێ ببینن، هەڵاتن بۆ چیاکان، خۆیان لەکونە مشکان و لە بن پنچکان دا شاردەوە... هەموویان، هەموویان، هەموویان هەڵاتبوون. دوێنێ لە شار کچەتیوی "فنجان چییەکان" وادەکا:"دیسان دەچیەوە کێڵگە؟" گوتم:"بەڵێ، دەچمەوە کێڵگە، بەڵێ قوربان دیسان دەچمەوە کێڵگە..." پاشانیش چاوم لێك نان و زارم کردەوەو پێم گوت:"کچم! ئەو رۆژانە کە بابت لە ئەدەنە لە بن ئاڵای فەرانسە دا سەمای لەبەر فەرانسەیییەکان دەکردو کلکەسووتەی لەبەر دەکردن، عەلی سەفابەگی من، تایفۆنی من شەڕی لەگەڵ دەکرن. شەڕی دەکردو خوێنی دەڕشت. کچم، ئێستا چاوتان بەرایی نادا ببینن کە تایفۆنێك، قارەمانێکی سەربەخۆیی بوویێتە خاوەنی دوو هەکتار زەوی؟ ئەدی کچم؟!" کاتێك ئەم قسانەم پێ گوت متەقی لێبڕا، پاشانیش کلکی لە گەڵۆزی گرت و وەك دێڵەسەگ لێی دا رۆیشت. بە باوەڕی تۆ کارێکی باشم نەکرد؟"

عەلی سەفابەگ بە جۆرێك لە گژ فکران راچووبوو کە گوێی لە قسەکانی خێزانی نەبوو. ژنەکەی پەیتا پەیتا چەندین جار پرسی:"بە باوەڕی تۆ کارێکی باشم نەکرد، تایفۆن بەگ، کارێکی چاکم نەکرد؟"

بەگ کە هاتبووەوە سەر خۆی خێرا خێرا دەیگوت:"کاری چاکت کرد گیانەکەم، زۆر کارێکی چاکت کرد."

"هەموویان دوژمنمانن. کێڵگەکەمان بووەتە دڕکێك و لە چاوی چوکووراوا هەڵچەقیوە. خەتای خۆتە. چەندم پێ گوتی لەسیرێ تا پیوازێ هەموو شتێك بۆ مستەفا کەمال پاشا بنووسە. یەك بە یەك هەمووی تێبگەیەنە. تا ئەویش ئەو سەربازە راکردووانە، ئەو خائینانەی نیشتمان، ئەو بێغیرەتانە، ئەو دوژمنانەی سەربەخۆیی لە دار بدا، لەدار... چەندم پێگوتی بۆ مستەفا کەمال پاشا بنووسە کە "پاشا" ئەوانەی وەختی "حیزبی ئیستیقلال" دەرەقەتی تایفۆنی تۆ نەهاتن، ئێستا کلکیان لەسەر نەڕی پشتێ داناوەو دەیانەوێ وەك مار پێیەوە بدەن. گوتم بنووسە. ئا...خ ئەتۆ چەند میهرەبانی، چاکی، بە روحمی. دڵت نایە گورگی بیابان و مێرووڵەی سەر رێگاو ماری ژارداریش لە تۆوە ئازاریان پێ بگا، حەیف کە دڵت نایە."

ئەمجار لە بانگی گریانێی داو لە کاتێك دا داوێنەکەی هەڵدابووەوەو بەرو نێفەکی خۆی بە مێردەکەی نیشان دەدا، گوتی:"بڕوانە رۆژو رۆژگارم. وەرە بزانە. با بێن لاقانم، لەشی وەك گوڵ ناسکم ببینن، با بێن تەماشا کەن، ئەگەر ئینسان بن، ئەگەر ئینسانەتی بزانن، داخوا دڵیان تاقەت دەگرێ؟ تەپۆ هەموو ئەندامی لەشمیان هەلا هەلا کردوە."

پاو پووزی مەلیحەخانم پڕ بوو لەجێ دەمی تەپۆر مێشوولە. تەپۆ پێیانەوە دابوو، هەموو گیانی بریندار بوو.

عەلی سەفابەگ نیزیك کەوتەوە. سەروپەرچەمی خێزانیی ماچ کردو گوتی:"مەگری مەلیحە. ئەمن دەرەقەتی ئەمانەش دێم. هەروەك فەڕانسەییەکانم هەپروون بە هەپروون کرد، مشووری دوژمنەکانیشم دەخۆم. زەوییەکانی ئەم دەشتە هەقی خۆمانن و هەقیش بە هەقدار دەگا."

مەلیحەخانم لە کاتێك دا فرمێسکی چاوە گەورە بادامیەکانیی دەسڕیەوە گوتی:

"عارف صائم بەگ هەروەك ئاوخواردنەوە چەرکەسەکانی لە گوندو مەزرای خۆی وەدەرنا! دەستی خۆش بێ. بە نیازە کێڵگەیەکی نموونە دروست بکا کە لە جیهان دا وێنەی نەبێ. ئێمەش دڵمان بەوایوای و ئەو خەڵکە ناحاڵییە خۆش کردوە."

عەلی سەفابەگ گوتی:

"مەگری مەلیحە. ئەمن شەڕکەرێکی بەئەزموونم. حەز لە گیروگرفت دەکەم. ئەمجار وەك عارف صائم بەگیش نیم کە حکوومەتی "کۆماری تورکیە"م لە پشت بێ. ئەمن شەخسییەتی خۆم هێندە ناهێنمەخوار کە گیروگرفتەکانی خۆم بەرمە لای دەوڵەت. ئێمە "حیزبی ئیستقلال"مان لەبەر خاتری خۆمان دروست نەکرد... ئەگەر ئەوەی دێهاتی‌یەکان هان دەدا، دەکەوێتە بەر چنگم... لە پشت پەردەوە کەسێك هەیە کە لەنێو دێهاتی‌یەکان زۆری قسە دەڕوا، باوەڕو متمانەیان پێی هەیە. بەڵام ئەو دەبێ کێ بێ مەلیحە؟ کێ‌یە، کێ‌یە، ئەو کابرایە کێ‌یە؟"

مەلیحە گوتی:

"هەموون. کەس زگی بە ئێمە ناسووتێ. کەس ئاگای لە دڵی ئێمە نیە. ئەمە چارەنووسی من بوو؟ بابم ئەوەندەی بە من خوێند بۆ ئەوەی لە دەشتی ئاناوارزا تەپۆ بم خۆن؟ هەموو رۆژێ تا ئێوارێ ئەو دێهاتی‌یە پیس و چەپەڵانە لەبەر چاوی خۆم ببینم و قسەیان لەگەڵ بکەم؟ بڕوانە، بابم بۆ ئەوە منی نایە بەر خوێندن؟"

پاشان دووبارە داوێنی خۆی هەتا بەر نێوکی هەڵدایەوەو بەرو نێفەکی خۆی بە مێردەکەی نیشان دا.

"مەگری مەلیحە. مەگری. دڵنیابە دەرەقەتیان دێم. مشووریان دەخۆم."

پاشان لەهۆدەکە دا دەستی کرد بە راوێچکە. مەلیحەخانم شارەزای ئەخلاقی مێردەکەی بوو، کاتێك ئەو راوێچکەی دەکردن، ئەم دەنگی نەدەکردو بە چاوی مۆڵەق ماوەوە بێ‌ئەوەی هەست بە ماندوویی بکاو بە سەبرو سیکەدانەوە تەماشای پیاسەکردنی پیاوەکەی دەکردو تەنیا وەختێك قسەی دەکرد کە مێردەکەی شتێکی لێ‌پرسیبا.

چەکمە زەردەکانی عەلی سەفابەگ خۆڵاوی بوون. پانتۆڵە خەت خەتە قاوەیی‌یەکەی چەکمەکانیی دادەپۆشین. بەسپایی قەمچیی لە چەکمەکانی رادەکێشاو بەو زەبرانە دەنگێکی وەك دەنگی ئارامی تەپڵ لە چەکمەکانی هەڵدەستا. عەلی سەفابەگ لەمێژ ساڵ بوو فێر بوو لەنێو ئەو دەنگە نەرمەی وەك دەنگی تەپڵ دا بیر بکاتەوەو نەخشە بکێشێ."

دەیان گوت حەمەدۆك لە چیاکانی تووڕووس بینراوە. ماوەیەك پێشتر زەینەڵ بەگوێی خۆی گوێی لێ‌ببوو کە کچێکی جحێڵ لەبەر خۆیەوە گۆرانی‌یەکی بە نارەنار گوتبوو کە بۆ حەمەدۆك دانرابوو. "بەڕاستی زەینەڵ چیی بووە؟" دەبوو بیدۆزێتەوە.

"مورتەزا!"

دەنگێك لە خوار پلیکانەکانەوە جوابی دایەوە:

"فەرموو ئاغا."

"وەرە سەرێ."

مورتەزا کە تا ئێستا قەتی هێندە فیشەك لە خۆی نەدابوون، لە حالێك دا لەبەر قورسایی فیشەکدانەکان نێوچاوانی تێك نابوو لە پلیکانەکان وەسەر کەوت.

"بەڵێ ئاغا."

"کوڕم مورتەزا، ئەوە چەند رۆژە زەینەڵ دیار نیە. چیی بەسەر هاتوە؟ بەڵایەکی بەسەر نەهاتبێ؟ تا ئێستا شتی وا نەبووە. زوو زوو سەری دەدام. بەڵایەکیان بەسەر ئەو بەستەزمانە نەهێنابێ؟ برۆ وایوای و گوێ پێدا بگرە، بزانە چ بووە. لەوانەشە نەخۆش بێ."

"بە چەکەوە بچم یان بێ چەك؟"

"بێ چەك بچۆ."

مورتەزا رۆیشت.

"هەتا سەروسەکوتی حەمەدۆك لە چیاکانی تووڕووس دەردەکەوێ، دێهاتییەکان دەبووژێنەوە. هەرکاتێك دەنگ و باسی حەمەدۆك لەچیاکانی تووڕووسەوە دێ، دێهاتییەکانیش لێرە هار دەبن. ئاکا هۆی یاغی بوونی دوێشەو حەمەدۆك بێ؟ ئاکا ئەسپەکان حەمەدۆك رفاندبنی؟"

هێڵەکانی دەم و چاوی ئەسمەری عەلی سەفابەگ کە لەبەر سەوزەیی رەش دەچوو و دەت گوت دووکەڵگرتوو بووە، پەیتا پەیتا دەگۆڕان. لەدڵی خۆی دا دەیگوت:"تۆ بڵێی بوونی تاقە کەسێك لەو چیاو بەندەنانە بتوانێ ئەوەندە غیرەت وەبەر ئەمانە بنێ کە کەتنی وا گەورە بکەن؟ پیاو لەو هەرچی و پەرچییانە تێناگا. وەختی وایە دەبینی لە خشەی قۆڕی دەسڵەمنەوە، رۆژی واشە تۆپ و تفەنگیشیان پێوە نێی باکیان نیە... ئەم حەمەدۆکە عارف صائم بەگی لە پشتە، ئەگینا تا ئێستا لە بەین چووبوو. جەندرمە دەیگرن و بەرەڵلای دەکەنەوە." زۆر بە دەستی عارف صائم بەگەوە داماو بوو. ئەگەر ئەو بێویستایە سەرانسەری دەشتی چوکووراوای داگیر دەکردو کەسیش نەیدەوێرا لە پێشی راوەستێ و بڵێ پشتی چاوت برۆیە. بە باوەڕی عەلی سەفابەگ بوونی چەتە لە چیاکان و ئاڵۆزبوونی وەزعەکە بە قازانجی عارف صائم بەگ بوو. گورگی وەك عارف صائم بەگ حەز لە هەوای ئاڵۆز دەکاو ئەگەر هەوا

تووش نەبێ، گورگی بەهێزی وەك ئەو بە دەستی خۆیان هەوایەکە ئالۆز دەکەن. جگە لەوەش زۆر توندی ئێرەیی بە عارف صائم بەگ دەبرد.

وەرسوورا چووە لای ژنەکەی و نێوچاوانیی ماچ کردو گوتی:

"خەفەت مەخۆ مەلیحە. ئەمن دەرۆستی ئەمانەش دێم. ئێستا دەمەوێ بچمە چیك چیك لار بۆ لای خزمەکان. ئەگەر پیاو بن، دەبێ پیاوەتیی خۆیان نیشان بدەن و بێن. ئەگەر لەم هەل و مەرجە سەختەدا بە کەلك نەیەن، ئەدی کەنگێ بە کەلکم دێن. ئاخر وانیە؟"

مەلیحە پێکەنی. سەرگۆنا تورت و گۆشتنەکانی لە چاڵ کەوتن و بە زەردەخەنەوە دووپاتی کردەوە:

"ئەدی کەنگێ بە کەلك دێن؟..."

پاشان بە خۆشحاڵی و لەناخی دڵەوە گوتی:

"بە قوربانت بم تایفۆن بەگ. پیاوان زۆر لەگەڵ خۆت بێنە. ئەم هەرچی و پەرچیانە هەرچی لەدەستیان بێ دەرهەقی ئێمە درێخی ناکەن. ئەمانە، ئەم هەرچی و پەرچیانە خەرمانەکانمانیان سووتاند، ئەوانەی ئەوەندە نزمن کە ڕزق و ڕۆژیی خەڵك، رزق و ڕۆژیی ئێمە دەبڕن و ئەسپەکانمان دەدزن، ئەوانەی لە زەوییەکانمان نارۆنەدەر، هەر خەراپەو ناپیاوییەك لە دەستیان بێ، دەیکەن. دەبەرت مرم تایفۆن بەگ، وریای خۆت بە..."

عەلیسەفابەگ بە نیشانەی سەلماندن سەرێکی بۆ لەقاندو بە غاردان لە پلیکانەکان چووە خوار. لە حەوشەی ماتڵ نەبوو. ئەسپەکەی سازوئامادە بوو، هەرکە پێی لە ڕکێفێ نا، سێ پیاوی دیکەش خۆیان هاویشتە سەر ئەسپان.

خەڵکی چیك چیك لار لە دەرەوەی ئاوایی پێشوازییان لە عەلیسەفابەگ کرد. سەرکردەکەیان"حاجی کاهیا"ی بابی عەلیسەفابەگ پیاوێکی هەژار بوو کە بە قەرزوقۆڵە کوڕەکەی خۆی لەبەر خوێندن نا. عەلیسەفابەگ لە ڕێگای پیاوەکانی دەوڵەتەوە زۆری کۆمەگ بە خەڵکی چیك چیك لار دەکرد. تەنانەت ژمارەیەك لە خەڵکی ئەو دێیەی هەر لەو ڕێگایەوە لە بەندیخانە ئازاد کرد، کە پیاویان کوشتبوو. بۆیە خەڵکی ئەو دێیە زۆریان خۆش دەویست و هەرچی ویستبای بێ ئەم لاو ئەولا بۆیان دەکرد.

هێشتا چاك و خۆشییان نەکرد بوو، بە عەلیسەفابەگیان گوت:" ئیشەڵڵا خێرە ئاغا. خوا کەریمە. ئێمەش خۆ دەست و باڵمان نەبەستراوە..."

"سلامەت بن، بژین. زۆر لە ئێوە خزم و دۆستان رازیم." مووسا کاهیا"تان کە ناردبوو، هاتە لام و زۆری خۆشحاڵ کردم. چونکە هەر ڕۆژی دوای سووتمانەکە هاتە لام، وام زانی دنیایان

داومێ. ئێستا مەسەلەکە خەریکە زۆر قووڵتر دەبێ. بەڵام وەختێك ئێوە وەك کێو لە پشتم ڕاوەستاون، نیگەرانیم نیە..."

خەڵکەکە گوتیان:

"ئەرێ وەڵڵا وایە."

گوندی چیك چیك لار تەنیا گوندی دۆڵی چیك چیك لار بوو کە خەڵکەکەی بەدزی و چەتەیی دەژیان. تەنانەت ژنەکانیشیان ئەسپ دز بوون و هەموویان لە حەوت ساڵی‌یەوە فێری تفەنگ هاویشتن دەبوون.

خەڵکەکە گوتیان:

"ئاغا، ئەتۆ دڵ لە دڵ مەدە."

"لە چوکووراوا هەرجێ‌یەك پێی ئەسپی تۆی وێکەوێ، ملکی خۆتە"

"خوا سێبەری تۆمان لەسەر کەم نەکا."

"کوڕە ئاغا، گیان و ماڵمان بە قوربانی سەرە موویەکت."

"بەردێك لە نینۆکی تۆ بدرێ، جەرگی ئێمە دەبڕێ."

عەلی‌سەفابەگ لە خۆشی‌یان وەخت بوو باڵ بگرێ. لە کاتێك دا زاری هەتا بنانگوێ‌یان پێداپچڕابوو، دەستی ڕێك دەخشاندن و جگە لەوە کە لێکدا لێکدا بڵێ:"سلامەت بن یاخوا، هەر بژین." نەی‌دەتوانی قسەیەکی دیکە بکا.

لەنێو خەڵکەکەدا پیرەپیاوێك بە قەڵسی‌یەوە پێی گوت:

"عەلی! ئەوە چت لێ‌هاتوە؟ ئەتۆ پێت وایە ئێمە تۆ دەخەینە زاری ئەو گورگانەی وایوای و بۆخۆمان تەماشات دەکەین؟ بۆ وا تێك چووی؟ هەموو دێ‌یەکە بە قوربانی نینۆکێکی تۆ دەکەین. بڕۆوە سەرماڵ و گوزەرانی خۆت و خەیاڵیشت تەخت تەخت بێ. ئەمساڵ خەڵکی وایوای زەوی‌یەکانی تۆ بەجێ دێڵن و دەڕۆن. ئەگەر خەڵکی وایوای زەوی‌یەکانی تۆ بەجێ‌نەهێڵن و نەڕۆن، ئێمە ئەم گوندە بەجێ‌دێڵین و دەڕۆین و جارێکی دیکەش سەرمان هەڵنایە بێینەوە نێو پیاوان. تێگەیشتی، گوێت لێ‌بوو چم گوت کوڕە ئاغا؟ ئەتۆ بڕۆ وەدوای کارو گوزەرانی خۆت کەوەو کاری وایوای لێ‌گەڕێ بۆ ئێمە. هیچ نارەحەتیش مەبەو خەفەت مەخۆ."

عەلی‌سەفابەگ بە چاوێکی فرمێسکاوی و دەنگێکی گیراوەوە گوتی:

" خوا بت پارێزێ مام"حاجی وەلی"، منت خۆشحاڵ کرد."

حاجی وەلی گوتی:
"هەم خۆشحاڵ بەو هەم خاترجەم."
دەسبەجێ بە خۆشیی عەلیسەفابەگ بزنێکیان کوشتەوە. ئاورێکی خۆشیان کردەوەو گۆشتیان برژاند. ڕاکییشیان هێنا. عەلیسەفابەگ هەر لەنێو دێی نوێژی کردو پاش نان خواردن بانگی"دورسوون دورمووشی" کردو گوتی:
دورسوون دورمووش کوڕی خۆم، ئێستا وەختی دەست بەکاربوونە. چ نەخشەیەکت بۆ وایوای هەیە؟ دەتەوێ چ بکەی؟"
"هەرچی ئێوە بفەرموون."
"بڕوانە، ئێستا دەستیان بە تەواوی بەتاڵە. ئەسپەکانیان چوون. خەرمەناکانیان سووتان. تەنیا گاوگۆل و قازومراوی و مریشکیان ماون... گوێ بگرە دورسوون دورمووش لە گوندی وایوای نابێ بۆ نموونەش نە باڵندە بمێنێ، نە پێڕۆ. دەبێ هەموویان بکوژی و کەلاکەکانیان لە دەوران دەوری ئاوەدانی ریز بکەی."
"بە چاوان ئاغا."
"بەرنامەکەی دیکەت دوایە پێدەڵێم."
"خەلکی وایوای زۆر ترسەنۆکن، لە سەریان دە، پاروویان لە دەم بڕفێنە متەق ناکەن!"
هەرچەند مەسەلەی حەمەدۆك باشی فکری عەلیسەفابەگ ئاڵۆز کرد بوو. بەلام بۆ ئەوەی تێنەگەن مەسەلەکەی زۆر بەلاوە گرنگە، لەو بارەیەوە پرسیارێکی نەکردو چاوەڕێ بوو ئەوان مەسەلەکە بێننە گۆڕێ. بەلام سەرەنجام خۆی پێ ڕانەگیراو بۆخۆی بە جۆرێك باسی حەمەدۆکی هێنایە پێش و بە بێمویالاتی‌یەوە گوتی:
"لە بیرتانە وەختێك چەتەیەك لە چیاکان پەیداببوو، ئەوە کە عەبدیخانی خۆمانی کوشت"
دێهاتی‌یەکان گوتیان:
"ئا، بەڵێ، حەمەدۆك..."
"بیستوومە دووبارە لە چیا بینراوە."
حاجی وەلی گوتی:
"ئەو زۆر ئازایە، غیرەتی شێری هەیە، ماوەیەك لەمەوبەر برایمەڕەشی کوشت، سێ شەووڕۆژان لەگەڵ لەشکرێك جەندرمە شەڕی کردو سەرەنجام دڕی بە لەشکرەکە داو بە سلامەتی دەرچوو. بابایەکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە. پاشانیش..."

هەمووان بە قینەوە ئاوڕیان دایەوە سەر حاجی وەلی... حاجی وەلی دەسبەجێ تێگەیشت چ هەڵەیەکی کردوەو بۆ ئەوەی سەرو کلکی مەسەلەکە پێك بگرێ، گوتی:

"پاشانیش... پاشانیش برووسکەی بۆ مستەفاکەمال پاشا لێدا کە ئەو فەقیرو هەژارانە مەنێرە شەڕی من، ئەگەر دەوێری بۆخۆت وەرە پێش."

عەلیسەفابەگ لە هێنانەگۆڕی مەسەلەی حەمەدۆك پەژیوان بووەوەو زانی کە ئەو دێهاتییانە ڕێزو ئۆگرییەکی قووڵیان دەرهەق بەو منداڵە یاغییە لە دڵ دا هەیە. دیارنەبوو ئەم هەستە لە کوێ هەڵدەقوڵێ.

ئەگەر پێشی زمانی حاجی وەلیی نەگرتبایە، حەمەدۆکی دەکردە قارەمانێکی ئەفسانەیی.

بە باوەڕی عەلیسەفابەگ، حەمەدۆك کابرایەك بوو کە دەیتوانی بۆ هەموو کەس مەترسیدار بێ. خەڵکی وایوای ئەو هانی دابن، یان کەسێکی دیکە، بەهەرحاڵ ئەو، بنیادەمێکی خەتەرناك بوو. لەنێوبردنی کارێکی واجب بوو.

لەبارەی حەمەدۆکەوە فکری جۆراوجۆر هێرشیان دێنایە سەر مێشکی کە خەریك بوو شێتی کەن، ئەودەم دەترساو سام دەیگرت. داخوا ئەو کوڕیژگەیە قارەمانێکی گەلی بوو؟ ئەگەر قارەمانێکی گەلی بوو، بۆ گەیشتن بەو پلەیە جگە لە کوشتنی ئاغایەکی بەستەزمان و بێچارەی کوێرەدێیەك چ کارێکی گرنگی لەدەست هاتبوو؟ داخوا هۆی سەرەکی کە ئەم منداڵەی کردوەتە قارەمان چ شتێکە؟ وەختێك ناوی حەمەدۆکی هێنا، دێهاتییەکان و تەنانەت خزم و تایەفەو کەس و کارەکەی خۆشی بێدەنگ بوون و ئەگەر حاجی وەلیی زۆربلێ قسەی نەکردایە، کەس لەبارەی حەمەدۆکەوە زمانی نەدەگەڕا. داخوا ئەم کوڕیژگەیە کەشف و کەرامەتی هەیە؟ داخوا ئەفسوون و جادووی پێیە؟

عەلیسەفابەگ لە کاتێك دا لە دڵی خۆیدا دەی پرسی:" ئەرێ لێی دەترسم؟"لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

"دەبێ بڕۆم بۆ شار."

ئەسپەکەیان بۆ هێنا، سوار بوو. لە دڵی خۆیدا بیری دەکردەوە: "داخوا دەترسێم؟ ئەسپەکانیانم بە دزین دا، ئەوانیش ئێ منیان دزین... خەرمانەکانیانم سووتاند، ئەوانیش هینەکانی منیان سووتاند... ئەمن گوتم گاوگۆلەکەی وان بکوژن، ئەوانیش هەر ئەو کارە دەکەن؟ ئەمن فەرمان دەدەم بیان کوژن... لەوانەیە بڵێم مەلافەرهادیش بکوژن. داخوا ڕێی تێدەچێ ئەوانیش من بکوژن؟..."

مووی قالبی ڕاست بوونەوە، بۆ یەکەم جار مردنی زۆر چاك و زۆر نزیك لە خۆی هەست پێکرد. داخوا ئەم دێهاتی‌یانە دەی‌کوژن؟ داخوا دەوێرن کاری وا بکەن؟ تۆ بڵێی شتی وا بگونجێ؟

لە کاتێك دا پێ‌دەکەنی لەبەر خۆیەوە دەی‌گوت:"خەریکم دەترسم. سووتمانی ئەو دەشتە بە جارێك مێشکی تێك داوم. باشە، خەرمان سووتاندن کارێکی نیە، بەڵام لە وایوای کەسی وا پەیدا نابێ بتوانێ ئەسپەکانم بدزێ..." و دەسبەجێ فکری حەمەدۆك لە زەینی‌دا زیندوو دەبووەوە:" ناکا تەواوی ئەم گونگەڵانە لە بن سەری حەمەدۆك دا بن؟ ها...! نا گیانە. ئەو رۆژێك لە چیاو بەندەنان دەردەکەوێ و بۆ بەیانی دەڕواو دە ساڵان ون دەبێ... چەتەیەکی سەیرو سەمەرەیە. دیسان دێهاتی‌یەکان بە شانازیی وی دڕووەڵانەکە ئاگردەدەن. دیسان لەسەر دوندی چیاکان ئاگر هەڵدەبێ. زۆر سەیرە. لەوانەشە ئەم دێهاتی‌یانە ئاگرپەرست بن.

بەڵێ! هەمزەش رۆیشت! کاری تەواوە. دەڵێن ئەویش زۆر لەگەڵ رەعیەتەکان خەراپە... باشە، مەسەلەی تۆڵەی عەبدی‌خانیش لە گۆڕێ‌دایە... بەڵام خۆ ئێمە لە چەرخەکانی نێوەڕاست دا ناژیین! ئەم جۆرە توندو تیژی‌یە هەر ئەم ئاکامەی دەبێ. ئێستا بزانم چۆن دەتوانێ گیانی شیرنی دەرباز بکا."

بەباوەڕی عەلی‌سەفابەگ هاتنەوەی حەمەدۆك بۆ توورپووس بە مەبەستی کوشتنی هەمزە لەگەڵ ئەقڵ و مەنتیق ڕێك دەکەوت. حەمەدۆك پاش کوشتنی هەمزە دووبارە ون دەبێتەوەو دێهاتی‌یەکانیش پاش ڕۆیشتنی ئاگر هەڵدەکەن. کەوابێ دەلیلێك بۆ ترس و لەرزی وی نەبوو. بەڵام...

عەلی‌سەفا لە کاتێك دا بیری لەم مەسەلەیە دەکردەوە گەیشتە شاری. ئەسپەکەی بردەوە ماڵێ و یەکێك لە نۆکەرەکانی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و چووە نێو بازاڕ.

## (٣٩)

یاوەر دەی گوت:

"بنیادەمێکی سەیرو سەرسوڕ هێنەرە. سەرسوڕهێنەرو ئازا."

هەمزەش لە حالێك دا چاوی وەك زارە ئەشکەوت داپچڕابوون، پرسی:

"بە باوەڕی ئێوە ناکرێ بیگری؟"

"هەر چەتەیەك ئاخرەکەی ڕۆژێك دەگیرێ، بەڵام دەبێ بزانین کەنگێ."

وەکیل باشی عاصم هاتەوە نێو باسەکەوە:

"ئاخر پیاو ناتوانێ سەر لە کاری وی دەرکا، پێش بینی ناکرێ... وەك ماسی نێو ئاو وایە، لەنێو دەستی بنیادەم دا دەخزێ و دەردەپەڕێ!"

"وەکیل باشی ، بە باوەڕی ئێوە ئێستا بۆ کوێ چووە؟"

"کەس نازانێ. لەپڕ ون دەبێ، پاشان خوا دەزانێ لەکوێ سەر وەدەر دەنێ... بۆ وێنە پێت وایە ئەمڕۆ لە چوکووراوایە، لەپڕ دەبینی سبەینێ لە ئالاداغ سەر وەدەر دەنێ. ئەمڕۆ پێت وایە لە ئالاداغە، بەڵام ڕۆژێکی دیکە دەبینی سەر لە چوکووراوا دەردێنێ! کارەکانی ئەو کابرایە کەس تێیان ناگا. لەنەکاو دەبینی سێ شەوو ڕۆژان نە ئیسراحەت دەکا، نە دەخەوێ، نە نان و ئاو دەخوا، وەك با دەفڕێ. بنیادەمێکی سەیرە. پێیخۆش بێ دەبینرێ و پێیخۆش نەبێ نا..." وادیاربوو ڕاوێژی وەکیل باشیعاصم لە کاتی باسی حەمەدۆك دا کەمێك تاریف و پێهەڵگوتنی لەگەڵە. وەختێك باسی دەکرد، دەنگی زیندووترو گەرم تر بوو.

"کەوایە لە گرتن نایە؟"

یاوەر گوتی:

"بۆچی، دەش گیرێ، بەڵام پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر ئێمەی بەدوای خۆی دا ڕاکێش کردو سەری لـێشێواندین و کەفەزگی کردین. چما ئەقڵ دەیگرێ، نەگیرێ؟ " چاکیرچالیئەفە" چاردەساڵ سوپای جارز کردبوو، ئاخرەکەی چی بەسەر هات؟ لـێیان داو کوشتیان. چما ڕێی تێدەچێ نەگیرێ؟"

هەمزە وردەوردە فکری دەشێواو حەواسی پەرت دەبوو. ترسێك کە لە دڵی دا شاردرابووەوە کەم کەم خۆی دەردەخست و لە پەستا وەکیل باشیو یاوەری دەخستە بەرپرسیار. سەرەنجام لەو پرسیارانە گەیشتە ئەو ئاکامە کە بەو ئاسانیيە باشاری حەمەدۆك ناکرێ.

وەکیل باشیعاصم زۆر بە ئیشتیاوە دەیگێڕایەوە کە:

" ڕۆژێکیان دیسان لەگەڵی بەرەوڕوو بووین. لە "ئاشاغی ئاندریم" بوو. سێبەسێ بەنێو مەرەزەجاڕدا دەڕۆیشتن. دەت گوت بە نێو سینیيەك دا دەڕۆن. ڕاست لە نێوەڕاستی مەرەزەجاڕێکی سەوزسەوزدا دەڕۆیشتن. بەیانی بوو. ئێمە تەقەمان لـێ کردن. لەنەکاو دیتمان لە نێوەڕاستی مەرەزەجاڕەکە دووکەڵ هەستا. پاش تاوێك دووکەڵەکە نەماو تەماشامان کرد ئەو سێ کەسەش دیارنین. دەت گوت بوونە ئاوو بە زەویدا چوونە خوار. ئەو ڕۆژە هەموو مەرەزەجاڕەکەو دەوروبەرەکەیان بە زیاتر لە هەزار کەس دێهاتی و دەستەیەك جەندرمە سەنگ و سووژن نا. بەڵام شوێنەواریان نەبوو. بۆ سبەینێ بەیانی ئەویان لەگەڵ هاوڕێیەکانی لە "ساری باخچە" دیبوو. وەدوای مەسەلەکە کەوتم. خەبەرەکە ڕاست بوو. بنیادەم چۆن دەتوانێ بەشەوێك ئەو هەموو ڕێگایە ببڕێ؟. ئێستاش کە ئێستایە بۆ من بووەتە مەتەڵۆکە. ناڵێم ناگیرێ. بەڵام بەو ئاسانیيەش کلکی بە تەڵەوە نابێ. ئەمن تووشی زۆر کەس لە چەتەکان بووم. بەڵام پیاوی وا چوست و چالاکم نەدیوە. ئەوم جارێك دیوە. پیاوێکی ڕیوەڵەیە. نازانم چ نهێنیيەك لە کاردایە کە هەموو دێهاتيیەکان خۆشیان دەوێ. چەندین ساڵە سەروکارم لەگەڵ یاغیيانە، بەڵام تا ئێستا کەسم نەدیوە ئەوەندە لەلای خەڵك خۆشەویست بێ. زەحمەت بکرێ حەمەدۆك لە دەستی دێهاتيیەکان برفێندرێ."

هەمزە گوتی:

" هەموو خەلکی دێی ئێمە لەگەڵی دوژمنن. تەنیا چاوەڕێی دەرفەتن. ئەگەر وەدەستیان کەوێ لە کەچکە ئاوێك دا دەیخنکێنن. ئێمە ئاغای خۆمان زۆر خۆش دەویست. ئێستاشی لەگەڵ بێ شەووڕۆژ فرمێسك بۆ عەبدیخان هەڵدەوەرێنن. هەقیانە. عەبدیخان وەك فریشتە وابوو، پیاوی خوا بوو. دەڵێن ئێستاش دێهاتيیەکان دەیبینن کە بە سواری ئەسپی بۆرە لەنێو

خەرمانەی نووردا بەسەر ئاوەدانیەوە دەفڕێ. پازدەشەو هەتا تولعی بەیانی بەخەبەر بووم بەلکوو بیبینم، بەڵام بە نسیبم نەبوو. وادیارە لەمن قەڵسە، بۆیە خۆم نیشان نادا."

وەکیل باشیعاصم و یاوەر پێکەنینیان بە قسەکانی هەمزە دەهات...

هەمزە بە دەنگێك کە لەترسان دەلەرزی، بە ڕاوێژێکی تێکەڵ بە گریانەوە بە داماوی و ناهومێدی گوتی:

" ئەمن دەزانم ئەو ئاخرەکەی منیش دەکوژێ. ئەو لەبەر خاتری من گەڕاوەتەوە ئێرە. هاتوەتەوە من بکوژێ. ئەمن چیم دەزانی! بریا لە چوکووراوا نەهاتبامە ئێرە. وەجاخم کوێر بووەوە. هاتم کە نەهێڵم وەجاخی بابم کوێر بێتەوە. بەڵام گیانی شیرینم دانا. ئەو سەرەنجام منیش دەکوژێ."

" هەمزە لەگەڵ دووپات کردنەوەی ڕستەی:" ئەو سەرەنجام منیش دەکوژێ."، بێ چاوتروکاندن تەماشای وەکیل باشی و یاوەری دەکرد کە بەلکوو لە زمانیان ببیسێ بلێن یارمەتیت دەدەین و فکرێکت بۆ دەکەین و تیشکێکی هیوا لە دلّی بدا. بەڵام پێکەنین لەسەر لێوی وەکیل باشی و یاوەر تۆرابوو و روخساریان وەك دیوار ڕەق و بێموبالات بوو. ئەو دووە هەر ئەو ڕۆژە کە بیستیان حەمەد گەڕاوەتەوە چیا، لە باسی خۆیان دا بەو ئاکامە گەیشتن کە بۆ کوشتنی هەمزە هاتوەتەوە.

وەکیل باشیعاصم گوتبووی:

"بێئەم لاوئەولا حەمەد دەیکوژێ، حەمەد تا هەمزەی نەکوژێ ناگیرێ" ڕۆژی شەڕەکەش کە حەمەد بە پاڕانەوە بە وەکیل باشیی دەگوت: "هێندێ کارم هەن دەبێ تەواویان بکەم." هەمووان دەیان زانی مەبەستی چیە. بێئەم لاوئەولا کاری هەمزە یەك لا دەکا.

"ئەو من دەکوژێ. وانیە وەکیل باشی؟ کەسیش ناتوانێ پێشی پێبگرێ. نەئەتۆ، نە عارف صائم بەگ، نە مستەفاکەمال پاشاو نە خوای گەورە. وانیە؟"

وەکیل باشی وەڵامی نەدەدایەوە.

"وا نیە جەنابی یاوەر؟"

یاوەر کە دەت گوت گوێی لە پرسیارەکەی نەبووە، بە چاوێکی حەبەساو و بێحاڵەوە گەوجانە تەماشای سەروچاوی ئەوی دەکرد.

"یاوەر، ئەو سەرەنجام من دەکوژێ، دەزانم دەم کوژێ. بەڵام ئێوە دلّتان نایە پێم بلێن. وانیە؟"

ئەوان رووبەڕووی یەکتر لەبەر کوورەخانەیەك کە موورەداری گەورە گەورەی تێدا دەسووتان، دانیشتبوون و تەماشای ئەو دارانەیان دەکرد کە بە قرچە قرچ دەسووتان، و قسەیەکیان بۆ گوتن نەدەدۆزیەوە.

هەمزە لە حاڵێك دا هەر دەیگوت:"ئۆف، ئۆۆۆف، ئۆف!" لە جێی خۆی ڕاست بووەوە، ڕۆیشتە خوار بۆ بەستێنی چۆمەکەو لە قووڵایی شەوی بێئەستێرە دا نوقم بوو.

"خوایە، رووح وەبەر ئەم بەردە بنێ! ئەوەی مردوە زیندووی بکەوە! رووح وەبەر ئەو ئاسنە تواوەوەی نێو کوورە بنێ! گیان بێنەوەبەر دارو لك و پۆپی وشك هەڵاتوو! ڕووناکایی بدەوە بە چاوی کوێر..."

هەستی بە پەژیوانی دەکرد. وەك سەگ پەژیوان بوو:"ئاخ لە دەستی ئەم پتراخ ئۆغڵیە ئا...خ لە دەستی ئەو پیرە سەگە! هەمووی خەتای وییە، ئەو گیانی شیرنمی لێنەستاندم!" پاشان هاواری کرد:"پێش ئەوەی بمرم ئەوی دەکوژم." بە وەبیر هاتنەوەی مەرگ ئاگری رق و قینی بەرامبەر بە پتراخ ئۆغڵی خۆشتر دەبوو:

"ناپیاوی بێناموس، ئاخر چۆن بوو کە منت وەبیر هاتەوە؟ سەری خۆم داخستبوو و لە چوکووراوا چاك و خەراپ گوزەرانم دەکرد. بۆچی بۆ دوو هەکتار زەوی ئەم زوڵمەت لە من کرد؟ گیانی شیرنمت لێ ئەستاندم. ئێستا چ بکەم، چ خاکێك وەسەر خۆم بکەم؟. ئەو یاوەرەش کە ئەوەندە نان و نمەکی منی کردوە، ئەوەندە بەرخ و هەنگوین و ڕۆنەکەرەی منی خواردوە، ئێستا قژقژ پێم پێدەکەنێ. بە جۆرێك تەماشام دەکا دەڵێی چاو لە کەسێك دەکا کە خەریکن لە داری دەدەن. پتراخی نەفام، هەقی خۆیەتی پێش مردن ئەو ملە درێژەی تۆ وەك ملی مریشك بگرم و بت خنکێنم؟... هەمووی تاوانی تۆیە!"

جۆیەکی باریك بە خوڕەخوڕ تێدەپەڕی. بێئەوەی بۆخۆی بزانێ وەنێوی کەوت و پەڕیەوە ئەوبەر. دنیا زۆر تاریك بوو. لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئەم شەوە تەواو نابێ، تاریکاییش نابڕێتەوە، شان بە شانی من لەگەڵم دێ..."

نارەحەت و پەرێشان، بێئەوەی بچێتە جێیەك لەگەڵ شەو ببوو بە یەك و لەگەڵ شەودا دەگەڕا. لە نەکاو خۆی لە بەردەرکی ماڵی عەلیەشەل دیتەوە. هێشتا چرای ماڵەکەیان داییسا. وادیار بوو عەلیەشەلیش ئەمشەو خەوی لێتۆراوە. هەمزە بیری کردەوە:"ئەویش، ئەو بەستەزمانەش لەگیانی خۆی دەترسێ. ئەمنیش ئەوم تووشی ژانەسەر کرد."

له کەلێنی دەرگاوە تەماشای ژوورێی کرد. عەلی باوەشی بە ئەژنۆی خۆی دا کردبوو، چەنەگەی خستبووە سەر ئەژنۆی و لە گۆشەیەگ کوشم هەڵاتبوو. بانگی کرد:

"کاك عەلی، کاك عەلی."

عەلی دەسبەجێ راست بووەوەو دەرگای کردەوە.

یەکەم قسەی هەمزە ئەمە بوو:

"دەکوژێ، هەردووکمان دەکوژێ. دەکوژێ. بۆ کوشتنی ئێمە هاتوەتەوە چیا. ئێمە دەکوژێ!"

عەلی بە لارەملی گوتی:

"ئەدی، دەمان کوژێ."

عەلی وەزعێکی وا پەرێشانی هەبوو دەت گوت هەر ئێستا دەستی لە گیانی خۆی شوتوە.

هەمزە گوتی:

"بەنیازی کوشتنی من هاتوە."

عەلی گوتی:

"بە نیازی کوشتنی ئێمە هاتوە."

"بریا لە چوکووراوا نەهاتبامەوە. ئەتۆشم تووشی ژانەسەر کرد، ئەتۆش... ئەمن ناهەقیم لە تۆ کرد. پتراخیش منی خستە ئەم بەڵایەوە. بریا..."

عەلی قسەکەی وی تەواو کردو گوتی:

"بریا کەسێکی دیکە هاتباو ببا بە ئاغای خاردەشت. کەسێکی دیکە کوژرابا."

هەمزە دووپاتی کردەوە:

"ئەرێ، کەسێکی دیکە..."

"چۆن هێشتیان لە دەستیان دەرچێ؟ لەنێو دێ دا گەمارۆیان دا، لە ئاشی سمایلەزلە گەمارۆیان دا، بەڵام هێشتیان لە دەستیان دەرچێ. تاقە پیاوێك و دەستەیەك جەندرمە..."

هەمزە گوتی:

"وەك ماسی وایە... لە دەستی بنیادەم دا دەخزێ. وەك تەیری ئاسمان وایە، ئێستا لێرەیە، دەقیقەیەکی دیکە لە چوکووراوا. راست وەك مووسا سەرسەرە... لەویش بێڕەزاترە!..."

"مووسا سەرسەرِ دەڵێ ئەو لە من چالاك ترە. دەیگوت ئەمن شوێنی هەموو شتێکم هەڵگرتوە. دەیگوت:"شوێنی باڵی باڵندە، شوێنی لاقی ئاسك، شوێنی پێی مێروولەو

هەزارپێ، شوێنی پێی هەموو بوونەوەرێکی زیندووم هەڵگرتوەو دۆزیومەتەوە، بەڵام نەم توانی شوێنی وی هەڵگرم و بە ئاکام بگەم. نهێنی‌یەك لە کاری ئەم کورپژگەیەدا هەیە، بێ‌ئەملاو ئەولا نهێنی‌یەك هەیە."

"عەلی! ئەمن چ بکەم؟ ئەتۆ فکرێك بکەوە عەلی. فکرێك بۆ ئەو گیانە شیرنەمان بکەوە، با لە دەست نەچێ."

عەلی وەلاّمی دایەوە:

"دەکوژێ... ئا...خ دەمان کوژێ. چ بکەین؟"

"هەڵێین بچینە جێگایەك. بچینە گەڵ عێلاتێك کە کەس ناو و ناوبانگی نەبیستبێ."

عەلی بە ناڵینەوە گوتی:

"ئەو دەمان دۆزێتەوە. بچینە کونەمشکیشەوە، لەبن باڵی تەیری ئاسمانیش دا خۆمان بشارینەوە دیسان دەمان دۆزێتەوەو هەردووکمان دەکوژێ. لە پێش دا کارێکمان پێ دەکا ئەو شیرەی لەمەمکی دایکی خۆمان مژیوە، بەکونە تفنکمان دا بێنێتەوە خوار، پاشانیش هەردووکمان دەکوژێ. وەجاخمان کوێر دەکاتەوە. ماڵمان دەکاتە هێلانەی خامۆشان."

"باشە بزانم! جەندرمەکان نای کوژن؟ ئاغاکانی چوکووراوا، عارف صائم بەگ، ئەدی ئەمانە چ دەکەن؟"

"هیچ کەس ناتوانێ بی‌کوژێ. ئاخر دەزانی گوللە کاری لێ‌ناکا؟ دەڵێن تەنیا چاوپەتی کە گوللە کاری لێ‌بکا. رۆژێکیان لە چیایەك بارانی لێ‌دەبارێ. نووزوون جەبارو نایب رەجەبیشی لەگەڵ دەبن. لەبەر بارانێ دەچنە بن دارێکی گەورە. پەیتا پەیتا بریسکە لە دارەکە دەدا. دارەکە دووکەڵی لێ‌هەڵدەستێ. ئەوان لەبن دارەکە رادەکەن و دەچنە بن تاتە بەردێك . یەك لە دوای یەك بریسکە لە دارەکە دەدا. دارەکە جار لەگەڵ جار رووناکتر دەبێ، بە جۆرێك کە ئاخرەکەی دەکەوێتە نێو خەرمانەی نوور. نوورەکە جار بەجار زیاد دەکا تا وای لێ‌دێ کەس نەتوانێ چاوی لێ‌بکا. وەختێك بریسکەیەکی گەورە دەکەوێتە سەر دارەکە لەپڕ دەبینن حەمەد لەبن تاتەبەردەکەڕا غاردەدا بۆ لای دارەکە. تاوێك دواتر دەبینن حەمەد شتێکی تیشك داری بە قەدەر دوگمەیەکی بە دەستەوەیەو دێتەوە. تیشکی ئەو شتە ئەوەندە توند بوو ئەگەر کەسێك چاوی لێ‌کردبایە کوێر دەبوو. پاشان حەمەد دەڵێ:"ئەمن بریسکەم گرتوە. ئەوەی لە دەستم دایە، بریسکەیە." پاشانیش بریسکەکە دەخاتە نێو نوشتەی چاوەزارەکەی و ئەمجار داوا لە نایب رەجەب دەکا کە بە تفەنگ لێی بدا. نایب رەجەب دڵی نایە تەقەی لێ‌بکا. حەمەد دەڵێ یالڵلا پێمەوە نێ و پاشان سوێندی لێ‌دەخوا کە ئەگەر ئەتۆ بە تفەنگ لێم نەدەی، ئەمن لێت

دەدەم. نایب دەبینێ حەمەد هەر بەڕاست دەیەوێ ئەو کارە بکا، چونکە حەمەد سێرەی لێگرتوەو پەیتا پەیتا دەڵێ یاڵڵا نایب پێمەوە نێ. نایب لەسەر دووڕێیانێك گیر دەکا. چارەی نامێنێ. بەڵام بۆ ئەوەی گوللەکە ئەو شێت و شووره نەکوژێ سێرە لە لاقی دەگرێ و چاوی لێك دەنێ و دەستی لێدەکێشێ... وەختێك چاو هەڵدێنێ، دەزانی چ دەبینێ؟ دەبینێ حەمەد قاقا پێدەکەنێ. نایب پێی وادەبێ نەیئەنگاوتوە، دووبارە تەقەی لێدەکا. پاش ئەویش گوللەیەکی دیکەی لێدەدا. کەچی دەبینێ گوللەکان وەختێك لە لەشی حەمەد دەدرێن تەپ بەردەبنەوە سەر زەوی. دەبینێ وەختێك گوللەکانی وێ دەکەون، لە لەشی ناچنە خوارو تەنیا بە قەد ئەوەندەی کێچێك پێی دا بنووسێ شوێنێکی چووکەڵە لە قالبی دەکەن. پاشان حەمەد بە نایب دەڵێ ئەمن بریسکەم گرتوە، هەرکەس بریسکەی پێ بێ گوللە نایبڕێ. ئەمجار بریسکەکە دەدا بە نایب و بۆخۆی دەیداتە بەر گوللە... ڕاست هەروەك حەمەد، گوللەکان وەلەشی نایب دەکەون و بەردەبنەوە سەر زەوی..."

هەمزە گوتی:

"ڕاستە، وەك دووخێ وایە. ئەگینا چۆن دەیتوانی لە گەمارۆی ئەو هەموو جەندرمەیە دەرباز بێ؟ ڕاستە وەك دووخێ. سەرەنجام دەم کوژێ. بەڕاست عەلی، تەگبیرێکت پێ شك نایە کە لە دەستی وی ڕزگارمان بێ. ئەگەر لە جێیەك خۆ بشارینەوە. ئەگەر هەڵێین و بچینە وڵاتێکی دیکەو شرت و گوم بین، ئەگەر بچینە نێو قەوەزێکی ئاسن..."

"دیسان هەر دەمان کوژێ."

"ئەگەر لەبەری بپاڕێینەوەو خۆ باوێینە سەر دەست و لاقی..."

"دیسان هەر دەمان کوژێ."

"هیچ ڕێگایەکی نەجات بوونمان نیە؟"

عەلی گوتی:

"بۆچی، ڕێگایەك هەیە، بەڵام زۆر حەستەمە. ڕۆژنەیەکی هیوا بەقەد کونە دەرزییەك ماوە..."

هەمزە کە تۆزێك گیانی هاتبووە بەرێ، گوتی:

"ئەو چیە؟"

"دایەحۆری. ئەگەر دایەحۆری بچێ و لە لای حەمەد تکا بکاو بڵێ هەمزەی ببەخشە، لەوانەیە لە گوناحت خۆش بێ. دایەحۆری ڕەنگە تکا بۆ تۆ بکا... بەڵام بۆ من ئەگەر لەت و کوتی کەن دەمی هەڵناپچڕێ."

"یاڵڵا هەستە بچینە لای دایەحۆری. با جارێ تکا بۆ من بکا... ئەوی دیکەی ئاسانە. دێیەك دەدەم بە حەمەد کە لە گوناهی تۆش خۆش بێ. یاڵڵا، یاڵڵا هەستە وەڕێ کەوە."

هەستان و بەرەو ماڵێ دایەحۆری وەڕێ کەوتن. زۆر بەسپایی لە دەرگای ماڵێ دایەحۆرییان دا. دایەحۆری بانگی کرد:

"سەبرکە کوڕم، کوڕە ئازایەکەم ئەوە هاتم. ڕاوەستە چرایەکە هەڵکەم، ئەوە دێم. بیستم، خەبەرم زانی کە فکری ئەو بێدینانەت ئاڵۆز کردوە. سێ ڕۆژی تەواو بریندارەکانی ئەو کافرانە لەبەر ئەم دەرگایە ناڵاندیان. حۆرێت بە قوربان بێ حەمەد دەقیقەیەك سەبر کە ئەوە دێم. کەوایە گوللە کاری لێنەکردی؟ بۆچی ئەمەت پێ نەگوتبووم کە لانیکەم دایەحۆریت بە ئاسوودەیی خەوی لێبکەوێ. ئەو ماوەیە کە ئەتۆ لە چیاو بەندەنان بووی، خەوو خواردنم لێهەڵگیرابوو. ئاخر پیاو ئەم جۆرە شتانە بە دایکێ خۆی ناڵێ؟"

هەر کە دەرگای کردەوە، گوتی:"چ...ی؟"و دەسبەجێ دەرگایەکەی پێوەدایەوەو چرایەکەی لە دەست کەوتە خوار. پاشان داهاتەوەو لە کاتێك دا چرایەکەی هەڵدەکردەوە، نەڕاندی:"ئێوە کێن؟"

عەلیەشەل بە سرتە بە هەمزەی گوت:"ئەتۆ جواب بدەوە.. باسی منیش هەر مەکە. دە جواب بدەوە دەی."

هەمزە گوتی:

"ئەمنم. هەمزە، هەمزاغا."

دایەحۆری گوتی:

"تووتکەسەگ، ئەتۆ لە کەنگێوە بوویە ئاغا. بنیادەم بوون خاتری تۆ. ئەتۆ لە پێش دا ساغی بکەوە بە قەد سەگێك قیمەتت هەیە، دوایە داوای ئاغایەتی بکە. بڵێ بزانم بەم نیوەشەوە چیت لە گیانی خەڵك دەوێ؟"

"دایە، دووسێ کەلیمە قسەم پێتە."

"ئەمن لەگەڵ تۆ هیچ قسەیەکم نیە. ئەمن لەگەڵ ئەو کەسەی مێردی کوشتووم، لەگەڵ زاڵمێك کە دەستی تا ئانیشکێ بە خوێن سوورە، قسەیەکم نیە... لاچۆ لەبەر دەرکی ماڵێم."

"دایە، کارێکی زۆر پێویستم هەیە. دەمەوێ مەسەلەیەکی زۆر گرنگت پێ بڵێم."

"لاچۆ لەبەر دەرگاکەم. نامەوێ قەڵافەتی شووم وگڵاوت ببینم. ئەتۆ بوویە هۆی لەبرسان مردنی منداڵان. نامەوێ قەڵافەتی کافرێکی وا ببینم."

"دایە، بە قوربانت بم."

"لاچۆ لەبەر دەرگاکەم تووتکەسەگ! ئەتۆ دێهاتی‌یەکانت موجتاجی پارووە نانێك کرد."

"دایە لەبەر بەری پێ‌یانت مرم، دەرگاکە بکەوە."

"لاچۆ لەبەر چاوم هەمزە کەچەڵ برۆ. دەرگا ناکەمەوە. ئەتۆ بوویە هۆی ئەوە کە دە هەزار، سێزدەهەزار، شازدەهەزار، هەزار هەزار خەڵکی تووڕووس پێمان پێ‌بکەنن. دنیا پێمان پێ‌دەکەنێ."

"دایە، گوێت لێ‌بێ بزانە دەڵێم چی. خەبەرێکی زۆر گرنگم بۆ هێناوی... لەو خەبەرانە کە ئەگەر گوێت لێ بن خۆشحاڵ دەبی، دایکە جوانەکەم، لە خۆشی‌یان شێت دەبی، لە خۆشی‌یان باڵ دەگری."

"لەبەر دەرکی ماڵەکەم وەلاکەوە هەمزەکەچەڵ برۆ. لاقە خوێناوی‌یەکانت، ئەو لەشە گلاوەت لەم دەرگایە نایەتە ژوور. برۆ لە رێی خۆت، برۆ کەچەڵ. خەبەرەکەشت پێشکەشی خۆت. خەبەری تۆ ئەگەر زیندووشم بکاتەوە، ئەگەر دنیاشم بداتێ، دیسان بۆخۆت، ئەگەر بشم کوژی دیسان چاو لە قەلافەتی پیست ناکەم..."

هەمزە کەوتە پاڕانەوەو لالانەوە، بەلام دایەحۆری هەر یەك قسەی دەزانی:"ون بە لە پێش چاوم." عەلی‌یەشەل و هەمزە هەر لەوێ لەبن دیواری ماڵێ دایەحۆری رۆژیان کردەوە. دایەحۆرییش خەو لە چاوانی نەکەوت و هەتا تولعی بەیانی تەنیشتاو تەنیشتی کردو لەبەر خۆیەوە قسەی کرد. وەختێك یەکەم رووناکایی رۆژ لە ئاوەدانیی دا، دەرکەی کردەوە. وەختێك عەلی‌یەشەلی لەگەڵ هەمزە دی و ناسی، هاواری کرد:

"وادیارە لە ترسی رووحی خۆتان هاتوون. خەریکن لە ترسی حەمەد زراوتان دەچێ؟ ئەرێ؟ هەمزە هەستایە سەرپێ و دەستی دایەحۆریی گرت:"دایە، ئەمن بێ‌گوناهم. بەحەمەدی بلێ من نەکوژێ. سێ دەست، دە دەست، زیاترت جلکان بۆ دەکڕم. گوارەی زێرپیشت بۆ دەکڕم. دە لیرەش بۆ کۆڵوانەکەت."

دایەحۆری بە بێزاری و بە تەکانێك دەستی لە دەستی هەمزە راپسکاوت و گوتی:

"برۆ لاچۆ کەچەڵ. لاچۆ! ئەمنیش دەبمەوە بووك، وەنا؟ ئەو شتانەی ئەتۆ بۆم دەکڕی، وەخۆیان دەخەم، دەبمەوە بووك و دەچمە سەر کلکۆی عەلی دوورمووش هەڵدەپەڕم! وانیە؟"

پاشان رووی کردە عەلی‌یەشەل و بە پێکەنینەوە گوتی:

"لە ترسی رووحی خۆت هاتووی وەنا؟ لە ترسی رووحی خۆتان هاتوون؟ حەمەد هیچی من نیە. ئەمن هەر چاوم بە حەمەد ناکەوێ. ئەگەر ئەگەر بیشی بینم قسە بە قسەی من ناکا.

شەلە دەزانێ ئەگەر حەمەد بە قسەی منی کردبایە، ئێستا ئەو لێرە نەبوو، حەوت کفنی ڕزاندبوون. بڕۆن وەدوای کاری خۆتان کەون بڕۆن کوڕینە. لەمن نانێکتان پێنابڕێ. ئەمن کارێکم بۆ ئێوە لە دەست نایە. ئەگەر لە دەستیشم هاتبا..."

پاشان دەرکەی ماڵەکەی داخست و چوو بۆنێو ئاوەدانی. عەلی و هەمزە هەر لەوێ لەبن دیوارەکە بەجێ مان.

دایەحۆری کە پاش ئەم ڕووداوە کەوتبووە نێو تۆفانی ڕق وقینەوە، وەنێو دێی کەوت. بە قینەوە چاوی لە هەموو خەڵکی ئاوایی دەکرد. خەڵکی دێش بە دیتنی وی سەریان داخست و نەیان وێرا چاو لە چاوی بکەن.

تەواوی خەڵکی پێنج دێی خاردەشت خەبەریان زانی کە هەمزەو عەلیەشەل شەوێ چوونە دەرکی ماڵێ دایەحۆری و تا بەیانی لەبەری پاڕاونەوە. ئەم خەبەرە بە سرتەو بە ترس و پارێزەوە لەنێو دێهاتیەکانی سەرانسەری چیای تووڕووس دا بڵاو بووەوە کە:"دایەحۆری دەرگایان لێناکاتەوە. پێیان دەڵێ ئەگەر حەمەدۆك ئەم دوانەتان نەکوژێ، بۆخۆم دەتان کوژم. بەم دەستانەم دەتان خنکێنم. هەی یەزیدینە! ئەمن چاوەڕێی ڕۆژێکی وا بووم... ئەمن چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە جوانە بووم... تێگەیشتن؟... پڵنگ، "قزلجەکایا" (گابەردی سوور)، هەژدیهای ئاکچاساز، مارەکانی "ئیلان قەلعە"، مردووی چرچ هەڵاتووی گۆڕستان دەتوانن لە دەرگای من بێنە ژوور، بەڵام ئێوە ئەم دووانەتان ناتوانن. ئەگەر حەمەدم هەر ئەم ڕۆژانە نەتان کوژێ، گەردنی ئازا ناکەم، ناکەم، ناکەم. تێگەیشتن؟"

دێهاتیەکان قسەکانی دایەحۆرییان هێندی بوون، چل هێندە گەورە دەکردەوەو لەنێو ئاوەدانی دا بڵاویان دەکردنەوە. بەڵام چاك یان خەراپ بیروباوەڕی خۆیانیان دەربارەی قسەکانی دەرنەدەبڕی. لە ڕاوێژی قسەکانیان و لە جووڵانی گنجی نێوچاوانیان شتێك دەرنەدەکەوت. ڕاستیەکەی ئەوەبوو تێمابوون کە بەرامبەر بەرووداوەکان چ دژکردەوەیەك لە خۆیان نیشان بدەن.

## (٤٠)

تەرمی برایمەرەشیشیان هاویشتە سەر پشتی ئەسپێکی رووت و هێنایانەوە شارو لە گۆڕستان ناشتیان.

شار کەوتبووە بناری تەپۆلکەکەو زارکی دۆڵەکەو ئەو نوختەیە کە دەشت دەبڕایەوە. لە ڕۆژئاوای شار تەپۆلکەیەکی رووتەن هەبوو کە رووباری زولاڵی ساوورانی بە بن دا دەڕۆیشت.

پردی ئەو چۆمە کە بە بەردی سپی لەسەر ئاو و سەوزایی دروست کرابوو، زۆر وەك پردێکی جوانی یاریی منداڵان دەچوو. لەو گەڕەکە کە ئەرمەنیەکان چۆڵیان کردبوو و رۆیشتبوون و خەریك بوو وێران دەبوو، ئەو کوردانە کە لە ئەنەدۆڵی رۆژهەڵاتەوە کۆچیان پێکرابوو، نیشتەجێ ببوون. ئەم کوردانە خۆیان لە هیچ کارەسات و رووداوێکی ناوچە هەڵنەدەقوتاند. لە کلاورۆژنەی قوڕینی ئەرمەنیەکان کە ئێستا کوردیان تێدا دانیشتبوون، هەمیشە بە زمانی کوردی دەنگی گرمەو هەراو هۆریا دەهات. هەموو ئێواران بێ نێوبوێر کوردەکان بە داروبەرد بەردەبوونە گیانی یەکتر. سەرو دەستی یەکتریان دەشکاندو دەنگی هات و هاواریان شاری پڕ دەکرد. شارەکەش بەم شەڕو کێشەیە راهاتبوو.

لەو گەڕەکە کۆنەی ئەرمەنیەکان دا داری قەدئەستووری زەیتوون و هەنجیر لە تۆزوخۆڵ دا ون ببوون و لەبەر بێئاوی و گەرما دەسووتان و وشك دەبوون. لەنێو کاولەکانی گەڕەکی نیوەوێرانی ئەرمەنیەکان دا هێندێك باغی هەنار هەبوون. ئەم باغانە پڕ بوون لە رەشماری درێژ کە وەختی جووت بوون وەك میلە ئاسنی تواوەوە سوور دەبوونەوە.

لە وەرزی پشکووتنی دارهەنارەکان دا، ئەم گەڕەکە گەورەیە بە گڵووکە هەنار دەڕازایەوەو جموجۆڵی مێشەنگوینەو پەپوولەو رەشمارەکان هەتا گڵووك وەرین درێژەی هەبوو.

هەموو ئێواران، هەورێکی تەپ و تۆز بە رەنگی خۆڵەمێشی کە بەرە بەرە مەیلەوڕەش دەبوو، دەهاتە سەر شارەکەو هەناسەکێشانی وەزەحمەت دەخست و ماڵەکان و ژووری دوکانەکان و جل و بەرگی خەڵکەکەو شەقامە بەردرێژ کراوەکان بە توێژێك تەپ و تۆز دادەپۆشران. لەو حاڵەدا ئەگەر لە دوورەوە تەماشای شارت کردبایە، سواڵەتە سوورەکان، باغە هەنارە پشکووتووەکان، دارە قەد ئەستوورە زەیتوون و هەنجیرو چنارەکان، پەنجەرەی ماڵەکان و پردو پنگەڵانەکان بێ پەڵە لە تەپ و تۆز دا سپی دەچوون، و دانیشتووانی شار بە دەم و لووتی پڕ لە تۆزو خۆڵەوە بەردەوام و بێپسانەوە قسەیان دەکردو باس و کێشەیان بوو.

مووچەخۆرانی دەوڵەت، ئاغاکان و خانەکان لە گازینۆی "لەتیف ئۆغلی" ئارەقیان دەخواردەوەو خەریکی زۆربلێیی خۆیان بوون. چینێکی کەم داهات تریش وەك دوکانداران و پیشەسازان لە چاخانەکەی "تۆفیق"دا کۆدەبوونەوەو چایان دەخواردەوەو قسەیان دەکردن. جووتیارانیش بێ کارو بێ مەبەست لە بازاڕدا دەسووڕانەوە...

هەموویان لە نهێنییەکانی یەکتر ئاگادار بوون. لەم شارۆچکەیەدا هیچ شتێکی شاراوە نەبوو. تا ئێستا لەوانەبوو هەزاران جار شەڕی عارف صائم بەگ و ئیدریس بەگ، قینی عارف صائم بەگ لەوو حاڵ و رۆژگاری پەرێشانی ئەویان بۆ یەکتر گێڕابێتەوە. خەڵکی شار بەربەرەکانیی نێوان ئەم دووانەیان وەك داستانێك زیندوو راگرتبوو. خەڵکەکە کێشەی نێوان عەلیسەفابەگ و جووتیارەکانی وایوایان مووبەموو دەزانی و بە بێسەبری چاوەڕوانی سەرەنجامی هەردوو بەربەرەکانێیەکە بوون. دەیان گوت عارف صائم بەگ ژن برایەکەی خۆشی لەگەڵ ئەو چەرکەسانە کە حازر نەببوون زەوییەکانی خۆیانی بدەنێ، وەنێو زییەلێن خستوەو لەبن قەمچییان دا کوشتوویەتی. بەڵام کەس هۆی سەرەکیی ئەم کارەی نەدەزانی. هێندێك دەیان گوت ئەو زگی بە چەرکەسەکان دەسووتاو چونکە ویستی پێشی زوڵم و زۆری عارف صائم بەگ بگرێ، ئەویش هەق و حیسابی خۆی لە مستێ ناو گوتی:"فەرموو کاکی دڵنەرم و بەروحم، ئەمەش بەشی تۆ." هێندێکی دیکەش دەیان گوت مەسەلەی ژنێك لە گۆڕێ دا بووە. بە کورتی لەم بارەیەوە بیرورای جۆراوجۆر هەبوون. بەڵام لەو نێوەدا شتێکی روون و حاشاهەڵنەگر هەبوو، ئەویش ئەوە کە ئەو لاوە لەنێو زییەلێن و لەنێو چڵە دڕکەکان و لەبن قەمچیی عارف صائم بەگ دا گیانی دەرچووە.

عەلی سەفا بیری لەوە دەکردەوە کە لەمەودوا لەگەڵ دێهاتییەکان چۆن رەفتار بکاو کام ئامرازی زەبروزەنگ و هەڕەشە بەکار بێنێ. بیری دەکردەوە لەگەڵ فلانەکەس چۆن رەفتار بکاو

لەگەڵ فیسارە کەس چۆن؟ و زۆر بە شەوقەوە ئەو مەسەلەیەی لێك دەدایەوە کە لەمەودوا دەبێ چ بکاو داخوا جووتیارەکان چ دژکردەوەیەکیان دەبێ.

کاری ئەم دواییەی جووتیارەکان هەموو کەسی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. تەنانەت هەتا دووسێ رۆژان لە شاریش کەس نەیدەتوانی رووداوەکە لێك بداتەوە، بیروڕای خۆی دەربڕێ و ناکامێکی لێوەرگرێ. سووتاندنی خەرمانەکانی عەلی سەفابەگ و دزینی ئەسپەکانی کارێکی تازە بوو کە هەرگیز وێنەی نەبینرابوو. دێهاتییەکان نە توانای ئەم کارەیان هەبوو ، و نە داب و شوێنی واشیان لەنێو دا باو بوو. ئەم رووداوە بۆ خەڵکی شاریش ببووە مەسەلەیەك! گەڕانەوەی حەمەدۆك بۆ چیاکانیش مەسەلەیەکی سەیر بوو. تا ئێستا لە نێو ئەو هەموو چەتەیەدا رێ نەکەوتبوو چەتەیەك پاش ئەوەی کاری خۆی کردو گەیشتە مەبەستی خۆی و سەری خۆی هەڵگرت و رۆیشت و ون بوو، دووبارە سەروسەکوتی لە چیاکان دەرکەوێتەوە. دیارە یەك دووێك لەو چەتانە پاش چەند ساڵ دووبارە هاتبوونەوە، بەڵام ئیدی کەس بایەخی پێ نەدابوون و پاش چوار پێنج رۆژ، یان ئەوپەڕەکەی پازدەرۆژ کوژرابوون. کەچی ئەم حەمەدۆکە وەك هەڵۆی رق ئەستوور دادێتە سەر چیاکان، چەتەیەکی کارکوشتەی وەك برایمەڕەش دەکوژێ، ژمارەیەك جەندرمە بریندارو شرووڕ دەکاو پاشانیش گیانی سلامەت لە شەڕەکە دەباتە دەرو ون دەبێتەوە.

جگە لە عەلی سەفابەگ هەموو کەس پێی وابوو بووژانەوەی جووتیارەکانی وایوای و راوەستانیان بەرامبەر بە عەلی سەفا لە کن حەمەدۆك ناو دەخواتەوە. لەبارەی حەمەدۆکەوە داستانی جۆراوجۆریان دەگێڕانەوە. بەڵام نە لە چوکووراواو نە لە کێوپارە جگە لە وەکیل باشی عاصم، کەس حەمەدی بە چاوی خۆی نەدیبوو. بەباوەڕی وان وەکیل باشی عاصم خۆی یەکێك لە نیزیکترین دۆستانی حەمەدۆك بوو و نەیدەتوانی نازارێکی پێبگەیەنێ. کێ دەزانێ، لەوانەشە ئەوەی لە چیاکان بینراوە، حەمەدۆك نەبێ و کەسێکی دیکە لە ژێر ناوی حەمەدۆك دا ئەو کارانە بکا. بەڵام حەمەدۆك نەبێ، کێ دەتوانێ دەستەیەك جەندرمە لە تووڕووسەوە تا چوکووراوا راو بنێ؟ جەندرمەکان بە ورەیەکی رووخاوەوە لە کاتێك دا چەك و پێڵاویان لە کێوەکان فڕێ دابوو، رایان کردو هاتنەوە شار. لەنێو شار لە ترسی گیانی خۆیان هاواریان دەکرد:"خوایەگیان بێچارە بووین، بە دەست ئەو حەمەدۆکەوە بێچارە بووین." دەیان گوت:"خۆ حەمەدۆك بە پێنج کەس و دە کەسەوە نایەتە پێش جەندرمە. سەدان کەسی بە دەورەوە بوون. دەت گوت لە زەوی هەڵدەقوڵن و لە ئاسمان دەبارن. جگە لەمانە بریسکەشی پێیە...

عەلی سەفابەگ لەنێو شاری، لە چاخانەی تۆفیقەوە بۆ گازینۆی "ناخودانۆغلی"، لەوێوە بۆ مەخفەری پۆلیس، لە مەخفەری پۆلیسەوە بۆ لای مودیر ناحیە، لەوێوە بۆ لای ئەحمەدئاغای سیاسەتبازو لەوێوە بۆ پۆستەخانە غاری دەداو سات بە ساتیش ئەو ترس و سامەی لە دڵیدا بوو، زیادی دەکرد. بەڵام هێشتا سەری لە هۆی یاخی بوونی جووتیارەکان دەرنەکردبوو. نەیدەتوانی لەسەر هیچ هۆیەکی تایبەتی ساغ بێتەوەو هیچ دەلیل و لێکدانەوەیەکیش قەناعەتی پێنەدەدا:"داخوا ئەم کارانە هەموو لەبن سەری حەمەدۆك دا بوون؟ نا! زۆر وێ نەدەچوو. نا! ئەم جۆرە کردەوەیە هەر لە دەست عارف صائم بەگ دەهات. ئەگەر عارف صائم بەگ پشتی جووتیارەکانی نەگرتایە، ئەوان نەیان دەوێرا ئاوا دەم بێننە پێش."

دەیگوت:

"خەڵکی لادێ هەتا دەسەڵاتێکیان لە پشت نەبێ، دەست بەکار نابن. ئەوان تەنانەت متمانە بە خۆشیان ناکەن. ئەوان نایەن بە پشتیوانیی رووتەڵەیەکی وەك حەمەدۆك خەرمانەکانی من بسووتێنن، ئەسپەکانم بدزن، نۆکەرەکانم بکوژن. هاورێیان! دەبێ زۆر وریا بن، وادیارە حکوومەت سیاسەتێکی تازەی رەچاو کردوە. یەکەمین تاقیکردنەوەش لەسەر من دەکا. دۆستان وریای خۆتان بن، ئەم بەزمە عارف صائم بەگ بەسەرمان دێنێ. تازە تێدەگەم ئەو بۆچی دەیەوێ لە چوکووراوا ببێتە خاوەنی مەزراو زەوی... ئەوان پێویستییەکیان بە مەزراو مڵك و ماڵ نیە... چما هەموو تورکیە هی ئەوان نیە؟ ئێستا روون دەبێتەوە کە بۆچی کاربەدەستانی کۆماری تورکیە دەستیان بەسەر زەوییەکان داگرتوە... تازە ئەوە ئەسڵی مەسەکە روون دەبێتەوە... ئێستا ئەوە هۆی زەوت کردنی باغە زەیتوونەکانی "موودانیا" و دروست کردنی کێڵگە لە "ئەگە" دەردەکەوێ... ئێستا، ئێستا خەریکە مەسەلەکە روون دەبێتەوە. شۆرش تەواو نەبووە. کاربەدەستانی کۆمار بە بیانووی جۆراوجۆر لە ئەنەدۆڵ دا بڵاو بوونەوەو خەریکی لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەن. پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەکەیان تەواو بوو، زەبری سەرەکی دەوەشێنن. جووتیاران نرخ و بایەخ پەیدا دەکەن. شۆرش بەربڵاو دەبێ و پەرە دەستێنێ. تەواوی ئەم کارانە لەبن سەری عارف صائم بەگ دان، حەمەدۆکیش تەنیا داردەستێکە."

ئەوانەی پارێزگارییان لە عەلی سەفابەگ دەکرد، بێدەنگ دەبوون و لەو بارەیەوە باس و کێشەیان لەگەڵ نەدەکرد. دووریش نەبوو قسەی عەلی سەفابەگ بێ. چونکە ئەوەندەیان لێروون بوو کە حکوومەت خەریکە هێندێك شتی نوێ دابێنێ و بتەوێ و نەتەوێ لە ئەنکەرەوە بۆنی گۆڕانێکی تازە دەهات.

لە ماوەی چەند رۆژدا عەلی سەفابەگ لە پێش دا خۆی و پاشان ئاغاو خانەکانی شارۆچکەی قانیع کرد کە تەواوی ئەو کارانە لەبن سەری عارف صائم بەگ دان. بەڵام عارف صائم بەگ بۆ وای دەکرد؟ داخوا لە سەرەوە دەستووری پێ درابوو، یان سەربەخۆ ئەو کارانەی دەکرد؟ ئەمە مەسەلەیەك بوو کە خان و ئاغاکان سەریان لێ‌دەرنەدەکرد. بە سرتە پێکەوە قسەیان دەکرد، هەتا تولعی بەیانی لەبەر شۆقی چرافانۆس دادەنیشتن و باس و وتووێژیان دەکرد، بەڵام نەدەگەیشتنە ئاکامێك.

راست لەو بێنەو بەرەیەدا بوو کە عارف صائم بەگ هاتە شار. هەموویان بە ترسەوە دۆش دامان. خان و ئاغاکان دەست لەسەر سینگ چوونە خزمەتی. عارف صائم بەگ دەسبەجێ هەستی بەو ترس و سامە کرد کە باڵی بەسەر شار دا کێشابوو. بە پێکەنینەوە بە حازرانی گوت:

"مەسەلەی حەمەدۆکە؟ لە ئێوە دوور بوو ئەوەندە لە بستە منداڵێکی بێ دەسەڵات بترسێن. کۆمارەکەمان زۆر بەهێزە. بە لەشکرێك، حەمەدۆك هیچ، هەزاری وەك حەمەدۆك شەق وشڕ دەکا. گوێ مەدەنێ گیانم."

لەنێو هەمووان دا "کاراداغلی ئۆغلی مورتەزا" وەقسە هات و گوتی:

"مێشوولە خۆی شتێك نیە، بەڵام وەزعی بنیادەمیش تێك دەدا. حەمەدۆك بۆخۆی مەسەلەیەك نیە. بەڵام ناوەکەی جۆ وەبیر وڵاغ دێنێتەوە. دێهاتی‌یەکان گوێیان لە کڵاوی پەڕاندوە. ئەو دێهاتی‌یەکان هان دەداو لەگیانی ئێمەیان بەردەدا. دێهاتی‌یەکان هان دەدا لە دژی ئاغاکان، خانەکان و ئەو حکوومە کە پارێزەری ئێمەیە، راپەڕن. ئەو دێهاتی‌یەکان فێر دەکا کە بێن ئەسپ و ماینی ئاغاکان بدزن، خەرمانەکانیان بسووتێنن و پیاوەکانیان بکوژن. ئەگەر ئەتۆ بەڕاستی نیازت هەیە کێلگەیەك دروست کەی، دەبێ لەبیرت بێ ئەگەر ئەمڕۆ نۆرەی ئێمەیە، سبەینێ نۆرەی..."

پاشان دەستی کرد بە پتەپت.

عارف صائم بەگ بە تووڕەیی‌یەوە گوتی:

"چی؟ بەڕاست... بەڕاستی... ئەتۆ دەتەوێ بڵێی چی؟"

"یانی... یانی... یانی پێم وابوو مەبەستی ئێوە لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەیە... نەخشەو بەرنامەیەکی دیکەتان هەیە..."

"چی؟ ئێوە شێت بوون. ئەمن دارو نەداری خۆم لەسەر ئەو زەوی‌یانە داناوە. ئێوە پێتان وایە ئەمن لاسای خاوەن ملکان دەکەمەوە؟"

"یانی... ببووره بەگ... ئەم توانی مەبەستەکەمت باش عەرز بکەم..."

حازرانیش گوتیان:

"ئەم مورتەزایە قەت ناتوانێ مەبەستی خۆی بە لەباری عەرز بکا، نیازێکی نیە."

عەلی سەفابەگ گوتی:

"استغفرالله! کێلگەی ئێوە دەبێتە نوێترین کێلگەی دنیا. چوکووراوا چەندین سەدە شانازیتان پێوە دەکا کە ئەم خزمەتە مەزنەتان پێ کردوە. هەروەك بە قارەمانەتیتان لە شەڕەکانی سەربەخۆییدا دەنازێ. چوکووراوا شانازی بە خۆیەوە دەکا کە رۆڵەی وا بەڕێزی لە باوەشی خۆی دا پێگەیاندوە."

عارف صائم بەگ پاش ئەوەی بە میهرەبانییەوە سەیرێکی مورتەزاغای کرد کە لە گۆشەیەك کوشم هەڵاتبوو، گوتی:

"سوپاست دەکەم عەلی سەفابەگ، لەلوتف و مەحەببەتی بێخەوشتان سوپاس دەکەم. باشە کەوایە جەنابی مورتەزاغایە؟"

مورتەزاغا لە جێی خۆی دەربەڕی، هات هەردوو شانی بەگی ماچ کردن و گوتی:

"لە خزمەت تان داوای لێبووردن دەکەم. لە خزمەت جەنابت داوای لێبووردن دەکەم! ئەمنیش هەر دەمەویست ئەمانەت عەرز بکەم... یانی... یانی... یانی...

دووبارە زمانی گیراو وەك چەوەندەر سوور هەڵگەڕا.

حازران دەستیان کرد بە پێکەنین.

عارف صائم بەگ بۆ ئارام کردنەوەی وی، گوتی:

"مورتەزابەگ، پەلە مەفەرموو. ناڕەحەت مەبە. لە مەبەستەکەتان حاڵی بووم."

مورتەزاغا گوتی:

"زۆر خۆشحاڵم کە لە مەبەستم حاڵی بوون. ئەگەر ئێوە حاڵی نەبوونایە خەراپ دەبوو. دەفەوتام. وەجاخم کوێر دەبووەوە. ئەگەر ئەتۆ لەبارەی منەوە فکری خەراپ بکەیەوە، ئەمن دەفەوتێم، ماڵ وێران دەبم. خوا سلامەتت کا. بژی بەگ. دەستەکانت ماچ دەکەم."

پاشان بە دڵ ئاسوودەیی چوو لە جێی خۆی دانیشتەوە. لە دڵی خۆی دا بەڵێنی داو سوێندی خوارد کە لەمەودوا لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت بە توورەیی قسە نەکا. لە دڵی خۆیدا گوتی:"ئەم جۆرە کەسانە هەموو شتێك بەرئاوەژوو حاڵی دەبن. بە دڵیەوە دەگرن. ئەی کە ئەو عەلی سەفابەگە گەوروادە چۆنی قسەی خۆی گۆڕی!"

عارف صائم بەگ هەموویانی لەنێو سەراسیمەیی و سەرسوڕمان دا بەجێ هێشت و ڕۆیشت. بە ڕۆیشتنی وی ترس و دڵەکوتەی دەرەبەگەکان چەند بەرابەر بوو. عارف صائم بەگ بۆ هاتبوو؟ مسۆگەر دەلیلێکی هەبوو! مسۆرگەر! هەموو خەڵکی شار زگیان بە هەمزە دەسووتا کە لە چیاڕا هاتبوو و ماوەیەك لە شار سەرگەردان مابوو. هەمزە لە نێو شار بۆ کونێك دەگەڕا خۆی تێدا حەشار بدا، ئەم لاو ئەولا دەگەڕا بەڵکوو جێیەك وەبینێ پەنای بۆ بەرێ. لەلای سیاسەتبازی پارێزەرەوە دەچووە لای فەتحی کووزان ئۆغلی، لەلای وی ڕا دەچووە لای فەخرییە شێت و هەموو ڕۆژێ بروسکە لە دوای بروسکە بۆ ئەنکەرەی دەناردو لە بازاڕی شارۆچکەدا بە مستان پارەی خەرج دەکرد. عەلییەشەلیش بەدوایەوە بوو. لە دەرکی پۆستەخانەی نەدەبزووت. هەمزە دەگەیشتە هەرکەس دەیگوت:"ئەو، ئەو کافرە ئاخرەکەی دەم کوژێ. ئەو هەر لەبەر من هاتوەتە دەرو هاتوەتەوە چیاکان. چ بکەم؟ براینە چم لێدەکەن؟ ئێوە ڕێیەکم نیشان بدەن. ئەمن چ بکەم؟" لەسەر ڕێیان لەگەڵ خەڵك دەردی دڵی هەڵدەڕشت و دەیگوت:

"چما ئەمن چ خەراپەیەکم بۆ دێهاتییەکان بووە. چما ئەمن چیم کردوە؟ بێ سەرپەرست مابوونەوە، هاتم سەرپەرستیم کردن. تەنانەت جارێکیش پێم نەگوتوون پشتی چاوتان برۆیە. لە گوڵ کاڵترم پێ نەگوتوون. ئەو بەخیل و حەسوودەش وەختێك لە مەسەلە حاڵی دەبێ و دەبیسێ کە جووتیارەکان منیان وەك بابی خۆیان، وەك گیانیان، وەك ئەولادیان خۆش دەوێ، لەو کونەی خۆی تێدا حەشار دابوو، دێتەدەر. ئەو، دوژمنی ئاغایانیشە. تەنانەت لەگەڵ حکوومەتیش دوژمنایەتییەتی! دەڵێن گوتوویەتی بۆخۆم دەزانم چ لە حکوومەت دەکەم! ئەو، بە هیچ جۆر دێهاتییەکانی خۆش ناوێ. پێی خۆش نیە دێهاتییەکان خۆشی لە خۆیان ببینن. هەربۆیەشە دەیەوێ من بکوژێ. بۆچی؟ چونکە ئەمن بوومە هۆی ئەوەی دێهاتییەکان ڕۆژێکی خۆش ببینن! لەوەتا من بوومە ئاغای ئەو دێیە، ڕەعیەتەکان دەستێکیان لە هەنگوین و دەستێکیان لە ڕۆنەکەرەدایە. نانیان دەڕۆنی کەوتوە. هەر لەبەر ئەوە، هەر لەبەر دوژمنایەتیی دێهاتییەکانە کە دەیەوێ من بکوژێ."

لەدواوەشی عەلییەشەل پشتی قسەکانی دەگرت و دەیگوت:

"دەکوژێ. ئا...خ ئەو کافرە ئاخرەکەی ئاغاکەمان دەکوژێ. منیش دەکوژێ..."

ڕۆژێکیان پارێزگار هاتە شارۆچکە. خان و ئاغاو مووچەخۆرانی دەوڵەتی لەماڵی حاجی خەلیل کۆکردەوەو قسەی بۆ کردن و باسی ئەو برووسکانەی کرد کە بۆ ئەنکەرە لێدرابوون و گوتی کاربەدەستانی ئەنکەرە لەو برووسکانە زۆر قەڵسن" دەیئەڕاندو دەیگوت:

"ئەم شارۆچکەیە وەبەر تۆپ دەدەم. هەمووتان دوور دەخەمەوە بۆ "خیزان"... ئەو حەمەدۆکە کێیە؟ یەکێك لە ئێوە قوتی کردوەتەوە... ئەوم لە ئێوە دەوێ. دەبێ بیگرن. هیچ چەتەیەك هەتا ئاغاکان پشتیوانیی لێنەکەن، ناتوانێ لە چیاو بەندەنان وەمێنێ. باش تێگەیشتن؟"

دیسان مورتەزاغا هەستایە سەرپێ و هاتە نێو باسەکەوە:

"تێگەیشتین، بەڵام ئەم چەتەیە بێ پشتیوانیی ئێمە لە چیاو بەندەنان خۆی راگرتوە. ئێمە پشتیوانی لە حەمەدۆك ناکەین. بەخوا، بە پێغەمبەر ئێمە پشتیوانیی لێناکەین. ئێمەش تا ئێستا وەك تۆمان بیر دەکردەوە. دەمان گوت ئەگەر ئێمە پشتیوانی لە چەتەیەك نەکەین، ناتوانێ لە چیاو بەندەنان خۆی راگرێ. جەنابی پارێزگار، ئێمەش پێمان سەیرە. وەرە بە چاوی خۆت ببینە کە خۆی راگرتوە. ئەویش چۆن! قیمەتی شارۆچکەکەمانی کردوەتە پوولەرەشکەیەك. خۆی راگرتوەو خۆی رادەگرێ. هەمووانیشمان دەکوژێ..."

پاشان دیسان زمانی گیراو کەوتە پەتەپەت و ئارەقی رشت.

پارێزگار پرسی:

"ئێوە ناوتان چیە؟"

"مورتەزاغا."

"ئەتۆ پیاوێکی ئازاو قسەلەڕووی."

مورتەزا گوتی:

"ئازا..."

"ئەتۆ پێم بڵێ چۆن دەکرێ حەمەدۆکی بگرین؟"

"جەنابی پارێزگار. ئەم باوك سەگە چ بگیرێ و چ نەگیرێ ئەوەی نەدەبوو ببێ، بووە. گورگی دڕندە بۆنی خوێنی کردوە. وڵاغ جۆی وەبیر هاتوەتەوە. ئیدی نە ئێمەو نە حکومەت لە دەستی ئەم دێهاتییانە ئاسوودەیی بەخۆمانەوە نابینین. ئەمە هەمووی لەبن سەری حەمەدۆك دایە."

پارێزگار گوتی:

"ئەمن پیاوی وا قسەلەڕووم خۆش دەوێ."

مورتەزا بە لەخۆبایی‌بوونەوە گوتی:

"زۆر کاری چاك دەکەی کە پیاوی قسەلەڕووت خۆش دەوێ. زۆر کارێکی باشە. ئەمن هەمیشە قسەی خۆم بەرەوڕوو دەکەم، پێچ و پەنا لە کاری من دا نیە."

"وەرە ئێرە دانیشە."

مورتەزا چوو لە سەر قەنەفەیەك كە لە تەنیشت پارێزگار بوو، لەسەر چۆكان دانیشت و دەستی لەسەر ئەژنۆی دانان و گوتی:

"جەنابی پارێزگار، ئەزیلەیەكت بۆ دەگێڕمەوەو پاشان وەدوای دەردو مەرگی خۆم دەكەوم."

پارێزگار:

"فەرموو تكایە."

"ئەوەی دەمەوێ بیلێم لەبارەی حەمەدۆكەوەیە كە هەموو دەیزانن و كەسیش ناگرێتەوە. مار هەتا چووكەڵەیە دەبێ سەری پان بكەیەوە. بەڵام حەمەدۆك گەورە بووە. رەنگە ئەم چەتە تازەیە كە لە چیاكان قوت بووەتەوە، حەمەدۆكی بەڕاستی نەبێ. دیارە دەڵێم رەنگە. بەڵام ئەگەر حەمەدۆك خۆی بێ، حەمەدۆكی ناتوانین بكوژین، یانی ناكوژرێ. دەقیقەیەك راوەستە روونی بكەمەوە. پەرژینی بە گوڵ بێ تا ئێستا مارتان دیوە، مارێكی گەورە؟"

پارێزگار گوتی:

"ئەرێ، دیومە."

"دەزانی مار چۆن دەمرێ؟"

"نا، نازانم."

"ئەگەر بە بەرد سەری پان بكەیەوە دەمرێ. ئەوە یەك!..."

پارێزگار گوتی:

"بەڵێ دەمرێ، ئەمە رێگایەكی."

"رێگایەكی دیكەی ئەوەیە كە بیخنكێنی. ئەوە دوو... بە گوللەش دەكرێ بیكوژی ئەوە بوو بە سـ...ێ! دیارە بە چەند جۆری دیكەش دەمرێ... نەخۆش دەبێ دەمرێ، لەك لەك دەیخوا دەمرێ، ئەم جۆرە دەمرێ، ئەو جۆرە دەمرێ. دەزانی چۆنی دیكەش دەمرێ؟"

پارێزگار كە قسەكانی مورتەزای پێ خۆش بوون، پرسی:

"بە چ شێوەیەكی دیكەش دەمرێ؟"

"بەچ شێوەیەكی دیكەش دەمرێ؟ جەنابی پارێزگار پرسیاری سەیر دەكا. ها؟ ئێستا عەرزی پارێزگاری خۆم دەكەم! ئەگەر مار بە قەد نووكە دەرزییەك بریندار ببێ، دەمرێ... حەتمەن دەڵێی بە قەد نووكە دەرزییەك برین شتێك نیە! ئەگەر بینادەمێك یان گیاندارێكی دیكە بە قەد نووكە دەرزییەك بریندار بێ، چی لـێدێ؟ بە خۆڕایی فكری خۆت ماندوو مەكە

جەنابی پارێزگار، هیچی لێ‌نایە. هیچی نابێ و دەسبەجێ چاك دەبێتەوە. لە کاتێك دا ئەگەر مار بەقەد نووکە دەرزی‌یەك برین بکەوێتە لەشی دەمرێ. رەنگە بڵێی چۆن؟ ئەتۆ نەت دیوە، ئەتۆ نازانی، ئەمن دەزانم. مار ئەگەر بە قەد نووکە دەرزی‌یەك برینی تێ ببێ، مێروولەزەردکە هێرش دەکەنە سەر برینەکەی و بە یەك رۆژ مارەکە دەخۆن. ئێستا تێ‌گەیشتی جەنابی پارێزگار؟"

پارێزگار، لە کاتێك دا لە چاوانیەوە رامابوو بیری دەکردەوە.

"حەمەدۆك وەك ئەو برینە چووکەڵەی لەشی مارەکەیە... عەرزی بە خزمەتی ئاغای خۆم بکەم، حەمەدۆك بە کوشتنی عەبدی‌خان و دابەش کردنی زەوی‌یەکانی لەنێو دێهاتی‌یەکان دا ئەو برینەی دروست کرد. ئێستا حەمەدۆك بمرێ، یان بمێنێ، ئێمەو حکوومەت بەو ئاسانی‌یە نەجاتمان نابێ. لە ژانەسەر رزگاریمان نایە. دێهاتی‌یەکان راست وەك ئەو مێروولە زەردانەن، بێ‌ئەقڵ، ناڕاست، نازیرەك. بەڵام... بەڵام برینێکی بە قەد نووکە دەرزی بەسە بۆ ئەوەی کارەکە تەواو بکەن. ئێستاش بەو برینە کە حەمەدۆك لە لەشی کردووین، لە پێش دا یەك یەك و دوایە بە کۆمەڵ هەمووانمان دەخۆن و لەنێومان دەبەن. بەڵێ جەنابی پارێزگار، هەم ئێمە دەخۆن و هەم ئێوە. ئەمن دێهاتیم و خەڵکی دێهات باش دەناسم. بە ئاغای خۆم بڵێم، بۆ خزمەتکاری خۆت هەرچی بە دڵی دێهاتی‌یەکان دا بێ وەك رۆژ رووناکە. ئێوە ئاقڵن، زۆریش ئاقڵن. پیاوی بەرێزو خوێندەوارن. هەموو ئەم ئاغایانە دەزانن کە ئەمن لە ژیانم دا تا ئێستا لە هیچ نەترساوم. بەڵام ئێستا لە ترسی حەمەدۆك خەریکە زراوم بچێ. هەم لە زیندووەکەی دەترسم و هەم لە مردووەکەی..."

"مورتەزابەگ ئەتۆ زۆری پێوە دەنێی."

"جەنابی پارێزگار، ئەتۆ وا بیر بکەوە. بەڵام ئەمن لە ئێستاوە دەستم لە ژیانی خۆم شوتوە. مێروولە زەردەکان خەریکن بە نێو لەشم دا دێن و دەچن."

"زۆری چاوڕاو بۆ دەکەی."

مورتەزاغا لە کاتێك دا باڵی لێك کردبوونەوەو توند رای دەوەشاندن هاواری کرد:

"وەڵڵا، بیللا، وەڵڵاهی بیللاهی ئەو بەڵایانەی بەسەر عەلی سەفابەگ هاتوون لەبن سەری حەمەدۆك دان. کاری مێروولە زەردکەیە... عەلی سەفابەگ چ دەڵێ، با بڵێ، چۆن بیر دەکاتەوە با بکاتەوە. بەڵام کاری مێروولەزەردکەیە..."

عەلی سەفابەگ گوتی:

"مورتەزاغا ئەتۆ خەراپ ترساوی، زۆری چاوڕاو پێوە دەنێی. خەریکی منداڵێکی بێ دەست و پلمان بۆ دەکەیە غوولێك."

مورتەزا گوتی:

"ئەتۆ وای حیساب بکە."

نارەق بە سەرو رووی دا دەهاتە خوارو رەگی ملی هەستابوون:

"ئەتۆ هەروای لێك بدەوە. هەر ئەم رۆژانە دەغڵەکانمان ئاگر دەدەن، هەموو ئاغایەکان هەر لە جێ دەکوژن، ئەم مێرووە زەردانە دارو نەدارمان بە تاڵان دەبەن. جا دەیبینی. ئەتۆ هەروا بیر بکەوە."

هەتا ئێوارێ قسەیان کرد. پێکەنین و سەرەنجام رێك کەوتن. پارێزگار دەیەویست لەمەودوا هیچ برووسکەو شکایەتێك و هیچ نامەیەك لە شارۆچکەکەوە نەنێردرێتە پێتەخت. ئاغاو خانەکان لەو بارەیەوە پارێزگاریان دڵنیا کردو قەولی پیاوانەیان داو سوێندی ناموسیان بۆ خوارد.

پارێزگاریش لە وەڵام دا گوتی:

"ئەو هەتیوە بێ دەست و پلە هێندە گەورە مەکەنەوە. ئەم وڵاتە پیاوی وەك چاکیر چالیی دیوە. ئەم کێوانەی تووڕووس زۆر پیاوی وەك گزیك دۆران، کارانیلان، یووزجوو، گووت دەڵەك و کوورت رەجەبیان بە خۆوە دیوە. هەر ئەم رۆژانە تەرمی حەمەدۆك لە شەقامەکانی شاردا بەسەر زەوی دا رادەکێشن.

ئەمجار سواری ترۆمبێلەکەی بوو و لەنێو تەپ و تۆزدا شارۆچکەی بەجێ هێشت.

ئێوارەی ئەو رۆژە قایمقام بە پەلە بانگی هەمزاغای کردو پێی گوت:

"هەر ئێستا دەچیەوە دێی خۆتان و بەم زووانەش لە شار نابینرێیەوە. ئەتۆ خەریکی ورەی شارۆچکەیەك دێنیە خوار. مانای نیە هەموو رۆژێ برووسکە بۆ ئەنکەرە لێدەدەن و ژانەسەر بۆ گەورەکان دروست دەکەن. ئیدی بە هیچ جۆر هەقتان نیە برووسکە بۆ ئەنکەرە لێبدەن."

هەمزە بە بێهێزی و شەکەتی گوتی:

"دەم کوژێ جەنابی قایمقام، ئەو دەم کوژێ. ئا...خ ئەمن بچمە کوێ؟ ئەو من دەکوژێ؟"

قایمقام سەری راوەشاندو بۆ دڵسۆزی و هاودەردی لەگەڵ هەمزە گوتی:

"بەڵێ دەکوژێ. دەزانم هەر بۆ کوشتنی تۆ دووبارە سەروسەکوتی پەیدا بووەتەوە. بۆخۆم ئەمە دەزانم، بەڵام کارێکی لە دەست نایە. هێشتا حکوومەتمان زۆر لاوازە. بۆخۆم دەزانم.

بەڵام... بەڵام پارێزگار بەڵێنی داوە کە بیگرێ. بەڵام ئاغای خۆم. نووری هەردوو چاوم، سوڵتانەکەم، هەمزەبەگ، راستت دەوێ دڵم ئاو ناخواتەوە... دەبێ خۆت بە قەزاو قەدەر بسپێری و بچیەوە دێ و چاوەڕێ بی، بەڵکوو مۆجیزەیەك روویدا..."

"ئا...خ، دەم کوژێ."

هەر ئەو رۆژە هەمزە سواری ئەسپەکەی بوو و لە کاتێك دا عەلیەشەلی بە دواوە بوو. ملی رێگای گرت بەرەو کێوپارە.

ئێوارە بوو کە هەورێکی تۆزوخۆڵ ئاسمانی شارۆچکەی داگرت و تۆزوخۆڵێکی رەنگ زەرد بەرەو چیاکان هەڵکشا. مێشەنگوینە لەسەر گوڵە سوورە تۆزاوییەکان نیشتبوون.

لەسەر بەرزترین لکی دارهەنارێکی کۆنەساڵ، پەپوولەیەکی گەورە مردبوو. هەزاران مێروولەی زەرد بە قەدی دارەکەدا بەرەو کەلاکی پەپوولەکە پێ هەڵدەگەڕان.

هەوا زۆر گەرم بوو.

## (٤١)

"وەسمانەزلە بە قوربانی شەهێن بێ!"

وەسمانەزلە قەلنە بە دمەوەو دەستی ڕاست لەسەر دەسکی دەمانچەی ساچمەزەن وەك لاوێکی پازدە ساڵە لەنێو دێی دا پیاسەی دەکرد. تووشی هەرکەس دەبوو، چەند کەلیمە قسەی لەگەڵ دەکرد، دەستی بەسەر سەریدا دێناو دەیگوت:

"خوا من بکا بە قوربانی شەهێن. بە قوربانی ئەو گورگە، بە قوربانی ئەو شەهێنە بم. بە قوربانی ئەوەی بم کە پیرەداری وشك زیندوو دەکاتەوەو گەڵای سەوزی پێ دەردەکا. خوا وەسمانەزلە بکا بە قوربانی حەمەد."

خەڵکی دێش لە شادمانیی وەسمانەزلەدا شەریك بوون و وێرای وی دەیان گوت:

"گوندی وایوای بە قوربانی حەمەد بێ. ناوچەی ئاناوارزاو دێهاتی چوکووراوا هەمووی بە قوربانی حەمەد بێ."

داربەداری جووتیارەکان لەگەڵ عەلی سەفابەگ" واتە سووتاندنی خەرمانەکان و دزینی ئەسپەکانی کە هەموو کەس بە کاری حەمەدی دەزانی هەموو مەڵبەندی ئاناوارزای بووژاندەوە. زۆری نەمابوو مووسلوو خۆشی باوەڕ بکا کە ئەم کارانە لەبن سەری حەمەدۆك دان! دیسان لەبارەی حەمەدۆکەوە داستان و سەربردەو ئەفسانەو گۆرانیی خۆڵاتی کەوتنەوە سەر زارو زمانان.

وەسمانەزلە دەیگوت:

"مەلافەرهاد، ئەمە کاری خوایە. پیاو سەر لە کاری خەڵکی لادێ دەرناکا! لە بەیانی تا ئێوارێ ناوی شەهێنم بنێشتەخۆشەی سەر زارانە، بەڵام ئەیان هێشتوە نە ئاغایەك نە خانێك نە

حکوومەت سووسە بکەن. جێی باوەڕ نیە. یانی ئەوانە لەنێو ئاغاو خان و مووچەخۆرانی دوڵەت خزم و خوێش و کەس و کارێکیان نیە؟"

دیارە بووشیان. بەڵام هەموو جووتیارەکان یەك زمان و هاوپەیمان زمانیان گرێ دابوو و لە لای بێگانە زاریان هەڵنەدەپچڕی.

مەلافەرهادو وەسمانەزلە سەریان لە نهێنی پارێزیی ئەو دێهاتیە زۆربلێیانە سوڕمابوو، و سەریان لێی دەرنەدەچوو. تەنانەت جووتیارەکان خۆشیان سەریان لە کاری خۆیان سوڕمابوو. ئەگەر جەندرمەکان هەرکام لە جووتیارەکانیان گرتبایە، ئەگەر چەرمی لەشیان لەبەر داڕنیبان، ئەگەر چاویان لە کالانە دەرهێنابان، نەیان دەتوانی تاقە وشەیەکیان لەبارەی حەمەدۆکەوە لێ دەرکێشن.

وەسمانەزلە دەیگوت:

"ئەم بنیادەمەش دەعبایەکی سەیرە. جاری وایە ناتوانی متمانەی پێ بکەی تەنانەت دارێکی وشکەڵ، شتێکی بێقیمەتیشی بدەیە دەست، جاری واشە ژیانی خۆتیان لەکن دانێ، وەك گلێنەی چاوی خۆیان دەیپارێزن."

ڕووداوێکی دیکە کە جووتیارەکانی ئەوەندە خۆشحاڵ دەکرد هەر هێندە بوو شێت نەدەبوون، ئەوە بوو کە هەموو شەوێ ڕاست لای نیوەشەو مەزراکەی عەلی سەفابەگ ڕاست وەك گوندی وایوای دەدرایە بەر تفەنگان.

سەفچەکاهیا دەیگوت:

"هەڵدێ، عەلی سەفا مەزراکەی بەجێ دێڵێ و لە مەڵبەندی ئاناوارزا رادەکا."

جەندرمەکان و نۆکەرانی عەلی سەفا لە مەزرا ئێشکیان دەکێشاو وریا بوون و بەو حاڵەش هەر کە نیوەشەو دادەهات، مەزرا وەبەر تفەنگان دەدرا. نەش دەزانرا تفەنگەکان لە کوێ ڕا داوێژرێن و کێ دەیان هاوێ. کەلێن و قوژبنی دنیایان بۆ دیتنەوەی ئەوانە دەپشکنی. بەڵام دەت گوت زەوی زاری لێك کردوەتەوەو قووتی داون. عەلی سەفا گێژو وێژو سەرسوڕماو لەو ڕووداوانە سێ جار چووە لای عارف صائم بەگ و مەسەلەکەی بۆ باس کردو عارف صائم بەگیش باش گوێی بۆ ڕاگرت. بەڵام لە وەڵام دا تەنیا پێکەنینی تەحویل دا.

دواجا رعەلی سەفا گوتبووی:"جووتیاران یاخی بوون، یاخی بوونێکی ڕاست و دروست، خەریکن کاردروستایی بۆ بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە دەکەن."

عارف صائم بەگ دیسان هەر بە پێکەنین وەڵامی دابووەوە:

"دێهاتیەکان یاخی نابن. جووتیاری تورك قوونەبانی کاری وای نیە، یاخی نابێ، خوو و ڕەوشتی وای نیە."

عەلی سەفابەگیش نەیوێرابوو بڵێ:"ئەدی کێ خەرمانەکانی منی سووتاندوە، کێ ئەسپەکانمی دزیوەو کێیە مەزراکەم وەبەر تفەنگان دەدا؟ هەموو ئەم کارانە جووتیارانی تورك نەیان کردوە؟ ئەگەر وابێ ئەتۆ کردووتن جەنابی عارف صائم بەگ! لەوانەشە کاری خۆت بن. دێهاتیەکان پشتیان بە جێیەکی قایم گەرمە. پاڵیان وەبەردێکی زۆر قایم داوە. ئەگینا ئەگەر گۆشتی لەشیان ریزاڵ ریزاڵ بکەین، غیرەتی یەکێك لەم کارانەیان نیە. ناکا ئەو پشت و پشتیوانەیان خۆت بی؟ ئەم پشت و پشتیوانە دەکرێ مستەفا کەمال پاشاش بێ، دەتوانێ جاسووسەکانی "ئەمنییەتی گشتی"یش بن."

زۆر گێژو سەرلێشێواو بوو. روخسارە تاوەسووتەکەی کە دەت گوت لە دووکەڵ دا رەش بووە، گەندە ئارەقی دەرکردبوو. شەو و رۆژ بێپسانەوە بیری دەکردەوەو ئارەقی دەردەڕشت. هێندێك جاسووس و خەبەرهێنی رەگەڵ دێهاتیەکان خستبوون:"بچن بنج و بناوانی مەسەلەکەم بۆ دەربێنن." بەڵام راپۆرتی هیچ کام لەو خەبەرهێنانە لەگەڵ ئەقڵ و مەنتیق دا نەدەگونجا، دێهاتیەکان گوتبوویان:

"چل سوارەی غەیبی لە چیای ڕا هاتنەخوار، خەرمانەکانی عەلی سەفابەگیان سووتاندو سواری ئەسپەکانی بوون و رۆیشتنەوە. حەوت کەسیان بەجێ ماون هەموو نیوەشەوان کێڵگەکەی عەلی سەفابەگ بەردباران دەکەن. ئەوان هەتا وەختێك عەلی سەفابەگ مەزراکە چۆل نەکاو نەڕوا، دەست بەردار نین. ئەوانە کە تەنیا بنیادەمی حەلاڵزادە دەیان بینێ، شەوانە باڵەخانەکەی ئەو بێدینە بەردباران دەکەن و ون دەبن."

"عەلی سەفاش هار ببوو، لە داخان دەیناڕاند:

"قسەی پڕوپووچە، بێمانایە. هەر ئەم رۆژانە دەچمە بنج و بناوانی مەسەلەکە. ئەو کەسەی ماڵەکەم وەبەر تفەنگان دەداو ئەو کەسەی خەرمانەکانمی سووتاندوەو ئەسپەکانمی دزیوە دەدۆزمەوە. زوو بەگیری دێنم. هەموو شتێك روون دەکەمەوە. یەك بە یەك ئیسباتی دەکەم کێ دێهاتیەکان پاڵ پێوە دەنێ یاخی بن، کێ دەستیان لە پشتێ دەدا. پاشانیش دەچمە ئەنکەرە. جا دەیبینن. دەڵێن:"ئەزەرکردە ماڵەکەم بەردباران دەکەن." جگە لە بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرستانە، ئەم قسەیە چ ناوێکی لێدەنرێ؟ ئەمەی لە کاربەدەستانی ئەنکەرە دەپرسم. دەڵێم ئێمە نیشتمانمان بۆ ئەوە رزگار کرد کە ئەم قسانەمان گوێ لێبێ؟ خۆ ئێمە پێمان وابوو

نەزەرکردەکانمان لەگەڵ دوژمن لە دەریا کرد. هەموو ئەمانەیان لێدەپرسم. دەپرسم. هەمووی دەپرسم."

عەلی سەفا لە خۆی دەپرسی:"کێیە ئەو بەدبەختییانەم بەسەر دێنێ؟" مەیدانی ئەم پرسیارە گەیشتە کووزان، عوسمانیە، جەیهان و پایاس. تووشی هەر ئاغایەك دەبوو داستانەکەی بۆ دەگێڕایەوەو هۆیەکەی لێدەپرسی. بەڵام هیچیان قسەیەکی وایان نەدەکرد کە ئاگری دەروونی دامرکێنێ. تەنیا ئاغایەك، ئاغایەکی تورکمەن بە ناوی "کوردعەلیئاغا" کە لە جەیهان بەکێرلی کێڵگەی هەبوو، هێندێ قسەی کرد کە ئەقڵ دەیگرتن:

"کوڕی خۆم، عەلی سەفا. ئەتۆ زۆرت تین بۆ دێهاتییەکان هێنابوو. ئەتۆ ئەگەر بێچووە پشیلەیەك لە ژوورێك کەی و لە پەستا ئازارو ئەزیەتی بدەی، ئاخرەکەی ڕۆژێك چنگوڕکت لێدەداو چاوت دەردێنێ. وەختێك بێچووە پشیلەیەك ئەو کارە بکا، ئەتۆ پێت وایە بنیادەمێك، بە قەد بێچووە پشیلەیەك غیرەتی نیە؟ مرۆڤ هەرچەندی ترسەنۆك بێ، ئەوەندەش بەغیرەتە. بەخۆڕایی بۆ هۆیەکەی مەگەڕێ. هۆیەکەی ئەوەیە کە گوتم."

عەلی سەفابەگ ئەم ڕایەشی قبووڵ نەبوو. ئەو، ئاکارو کرداری دێهاتییەکانی وەك بەری دەستی خۆی دەناسی. لەو باوەڕەدا بوو پیاو چەندی حەز بکا دەتوانێ تین بۆ دێهاتییەکان بێنێ. هەرچی زەبرو زەنگ پتر بێ، دێهاتی بەگوێتر و ڕام تر دەبێ. دیارە ئەم قسەیەی لە لای کورد عەلی ئاغا نەکرد. جووتیاری تورك هەتا هێزێك و پاڵپشتێکی نەبێ، ئاوا ڕاناپەڕێ و یاخی نابێ. وەك شێتان بیروڕای جۆراوجۆری لە مێشکی خۆی دا ڕیز دەکردن و چونکە هۆی سەرپێچی و بەربەرەکانیی جووتیارەکانی نەدەدۆزیەوە ڕقی هەڵدەستا، هەتا زیاتریش ڕقی هەڵدەستا، هارتر دەبوو و پتر جڵەوی ئەقڵی لە دەست بەردەبوو. بە سواری ئەسپ دەچووە دێهاتی ئاناوارزا، لەنێو هەر گوندێك وەك داری تێ بڕابێ، قیت لەسەر ئەسپەکەی ڕادەوەستا، ڕووی دەکردە ئەو جووتیارانەی لە دەوری کۆ دەبوونەوەو پێی دەگوتن:

"کارێك دەکەم گوندی وایوای خوێن بڕشێتەوە، خوێن، خوێن، خوێن."

ئەودەم ڕکێفی لە ئەسپەکەی توند دەکردو خێرا وەك تۆفانێکی ڕق و قین دەشتی ئاناوارزا دەگەڕا:"ئەم دێهاتییە دڕندانە یەکیان گرتوە، ڕادەپەڕن، هەموو شەوێ ماڵەکەم وەبەر گوللە دەدەن، بەڵام ئێمە پێکەوە یەکیەتیمان نیە. ئاغایەك، خانێك، فەرمانبەرێکی دەوڵەت نایە بڵێ مامە کەرت بە چەندی؟... عەلی سەفا چۆنی؟ منیان بە تاقی تەنیا لە نێو زاری شێر دا بەجێ هێشتوە... ئەمڕۆ کە ئەم بەڵایە بەسەر من دێ، فکر ناکەنەوە کە سبەینێ نۆرەی خۆشیان

دێ. دەیبینن، با ئەمن بشکێم... جا خۆیان دەبیننەوە... سەرانسەری چوکووراوا تالآن دەکرێ."

هەمیشە بیری دەکردەوەو نەخشەی دەکێشا. هەموو ئەو کارانەی دەبوو بۆ وردکردنی دێهاتی‌یەکان بیان کا، لە مێشکی خۆی‌دا دەهێناو دەبردو شێوەی جۆراوجۆری زەبرو زەنگ و تۆقاندنی لەزەینی خۆی دا دادێنان، شتی وای بە مێشك دا دەهات، ئەقڵ نەی‌دەگرت.

جووتیارەکانیش تێ‌گەیشتبوون کە عەلی سەفابەگ گێژو سەرلـێ‌شێواوو پەرێشان و داماو بووە.

"وەسمانەزلە بە قوربانی شەهێن بێ، بە قوربانی ئەو چاوە رەشانەی بم، بە قوربانی حەمەدۆکی نازای هەڵکەوتووی ئەم جیهانە بم کە نووری محمدی هەیە."

ئەو جووتیارانەی لە دێهاتی دوورەوە بە شەو یان بە ڕۆژ بۆ دیتنی "ئەو" دەهاتن، وەسمانەزلە پێی دەگوتن:

"لە ماڵ نیە. ئەو شەهێنێکی تیژباڵە. هات لەسەر دەشتی ئاناوارزا نیشت و پاشان باڵی گرت و ڕۆیشت... شەهێن جێی لە دەشتی هەموار نیە! لە شەقەی باڵی داو چووەوە شاخی. ئافەریم بۆ کەسێك کە بیدۆزێتەوە. ئافەریم بۆ ئەو دایکە کە ئەوی لـێ‌بووەو بۆ ئەو چاوە کە ئەوی دیوەو بۆ ئەو ڕێ‌یە کە پێی دا ڕۆیوەو بۆ ئەو کانی‌یە کە ئاوی لـێ‌خواردوەتەوە. ئافەریم بۆ ئەو تیشکە کە لێی دەداو بۆ ئەو بارانەی لێی دەبارێ. ئافەریم بۆ هەتاوێك کە هەڵدێ و بۆ شەوێك کە تاریك دەبێ..."

جووتیارەکانیش بە لارەملی و دڵتامەزرۆیی دەچوونەوە دێ‌یەکانی خۆیان. تەنیا "ساری سەفەر" پێی چەقاندو نەڕۆیشتەوە. دەی‌گوت:"دەبێ بی‌بینم، دەبێ چاوم بە شەهێن بکەوێ." سێ ڕۆژ بوو لەبەر دەرکی ماڵی وەسمانەزلە دانیشتبوو و چاوەڕوانیی دەکرد.

ساری سەفەر لاوێکی بێ‌کەسی خەڵکی نارلی‌قشلا بوو لێوقەڵشیوو مووزەرد کە تەمەنی نۆزدە بیست ساڵ دەبوو. مووی سەری وەك کەوڵە ژووشك ڕەق بوو و بەماڵان دا کاری سەرپێ‌یانی بۆ ئەم و ئەو دەکرد. دەی‌گوت:

"دەبێ بی‌بینم. ئیدی لە گیانم بێزار بووم. ئەگەر وەرم گرێ ڕەگەڵی دەکەوم."

وەسمانەزلە هەرچی کردی و کراندی، نەی‌توانی لە دەرکی ماڵێ خۆی دەربکا. سەفەر دەی‌گوت:

"مام وەسمان، سەرم مەخەرە سەر. ئەمن لە ژیانی خۆم بێزار بووم. ئەمن مردم و لە دەست چووم. یان دەمرم، یان دەی‌بینم."

وەسمانەزلە نەڕاندی:

"ناتوانی بیبینی. ئەو لێرە نیە."

شەوێکیان دەلی مووسلوو سەرتاپا قوڕاوی هاتە مالّی وەسمانەزلە.

مەلافەرهادیشیان بانگ کرد. مەلا فەرهاد، مووسلووی لە باوەش گرت و چاوەکانی ماچ کردن. لاچاوی سلەمان و ئەحمەدیشی ماچ کردو گوتی:

"کوڕینە زۆر کاری چاکتان کرد. پاداشتان لە لای خوا مەحفووزە."

پاشان لەبارەی زەینەلّەوە لێی پرسین. ئەوان لەبارەی بەسەرهاتی زەینەلّەوە هیچیان نەگوت.

هەموو خەلّکی ئاوەدانی، تەنانەت ژنێ زەینەلّیش بە ون بوونەکەی سەرخۆش بوون.

وەسمانەزلە گوتی:

"زەینەلّ خەبەری هاتنی شەهێن بۆ چوکووراوای بە عەلی سەفابەگ و فەرمانبەرانی حکوومەت رادەگەیاند. ئەگەر ئەمڕۆو سبەینێش نەیگوتبایە، ئاخرەکەی رۆژێك دلّی تاقەتی نەدەگرت و دەیدرکاند."

مووسلوو داوای دیتنی حەمەدۆکی کرد. مەلافەرهاد گوتی:

"وەزعی زۆر خەراپە مووسلوو، وەزعی نالەباری دێیەکەی خۆیان پشتی شکاندوە. بە هیچ جۆر هۆشی لە خۆی نیە. هەر دەڕوانێ. بۆخۆشی نازانێ دەلّێ چی و هەر فکر دەکاتەوە. ئەگەر چاوت پێی نەکەوێ باشترە."

مووسلوو پێی چەقاندو گوتی:

"حەتمەن دەبێ بیبینم. ناکرێ نەیبینم. دەبێ بزانم مەسەلە چیە. دەبێ بیبینم."

وەسمانەزلە گوتی:

"لێی گەڕێ بیبینێ. رەنگە بیهەوێ پرسیارێکی لێبکا. چما شەهێنی من نابێ یارمەتیی مووسلوو بدا؟ چما نابێ کۆمەگی بکا تا وەك بریسکە لە سەری عەلی سەفابەگ بدا؟"

هەتا بەیانی باس و کێشەیان بوو. هەربۆیەش ئەو شەوە مالّی عەلی سەفابەگ گوللەباران نەکرا. سەرەنجام مەلا فەرهاد نەختێك نەرم بوو و گوتی:

"پێنج شەش رۆژی دیکە وەرە دایەقەمەرو سەیران دەت بەنە لای وی. ئەوان خزمەتی شەهێن دەکەن و برینەکانی بۆ دەرمان دەکەن. بەلّکوو تا پێنج شەش رۆژی دیکە برینەکانیشی چاك بنەوەو بێتەوە سەرخۆی. بەلاّم ئەمن زۆری لێدەترسم. وەزعی زۆر باش نیە."

مووسلوو گوتی:

"ئەو هیچی لێ‌نایە."

هەموو جووتیارەکانی ئاناوارزا ببوونە چاوێکی پڕ چاوەڕوانی. مەلا فەرهاد بە مووسلووی گوت کە عەلی سەفابەگ کەسێك نیە ئەو بەڵایانەی بەسەری هاتوون تەحەمول بکاو دژکردەوەیەك لە خۆی نیشان نەدا. دەبێ بزانین دژکردەوەکە چ دەبێ.

مووسلوو لە وەڵام دا پێ‌کەنی و گوتی:

"هەر دژکردەوەیەك پێی خۆشە، با نیشانی بدا. یەك بە دەو یەك بە سەد وەری دەگرێتەوە. ئێمە نیگەرانیمان نیە. "ئەو"مان لە نێوە. "ئەو" لە دێیەکەمانە..."

وەرزی گەرما داهات و شەوانی هاوین پڕ بوون لە وزەوزی تەپۆیان. نیزیك بە هەمووی منداڵان و نیوەی لاوەکانی ئاوایی تووشی نۆبەتێ بوون. جووتیاران لەبەر زەردەگەرمای هاوینێ لەسەر ئەو زەوی‌یە کە وەك پۆلوو گەرم و سووتێنەر بوو رادەکشان و لە تولعی بەیانی‌یەوە تا فێنکی ئێوارێ لە سەرمان هەڵدەچۆقین.

بەڵام نۆبەتێیش بە پێچەوانەی ساڵانی پێشتر جووتیارەکانی لە پێ نەخست. لە ئاگری نۆبەتێ دا دەسووتان و لە سەرمای پاش نۆبەتێ دا هەڵدەلەرزین. بەڵام لە هەناویان دا هەر شاد بوون. هەموو رۆژێ لە باڵەخانەکەی عەلی سەفابەگەوە خەبەرێکیان پێ دەگەیشت و ئەو خەبەرانە لەگوندی وایوایەوە بە سەرانسەری ئاناوارزادا بڵاو دەبوونەوە. کەس نەی‌دەزانی حەمەدۆك لە کوێ‌یەو لەکن کێ‌یە. بەڵام ئەمە نەدەبووە کۆسپی ئەوە کە دەنگ و باسی لەبارەدا ساز بکەن.

بۆ وێنە رۆژێك خەبەر دەهات کە لە چیای "کامیرانلی" هێرشی کردوەتە سەر ماڵی زاڵمێك و بەیانی دەت بیست کە دەستەیەك جەندرمەی لە چیاکانی "حاجین"ەوە تا چوکووراوا شکاندوەو ڕەپێی ناون.

لەو ماوەیەدا سێ جار ئیدریس بەگ هاتە وایوای. پاش ئەم شەڕەی لە ئاناوارزا تووشی بوو، وەك گورگێکی تەنیا، هەر بە شەو لە چیارا دەهاتە خوار بۆ چوکووراوا. ئەویش هەردوو پێی لە کەوشێك کردبوو و دەی‌گوت:

"ئیللاو بیللا دەمەوێ چاوم بە شەهێن بکەوێ"و یەك قسەی دیکەشی نەدەکرد.

وەسمانەزلە پرسی بە مەلا فەرهاد دەکردو ئەویش بە پێ‌داگرتنەوە دەی‌گوت:"ئیمکانی نیە. نابێ. ئەو جارێ ناتوانێ چاوی بە شەهێن بکەوێ. لە جێ دا نازانین ئەو کێ‌یەو چ کارەیە، بێجگە لەوانەش، ئەو بۆخۆی ئاغایەکە..."

وەسمانەزلە کێشەی لەگەڵ مەلافەرهاد دەکردو دەیگوت:

"ئەگەر ئەو پیاوێکی خەراپ بووایە، خان و ئاغا بایە، پیاوی حکوومەت بووایە، دێهاتی‌یەکان متمانەیان پێ نەدەکردو پێیان نەدەگوت شەهێن هاتوەتە دەشتی چوکووراوا. ئەم پیاوە ئینسانێکی باشە. لەوانەیە کارێکی بە شەهێن هەبێ، قسەیەکی پێی هەبێ."

مەلافەرهاد دەیئەڕاند:

"هیچ قسەیەکی نیە. ئەم پیاوە نابێ حەمەدی ببینێ. تێگەیشتی مام وەسمان! لە جێ دا کەس نازانێ کێ‌یەو چ کارەیە. ئێستا کام دێهاتیی بێ‌ئەقڵ پێی گوتوە، با پێی گوتبێ، گرنگ نیە."

لە وەڵامی داخوازەکانی ئیدریس بەگ دا دەیان گوت:

"ئێمە نە دیومانەو نەدەزانین لە کوێیە. چما ئەو شێتە، بێتە ئەم دەشتە؟ ئەو لە چیایە."

ئیدریس بەگیش بێ‌ئەوەی باوەڕ بە قسەکانیان بکا، سواری ئەسپی خۆی دەبوو و لە تاریکایی شەو دا هەی لێ‌دەکرد.

سیلوێرگلین لە "ئەندەل" کە دێیەکی دوور بوو، نەوەیەکی هەبوو. ئەم منداڵە دارو نەدارو رووح و گیانی سیلوێر بوو. سیلوێر سەرانسەری زستانێ پاروی لە زاری خۆی دەگێڕایەوەو هەرچی وەدەستی دەکەوت کۆی دەکردەوەو بۆی دەنارد.

هەناری زل زل و شووتی و کاڵەکی گەییوو پڕ ئاو، باسووقی چیاکانی ماراش، مێوژەتوو، ترێ و هەموو شتێکی بۆ نەوەکەی خڕ دەکردەوە. جگە لەوانە خەڵێفە مێشێکی گەورەشی هەبوو. هەنگوینی ئەو خەڵێفە هێندە زۆر دەبوو کە لە خەڵێفەکەدا جێی نەدەبووەوەو دەبوو لە دەری خەڵێفەکە جێگای بۆ ساز بکا. دیارە هەمووان مێشەنگوینیان هەبوون. بەڵام خەڵێفە مێشی سیلوێرگلین شتێکی دیکە بوو. ئەو زۆر باشی ئاگا لە مێشەکانی بوو، بۆیە هەنگوینی مێشەکەی وی سپی و پتەو دەردەچوو و بۆنی گوڵی خەلەنگی لێ‌دەهات. مێشەکانی سیلوێرگلین لە مێشی ئەوانی دیکە گەورەترو قەڵەوترو تررووسکەدارتر بوون.

سیلوێرگلین شانە هەنگوینەکانی لێ‌کردبوونەوە هەمووی لە تەنەکەیەکی پڕ نەخش و نیگار هاویشتبوو هەتا بۆ نەوەکەی بەرێ. تەنەکەکەی بەدیوارەوە هەڵواسیبوو، بە ئیشتیاوە تەماشای دەکرد. ئەمە پیشەی هەموو ساڵێکی بوو و تەنانەت قامکێکیشی لەو هەنگوینە نەدەدا.

سندووقەکەشی پڕ بوو لە سێوی بۆن خۆشی کوێستان و هەرمێ و هەنجیرو ترێ و باسووق و مێوژەتوو.

سیلوێرگلین پاش ئەوەی هەنگوینەکەی بڕیەوەو لەتەنەکەی کردو بە دیوارەوە هەڵی واسی، ماوەیەك تەماشای تەنەکەکەی کرد. ئەم ساڵ بە هیچ جۆر دەستی لەبەر دڵی نەدەبووەوە کە تەنەکە هەنگوینەکە هەڵگرێ و بیبا بۆ نەوەکەی. لە هەناوی دا شتێك دەبووە کۆسپی ئەم کارەو تەنەکە هەنگوینی هەڵاوەسراو هێندێ هەستی دژبەیەکی لەهەناوی دا دەبزواند. هەتا وای لـێهات رۆژێکیان بەیانی خۆی پێڕانەگیرا، تەنەکە هەنگوینەکەی لەدیواری کردەوە، چەرەس و میوەی نێو سندووقەکەی لە خورجێنێك کردو هەمووی هەڵگرتن، چووەماڵی وەسمانەزلەو گوتی:

"بگرە وەسمان! زۆرم تین بۆخۆم هێنا، ئەم ساڵ دڵم نەهات ئەمانە بۆ نەوەکەم بەرم. دەستم نەیهێناو دڵم رازی نەبوو. ئەم ساڵ ئەمانە بدە بەو. زۆری بەدبەختی کێشاوە، هیچی نەخواردوە. ئاخر لەو کێو و بەندەنانە چ دەست دەکەوێ بەستەزمانە بیخوا... بووژاوە، باڵای نەکردوە. ئەگەر بەستەزمانە چاك بخواو بخواتەوە لەوانەیە کەمێك باڵا بکا، ببووژێتەوە. ئەمانە بەرە بیدەیە. وەك شیری دایکی حەڵاڵی بێ. پێی بڵێ سیلوێرگلین گوتوویە خوا من بکا بە قوربانت."

وەسمانەزلە بە خۆڕانانێکەوە دەستی بەسەر تەنەکە هەنگوینەکەدا هێنا کە نەخشی رەنگاوڕەنگی لـێهەڵکەندرابوون و ئەمجار گوتی:

"باشە، باشە جوانکیلەکەم سیلوێرگلین باشە. پێی دەڵێم ئەمانە سیلوێرگلین بۆی ناردووی. بیان خۆو وەك کێو قەڵەو بە! با ئەوانەی تۆ دەبینن سامت لـێبکەن. پێی دەڵێم راستە شەهێنیش چووکەڵەیەو نێچیریشی لەدەست دەرناچێ. بەڵام دیسان وا باشترە قەڵافەتت بەسام بێ."

سیلوێرگلین بە راوێژێکی زۆر جیددی گوتی:

"ئەرێ، ئەرێ. ئەمن وام دەوێ."و بە خۆشحاڵی پێکەنی. وەسمانەزلە دەستی بەسەر تەنەکە هەنگوینەکەدا دێناو دەیگوت:

"سیلوێرگلین، چەند نەخش و نیگارێکی جوانت لەم تەنەکەیە داوە. چۆن دەبریسکێتەوە. ئەتۆ دنیاو بەهەشتت لەسەر ئەم تەنەکەیە کردوونە نەخش. یاخوا دەستت نەرزێ."

لەسەر زەمینەی رەشی تەنەکەکە تفەنگێکی گەورە بە رەنگی شین کێشرابووەوەو دەستێك بە نیوە کراوەیی لە پەنای تفەنگەکە دەبینرا."

وەسمانەزلە گوتی:

"وەسمان بە قوربانی شەهێن بێ، بە قوربانی کوڕەکەی، بە قوربانی بێچووە شێرە دلێرەکەی، بە قوربانی نووری چاوەکانی بێ. بە قوربانی هەڵکەوتووی ئەم جیهانە بێ. بە قوربانی ئەو دەستەی بێ کە وێنەکەی لەسەر ئەم تەنەکەیە کێشراوەتەوە."

سیلوێرگلین بەم قسەیەی وەسمانەزلە یەکجار دڵخۆش بوو و گوتی:

"سیلوێرگلینیش بە قوربانی بێ..."

## (٤٢)

چۆمی ساووران وردەبەردەکانی خۆی لە ژوور ئاکچاسازەوە پان دەکاتەوەو پاشان بە هاشەیەکی نەرم لە نێو وردە بەردەکان دا دەبێتە دوو کەرت و دوای بەجێ هێشتنی تەپۆلکەیەکی چووکەڵەی خیزەڵان بەرەو گۆلاوی ئاکچاساز شۆڕ دەبێتەوەو پاش ئەوەی بەسەر گوڵە پشکووتووەکان و بە بن بێیەکانی بەیەڵێن دا تێدەپەڕێ، دەڕژێتە نێو گۆلاوەکە. لێرە هەموو رووەکێك زۆر سەرسەوزو لەشۆقە. لە نیزیك گۆلاوەکە لە لای شیمال دارەبیی لەمێژینە دەوری دورگەیەکی چووکەڵەیان داوەو لە لای رۆژهەلات واتە لەو شوێنە کە دورگەکە دەست پێ دەکا لێرەوارێکی چووکەڵەی دارەچنار بەرچاو دەکەوێ کە چۆمی ساووران وردە بەردەکانی خۆی کۆکۆ لەبن دارەکانی هەڵداوەتەوە. لە جنووب، قامیشەلانێکی چڕ و پڕ بەداری سنۆبەری خۆڕست و دەوەنە دڕك وجەگەنەوە خۆی دەنوێنێ و گۆلاوی بێبڕانەوەی ئاکچاسازیش کەوتوەتە رۆژئاوا. قامیشەلانەکە بەهەشتی پەلەوەرەکان بوو. هەموو رۆژێ کۆمەڵێکی یەکجار زۆر باڵندە بە رەنگ و شکڵی جۆراوجۆرەوە لەسەر دارەکانی قامیشەلان هەڵدەنیشتن، سەدان هەزار جۆر باڵندەی گەورەو چووك بەشکڵ و رەنگی جۆراوجۆر. سەرلەبەیانیێیان، وەختی کازیوە هەزاران باڵندە، یەك دەنگ گۆرانیێیان دەگوت. کۆمای باڵندەکان وەك هەورێك لەسەر قامیشەلان دەنیشت و وەك هەورێکی رەش لەسەر قامیشەلان هەڵدەفڕییەوە.

ئەم دورگەیە هی سەیفەلی بوو. پشتاپشت بێستانەوان بوو. گەورەترین شووتی و شیرین ترین کاڵەکەکانی چوکووراوا لە خاکە رەڵمەکەی ئەم دورگەیەدا ڕەنێو دەهاتن. رەنگە زۆرمان نەگوتبێ ئەگەر بڵێین گەورەترین گوڵە مەخمەریی دنیاو چڵە ریحانەی گەورەی بەقەد چڵە

خەلەنگێك لەم بێستانەدا شین دەبوون، کە لە گەرمای هاوین دا بۆنەکەیان هەتا دوور دەڕۆیشت. شەش ساڵ بوو "خەلیل جیك" ئەم بێستانەی بەخێو دەکرد.

شەش ساڵ لەمەوبەر پیاوێکی کۆسەی زۆر باڵابەرز هاتە لای سەیفەلی کە سەری لەنێو شانی ڕۆچووبوو و چاوێکی هەڵمساوی هەبوون. مژۆڵ و برۆی هەر نەبوون و لە روخساری پڕ گنج و لۆنجی ڕا نەدەکرا تێبگەی کە تەمەنی چەند ساڵ دەبێ؟ ئەو گوتبووی:

"ئاغا سەیفەلی، برالە. ئەمن لەم ژیانە وەڕەز بووم. ئەم بێستانە وەدەست من دە با ئاگاداریی لـێبکەم و زۆریشت خێر دەگاتێ. بۆخۆم دەزانم کە بێستانەوانی ئەم جۆرە جێگایانە ئەوپەڕەکەی سێ ساڵ بەرگە دەگرێ. پاشان لەبەین دەچێ. نوبەتێی کەمەرشکێن بێستانەوانەکان یەك لە دوای یەك لەگەڵ خۆی دەبا."

سەیفەلی گوتبووی:

"باشە کاکە."و لەو ساڵەوە پارێزگاریی بێستانەکەی بە خەلیلە کۆسە ئەسپارد. بەڵام خەلیل نەك هەر نەمرد، بەڵکوو تەنانەت تووشی نۆبەتێیش نەبوو. وەختێك لـێیان دەپرسی، دەستی بۆ لای نوشتەیەکی ڕەنگاوڕەنگی چاوەزار کە لەملیدا بوو، ڕادەداشت و دەیگوت:

"ئەمن نوشتەی دژی تەپۆم پێیە."

خەلیلە کۆسە بەهاری هەموو ساڵێك وەختی داچاندنی بێستانەکە دەهات و پاییزان دوای بڕانەوەی بێستانەکە ون دەبوو. کەس نەیدەزانی لەکوێ ڕا دێ و بۆ کوێ دەچێ.

سێیەمین ڕۆژی هاتنی حەمەدۆك بۆ ئاوایی بوو کە سەیفەلی هاتە بێستانەکەو گوتی:

"خەلیل، دەتوانم متمانەت پێ بکەم و گیان و ماڵ و نامووسی خۆمت پێ بسپێرم؟ دەتوانم لەبارەی سۆمای چاوی میللەتێکی گەورەو هەژارو زۆرلێکراو متمانەت پێ بکەم؟"

خەلیل دەسبەجێ تێگەیشت و دەستی کرد بە پێکەنین:

"ئاغا سەیفەلی، بۆ هێندەی لەبەر یەك بکێشینەوە، "ئەو" سۆمای چاوی خۆشە. هەتا کاتێك منی بێچارە زیندووم و هەتا وەختێك لەشم نەچووەتە بن خاکی ڕەش، تەنانەت خەیانەت بە تاڵە موویەکیشی ناکەم. جێیەکی وای بۆ دروست دەکەم نە چاوی بنیادەمی پێبکەوێ و نە کەس پێی بزانێ."

ئیدی پێویست نەبوو زیاتری لەسەر بڕۆن و هەر ئەو شەوە حەمەد لەسەر هەرزاڵێکی بەرین کە خەلیل لەنێو لکەکانی دوو دارە بی دا هەڵی بەستبوو، بە ئاسوودەیی لێی خەوت.

خەلیلە کۆسە لە قامیشی یەکجار باریك و ناسك شتێکی وەك مێش بەندی تەنیبوو، و لەو مێش بەندەو لەنێو ئەو قامیشە تەنراوانەدا چەند هەواکێشی زۆر چووکی دامەزراندبوون کە

هەم مێش بەندەکە فێنك دەبووەوەو هەم تەپۆ نەیان دەتوانی بچنە ژووری. لەکاتێك دا لە دەرێ بە میلیۆن تەپۆ وەك هەورێك دەیان گرماند، تەنانەت بۆ نموونەش تەپۆیەك نەیدەتوانی بچێتە نێو مێش بەندە قامیشەکە. هەر بەهۆی ئەو جۆرە مێش بەندەشەوە بوو کە خەلیل لە ماوەی ئەو شەش ساڵەدا تووشی مالاریا نەببوو.

شەوێکی مانگەشەو بوو. ئەو شەوە خەلیل تا بەیانی نەخەوت و گوێی بۆ هەناسەی حەمەد ڕاداشت و لەبارەی بەسەرهاتی ئەم پیاوە وردیلانەیەوە بە قووڵی بیری کردەوە. ئێستا ئەم پیاوە وردیلانەیە بریندارو ماندوو بوو و ئاگای لە دنیا نەبوو.

جگە لەوانەش خەلیل لە هیچ یارمەتییەکی دایەقەمەرو سەیران و مەلا فەرهادو وەسمانەزلە کە خەریکی دەرمان کردنی برینەکانی حەمەد بوون، درێخیی نەکرد.

ئەو گوڵ و گیایانە کە دایەقەمەر بۆ دروست کردنی مەلحەم پێویستیی پێبوون و دەستی نەدەکەوتن، خەلیل لە قامیشەلان و شاخ و داخ و چیاکان پەیدای دەکردن و دەیهێنان. ئەگەر خەلیل نەبووایە، برینەکانی حەمەد بە داودەرمانی دایەقەمەر بە پازدە ڕۆژ سارێژ نەدەبوونەوە.

حەمەد کە نەختێك باشتر ببوو، هەتا دەهات زیاتر خۆی دەخواردەوەو لەگەڵ کەس قسەی نەدەکردو چاوی لە چاوی کەس نەدەکرد. بەرامبەر بە پرسیارەکانی خەلیل و دایەقەمەرو سەیران دەمی هەڵنەدەپچڕی. جۆرێك بوو، دەت گوت نەدەبینێ و نە دەبیسێ. ئەو خۆراکەی بۆشیان دێنا، بێئەوەی تەماشای بکاو لێی بتامێ خێراخێراو بەپەلە دەیخوارد. کە نانەکەشی دەخوارد دەچووەوە ژووری ئەو جێگایە کە خەلیل لە لك و پۆپی بۆن خۆشی مۆرد بە شێوەی توونێل بۆی دروست کردبوو، و لەوێ دا دەخەوت. کاتێکیش لەو لانە دەهاتە دەرێ وەك کەسێك کە لە خەودا بەرێ دا بڕوا لە کاتێك دا لاقی لە بەردو دارو بڕکە شووتی و کاڵەك دەگیران، دەچووە نێو چۆمی ساووران و لەنێو ئاوەکەدا ڕاوێچکەی دەکرد.

خەلیلە کۆسە لە وەڵامی پرسیاری سەیران و دایەقەمەرو وەسمانەزلەو مەلا فەرهاد دا دەیگوت:

"جندۆکە دەستیان لێوەشاندوە. ئەمن زۆ...ر کەسی جندارم دیون... ڕاست وەك حەمەد بوون... ڕاست... ڕاست... لە گوندی خۆمان "ئالامستەفا"یەك هەبوو، شەوێکیان..."

ئەم جار داستانی جندار بوونی ئالامستەفای موو بەموو دەگێڕایەوەو دەیگوت:"لە کاتێك دا زەماوەندی جندۆکان دەبێ و خەریکی نان خواردن دەبن، ئالامستەفا پێیان هەڵدەمیزێ. بەستەزمانە بە چ ڕا بزانێ... بە کورتی جندۆکەش ئەویان بەو جۆرە گێژو وێژ کردبوو." پاشان

دەیگوت حەتمەن حەمەدیش لە چیاو بەندەنان، یان لە ئەشکەوتێك دا میزی بە جندۆکان دا کردوە. دوکتۆرو دەرمانیش سوودی نابێ. دەبێ هەر ئەو جندۆکانە کە ئەویان تووشی ئەم وەزعە کردوە، بەزەییان پێی دا بێتەوەو وەك خۆی لێبکەنەوە.

وەسمانەزلە لە کاتێك دا دەستێکی لەسەر دەسکی دەمانچەکەی و دەستەکەی دیکەی لەسەر شانی خەلیلە کۆسە بوو، بە چاوێکەوە کە وەك بلێسە دەدرەوشایەوە دەینەڕاند:

"چاکت گوێ لێبێ خەلیل. لە لای یەك کەس بلێی ئەو جندار بووە، دەت کوژم، پیاو نیم ئەگەر نەت کوژم. خوێنت لە جیاتی ئاو دەخۆمەوە. کۆسەش بە ئارامی وەڵامی دەدایەوە:

"جا ئەمە قسەیە دەیکەی مام سلەمان؟ چما دەکرێ شتی وا بلێین و هیوای میللەتێك بکەینە ناهومێدی؟ ئەگەر دێهاتییەکان ئەم مەسەلەیە ببیسن، دێیەکە چۆڵ دەکەن و هەڵدێن. چما دەکرێ پیاو بە کەس بلێ. ئۆ...ی مام وەسمان، ئێمەش بە قەدەر تۆ لەم شتانە حاڵی دەبین... پێمان دەڵێن خەلیلە کۆسە. ئێمە پیاوێکی دنیادیدەین. ئەو ریشەمان لەبەر تاوێ سپی نەکردوە."

ڕۆژێکیان خەلیلە کۆسە داوای مەنجەڵێکی گەورەو قالبە سابوونێك و دەستێك جلکی لە سەیران کرد. ڕۆژی دواتر سەیران هەرچی خەلیل داوای کردبوو بۆی هێنا. سابوونەکە ڕەنگی پەمەیی بوو و زۆر بۆن خۆش بوو. سەیران ئەم سابوونەی لەنێو بەروبوخچەکەیدا لە خەرمەن جاوە هێنابوو و دڵی نەدەهات خەرجی بکا. خەلیل دەسبەجێ هەر لەوێ ئاورێکی کردەوەو ئاوی گەرم کرد. پاشان حەمەدی لەنێو پۆلە قامیشێك دا رووت کردەوەو خێرا خێرا بە قالبە سابوونێك وەك منداڵێك بشوا، پاك و خاوێن شوتی و وشکی کردەوەو جلکەکانی لێگۆڕین.

جلکەکان وەسمانەزلە کڕیبوونی. پانتۆڵێکی ڕەشی نوێ و کراسێکی خەت خەتی یەخە حوسەینی لەکەتانی ماراش و جووتێك کەوشی پاژنەنوستووی کاری ئەدەنە بوون.

ئەو جلکانەی خەلیل لەبەر حەمەدی کردن پڕ بە لەشی بوون. حەمەد بەو جلکە تازانەوە نەختێك وردترو منداڵتر دەهاتە بەرچاو. ئەگەر ریشە درێژو تێك هاڵاوەکەی نەبووایە، بە سوێندو قورئانیش کەس باوەڕی نەدەکرد ئەم منداڵە حەمەدۆك بێ.

خەلیل گوتی:

"هەتا ئەم کوڕە لەلای منە دەبێ بە لەباری سەرووڕیشی بۆ بتاشم."

پاشان چەقۆیەکی باش تیژ کردو لە فێنکایی ئێوارێ دا سەرو ڕیشەکەی بۆ تاشی. حەمەد لەحزەیەك تەماشای خەلیلی کردو بە ڕوویەوە پێکەنی و دەستی گرت و گوشی. خەلیل غاری

داو چووه لای سەیران که لەبن دار چنارێك دانیشتبوو، بەخۆشحاڵی‌یەوه له کاتێك دا زمانی گیرابوو و به چاکی قسەی بۆ نەدەهات گوتی:

"خوشکه سەیران، خوشکه سەیران. دەزانی چ بوو؟ ژیوەتەوه، ژیوەتەوه، وەڵڵا بیللا دەستی گوشیم... تەنانەت زۆر باشیش به ڕوومەوه پێ‌کەنی."

سەیران پرسی:

"پێ‌کەنی؟ بەڕاستی پێ‌کەنی؟"

له جێی خۆی هەستاو هەردووکیان بەرەو حەمەد وەڕێ کەوتن.

حەمەد ڕاوەستابوو، تەماشای وانی دەکرد. چاوی هەڵێنابوون و دەت گوت یەکەم جاره دەیان بینێ، به سەرسوڕمانەوه تەماشای دەکردن و زەردەی دەهاتێ.

سەیران دەستی وی گرت، روخساری داگیرسا، سوور هەڵگەڕاو گوتی:

"بەلا دوور بێ برا."

حەمەد به حەبەساوی تەماشای سەیرانێی دەکردو زەردەی دەهاتێ.

خەلیل گوتی:

"ناسیت؟ ئەم کچه سەیرانه. لەگەڵ دایەقەمەر برینەکانی تۆی دەرمان کرد. ناوی منیش خەلیله کۆسەیه، ئەمن بێستانەوانی ئەم بێستانەم."

خەلیل هەستی کرد حەمەد له شتێك دەگەڕێ و لەنێو بۆشایی‌یەکی سەیردا دەخزێ و ڕۆدەچێ..."

خەلیل گوتی:

"چاو بۆ چی دەگێڕی کاکه؟"

حەمەد دەوروبەری خۆی دەپشکنی.

"له تفەنگەکەت دەگەڕێی؟... لێرەیه."

دەستی حەمەدی گرت و بردیه بن هەرزاڵەکه. گیشەگیایەك لەبن هەرزاڵەکه بوو، وەلای دا، قوولکەیەك وەدەر کەوت. لەنێو قوولکەکەدا حەسیرێکی لوول دراو هەبوو.

خەلیل داهاتەوه، حەسیرەکەی لێك کردەوه. تفەنگ، فیشەکدان، دووربین، دەمانچەو به کورتی دارونەداری حەمەد لەنێو ئەو حەسیرەدا بوو. حەمەد بێ‌پسانەوه پێ‌دەکەنی، جارێکی دیکه به هەموو هێزی خۆیەوه دەستی خەلیلی گوشی.

لەبن بی‌یەکان دانیشتن و پاڵیان وەقەدی دارەکان دا. سەیران چاوی له حەمەد نەدەتترووکاند. له هەناوی دا شتێکی نەرم و خۆش و گەرم هەڵدەقوڵی. زۆر لەمێژ بوو ئەو هەستەی لەبیر خۆی

بردبووەوە. وەختێك تەماشای روخساری حەمەدی دەكرد، گەرمایەك لە دوورەوە دەهات و دڵۆپ دڵۆپ دەتكایە سەر دڵی. سەیران سەری دادەخست، بەڵام دیسان دەیدی كە بە خۆی نیە چاوی تێوە بڕیوە... سەیران نەیدەزانی تەگبیری چیە. لەنێو هەستێكی سەیردا نوقم ببوو.لە بنەوە هەر تەماشای خەلیلی دەكردو لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ناكا شتێكی لێ حاڵی بووبێ." خەلیل بە هیچ جۆر لە وەزعێكی وادا نەبوو، ئەمە دەبووە هۆی ئەوە كە سەیران خەیاڵی تەخت بێ. پاشان بەخۆی نەبوو لە روخساری حەمەدوە ڕاما.

لەدڵی دا هەستێكی نوێ دەپشكووت و دەبزووت. سەیران لەنێو شەپۆلی چەند هەستی جۆراوجۆردا، بەزەیی، ئەوین، هەستێكی دایكانەو دۆستانەدا پەلەقاژەی بوو.

خەلیل دووسێجار بێستانەكە گەڕا. پاشان دوو دەسكی گوڵە مەخمەری و ڕیحانە هەڵكەند، یەكی وە سەیران و ئەوی دیكەی وە حەمەد دا. حەمەد بۆنی بە گوڵەكانەوە كرد. بۆنی گوڵ و ڕیحانەی پڕ بە سیەكانی هەڵمژی. جۆرێك بوو دەت گوت تا ئێستا قەت بۆنی بە گوڵێكەوە نەكردوە.

ڕۆژبا هەڵی كردبوو و لە جادە خۆڵاوییەكان و لە خوار قەڵای ئاناوارزا گێژەڵووكەی بەرز بەرزی دەخستنە سووڕان و جووڵان.

سەیران بە پەلە هەستایە سەرپێ و گوتی:

"ئاگرێك بكەمەوەو شۆرباوێكتان بۆ لێنێم."

دەستی كرد بە كۆكردنەوەی پووش و پەڵاش. خەلیلیش یاریدەی دا. ئاوریان هەڵ كرد. بۆنی ڕۆن و پیوازو دەنگی جزەجز هەڵستا.

سەیران زۆر بە تەڕدەستی سفرەی ڕاخست، دەوریی شۆرباوخواردنی دانان و گوتی:"فەرموون" حەمەدو خەلیل چوار مێزیلكە دانیشتن.

حەمەد بۆ یەكەم جار لە سەرەخۆو بە ئیشتیاوە شۆرباوەكەی خوارد. بۆ ئەوەی تامی خواردنەكە باش بچێژێ، چاوی لێك دەنان و لە حاڵەتێكی تێكەڵ بە سەرخۆشی دا كەوچكی بۆ زاری دەبرد.

پاش ئەوەی شۆرباوەكە تەواو بوو، چەندین جار ڕوانیە دەوروبەری خۆی. حاڵەتی سەرلێشێواو و سەرسوڕماوی كەسێكی هەبوو كە تەلیسمی شكابێ، لە خەوێكی قورس وەخەبەر بێ و لە دنیایەكی گەورەی خەون و خەیاڵ ڕا لەنەكاو بێتەوە سەر دنیای ڕاستەقینە.

دوای ئەوەی ماوەیەك تەماشای دەوروبەری کرد، سەرەنجام چاوی لەسەر سەیران بە مۆڵەق وەستان. لەحزەیەك چاویان لە یەکترەوە بڕی و سەیران ڕووی وەرگێڕا.

حەمەد وەقسە هات و گوتی:

"دەستت خۆش بێ خوشکێ. لە ژیانم دا شۆرباوی وام نەخواردبوو."

راوێژی دەنگی حەمەد سەرانسەری گیان و لەشی سەیرانێی هەژاند. تەواوی ئەندامی لەشی تووشی لەرزینێك بوو کە هەر بنیادەمێك لە درێژایی ژیانی خۆی دا تەنیا یەك جار تووشی دەبێ. دەست و لاقی سست بوون. دەنگی حەمەد زۆر لە دوورەوە دەهات، لە دنیایەکی دیکەوە، لەدنیایەکی سەیرو ئەفسووناوی‌یەوە. سێبەرە ڕەنگاوڕەنگەکانی خۆرئاوا بەسەر وڵات دەکشان. سەیران دەمەساتێك لەنێو ئەو سێبەرانەدا روخساری حەمەدی لێ ون بوو. لە جێی خۆی هەستا، چووە چەپ و ڕاست و ئەم لاو ئەولا. پاشان چوو ئەو تەنەکەیەی هێنا کە بە قەدی بی‌یەکەوە هەڵواسرابوو، هاتەوە لای حەمەدو گوتی:

"هەنگوینە. سیلوێرگلین بۆی ناردووی. هەنگوینێکی باشە، ئەم هەنگوینە نادا بە کەس. تەنیا داویە بە تۆ."

بەپەلە هەنگوینی لە دەفرەکەی حەمەد ـ کە شوتبوویەوەـ کرد. حەمەد گوتی:

"خۆش بی خوشکێ. چەند زوو برینەکانی منتان چاك کردەوە."

سەیران بە خۆدا شکایەوە، سوور هەڵگەڕاو بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتی:

"بنەماڵەی دایەقەمەر هەموویان نەشتەرگەر (جراح) بوون. ئەو خەڵکی ئەو چیایانەی سەرەوەیە. خەڵکی "ساری تانشمانلی"یە. خەڵکی وێ زۆر باش دەزانن برینی گوللە دەرمان کەن. ئەمنیش خەڵکی کێوپارەم. خەڵکی لای مە هەموویان بە گوللە بریندار دەبن..."

پاشان لەنەکاو بێدەنگ بوو. لە قسەکردنەکەی پەژیوان بووەوە.

چونکە دەست و لاقی وەك بیی نێو ئاو دەلەرزین و لە ترسی ئەوەی حەمەدو خەلیل چاویان بەو لەرزینە بکەوێ، خەریك بوو زراوی بچێ. سوپاس بۆ خوا کە هەتاو ئاوا ببوو، و دنیا بەرەو تاریك بوون دەچوو. پۆلی تەپۆو مێشوولە وەك پەڵە هەور لەبن گوێ‌یان و لە ژوور سەریان گۆرانی‌یان دەگوت.

سەیران تووشی حاڵەتێکی سەیر هاتبوو. لەگەڵ ئەوەی دەیەویست لەوێ ڕابکا، نەی‌دەتوانی بڕوا. تا ئێستا قەت هێندە وەدرەنگ نەکەوتبوو. ئەم جار لەبەر تاریك بوونی هەوا نەشی دەتوانی روخساری حەمەدی بە باشی لێك بکاتەوە.

دەسبەجێ لە جێی خۆی هەستا. حەمەدو خەلیلیش لەگەڵی هەستان. سەیران گوتی:

"درەنگم لـێ داهاتوە. خواحافیزتان بێ."

حەمەد تەنیا توانی ئەوەندە بڵێ:

"بەم نیوەشەوە... بە تاقی تەنیا..."

خەلیل پێکەنی و گوتی:

"ئۆ... هۆۆۆ... کاك حەمەد. ئەتۆ سەیرانێ ناناسی. ئەو هەر بەم شەوە دەتوانێ بە نێو هۆردوویەك دا بڕوا. لەهیچ کەس و لە هیچ شتێك ناترسێ..."

سەیران بە غاردان دوور کەوتبووەوەو گەیشتبووە چۆمی ساووران و کەوشەکانی داکەندبوون و لە ئاوێ دەپەڕیەوە. خێرا لە ئاوەکە پەڕیەوە، کەوشەکانی لەپێ کردنەوەو لە جادە خۆڵەکەدا کەوتە رێ. لەو هەستە کە چەندین ساڵ لەبیر خۆی بردبووەوە، کەوتبووە هەژان و خەریك بوو بتوێتەوە. هێشتاش لەشی دەلەرزی. لەحزەیەك خۆی لەنێو هەڵچوون و هەژانێکی لەرادەبەدەردا دەدی و لەحزەیەکیش تووشی شادییەکی ئارام بەخش دەبوو.

## (٤٣)

ئەو شەوە تا بەیانی خەو لە چاوی سەیرانێ نەکەوت. لە خۆشیییان لە کەوڵی خۆیدا جێی نەدەبوو. هەستی جۆراوجۆری تووش دەبوون. لە خەیاڵێکی شیرن، ئەفسووناوی، ئارام و گەرم دا مەلەی دەکرد. شتێکی ئارام بە بۆنێکی قورسەوە، شتێکی وەك ئەوین، بەزەیی، خۆشەویستی و دۆستایەتی بەخێرایی بە دەمارەکانی دا دەگەڕاو خوێنی ئەوی لە تەواوی ئەو ئازارانەی چاشتبوونی، پاك دەکردەوەو ئارامیی پێ دەبەخشی.

هێشتا هەتاو نەکەوتبوو کە سەیران لە جێی هاتەدەرو تەواوی لەشی خۆی بە بسکەکانیەوە، بە پێست و نینۆکیەوەو بە چاوو گوێیەوە دایە بەر ئەو هەتاوە کە خەریك بوو دەرکەوێ. لە خەونی بێبڕانەوەی بەختەوەری دا ون ببوو، بێستان، ئەو ئاوە کە بە هاژە هاژ بەنێو وردە بەردەکان دا دەڕۆیشت و هەتا گوێزینگی پێی دەهات، دارە بێیەکان، پۆلی ئەو پەپوولانە کە وەك هەورێکی شین دەهاتن و لەسەر پشتی سەوزی قامیشەڵانەکە دەنیشتن و بنە چنارەکان، باڵندەکان، خەلیلە کۆسەو هەموو شتێك لەنێو بڵێسەو گڕی بەختەوەری دا لە دەوروبەری دەجووڵان.

لە کاتێك دا لەنێو هەژان و لەرزینی بێبڕانەوەی خۆی دا ون ببوو، جاروبار تەواوی لەشی دەبوو بە گڕێك و ئاگر لە هەناوی هەڵدەستا. دەت گوت ئەگەر قامك بەسەر پێستی دا بێنی، دەستت دەسووتێنێ.

لووتکی چیاکانی ڕۆژهەڵات روون بووەوە. سەیران تا ئەو ڕۆژە روون بوونی لووتکەکانی پێش تاوهەڵاتن نەدیبوو. پێش ئەوەی هەتاو بکەوێ، شووبایەکی نەرمی دەهات و زەوی هەڵمی لێهەڵدەستا. باڵندەکان گۆرانییان دەگوت. پەپوولەی گەورە گەورەی شین، زەرد، بنەوشی و

سوور بەو باڵانەیانەوە کە وەك تەڕ بن، وا دەهاتنە بەرچاو لە باڵەفڕە دابوون. مێشەنگوینەو کوللەو مێروولە لە هێلانەکانی خۆیان هاتبوونەدەرو چاوەڕێی دەرکەوتنی هەتاو بوون.

زەوی، ئاسمان، دار، ئاو، حەیوانات، باڵندەو جرو‌جانەوەر لە هەژانی بێ‌سەبرانەی ژیانەوەدا لە خۆشیی دەرکەوتنی هەتاو دا نوقم ببوون.

هەموو شتێك جوان و دڵگر بوو، هەموو شتێك لە خۆشی‌یان باڵی دەگرت. تاوێك دواتر هەتاو دەرکەوت. سەیران تا ئێستا هەتاوکەوتنیشی بەم جۆرە نەدیبوو. ئاسمان روون بوو و رەنگێکی شینی خەیاڵاویی بەخۆیەوە گرت. ئاسمان پاك و خاوێن و بریقەدار بوو. دەت گوت پاك پاك شوتوویانە، ئەوەندە پاك و تەمیز بوو، لە ئاسمان پەڵە هەورێکیش نەدەبینرا. تەنانەت پەڵە هەورێکیش باڵی لێك نەدەدا.

سەیران بەرەو ساووران وەڕێ کەوت. غاری دایە لای گۆمێك کە لەنێو دارە بی‌یەکان دا بوو. دەسبەجێ خۆی رووت و قووت کردەوە بازی دایە نێو ئاوی ساووران. روخساری و ئەندامی یەکجار رێك و پێك و باریك و راکشاوی لەسەر وردە بەردە سپی‌یەکان ڕاخرابوو. بە دڵێکی پڕ لە شادمانی‌یەوە راکشابوو و هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو. لە ترسی ئەوەی نەوەك کەس بی‌بینێ، خۆی پۆشتە کردەوە. تا ئێستا ئاو و تاوهەڵات و ئاسمانی بەم دڵگری و جوانی‌یە نەدیبوون و تا ئێستاش لە دنیایەکی وا جوان دا نەژیابوو. دنیا پڕ لە خۆشەویستی و شادی بوو، و شادی بە شێوەی پوولەکەیەکی درەوشاوە بەسەر جەیهان دا دەباری.

گوندیش لە خەو هەستابوو. لە کاتێك دا کەزیە تەڕەکانی دەهۆنیەوە هاتەوە نێو دێ. "عەلی ئەحمەد" یەکەم کەس بوو کە تووشی بوو. پیاوێك بوو حەفتا ساڵە کە هەر لە تەمەنی لاوەتی دا پشتی چەمابوو. راوەستا لە روخساری سەیرانێ ڕاماو گوتی:

"کچێ ئەتۆ چتە کچێ! ئەتۆ پێ‌دەکەنی، دەڵێی فریشتەی. ئەتۆ چت بووە؟"

سەیران چوو باوەشی بە شانەکانی‌دا کرد.

"کچە شێتەکە، هەی کچە شێتەکە! ئەتۆ چتە. چەندیش جوانتر بووی. هیچ کەس تۆی وا نەدیوە. بەڵام لە هەق نەگوزەرێین جوانتر بووی. رەگەزی تۆ دەچێتەوە سەر حۆری و فریشتە؟"

قەڵافەتی عەلی ئەحمەد، ریشە لە خەنە گیراوەکەی، پشتە کۆمەکەی و چاوە ریپۆقاوی‌یەکانی لەبەر چاوی سەیران جوانتر دیار بوون! عەلی ئەحمەدی تووڕەو تۆسن کە لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ لە منداڵانی دەدا، چەند پیاوی چاك بوو!

سەیران چووەوە ماڵەکەی و دەرگای سندووقەکەی کردەوە. بۆنی سێوی کوێستان، عەتری گوڵە مەخمەری و ڕیحانەی وشك و نێرگزو پنگ کە تێکەڵ ببوون لە وڵاتی گەڕا. داوێنی سەردەمی کچێنیی‌یەی کە زۆری خۆش دەویست و تا ئەو ڕۆژە تەنیا یەك جاری لەبەر کردبوو، لە سندووق دەرێناو لەبەری کرد. دیارە ئەگەر ئەمەش نەبووایە دیسان ئەو داوێنە یادگاری ڕۆژێکی شادیبەخشی ژیانی بوو. پاشان گەردن بەندێکی مەرجانی کە بە زێو و زێڕ دروست کرابوو و لەمێژ ساڵ بوو لەبیری چووبووەوە، لە ملی خۆی کرد. کەوشە پاژنە بڵیندە بریقەدارەکانی کردە پێی و پشتێندە شاڵە لاهوورەکەی لە پشتێ بەست، گوارە زێڕەکانیی لە گوێ کردو ئەنگوستیلە زێڕەکەی کردە دەستی و چووە بەر ئاوێنە. ماوەیەك لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی کرد. بەڕاستیش لە هەمیشە جوانتر ببوو. لەماڵێ هاتە دەرێ. سیلوێرگلین یەکەم کەس بوو کە بەم کەشم و نەشمەوە چاوی پێی کەوت. گوتی:

"ئە...ی! چەند جوان بووی. پێکەنین نیشتوەتە سەر لێوانت کچەکە. بۆخۆت هیچ ئاگات لێ‌یە؟ ڕوخسارت پێدەکەنێ، وەختێك پێدەکەنی، چەند جوان دەبی کچەکە! ئەتۆ خۆشحاڵی کچەکەم."

ڕوخساری سەیران و چاوەکانی کە برژانگێکی درێژیان هەبوو، پێدەکەنین.

"ئە...ی چەند جوان بووی سەیران!"

سەیران شانی ویشی لە ئامێز گرت و بە گەرمی گەردنی ماچ کرد. سەیران حەزی دەکرد هەموو کەس ماچ بکا. لێواولێو پڕ بوو لە خۆشحاڵی و هەژان. پێی خۆش بوو لەگەڵ هەرچی‌یەك بەرەوڕوو بێ، دۆست، دوژمن، مرۆڤ، دار، جانەوەر، مێشەنگوینە، هەمووان ماچ بکا. ئەگەر هەموو دنیای ماچ کردبایە هێشتا تێر نەدەبوو. لەمێژ ساڵ بوو ئەوینی گەرم و خرۆشاوی لەدڵی خۆی دا شاردبووەوە، و ئێستا ئەو ئەوینەو ئەو هەڵقوڵینە دەروونی‌یە هەموو لەمپەرەکانی شکاندبوون، سەرڕێژی کردبوو و هەڵدەڕژا. هەرکەس دەیدیت و هەرکەس دەستی دەگرت و تەماشای چاوەکانیی دەکرد، هەستی دەکرد ئەوین و خۆشەویستی لە دەستەکانی وی ڕا دەڕژێتە دەستانی و لە چاوەکانی ڕا دێتە چاوانیەوە.

سەیران پێدەکەنی، دەیلاواندەوەو ماچی دەکرد.

دەمەساتێك تۆزی خەفەت ڕوخساری وی داگرت، بەڵام خێرا سڕیەوەو لە خۆی دوور خستەوە. سەیران چوو بۆ لای ماڵێ دایکی و براکانی کە لە گەڕەکێکی دیکەی ئاوەدانی بوون. دایکی وەختێك چاوی پێی کەوت کە بۆ لای ماڵێ دێ، لە ژوورێ هاتە دەرو بەپیریەوە چوو.

براكانی، براژنەكانی، مندالّەكان، خزم و خوێش و كەس و كار هەموویان هاتبوونە دەرێ و بە پێشوازیەوە دەچوون. سەیران بە پێكەنینەوە ئامێزی بەدایكی دا كردو پاشان دەستی ماچ كرد. دایكی دەگریاو لە پەستا بۆنی بە بسك و روومەتی كچەكەیەوە دەكردو ماچی دەكردو دەیگوت:"كەوایە ئێمەت بەخشیوە. بریا بابت مابایەو ئەم رۆژەی دیتبایە ـ لەبەر هەنیسك دان خەریك بوو بخنكێ ـ بابت هەتا دواهەناسە بە عەزرەتەوە بوو بت بینێ. ئێستا ئێسقانەكانی بابت لەنێو گۆڕەكەی دا ئاسوودە بوون. ئێمە زۆرمان خەراپە دەرهەقی تۆ كرد كچم. بەلاّم ئەتۆ ئینسانەتیت كردو لێمان خۆش بووی."

دایكی وەك هەوری بەهار فرمێسكی هەلّدەڕشت.

براكانی و خزم و كەس و كارەكەی هاتنە لای و یەكتریان ماچ كرد. خەفەتی گەورەی دەروونیان ئەمڕۆ لە رۆژان زیاتر بوو. "سەیران چیی ببوو، هۆی ئەم گۆڕانە چ بوو؟ روخسارێك كە هەرگیز پێنەدەكەنی و چاوە فرمێسكاوییەكانی بۆچی وا پێدەكەنین؟" بەلاّم نە وەختی پرسینی ئەو شتانە هەبوو، نە كاتی بیر لـێكردنەوەیان.

دایك، براكان، بووكەكان وەك رۆژانی جێژن و زەماوەند خۆشحالّ بوون. ئەوانیش هەتا ئەو كاتەی سەیران پێنەكەنیبوو، لەدلّەوە پێنەكەنیبوون.

ئێستا هۆی ئەم گۆڕانە هەرچییەك بووایە گرنگ نەبوو. گرنگ ئەوەبوو سەیرانێك كە چەندین سالّ لەبەری پاڕانەوەو بۆ ئەوەی جاروبار چاویان پێی بكەوێ، مالّ و ژیانیان بەجێ دەهێشت و وەدوای دەكەوتن بۆ چوكووراوا، سەیرانێك كە لەو ماوەیەدا تەنانەت یەك جاریش قسەیەكی لەگەلّ نەكردبوون، زەردەی نەهاتبووە سەر لێوان و چاوی لە چاویان نەكردبوو، ئێستا دەم بە پێكەنین و بە ئارەزووی خۆی، ئەویش ئاوا بە خۆشحالّی و بەختیاری بە لاقی خۆی هاتبووە سەردانیان.

دایك گێژو سەرسوڕماو لەنێو مالّێدا راوەستابوو، نەیدەزانی چ بكاو نەیدەتوانی چاوە مۆلّەق ماوەكانی لە روخساری كچە جوانەكەی هەلّگوێزێ.

ئەم سەردانەش سەیرانی قانیع نەكرد. خۆشحالّی دایك و براكانی و مندالّەكان هەژانی دەروونیی ئەویان ئارام نەكرد. بە پێچەوانە بەرە بەرە كەف و كولّەكەی سەرڕێژی دەكرد. لەنەكاو لە مالّێ دەرپەڕی و بە پێكەنینەوە گوتی:"دووبارە دێمەوە."و رۆیشت.

تەنیا پاش رۆیشتنی وی بوو كەدایكی و براكانی لە بارەی هۆی خۆشحالّیی سەیران و چاوپۆشی و لـێبووردنی دەرهەق بە خۆیان كەوتنە فكرەوە. بەلاّم هەرچەندی لەو بارەیەوە زیاتر بیریان كردەوە، كەمتر بە ئاكام گەیشتن.

دایك هاواری كرد:

"فكری لێ‌مەكەنەوە. هۆیەكەی هەرچی بێ، جێی لەسەر گلێنەی چاوەكانمە. هەر كارێك پێی خۆشە با بیكا. بەو ئاخری عومرییە خۆشحاڵی كردم. ئاخ كچەكەم، جوانكیلەكەم، سەیران."

براكانیشی ورەیەكی تازەیان پەیدا كردبوو.

چارەنووسی سەیران و چوونیان بۆ چوكووراوا دڵیانی بە خەم و خەفەت شەقار شەقار كردبوو. براكانی لەوە كە سەیران زویر ببوو و لە گوناهەكانیان خۆش نەدەبوو و ئەوانی بە مایەی چارەڕەشی‌یەكانی خۆی دەزانی، هەمیشە پەشێوحاڵ و دڵپەرۆش بوون.

بابیشیان هەر بەم ئازارەوە دیقی مەرگی كرد. لە چوكووراوا براو كەس و كارەكەی سەیران هەر لەبەر ئەوە چاوترسێن ببوون وخۆیان لەهیچ كارێك هەڵنەدەقوتاند. سەیران بەو خۆشحاڵی و دەم بە پێكەنینی‌یەی خۆی گیانێكی تازەی بەبەر خەڵكی دیكەش دا كردبوو.

سەیران بە غاردان چووە ماڵی دایەقەمەر. دایەقەمەر بە سام گرتوویی لەگەڵی بەرەوڕوو بوو:

"چت بووە كچەكە؟ چت بەسەر هاتوە. لە دێی دا هەموو هەر باسی تۆ دەكەن. دەڵێن خۆت رازاندوەتەوەو چوویەوە ماڵی دایكت. راستە؟ ئەتۆ چت بووە؟"

سەیران لە كاتێك دا گۆناكانی دە چاڵ كەوتبوون، پێ‌دەكەنی، بەو وەزعەوە كە چووبووە خەیاڵێكی شیرن و شادمانی‌یەكی منداڵانەوە، لە هەموو وەختێك جوانتر بوو.

"كچەكە ئەتۆ چت لێ بەسەر هاتوە؟"

دایەقەمەر دەستی بەسەری‌دا هێناو ماوەیەكی دوورودرێژ لە ڕوومایەوە ڕاما. پاشان پرسی:

"كچم، سەیران. ئەتۆ زۆر جوان بووی. كەس نازانێ. مەسەلە چیە؟"

سەیران سەری داخستبوو، وەڵامی نەدەدایەوە. پاش چەند لەحزەیەك سەری هەڵبڕی. ڕوومەتی سوورو گڕگرتوو بوون. گوتی:

"دایەقەمەر... دایەقەمەر..."

بەڵام قسەكەی تەواو نەكرد.

قەمەر بەبێ سەبری گوتی:

"دە قسە بكە كچم. چما دەتەوێ ناوەكەم ڕەوان بكەی، هەر دەڵێی دایەقەمەر، دایەقەمەر!"

سەیران دیسان سەری داخست.

دایەقەمەر بە نەرمی و میهرەبانی گوتی:

"کچم، پێم بڵێ چ بووە. رووداوێکی باشت هاتوەتە پێش. پێم بڵێ مەسەلە چیە. بە دایکێ خۆت بڵێ..."

سەیران دیسان سەری بەرز کردەوە. چاوە ڕەشە گەورەکانی دەدرەوشان. چاوەکانی سەرانسەر ببوونە ئەوین و دەیان ڕوانی. گوتی:

"دایە، با بچینە وێ، لەگەڵم وەرە بچینە سەر بێستان."

دایەقەمەر خۆشحاڵ بوو. پێکەنی و گوتی:

"ئاوا! کەوایە، ئەوە پێکەنینی هێناوەتە سەر لێوت... هەی کچە شێتەکە..."

پاشان باوەشی پێدا کردو بەگەرمی بە خۆیەوە گوشی:

"هیچ کەس تەنانەت دایکیشت نابێ بزانێ، نابێ بۆن بکا. کچە شێتەکەم، کچە شێتەکەم، کچە شێتەکەم."

دایەقەمەر لەگەڵ دووپات کردنەوەی "کچە شێتەکەم" بەسپایی دەستی لە پشتێ دەداو مووەکانی ماچ دەکرد:

"کچە شێتەکەم ئەگەر هەر ئێستا بچین هەموو تێدەگەن مەسەلە چیە. هەموو خەلکی ئاوایی باسی تۆ دەکەن. دەڵێن:"سەیران چیی بووە، خۆشحاڵە!" پاشان بیانوویەك دەبینینەوەو دەچین."

"دایە ناتوانم، دڵم تاقەت ناگرێ. دایە یارمەتیم بدە. هەتا ئێستا شتی وام بەسەر نەهاتوە."

دایەقەمەر بە پێکەنینەوە گوتی:

"هەمیشە وایە کچم. ئەوینێکی راست و خاوێن بنیادەمی بێئارام دەکا. خوێنی ئادەمیزاد دێنێتە کوڵ."

دەستی سەیرانێی گرت و گوشی.

سەیران بە پاڕانەوەوە گوتی:

"دایەقەمەر بە قوربانت بم، وەرە بچین. ئەتۆ بۆخۆت دەتوانی تێم بگەی. لەو ڕۆژەوە ئەوم دیوە خەریکە دەمرم."

وەسمانەزلە هاتەوە ژوورێ. کە چاوی بە سەیران کەوت، بە خۆشحاڵی گوتی:

"دایەقەمەر، کچە شێتەکەمان چیی بووە؟ پێدەکەنێ. هەموو خەلکی ئاوەدانی باسی دەکەن. دەڵێن:"پێکەنیوە، پاشانیش چووەتە ماڵێ دایکی و براکانی." ئەتۆ پێت وایە مەسەلە چیە؟"

دایەقەمەر بە قەڵسیی‌یەوە گوتی:

"هیچ نەبووە. دێهاتی‌یەکانیش با بڕۆن لاچن. کارو کاسبی‌یان بەجێ‌هێشتوە هاتوون باسی پێکەنینی کچەکە دەکەن؟ بنیادەم خۆ هەمیشە حاڵەتێکی نیە... دەگری... پێ‌دەکەنێ... وانیە وەسمانەزلە؟ ئەمە چما قسەی تێدایە؟ ئەم دێهاتی‌یانەش با بڕۆن لاچن. کچەکە کارێکی خەراپی کردوە چووە لەگەڵ دایك و برایانی ئاشت بووەتەوە، بەڵێ؟ کارێکی خەراپی کردوە؟"

"دەقیقەیەك هەڵمەچوو دایەقەمەر. دەتەوێ چونکە دێهاتی‌یەکان باسی سەیرانێ دەکەن، دەسبەجێ بچم هەموویان وەبەر تفەنگان بدەم؟ گۆڕانێکیان لە حاڵی کچەکەدا دیتوەو لەو بارەیەوە قسە دەکەن. ئەمە ئیدی شتێك نیە، دایە قەمەر بۆ تووڕە بوونیش نابێ. خۆ دێهاتی‌یەکان لەبارەی سەیرانەوە فکری خەراپ ناکەنەوە. خۆشحاڵن لەوەی ئەویان بە خۆشحاڵی دیوە."

دایەقەمەر دیسان بە توندی گوتی:

"چما قەرار بوو لەبارەی کچەکەوە فکری خەراپیش بکەنەوە؟ قسەی لابەلا!"

وەسمانەزلە بەنەرمی گوتی:

"دایەقەمەر جارێ قسەت لەگەڵ ناکرێ. جارێ ئەتۆ ئاگرت گرتوە."

"ئەتۆ وای حیساب بکە. باشە چ بوو؟"

پاشان چوو بۆ لای دەرگاو لە کاتێك دا دەستی سەیرانێی گرتبوو، بەدوای خۆی دا رادەکێشا، گوتی:

"وەسمانەزلە. ئەتۆ ئەمشەو بۆ نان خواردن بچووە لای کوڕەکانت. ئەمن ئەمشەو لە ماڵ نیم. قەرارە لەگەڵ سەیرانێ بچینە قامیشەڵانی خوارێ."

ڕۆیشت و بە جادەکەی پشت ماڵێ دا وەڕێ کەوتن. جادەکە پڕ لە تۆزوخۆڵ بوو و تۆز دەگەیشتە گوێزینگان. گڵ وەك ژیلەمۆ دەچووە نێو قامکی لاقیان و دەی‌سووتاند. هەتاو کە لە پشتەوە لێی دەدان پشت و پشت ملی دەسووتاندن. گیاوگۆڵ و پەلکە گوڵەکانی قەراخ جادە لە تۆزوخۆڵ دا سپی ببوون و خڕ ببوونەوە. لاسکی ئەو گۆزروان و چڵە دڕکانە کە هەتاو نەی‌سووتاندبوون و تەڕ بوون بە نینۆکە شەیتانەی بەقەدەر دوگمەیەك داپۆشرابوون. سەیران نینۆکە شەیتانەی زۆر ناخۆش دەویست، بەڵام لەو لەحزەیەدا ئەوانیش لەبەر چاوی جوان بوون.

سەیران لە پێشەوە دەکرێ بڵێین غاری دەداو دایەقەمەریش بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا بی‌گاتێ. دایەقەمەر پشووی سوار ببوو. ئەمجار ئارەقیش بەجۆلاوکە لە لەشی دەچۆڕا. سەرەنجام لە دواوە بانگی کرد:

"راوەستە کچەکە، راوەستە! ناتوانم بت گەمێ راوەستە!"

سەیران وەختێك ئاوڕی دایەوە، دیتی زۆری دایەقەمەر بەجێ هێشتوە. بەخۆدا شکایەوە. هەر لەوێ راوەستاو چاوەڕوانی دایەقەمەر ما. دایەقەمەر پاش ماوەیەکی درێژ شەکەت و ماندوو لە کاتێك دا بەزەحمەت لاقی لە دوو دەهاتن پێی گەیشتەوە. هەناسەی سوار ببوو:

"مردم هەتا پێت گەیشتمەوە. خەریکە دەمرم. وەی ئەژنۆم، وەی! داد لە دەستی پیری."

سەیران کە لە گێژی و گوێ پێنەدانی خۆی شەرمەزار بوو، تەماشای دایەقەمەری نەدەکرد. دایەقەمەر بۆ ئارام کردنەوەی سەیران بە پێکەنینەوە گوتی:

"بۆچی پەلە دەکەی. هەر دەگەینە بێستانی. پێش رۆژئاوابوون دەگەینێ..." دایەقەمەر خۆشحاڵ بوو و پێدەکەنی.

هێشتا تێر نەحەسابووەوەو دانەنیشتبوو، سەیران راست بووەوەو قیت راوەستا. بە هیچ جۆر نەیدەتوانی دانیشێ. خۆی پێ راگیر نەدەکراو سەبری نەبوو. دایەقەمەر کە ئەمەی دی زۆر دانەنیشت، ئەویش هەستاو دووبارە لەو گەرمایەدا وەڕێ کەوتن. سەیران پاش چەند لەحزە دیسان فکری رۆیشت. دایەقەمەری بەجێ هێشت و لێی دوور کەوتەوە. بەڵام دایە قەمەر لە دواوە بانگی نەکرد. سەیران بەنێو تۆزوخۆڵ دا لە جیاتی رۆیشتن دەفڕی. زۆری پێ نەچوو ئەوەندە دوور کەوتەوە کە لە پێش چاو ون بوو.

دایەقەمەر دوای ماوەیەکی دووروودرێژ گەیشتە بێستان. سەیران لە شەرمان تەماشای روخساری وی نەدەکرد.

خەلیلە کۆسە لە حاڵێك دا بەغاردان دەچوو بۆ لای دایەقەمەر، گوتی:

"چاکتان کرد هاتن. ئەمڕۆ دوو کەودەریم کوشتوون. یەکێکمان بۆ بکە بە کەودەری پلاو ئەوی دیکەشیان بەرەوە بۆ مام وەسمان، باشە؟ کەودەرییەکان زۆر چەورو چۆڵن."

حەمەدیش غاری دا هات و دەستی دایەقەمەرێی ماچ کرد. دایەقەمەر تەماشای کرد، روومەتەکانی حەمەد خوێنیان تێگەڕابوو. چاوەکانیشی وەك رۆژان تۆزاوی و مردوولە نەبوون. نەختێك دەدرەوشانەوە:

"بەخێراتی دایە. وەڕەزیم کردبووی. مام وەسمان چۆنە؟ لەنێو دێی چ خەبەرە؟"

دایەقەمەر وەڵامی دایەوە:

"خۆشیت."

قەمەر لە بنەوە چاوی لە سەیرانێ دەکرد. سەیران لە خۆشییان سوور هەڵگەڕابوو، پشووی سوار بوو و قەوەزەی سنگی بە توندی هەڵداو پێدای دەکرد. لەشی دەلەرزی. بەڵام حەمەد هەر

ئاگای لەو باسە نەبوو. ئەم مەسەلەیە سەرنجی دایەقەمەریی ڕاکێشاو لە دڵی خۆی دا گوتی:"وەی کچە بێچارەکەم، وەی. هەر ئاگاشی لە حاڵی تۆ نیە! کارەکەت وای بەسەر هات؟ خۆ ئەو تەنانەت چاویشی لە روخساری جوان و بەژن و باڵای شۆخ و شەنگ و چاوی رەش و ئەو خۆڕازاندنەوەیەت نیە.

وەك گەڵای دار لە بەردەمی دەلەرزی، ئەو هەر ئاگاشی لـێنیە... روومەتت وەك هەنار گوڵی کردوە، زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەقی دەرڕشتوە، ئەو هەر ئاگاشی لـێ نیە... سەیرانەکەم، کچە بێبەختەکەم. دیسان سووتای... خۆ ئەمن نەم دەزانی مەسەلەکە وایە. پێم وابوو ئەویش دەزانێ. ئا...ی کچە بەخت رەشەکەم ئا...خ رۆژێکی خۆشت نەدی. ئا...خ ئێستا چ دەکەی کچە جوانە بەخت رەشەکەم؟ تەنانەت خەلیلە کۆسەش پێی زانیوە، کەچی ئەو مێشێکیشی لـێمیوان نیە."

سەیران بە هیچ جۆر ئاگای لەوە نەبوو کە حەمەد سەرنجی دەداتێ یان نا. چاوی حەبەساو و جادوولـێکراوی لە روخساری حەمەد نەدەگوێزتەوە. نە هیچی دەگوت و نە هیچی دەبیست و نە لەو بەولاوە هیچی دەدی. تەنیا تەماشای وی دەکرد. هەتا لای ئێوارێ لەبەر سێبەری فێنکی بێیەکان دانیشتن. حەمەد کەمێك هاتبووەوە سەرخۆی، بەڵام دیسان قسەی نەدەکردو هەمیشە لە فکردا بوو. تووشی سەرلـێشێواوییەکی بەسام هاتبوو.

دایەقەمەر لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"پیاو ئەوەندە جحێڵ بێ، سەڵت بێ و کچێکی جوانی وەك سەیرانێ ئاوا خۆی بۆ بڕازێنێتەوەو لە چاوانیەوە رامێنێ، چۆن تەماشای ناکا؟ چۆن حاڵی نابێ و تێناگا؟ ئەم کوڕە تێك چووە، جندۆکە دەستیان لـێوەشاندوە. بنیادەم مێشکی ساغ بێ چۆن دەکرێ کچێکی وا جوانی وەك سەیرانێ لەبەر دەمی راوەستێ و ئاگای لـێنەبێ؟ وەی حەمەد وەی! وەی بێچووە شێرەکەم وەی! کێوو بەندەن، برسیەتی، نەداری، ئاغا بێدینەکان و جەندرمە بێویژدانەکان حاڵێکیان بەو بەستەزمانە نەهێشتوە..."

سەیران زۆر بە توندی زەجری دەکێشاو دڵی لە خەفەتان دا شەقار شەقار بوو. وەختێك خوا حەز نەکا، بنیادەم ناتوانێ رووی خۆشی و ئاسوودەیی ببینێ. لە سەرەتادا ئەوینی عەزیز، ئەوینێك کە خزم و کەس و کارەکەی دژی راوەستان، ئەوینێکی بێئاکام و ئێستاش ئەوینی حەمەد... کچەکە هەتا مردن لە ئاگردا دەسووتێ، لە ئاگری ئەم ئەوینە بێبەرهەم و خۆڕاییەدا دەسووتێ. سەیرانی بەستەزمان بزانە چۆنی تێوە ڕاماوە، شێت و شەیدا بووەو ئاگای لە خۆی بڕاوە! ئەوی دیکەش هەروا بزانە هیچ نەبووە...

حەمەد لە نەکاو سەری هەڵێنا، چاوی لە چاوی دایەقەمەرەوە بڕی و بە هەڵچوون و هەژان و بەدەنگێکی لەرزۆکەوە پێی گوت:

"دایە! ئەتۆ ژنێکی ئاقڵ و بە ئەزموونی. دەمەوێ شتێکت لێبپرسم."

پاشان بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە. باسی دایکی، خەجیج، منداڵەکەی، و نایب ڕەجەب کە بە یەکجاری لە گۆلاوی ئاکچاسازدا خەوتبوو، جەبار، عەلیەشەل و سڵەمانەزلەو دورمووش عەلی و دایەحۆری و بە کورتی باسی هەموانی کرد. مەسەلەی هەمزەو وەزعی ئێستای دێی باس کرد، لەبارەی سمایلەزلەوە قسەی کردو لە کورتی بێبڕینەوە هەرچی بەسەری هاتبوو، یەك بە یەك گێڕانیەوەو سەرەنجام گوتی:

"دایە، ئەتۆ ژنێکی بە ئەزموون و ساردو گەرم دیتوو و دڵپاکی. ئەتۆ پێم بڵێ ئەمن چ بکەم؟ عەبدیخان ڕۆیشت هەمزە هات. هەمزە بڕوا بەکر دێ. عەلی سەفابەگ دەڕوا..."

دایەقەمەر قسەکەی لێوەرگرت:

"کەنعان دێ."

"پاشان دووبارە خەڵکەکە لەگەڵم دەبنە دوژمن، نەحلەت بارانم دەکەن و دوایەش هەموو شەوانی هەینی فاتیحە بۆ رووحانەتی عەلیسەفابەگ دەنێرن."

دایەقەمەر لە فکرەوە چوو. زۆری بیر کردەوەو ئاخرەکەی گوتی:

"لێم ببوورە حەمەد. ئەمن هیچم بە ئەقڵ ناگا."

حەمەد رووی کردە سەیران و گوتی:

"خوشکێ بیروڕای تۆ چیە؟"

بۆ یەکەم جاریش سەرنجی بۆ لای جوانیی سەیرانێ ڕاکشا. خۆڕازاندنەوەکەشی هەر سەرنجیی ڕاکێشا. لە دڵی خۆی دا گوتی:"دەکرێ بنیادەم ئەوەندە جوان بێ، لە دنیادا ژنی ئەوەندە جوانیش پەیدا دەبێ؟"

سەیران لەبەرخۆیەوە لەزری و بێدەنگ بوو. سوور بوو، بنەوشی بوو، شەلاڵی ئارەق بوو. دەستی سڕ بوون و تف لە زاری دا وشك بوو.

حەمەد لەسەری ڕۆیشت:

"سڵەمانەزلە دەیگوت، تێکۆشان، شەڕکردن و پێش بە زۆردارگرتن هەقە. بیروڕای تۆ چیە؟ ئەتۆ دەڵێی چی؟ وەختێك ئاکامی نەبێ، سوودی چیە بنیادەم لەگەڵ زۆرداردا بەشەڕ بێ و تێکی بشکێنێ. بیروباوەڕی تۆ چۆنە؟"

سەیران زۆری قسە لە دڵ دا بوون کە بیان کا. بەڵام نەیدەتوانی قسە بکا. زمانی گیرابوو، ئەمجار لەوەش دەترسا کە ئەگەر قسە بکا دەنگەکەی هەموو شتێکی لێ‌ئاشکرا بکا. ئاخرەکەی چاوی لە زەوییەوە بڕی و بە دەنگێکی بەسپایی گوتی:

"نازانم کاکە، ئەمن ئەو شتانە نازانم. هەر هیچیان لێ‌نازانم. ئەتۆ حەمەدۆکی. ئەتۆ ئەو جۆرە شتانە لە هەموو کەس، لە هەمووی مەمانان باشتر دەزانی."

دایەقەمەر دەسبەجێ هەر لەوێ ئاوری کردەوە. خەلیلە کۆسە بڕۆیش و مەنجەڵێکی مسی سپی‌کراوەی هێنا لە پەنا دایەقەمەر دای‌نان. مەنجەڵی خەلیلە کۆسە لەبەر خاوێنی دەبریسکایەوە. دایەقەمەر ئێرەیی بە خاوێنیی مەنجەڵی خەلیلە کۆسە دەبرد. خوێ و ڕۆنەکەرەیان هەبوو لەگەڵ کەودەرییەکی قەڵەوی هێندی مریشکێك... دایەقەمەر بە سەلیقەوە پلاوبڕۆیشی دەم کرد. ڕۆنەکەرەی چۆقاوی بە چزەچز پێدا کرد. ڕۆژبایەکی نەرمی هەڵکردبوو. با بۆنی پلاوەکەی هەتا دووری لەگەڵ خۆی دەبرد.

سەیران لە جێی خۆی نەدەبزووت. هەر لەوێ وشك ببوو لە حەمەدەوە ڕامابوو.

حەمەد پڕ بە سی‌یەکانی بۆنی پلاوەکەی هەڵمژی و گوتی:

"دەستت نەڕزێ دایە. تەنیا دایکانی باشی وەك تۆ دەتوانن پلاوی بۆن خۆشی وەك ئەم پلاوە دەم بکەن."

دایەقەمەر بە قەڵسی‌یەوە بە سەیرانێی گوت:

"هەستە کچێ، بۆ لەوێ ڕەق بووی. هەستە سفرەکە ڕاخە."

سەیران دەسبەجێ ڕاپەڕی، سفرەکەی لە کەپرێ ڕا هێناو کەمێك لەولاتر لەسەر زەوی ڕای‌خست. بادی‌یە دارەکە ئاوێکی فێنکی تێدابوو. هەر تاوێك پێشتر خەلیلە کۆسە لە کانی‌یەی هێنابوو. چوارپەچوار لە دەوری سفرەکە دانیشتن. کەودەری‌پلاوەکەیان بە ئیشتیاوە خوارد. لەباری خواردن و خۆراکەوە حەمەد بە باشی وەخۆ کەوتبووەوە. ئەی باشە بۆ تا ئەو ڕادەیە لە سووتان و برژانی ئەو کچە جوانە بێ‌خەبەر بوو و بۆچی وا گوێی لێ‌خەواندبوو؟ کەم بوونی شتێك لە وجوودی ئەم کوڕیژگەیەدا هەست پێ‌دەکرا. ئەو کەمایەسی‌یە چ بوو؟

پاش نان خواردن، دایەقەمەر ویستی دەفرەکان بشوا. بەڵام خەلیلە کۆسە نەی‌هێشت. بڕیاری دابوو بۆخۆی بیان شوا.

هەتاو خەریك بوو ئاوابێ. سێبەرە ڕەنگاوڕەنگەکانی خۆرئاوا خۆیان دەنواند. هەتاو خۆی گەیاندبووە پشتی ئاناوارزاو بە ئەسپایی خۆی لە دەشتێ دەدا. سەیران بێ‌ئەوەی ئاگای لە خۆی

بێ، چاوی لە حەمەدەوە بڕیبوون. خوا کەس تووشی ئەو سەوداسەرییە نەکا. دایەقەمەر دەیەویست هەستێ. بەڵام کە چاوی بە سەیرانێ کەوت لە بڕیارەکەی پەژیوان بووەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی:"با بەستەزمانە کەمێکی دیکەش چاو لە روخساری دڵدارەکەی بکا."

سەرەنجام هەتاو ئاوا بوو. تاریك داهات. لەبەر تاریکی بە زەحمەت روخساری حەمەد دەبینرا. بەڵام سەیران هێشتا چاوی لێوەرنەدەگێڕا. دایەقەمەر بیری کردەوە:"دنیا تاریك بووە، ئیدی شتێك نابینێ. کوڕەکەش خۆ هەر ئاگای لەو باسانە نیە... ئەگەر هەشی بێ، دیسان فایدەی چی، چەتەیەك هەمیشە کفنی خۆی پێیە... هەرچۆنی بیری لێبکەیەوە، دیسان سوودی نیە." دایەقەمەر لە نەکاو هەستاو لە کاتێك دا دەیگوت:"هەستە کچێ، درەنگمان بەسەرهات" وەڕێ کەوت:

"خواحافیز کوڕینە، ئەگەر کارێکتان هەبوو، ئێمە سبەینێ یان دووسبەی دیسان دێینەوە."

حەمەد بە غاردان چووە نێو گوڵزارەکە. دوو دەسك ڕیحانەو گوڵە مەخمەریی هەڵپساندن و هێنانی، دەسکێکی دا بە دایەقەمەرو ئەوی دیکەی وەسەیرانێ دا.

وەڕێ کەوتن. سەیران پەیتا پەیتا ئاوڕی دەدایەوەو تەماشای دواوەی دەکرد. هەنگاوێکی هەڵدێنایەوە، پاشان ئاوڕی دەدایەوەو تەماشای دواوەی دەکرد.

شەوێکی مانگەشەو بوو. نەك هەر حەمەد، بەڵکوو بێستانەکەش بەو هەموو پانی و بەرینایی خۆیەوە لە تاریکێ دا دیار نەبوو. کەچی سەیران دیسان ئاوڕی دەدایەوەو تەماشای دواوەی دەکرد. لاقی لە دوو نەدەهاتن. ئەم جارە دایەقەمەر پێش کەوتبوو، و وەختێك دەیدی زۆری سەیران بەجێ هێشتوە لاقی دەگرتەوە تا بیگاتێ. بەو رۆیشتن و راوەستانانەوە گەیشتبوونە نیزیك ئاوەدانی کە سەیران لەدواوە بانگی کرد:

"راوەستە دایەقەمەر، راوەستە. دەترسم."

دایەقەمەر راوەستا بۆ ئەوەی سەیران بیگاتەوە. وەختێك سەیران پێی گەیشتەوە، لێی پرسی:

"لە چ دەترسێی؟"

سەیران لێی نیزیك بووەوە. قۆڵی گرت و ناڵاندی:

"دەیکوژن. دایە دەیکوژن. تا ئێستا قەت بیستووتەو دیوتە یاغییەك تا ئاخر بژی؟ تەنانەت گزیك دزرانیش کوژرا. دایە ئاخرەکەی دەیکوژن." دایەقەمەر بێدەنگ بوو، و سەیرانیش بێ راوەستان قسەی دەکرد. دایەقەمەر وەڵامێکی نەدەدایەوە. سەرەنجام وەقسە هات و گوتی:

"نوخشەی خەراپی لـێمەدە کچم، کێ دەیکوژێ؟"

سەیران گوتی:

"هەموو، هەموو. ئاغاکان، جەندرمەکان، حکومەت هەموو بە خوێنی سەری تینوون."

دایەقەمەر گێژ ببوو. چاوەڕوانی و ئامادەیی ئەو جۆرە پرسیارو وەڵامەی نەبوو. لەلایەکیش باوەڕی وەك سەیرانێ وابوو. تا ئێستا نەبینرابوو یاغیەك تەمەنی درێژ بێ. بە تایبەتی چما دەیان هێشت یاغییەکی وەك حەمەدۆك بە زیندوویی دەرچێ؟ داروبەردو کێو و باڵندەو پێڕۆو ئاغاو خان هەموویان بە چەکداری بەدوایەوە بوون.

دایەقەمەر دەیگوت:"گوللە کاری لـێناکا. ئەو بریسکەی پێیە. دوعای چاوەزارێی پێیە. حەزرەتی خدریش دەستی بە پشتێ دا هێناوە"و بە پێی قاعیدە دەبوو ئەم مەسەلەیە ببێتە هۆی دڵئاسوودەبوونی سەیران. بەڵام گوێی لـێنەبوو و بە هیچی دەگرت...

لەپەستا دەیگوت:"دەیکوژن، ئاخرەکەی دەیکوژن."

"ئەو بریسکەی پێیە. بریسکەی پێیە. ئەدی..."

دیارە دایەقەمەر بۆخۆشی باوەڕی بە قسەکانی خۆی نەبوو.

"جگە لە چاوانی گوللە کار لە هیچ کوێیەکی لەشی ناکا."

سەیران بن پیلی دایەقەمەرێی گرتبوو و ئەوی بۆ لای ئاوەدانی رادەکێشا. دایەقەمەریش لێکدا لێکدا دووپاتی دەکردەوە:

"جگە لە چاوەکانی گوللە کار لە هیچ کوێی ناکا... خۆ ئەویش لە چاوەکانی وریایە..."

## (٤٤)

عەلی سەفابەگ پاش بیرو بەرژەوەندێکی زۆر، گەیشتە ئەو ئاکامە کە نابێ چاوەڕوانی کۆمەگ و یارمەتیی هیچ کەس بێ. بەڵکوو دەبێ بۆخۆی لە فکری چارەدا بێ و بۆخۆی بڕیار بدا. وادیار بوو قایمەقام و پارێزگاریش لە ترسی پاشەڕۆژ خۆیان تووشی مەسەلەی چۆڵ کردنی گوندی وایوای ناکەن. قایمەقام لەمێژ بوو ئەو قسانەی لە وایوای کردبوون، خواردبوونیەوەو بڕیارەکانی خۆی لستبوونەوە.

عەلی سەفابەگ بە راوێژێکی تێکەڵ بە سووکایەتی ناوی دەبردن و دەیگوت:

"ئەمەش بوو بە حکوومەت؟ ئەوە پیاوەکانی، ئەوە قایمەقامەکەی، ئەویش پارێزگارەکەی! کوڕە ئەمانە لە کێلگەکەم دا بە نۆکەریش ڕاناگرم! وەڵڵاهی بیللاهی بە نۆکەرییش رایان ناگرم. مستەفا کەمال پاشاو عارف صائم بەگیش دڵیان خۆشە کە مەملەکەت رادەگرن. خەیاڵیشیان تەخت تەختە. حکوومەتی وا مرتەزا کاراداغلیی خۆشمان دەیتوانی پێکی بێنێ! زۆریش باشترو رێك و پێکتر!"

پیاوە ئازاو بە ئەزموونەکانی چیك چیك لارو هەروەها کەسانی دیکەی کە دەیان توانی چەك هەڵبگرن لە دەوری خۆی کۆ کردبوونەوە. لەبارەی دوا زەبری کاریگەرەوە کە پێویست بوو لە وایوای بدرێ، شەووڕۆژ تەگبیرورِایان دەکرد. ئەمجار باڵەخانەکەی نێو کێلگەشیان کردبووە قەڵایەکی قایم. لە پشت دەرگاو پەنجەرەکانەوە تەلیسە خیز هەڵچنرابوون و ماڵەکە پڕ کرابوو لە فیلینتای نوێی ئەڵمانی و سندووقە فیشەك و دەمانچەو نێزەو دووربین و کڵاوی سوورو جل و بەرگی سەربازی... ون بوونی زەینەڵ و ئادەم چاکی ترساندبوو. وا دەهاتە بەرچاو کە جووتیارەکانی وایوای پتر پێیان لێ‌هەڵێناوەو تەماعیان لە گیانی کردوە.

زەکەریا خەبەری هێنا کە:

"جێ نەماوە نەمان پشکنیبێ، کەس نەماوە لێمان نەپرسیبێ... نە زەینەڵ و نە ئادەم سەرو سۆراغیان دیار نیە.

دێهاتی‌یەکان و یەك لەوان ژنەکەی دەڵێن زەینەڵیان خنکاندوەو لە ئاکچاسازیان هاویشتوەو شرت و گومیان کردوە. دەڵێن یۆبازئۆغڵیش ئادەمی شرت و گوم کردوە.

زۆریان بۆ گەڕام. نە بە زیندوویی دیار بوون، نە بە مردوویی."

ئەو رۆژە بەیانی عەلی سەفابەگ هەر کە لەخەو هەستابوو، فەرمانی ئامادەبوونی دابوو. وەڵامی بۆ خەڵکی وایوای ناردبوو کە دەیەوێ بچێتە وێ، چاوەڕوانی بن.

نیازی بوو هەر ئەو رۆژە چەکمە زەردەکانی، کە زەکەریا زۆر جوان بۆی بۆیاخ کردبوون لەپێ بکا، پانتۆڵە خاکی‌یە ئەفسەری‌یەکەی دەورانی "شەڕی سەربەخۆیی" کە هێشتا نوێ بوو لەبەر بکا، زنجیرە زێڕەکەی کە لەمێژ ساڵ بوو بەکاری نەهێنابوو، وە بەرۆکی بخاو کڵاو گەرگەرییە رەشەکەی بکاتە سەری.

جلکەکانی لەبەر کردو خۆی رازاندەوە" سمێڵەکانی بادان، ناقانە دەسك سەدەفەکەی لە کەلەکەی چەپی بەست، فیشەکدانە جوانە گوڵدۆزی‌کراوەکەی لە قەدی دا. کلکەوانە زێڕە گەورەکانی لە قامکەکانی کرد. چونکە خەڵکی لادێ زۆریان رێز لە زێڕو چەك و سەرباز دەگرت. لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی کرد، بە پانتۆڵی ئەفسەری و چەکمەی زەردی بریسکەدارو قەمچیی زیوکاری کراوەوە کە لە لاسکی چەکمەکەی چەقیبوو، بە نیشانی "شەڕی سەربەخۆیی"و بە دەمانچەو زنجیری زێڕو کڵاو گەرگەریی رەشەوە زۆر بەسام دیار بوو. ئەم بیچم و قەڵافەتە بەڕادەی پێویست ترسێنەر بوو، خەڵکی دەتۆقاندو جووتیارەکانی ناچار دەکرد رێزی لێبگرن. بە باوەڕی وی خەڵکی لادێ هەرگیز ئەقڵیان نەبوو. ئەقڵ و تێگەیشتن مەسەلەیەکە دەبێ بە دەستی بێنی و ئەقڵی دێهاتی‌یان هەمیشە لەچاویان دا بوو. ئەگەر بۆی کراباو عارف صائم بەگ پێی نەزانیبایەوە، هەمیشە جل و بەرگی ئەفسەریی لەبەر دەکردو لەو بیچم و قەڵافەتەدا خۆی نیشانی دێهاتی‌یەکان دەدا.

ئەو عارف صائم بەگەش بۆ چوکووراوا ببووە ژانەسەرێکی گەورە، ئەویش چ ژانەسەرێك! جل و بەرگی سەربازیی لەبەر دورسوون دورمووش کرد. پانتۆڵی سواری‌یە زەکەریاش رەنگی ئەفسەری بوو. بڕیاری دا ئەوانیش لەگەڵی بچنە دێ. بەکورتی هەرکام لەو هەژدە کەسەی لەگەڵی بوون، نیشانەیەکی سەربازی‌یان پێوە بوو. بۆ وێنە یەکێك ئەستێرەی ئەفەراتی

جەندرمەی لە کڵاوەکەی دابوو، یەکێك بەلەك بەندی سەربازیی لەسەر کەوشەکەی دیار بوو، یەکێك نێزەی بە قەدیەوە بەستبوو، یەکێك قایش پشتێنی پانی سەربازیی لە پشتێ بوو، ئەویان قەمسەڵەی لەبەر کردبوو، و ئەوی دیکەیان پاگۆنی لـێدابوو...

دۆستی باب و باپیرانی، یەغمووراغا لە جیاتی ئەسپەکانی کە دزرابوون، نیزیکەی پازدە ئەسپی خۆش رەوتی چوار پێنج ساڵەی بۆ ناردن و پووڵە ڕەشکەیەکیش چیە لێی نەستاندبوو. ئەو ئەسپانەی یەغمووربەگ ناردبوونی، بەڕاستی ئەسپی جوان و رەسەن بوون.

علی سەفا پێش ئەوەی سوار بێ لە پێش دا دوا ڕێنوێنی و فەرمانی خۆی بە پیاوەکانی داو گوتی:

"وەختێك ئەمن لەگەڵ دێهاتی‌یەکان قسە دەکەم، هەمووتان لە پشت منەوە رادەوەستن و چاوتان دەبڕنە نوختەیەك، دەستی راستتان لەسەر لوولەی تفەنگەکانتان دادەنێن و جووڵە لە خۆتان دەبڕن.

سواری ئەسپەکان بوون و وەڕێ کەوتن. جووتیارەکان لەبن دارتوویەکی قەد ئەستوور کە لك و پۆپی وەك دوو باڵی گەورەی لێك کراوە دەهاتنە بەرچاو، چاوەڕێی بوون.

هەموویان بە پەلە بوون و هەژانێکی بەرچاویان تێدا بەدی دەکرا.

عەلی سەفابەگ و پیاوەکانی بە لینگ دان لەنێو تەپ و تۆز دا گەیشتنە نێو دێ. عەلی سەفابەگ بێ‌ئەوەی ئەسپەکەی لە غار بخا، هەر کە گەیشتە بن دارەکە خۆی لە ئەسپەکە فڕی داو بە دەنگێکی بەرز گوتی:

"سلام علیکم."

جووتیارەکان بە دان بە جەرگی خۆداگرتنەوە، لە کاتێك دا هەوڵیان دەدا هەژانەکەیان ئاشکرا نەکەن، بە نەرمی جوابی سڵاوەکەی‌یان دایەوە:

"علیکم السلام."

پاشان عەلی سەفابەگیان بانگ کرد لەسەر نیوتەختێك کە لایەکی بەبزمار لە قەدی دارەتووە ئەستوورەکە قایم کرابوو و دۆشەکێکی ئەستووری لەسەر راخرابوو و لەسەر ویشەوە بەرەیەکی تورکمەنی‌یان راخستبوو، دانیشێ.

عەلی سەفابەگ لە کاتێك دا بە دەم ئەوانەوە کە رێگایان بۆ دەکردەوە پێ‌دەکەنی، چوو لەسەر نیوتەختەکە دانیشت و لاقی هاویشتە سەر لاقی. دوگمەی چاکەتەکەشی کردەوە هەتا جووتیارەکان دەمانچە دەسك سەدەفەکەی و فیشەکدانە گوڵدۆزی‌کراوەکەی ببینن.

پاش ئەوەی لەگەڵ یەك یەکی حازران چاك و خۆشیی کرد، بێ‌دەنگ بوو. نۆکەرەکانیشی لە پشتەوە بەریز راوەستابوون، سنگیان ڕەپێش کردبوو، زگیان چاڵ کردبوو، چاویان لە

نوختەیەکەوە بڕیبوو، دەستی ڕاستیان لەسەر لوولەی تفەنگەکانیان دانابوو و دەستی چەپیان لەبەر فیشەکدانەکانیان ڕاکردبوو، وەك بەرد جووڵەیان لەبەر خۆیان بڕیبوو.

عەلی سەفابەگ کە سەری داخستبوو، پاش ماوەیەکی دووردرێژ کە وادیار بوو خەریکی بیر کردنەوەیە، سەری هەڵبڕی و بە چاوە ئاگرینەکانی تەماشای یەك یەکی جووتیارەکانی کرد. هەموو ئەو جووتیارانەی دەیناسین لەوێ بوون. سەیفەلی دەستی لەبن هەنگڵی نابوون و لە ترسان وەك مێژۆکە دەلەرزی. عەلی سەفابەگ بەدیتنی ئەم دیمەنە خۆشحاڵ بوو. وەسمانەزلە بێخەیاڵ و بێ ترس و لەرز ڕاوەستابوو، بەڵام لە ڕوخساری منداڵانەی دا شتێك نەدەخوێندرایەوە. ڕوخسارێك بوو پڕ لە گنج و لۆچی بێئەژمار لەگەڵ ئەزموونێکی زۆر کە خستبوویە سەر یەك... بۆیە لە هێڵەکانی ڕوخسارێکی وادا کە لە چرچ و لۆچ دا ون ببوو نەدەکرا هیچ شتێك بخوێنیەوە... مەلا فەرهاد کەمێك ملی بەلای ڕاستیەوە نابوو، دەستی لەسەر زگی لەبەر یەك ڕاکردبوون، چاوی لەسەر یەك دانابوون و خۆی دابووە دەست لوتف و کەرەمی خواو بێخەیاڵ و نیگەرانی و پشت بە خوا بەستوو ڕاوەستابوو.

ئەمڕۆ سەفچەکاهیا حاڵەتێکی تایبەتی و بەرچاوی هەبوو. بە شێوەیەکی نائاسایی لیباسی لەبەر کردبوو. لەو گەرمایەدا پانتۆڵێکی خوریی لەپێ کردبوو و گۆرەوییە بەنە میرزاییەکەی دەگەیشتە ئەژنۆی. دوو قایشە شمشێری پەراوێز لێنراوی لەسەر یەك لە پشتێ بەستبوون، دەمانچە ساچمەزەنەکەی خستبووە نێوان ئەو دووانە. کراسێکی شینی ئاسمانیی لە کەتانی خەت خەت لەبەردا بوو. کڵاوێکی لبادی شەپقەداری سپیی لەسەر نابوو. کاکۆڵی نێوەڕاستی سەری بە ئەستووریی دوو قامك هۆنیببوونەوە، ئەم هۆنراوە زێوینە لە پشت ملی هاتبووە دەرو دەگەیشتە سەر پشتێنێی. لە پشتەوەی خەڵکەکە بە لیچ و لێوی داچۆڕاوەوە دەی بۆڵاندو سەرو خواری دەکرد. سیلوێرگلینیش لەوێ بوو. سپیترین سەرپۆشی خۆی کە وەك چۆڕێ شیری سپی بوو، بەسەر خۆیدا دابوو.

ئەوەی عەلی سەفابەگی خستبووە سەرسوڕمانەوە، ئامادەبوونی براو کەس و کارەکەی سەیران لەو کۆبوونەوەیەدا بوو کە فکریی ئاڵۆز دەکردو دەیترساند. چونکە دانیشتووانی کێوپارە هەم خەڵکێکی ئازاو نەترس بوون، و هەم خوێندەوارو ڕووناکبیر. ئەوان تا ئێستا خۆیان لە هیچ مەسەلەیەکی ئاوەدانی نەدەگەیاند. هەروا بزانە میوان بوون، ئەمڕۆ لێرە بوون و سبەینێ دەڕۆیشتن و خۆیان لە هەموو مەسەلەکان دوور ڕادەگرت. ئەگەر ئەوان خۆیان لەکاروباری وایوای هەڵقوتێنن، مەسەلەکە شێوەیەکی دیکە پەیدا دەکاو عەلی سەفابەگ

لەگەڵ هێندێ گیروگرفتی سەخت بەرەورِوو دەبێ. ئێستاش وەزعەکە وا نیشان دەدا کە ئەوانیش نیازیان هەیە لە کاروباری وایوای دا بەشدار بن.

عەلی سەفابەگ بەدەم ئەو بێدەنگی‌یەوە هەرچی زیاتر چاوی لە روخساری دێهاتی‌یەکان دەکرد، بلێسەی رق و قینی سەرکێش تر دەبوو. ئەگەر جاران بایە عەلی سەفابەگ قینی خۆی دەخواردەوەو بە سەری دا زاڵ دەبوو. بەلاّم ئێستا جڵەوی رق و قینی خۆی بەرەڵلاّ کردبوو. بە باوەرِی وی بەتوورِەیی قسەکردن زیاتر کاری دەکردە سەر جووتیارەکان. بە کۆخەیەك گەرووی خۆی پاك کردەوە. هەموو رەق رامابوون و چاوەرِوانی بەرنامەی دوای کۆخەکەی عەلی سەفابەگ بوون.

عەلی سەفابەگ دەستی بە قسان کرد:

"پاش ئەو هەموو خەراپەیەی لەگەڵتان کردم، نەم دەویست پێ لەم دێ‌یە بنێمەوە. دوای ئەوەی منتان لە چوکووراوا ئاوا خستە سەر زارو زمانان نەم دەویست چاو لە چاوی هیچ کامێکتان بکەم. بەلاّم تەنیا بۆ ئەوە هاتم ئاخر قسەی خۆمتان پێ بلێم. هاتووم پێتان بلێم و ئیدی هۆبالّی خۆتان بەستۆی خۆتان. ئیدی پاشملە مەلێن عەلی سەفابەگ، تایفۆن بەگ پێی نەگوتین و وشیاری نەکردینەوە. مامینە، براینە، هەرچەند بەزمانم دا نایە پێتان بلێم مام و برا، بەهەرحاڵ... ئێوە دەرهەقی من زۆرتان خەراپە کرد. ئەسپێك کە سەربەسەر بە زێرِم کرِیبوو، ئەسپە تاقانەکەمم داو زەوی‌یەکم پێ کرِی. بەلاّم ئێوە بە کەللەشەقی مەزراکەمم بۆ چۆڵ ناکەن. بۆچی؟ چما لە جێی دیکە زەوی چنگ ناکەوێ؟ ئێوە لەبەر کەللەشەقی ئەم مەزرا پیسە پرِ لە مێش و مەگەزە کە وەك گورگی برسی پیاوی دەخۆن، بەجێ ناهێڵن. لەدەشتی چوکووراوا ئەوەندە زەویی چۆڵ و بەرێژەو هەیە دەتوانی هەزار دێی لێ‌دروست بکەی و ژیانی خۆتی تێدا وەرِێ بخەی. بەلاّم ئێوە کاری بێ‌قانوونیتان کرد، قانوونی حکوومەتتان لەژێر پێ ناو بە زۆری زۆرداری لەسەر زەوی‌یەکانی من مانەوە. پێم بلێن بزانم ئەم زەوی‌یانەی منتان بۆ چۆڵ نەکرد. چما ئەو ملکە ئی من نیە، چما قەباڵەکەیم نیە؟"

وەك شێتان چاوی بە جووتیارەکان دا گێرِا. دێهاتی‌یەکان بە حەبەساوی و بێدەنگی گوێیان بۆ قسەکانی راگرتبوو، چووکترین جموجۆڵیان لێ‌نەدەبینرا. عەلی سەفا لە دڵی خۆی دا گوتی:"وەزعەکە ناجۆرە، شتێك لە گۆرِێ دا هەیە."

سەفچەکاهیا لە حاڵێك دا دەستی لەبەر پشتێنێ راکردبوو، گوتی:

"جەنابی عەلی سەفا، کوڕم دێ ئی تۆ نیە. پشتاوپشت ئەم ملکە هی ئێمە بووە. ئەم دێیە ئی خۆمانە. ئەم خاکە ئارانی ئێمەیە. ئەتۆ لەکوێ ڕا هاتی؟ کوڕم، پێش ئەوەی ببیە تایفۆن بەگ، ئەتۆ لە کوێ بووی؟"

قسەیەکی دیکەشی نەکرد. دەستی لەبەر پشتێنێ دەرهێنا، قەڵنەکەی دووبارە بە دەمەوە گرت و دەستی کرد بە راوێچکان.

عەلی سەفابەگ چاوەڕوانی دژکردەوەیەکی وا نەبوو. قسەکانی سەفچەکاهیا رق وقین و لەگەڵ رق وقینەکەی ترسی ئەویان چەند قات زیاد کرد. نەڕاندی و گوتی:

"باسی منت کرد... چما ئەمن نەبووم ئەسپێکم دا بە یۆبازئۆغلی کە شەجەرەنامەی سەدو پەنجا ساڵی هەبوو، و ئەم زەوییانەم لێ‌کڕی؟ ئەگەر ئەم زەوییانە هەقی من نین، ملکی من نین، ئەی بۆچی نیوەی خەڵکی دێ ئێرەیان چۆڵ کردو رۆیشتن. یۆبازئۆغلی بۆ رۆیشت؟"

سەفچەکاهیا کە پیاسەی دەکرد، لە جێی خۆی راوەستا. پشتە چەماوەکەی راست کردەوەو تاوێك قیت راوەستاو بەهاوار کردنەوە گوتی:

"ئەوانەی رۆیشتن ناکەس بەچە بوون. شیری پاکیان نەخواردبوو. لە ترسان رۆیشتن. بەڵام یۆبازئۆغلی بۆیە رۆیشت کە بە فیتی تۆ ئەوەندەیان لێ‌دا گەیشتە شەرابەمەرگی. ئەو شیعەیەکی غەریب و بێ‌کەس بوو. نەی‌توانی خۆ رابگرێ، هەڵات و رۆیشت."

عەلی سەفا نەڕاندی:

"ئەتۆ هەڵمەیەو هەر خەریکی فێڵ و تەڵەکە بە، لە زەوییەکانی من دا کێڵگە ساز بکە، داری زەیتوون بنێژە تا دوایە بەرەکەی بخۆی."

سەفچەکاهیا لە حاڵێك دا لێوە ئەستوورەکانی دەلەرزین و زاری کەفی کردبوو، و وەك لۆکی گەرم داهاتوو کەفی دەپرژاند، گوتی:

"دیارە هەڵنایەم."

پیاسەی دەکرد، سەرداو پێدای دەکردو لەبەر خۆیەوە دەی‌گوت:"با وەسمانەزلەو سەیفەلی مل درێژو مەلافەرهاد چاوڕەش وەری گرن. کامیان دەتوانن وەك من شێرانە لە پێش عەلی سەفابەگ راوەستن و قسە بکەن. دە بڵێن بزانم دەتوانن زار هەڵپچڕن؟ وەڵڵا ئەمن لاقم لەسەر لێوی قەبرییە... بەدبەخت و چارەڕەشی دەکەم، بێ‌ماڵ و حاڵی دەکەم. ئامادە بە کوڕم جەنابی عەلی سەفا، تایفۆن بەگی قارەمان، دیفاع لە خۆت بکە."

"هەم داری زەیتوون دەنێژم، هەم چنار. پرتەقاڵی پڕ ئاوو گێلاسی سوور دەنێژم. ئادەمیزاد دەنێژم و ئینسان دەدرووومەوە!"

عەلی سەفابەگ وەك مێشێك لە خۆی دەرکا، دەستی راوەشاندو گوتی:

"هەرچی پێت خۆشە بنێژەو بچێنەو بدروو، ئەمن کارم پێی نیە. ئەمن تەنیا لەبەر خاتری ئینسانەتی هاتمە ئێرە. هاتم ئاگادارتان بکەم. خەرمانەکانتان سووتاندم، قسەم نەکرد. داخوا لە دنیای ئینسانەتی و موسوڵمانەتی دا خەرمان سووتاندن دروستە! ئەسپەکانتان دزیم، هەموو شەوێ بێنێوبژێر ماڵەکەتان وەبەر تفەنگان دام. داخوا هەمووی ئەم کارانە بە پێی قانوونەکانی دەوڵەتی کۆماری تورکیە دروستن. داخوا قانوونی ئینسانەتی و ئیسلامەتی ئەمەی بە دروست دەزانێ؟ ئەمن دەنگم نەکردو ددانم بە جەرگی خۆم دا گرت. هەمووی ئەمانەم تەحەممول کردو هەموویانم بێوەلام هێشتنەوە. ئێوەش گوتتان فلانەکەس دەترسێ. گوتم لە ئینسانەتی دەرنەچم. گوتم قەیدی نیە لەنێو دۆستان دا دڵئێشانیش روو دەدا. بەلام ئێوە حاڵی نەبوون. بە هیچ جۆر تێنەگەیشتن. بە کەللەشەقی یاخی بوون، درێژەتان بە یاخی بوون دژی دەوڵەت و میللەت دا. یاخی بوونی ئێوە راست وەك یاخی بوونی شێخ سەعید بوو. بەلام ئەمن نەم هێشت حکوومەت پێ بزانێ. ئەگەر مەسەلەکەم بەو جۆرە کە هەبوو، بە حکوومەت گوتبا، ئێستا هەمووتان ملتان بە پەتی سێدارەدا کرابوو و لاقتان رادەژان..."

ئەمجار عەلی سەفابەگ دوو قامکی وەك (٨) سەرەوژێر راگرتن و بە بزواندنی قامکەکان شکڵی جووتە لاقێکی نیشان دا کە بە قەنارەوە رادەژان.

"بەڵێ جەنابان، کەمێك هۆشتان بێتەوە بەر خۆتان، جەنابان!"

دەنگی لە هەموو کەلێن و قوژبنێك دەگەڕاو هەتا زۆر دوور دەبیسترا. گەرما گاڵەی دەکرد. هەرچەند سێبەری تووە گەورە فێنك بوو، بەو حاڵەش عەلی سەفابەگ شەلاڵی ئارەق بوو و ئارەق بە بن هەنگڵیداو بەرزگی دا هاتبووە دەر.

"پاشان ئێوە جەنابان..."

تاوێك راوەستا بزانێ قسەکانی چەندیان کار لێدەکاو دوایە لەسەری رۆیشت:

"ئێوە جەنابان ئێوە دەزانن دوایە چیتان کرد؟"

دیسان بێدەنگ بوو، رەگی ملی بەقەد کلکە تەشێیەك ئەستوور ببوون. چاوە داقلێشاوەکانی لە چاوی یەك یەکی جووتیارەکانەوە بڕی:

"ئێوه، ئێوه، ئێوه هەمووتان خەیانەتتان کرد. پیاوەکانی منتان کوشت. بە...ڵێ پیاوەکانی منتان کوشت. جەنابان هەموو خەڵکی چوکورراوا دەزانن کە ئادەم و زەینەڵ ئێوه کوشتووتانن. پارێزگار لە ئەدەنەو حکوومەت لە ئەنکەرەو عارف صائم بەگ لە بن دەستی خۆمان ئاگایان لەو کەتنەی ئێوه هەیە. بەڵێ دۆست و برامان عارف صائم بەگیش ئاگادارەو لەو بارەیەوە زۆریش تووڕەیە. چما ئادەم و زەینەڵ چیان لە ئێوه کردبوو کە ئەو بەستەزمانانەتان کوشت؟ زەینەڵ ئاومالّی خۆتان بوو. بە تایبەتی کە پێنج منداڵیشی هەتیو بوون. جەنابان، جەنابان، لەو کەتنەتان خۆش نابم. نایەڵم خوێنی پیاوەکانم بە فیڕۆ بچێ. ئەگەر لەم مەملەکەتەدا حەق و حقووق و قانوونێك هەبێ، خوێنیان ون نابێ."

پاشان لە نەکاو دەرپەڕی، وەك شێتان بە توندی دەستی راوەشاندن و لاقی بە عەرزی دا دان:

"ون نابێ، ون نابێ! هەتا رووحم لەبەردایە نایەڵم خوێنیان ون بێ. ئێوه دڵتان بەو کەسە قایمە کە لە پشتتان راوەستاوە. هەرکەستان بە پشتەوە بێ، گرنگ نیە. خوای گەورە پشت و پەنای منە."

پاشان ئاوڕی دایەوە دوای خۆی و پیاوەکانی کە لە پشتیەوە قیت راوەستابوون بە جووتیارەکان نیشان داو بەدەنگێکی ئەسپایی کە بەحاڵ دەبیسترا، گوتی:"دیارە ئەمانەش هەن."و دوایە چاوێکی لێداگرتن:

"متمانە بە کەس مەکەن. بە پشتیوانیی کەس زوڵم و ناهەقی مەکەن."

دەنگی بەرە بەرە ئارامتر و نەرم تر دەبوو. پاشان بە راوێژێکی ئارام، وشك، دڵنیاو لێبڕاوانە گوتی:

"هیچ دەسەڵاتێك ناتوانێ لە دەستی عەدالەت رزگارتان بکا. ئێستا گەیشتینە ئەسڵی مەبەست. دە رۆژتان مۆڵەت دەدەمێ. لە ماوەی ئەو دە رۆژەدا دەبێ دێیەکە چۆڵ کەن و برۆن. ئەگەر دێیەکە چۆل نەکەن بڕیارم داوە تا دوا هەناسە شەڕتان لەگەڵ بکەم. دێ هی خۆمەو زەوییەکانی دێ ملکی خۆمن. نایەڵم کەس هەقم بخوا. ئەگەر هەتا دە رۆژی دیکە دێیەکە بەجێ نەهێڵن و نەڕۆن، بە هەموو توانامەوە لەگەڵتان دەکەم و بە زۆر لە زەوییەکانی خۆم وەدەرتان دەنێم. ئەگەر پێتان وایە دەتوانن بم کوژن، بسم الله فەرموون، ئەگەر بەو کارە خوێن دەرژێن و ماڵ کاول دەبن، با بێن. ئەگەر ماڵەکان ئاور دەدرێن و پێش نوێژو مەلاکان بە ریشی خۆیان هەڵدەواسرێن هەتا گیانیان دەردەچێ، با دەربچێ. ئەگەر شەوانە هێرش دەکەنە سەر دێیان و ژنان و کچان هەڵدەگرن و دەیان بەنە کێو و بەندەنان، با بیان بەن. ئەگەر دێهات

ئاگر دەدەن، با بدەن. ئەمن بەش بە حاڵی خۆم باکم نیە. ئەگەر ئاورم بۆ بێ، ئاوم بۆ بێ، ئەجەلم بۆ بێ، هەژدیهام بۆ بێ، حکوومەتیشم بۆ بێ، دیسان باکم نیە."

پاشان ئاوڕی دایەوە، دەستی بۆ لای پیاوەکانی کە بە لەخۆبایی‌بوونەوە وەك بت قیت لە جێی خۆیان چەقیبوون، راداشت و گوتی:

"ئەمانەش تەنانەت ئەگەر رەشە تاعوونیشیان بۆ بێ، باکیان نیە."

دورسوون دورمووش هاواری کرد:

"ئەرێ وەڵڵا."

"بەڵێ جەنابان! ئەگەر لەم دە رۆژەدا زەوی‌یەکانم بەجێ نەهێڵن و نەڕۆن بەڵایەکتان بەسەر دێ کەس بە فکریشی‌دا نەهاتبێ. ئەم دێیە دەبێتە مەیدانی کەربەلا. باشتان گوێ لە قسەکانم بێ، چاوو گوێتان باش بکەنەوە. ئەگەر نەڕۆن ئەم دێیە دەبێتە مەیدانی کەربەلا. مەیدانی کەربەلا دەزانن چیە؟ دەزانن یانی چی؟ بەڵێ ئێرە راست دەبێتە کەربەلا، کەربەلا..."

دێهاتی‌یەکان بێ‌دەنگ ببوون و لە چاوەکانیشیان دا نەدەکرا فکریان بخوێنیەوە. دیار بوو پیاوانە بڕیاری خۆیان داوە. سەفچەکاهیا قەلنە بەتاڵەکەی بە زارە بێددانەکەی گرتبوو و لە پەستا دەچووە سەرێ و دەهاتە خوارێ. بەدیتنی ئەم دیمەنە عەلی سەفابەگ پێکەنین گرتی:"ئەم پیاوە چ شتێك قورمیشی کردوە، بەو ملە باریکە رەقەڵەیەوە هەروەك منداڵێکی دە ساڵەی نەخۆشی نەدی بدی دەچێ. پێم وایە سەد ساڵ زیاتر دەبێ."

"ئێستا جەنابان ئەمڕۆ هاتم ئەم قسانەتان پێ بڵێم، پێتان بڵێم ئەگەر دێیەکە چۆل نەکەن لەوانەیە چ تۆفانێك هەستێ، چ بوومەلەرزەیەك بێ و چ بەڵایەکتان بەسەر بێ. یان هەتا دە رۆژی دیکە دێیەکەم بۆ چۆل دەکەن، یان بە پشتیوانیی ئەو کەسەی دەستتان لە پشتێ دەدا، ئامادەی بەرەبەرەکانی دەبن. ئەم جارە بەربەرەکانی‌یەکە بێ‌بەزەیی‌یانە دەبێ... تا..."

پاشان چاوی لە سەفچەکاهیا کە هەروا دەهات و دەچوو، کردو چاوەڕوانی وەڵامێك لەوەوە بوو. بەڵام سەفچەکاهیا تەنانەت سەریشی هەڵنەبری. عەلی سەفا لەسەر نیوتەختەکە دانیشتەوە. گرێی کراواتە سوورە بریقەدارەکەی کە دەرزی‌یەکی زێڕی مرواری نیشانی لێ‌درابوو، شل کردەوە، بەدەسرۆکەیەکی سپی ئارەقی سەروچاوو ملی سڕی. دەسرۆکەکە وا لە ئارەق دا خووسا، دەت گوت لە ئاوێ ڕۆ کراوە.

سەفچەکاهیا لە بنەوە تەماشای دەکردو لەدڵی خۆی دا دەی‌گوت:

"وەك سەگ دەترسێ، ترسی ڕێ نیشتوە. چاوی ترساوە، چاوترسێن بووەو خەریکە دەپاڕێتەوە، ئەمەش خۆی جۆرە پاڕانەوەیەکە. بەتایبەتی ئەگەر دەیزانی "ئەو" لە دێی ئێمەیە پانتۆڵەکەی پیس دەکرد، خۆی پیس دەکرد پیس!..." ڕاوەستاو بە شێوەیەکی بەرچاو ماوەیەکی درێژ لە عەلی سەفابەگی ڕوانی. بیری کردەوە:"ئەگەر ئێستا بچمە پێش و بەو سەگە، بە عەلی سەفا بڵێم کوڕە گەوجە عەلی! حەمەدۆك لە چوکووراوایە، بۆخۆشی ئێستا لەم دێیەیەو هەر ئێستاش لە ماڵێ منە... باش باش پانتۆڵەکەی پیس دەکا."

دیسان دەستی بە ڕاوێچکە کردەوە. لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاند:

"پێی دەڵێم، بە عەلی سەفا دەڵێم کە ئەو وەك شەهێنێکی ڕەنگ خاکی هاتوە لە چوکووراوا نیشتوە، با ئەو بێناموسە لە ترسان سەکەت بێ. ئەم چاکەیەی لەگەڵ دەکەم. ئەودەم دەبینی کە چۆن چوکووراوای لێدەبێتە بەندیخانە. ئەودەم دەزانم داخوا لەم چوکووراوا هەزار بە هەزارە کونێك دەبینێتەوە خۆی تێدا حەشار بدا؟"

سەفچەکاهیا جار بە جار ڕادەوەستا. بە چاوە زیت و وردو پڕ پێکەنینەکانی دەیڕوانیە عەلی سەفا کە هێشتا هەر خەریك بوو ئارەقی دەم و چاوی دەسڕیەوە. ماوەیەك تەماشای دەکردو دووبارە وەڕێ دەکەوتەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"نیوەشەوێك دەچمە ماڵەکەی، پێی دەڵێم عەلی ئاغا! بابت لەگەڵ من دۆست بوو، ئەمن دۆستی تۆم، حەمەدۆك لێرەیە. لە چوکووراوا خۆی حەشار داوە. حەمەدۆك بەنیازە تۆ بکوژێ. بەڵام جارێ لێکی دەداتەوە کە گوللە بە کوێی لەشتەوە بنێ تا زیاتر ئازار بچێژی. ئێستا لەو مەسەلەیە ورد دەبێتەوە. عەلی سەفابەگیش وەردەسوڕێ و دەڵێ لە کوێیە، لە کوێیە، حەمەدۆك لە کوێیە، لە کوێ خۆی شاردوەتەوە؟"

سەفچەکاهیا ئاوڕی دایەوە تەماشای عەلی سەفای کردو پێکەنی. قاقا پێکەنی. عەلی سەفا ئاوڕی دایەوە سەری و تەماشای کرد:"ئەم پیرەپیاوە چیی بووە؟ مێشکی تێك چووە؟" دێهاتییەکانیش تەماشای سەفچەکاهیایان دەکرد.

سەفچەکاهیا دووبارە پێکەنی:"ئەمن پێی دەڵێم ئەو بەشەی ئیدی نازانم، نازانم لە کوێ خۆی شاردوەتەوە." پاشان دووبارە وەڕێ کەوتەوە:"نابێ پێی بڵێم، نابێ بە عەلی سەفا بڵێم "ئەو" لێرەیە تەنانەت وەسمانەزلەو مەلاو سەیرانیش، هەر هیچ بنیادەمێك نابێ بزانێ "ئەو" لێرەیە. عەلی سەفا دەڵێ لە کوێ خۆی حەشار داوە. ئەمنیش دەڵێم عەلی سەفا ئەمەیان ئیدی نازانم، بە جێگاکەی نازانم. ئەگەر بیزانم گوێی ئەو کوڕە چەتەیە دەگرم و دەیدەمە دەستت.

ئەو دەڵێ چۆن دەکرێ لەو دەشتە کاکی بە کاکی‌یەی چوکووراوادا بیدۆزینەوە. پیاوی ون بوو خۆ وەك گای ون بوو نیە... لەکوێ و چۆن دەکرێ بیبینینەوە؟ ئەمنیش دەڵێم ئەمەیان ئیدی نازانم عەلی سەفابەگ.

سەیفەلی دەست لەسەر سینگ لە کاتێك دا ملی بەلاوە نابوو، لە عەلی سەفا نیزیك بووەوەو گوتی:

"بەگ، ئەمە نیوەڕۆیە. چونکە دەم زانی جەنابتان دێن، مەڕم بۆ سەر بڕیون. نیوڕۆژێ لە لای ئێمە بخۆن و بڕۆن."

عەلی سەفا لەبەرچاوی حەبەساوی جووتیارەکان هەستاو چوو بۆ لای ئەسپەکەی. لاوێك لەغاوی ئەسپەکەی بۆ گرت و رکێفی بۆ داگرت.عەلی سەفا پاش ئەوەی خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی نەڕاندی:

"ئەمن نانی ئێوە ناخۆم."

پیاوەکانیشی سواری ئەسپەکانیان بوون و لە حاڵێك دا هەورێکی تۆزوخۆڵ لە عەرزی هەستابوو، بە پڕتاو دێیان بەجێ هێشت.

وەسمانەزلە لە دواوە تەماشای کردن و گوتی:

"ئاسەواری ئینسانەتی لە قالبی ئەو بنیادەمەدا نیە. بنیادەم نانی کافریش رەت ناکاتەوە... تەنانەت نانی دوژمنی هەزار ساڵەشی رەت ناکاتەوە."

جووتیارەکان تەماشایان کردو گوتیان:

"ئینسانەتیی تێدا نەماوە."

سەیران وەك شنەبایەکی جوانی و بەختەوەری بە پێش ئاپۆرایەکەدا تێپەڕی و بە پەلە دێی بەجێ هێشت و رێگای بێستانی گرتەپێش.

## (٤٥)

له خوارەوە لەسەر ئەو جادەیە کە بەبەر قەڵای ئاناوارزادا دەڕۆیشت کۆچ و کۆچبارێك لە ریزێکی دوورودرێژدا بەنێو تەپ و تۆزدا دەهاتە پێش. دەسبەجێ لە دڵی جووتیارەکان، وەسمانەزلەو مەلافەرهاد دا ئەو هیوایە وەخەبەر هات کە رەنگە کۆچ و کۆچباری ئەو جووتیارانە بێ کە دێیان بەجێ هێشتبوو و ئێستا دەیانەوێ بگەڕێنەوە. هەتا خۆرەتاو بەرز بوو بە تامەزرۆیی‌یەوە چاوەڕێ مان. دەوروبەری سەعاتی دە، سوارێك بە پڕتاو هاتە نێو ئاوایی. ئەم سوارە لاوێك بوو بەناوی "چەگیرکە سوللووی". ئەسپێك کە سواری ببوو نە زینی پێوە بوو و نە هەوسار. میوانی تازەهاتوو بە دەنگێکی بەرز دەستی بە قسە کرد:

"لە غەریبایەتی دا گیانمان گەیشتە سەر لێو. وەختێك بیستمان ئەو هاتوەتەوە، خانووەکانمان رووخاندن و باروبنەمان تێك ناو وەڕێ کەوتین. گوتمان شین لەگەڵ ئاواڵان جێژنەپیرۆزەیە. ئەگەر قەرار بێ ئاومالەکانمان بکوژرێن، پێکەوە دەمرین. ئەگەر برسی بین پێکەوە برسی دەبین. ئەگەر ماڵ و خەرمانیان سووتان با هی ئێمەش بسووتێن."

لای نیوەڕۆیە پێشی کۆچ و کۆچبارەکە گەیشتە نێو دێ. هەرچەند جووتیارەکان پێشوازی‌یەکی گەرمیان لەو ئاومالە تازەهاتووانەیان کرد، بەلام ئەوان شەرمیان دەکردو لە خەجالەتی‌یان نە چاویان لە چاوی کەس دەکردو نە قسەیەکیان بە زمان دا دەهات.

هەرکەس بارگەو بنەی خۆی هەڵگرت و لەبەر دەرکی خانووەکەی داینا. بە هاوکاریی خانەخوێ‌یەکان هەرکەسە لە خانووی خۆی دا جێگیر بوو. لە ژێر تووە گەورەدا رایەخیان راخستن و پێکەوە شێویان کرد. هەرکەس لە ماڵێ خۆی شێوی ساز کردبوو و هێنابوویە بن دارێ و پاش نان خواردن دەردی دڵ و سکالا دەست پێ کرا:

"زۆرمان بەڵا بەسەر هات."

"یاخوا کەس تووشی غەریبایەتی نەبێ."

"غەریبی لە مردن ناخۆشترە."

"لە دەستی غەریبایەتی پەنا دەبەینە بەر خوا."

"ئەگەر بەهەشتیش بێ دیسان بەکەڵك نایە."

"نیشتمانی باب و باپیرمان بە بەهەشت نادەین."

"ئەوەندە بەڵامان بەسەر هاتوە هەر باسی مەکەو مەپرسە."

"نە دۆستێك نە کەس و کارێك."

"بێکەس بێکەس بووین."

"زۆر پێشتر دەمانەویست بێینەوە. دەزانن بۆ نەهاتینەوە؟ نەمان دەتوانی لە شەرمان چاو لە چاوتان بکەین!"

"دیتمان ئیدی چارەمان نیە، تا ئێرەمان هاتبوو. ئاخرەکەی وەڕێ کەوتین."

"براینە ئێوە لێمان ببوورن."

"ئێمەتان زۆر باش و بە میهرەبانی وەرگرت."

"وەك دۆستێك..."

"خوا غەریبایەتی ببڕێ."

"غەریبایەتی یانی بەدبەختی و چارەڕەشی."

"لە عەرزی گەرم بدرێ، غەریبایەتی."

"ون بێ و بچێتە بنی جەهەننەم."

"بچێتە جەهەننەم."

"چاوی ئێمەیان ترساند."

"فریویان داین."

"لە حکوومەت ترساین."

"حکوومەت بۆ لێترسان دەبێ."

"گوتمان هەستین بڕۆین."

"گوتمان هەستین بچینەوە دێی خۆمان. ئەگەر قەرار بێ بمرین، با لەگەڵ خزم و کەسی خۆمان بمرین."

"بەو ریگا پڕ تەپ و تۆزانەدا وەڕێ کەوتین و هاتینەوە."
"روومان نیە چاو لە چاوتان بکەین."
"حکوومەت دەسەلاتی هەیەو سامی هەیە."
"پیاو بە حکوومەت ناوێرێ."
"حکوومەت لە هەمووان خراپترە."
"حکوومەت پشتیوانی لەو دەکا. چەتەکان لەگەلّی هاودەستن. ئاغاو خانەکانی لە پشتن. شارۆچکە لەگەلّ ئەوە... خاوەن پارەکان پارێزگاریی لێ‌دەکەن، فەقیرو هەژار..."
"بێچارە بووین."
"بێچارە بووین و مالّ و گوزەرانمان بەجێ هێشت و رۆیشتین. دیارە کارێکی باشمان نەکرد."
خزم و خوێشەکان لە دیتنەوەی کەس و کارو دۆستانی کۆچ کردووی خۆیان لەزەتیان وەردەگرت. بۆیە هەتا نیوەشەوێ لەبن دارە توووەکە دانیشتن و قسەیان کرد.
وەسمانەزلەو مەلا فەرهاد لە گەڕانەوەی جووتیارەکان سەریان سوڕمابوو. چونکە ئەو جارەی چوبوون هەرچەندی لەبەریان پاڕانەوە کەس حازر نەبوو بێتەوە. وەسمانەزلە دەی‌گوت:
"ئەم، ئەم شەهێنە، ئەم بالّندە رەنگ خاکی‌یە، تەنانەت ناوەکەشی خاوەن کەشف و کەرامەتە، ئەویش چ جۆرە کەرامەتێك!"
مەلا فەرهاد لەبنەوە زەردەی دەهاتێ و بێ ئەوەی قسەیەك لەگەلّ وەسمانەزلەو ئەوانی دیکە بکا، بە نیشانەی سەلماندنی قسەکانی، سەری لەقاند. ئەوانەی گەڕابوونەوە ئەسپیشیان هەبوون.
ئەو شەوە تازە هاتووەکان تا بەیانی نەخەوتن و ژمارەیەك لە خەلّکی گوندیشیان لەگەلّ خۆیان بە بێداری هێشتەوە. بەتامەزرۆیی لەبارەی حەمەدۆکەوە پرسیاریان دەکردو بێ ئەوەی هەست بە ماندوویی بکەن و بە سەبرو سیکەدانەوە گوێیان بۆ ئەو شتانە رادەگرت کە لەبارەی وی دا دەگوتران. وەختێك پێنج شەش کەسیش تاقە یەك داستانیان لەبارەی حەمەدۆکەوە دەگێڕایەوە، دیسان زۆر بە حەوسەلەوە گوێیان بۆ رادەگرتن:
"چۆن پیاوێکە، شێوەی چۆنە؟"
"چاوەکانی چۆنن، دەست و لاقی چ شکلێکن؟"
"مووی سەری، برۆکانی و برژانگەکانی چۆنن؟"
"دەنگی چۆنە، چۆن قسان دەکا؟"
"بەژن و بالاّو قەلاّفەتی چۆنە؟"

جووتیارەکانیش نە لەبارەی بەژن و بالآیەوە قسەیەکیان دەکردو نە لەبارەی شێوەی قسەکردن و تایبەتمەندییەکانی دیکەی لەشی. تەنیا بە گوتنی ئەوە کە:"ئازایە، وەك شەهێنە، وەك تەیری راوکەوە، گوللە کاری لێناکا، بریسکەی لەنێو نوشتەی چاوەزارەکەی دایە" خۆیان لە باسی شکلّ و قەلآفەتی حەمەد لادەدا.

پێش هەمووان ژنان و بەتایبەتی کچانی جحێلّ لەبارەی بەژن و بالآو چاوو برۆیەوە پرسیاریان دەکرد. بەلآم لەو کەسانەی ئەویان دیتبوو، وەلآمێکی راست و دروستیان وەرنەدەگرت. چونکە بە زمانی کەس دا نەدەهات کە بلێ:"ئەگەر چاوت پێی بکەوێ، یەکی ریوەلّەی بەقەد منداڵێکە، مەلێ دەم و چاو، بلێ جووتێك چاوی گەورە." نەیان دەتوانی بلێن:"دەستەکانیشی چووکەلّەن." لە کاتێك دا دەستی حەمەد چووکەلّە نەبوون. چوارشانە بوو. بەلآم لەپێش چاوی وان هەموو ئەندامەکانی لەشی حەمەد چووکەلّە بوون. لەبارەی دەنگ و شێوەی قسەکردنیەوە شتێکیان نەبوو بیلێن. چونکە نە دەنگییان گوێ لێبىوو، نە شێوەی قسەکردنی... تەنیا دایەقەمەر نەبێ کە بە خۆشحاڵییەوە پێدەکەنی و بە خۆرانانەوە دەیگوت:"ئەو پیاوێکی بەراستییە." پێدەکەنی و لەبنەوە تەماشای سەیرانێی دەکرد کە لە پەنای راوەستابوو و سەرتاپای گیانی پڕ لە ئەوین بوو.

لە ماوەی چەند رۆژدا دێ چووەوە سەر دۆخی جاران. هەروا بزانە قەت نیوەی حەشیمەتی دێ باریان نەکردوەو چەندین ساڵ لە شۆرەکاتی ساریچام نەژیاون. ئەوانەی گەڕابوونەوە، کەمێك ناهومێد دیار بوون. ئەوان لە پێش دا پێیان وابوو هەر کە گەیشتنەوە ئاوەدانی لەگەڵ حەمەدۆك بەرەوڕوو دەبن. لەگەڵ پیاوێکی بەخۆوەی سەرتاپا چەکداری سمێڵ بابڕ. بەلآم وا دەهاتە بەرچاو کە نە کەس دیویەتی و نە کەس دەزانێ لە کوێیە."

چەند رۆژ دواتر یۆبازئۆغلیش بە ژن و منداڵەوە هاتەوە. لەبەر ئەوەی خانووەکەی سووتابوو، سرو سیپاڵەکەی لەبن تووە گەورە دانا. جووتیارەکان دەسبەجێ کۆنە کادێنێکیان خاوێن کردەوەو ماڵەکەی یۆبازئۆغلییان تێنا. یۆبازئۆغلی و ژن و منداڵەکەی زۆر پەرێشان بوون. دەسبەجێ جووتیارەکان یاریدەیان داو هەرچییەکی کەم و کەسری هەبوو، بە پێی توانا بۆیان دابین کرد.

"حکوومەت هیچ، جەندرمە هیچ، ئاغا هیچ، ئەگەر ئیزرائیلیش بێ، جارێکی دیکە لێرەڕا ناچمە جێیەکی دی. با بم کوژن، ملم لەبەر تیغ رادەگرم و دەلێم لێی دەن، ملم لە موو باریکترە. ئەگەر لە ملم دەدەن، لێی دەن با خوێنەکەم برژێتە سەر خاکی باب و باپیرانم."

هەمیشە ئاخ و ئۆفی هەڵدەکێشاو داوای لێبووردنی لە وەسمانەزلەو مەلا فەرهاد دەکرد.

عەلی سەفابەگ لە مەسەلەکە ئاگادار بوو. لە پێش دا باوەڕی نەکردو شتەکەی بە پێکەنین و گاڵتە گوزەراند. پاشان دوو کەس لە باوەڕپێکراوترین پیاوەکانی، واتە زەکەریاو دورسوون دورمووشی نارده وایوای، کە ئەوانیش گوتیان شتەکە راستە. عەلی سەفا بە رادەی شێت بوون تووڕە بوو و کەفی پرژاندو رۆژێك لە بەرەبەری بەیانی‌یەوە هەتا بانگی نیوەڕۆیە لە دالانی باڵەخانەکەی دا هات و چوو و دووپاتی کردەوە:"ئەمن، ئەمن، من، من، من من هەرچیم پێ خۆش بێ دەتوانم لەگەڵیان بکەم! گۆرانیم بۆ دەڵێن... گۆرانی... من من... من من، من من. بەو تووتکە سەگانە نیشان دەدەم... تووتکە سەگانە... تووتکە سەگانە... من من..."

سەرەنجام بە لەشێکی کفت و داماو و بە چاوێکی کەم سۆماوە دەستی کرد بە ورتەورت:"خوایە گیان، گوناهی من چیە؟ لە رێگای حەڵاڵەوە بە دڵپاکی لەم مەملەکەتەدا بوومە خاوەنی کێڵگەیەك. لە کاتێك دا هیچ کام لەوانە پێویستی‌یان بەو زەوی‌یانە نیە. کەللەشەقی دەکەن. لە کاتێك دا ئەمن زەویی هەزار جار باشتر لەو زەوی‌یەم بۆ پەیدا دەکردن. ئاخر ئەمن چیم لێ‌کردوون کە چەند ساڵە ئەو بەڵایانەم بەسەر دێنن. مافیان پێشێل کردم. خەتای وانە کە چەندین ساڵە کێڵگەکەم بە نیوەچڵی ماوەتەوە. کلکی کەرێیە، نە درێژ دەبێ، نە کورت دەبێ. لەجیاتی ئەوەی بچمە ئەستەمبوول یان ئەنکەرە کارێك پەیدا بکەم و بە خەیاڵی ئاسوودەوە بخۆم و بنووم و کەیفێ بکەم، لەبەر خاتری مەملەکەتەکەم، لەبەر خاتری نیشتمانەکەم لە گیانی خۆم بووردم... چما کێ هەیە تێ بگا... ئەم دێهاتی‌یانە نافامن، ئینسانەتی نازانن. حاڵی نین. ناتوانم حاڵی‌یان بکەم. بە بەدبەختی و چارەڕەشی دەژیم. ئەمن و مەلیحە بە چارەڕەشی دەژیەین. ئەو ژنە بەستەزمانەشم هێنا لەم جەهەننەمەدا سەرگەردانم کرد. هەموو لەشی بووەتە زیپکە.

لەشی قەڵەوی پڕ برین و زیپکەی خێزانیی هاتە بەرچاو. بە دەم ناڵینەوە گوتی:"بە خوا زوڵمە. دێهاتی‌یەکان بەم کارانە ئەمن نازارو ئەشکەنجە دەدەن. زوڵمە... ئەم کارانە شیاوی مرۆڤایەتی نین. ئەی خەڵکینە ئەم بارەم چی دیکە پێ هەڵناگیرێ. ئەی هاوڕێیان، ئەی هاورێ دڵسۆزەکان، ئەی دۆستانی زەمانی شەڕ، ئەی دۆستان، خەریکم لەبن باری قورسی ئەم زوڵمەدا دەناڵێنم! چیدی ئەم بارە قورسە ناتوانم هەڵگرم. ناتوانم لەبن ئەم بارە قورسەدا راست ببمەوە. ئەوەتا دنیا دنیایە ئەو بەڵایانەی بەسەر من هاتوون، ئەو ناپیاوی‌یانەی لەگەڵ من کراون، لەگەڵ هیچ کەس نەکراون."

"ئەو بەڵایانەی بەسەرت هاتوون لەبەر ئینسانەتی و دڵنەرمیی خۆتن، لەبەر ئەو دڵە میهرەبانەن کە لە سینگت دایە..."

عەلی سەفا سەری هەڵبڕی چاوی بە ژنەکەی کەوت کە بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتوە. دڵۆپە فرمێسك بە برژانگیەوە گیرسابوونەوەو روومەتی بە فرمێسکان تەڕ ببوون. دیسان داوێنەکەی هەتا سەر ئێوکی هەڵ دایەوە:

"هەر بۆ ئەوە بابم منی نادرە ولاتانی گرنگی دنیا، بۆ خوێندن ناردمیە ئەستەمبوڵ؟ بۆ ئەوەی بکەومە ئەم رۆژو رۆژگارەوە عەلی سەفا؟ بەڵێ؟ هەر بینا دیت ئەم رۆژانە گۆشتی لەشم رزی و پارچە پارچە هەڵوەری!"

لاقی سەرانسەر لە جێ دەمی تەپۆو میشوولەدا رەش و شین هەڵگەڕابوون و لە کاتێك دا جێ پێوەدانەکەی نیشانی عەلی سەفا دەدا گوتی:

"ئاکا لەبەر ئەمانە بێ کە ئەم جووتیارە زۆردارانەی وایوای زوڵممان لێ‌دەکەن، ئازارمان دەدەن، چما ئاگایان لە حاڵی ئێمەو لەو بەلایانەی بەسەرمان دێن، نیە؟ خوایەگیان! ئیشەڵلا ئەو زەوییانە دەبن بە گلکۆیان، ئیشەڵلا دەبنە گلۆی مندالانیان، گلکۆی ژنەکانیان، گلکۆی خۆیان!"

عەلی سەفا کە زگی بە ژنەکەی دەسووتاو لە دڵ دا خوێن دەگریا، نەڕاندی:

"دیارە دەبن! کارێك دەکەم ئەم زەوییانە بن بە گۆڕیان، گۆڕ، گۆڕ... ئەمن، ئەمن، ئە...من! ئەمن هەرچی پێم خۆش بێ دەتوانم بیکەم... بۆ هەر دڵۆپە فرمێسکێك کە لە چاوی تۆ دێ، گیانێکیان لێ‌دەستێنم! گیانێك! ئەو زوڵمانەی دەرهەقی من و تۆیان کردوون نایەڵم بێ سزا بڕۆن... بە هەموو بیروباوەڕم، بە خاکی پیرۆزی نیشتمانم، بە مەملەکەتم سوێند دەخۆم کە ئەم زوڵمە ناپیاوانەیە، بێ‌جواب نەهێڵمەوە. یەك بەهەزار تۆڵەیان لێ‌دەکەمەوە."

پاشان چوو بۆ لای مەلیحەخانم و دەستی بەسەر مووەکانی دا هێناو بە گەرمترین و میهرەبانانەترین راوێژەوە گوتی:

"لەوەی تۆم هێناوەتە ئەم جێگا پڕ مەترسییەو لەنێو ئەو بیابانەدا تووشی زوڵمی ئەو زاڵمانەم کردووی، داوای لێبووردنت لێ‌دەکەم.

بەڵام بۆخۆشت دەزانی هەتا ئێرە سەرکەوتوو بووم. ئەو زەوییانەی زەوتم کردوون بە کەم مەزانە. بەمیلیۆن قیمەتیانە. ئەگەر راستت دەوێ ئەختێکیش خۆشحاڵم. شتێکی وا بەنرخ ئەگەر بە ئاسانی وەدەست کەوتبایە، ئەو نرخەی نەدەبوو. ژیان خەبات و تێکۆشانە. مەلیحە

ژیان بە بێ شەڕو مل بە ملە قیمەتی نیەو پیرۆزترین شەڕیش ئەو شەڕەیە کە لە پێناوی زەوی دا دەکرێ! وەدەست هێنانی کێلگەیەك بە ئەندازەی وەدەست هێنانی نیشتمان بەنرخە. ئەم دووانە هیچ فەرقێکیان نیە. مەگری مەلیحە. هێشتا زۆر گەنجین. دوارۆژێکی روون و پڕ هیوا چاوەڕێمانە. ئێستاش دەمەوێ بچم تۆڵەی چاوە جوانەکانت لە خەڵکی وایوای بستێنمەوە. بۆ هەر دڵۆپە فرمێسکێکی تۆ هەزار جۆرە بەڵایان بەسەر دێنم. بەزمێکیان پێ دەکەم بۆخۆیان کەیف بکەن. کارێك دەکەم وەك سەگ پەژیوان ببنەوە کە بۆچی هاتنە سەر دنیا، بۆچی لەدایکی خۆیان بوون."

داهاتەوە، مووی سەری ژنەکەی خۆی هەڵدانەوەو پشتە ملی کە بۆترشی ئارەقی لـێدەهات، ماچ کرد:

مەلیحەی خۆم، خۆشەویستەکەم، نینۆکێکی تۆ سەد چوکووراوا دێنێ، کە تۆم هێناو لەو جێگا پڕ مەترسیەیەدا تووشی رۆژڕەشی و پەرێشانیم کردی. بەڵام چ بکەم کە ژیان خەبات و بەربەرەکانێیە. ناچارین."

چووە سەر پلیکانەکان. بەسەر خۆی دا زاڵ ببوو. بانگی زەکەریاو دورسوون دورمووشی کرد:

"چەند کەسێك لەگەڵ خۆتان بێنن و وەرنە ئێرە... پیاوی جێی باوەڕ بێنن، دەچینە شار."

بە سواری وەڕێ کەوتن. خەڵکی شاریش لە هاتنەوەی دێهاتێیەکان بۆ وایوای ئاگادار ببوون. دەیان گوت:

"بەستەزمان عەلی سەفابەگ! بەستەزمانە نە کەس و کارێکی هەیە، نە پشت و پەنایەك. دیسان دێهاتێیەکان هاتنەوەو زەوییەکانیان لـێ زەوت کرد."

کەمێك دوای ئەوەی عەلی سەفابەگ گەیشتە شاری، دەنگۆیەکی دیکە لە نێو شاری گەڕا کە هەموان باسیان دەکردو زیاتریان زگ بە عەلی سەفابەگ دەسووتا.

"بەستەزمانە عەل سەفابەگ پیاوێکی بەدشانس و بێبەختە. پارووی لە زاری خۆی گێڕایەوە، دای بە خەڵکی وایوای خواردیان. ئەگەر یەکێکیان نەخۆش دەبوو، دەسبەجێ دوکتۆرو یاسین خوێن لەبن سەری بوون. ئەگەر بەرد لە نینۆکی یەکێکیان درابایە، دڵی عەلی سەفابەگ شەقار شەقار دەبوو. تەواوی داهات و دارونەداری عەلی سەفابەگ لەبەردەستی جووتیارەکانی وایوایدا بوو. پێیان دەگوت:"عەلی سەفابەگ ئەم کارانە مەکە، دێهاتێیەکان سواری سەری خۆت مەکە ئاکامێکی خراپی دەبێ"، دەیگوت نا... ئەوانەم وەك چاوی خۆم خۆش دەوێ، ئەوانە برای منن، سەروەرو تاجی سەری ئێمەن." ماری لە باخەڵی خۆی دا بەخێو

کرد بۆ ئەوەی پێوەی بداو دان و ئاوی دا بە قشقەڵە هەتا چاوی هەڵکۆڵێ. وەی عەلی سەفای بێچارە... شەوێکیان دێهاتی‌یەکان هێرش دەکەنە سەر مەزراکەی و دەی‌دەنە بەر دەسرێژ. دوو کەس لە پیاوەکانی دەگرن، لە دارێیان دەبەستن و بە زیندوویی کەوڵیان دەکەن. پاشانیش تەرمەکەیان لەت و کوت دەکەن و دەی‌هاوێنە ژووری ماڵی عەلی سەفا."

داستانی کوژرانی ئادەم و زەینەڵ بە ریوایەت و شێوەی جۆراوجۆرەوە ئەوەندە بە سۆزو بەزەیی‌یەوە دەگێڕرایەوە کە ژنانی شاری بە دەم ئاە و ناڵەوە دەیان گوت:

"وەی مەلیحە خانم، وەی... لەبەر خاتری ئەم عەلی سەفا بێ‌ئەقڵە ئێستا دەبێ هەزار جۆرە بەڵات بەسەر بێ."

"ئاخر بنیادەم باوەڕ بە خەڵکی لادێ، بەم جانەوەرانە دەکا؟"

"باوەڕ بەو نان خۆرو ناندێن دڕێنانە دەکا؟..."

"بەو خوێن خۆرانە."

"بەو پیاوکوژانە..."

"بەو پەیکەری ترس و سامە کە ناوی نراوە دێهاتی..."

"چما بنیادەم باوەڕ دەکا؟"

"حکوومەتیش مووی زۆر نەرمە."

"وەی مەلیحەخانم، وەی! وەی بێ‌شانسی غەریب و بێ‌کەس!"

شار ببوو بە دەریایەکی بەزەیی و دڵسۆزی. هەموو چاوبەگریان بوون. خەڵك بە قینەوە تەماشای ئەو جووتیارانەیان دەکرد کە لە بازاڕی شاردا دەهاتن و دەچوون. ددانیان لەو جانەوەرە رووتەڵانە لەچیڕەوە دەبرد کە بە ئەستۆی شل و شەکەتەوە بە ساویلکەیی راوێچکەیان دەکرد.

عەلی سەفابەگ لە پێش دا بەسەرهاتەکەی تا ئەو جێگایەی لەدەستی دەهات و بە زمانی دا دەهات بە راوێژێکی بەزەیی بزوێن بۆ یاوەر فارووق سەرۆکی جەندرمە گێڕایەوە. یاوەر بە بیستنی ئەو هەموو دڵڕەشی و دڵڕەقی‌یە نێوچاوانی گرژ بوو. پاش ئەوەی ئێوارە داهات و دووسێ ئیستیکانێك لە گازینۆکەی "نافیزئۆغلی" خورانەوە، یاڵڵا توانی بێتەوە سەر حاڵی ئاسایی خۆی و لە شوێنەواری ناڵەباری ئەو رووداوانە رزگاری بێ. ورەی قازی و حاکمەکانی شار لە هی یاوەر فارووقیش خەراپتر بوو. لەو نێوەدا تەنیا قایمەقام لە حاڵێك دا بە خۆشحاڵی‌یەوە دەستی رێك دەخشاندن دەی‌گوت:"باشە، جێی خۆشحاڵی‌یە! با ئەو

کافرانە یەکتری بخۆن. ئاغای من، نووری چاوم، لە زەمانی سەروەرمان، پادشامان دا کاری ئاوا دڕندانە دەکران؟"

عەلی سەفابەگ پەنای بردە بەر سیاسەتباز، فەتحیبەگ و فەخرییەشێت و ئەوانیش برووسکە لە دوای برووسکە بۆ ئەدەنەو ئەنکەرەیان لێدا: "جووتیاران ڕاپەڕیون. مەزراکان دەسووتێنن و ماڵان وێران دەکەن. خوێنیان وەڕێ خستوە. زەوییەکانی چوکووراوا لە جیاتی ئاو بە خوێن ئاو دەدرێن! بە خوێن! ئێستا پارێزگار چ دەڵێ با بڵێ، چما هەمووی ئەمانە ڕاست نین؟"

هەر ئەو ڕۆژە دەستەیەك جەندرمە بەڕێ کرانە وایوای. جەندرمەکان یۆبازئۆغڵییان بەتۆمەتی کوشتنی ئادەم و مەلافەرهادیان بە تۆمەتی کوشتنی زەینەڵ گرت.

عەلی سەفابەگ و داواکاری گشتی "المدعی العام" وەك دوو برا دانیشتبوون و بێ پەردە پێکەوە تەگبیرو ڕایان کردبوو، و بەو ئاکامە گەیشتبوون کە ئەو دوو کەسە لە هەموانیان زیاتر بۆ پێوە چەسپاندنی تاوانی پیاو کوشتنەکە دەست دەدەن. چونکە حەسەنی یۆبازئۆغڵی هیچ کەس و کارێکی لە چوکووراوا نەبوو، مەلا فەرهادیش کەس نەیدەزانی لە کوێ ڕا هاتوەتە چوکووراوا.

داواکاری گشتی گوتی:

"سەفابەگ، ئەم مەلایە کابرایەکی گوماناوییە. دەتوانین مەسەلەی جاسووس بوونەکەشی بێنینە گۆڕێ. پێیەوە دەلکێ. تەنانەت خەڵکی وایوایش باوەڕ دەکەن کە جاسووسە. یاڵلا قۆڵی لێ هەڵماڵەو هێندێ بەڵگەی قایم و پتەو لەسەر جاسووس بوونی بدۆزەوە. بەم جۆرە دەتوانین مەلا فەرهادی بگەیەنینە سنووری ئیعدام و لە کۆڵ وڵاتی بکەینەوە. مەلا فەرهادمان باش هەڵبژاردوە. دیارە لەبیرت نەچێ کە ئەو مێزەر بەسەرێکەو هەموو کاربەدەستانی پێتەخت لە ئاخوندەکان دەترسن و چاویان پێیانەوەیە. بەتایبەتی ئەم ڕۆژانە... بەڵام سەفابەگ نیشانەکەمان باش هەنگاوتوە."

عەلی سەفابەگ بە سەرسوڕمانەوە دەستی داواکاری گشتیی گوشی:

"جەنابی داواکاری گشتی. نیشانەکەتان باش هەڵبژاردوە، مەلایەك و شیعەیەك... پشتی ئەو دێهاتییە بێقیمەتانە دەشکێ. ئێوە وەڕێ خستنی شانۆیەکە بە من بسپێرن..."

عەلی سەفا پاش ئەم وتووێژە دەسبەجێ چووە شار.

جووتیارەکانی وایوای، مەلافەرهادو یۆبازئۆغڵییان کە دەستیان لە کەلەبچەدا بوو، هەتا دەرەوەی ئاوەدانی بەڕێ کردو لە کاتێك دا چەپڵەیان بۆ لێدەدان، دەیان گوت:

"زوو بچن و زوو بگەڕێنەوە. مەلا، خوا پشت و پەنات بێ."

وەختێك لە دێی وەدەر کەوتن یۆیازتۆغلی راوەستاو گوتی:

"هەرچەند هەمووی ئەمانەم لێك دابوونەوە، بە پێی خۆم هاتمەوە. دەم زانی وای لێ دێ. بەڵام باوەڕ بکەن ئەمن ئادەمم نەکوشتوە. پیاوکوشتن کارێکی ناشیرنە. دەم زانی کەس باوەڕ ناکا، بەڵام هەر نەبێ ئێوە باوەڕ بکەن کە ئەمن نەم کوشتوە. ئەمانەت تان منداڵەکانم بێ."

مەلا فەرهاد لە پێش دا نیازی نەبوو قسە بکا. بەڵام کەس نەیزانی بۆچی رای خۆی گۆڕی، ئاوڕی دایەوە سەر جووتیارەکان و بە چاوی فرمێسکاوی و دەنگێکی گیراوەوە گوتی:

"ئێوە دەزانن ئەمن کێم و چ کارەم و پێویست بە گوتن ناکا. ئەمن ئیدی نایەمەوە ئەم دێیە. لە دارم دەدەن. گەردنم ئازاکەن براینە."

بریسکەیەك درەوشایەوە.

مەلا فەرهاد لەبن لێوانەوە هێندێك دوعای خوێندن و زەردەخەنەیەکی تاڵ هاتە سەر لێوانی.

وەسبەینێ را دەوروبەری سەعاتی دە گەیشتنە شارۆچکە. دەوری چاوە جوانەکانی مەلا فەرهاد شین ببوو و هەڵمسابوو. دەم و چاویشی شین هەڵگەڕابوون. خوێن بە چەنەگەیەوە وشك ببوو. جلکە شڕو شۆڵەکانیشی شەڵاڵی خوێن بوون. پانتۆڵەکەی ریشاڵ ریشاڵ ببوو و پێخواس بوو. خوێن لە لاقەکانی دەچۆڕاو دەڕژایە سەر خۆڵەمێشی جادەکە.

وەزعی یۆیازتۆغلییش هەزار جار خەراپتر لە هی مەلا فەرهاد بوو.

جێی ساغیان لە لەشی دا نەهێشتبوو. وەك کۆنەپەڕۆیەکی رێك هاتووی خوێناوی دەچوو. وەختێك گەیشتنە نیزیك شاری هەر یەکەی گوریسێکی رەشی ئەستووریان لە ملی کردن.

لە شاری حەشیمەتێکی زۆر بە توێکڵە شووتی و زبڵ و زاڵ و قوڕو داروبەردو هێلکەو تەماتەی گەنیو و سەتڵە دۆی ترشاوەوە چاوەڕێیان بوون. وەختێك لە جادەکەی خوارەوە سەروسەکوتیان دەرکەوت لەگەڵ هات و هاواری حەشیمەتەکە بەرەوڕوو بوون و بارانی توێکڵە شووتی و قوڕو تەماتەو هێلکەمریشکی گەنیویان بەسەردا باری و جنێو و قسەی سووك و نەحلەت و نەفرینیان پێ بەخشرا. مەلا فەرهاد سەری داخستبوو لە پێشەوە دەڕۆیشت و یۆیازتۆغلییش هەر بەو وەزعەوە بە دوایەوە بوو. نە هیچیان دەدی و نە هیچیان دەبیست. ئەو دووانەیان لە نێو ئاپۆرای ئەو حەشیمەتەدا کە دەیان نەڕاندو جنێویان دەداو بەردبارانیان دەکردن، لە پێش دا بردە بازاڕ. "تەلال ئەحمەد غووزی" لە پێش دا لەبارەی ئەو تاوانبارانەو لەبارەی ئینسانەتی و پیاوکوشتنەوە وتارێکی دوورودرێژی خوێندەوە، وتارێك کە بە بیستنی

فرمێسك لە چاوی گوێگران دا قەتیس دەما. پاش ئەم وتارە دیسان بارانی بەردو زبڵ و زاڵ و قوڕو جنێو بەسەریان دا باری.

مەلا فەرهادو یۆبازئۆغلۆیان لە کاتێك دا پەتیان لە مل دابوو و سەدان کەسیان بە دواوە بوو، بە سەرانسەری شارۆچکەدا گێڕا. ئەحمەد غووزی لە هەموو گەڕەکێك وتارە توندو ئاگرینەکەی دووپات دەکردەوە.

وەختێك گەیشتنە بەندیخانە هیچ کامێکیان خۆی بە پێوە ڕانەدەگرت و نیوە بێهۆش لەبن دیواری بەندیخانە تخێڵ بوون.

ئەو شەوە عەلی سەفابەگ لە گازینۆی نافیز ئۆغلی بە شانازیی پیاوە ناودارو ناسراوەکانی شار ئارەق خواردنەوەیەکی پان و بەرینی وەڕێ خست. لەو میوانداریيەدا لەبارەی خەسلەتە باشەکانی زەینەڵ و ئادەم و لەو بارەیەوە کە ئەو دوو کەسە چەندە ئینسانێکی باش و ڕاستگۆ بوون بە درێژی قسەی کردو ئینسانەتی و سروشتە باشەکانی ئەو دووانەی یەك بە یەك باس کردو گوتی ئەوانە بۆیە نەدەبوون ئاوا زاڵمانەو ناپیاوانەو دڕندانە بیان کوژن.

عەلی سەفا ئەوەندە لە ناخی دڵەوە قسەی دەکرد کە ئەو شەوە دڵی هەمووانی لە خەفەتان پڕ خوێن کرد.

## (٤٦)

هەرچەند جارێ مابووی هەتاو بکەوێ، بەڵام دنیا وا رووناك بوو دەت گوت بەیانی ئەنگووتوە. چۆمی ساووران بە هاژەهاژ دەهات و تێدەپەڕی. ئەو گوڵ و پنگانەی لەلێواری چۆمەکە روابوون لە ئاونگ دا شەلاڵ ببوون. مێشەنگوینەو زەرگەتە باڵیان لەسەر پشتێ جووت کردبوون و لەسەر گوڵەکان خەوتبوون و جاروبار جووڵەیەکی وەك هەڵچوون و لەرزینیان لـێدەبینرا.

بن کەپرەکەو دەوروبەری پڕبوو لە توێکڵە شووتیی قاش کراوو قەپاڵە لـێدراو... بۆنی شووتی‌یە رزیو لە سەرانسەری بێستانەکەو دەوروبەری گەڕابوو.

حەمەد ماوەیەك بوو لە خەو هەستابوو و لەنێو بێستانی راوێچکەی دەکردن و بیری دەکردەوە. بەو رووداوانەدا دەچووەوە کە بە سەری هاتبوون. هەموو بەسەرهاتەکان یەك یەك بە پێش چاوی دا تێدەپەڕین. لە کوێ ڕا دەستی پێ‌کردبوو و گەیشتبووە کوێ. ئێستا حکوومەت بە هەموو هێزی خۆیەوەو ئاغاکانی چوکووراوا بە هەموو توانایانەوە بەدوایەوە بوون. دەستە دەستە جەندرمەیان دەناردە راونانی. کێ دەزانێ ئەگەر ئەویش چەتەیەك با وەك چەتەکانی دیکە چیی بەسەر دەهات!

له دڵی خۆیدا دەی‌گوت:"چییان لە گیانی من دەوێ؟"

چەند رۆژ پێشتر وەسمانەزلە بە خۆشحاڵی هاتبووە بێستانەکە:

"شەهێنەکەم، ئاخرەکەی ئەو کارەمان لە دەست هات و پشتی عەلی سەفامان شکاند. ئەو دێهاتی‌یانە کە پێشتر ناوی تۆیان بیستبوو، بەڵام لە ترسان لەدێ‌یەکە هەڵاتبوون، ئێستا کە بیستوویانە ئەتۆ لێرەی، وەغیرەت کەوتوون و رانەوەستاون، وایوای بگرەو هاتم. یۆیازئۆغڵیش هاتوەتەوە. هەتا ئەتۆ لێرەی، تەنانەت ئەگەر هەر لە جێی خۆشت نەبزووی، دێهاتی‌یەکان لەگژ

کێویش ڕادەچن. عەلی سەفاش هەر ئەم ڕۆژانە بە سزای خۆی دەگا. ئەو کوڕە، مووسلووش بەڕاستی هەوڵ دەدا. ئەو کارانەی کە مووسلووش دەیان کا هەمووان پێیان وایە لەبن سەری تۆ دان. لە ڕاستییش دا ئەگەر ئەتۆ نەبای، ئەگەر ئەتۆ غیرەتت وەبەر نەنابان، وەك ژنان لەبن عەلی سەفادا دەخەوتین! ئەمە حەقیقەتێکە!

ئەسپەکانی ئاناوارزا تیژ دەڕۆن
تەپۆکانی وەکوو گورگ پیاو دەخۆن
ئەگەر ماڵی ئاغاکان وێران نەکەی
حەمەد ئێمە دات نانێین بە کوڕی خۆن

ئەم شێعرە کە لەبارەی حەمەدۆکەوە دانرابوو، لەزاری وەسمانەزلە ترازاو دوایەش لەوە کە بە زاری دا هاتوە، پەژیوان بووەوە...

"یانی، مەبەستم ئەوەیە کە ئێمە خۆمان خانووەکانیان بەسەردا دەڕووخێنین، ئەتۆ هەر لێرە دەمێنیەوە، دەخۆی و دەنووی. سێبەرت لەسەر سەرمان بێ، بەسە. هەر ئەوەندەمان بەسە. ئەتۆ لێرە وەمێنە، ئێمە خۆمان کاری خۆمان دەکەین."

پاشان وەسمانەزلە بە راوێژێکی جیددیتر لە حاڵێك دا ترس و ناهومێدی لە چاوانی دا شەپۆلیان دابوو، گوتبووی:

"شەهێنی خۆم، ئەوەندە بزانە کە هەموو خەڵکی ئاناوارزا دەزانن ئەتۆ لە چوکووراوای، بەڵام خەیاڵت تەخت بێ. کەس بە جێی تۆ نازانێ. هیچ کام لە دێهاتییەکانیش لەلای ئاغاکان و فەرمانبەرانی دەوڵەت ئاشکرای ناکەن کە ئەتۆ هاتوویە چوکووراوا. خەڵکی لادێ لە وەختی خۆی دا زۆر ڕازدارن. وەك بەردی سەختیان لێدێ. وەك بەرد کوڕم. ئەتۆ هەر لێرە ئیسراحەت بکە."

حەمەد پاش بیستنی ئەو شێعرە کە وەسمانەزلە خوێندیەوە، تازە تێدەگەیشت کە ئەو خەڵکە چەندیان چاوەڕوانی لەو هەیە. چما پێیان وابوو ئەو کێیەو چ کارەیە؟ ئەو بابایەك بوو چەند ساڵ لە چیاو بەندەنان سووڕابووەوە. بە زۆر ناچاریان کردبوو بچێتە چیاو بەندەنان. زۆری بەڵا بەسەر هاتبوون، دێ بە دێ و کێو بە کێو گەڕابوو، چونکە کونێکی دەست نەکەوتبوو پەنای بۆ بەرێ، هاتبوو پەنای بۆ ئێرە هێنابوو.

حەمەد زۆر تێدەکۆشا بۆ ئەوەی ڕووداوەکانی دەوروبەری خۆی باش تێبگا. زۆر ڕۆژان تا ئێوارێ و زۆر شەوان تا بەیانی لە گژ فکران ڕادەچوو و مێشکی خۆی زۆر ماندوو دەکرد. ئەو

هێندێك لە پێشهات و ڕووداوەكانی دەوروبەری خۆی لەسەر بناخەی ئەزموونەكانی ڕابردووی، حاڵی دەبوو، بەشێكیشیان لە پێش چاوی وەك مەتەڵۆكە وابوون و بۆی هەڵنەدەهاتن. ئەم وەسمانەزلەیەش بەخۆڕایی ئەو غار غارێنەی دەكرد. عەلی سەفابەگ درەنگ یان زوو هەموویانی لەدێیەكەیان وەدەر دەنا. چونكە حكومەتی لە پشت بوو، ئاغاكان لە پەنای بوون و چەندین پیاوی چەكدار لە دەوروبەری. وەسمانەزلە دڵی بە چی خۆش كردوە، بەحەمەدۆك بە تاقە نەفەرێك. وەسمانەزلە نەیدەزانی ئەگەر جەندرمەكان پێبزانن، هەر لێرە دەتوانن لە باتلاغەكانی ئاناوارزادا بیخەنە تەنگانەوەو بە دەستەیەك جەندرمە حەمەدۆكی وی وەك كەوبارە بەدەستان بگرن!

حەمەد بە پێكەنینەوە بە خۆی دەگوت:"تەسلیم نابم، دەم كوژن." بیری دەكردەوە كە باشە، ئەوە دامان نا، دێهاتیەكان عەلی سەفایان كوشت، داخوا عەلی سەفایەكی خراپتریان لێ قوت نابێتەوە، زۆریش لە عەلی سەفا خراپتر! حەمەد ئەو بەڵایانەی هەمزە بەسەر خەڵكی ئاسیاب چەشمەی هێنابوون، موو بە موو بیستبوو:"دەبێ كارێك بكەم. ویستم چاكە بكەم، ئەو بەستەزمانانەم ماڵ وێران كرد. دێهاتیەكان هەرچەندی لێم قەڵس بن، جنێوم پێ بدەن و خراپەم بلێن هەقیانە..."

لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"... ئەم جارە ئیدی لە چوكووراوا بە زیندوویی دەرناچم. لەم بێستانەدا ڕەحەت و ئاسوودە چاوەڕوانی مردنم و فەرمانی ئیعدامم لە ئەستۆی خۆم كردوەو لە دەشتی ئاناوارزادا خەریكی گەشت و گوزارم! ئەگەر عەبدی دەڕۆیشت و هەمزە نەدەهات، كارەكە ئاسان بوو. بەڵام عەبدیەك دەڕواو هەزار هەمزەی لەجێگا شین دەبێتەوە. لە هەل و مەرجێكی وادا هەموو تێكۆشانێك پووچ و بێسوودە. خەباتی وەسمانەزلەش لە وایوای پووچ و بێبەرهەمە... هەر ئەم ڕۆژانە ئێرە بەجێ دێڵن و دەچنە جێیەكی دیكە... ئەگەر چوونە جێیەكی دیكە، لەوێش عەلی سەفایەكی دیكەیان لێ پەیدا نابێ؟ پاییز دانایە، جەندرمەكان لێرە من دەگرن. خەڵكی وایوای جێگاكەی من بە یاوەرێك دەڵێن و خوێنە سوورەكەم دەڕژێتە سەر خاكی ڕزیو و گەنیوی ئاكچاساز. لێرە جگە لەوەی لە كن خەلیلە كۆسە نیوە خەو و نیوە مردوو ڕادەبوێرم، چارەیەكی دیكەم نیە."

لەگەڵ خەلیلە كۆسەش لەبارەی ئەو عەبدیەوە كە ڕۆیشت و ئەو هەمزەیەوە كە هاتە جێگای باسیان دەكرد، مێشكی خۆیان ماندوو دەكرد. بەڵام ڕێگا چارەیەكیان نەدەدۆزیەوە،

بچیە هەر جێیەك ئاغاو جەندرمە هەیە. بچیە هەر کوێیەك حەمەدۆکی دەناسن. ئای... با بڕوا حەمەدۆك، با بڕواتە بن گڵ و لەبەر چاوان ون بێ. لێرە ماوەتەوەو چاوەڕانی مەرگی خۆیەتی. بچێتە هەر کوێیەك و سەر لە هەر بەردێك بدا مردن بە دوای دا دێ!

خەلیلە کۆسە پیاوێکی چالاك و توندو تۆڵ و نەترس و سەرزیندوو بوو. ئەوەندە ئازا بوو هەر ئەوەندەی دەویست چاوێکی لێ داگری هەتا لە چاولێك نانێك دا خۆی بگەیەنێتە ماڵی عەلی سەفابەگ. حەمەد بە سەرسوڕمان و ئافەریمەوە چاوی لە خەلیلە کۆسە دەکردو بۆ خەلیلیش بە هیچ جۆر جێی باوەڕ نەبوو کە حەمەد ئاوا ترسی ڕێنیشتبێ و بێدەسەڵاتانە چاوەڕوانی مەرگی خۆی بێ.

لەدڵی خۆی دا دەیگوت:"حەمەدۆك وا دەبێ؟ دوور نیە، لەوانەشە حەمەدۆکەکان وا بن!" بەڵام ئەو ڕۆژە کە خەبەری گیرانی مەلا فەرهادو یۆبازئۆغلێیان بیست، خەلیل بە دیتنی قەڵافەتی حەمەدۆك ناچار بوو چاو بە بۆچوونەکەی خۆی دا بخشێنێتەوە. دەم و چاوو دەست و دەنگ و هەموو شتێکی حەمەد لە نەکاو بە جارێك گۆڕان. تەنانەت قەوارەی هەموو لەشی لەپڕ گۆڕانی بەسەردا هات و خەلیلە کۆسە بە خۆشحاڵییەوە لە دڵی خۆی دا گوتی:"ئەو حەمەدۆکەی باسی دەکەن، دەبێ ئاوا بێ، دەبێ ئەم جۆرە بێ."

سەیران خەریك بوو تەواوی ئەو بەڵایانەی بەسەر مەلا فەرهادو یۆبازئۆغلێ هاتبوون، لە زنجیری قورسی دەستەکانیانەوە هەتا دژکردەوەی خەڵکی شار هەمووی موو بەموو دەگێڕایەوە... حەمەد بێدەنگ بوو. خەلیل لە نەکاوێك دیتی ڕوخساری حەمەد بە جارێك گۆڕا. دەم و چاوی وەك دەمە شمشێرێکی تیژیان لێ هاتبوو. یەك دوو جار لە چاوەکانی دا نوورێکی چووکەڵە پریشکی هاویشت و پاشان بریسکەیەکی پۆڵایین هات و لە بنی چاوەکانی دا جێگیر بوو.

سەیران لەپڕ لە قسەکردن وەستاو بە سەرسوڕماوییەوە جۆرێك لە حەمەدەوە ڕاما دەت گوت یەکەم جارە دەیبینێ. دەت گوت ئەو پیاوە هەر ئێستاو هەر لەم لەحزەیەدا پاش ون بوونێکی زۆر گەڕاوەتەوە. بریسکەی پۆڵا هەروا لە چاوەکانی دا دەدرەوشا.

بێدەنگییەکی قووڵ وڵاتی داگرتبوو. قووڵ و بەسام... دەنگی باڵی مێشوولەش نەدەبیسرا. دنیا گەرم بوو. هەموو شتێك لە ڕووناکایییەکی سەرسوڕهێنەردا دەسووتا، دەتوایەوەو دەڕۆیشتە خوار.

تیشکێکی زەرد لە مێشکی حەمەد دا دەدرەوشا، بڵێسەی لێ هەڵدەستا، بڵاو دەبووەوەو تیشکی رەنگ زەرد بە رووناکایی‌یەك کە چاوی لەبەر هەڵنەدەهات و زۆر بە خێرایی، دەسووڕاو بڵاو دەبووەوە. دنیا هەمووی زەرد هەڵگەڕابوو. دنیا لە تیشکێکی زەرد دا کە دەڕژیشتە خوار، دەخرۆشاو بڵاو دەبووەوە، نوقم ببوو.

حەمەد بە لاجەلاج هەتا سەر کانی‌یەکە چوو. چەند جار سەری لە ئاوی کانی‌یەکەدا کە وەك سەهۆڵ فێنك بوو، قوم کردو هێنایەوەدەر. پاشان بە چالاکی لەنێو بێستانەکەدا لەکاتێك دا بەرپێی خۆی نەدەدی و لاقی لە بڕکەکان دەگیرا، وەڕێ کەوت. ئێستا لە دەوروبەری، هەموو شتێك لە نێو چووبوو. گیاکان، دارەکان، گابەردەکانی ئاناوارزا، ئاو، خاك، قامیشەڵانی ئاکچاساز، کێوە پاڵ وێك داوەکانی ئەوبەر، هەموو شتێك سڕابووەوەو لەو نێوەدا وەك پەیکەری رق و قین لە جێی خۆی مابوو. خەلیل و سەیران چاویان لێ‌نەدەترووکاند. حەمەد ماوەیەکی زۆر راوێچکەی کردن. رۆیشت و گەڕایەوە، رۆیشت و گەڕایەوە... پاشان قیت لە نێوەڕاستی بێستانەکە راوەستا. وەك شمشێرێکی تیژ دەچوو کە بە زەوی دا چووبێتە خوار.

خەلیل چووە لای و گوتی:

"براله، حەمەد ئاوا لەوێ قیت رامەوەستە. دنیا زۆر گەرمە تاو دەت با. نەخۆش دەبی."

چوونەوە بن کەپرێ. هەزاران زەرگەتەو ژەنگەسوورەو مێشەنگوینەو مێشەڕەشکە لەسەر توێکڵە شووتی‌یەکان هەڵفڕین و باڵە تەنك و بلووری‌یەکانیان لەبەر تیشکی توندی هەتاو بە هەزاران لەرزەوە بریسکانەوە.

حەمەد تەماشای سەیرانێی کرد. ئەم جارە روخساری بیچمێکی دیکەی پەیدا کرد. بوو بە روخسارێکی هێدی، دۆست، شیرن و لەبەردڵان. زەردەخەنەیەکی کردو لە کاتێك دا لەبن کەپرەکە دادەنیشت، گوتی:

"وەی مەلا فەرهاد، وەی! وەی کە دڵ و غیرەتی شێری هەبوو. ئەمن هەرگیز مەلای وام نەدیبوو. خەلیل! دەزانی وەسمانەزلە چیی دەگوت؟"

خەلیل گوتی:"نـ...ا"

"گوتی ئەگەر عەبدی برواو هەمزەش بێتە جێگای، دیسان لەم جیهانەدا هیچ شتێك پووچ و بێ‌سوود نیە... تێکۆشان دروست و بەرهەقە. خەبات بەرهەق و دادپەروەرانەیە. خەبات و ململانێی راست و دروست هەرگیز پووچ و بێ‌بەرهەم نابێ."

کەمێك روخساری بە پێکەنین کرایەوەو دووبارە نێوچاوانی گرژ بوو:

"دەبێ ئێوە بەجێ بێلم و برۆم. بچمە کوێ؟ خەریکم زەبر لەو بەستەزمانانە دەدەم. مەلا فەرهاد لە بەندیخانەیە. لەوانەشە لەسەر هیچ و خۆڕایی ئەو بەستەزمانەی لەدار بدەن، ئەوان بە لایەنگریی من لەگەڵ عەلی سەفا بەربەرەکانی دەکەن. بەڵام عەلی سەفاش دەست هەڵناگرێ، شەڕێکی بێبەزەیی‌یانە دروست دەبێ، ئاکامەکەی چ دەبێ، هیچ! ئاکامەکەی ئەوەیە وایوای تێدا دەچێ... بچمە کوێ؟ کێوەکان، ئینسانەکان و دڕك و داڵیش ئێمە قبوولْ ناکەن."

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

وەسمانەزلە زۆر شتی گێڕابووەوە. پیاوێکی زرینگ و بەهۆشە. بۆخۆشی وەك رۆژ لێی روون بوو کە لە بەرامبەر عەلی سەفادا تێدەشکێن و دەیزانی ئەگەر عەلی سەفا بڕوا کەنعان سەفا جێگای دەگرێتەوەو بەڵایەکیان بەسەر دێ هەزار جار خەراپتر لەوەی عەلی سەفا. بەو حاڵەوە پیرەپیاو مردنی خۆی لە پێش چاو بوو، بەڵام دیسانیش دەستی لە هەوڵ و خەبات هەڵنەدەگرت. عادەتەن بنیادەم کە پیر بوو گیانی خۆی زیاتر خۆش دەوێ. بەڵام وەسمانەزلە ئەو مەسەلەیەی پێ گرنگ نەبوو. ئەگەر ئەو نەبایە نەك هەر پیاوێك بەڵکوو پشیلەیەکیش لە دێی دا نەدەماو لەمێژ بوو تەسلیمی داواکانی عەلی سەفا دەبوون. هەموو ساڵێ لە مانگەکانی رێبەندان و رەشەمەدا لە بیابانەکانی جنووبەوە هەزاران ئاسك دەهاتنە چوکووراواو دەشتی ئاناوارزاو ڕەوە ڕەوە ئاسك لەو دەشتەدا دەگەڕان و دەلەوەڕان. لەسەر سەری ئاسکەکان قەرەقووشی تیژباڵ بە باڵە نووك تیژەکانیانەوە دەفڕین... خێرایی فڕینی قەرەقووشەکان لە خێرایی ئاسکەکانیش زیاتر بوو. دەهاتن، لەسەر پشتی ئاسکەکان هەڵدەنیشتن و لە پشتەوەڕا بە دەندووك چاوی ئاسکەکانیان هەڵدەکۆڵی و دەیان خوارد. وەسمانەزلە دەیگێڕایەوە:

"ئاسکە کوێرەکان دڵی بەردیان بۆ دەبوو بە ئاو. ئەو وەختەی ئێمە لاو بووین سەدان ئاسکی کوێرو داماو لە دەشتی ئاناوارزادا دەسووڕانەوە. هیچ کەس دڵی نەدەهات بیان گرێ و سەریان ببڕێ. هەروا بۆخۆیان دەمردن."

حەمەد پێی خۆش بوو بیر لە حاڵی ئاسکە کوێرەکان بکاتەوەو بە دەنگێکی بەرز دەیگوت:"ئەمن ئاسکێکی کوێرم کە کەوتوومە دەشتی ئاناوارزا، ئاسکێکی کوێری بێچارە کە بووەتە دیلی چەنگی قەرەقووش..."

لە دەشتی ئاناوارزا بەیان دەنگووت. رووی زەوی بەمژێك داپۆشرابوو کە بەرزایی‌یەکەی دەگەیشتە پشتێن. وا دەهاتە بەرچاو کە دارەکان لاسکیان نیەو کەوتوونە سەر مژەکە.

تاریك و روونی بەیانی دیسان ئەو تارماییەیە هات و لەم لای بێیەکانەوە لەسەر تەپۆلکەیەکی چووکەڵە راوەستا. حەمەد لە حەوتوویەك لەمەوبەرەوە ئەو تارماییەی کە دەهات و لەوێ رادەوەستا بە باشی ناسیبوو.

تارمایی ئەسپێکی خەنەیی عەرەبی بوو.

ئەسپی خەنەیی سەرانسەری شەوێ لەدەشتایی خوار نارلیقشلا لینگی دەدا، بەچوار نالّی دەڕۆیشت، دەیحیلاندو هەر کە ڕووناکاییەکی دەدی وەك فرفرە بە دەوری خۆی دا دەسووڕاو پاشان لە حالێك دا هێشتا زۆری مابوو بەیان بنگوێ، دەهاتە بێستانەکەو ئارام و بێ دەنگە دەنگ دەچووە سەر تەپۆلکەکەی ڕووبەڕووی بێیەکان و بێئەوەی مووی لـێبزوێ لە جێی خۆی رادەوەستا. حەمەدیش هەموو شەوێ هێشتا ئەسپەکە نەهاتبوو لەو مێش بەندە کە خەلیل بۆی دروست کردبوو دەهاتە دەرو لە دوورەوە تەماشای ئەو ئەسپەی دەکرد کە لە وەختی دیاریکراودا دەهاتە بێستانەکە. پەیکەری ئەسپی خەنەیی لەڕووناکایی بەرە بەیان دا کە هەر دەهات و زیادی دەکرد، ئارام ئارام دەردەکەوت. لە وەختی تاوهەڵات دا پەیکەری ئەسپەکە لەبەر تیشکی هەتاو جوانییەکی تایبەتیی بەخۆیەوە دەگرت و دڵی حەمەد بەرامبەر بەو جوانییە بێوێنەیە دەکەوتە لێدان و نەیدەتوانی چاو لەو ئەسپە وەرگێڕێ.

هێشتا چاوی لە ئەسپەکەوە بڕیبوو و هەناسەی راوەستابوو. بە وردی تەماشای دەکرد کە لە پەردەی تاریکی دەهاتە دەر. هەر کە ئەسپەکە لەبەر تیشکی هەتاو دەرکەوت دیسان تووشی دڵەکوتە بوو. لەمێژ ساڵ بوو دڵی لە بەرابەر جوانی دا ئاوا لێی نەدابوو. لەگەڵ هەموو تاوهەڵاتێك دەیگوت:"رەسەنی ئەم ئەسپە لە رەسەنی بنیادەمیش جوانترە." نێوقەدی باریکی ئەسپەکە پتر راکشابوو. گوێ ناسك و باریکەکانی تیژ کردبوو و کلکە درێژەکەی کە دەگەیشتە سەر گوێزینگی بە حاڵ و باڵ رادەوەشاند. یاڵە درێژەکانی بەسەر لاملی راستی دا کەوتبوون. مووە تەڕو خاوێنەکانی کە دەت گوت مشت و ماڵ کراون، دەبریسکانەوە. رەنگی پێستی ئەسپی خەنەیی لەبەر تیشکی هەتاو دەگۆڕا. جارێك وەك زێوی سپی وابوو و جارێك وەك شەوە رەش دەچوو، و چونکە مێش و مەگەز لەسەر پێستە سفت و لووس و راکشاوەکەی نەدەنیشت، پشتی نەدەلەرزی. ئێستا لەگەڵ تاو گەرم بوون، ئەسپی خەنەیی دەجووڵێ. بە هەموو هێزیەوە سەری بە راست و چەپ دا رادەوەشێنێ، پاشان ئەندامی دوو هێندەی درێژایی لەشی رادەکێشێ.

پان تر و گەورەتر دەبێ و وەك هەور دەخزێ، درێژ دەبێ، پان دەبێ، گەورەتر دەبێ و وەك ئەستێرە رادەخزێ بۆ سەر ئاکچاساز. پێستەکەی هێدی هێدی رەنگی زێو بەخۆیەوە دەگرێ و دوایە وردە وردە کەم رەنگ و کەم رەنگ تر دەبێ و لەبەر چاو ون دەبێ. لەگەڵ ئاسمان و قامیشەڵان و ئاوو دارەکانی دەبێتە یەك و دەڕوا.

حەمەد هێشتا لەبارەی ئەو ئەسپەوە کە هەموو بەیانان دەیدی، شتێکی بە خەلیلە کۆسە نەگوتبوو. هەموو رۆژێ لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ئاها، ئێستا تاوێکی دیکە کۆسەی وەخەبەر دێنم و ئەسپەکەی پێ نیشان دەدەم." پاشان وا نوقمی تەماشای ئەسپەکە دەبوو کە لەبیری دەچوو خەبەری بکاتەوەو ئەسپەکەش لێی دەدا دەڕۆیشت و خێرا لەئاکچاسازدا لەگەڵ قامیشەڵان تێکەڵ دەبوو و لەبەرچاو ون دەبوو.

حەمەد بە غاردان چووە کەپرەکەو بەدەنگێکی ئەسپایی و لەسەرەخۆ، بە هەژانەوە گوتی:

"خەلیل، خەلیل، هەستە!"

خەلیل دەسبەجێ لە جێی دەرپەڕی، بە پشتە دەستی چاوەکانی هەڵگلۆفین. وەك منداڵێك دەچوو کە وەختێك لە خەوێی هەڵدەستێنن، لێوان هەڵدەچنێ و ئامادەی گریانە. پاشان دەرپێیەکەی هەڵکێشا.

"وەرە خەلیل..."

حەمەد بن پیلی گرت و بەدوای خۆی دا رایکێشا.

"لێرە راوەستین."

خەلیل کە ئەختێك وەخۆ هاتبووەوە، بە خەواڵوویی پرسی:

"چیە، چ بووە؟"

حەمەد بە قامك ئەسپەکەی پێ نیشان داو گوتی:

"ئەو ئەسپەی ببینە... ئەوەتا لەوێ..."

تاوێك راوەستان. وەختێك چاوی خەلیل کە بە تەواوی خەوەکەی رەوی بوو، بە تاریکایی راهات، گوتی:

"دەزانم، ئەم ئەسپە زۆر باشیش دەناسم."

پاشان بێدەنگ بوو و قسەیەکی دیکەی نەکرد. لەپەنای یەکتر چاویان لە ئەسپەکەوە بڕی. هەردووکیشیان دەیان زانی چ دەبێ. سووچێکی هەتاو وەدەرکەوت و ئەمجار ئەسپی خەنەیی بە هەموو جوانیەیەکەوە دەرکەوت. تەکانێکی دایە خۆی وەك ئەوەی بیهەوێ بفڕێ. سێ جار لاقی پێشەوەی هەڵێنان و هاتە سەر پاشووان. ئەمجار لەبن دارە بێیەکانەوە خزی بۆ سەر ئاکچاسازو تێکەڵ بە قامیشەڵان بوو.

خەلیل گوتی:

"ئەمن ئەسپێك دەناسم، ئەم ئەسپە..."

پاشان دەستی كرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەسپەكە...

حەمەد گوتی:

"خەلیل با ئەو ئەسپە بگرینەوە. ئەمنیش دەزانم. ئەو شەوەیماڵی یۆبازئۆغڵی سووتا، ئەمن لە نێو دێی بووم... لە وایوای بووم... ئەگەر بتوانین ئەو ئەسپەی بگرینەوە..."

خەلیل بە دڵنیایییەوە گوتی:

"كەس ناتوانێ ئەو ئەسپەی بگرێتەوە، كەس ناتوانێ تەنانەت لێشی نیزیك بێتەوە. ئەسپێكی سەیرو سەمەرەیە. دەبینی جارێك لە نەكاو ماوەیەك ون دەبێ و لە هیچ كوێ دیار نیەو جارێكی دیكە كە بە هیچ جۆر چاوەڕوان نی، لەبەرچاوت قوت دەبێتەوە. كەس نازانێ لە كوێوە دێ و دەچێتە كوێ..."

حەمەد هەناسەیەكی هەڵكێشاو گوتی:

"ئاخ، بریا توانیبامان ئەو ئەسپە بگرینەوە."

خەلیل گوتی:

"فكری ئەو ئەسپە لە سەری خۆت بەرە دەرێ."

پاشان پاشماوەی بەسەرهاتی ئەسپەكەی گێڕایەوە.

## (٤٧)

حەمەد تازە خەریك بوو خەوی لێبکەوێ کە لە نەکاو بە حیلەی ئەسپێك کە عەرزو عاسمانی لێك دەدروون، راپەڕی. بە دوای حیلەی ئەسپەکەدا دەنگی هاویشتنی سێ گوللەش بەرز بووەوە. ئەسپەکە لە پەستا دەیحیلاند. وەك حیلەی سام ڕێنیشتووی ئەسپێك دەچوو کە هەتا سنووری شێت بوون ترسابێ. حەمەد لە هەرزاڵەکەی هاتەخوار، بێئەوەی خۆی پۆشتە کاتەوە، بە پەلە تاوی دا تفەنگەکەی و ڕۆیشت. گەیشتە سەر ساووران، پەڕیەوە ئەوبەرو لە پشت تەپۆلکەیەکی چووکەڵە دامەزرا. خەلیلیش بە ئارەق گیرو دەرپێوە بە دوای دا هاتبوو.

حەمەد کاتێك خەلیلی بە پێوە دی، رقی هەستاو بانگی کردو گوتی:

"وەرە نێرە."

خەلیل هات و لە پەنای وی چۆکی دادا. لە دوورەوە دوو تفەنگی دیکەش هاوێژران و حیلەی ئەسپەکە توندترو شێتانەتر بوو و شەوگار دەنگی دایەوە.

حەمەد لە رووبەڕووی خۆی سێرەی لەو جێگایە گرت کە بڵێسەی تفەنگەکانی لێهەستابوو و پێنج فیشەکی پێوەنان. لەوە کە لەو نیوەشەوەدا تەقەی لە گڕی تفەنگێکی نەناسراو دەکرد، تووشی حاڵەتێکی سەیر بوو. تاوێك دواتر دیتیان تارمایی ئەسپێك بە خێرایی و کەمێك دوور لە خۆیان بە پێشیان دا رابرد. حەمەدو خەلیل ماوەیەك هەر لەوێ چاوەڕێ مان. تارمایی ئەسپەکە لەبەر چاویان ون بوو، ڕۆیشت و دەنگی پێی لە دوورەوە هاتە بەر گوێ. گوێیان بە عەرزییەوە ناو گوێیان بۆ دەنگی سمی ئەسپەکە هەڵخست. دەنگەکە دوور کەوتەوەو دوور کەوتەوەو پاشان بێدەنگ بوو.

ئەم تفەنگانە بە چیەوە نرابوون؟ داخوا جەندرمەکان حەشارگەی حەمەدیان دۆزیبووەوە؟ ئەگەر حەشارگەکەیان دیبێتەوە کێ خەبەری پێ داون؟ تەنیا دایەقەمەر، وەسمانەزلە، مەلا فەرهادو، سەیران بەم حەشارگەیان دەزانی، لەگەڵ سەیفەلی مل درێژ... کە ئەگەر لەت و کوتیشیان کردبان، جێی حەمەدیان بە جەندرمەکان نەدەگوت. نەکا مەلافەرهاد لە بەندیخانە لە ژێر ئەشکەنجەدا درکاندبیەتی، یان خەلیل؟ حەمەد ئاوڕی دایەوەو چەند لەحزەیەك لەبەر شۆقی مانگەشەو تەماشای روخساری خەلیلی کرد. داخوا خەلیل لەوانە بوو راپۆرتی لـێبدا؟

"خەلیل، بە فکری تۆ کێ جێگاکەمانی بە وان گوتوە؟"

خەلیل گوتی:

"نازانم. کەس پێی نازانێ هەتا پێیان بڵێ. ئەوانەی دەش زانن ئەگەر لەت لەتیان کەی ئاشکرای ناکەن."

"ئەدی سەیفەلی؟"

"تەماشای ئەو ملە درێژەی مەکە، دەڵێی قازە. سەیفەلی پیاوێکی بەغیرەتە."

"خەلیل، ئەگەر لێرە گەمارۆ بدرێین رێگای دەربازبوونمان نیە. ئێرە وەك کێوپارە نیە. لە کێوی هەر تاتە بەردێك و هەر چڵە درکێك بنیادەمی دەشارێتەوە. لەم دەشتەدا هەموو شتێك پیاوی ئاشکرا دەکا. چوکووراوا بۆیە نابێ متمانەی پێ بکەی. یاڵڵا هەستە بچینە ئاکچاساز، یان ئەگەر حەز دەکەی ئەتۆ هەر لێرە چاوەڕێ بە."

خەلیل گوتی:

"ئەمنیش لەگەڵت دێم. ئاخ بریا چەکێکم بووایە..."

"بچۆ لەبن کەپرێ دەمانچەکەی من هەڵگرەو بیهێنە."

خەلیل بە غاردان چووە بن کەپرێ و دەسبەجێ دەمانچەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە. حەمەد داهاتەوەو گوتی:

"بڕوانە... بڕوانە هۆوێ تارماییەك خەریکە دێ."

خەلیل تەماشای کردو گوتی:

"تفەنگیشی پێیە، بەڵام جەندرمە نیە."

پیاوەکە بۆ لای وان دەهات.

حەمەد گوتی:

"ئەمن لێرە دەچمە نێو قامیشەڵان، ئەتۆ بچۆ پێشێ. زۆرم لێبووەتە مەراق. دەمەوێ بزانم کێیە. پاشان لە ساووران پەڕییەوە، چووە نێو پۆلە قامیشێکی پڕو دانیشت.

لە پڕ لە خوارەوە دیسان دەنگی سمی ئەسپ بەرز بوو. تارماییەکە بە بیستنی ئەو دەنگە تاوێك راوەستاو پاشان دەسبەجێ چوو لە پشت تەپۆلکەیەکی چووکەڵە لەسەر زگ درێژ بوو. حەمەد گوێی لە خڕەی چەخماخ بوو. دەنگی سمی ئەسپەکە بەرە بەرە نیزیکتر دەبوو. لە پشت تەپۆلکەکەوە سێ جار گڕ بەرز بوو و دەنگی تەقە شەوگاری قەڵاشتەوە. بە دوای دەنگی تفەنگەکان دا ئەسپەکە پڕ بە گەرووی حیلاندی و زۆری پێ نەچوو دەنگی پێی ئەسپەکە نەما.

تارماییەکە دوو سەد هەنگاوێك لەولای خەلیل بوو. خەلیل دیتی ئەو لە جێی خۆی هەستا. خەلیلیش بە خۆی نەبوو لەگەڵ وی هەستایە سەرپێ. تارماییەکە خەلیلی دیت و چەند هەنگاوێك بۆ لای هات، بەڵام لەبەر هەرچییەك بوو راوەستاو پاشان گەڕایەوەو بە غاردان رای کردەوە ئەو جێگایەی لێی ڕا هاتبوو.

خەلیل گوتی:

"ئاغای خۆم، حەمەداغا، کابرا خەریکە رادەکا. چ بکەم؟"

حەمەد لە قامیشەڵان هاتە دەرو بە غاردان هاتەوە لای خەلیل. تارماییەکە چووبووە نێو ئاودڕێك و نەدەبینرا.

مانگ بەسەر بەردەڵانەکانی ئاناوارزادا شۆڕ ببووەوە. بەردەڵانی ئاناوارزا لە دوور لەبەر شۆقی مانگەشەو وەك گەمییەکی گەورەی بە زێونەخشاو دەچوو کە لە نێو تەم و مژدا بە ئەسپایی دەچووە پێش و لە بن پێشی دا باتلاغی ئاکچاساز بە قامیش و جەگەنە مژاوی و تاریکەکانیەوە وەك دەریا دەهاتە بەرچاو. تاوێکی دیکە کە مانگ ئاوا بوو، بەردەڵانەکانی ئاناوارزا لە تاریکاییدا نوقم دەبن و وەك سێبەرێکی نادیار دێنە بەرچاو.

حەمەد گوتی:

"پێویست نیە هیچ بکەی. دیتت سێرەی لە چی گرتبوو و تەقەی لێدەکرد؟"

خەلیل وەڵامی دایەوە:

"دیتم، تەقەی لەو جێیە دەکرد کە دەنگی پێی ئەسپەکەی لێوە دەهات."

حەمەد پرسی:

"ئەسپەکە کەسی سوار بوو؟ ئەمن هیچم نەدی."

خەلیل وەڵامی دایەوە:

"ئەمنیش نەم دی."

"ئەسپەکە بۆ کام لا چوو؟ نەکا ئەسپەکەی خۆمان بێ."

خەلیل بە دڵنیایی‌یەوە گوتی:

"ئەسپی خۆمان بوو."

شەوێکی گەرم بوو. بە زەحمەت هەناسەیان هەڵدەکێشا. تەیرێکی سەیر پەیتا پەیتا بە دەنگێکی شووم کە مووی لەشی بنیادەمی راست دەکردنەوە، دەیخوێند. شەو لەبەر دەنگی باڵی تەپۆیان گرمەی دەهات. تەپۆیەکان وەك کۆمەڵە هەورێکی پڕ هێرشیان هێنابووە سەر حەمەدو خەلیل، حەمەد گوتی:

"سەیر بوو. بەڕاستی چوکووراواش جێیەکی سەیرە. کابرایەك لە نیوەشەوێ دا دەچێتە دەشتێ و ئەسپێك وەبەر تفەنگان دەدا. ئاخر ئەمە کارە؟ بە تایبەتی کە ناش توانێ ئەسپەکە بپێکێ. ئاخر شتی وا دەبێ؟"

خەلیل دیسان زۆر بە دڵنیایی گوتی:

"ئەسپەکەی خۆمان بوو."

بە قسەکردن چوونەوە سەر هەرزاڵێ و چوونەوە نێو مێش بەندەکە. مانگ ئاوا بوو. ئەستێرەکان زۆرترو گەورەتر بوون. ئەستێرەکان لە زەمینەیەکی شین دا نێژرابوون. ئاسمان بە ئەستێرە رازابووەوە. لە ئاسمان لەبەر ئەستێرەی زۆر جێگا نەبوو دەرزی لێ فڕێ بدەی. هیچ ئەستێرەیەك ئاوا نەدەبوو. شەوێکی کڕو مات و بێ با بوو.

دەنگی ئارامی هاژەی ساوورانیان دەهاتە بەرگوێ.

دیسان دەنگی سمی ئەسپەکە بیسترایەوە. بەڵام وا دیار بوو ئەسپەکە زۆر دوورە. دەنگی پێی ئەسپەکە وردە وردە نیزیك دەکەوتەوە.

حەمەد لە مێش بەندەکە هاتە دەرو لە هەرزاڵەکە هاتەخوارو گوتی:

"براله خەلیل، زۆرم لێبووەتە مەراق کە بزانم ئەسپەکەمان کەسی سوارە یان نا؟"

خەلیل گوتی:"ئەمنیش دەمەوێ بێم" و لە هەرزاڵەکەی هاتە خوار. دیسان هاتنەوە جێی پێشوویان و لە پشت تەپۆلکەکە خۆیان حەشار دا:

"دەنگی پێی ئەسپەکە بەرە بەرە نیزیکترو ئاشکراتر دەبوو. ئەسپەکە هات و راست لەو لەحزەیەدا کە بە پێشیان دا تێدەپەڕی، ئەوانی دیت و سڵەمیەوەو هاتە سەر پاشووان. تارمایی

ئەسپەکە چەند جارێك بەرەو ئاسمان کشاو ئەمجار هاتەوە خوار. ئەسپ لەبەر چاویان ون بوو. ڕۆیشت و لە دوورەوە دەنگی سمەکانی بیسترا.

حەمەد گوتی:

"ئەسپی خۆمان بوو."

خەلیل دووپاتی کردەوە:

"ئەسپی خۆمان بوو."

"یەکێك دەیەوێ بیکوژێ."

خەلیل گوتی:

"عەلی سەفابەگ دەیەوێ."

"ڕەنگە."

چوونەوە سەر هەرزاڵێ و لە مێش بەندەکەیان خزینەوە. ئەو شەوە هەتا بەیانی دەنگی سمی ئەسپەکە نیزیك دەبوو و دوور دەکەوتەوە. گەلاوێژ لە ئاسمان دا خۆی نواند، شەو فێنك داهات. گەلاوێژ دەدرەوشا. چوار پێنج هێندەی ئەستێرەیەکی ئاسایی دەبوو. جارێك وەك هەتاو دەدرەوشاو جارێکی دیکە نوورەکەی مات و لێڵ دەبوو. نوورەکەی جارێك مەیلەوزەردو جارێك ئاماڵ سپی دەبوو. ڕەنگی دەگۆڕی، وەك گڕی ئاگر دەدرەوشایەوەو پاشان وەك سەهۆڵ دەی‌بەست.

لە هەرزاڵێ هاتنەخوار. لە نیزیك بی‌یەڵێین لەنێو پۆلە قامیشێك دا خۆیان شاردەوە. ئەسپەکە هێدی هێدی وەك ئەوەی لەسەر نووکی لاقی بڕوا بە هەنگاوی درێژ درێژ هات و لە شوێنی هەمیشەی خۆی دا ڕاوەستا.

بەرە بەرە کە هەوا ڕوون دەبوو، پەیکەری ئەسپەکەش دەردەکەوت و ڕوونتر دیار بوو. ئارەقی کردبوو. شوێنەواری کەف لەسەر مل و کەفەڵی دەبینرا. ئەسپی خەنەیی تەڕ بوو و لەبەر تیشکی یەکەمین ڕووناکایی هەتاو دەدرەوشایەوە. ماندوو بوو، ملی بەردابووەوە، دەت گوت خەوی لێ‌کەوتوە.

خەلیل پرسی:

"لێی نیزیك ببمەوە، بەڵکوو بۆ من ڕام ببێ؟ حەیوانات، ئەوانەی لە هەمووانیش وەحشی‌ترن، لەبەر من هەڵنایەن، تەنانەت چەقەڵ و ڕێوییش لە من ناسڵەمنەوە."

حەمەد بێ‌دەنگ بوو.

خەلیل هەستا. کەوشەکانی داکەندن و بە رۆینێکی وەك خزین چوو بۆ لای ئەسپەکە، لە ئەسپەکە نیزیك بووەوە. لەگەڵ نیزیك بوونەوە، لێکدا لێکدا "کوڕوو کوڕوو"ی بۆ دەکرد. ئەسپ چووکترین گۆڕانی بەسەر خۆی دا نەهێنابوو. خەلیل هەرچەندی لە ئەسپەکە نیزیکتر دەکەوتەوە، هومێدی زیاتر پەیدا دەکردو حەمەدیش زۆر بە ئیشتیاوە چاوی تێوە بڕیبوو. خەلیل لە ئەسپەکە نیزیك و نیزیکتر کەوتەوە. سێ هەنگاوی مابوون بیگاتێ. راست لەو لەحزەیەدا کە دەیەویست خۆی فڕێ داتە سەر پشتێ و سواری بێ، ئەسپ گوێی لە چەرمەوە بردن، ئاوڕی دایەوە سەر خەلیل و بە روانینێکی وەك روانینی ئادەمیزاد تەماشای خەلیلی کرد، سەری هەڵێناو لە نەکاو هەستایە سەر پاشووان.

حەمەد دیتی کە بەژنی ئەسپەکە چۆن درێژ بوو و ئەندامی لە کوێوە تا کوێ راکشا. ئەسپی خەنەیی بە چاولێك نانێك لە بێستانی دەرچوو، و وەك بریسکە تێی تەقاند. هەتا چەند لەحزەیەك سێبەرێکی رەشی درێژ کە بەسەر بێستانەکەدا بازی دەدا، لە بنی چاوەکانی حەمەدو خەلیل دا مەلەی دەکرد.

## (٤٨)

سەیران هەروا دەیگوت:

"دایە، دایە، دایەقەمەر ئەمەش بوو بە کار؟ دڵم گڕی گرتوە، سەرم لە گێژەوە دێ. خۆم بەسەر پێوە ڕاناگرم. دایە ئەمن دەترسم."

دایەقەمەر بەختەوەرو خۆشحاڵ بە پێکەنینێکی بە ماناوە گوێی بۆ قسەکانی ڕادەگرت. بەڵام لە ڕوخساری دا شتێکی وەك بەزەیی پێداهاتن بەدی دەکرا:"کچە بێمرادەکەم، جوانترین ئافەریدەی سەر دنیا، دیسان ڕێگاکەت لێ‌گۆڕاوە. ترسەکەت بەجێیە. لەروانگەی وانەوە حەمەدۆك چەتەیەکەو چەتەش ئەمڕۆ زیندوویەو سبەینێ کەس نازانێ چیی بەسەر دێ. دیسان ئەی جوانی جوانان، ئاگرت لە دڵ بەردەبێ و بڵێسەی لێ‌هەڵدەستێ."

بەڵام ئەوەی بەدڵی دا دەهات لەگەڵ سەیرانێ باسی نەدەکرد. پاش عەزیز، ئەمەش حەمەد... مەخابن، بەختی جوان چاکان وەك ڕوخساریان جوان نیە. جوان چاکان بە بەختێکی ناشیرنەوە لە دایك دەبن. لەو چەند ساڵە دا پیاو لە ئاوایی دا نەما ئاشقی سەیرانێ نەبووبێ، لە کاتێك دا ئەو تەنانەت چاوێکیشی لە چاوی هیچیان نەکرد. چونکە دەیگوت، هیچ پیاوێك نایەتە سەر جێوبانی عەزیز... سەرەنجام هات و ئاشقی حەمەدۆك بوو. ئەوینێکی وا ناهومێدانە دەردێکی گرانە، و ئەو کوڕیژگەیەش بە هیچ جۆر لە فکری دا نیە، ئەو کچە چەندین ڕۆژە بە سەوداسەری هێلانەی لە چاوانی دا کردوە، بە هەر بیانوویەك بێ، بەشەو یان بەڕۆژ دەچێتە سەردانی هەتا گوێی لە دەنگی بێ و هەرکە دەرفەتێکی بۆ ڕێ‌کەوت دادەنیشێ و هەتا بەرەبەری ئێوارێ لە ڕوخساریەوە ڕادەمێنێ. یانی پیاوێك ئەم حاڵەتە تێ ناگا، ئەویش

پیاوێکی بەهۆشی وەك حەمەد. ڕەنگە ئەویش بزانێ ئەم ئەوینە بێئاکامەو بۆ ئەوەی کچەکە لەوە زیاتر ئازار نەچێژێ، خۆی بێمەیل نیشان دەدا.

دایەقەمەر پێی گوت:

"خەفەت مەخۆ کچم. هەر پیاوێك بت بینێ ئاشقت دەبێ. قسەی تێدا نیە ئاشقت دەبێ. لە دێیەکی وا گەورەدا پیاوێکم بۆ وەبینە لە جوان و پیرو ساغ و نەخۆش کە ئاشقی تۆ نەبووبێ. لە تەیری ئاسمانەوە بگرە تا مارو مێرووی سەر زەوی ئەگەر نێرینە بێ، ئاشقت دەبێ. حەمەد کارەساتی زۆر گەورەی بەسەر هاتوون. ئەو کارەساتانە بەستەزمانەیان لە پێ خستوە."

سەیران بە سۆزی دڵەوە دەیگوت:

"چاوم لـێناکا دایە، هەر چاو لە چاوم ناکا. لە حاڵی من بێخەبەرە. هەر بە فکریشیدا نایە. وەختێك تەماشاشم دەکا هەر دەپرسێ "عەبدی ڕۆیشت هەمزە هات. ئەمە ڕێگاچارەی چیە؟" لەوە زیاتر بیر لە هیچ شتێك ناکاتەوە. ناتوانێ ئەو فکرە لە سەری خۆی دەرکا. ئەم فکرە وەك خۆرکە خەریکە مێشکی دەخوا. لەوانەشە هەر لە فکری خەجیجێدا بێ. خەجیج لە من جوانتر بوو؟"

سەیران لەنێو دێ دا حاڵەتێکی پڕ لە نیگەرانی و هەژانی هەبوو. لە گژ فکران ڕا دەچوو و هەمیشە دەچووە دەرەوەی ئاوەدانی و دەیڕوانیە لای بێستانەکەو بەو کارە نەختێك سوکنایی دەهات. هێندێ جاریش لە حاڵێك دا جینگڵی دەدان ئازایانە لەبەر خۆیەوە دەیگوت:"ئەگەر بزانێ ئەمن ئاشقی بووم و خۆشی ئەوێم و ئەمەشم پێ بڵێ، خۆم دەکوژم." ڕوخساری ئاسك بەڵام پیاوانەی حەمەد لەبەرچاوی لانەدەچوو. وەختێکیش تامەزرۆیی سەرتاپای لەشیی دادەگرت، بێئارام و قەرار دەهاتە لای دایەقەمەرو بە پاڕانەوەوە دەیگوت:

"دایە خەریکم دەمرم. شتێك پەیدا بکە بۆی بەرم."

دایەقەمەریش بە پێکەنینەوە دەیگوت:

"کچە شێتەکە، هەرچی لەم ماڵەدا بوو هەڵت گرت و بردتە بێستان. ئیدی هیچت نەهێشتوە کە..."

پاشان شتێکی پەیدا دەکردو دەیدا بە سەیرانێ کە بیباتە بێستان و لە دڵی خۆی دا دەیگوت:

"کچە شێتەکەم، جوانی جوانانم، کچە بێبەختەکەم، بێکەسە ناهومێدەکەم ئاخری کارەکەت چ دەبێ؟"

سەیران هیچ لە فکری بەرودوایی کاری خۆی دا نەبوو، تەنیا بیری لە حەمەد دەکردەوە کە:"ئازارێکی پێنەگا، نینۆکی لە بەردێك هەڵنەنگوێ، با سەیران لە تاوان بمرێ، با لە داخ و ترسی ئەو بەڵایانەی بەسەر حەمەدی دێن بمرێ..."

رۆژێکیان بەیانی دیسان سەیران هاتە ماڵی دایەقەمەر، شەوێ تا بەیانی دڵۆپێك خەو نەتکابووە چاوەکانی:

"دایە، ئەمن ناتوانم ئۆقرە بگرم، شتێك وەبینە بۆی بەرم."

هەرچەندی گەڕان و بیریان کردەوە، شتێکیان دەست نەکەوت بیبا. هەرچی لە ئاوایی دا هەبوو و ئەوەی لە ماڵێ دەست دەکەوت، سەیران هەمووی لەگەڵ خۆی بردبوونە سەر بێستان. سەیران هەر رۆژە بە بیانووی بردنی شتێك وەك سیر، رۆنەکەرە، هەنگوین، گۆرەوی، کراس و دەسحێب دەچووە سەر بێستان.

"ئەم جارە بە دەستی بەتاڵ بچۆ. ئاوا باشترە. ئەگەر هیچ لەگەڵ خۆت نەبەی، بۆی دەبێتە فکر کە بۆچی هەموو رۆژێ دەچیە وێندەرێ. چەند رۆژێك بە دەستی بەتاڵ بچۆ. ئەودەم ئەویش فکری بۆ پەیدا دەبێ کە ئەو کچە بۆ هەموو رۆژێ دێتە ئێرە؟"

سەیران نەیدەتوانی ئەو کارە بکا. لەبەر چاوی وی بە دەستی بەتاڵەوە چوون بۆ بێستان وەك مردن وابوو. بە دەست بەتاڵی چوون قەدری دەهێنایە خوارو ئەو هەستەی بۆ پێك دەهات کە دەڵێی رووت و قووت لە پێش چاوی حەمەد راوەستاوە.

ماڵەکەیان سەنگ و سووژن نا، زۆریان فکر کردەوە، بەڵام شتێکیان نەدیەوە بە کەلکی بردن بێ. لە نەکاو دایەقەمەر هاواری کرد:"دیمەوە"و دەسبەجێ چووە سەر سندووقە دارگوێزە نەخشاوەکەی. بە پەلە سندووقەکەی هەڵپچڕی، هەڵی کۆڵی و زوو ئەو شتەی لێی دەگەڕا دیتیەوە. پاشان لە کاتێك دا مۆدنە زەردە کارەبایەکەی لە دەستیدا رادەوەشاند، دایە دەستی سەیرانێ و گوتی:

"ها بگرە. بۆ ئەمڕۆ ئەمەت بەسە. سبەینێش خوا کەریمە، شتێك پەیدا دەکەین. وەختێك ئێمە زەماوەندمان کرد ئەم دارجگەرەیە کەریم ئۆغڵی ئاغای گوندی "یۆرووك" بۆ مام وەسمانتی هێنابوو."

سەیران دەستی لەستۆی دایەقەمەر کرد، ماچی کردو گوتی:

"به قوربانت بم دایه، دایکی ئینسان و دڵپاکم..." پاشان له نەکاو قسەکەی بڕی و سێبەری خەفەتێك نیشته سەر دەم و چاوی و له کاتێك دا دارسیغارەکەی بۆ لای دایەقەمەر رادەداشت گوتی:"ئاخر ئەو جگەرە ناکێشێ."

"کچە شێتەکە. ئێمەش دەزانین ئەو سیغار ناکێشێ. هەڵی گرە، بیبە."

سەیران قانیع بوو و دەسبەجێ وەڕێ کەوت. لەبەر گەرماو لەنێو تۆزوخۆڵ دا ئەوەندە خۆش دەڕۆیشت دەت گوت غار دەدا. پشووی سوار ببوو و ئارەقی دەرکردبوو. جلەکانی شەلاڵی ئارەق بوون. ئەو بۆ ئەوەی لەحزەیەك زووتر بگاتە بێستان خۆی بە ئاوو ئاوردا دەدا.

وەسبەینێ ڕا مریشکیان سوور کردەوەو رۆژی سێهەم سەیران سەرشیری بۆ حەمەد برد...

سەیران ئیدی شەرمی دەکرد بچێتە ماڵی دایەقەمەر. هەموو رۆژێ ئێواران هەر کە خۆر ئاوا دەبوو، ئارام و بێدەنگ، بێئەوەی کەس بیبینێ لە ماڵێ وەدەر دەکەوت، دەچووە بێستانێ و چاوی لەو هەرزاڵەوە دەبڕی کە حەمەد لەسەری دەنووست و هەتا تاو هەڵدەهات لەوێ چاوەڕوان دەما.

ئاپۆرای تەپۆو مێشوولە شالاویان بۆ دێناو دەستەکانی سەیران لە تەپۆ دەرکردن ماندوو دەبوون. تەپۆیەکان تەنانەت لەسەر جلەکانیشیەوە پێیانەوە دەدا.

شەوێکیان سەیران قیڕووسیای لێکردو بە زگەخشکە خۆی گەیاندە بن هەرزاڵەکەی حەمەدو سەرانسەری شەوێ گوێی بۆ دەنگی هەناسەکانی راگرت و سوکنایی هات.

پیاوێکی چەکدار هەتا بەیانی لە دەوروبەری بێستانەکە دەخولایەوە. یەکی کورتەبالا بوو، کاتێك بە ڕێ دا دەڕۆیشت، هەستی پێی نەدەهات. جار جاریش دەهاتە نیزیك هەرزاڵەکەو گوێی هەڵدەخست و پاشان بە غاردان دەگەڕایەوە بۆ لای ژووررووی ئارلیقشلاو دوور دەکەوتەوە.

سەیران لەو بارەیەوە هیچی بۆ حەمەد باس نەدەکرد. چونکە بەرامبەر بەو پیاوە چەکدارە خۆی بە پارێزەری حەمەد دەزانی و لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"با ئەو بخەوێ، ئازایەکەم، بەجەرگەکەم با بخەوێ، ئەمن لێی وریام."

شەوێك لە شەوان پیاوێکی چەکدار هات و راست رووبەڕووی هەرزاڵەکە لەسەر لێوی ساووران راوەستا. پاشان لاقە پڕ لە برینەکانی درێژ کردو شوتنی. پیاوێکی کورتەبالا بوو. سەیران بە زەحمەت تارماییەکەی دەدی. لە جێی خۆی هەستاو چوو بۆ لای پیاوەکە. کابرا دەسبەجێ راپەڕی، گەڕایەوەو ئامادەی راکردن بوو. سەیران بانگی کرد:

"راوەستە. ئەتۆ کێی؟"

"پیاو"ەکە هەر کە دەنگی ژنێکی بیست راوەستاو چاوەڕێ ما. سەیران لە ئاوەکە پەڕیەوە، هاتە کن تارمایی‌یەکەو بە تووڕەیی لێی پرسی:

"ئەتۆ کێی. هەموو شەوێ لێرە چ کارێکت هەیە؟"

کابرا گوتی:

"ناوم ئادەمە. میرشکاری عەلی سەفابەگم... ئەسپێکمان بەرەڵلا بووە، ئاغا پێی گوتووم... ئاغا پێی گوتووم کە... هەتا ئەسپەکە نەگریەوە، نابێ بێیەوە... ئەوە چەند مانگە..."

سەیران نەختێکی دیکە لێی نیزیك بووەوە. ئادەم لەسەر قسەکانی رۆیشت:

"دەزانی چیە خوشکێ، ئەم ئەسپە ئەسپ نیە... ئە...رێ. ئەسپ نیە، جندۆکەیە، پەری‌یە، وەك تارمایی و خەیاڵە... لەپڕ دەبینی لەبەر لووتت قوت دەبێتەوەو لە نەکاو دەبینی ون بوو."

سەیران ئەو سام رێ‌نیشتنەی پێشێی نەماو گوتی:

"دەیان گوت ئەتۆ کوژراوی. یۆیازئۆغلی‌یان گرت بردیانە بەندیخانە. دەڵێن ئەو تۆی کوشتوە."

ئادەم وەڵامی دایەوە:

"ئەمن خەبەرم نیە. ئەمن ئاگام لە هیچ نیە. ئەم ئەسپە جندۆکەیە، پەری‌یە..."

پاشان وەرسووڕاو هەتا تینی تێدابوو بەرەو بەستێن غاری دا. حەمەد کە لە دەنگی وتووێژی ئەو دووانە وەخەبەر هاتبوو، خۆی لە هەرزاڵەکە فڕێ داو نەڕاندی:

"کێ‌یە؟"

سەیران لە حاڵێك دا دەلەرزی دەسبەجێ لەسەر عەرز درێژ بوو. بە بیستنی دەنگی حەمەد دەست و لاقی سست بوون.

حەمەدو خەلیل چەند جاریان بانگ کرد. دەوروبەری بێستانەکەیان سەرانسەر پشکنی. بەڵام کەسیان نەدیتەوە.

هەتا لووتکەی کێوەکان روون بوو و گەلاوێژ درەوشا، سەیران نەی‌توانی لەو جێی لێی راکشابوو، هەستێ، و هەر لەوێ بە دەست و لاقی سست و لەرزۆکەوە مایەوە. خاکی گەرم لەشی گڕگرتووی ئەوی گەرمتر دەکرد.

## (٤٩)

بە دەنگی تەقە لە خەوێکی شیرن راپەڕین. دێ گەمارۆ درابوو و لە هەر چواردەوری دەنگی تەقە دەهات. خەڵکی ئاوایی کە چاوەڕوانی شتێکی وا نەبوون و پێیان وابوو هەموو شتێك تەواو بووە، ئەو شەوەش ئاسوودەو ئارام لێی خەوتبوون. دەنگی تەقە جار بەجار نیزیکتر دەبوو و چەند لەحزە دواتر لەنێو ئاوەدانی دا دەنگی دەسرێژ بەرز بووەوە.

ئۆغڵەمەیەك دێیەکەی وەبەر دەسرێژ داو شەو پڕ بوو لە شیوەن و گریانی ژن و منداڵ. ئەسپان دەیان حیلاند، سەگ دەوەڕین، کەڵەباب دەیان خوێند، ژنان هاواریان دەکردو منداڵ دەگریان. دەنگی تەقە بڕایەوەو دەنگی سمی ئەسپان بەرە بەرە دوور کەوتەوەو دوایە بێدەنگ بوو.

لای پارشێوان دیسان دێ وەبەر دەسرێژ درایەوە. دیسان ئەسپان حیلاندیان و سەگ وەڕین و زێڕو هۆڕی ژنان دەرو دەشتی پڕ کرد. دەنگی گریانی ژنەکان وردە وردە دوور کەوتەوەو چووە نێو قوولایی شەو و بێدەنگ بوو.

جووتیاران لە ماڵەکانیان هاتنەدەر. پەلاماردەران سێ کچی ئەو ماڵانەیان کە تازە هاتبوونەوە بە پرچان راکێشابوون و لەگەڵ خۆیان بردبوون.

ئەو رۆژە جووتیارەکان بێئەوەی دەست لە رەش و سپی بدەن یان قسەیەك بکەن، بە دەست و باڵی هەڵواسراوەوە لەنێو دێ دا دەهاتن و دەچوون.

شەوی دواتر دیسان سوارەکان هاتنەوە. پاش گوللەباران کردنی دێ سێ کەوێڵیان ئاور دان. بۆ بەیانی عەلی سەفا دورسوون دورمووشی ناردە ئاوەدانی.

دورسوون دورمووش هاتە ئاوەدانی، رووی کردە سەیفەلی و گوتی:

"بەستان نیە؟ ئاغا دەڵێ ئەگەر بەسیان نیە، ئەگەر دێیەکە چۆڵ ناکەن و نارۆن ئێمە بەرنامەمان زۆر بە دەستەوەن. گوتمان ئێوە برای ئێمەن، کەس و کارمانن، بەڵام..."

ئەمجار دورسوون دورمووش دەستی لەبەر پشتێنێ ناو وەك عەلی سەفا کەمێك خۆی بە پشتەوەدا شکاندەوەو بە لاسایی کردنەوەی ئەو دەستی بە قسان کرد:

"نە دێیەك، نە پێنج دێ و نە پارێزگاری ئەدەنە هیچیان دەرەقەتمان نایەن. دێهاتیەکان! هاونیشتمانان، براینە، ئەوەی بزانن کە ئەگەر لە ماوەی حەوتوویەك دا ئەم دێیە چۆڵ نەکەن و نەڕۆن و بتانەوێ کەللەشەقی بکەن، دەبێ فاتیحەی دێیەکەتان بخوێنن، هەرچی گیان لەبەری لەم دێیەدایە لە پیاوو منداڵەوە بگرە تا باڵندەو مێروولە هەموو لەنێو دەچن. شەوێك دێیەکە گەمارۆ دەدەین، شەوێك کە بایەکی بەقەوەتی بێ، ئاگری تێبەردەدەین. نایەڵین گیان لەبەریش لە دێی وەدەرکەوێ. هەرکەسیش بیهەوێ وەدەرکەوێ بە تفەنگ لێی دەدەین و لەنێو ئاگرەکەی داوێینەوە. ئێوە چەند دێهاتیەکی بێویژدان بوون، چەند بێقیمەتن. بۆچی زەوی و زاری خەڵك چۆڵ ناکەن و نارۆن؟"

پاشان خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و رۆیشت.

کەمێك دواتر دێیەکە تووشی شڵەژانێکی سەیر بوو: هێرش کەران ئەو سێ کچەی بردبوویانن شەکەت و کفت و ڕووت و قووت بە مەمکی خوێناوی و لەشی رەش و شین هەڵگەڕاوەوە لە پشت ئاوەدانی بەرەڵڵایان کردبوون. کچەکان لە کاتێك دا بە دەستێك ئەدەبی خۆیان داپۆشیبوو و بە دەستەکەی دیکەیان هەوڵیان دەدا مەمکە خوێناوییەکانیان داپۆشن، شپرزەو پەرێشان هاتنەوە نێو دێ. هەریەکەی چارشێوێکیان بەسەردا دان و بردیاننەوە ماڵەکانیان. کچەکان هەرسێك نەخۆش بوون. لەلایەن ژمارەیەکی زۆرەوە دەستدرێژی بە ناموسیان کرابوو.

لە مەخفەرەوە ژمارەیەك جەندرمە هاتنە ئاوەدانی، بەڵام جووتیارەکان پێیان گوتن هیچ نەبووەو شکایەتیشیان نیە.

سەفچەکاهیا دڵی پڕ لە خوێن بوو، لە حاڵێك دا یەکجار زۆری رق هەستابوو لە دڵی خۆی دا گوتی:"بۆچی پێم نەگوتن کە حەمەدۆك لێرەیە؟" راوەستا تا شەو داهات. وەختێك کوڕەکەی و کچەکانی و نەوەکانی خەوتن بەسپایی لە جێی هاتەدەر. پێویست نەبوو خۆی پۆشتە کاتەوە، چونکە هەر بە پۆشتەیی راکشابوو. دەسبەجێ وەڕێ کەوت. داخوا مەودای نێوان ئاوەدانی و کێڵگەکەی عەلی سەفا چەند بوو؟ داخوا بەیانی دەیتوانی بگاتە وێندەرێ؟

وەختێك هەتاو کەوت نیوەی ڕێگاکەی بڕیبوو. لای ئێوارێ بوو کە توانی بە لاژە لاژ خۆی بگەیەنێتە باڵەخانەکەی کێلگەی عەلی سەفابەگ. عەلی سەفابەگ لە ماڵێ بوو. بەدیتنی سەفچەکاهیا تێگەیشت دەبێ خەبەرێك هەبێ.

سەفچەکاهیا دەیگوت:

"کوڕی خۆم عەلی ئاغا ماندووم، شەکەتم، برسیمە خەریکە دەمرم. هێندێ قسەم پێتە، بەڵام لە پێش دا دەبێ کەمێك بێمەوە سەرخۆم."

دنیا یەکجار گەرم بوو، وەختێك شەو بەسەر دەستان دا هات تازە سەفچەکاهیا دەهاتەوە سەرەخۆ. بەدۆی ساردو تاس کەباب و کەودەری‌پڵاو میوانداری‌یان لێ‌کرد. سەفچەکاهیا پاش ئەوەی نانەکەی خواردو تەواوی کرد، گوتی:

" قسەکانمان تایبەتین. نابێ لە خەڵکی گوندی کەس بزانێ کە ئەمن هاتوومە ئێرە. ئەگینا دەم کوژن. ئەو جانەوەرانە لەت و کوتم دەکەن. ئەمن لە ژیانی خۆم دا جانەوەرم زۆر دیون، بەڵام خەڵکی وایوای جانەوەرێکی دیکەن. خوا ئەگەر ددانیان بداتێ نابێ نینۆکیان بداتێ و ئەگەر نینۆکی دانێ نابێ ددانیان بداتێ!"

عەلی سەفا دەستی گرت و هەڵی‌ستاندو بردیە ژوورێکی دیکە. دنیا یەکجار گەرم بوو. عەلی سەفا گوتی:

"فەرموو ئاغای خۆم، گوێم لێتە."

سەفچەکاهیا بە ڕستەی "ئەتۆ من ناناسی عەلی ئاغا..." دەستی بە قسان کرد:

"بابی تۆ نیزیکترین دۆستی من بوو. سەردەمێك هەردووکمان کوێخا بووین. ئەمن کوێخای وایوای بووم و ئەو کوێخای چیك چیك لار... مەبەستم لە کوێخا ئەوەیە کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن موختار. مەبەستم ئەوەیە کە تۆ تەمەنت کەمە، ئەودەم هێشتا نەببووی. ئەوە زەمانێك بوو کە عوسمانی‌یەکان دنیایان گرتبوو. هاتووم پێت بڵێم کە مەترسی‌یەکی گەورە لەسەر سەرت دەسووڕێ."

عەلی سەفا شڵەژاو گوتی:

"بڵێ مام سەفچە."

"دەت کوژن..."

"کێ دەیەوێ بم کوژێ؟"

"بۆخۆی، هەر ئەم ڕۆژانە."

"کێ دەیەوێ بم کوژێ؟"

سەفچەکاهیا بە راوێژێکی ئارام و هێدی گوتی:

"حەمەدۆك عەلی ئاغا! حەمەدۆك دەیەوێ بت کوژێ."

عەلی سەفا بە شڵەژانێکی زیاترەوە گوتی:

"حەمەدۆك لە کوێیە؟ کەنگێ هاتوە، چیی لێ‌هاتوە، کەنگێ؟ چەند کەسی لەگەڵن..."

ئەوەی لێی دەترسا، خەریك بوو بەسەری دەهات.

"زۆرم بیر کردەوە. دوو مانگە بیر دەکەمەوە، نەم دەویست پێت بڵێم. بەڵام نەم توانی. رازی نەبووم بمری. ئێستاش هاتوومەماڵێت کە ئەو خەبەرە ناخۆشەت بدەمێ."

عەلی سەفا گوتی:

"تێ‌گەیشتم، رەعیەت هەتا یەکێکی لە پشت نەبێ، ئاوا کەڵلەشەق نابێ. ئێستا حاڵی بووم. حاڵی بووم."

"مەسەلەکە روون بووەوە؟..."

"ئێستا ئەوان لە کوێن، چ دەکەن؟"

"راوەستە عەلی ئاغا، سەبرکە! نازانم دوو مانگ پێش بوو، سێ مانگ پێش بوو یان زیاتر، شەوێك گوتیان حەمەدۆك هاتوەتە ئاوەدانی. چووم گەیشتمە بن تووە گەورە دیتم قیامەتە... درم بە حەشیمەت داو چوومە لایان. لەنێوەڕاستێ ئاگریان کردبووەوە. لەبن دارتووەکە بەرەو مافوورەیان راخستبوون. سەیفەلی سێ مەڕی سەر بڕیبوون. خەریك بوون قسەیان دەکردن. ئەوەی پێ‌یان دەگوت حەمەدۆك کابرایەکی یەکجار کەڵەگەتی باریك بوو. بەڕاستی خوا بەژن و باڵایەکی سەیری پێ دابوو. وەك سپیدار دەلاژایەوە.

سەیفەلی، سەیفەلی مل درێژی دەڵێم گوتی:"بەخێر بێی، خێرو بەرەکەتت هێنا، چۆن بوو پەیدا بووی؟" پاشان پرسی:"بۆچی هاتووی؟" ئەویش گوتی:"هاتووم عەلی سەفای بکوژم. بیستوومە زوڵم لە دێهاتی‌یەکان دەکا." گوتی:"لە چیای ڕا هەربۆیە هاتوومە چوکووراوا کە ئەوی بکوژم."

"نێ، کەوایە وای گوت... بەڵێ؟"

"وای دەگوت. دیارە زۆر شتی دیکەشی گوت:"ئەگەر ماڵێ ئاغاکانم بەسەریان دا نەڕووخاند ناوی خۆم دەگۆڕم." گوتی:"عەبدیم کوشت، بەڵام عەبدی شتێك نەبوو، دەبێ عەلی سەفای بکوژم هەتا ناویانگم لە دنیادا، لەکێوان دا هەتا ئەنکەرە دەنگ بداتەوە!" زۆر

پێ‌کەنی. ئەوەندە پێ‌دەکەنی کە... دەیگوت:"ئێستا ئەو، ئەو عەلی سەفابەگە بێ‌خەبەرە." دەیگوت خەبەری مەرگی خۆی نیە، نازانێ ئیزرائیل لە چیاو بەندەنان هاتووەتە خوارێ."

عەلی سەفا گوتی:

"با وا بێ. من، من، من من من... چەند کەس دەبن؟"

"زۆرن... زۆر... هەموویان چەکدارن. فیشەکدانەکانیان گوڵدۆزی کراوە. ژمارەیان یەکجار زۆرە. چاوەکانی دەت گوت پۆڵان. پەیتا پەیتا سوێندی دەخواردو دەیگوت:"دێهاتی‌یەکان! مەترسن. هەتا ئەمن ماوم مەترسن. هەتا ئەمن ماوم منەت لە شاو سوڵتانیش هەڵمەگرن. دەرەقەتی هەموویان دێم." دەستەکانی زۆر زەلام بوون. دەستێکی پێوە بوون وەك چنگورکی هەڵۆ. دەیگوت:"ئەگەر نەتوانم عەلی سەفا بەگی بکوژم بۆچی ناوی خۆم ناوە حەمەدۆك و وەچیاو بەندەنان کەوتووم، ئەدی بۆ پێم دەڵێن شەهێنی چیاکان؟" پیاوەکانی پێیان نەدەگوت حەمەدۆك. ناوی نهێنی‌یان بۆ داناوە. هەمووان پێیان دەگوت شەهێن."

"ئێستا لە کوێیە، لە دێیە؟"

"زۆر زرینگ و زۆڵە! چما لە دێی دەمێنێتەوە؟ ئەو تەنانەت لە دێی ئێمەش تاقە شەوێك مایەوە. دەیگوت:"ئەمن بە نیاز نیم لە چوکووراوا بمێنمەوە. هەر ئەم رۆژانە کارەکەم تەواو دەکەم. هەر ئەم رۆژانە لەجیاتی ئاو خوێنی عەلی سەفا دەخۆمەوەو لەو گەرمای هاوینەدا دڵی خۆم فێنك دەکەمەوە، پاشان دووبارە دەچمەوە چیاو بەندەنان، چەتە دەبێ لاقێکی لە چیا بێ و لاقێکی لەنێو لێرەوار." دەیگوت:"هەتا ئەوم نەکوشتوە لە چوکووراوا ناڕۆم." قسەکەی هەر ئەمە بوو و هیچی دیکەی نەدەگوت."

"ئێستا لە کوێ بێ باشە. ئەتۆ خەبەرێك مەبەرێکت لێی نیە؟"

دەنگی بە تەواوی دەلەرزی.

سەفچەکاهیا گوتی:

"با، هەمە..."

لە پەستاش هەناسەی هەڵدەکێشان و لە دڵی خۆی دا دەیگوت:"ئا...خ خ خ! ئەگەر هەر ئەو رۆژەی حەمەدۆك هاتبوو خەبەرم پێ دابا کە هاتووەتە چوکووراوا ئەم ناپیاوە پڕوپووچە دەترساو ئەو هەموو بەڵایەی بەسەر نەدێناین." رەنگی روخساری عەلی سەفابەگ وردە وردە شین هەڵدەگەڕاو سەفچەکاهیا بە دیتنی ئەو دیمەنە لە خۆشی‌یان لە کەوڵی خۆی دا جێی نەدەبوو:

"هەمە، خەبەریم هەیە. ئێستا رەنگە لە چیای "حەمیدە" بێ. لەبن ئەو دارە کە خەڵك بۆ مرادخواستن دەچنە بنی. ئەمە یەك... لەوانەیە لە قەڵای ئاناوارزا بێ، ئەمە دوو. لەوانەیە چووبێتە لای "قەرەتەپە" ئەوە سێ. لەم دەشتەدا نابێ بۆی بگەڕێی. ناو کابرا گەڵەگەتە، ئەو حەمەدۆکە چەتەیەکی زۆر زرینگ و حەرام زادەیە."

عەلی سەفابەگ لە فکرەوە چوو، چاوەکانی بریسکەیەکیان دا، تەواوی ئەندامی لەشی لە نۆبەتێ دا گڕیان گرت و روخساری رەش ئەسمەری سوور هەڵگەڕا. پاشان ئارەقێکی ساردی دەرکرد.

سەفچەکاهیا گوتی:

"ئەو خوێن خۆرە تۆ دەکوژێ. وریای خۆت بە. شتێکی دیکەی دەگوت. دەیگوت:"پیاوێکی زۆر گەورەم لە پشتە." دەیگوت:"عەلیەفەندی چووزانێ ئەمن کێم لە پشتە." دەیگوت:"ئەگەر ئەم عەلی سەفابەگە بزانێ ئەمن کێم لە پشتە." دوور لە رووتان پەرژینێکی قایم بێ، دەیگوت "عەلیسەفابەگ". دەیگوت:"ئەگەر عەلی سەفابەگ بزانێ لە ترسان لێوی دەقەڵشن، دێی ئێوە هیچ، هەموو خاکی چوکوورااوا ئەنەدۆڵ بەجێ دێڵێ و هەتا ئەوبەری دەریای مەڕمەڕە رادەکا. بەڵام مەیەڵن پێبزانێ. چونکە هەڵدێ و ناتوانم بیکوژم. ئەوەکا. ئەوەکا، ئەوەکا بزانێ! ئەم جۆرە سەگانە عادەتەن ترسەنۆکن. ئەم بێقیمەتانە وەك کەروێشك بێغیرەتن. ئەوەکا پێبزانێ، ئەگینا هەڵدێ." دەیگوت:"با لە هەموو شتێك ئاگادار بێ، بەڵام مەیەڵن ئەو یەکەیان بزانێ."

عەلی سەفا بە توندی راچەنی. خەریك بوو چاوی پێ دەرپەڕن، ئەڕاندی:

"ناوەکەی گوت؟ ئەو کەسە کێیە؟"

سەفچەکاهیا بە دەم خۆ خاوکێش کردنەوە گوتی:

"ناوەکەی نەگوت. ئەو زۆر زرینگە! چما دەیلێ؟ بەڵام تێگەیشتم پیاوێکی زۆر گرنگە، لە ئەنکەرەش دادەنیشێ."

عەلی سەفا لە حاڵێك دا هاواری دەکرد:"بۆخۆم دەزانم" دەرپەڕی و گوتی:"دەزانم کێیە" پاشان هات رووبەڕووی سەفچەکاهیا راوەستا. دەستی پیرەپیاوی گرت و ماچی کردو لەسەر سەری داناو گوتی:

"دۆستی بابم! ئەتۆ ژیانی منت نەجات دا. فکری هەموو شتێکم کردبوو، تەنیا ئەمەیانم بەفکردا نەهاتبوو کە حەمەدۆك بۆ کوشتنی من هاتوەتە چوکوورااوا."

سەفچەکاهیا دەستی گرت و لە کاتێك دا دەستی بەسەردا دێنا گوتی:

"ئەتۆ زوڵمت کرد. ئەتۆ زۆر زوڵم لەو خەڵکە دەکەی عەلی ئاغام. زوڵم هیچ وەخت کارێکی باش نیە." عەلی سەفا دەستی لە دەستی وی راپسکاوت و وەك بەردێکی بێدەنگ چاوەڕێ ما تا بزانێ سەفچەکاهیا چ ئاکامێك لە قسەکانی خۆی وەردەگرێ.

"کارێکی باشت نەکرد کە یۆبازئۆغلی و مەلافەرهادت بە گرت دا. یەکیان پیاوی خوایەو ئەوی دیکەشیان بابایەکی غەریب و بێچارەیە. زەینەڵ و ئادەم ئەوان نەیان کوشتوون. پیاوەکانی حەمەدۆك کوشتوویانن. هەر پیاوەکانی ویش هەموو شەوێ ماڵەکەت وەبەر تفەنگان دەدەن. راکێشانی کچەکانی دێی ئێمەو دەستدرێژی بەوانیش کارێکی دروست نیە... دووپاتیان مەکەوە عەلی ئاغا، دەت کوژن. ئەمشەو بچۆ لە جێیەك خۆت بشارەوە. ئەمشەو نا سبەی شەوێ دەیانەوێ ماڵەکەت بەسەردا وێران بکەن. بیستوومە حەمەدۆك دەیەوێ بە دەستەیەکی سەد کەسییەوە بێ و هێرش بکاتە سەر ماڵەکەت. بڵێ مەلا فەرهادی ئازاد بکەن. ئەسپ و ماین و گاوگۆلەکەمان وێ دەوە."

عەلی سەفا ئەڕاندی:

"نایان دەمەوە. یا دێهاتییەکانی وایوای لەسەر زەوی و زارەکەم دەر دەکەم یان دەکوژرێم. پاشان چوو دەرگای ژوورەکەی کردەوەو بانگی خوارەوەی کرد:"ئەسپەکان حازر کەن!" ئەمجار دووبارە هاتەوە لای سەفچەکاهیا. ئەو بە پێوە راوەستابوو. باوەشی بە سەفچەکاهیا دا کردو گوتی:"بژی یاخوا، زۆر سوپاس" ئەمەی گوت و خێرا وەدەر کەوت.

لە خوارێ ئەسپەکان ئامادە بوون. هەشت سوار بە لەحزەیەك سواری ئەسپان بوون و ملی رێگایان گرت بەرەو شار. وەختێك عەلی سەفا گەیشتە شاری، دەسبەجێ دەنگۆی لەنێو شاردا بڵاو کردەوە کە حەمەدۆك بە سیوچوار سوارەوە لە ئاکچاساز بینراوە. خەبەرەکە بە چەند رۆژ لە شارەوە گەیشتە سەرتاسەری چوکووراوا. وەختێك خەبەرەکە دەماودەم گەڕاو هاتەوە لای عەلی سەفا بە تەواوی گۆڕابوو و ببووە شتێکی دیکە:

"دەستەی حەمەدۆك لە جیاتی سیوچوار کەس کە عەلی سەفا بڵاوی کردبووەوە، سەدو هەشتا کەس بوون. حەمەد لە ئاناوارزا نەبینرابوو، بەڵکوو لە جێ دا ئەوێی کردبوو بنکەیەك و لەوێ ڕا دارو لەلەی بۆ هەموو خان و ئاغاکان و بۆ حکوومەت دادەنا. دەیگوت:"هەتا ئەمن زیندووم

ئایەڵم حکوومەت و ئاغاو خانە خوێن خۆرەکان ئەو فەقیرو هەژارەو ئەو رەش و رووتانە تاڵان بکەن. ئەگەر پێویست بێ هەموانیان لەبەین دەبەم. دەورانی ئاغایان بەسەرچوو!"

بەرە بەرە ئاغایەکان ترس و سامیان رێ دەنیشت. دێهاتی‌یە فەقیرو هەژارەکان و ئەو رەوە جانەوەرە چاوەڕوانی پرپشکێك بوون. ئەم ترسە نهێنی‌یە لە کۆنەوە هێلانەی لە ناخی دڵی ئاغاو خانەکان دا ساز کردبوو.

بە هاتنەگۆڕی ناوی حەمەدۆك دووبارە سروودو شێعری خۆماڵی کەوتنە سەر زارو زمانان و بە گوێی ئاغاکانیش گەیشتنەوە. هێنانەگۆڕی مەسەلەیەك لە شێعرو گۆرانی‌یە خۆماڵی‌یەکان دا مەسەلەیەکی خەتەرناك بوو. لە زمان حەمەدۆکەوە دەیان گوت، هەتا ماڵی ئاغاکان وێران نەکەم هەرگیز ئەم دەشتە بەجێ ناهێڵم. یان:

وا حەمەدۆك دەڵێ لەسەر چیاکان
جەندرمە لە دووی ئازایەك دەگەڕێن
پیاوێك کە ئاغاکان لە ترسی ناوی
شەو بە دڵەخورپەوە دەخزێنە نێو نوێن
چونکە ئەو دەزانێ و باشیش دەزانێ
چیا بەرزەکانیش لە هەڵۆ دەترسێن

ئەو گۆرانی و شێعرە خۆولاتی‌یانە عەلی سەفایان هێندەی دیکە دەترساند.

جووتیارەکانی وایوای بە خۆشحاڵی‌یەوە دەیان گوت:"شیری دایکی لێ‌حەلاڵ بێ. شیری دایکی لە حەمەدۆك هەڵۆی لووتکە بەرزەکان حەلاڵ بێ. دارو نەدارمان، ژن و منداڵمان قوربانی تاڵە موویەکی بێ."

دەستدرێژی بە نامووسی کچەکانیان کرابوو. گاوگۆلەکەیان بە تاڵان بردبوون، ئەسپەکانیان لێ‌دزیبوون، ماڵەکانیان سووتاندبوون، کەس و کاریان لە بەندیخانە بوون. بەڵام ئەو هەمووە کاری نەدەکردە سەر ورەیان:

"بەڵێ! حەمەدۆك چووەتە شاخەکانی ئاناوارزاو نەخشەو بەرنامە دادەڕێژێ... بەڵێ! سوێندی خواردوە کە گیانی عەلی سەفا بستێنێ..." لە ئاخری هەموو رستەیەکیش دا ناسناوی "هەڵۆی چیاکان" یان "شەهێنی شەهێنەکان"یان لێ‌زیاد دەکرد.

جوانترین و بەناوبانگترین شێعرە خۆماڵی‌یەکان لە تاریفی حەمەدۆك دا لە وایوای دادەنران. کەس نەی‌دەزانی ئەم شێعرانە کێ دایان دەنێ.

وەسمانەزلە دەیگوت:"زۆر سەیرە! چما لەم دنیایەدا چەند حەمەدۆك هەن؟ ئەوەندەی ئێمە بزانین حەمەدۆك لە لای خەلیلە کۆسەیەو لەنێو بێستانی خەریکی حەسانەوەیە. داخوا ئەو کوڕەمان رۆژێ شتێکەو شەوێ شتێکی دیکە؟"

رۆژێکیان بەیانی خەبەر هات کە جەندرمە حەمەدۆکیان لە شاخەکانی ئاناوارزا گەمارۆ داوە. دنیا پڕ ببوو لە جەندرمەو بەرەو حەمەدۆك تەقەیان دەکرد. حەمەدۆك ئەو رۆژە بە تاقی تەنێ لەگەڵ ئەو هەمووە جەندرمەیە شەڕی کردبوو، پیاوەکانی لەگەڵ نەببوون، چووبوونە بەرزاییەکانی کووزان. حەمەد پێی گوتبوون:"ئێوە بڕۆن، نامەوێ بەڵایەکتان بەسەر بێ. ئەمن بە تەنیا لەگەڵ ئەمانە شەڕ دەکەم." حەمەدۆك ئەو رۆژە سێ جار جەندرمەکانی لە بەردەڵانەوە هەتا دەشتێ و هەتا لێوارەکانی جەیهان ڕەپێ نابوو و پاشەکشەی پێ کردبوون.

شەڕی ئاناوارزا هێشتا درێژەی هەبوو و پەیتا پەیتا خەبەری خۆش و هیوابەخشی ئەو شەڕە بۆ جووتیارەکان دەهات.

شەوی دوای ئەو رۆژە کە ئەم خەبەرە بە خەڵکی وایوای گەیشت، هەتا بەیانی چاویان لێك نەنان و هەر خەبەری ئاناوارزایان پرسی: حەمەد ئەو شەوەش بە تاقی تەنیا لەگۆ جەندرمەکان راچووبوو و ئەو شیرەی لە مەمکی دایکی خۆیان خواردبوو لە تفنکانیانی هێنابووە دەر. ئەگەر بیویستایە دەیتوانی هەر لەوێ هەموو جەندرمەکان دەم و دەست قەلاچۆ بکا، بەڵام ئەو بێجگە لە ئاغاکان نیازی کوشتنی کەسی نەبوو.

وەسمانەزلەو سەیران، حەمەدۆکەکەی نێو بێستانیان موو بە موو لە دەنگ و باسەکە ئاگادار کرد. ئەویش ئەو شەوە تا بەیانی چاوی لەسەر یەك دانەنان و چاوەڕوانی ئاخری کاری ئەو حەمەدۆکە بوو کە لە ئاناوارزا لەگەڵ جەندرمەکان لە شەڕ دابوو.

رۆژی دوای ئەو شەوە بەیانی زوو جەندرمەکان سەرانسەری ئاناوارزایان داگیر کرد. دەنگی تەقە تەواو ببوو. پیاوەکانی لایەنەکەی دیکە یان کوژرابوون، یان رایان کردبوو. جەندرمەکان هەموو کەلێن و قوژبنی بەردەڵانەکانی ئاناوارزایان یەك بە یەك پشکنی. بەڵام هیچ گیاندارێك تەنانەت مارو مارمێلکەشیان لێ نەدی. هەموو جێیەکیان سەنگ و سووژن نا. تەنیا لە قەڵای تووڕووس دوو مێرمنداڵیان دینەوە کە لە پەنای یەك دانیشتبوون و وەك مێژۆك دەلەرزین. ئەو کەسانەی شەڕی جەندرمەکانیان کردبوو، ئەم دوو مێرمنداڵە بوون. دیارە لە دەوروبەریش دەنگی تەقە بیسترابوو، بەڵام نەیان دەزانی چ کەس و چ کارەن. ئەم دوو مێرمنداڵە پاش دوو رۆژ شەڕ لەگەڵ جەندرمەکان هەڵاتبوون و پەنایان بۆ ئەو قەڵایە هێنابوو و لەوێ لە ترسی

گیانی خۆیان نەیان دەزانی چ بکەن. ڕۆژو نیوێك بارانەی گوللە بەسەریان و بەسەر دەوروبەریان دا باری. هەر چوار ئەسپ کە لەو خوارە بەستبوویاننەوە بەر گوللە کەوتبوون و سەکەت ببوون و کەلاکیان هەر لەوێ کەوتبوو.

لە دوو مێرمنداڵەکە ئەوی موو زەردیان قسەی دەکردن و ئەوی دیکەیان کە کوڕێکی ڕەش ئەسمەر بوو، دەلەرزی و شەقەشەقی ددانی دەهات.

لاوە موو زەردەکە دەیگوت:

"جەنابی یاوەر ئێمە دوو مانگ لەمەوبەر چووینە گەڵ داروەدستەی یەغمووراغا. یەغمووراغا ئێمەی لە کن ئەسپ دزێکی وەستاکار دانا دەورەمان دی. ئەم ئەسپانەمان لە گوندی ئەندەڵ دزیبوو، و لە گەڕانەوەدا بووین کە لە ڕێگادا جەندرمەکانمان دیت. چووین لەنێو شاخەکان دا خۆمان شاردەوە. بە خوا تۆبەی دەکەین کە جارێکی دیکە ئەسپان نەدزین. هەزار جار تۆبە دەکەین.

"ئەم چەکانە کێ داونی بە ئێوە؟"

"یەغمووراغا."

یاوەر فارووق هەتا تینی تێدابوو زللەیەکی لە بنانگوێی مێرمنداڵەکە راکێشاو گوتی:

"جارێکی دیکە ناوی یەغمووراغات بە زمانیدا بێ، زمانت دەبڕم."

یاوەر فارووق وەك شێتانی لێهاتبوو. ئاخر بۆ نەیدەتوانی ئەو حەمەدۆکە بگرێ؟ هەمیشە لە چنگی دەردەچوو. وەختێك لە بەردەڵانێك کە وەك دورگە کەوتوەتە نێوەڕاستی چوکووراوا ئەو کابرایە بتوانێ وا بە ئاسانی لە دەستی رابکا، دیارە کە هەرگیز ناگیرێ.

یاوەر بەو گەرمای هاوینە لەنێو تۆزوخۆڵی چوکووراوادا سەرگەردان بوو. هەتا خەبەرێکی لە چیای حەمیدەوە بۆ دەهات غاری دەدا بۆ ئەوێ، و ئەگەر لە قەرەتەپە، کازماجان و تەنانەت لەچیاکانی نووری حەق و پاتسیان لە لێواری دەریای مەڕمەڕە خەبەرێکی بۆ هاتبایە، هەتا وێ غاری دەدا. ئەو غارغارێنە لە چوکووراوادا تەنیا یەك قازانجی هەبوو، ئەویش ئەوە کە ئەفسانەی جۆراوجۆر لەبارەی حەمەدۆکەوە ساز بکرێن:

"پاش هەموو شەڕێك شەهێنێکی سپی لەنێو بەردەڵانەکان دا هەڵدەفڕی بۆ ئاسمان. ئەم شەهێنە وەك نوور دەدرەوشا، شەهێنێك بوو یەکجار سپی... یەکجار تیژباڵ بە جۆرێك کە نە گوللەی دەگەیشتێ و نە بە چاو دەبینرا." ئەو حەمەدۆکەی لەنێو بێستانیش دانیشتبوو هەموو ئەو ئەفسانانەی دەبیستەوە.

لەو بێنەو بەرەیەدا یاوەر فارووق بەبەر راونانی حەمەدو پێك هەڵپڕژان لەگەڵ ئەودا هەژدە ئەسپ دزو شەش چەتەی وردیلەی گرتبوون.

یاوەر فارووق کە بە هیچ جۆرێك نەیدەتوانی حەمەدۆك بگرێ و ئەگەر لەگەڵیشی بەرەورووو دەبوو لە دەستی دەردەچوو، لە رقان لە دین دەردەچوو و داستانی قارەمانەتیی حەمەدیش رۆژ بە رۆژ زیاتر بەرەژوو دەچوو. ئەمەش زیاتر دەبووە هۆی دەهری بوونی یاوەر فارووق. هەربۆیە هەر دێهاتییەك کەوتبایە بەر دەستی دەیدایە بەر کوتەك و گۆپاڵ.

دوو شەو و دوو رۆژان لە گوندی ئاناوارزا کە لە خوار قەڵای ئاناوارزا هەڵکەوتوە، مایەوە. هەموو خەڵکی ئەو دێیەی بە لاو و پیرەوە بە نۆرە دایە بەر کوتەك و گۆپاڵ.

دوو رۆژ دواتر وەختێك لەگەڵ جەندرمەکانی لە دێی دەچووە دەر، تەنانەت بۆ نموونەش دێهاتییەك نەبوو بتوانێ بەری پێی لە عەرزی دابنێ. هەمووان لێکرا دەیان ناڵاند.

ئەگەر بە جێگای حەمەدیان زانیبایە، راستییان دەگوت. بەڵام کەس نەیدەزانی لە کوێ خۆی حەشار داوە... بەو حاڵەش یاوەر باوەڕی نەدەکرد:"ئەم دێهاتییە یاغی و بێقیمەتانە هەموویان، هەموویان دەزانن ئەو لە کوێیە. دەیپەرستن. کردوویانە بە هێزێکی رزگاریدەر. هەر رۆژە لەبارەی ئەوداو لەو بارەیەوە کە ئەو ئینسانێکی نائاسایییە چیرۆکێك دروست دەکەن."

هەرچەند یاوەر وەختێك داستانی ئەو شەهێنەی دەبیست کە لەسەر سەری حەمەد دەسوورێ و وەختێك دەیان گوت بریسکەی لەنێو نوشتەی چاوەزارەکەی دایە، قاقا پێدەکەنی، بەڵام بەو حاڵەش لە ئاسمانی هەر جێیەك دا لەگەڵ حەمەد لێکیان دەدا، چاوەکانی بەدوای شەهێنێکی سپی دا دەگەڕان.

"حەمەدۆك لە کوێیە؟"

"نەم دیوە، نە دەزانم و نە ناویم بیستوە."

"تەنانەت ناویشت نەبیستوە؟"

"نا نەم بیستوە."

"ڕای خەن!"

کابرای رادەخست و پاش ماوەیەك بە لاقی خوێناوییەوە لە حاڵێك دا لەسەر سەرو روخساری جێی پاژنە چەکمەو لەسەر لەشی جێی سەرەنێزە دیار بوو، راستیان دەکردەوە.

"نە ناویم بیستوەو نە دەزانم لە کوێیە."

خەڵکی گوندی "توورلی"، لە هەوارەکانی "مەجیدیە؟، تورکمەنەکانی ئووك سووزلوو و جووتیارەکانی نارلیقشلاو دەدەفاکلی... هیچ کامێکیان نە حەمەدۆکیان دیبوو و نە ناوییان بیستبوو.

ئاخرەکەی نۆرە گەیشتە سەر وایوای. یاوەر فارووق حەوتوویەك لەم دێیە مایەوە. هەموو خەڵکەکەی وەبەر کوتەك و گۆپاڵ دا. ئەویش نە جارێك بەڵکوو چەندین جار، تەنانەت ژن و منداڵیشی دارکاری کرد. وەسمانەزلە حەوتوویەکی تەواو خوێنی دانا. بە جۆرێك کە ترسیان بوو بمرێ. پاش حەوتوویەك راواندن بەرە بەرە وەهۆش هاتەوە. یاوەر بە دەستی خۆی نینۆکی سەیفەلیی هەڵکەندن.

لەنێو ئاوایی تەنیا یەك کەس، واتە سەفچەکاهیایان دارکاری نەکرد. تەنانەت بۆ شوێنەونکەش بووبێ تاقە یەك پتەیان لێنەداو کەسیش سەری لەو سورە دەرنەکرد.

"یان جێی حەمەدۆکم پێ دەڵێن، یان هەمووتان لەبن داران دا دەکوژم."

"نە حەمەدۆکمان دیوە، نە بە جێیەکەی دەزانین نە ناویمان بیستوە."

جووتیارەکانی وایوای دەگریان، دەیان ناڵاند، هاواریان دەکردو جینگڵیان دەدا. بەڵام بێجگە لە دووپات کردنەوەی ئەم قسانە هیچیان بە دەم دا نەدەهات:

"حەمەدۆك، شەهێنەکەم!"

## (٥٠)

خەلیل ئەو رۆژەش وەك هەموو رۆژەکانی دیکە هەر کە هەتاو کەوت دەسکە گیایەکی تەڕو تازەی بەدەستەوە گرت و هێدی هێدی بۆ لای ئەسپەکە چوو. لە کاتێك دا چاوی لە ئەسپەکەوە بڕیبوو گیایەکەی بۆ رادەداشت... ئەسپەکە نەدەبزووت. هەروا بزانە ئاگای لە هیچ نیە. پاشووی راستەی بە بەرزگیەوە نووساندبوو و راوەستابوو. گوێی بەردابوونەوەو یاڵەکانی ئەوەندە رێك و پێك بوون دەت گوت بە شانە کراون. بەشێك لە مووی کلکی دەکەوتە سەر کەفەڵی. وا دەهاتە بەرچاو کە ئەمڕۆ لە رۆژەکانی دیکە دەستەمۆتر بێ. حەمەد هەناسەی راگرتبوو و تەماشای خەلیلی دەکرد کە جارێك دەچووە پێش و جارێك رادەوەستا. هەنگاوێك دەچووە پێش و رادەوەستاو چاوەڕێ دەبوو بەڵکوو ئەسپەکە بێ بۆ لای گیایەکە. ئەسپ تەنانەت چاوێکیشی لێنەدەکرد.

خەلیل لە ئەسپەکە نیزیك و نیزیکتر بووەوە. گیایەکەی لە دەستی راستەوە دایە دەستی چەپ و هەنگاوێك دوور لە ئەسپەکە راوەستا، دەستی بۆ بردو دەستی بە ملە درێژو پتەوو بریقەدارەکەی دا هێنا. ئەسپ سەری بۆ لای خەلیل وەرگێڕاو تەماشای کرد.

خەلیل بۆ ئەوەی ئەسپەکە دڵنیا بکا زاری هەتا بنانگوێیان لێك کردەوەو پێکەنی. پێکەنینەکەی کەمێك جامەلووسکەیی تێدا بوو. حەمەدیش وێڕای وی لە دوورەوە بە رووی ئەسپەکەوە پێکەنی.

هەر کە خەلیل ویستی ئەو هەنگاوەی نێوانیشیان ببڕی و دەست لە ملی ئەسپەکە بکا، ئەسپ خۆی لەبەر یەك کێشایەوە، گوێی قوت کردن و راست لەو لەحزەیەدا خەلیلیش چنگی لە یاڵی گیر کرد. ئەسپەکە دووسێ جار هاتە سەر پاشووان. خەلیل دەستی لە ملی کرد. حەیوان

چەند جار هەتا تینی تێدابوو سەری راوەشاند. بەڵام نەیتوانی خەلیلی بەرداتەوە. ئەمجار خێرا وەك خول خولە بە دەوری خۆی دا سوورِا. ئەندام و لاقی خەلیل لە هەوا بوون. خەلیل بەرامبەر بە خێرایی راپەرِو توانای ئەسپەکە نەیتوانی خۆی رابگرێ. باسکی لێك کرانەوەو چەند میتر ئەولاتر فرێ درایە سەر زەوی. ماسوولکەی لاقی ئازاری دیبوو. ئەسپەکە پاش ئەوەی هێندێکی دیکەش بە دەوری خۆی دا سوورِا، راوەستاو خەلیل لە کاتێك دا هەوڵی دەدا هەستێتەوە، ئاورِێکی وەسەر دا. ئەسپ لە حاڵێك دا لاقی بە عەرزە نەرمەکەدا دەچوونە خوار، چووە نێو بێستانی و لەنێو چەند چڵە قامیشی سەرسەوزو تەرِو تازە راوەستا. چڵە قامیشەکان کەفەڵ و کەلەکەییان ون دەکردو تەنیا ئەستۆی درێژو راکشاو و کلکە قیتەکەی بە دەرەوە بوون. لە پشتی ئەسپی راکردوو لەو بەیانییە زووەدا هەڵمێکی نەرم هەڵدەستا.

خەلیلە کۆسە شەکەت و ماندوو بە هەناسە برِکە هات بە حەمەدی گوت:

"ئەمرِۆ خەریك بوو تەسلیم بێ، وادیار بوو دەیەوێ رام بێ. بەڵام شتێکی دی و سڵەمیەوە. حەمەد لمبۆزیت دی، پەرِەی کونە تفنکانیت دی چۆن لێك کرابوونەوە؟ وەك کوورەی ئاسنگەران هەناسەی دەهات.

حەمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

"بۆ کوێ دەچێ؟ ئاخرەکەی تەسلیم دەبێ، بەرە بەرە رادێ. چما رۆژەکانی پێشێ وابوو؟ لەوانەیە سبەینێ بیگری. خەلیل لە حاڵێك دا دەستی بە چەنەگە کۆسەکەی دا دێنا، گوتی:

"ئەگەر قەرار بێ بەگیر بێ، دەبێ بە لاقی خۆی بێ. ئاخر دەزانی ئەو حەیوانانە زۆریان من خۆش دەوێ. هەموویان لێکرِا ئەوەندەیان خۆش دەوێم مەپرسە. تەنانەت ماریش ئازارم بێ ناگەیەنێ. تەنانەت ماریش."

حەمەد بە پێکەنینەوە گوتی:

"تەنانەت تەپۆش."

خەلیل زۆر بە جیددی گوتی:

"تەنانەت تەپۆش ئازارم نادەن. ئەمن دەردی هەموو ئافەریدەیەك دەزانم."

"تەنانەت زمانیشیان دەزانی؟ وەك حەزرەتی سولەیمان."

خەلیل دووپاتی کردەوە:

"وەك حەزرەتی سولەیمان. وەك حەزرەتی سولەیمان... هەرکەسە هونەرێکی هەیە. هونەری منیش ئەوەیە کە باڵندەو پەرِۆ خۆشیان دەوێم."

پاشان له حاڵێك دا لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد چووە بن کەپرێ."

قایش پشتێنە چەرمەکەی کە بە بزماری کۆڵەکە کەپرەکەوە هەڵواسرابوو، لێ‌کردەوەو پاش ئەوەی لە قەدە بێیەکی باریکی خست، چەقۆیەکی دەسکری "ئەلیستان"ی لە گیرفانی دەرهێنا، بە ئیشتیاوە تەماشای کردو گوتی:"پۆڵای خالیسە". ئەمجار چەقۆکەی هەڵپچڕی، تفێکی گەورەی لەسەر قایشەکە رۆکردو دەستی کرد بە تیژکردنی چەقۆیەکەو رووی کردە حەمەدو گوتی:

"ئەمڕۆ دەمەوێ ریشت بۆ بتاشم."

حەوتوویەکی تەواو بوو کە خەلیل هەموو رۆژێ بەیانی لە خەو هەڵدەستاو پاش ئەوەی ماوەیەك بە ئەسپەکەوە خەریك دەبوو، تا ئێوارێ خەریکی تیژکردنی چەقۆیەکەی دەبوو.

"... وا تیژ بووە هەر رای دێری، دەبڕێ. سابوونێکی بۆن خۆشیشم پەیدا کردوە. لەو کۆلۆنیایەش کە خوشکە سەیران بۆی هێناوی، لە خۆت دەدەی."

ریشی حەمەد زۆر هاتبوو و دەخورا. لەمێژ بوو ریشی نەتاشیبوو، بەڵام ئەم رۆژانە پێی خۆش نەبوو ریشی هەبێ. ئەم کۆسە نەحلەتی‌یەش بەنیاز نەبوو بەم زووانە چەقۆیەکەی تیژ بکا... بەو پێیە ساڵێکی دەویست بۆ ئەوەی چەقۆیەکەی تیژ ببێ.

هەتاو گەرم ببوو کە کۆسە گوتی:"تەواو بوو. ئێستا بوویە. وەك گوێزان تیژ بوو." حەمەدی لەسەر نەردیوانی هەرزاڵەکە داناو خاولی‌یەکی لە ملی کرد. ئاوەکە هەر بۆخۆی شیلەوگەرم بوو. سابوونی لە دم و چاوان دا، سابوون کەفی کرد. ئەمجار وەك سەرتاشێکی کارامە چەقۆیەکەی بە دوو قامك گرت و بەرزی کردەوە. چاوێکی لێ‌کردو ئەمجار دەست بەکار بوو.

بەشێك لە ریشی زۆر هاتووی حەمەدی نەرم و بێ برژانەوە تاشی. حەمەد گوتی:

"خۆش بی خەلیل، دەستت نەرزێ، زۆرت زەحمەت پێوە کێشاوە، بەڵام بەڕاستی چاك تیژ بووە، دەستت زۆر خۆشە، هەر ناگام نەکرد."

پاشان چاوی لێك نان و خۆی دایە دەستی چەقۆی تیژی خەلیل.

خەلیل لە ماوەیەکی کەم دا ریشی حەمەدی تاشی، تیف تیفەی داو لەو کۆلۆنیایەی سەیران بۆی هێنابوو بە لوێچان لە ریشیی دا. ئەمجار گوتی:

"هەستە کاکە، پیرۆزت بێ."

حەمەد گوتی:

"دەستت خۆش بێ خەلیل. زۆر باش بوو. هەر هیچ ئاگام نەکرد."
رۆیشت و پاشان وەك شتێکی بیر کەوتبێتەوە، گەڕایەوەو پرسی:
"ئەمڕۆ هەرامەت دی؟"
خەلیل گوتی:
"دیتم. لای نیوەشەوێ زۆر دوور تێپەڕی و بەرەوژوور چوو."
حەمەد هەرچەند وەڵامی پرسیارەکەی وەرگرتبوو، بەڵام دیسان نەڕۆیشت. هەروا ڕاوەستابوو. خەلیل لە مەبەستەکەی حاڵی بوو و گوتی:
"خوشکە سەیران دوێشەو نەهاتبوو..."
پاشان بە پەلە گوتی:
"ئەم رۆژانە دێیەکەمان زۆری بەڵا بەسەر هاتوون. دوێنێ شەوێ ئەم دیت."
ئادەم کە تێگەیشتبوو ئەسپەکە بە بێستانەکە فێر بووە، هەموو شەوێ تا بەیانی بە دەوری بێستانەکەدا دەسوورا. بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیدەوێرا لە بێستانەکە نیزیك بێتەوە. هەرچەندی دەیزانی ئەسپەکە هەموو رۆژێ دەچێتە بێستانەکەو هەتا بەری بەیانی لەبن دارەکان ڕادەوەستێ، بەڵام دیسان نەدەچووە نیزیك بێستانەکە. چەند لە مردن دەترسا، ئەوەندەش لەو بێستانە دەترسا.
ئادەم لە ژیانی خۆی دا تفەنگچییەکی نەدیبوو وەك ئەو پیاوەی نێو بێستانەکە کارامەو دەست ڕاست بێ. ئەو پیاوە کە لەو دوورەوە تەقەی لە بلێسەی تفەنگەکەی کرد، خەریك بوو بیکوژێ. بە حاڵ و باڵ دەرچووبوو. لەو شەوەوە تا ئێستا هەمیشە بیری لەو کابرایە دەکردەوە، بەڵام فکری بۆ هیچ کوێ نەدەچوو. دوو کەس لەنێو بێستانەکە بوون کە یەکیان خەلیلە کۆسە بوو. لەمێژ ساڵ بوو ئەوی دەناسی. ئەوی دیکەیان غەریبە بوو. بە قەد منداڵێك دەبوو. بەڵام ئەوەندەی لێ ڕوون بوو کە تفەنگچییەکە ناتوانێ خەلیلە کۆسە بێ. ئەو غەریبەیە پارچە ئاورێك بوو بۆخۆی. ئەوەندە تفەنگچییەکی دەست ڕاست بوو کە دەیتوانی چاوی کەودەری بە تفەنگ بپێکێ.
ئادەم هەتا ئەو رۆژە کە بیستی حەمەدۆك هاتوەتە چوکووراوا، هەروا سەرگەردان بوو. پاشان فکری کردەوە. ئەو تفەنگچییە بێهاوتایە لە حەمەدۆك بەولاوە نابێ کەسێکی دیکە بێ. ئەگەر ئەو پیاوە حەمەدۆك باو ئادەم چووبا جێگاکەی بە عەلی سەفابەگ گوتبایەو شەوێك جەندرمە دەوری بێستانەکەیان گەمارۆ داباو ئەویان گرتبایە، ئەم لە وەدواکەوتنی ئەو رەسەنی

پەری و جندۆکەیە، ئەو ئەسپە پیسە رزگاری دەبوو، و ئابرووی لە دەست چووی وەدەست دەکەوتەوە، و دووبارە باوەشی گەرمی ژنەکەی و ئاسوودەیی نێو مەزراکەی بە دەست دێنایەوە. بەڵام ئەگەر ئەو پیاوە حەمەدۆك نەبێ و جەندرمەکان بە خۆڕایی بێن بێستانەکە گەمارۆ بدەن و پاشان بە دەستی بەتاڵ بگەڕێنەوە، ئەودەم "ئەو کەرەی لەو قوڕەی وەپەڕێنە". ئەمجار بێستانەکە ژنێکیشی لێبوو کە هەموو شەوێ لە دەوری بێستانەکە دەخولایەوە:"ئەم بێستانە بەڕاستی جێیەکی سەیرە، جێیەکی بەسام. ئەم ئەسپەش فێر بووە راست دەچێتە وێ و خۆی پەنا دەدا."

ئادەم چەندین رۆژ لە نێو شك و گومان دا پەلەقاژەی بوو. هەموو شەوی تا بەیانی بە ترس و لەرزەوە لە دوور بە دەوری بێستانەکەدا دەگەڕا. بەڵام نەیدەوێرا تەنانەت دوو هەنگاویش لێی نیزیك بێتەوە.

حەمەد چووە سەر چۆمی ساووران. لەبن بیەیەکی کۆنەساڵ دانیشت و پاڵی بە قەدەکەیەوە دا. ئاوی روون و زوڵاڵ، خۆی بەسەر وردە بەردە سپیەکانی بنی دا پان کردبووەوەو بە درەوشانەوەیەکی ئارامەوە دەڕۆیشتە خوار. حەمەد چاوی لەو ئاوەوە که لە رووناکی دا نوقم ببوو، بڕی. ئاوەکە بە حالە حاڵ هەتا گوێزینگێی دەهات. بەردە گەورەکان هەتا نیوەیان لە ئاوەکە دەرکەوتبوون و سەرەکەیان وشك ببووەوە. تەنیا بەشێك لە ئاوەکە کە رووبەڕووی حەمەد بوو قووڵتر بوو و بنەکەشی لە جیاتی وردەبەرد خیزو رەڵم بوو. ماسیەیە وردیلەکان کە لە قووڵایی ئاوەکەدا جوانترو بریقەدارتر دیار بوون، بە سرکی بە دوای یەك دا دەهاتنە سەر ئاوەکە.

لە پێش دا گەڵایەك بەسەر ئاوەکەدا تێپەڕی، پاشان ژەنگەسوورەیەکی مردووی زۆر گەورە. ئەمجار پەپوولەیەکی گەورەی بەقەد باڵندەیەك بە رەنگی نارنجی لە حاڵێك دا لەسەر ئاوەکە هەڵنیشتبوو و باڵەکانی لەسەر رووبەری ئاوەکە لێك کردبوونەوە، تێپەڕی. پەپوولە نارنجیەکە زیندوو بوو، رەنگە هەر لەبەرچاوی حەمەدیش وا بووبێ. سێبەرەکەی کە دەکەوتە بن ئاوەکە، لەگەڵ خۆی دەچووە خوارو لەو خوارەوە لەسەر وردە بەردەکان گەورەو چووك دەبووەوە.

خۆرەتاو زۆر بەتین بوو. گەرمایەکی قورس دەشتەکەی دەبرژاند. پیاو نەیدەتوانی چاو هەڵێنێ و تەماشای ئەو خۆرەتاوە بکا کە زەویی دەتواندەوە. ئەو گەرمایەی لەزەوی هەڵدەستایەوە، وەك چەند هەودای درێژی نوورانی بوو کە دەت گوت بکەوێتە سەر هەر شوێنێك دەیتوێنێتەوە. بەزوویی ئەو ئاوە روونە لە گەرمان دەبوو بە دووکەڵ و دەچووە

حەواو بەردە گەورەکانی دەتوانەوەو بنەکەی قەڵشتی دەدان... ئەم ئاوە زوڵاڵ و جوانە لەو کێوانەوە دەهات کە لە دوورەوە بە حاڵەحاڵ و بە شێوەیەکی خەیاڵاوی دەبینران. ئەم ئاوە لەبن تاتە بەردان و لەبن دارە سنۆبەرو تووسکاو مۆردەکان هەڵدەقوڵی، بەڕێ دەبوو، سەرەوژێر دەچووە خوارو روون دەبووەوە بە کەف پرژاندن وردە بەردەکانی خۆی لە دەشتاییەکان دا بڵاو دەکردەوە، لە دەرووەکان دا خڕ دەبووەوەو ئەمجار دەگەیشتە ئێرە. حەمەد چۆمی ساووران وەك بەری دەستی خۆی شارەزا بوو. چ بە منداڵی و چ لە سەردەمی یاغیگەرییەکەی دا سەرانسەری ئەم چۆمە گەڕابوو. تەماشای ئاوەکەی دەکرد، ئەوی دوورو تاریك دەهاتە بەرچاو. بۆ یەکەم جار چەند رۆژێك بوو خەیاڵپڵاوی دەکردن و دیسان بۆ یەکەم جار لەو چەند رۆژەدا مەسەلەی "عەبدی رۆیشت و هەمزە هات"ی لەبیر چووبووەوە. ئەگەر زانیبای ئەم فکرە لەو مێشکە شکڵ هۆڕنە چووەتە دەرێ خوا دەیزانی چەندی پێ سەیر دەبوو. سەیران ئەوی خۆش دەویست. هەر لە یەکەم رۆژەکان دا ئەمەی بۆ دەرکەوتبوو. چەند رۆژێك دوودڵ بوو، بەڵام پاشان بە تەواوی دڵنیا بوو کە ئەو کچە خۆشی دەوێ. کچەکە لە ئاگری ئەوین دا دەسووتاو هێندەی نەمابوو شێت بێ. کچێکی لەخۆبایی وەك وی هەر ئەوەندەی دەتوانی رازی دڵی خۆی ئاشکرا بکا. حەمەد لەوە کە دەیدی سەیران هەموو شەوێ دێ و هەتا بەیانی لە دەوروبەری بێستانەکە دەخولێتەوە، زۆر خۆشحاڵ بوو، و خوێن لە دەمارەکانی دا دەهاتە کوڵ. بیر کردنەوە لە سەیران خوێنی سەوداسەریی بەتوندی لە دەمارەکانی دا دەبزواند.

حەمەد هەر ئەو شەوە کە دیتی سەیران لە دەوروبەری بێستانەکە دەسووڕێتەوە، تێگەیشت کە ئەوینی ئەوە کچەکەی ناچار بەو کارە کردوە. لەو شەوەشەوە ئیدی خەو لە چاوانی نەکەوت. چاوەکانی لەنێو جادە تاریکەکان دا بە دوای تارمایی سەیران دا دەگەڕان و وەختێك دەیدی دەسبەجێ لە خۆشییان سەرخۆش و لە خۆی بێخەبەر دەبوو. بەڵام بەو حاڵەش لەبارەی سەیرانەوە نیگەران بوو. چونکە ئەو بەستەزمانە زۆری بەڵا بەسەر هاتبوون، نەکا لەو شەوانەدا گرفتارییەکی دیکەشی تووش بێ...

ئەوەندە تامەزرۆ بوو کە شەوێك خۆی پێ نیشان داو دەستی بگرێ، هەر هێندە بوو شێت نەدەبوو. بەڵام هەرگیز بۆی رێ نەدەکەوت. هەست کردن بەوە کە سەیران خۆشی دەوێ حەمەدی کردبووە ئینسانێکی دیکە. ئەو لەو کاتەدا تەنیا بیری لە سەیرانێ دەکردەوە. ئەو چاوە شینە مەخمەرییانەی کە راستگۆو دۆست و پڕ لە ئەوین و خۆشەویستی بوون، بە هیچ

بنیادەمێکەوە نەدیتبوون. جووتە چاوێکی وا گەرم، سووتێنەر، پڕ لە ئەوین، دۆست، ئینسان و پاك لە ڕەگەزی بنیادەم دا دەست نەدەکەوت.

سەیران لە پێش چاوی بەنرخ تر دەبوو و جوانتر خۆی دەنواند. هەموو شەوێ وەخەبەر دەهات و گوێی بۆ هەستی پێی سەیرانێ هەڵدەخست، لە خۆشی‌یان لە کەولّی خۆی دا نەدەگونجاو لەگەرمایی ئەوینێکی بێ‌پایان دا ئاگای لە خۆی دەبڕا. لە کاتێك دا سەرتاپای لەشی دەبووە تاسەو تامەزرۆیی بەو نیازە کە بچێتە لای و دەستی لەنێو دەستێ نێ، لە هەرزاڵەکە دەهاتە خوار، بەڵام هەرگیز ئەو نیازەی بەجێ نەدەهات، دەچووە پشت ڕەگە دارێك و هەر لەوێ خۆی خڕ دەکردەوەو لە کاتێك دا تووشی بۆرانی ئەوین ببوو لەرزەیەکی ئارام و لەبەر دڵانی تووش دەبوو... چما دەکرا دەستی وە دەستی سەیرانێ بکەوێ، جوانێکی ئاوا چما دەستی پێ ڕادەگەیشت؟ نەدەکرا هەر بیریشی لێ‌بکرێتەوە. حەمەد هەر جارەی بیری لەوە دەکردەوە سەری دەسووڕا. لە لایەکی دیکە زۆریشی زگ بە سەیرانێ دەسووتا. وەختێك بیری لەو و ئەوینەکەی دەکردەوە، فرمێسك لە چاوی دا قەتیس دەما. حەمەد بیری دەکردەوە کە بیهەوێ و نەیهەوێ ڕۆژێك لە ڕۆژان دەکوژرێ و ئەگەر نەش کوژرێ دیسان ناتوانێ ماوەیەکی زۆر لێرە وەمێنێ. لە ئاوری یاخی‌بوونێك دا دەسووتا. مێشکی، دەست و لاقی، مووەکانی و تەواوی ئەندامەکانی لەو ئاگرەدا ئارام و ئۆقرەیان لـێ هەڵدەگیرا.

لەو کاتانەدا وێڕای ئەوەی لەشی لەنێو تاولەرزێك دا گڕی دەگرت، دیسان ئەو بریسکەی پۆلایە دەهاتە نێو گلێنەی چاوەکانی‌و ئەو زەردە ئاڵتوونی‌یە، ئەو درەوشانەوە ڕەنگ هەتاوی‌یە لە کاسەی سەری دا بلاّو دەبووەوە.

لەسەر ئاناوارزا بەشێك لە ئاسمانی دی لەگەڵ هەورێکی سپی کە لە جێگای خۆی نەدەبزووت... ئاسمان زۆر شین و هەورەکە بێ‌ئەندازە سپی بوو. داهاتەوەو دەستی لە ئاوێ ڕۆکرد، ئاو بە نێو قامکەکانی دا هاتە خوار. ئاوەکەی بێ‌ئەنداز روون بوو، ئاو نەبوو هەر نوور بوو دەڕۆیشت. خەلیلە کۆسە بەنێو بێستانەکەدا دەڕۆیشت و گڵی بن بڕکە بێستانەکانی وەردەگێڕا. خەلیل چەند ئینسان و چەند باش و چەند دۆستێکی گیانی بەگیانی‌یە!

یاوەر فارووق، شەڕی ئاناوارزا... ئەو شەهێنە سپی‌یە کە وەختی شەڕەکان لە ئاسمان چەرخی دەدان... غارغارێنی یاوەر، بەرد بە بەردو کێو بە کێو لە چوکووراوا، دارکاری کردنی جووتیارەکان لەسەر وی هەتا وایان لـێ‌دەهات خوێن بمیزن، ئاخر چۆن دەکرێ پیاو

بەزەیی بە وەسمانەزلە دا نەیەتەوە؟ پیرەپیاو ڕەنگە خۆی لە سەد ساڵ دابێ. حەمەد حەزی نەدەکرد بیر لەو ڕووداوانە بکاتەوە. هێندێ جار هەستی دەکرد ئەو دەردو ئازارەی لە دڵی دایە، سەرڕێژ دەکاو دێتە دەرێ. تووشی دڵتەنگی دەبوو، لە بێدەرەتانیی خۆی وەزاڵە دەهات و بێئەوەی گوێ بداتە ئەوە کە خەلیلە کۆسە گوێی لێدەبێ هاواری دەکرد:"خوایە، بم کوژە، بم کوژە، بم کوژەو ڕزگارم کە، یان ڕێگایەکی نەجاتم نیشان بدە، یان بم کوژە. ئەمن توانای ئەو جەهەننەمەم نیە کە منت تووش کردوە. خەریکم دەپلیشێمەوە."

ئەو لێدانەی بەر وەسمانەزلە کەوتبوو کاری لە جەرگ و هەناوی حەمەد کردبوو. شەوێکیان تا بەیانی ناڵاندی و جینگڵی دان و هەر دەیگوت:

"بریا منیان کوشتبایە، بەڵام لەو پیرەپیاوەیان نەدابایە، چ دەبوو، چ دەبوو ئەگەر منیان کوشتبا؟"

هێندێك جار نیوەشەوێ لە نەکاو دەردەپەڕی، پڕی بە تفەنگەکەی دا دەکردو بە غار لە بێستانەکە وەدەر دەکەوت. بەرەو ئاناوارزا شۆڕ دەبووەوەو کاتێك لە نەکاو "عەبدی ڕۆیشت و هەمزە هات"ی وەبیر دەهاتەوەو دەست و لاقی شل دەبوون، لەسەر ئاگری بێدەرەتانی دادەنیشت و دەوەستا. لەو شەوانەدا کە حەمەد بە غاردان لە بێستانەکە دەچووەدەر، خەلیل ئەوەندەی وەدوا دەکەوت هەتا لە قوولکەیەك دا یان لەنێو چلە دڕکێك دا بە بێهۆشی دەیدیتەوە. ئەودەم بن پیلی دەگرت و لەگەڵ خۆی دەهێنایەوە نێو بێستانەکە.

سێبەرەکەی کەوتبووە سەر بنی ئاوەکە. ڕاست وەك خەلیلە کۆسە دەستی لە چەنەگەی خۆی وەردا. سێبەرەکەی کەوتبووە سەر بنی ئاوەکە. دەستەیەك ماسی بەسەر سێبەرەکەی دا تێپەڕین، ماسییەکان بەسەر سێبەرەکە دا دەڕۆیشتن و سێبەری پڕ جموجۆڵی وان بەسەر وردە بەردە درەوشاوەکان دا بڵاو بووەوە. بۆنی ئاڵەتی کێوی لە هەوا گەڕا. لەو ڕۆژەوە کە هاتبووە چوکووراوا ئەمڕۆ یەکەم جار بوو کە لووتی هەست بە بۆنی شتێك بکا. زۆر لەمێژ بوو مەراقی بوو بۆن لە شتێك بکا، بە هەناسەی درێژ سییەکانی خۆی پڕ کردن لە بۆنی ئاڵەتی کێوی. بە دوای بۆنی ئاڵەتی کێوی دا شنەبایەکی زۆر نەرم بۆنی خەلەنگی لەگەڵ خۆی هێنا. دەورانی منداڵییەی بە شێوەیەکی ناڕوون و خەیاڵاوی بە بەرچاوان دا تێپەڕی. دەوروبەری ئاشی سمایلەزلەش پڕ لە خەلەنگ بوو. دایکی لە چلە خەلەنگەکان گەسکی ساز دەکردن. حەمەد خەبەری کوژرانی سمایلەزلەی نەبوو.

دایم لە فکری ئەوەدا بوو کە ئەگەر بگیرێ چۆن رەفتارێکی لەگەڵ دەکەن.

وەختێکیش رەفتاری یەکەم جاری سمایلەزلەی لەگەڵ رەفتاری دوایەی بەراورد دەکرد ئینسانی بە ئافەریدەیەکی نەناسراو دەهاتە بەرچاو. وەختێك سمایلەزلەی وەبیر دەهاتەوە دڵی پڕ دەبوو لە شادی و خۆشی.

ئەمجار بۆنی پۆتراك لە وڵاتی گەڕا. ئەم بۆنە تایبەتی چوکووراوا بوو. لە گەرمایەدا خاکی گڕگرتووی چوکووراوا هەمیشە بۆنی تاڵی پۆتراکی لێدەهات.

لە جێی خۆی هەستا، ئاوڕی دایەوە لای ئاوەدانی و تەماشای ئەو جادەیەی کرد کە ئارام ئارام تۆزی لێهەڵدەستا. جادەکە هیچ ریبوارێکی تێدا نەبوو. ئەگەر هەر ئێستا هەستابا وەڕێ کەوتباو چووبایە ماڵێ سەیرانێ و گوتبای:"ئەمن هاتم"، چ دەبوو؟ سەیران چ دژکردەوەیەکی لە خۆی نیشان دەدا؟ حەتمەن گۆناکانی هەڵدەگیرسان و تەماشای روخساری حەمەدی دەکرد. چاوە جوانەکانی لە خوارەوە دەبڕی و سەری هەڵنەدەبڕی و گەردنە جوان و هەڵکشاوەکەی...

حەمەد دانیشت و دووبارە لە ئاوەکەوە ڕاما. روخساری سەیرانێی لە ئاوەکەدا دی. جگە لە روخساری سەیرانێ هیچی دیکەی نەدەدی. روخساری سەیرانێ جار لەگەڵ جار دەگۆڕا، دەیڕوانی، پێدەکەنی، هاواری دەکرد، تووڕە دەبوو، میهرەبان دەبوو، توندو تیژ دەبوو، و ئەمجار چاوە شینە مەخمەرییەکانی هەڵدێناو بریسکەی ئەوینیان تێدا دەدرەوشا.

حەمەد مات و حەیران تەنیا ئەو جووتە چاوەی دەدی، نە فکری لە هیچی دیکە دەکردەوەو نە هیچی دیکەی هەست پێ دەکردو نە قسەیەکی بە زمان دا دەهات. دەچووە نێو دنیایەکی ئەفسووناوی و تێی دا ون دەبوو، خۆی دەدایە دەم شەپۆلی دەریای ئەوین و لە نێوان خەوو دنیایەکی ئەفسووناوی و جادوویی‌دا هاتوچۆی دەکرد.

جووتیارە دارکاری کراوەکان، وەسمانەزلە، ئەو عەلییەشەلە کە چاوەڕێی بوو، زوڵم و زۆری عەلی سەفا، جەندرمەکان، عەبدی و هەمزەو مردن و جیابوونەوەو هەموو شتێکی لەبیر خۆی بردبووەوە.

لەوبەری، لەنێو گیاوگۆڵ دا لەك لەکەکان بە لاقە درێژو سوورەکانیانەوە بە شل و شەویقی دەسووڕانەوە.

ئەو رۆژە تا ئێوارێ چەندین جار هەستاو تەماشای لای ئاوەدانیی کردو دوایە لە جێی خۆی دانیشتەوە، تەماشای قووڵایی روونی ئاوەکەو ئەو شتانەی کرد کە بەسەر ئاوەکەدا دەڕۆیشتن.

کەوتە بەرە بەری ئێوارێ. عادەتەن سەیران لای ئێوارێ دەهات. زۆر وەختانیش نیوەشەوێ دەهات و لە جێی هەمیشەی، خۆی خڕ دەکردەوەو دەنووست.

حەمەد ئەو رۆژە قسەیەکی لەگەڵ خەلیلە کۆسە نەکرد. خەلیلە کۆسە لە وەزعی حەمەد حاڵی دەبوو.

لە جێوبانەکەی دا درێژ بوو، بەڵام خەوی لێنەکەوت. جێیەکەی بەجێ هێشت و چووە نێو بێستانی پیاسەی کرد. لەو رێگایەوە راما کە بەرەو ئاوەدانی دەڕۆیشت و ئێستا لە تاریکێ دا ون ببوو. هێشتا مانگ ئاوا نەببوو و لە سەرووی ئاناوارزا دیار بوو، بەڵام بە زوویی لە پشت شاخەکانەوە ون دەبوو. لە بێستانێ دوور کەوتەوەو وەك ئادەم لە دەورەبەری بێستانەکە راوێچکەی کردن. هێندێك شەوان ئەو وەختە ئەسپی خەنەیی بە رمبازی لە لای رۆژهەڵاتەوە دەهات و بەرەو ئاناوارزا شۆڕ دەبووەوە. پاشان لای بەیانی پاش ئەوەی چەند جار لەدەوری بێستانەکە هەڵدەسووڕا لەبن دارچنارێك کە ئاوەکە لەو دەوروبەرە قووڵ بوو رادەوەستا، ماوەیەکی زۆر خەریکی ئاو خواردنەوە دەبوو، ئەمجار دەهات و لەسەر تەپۆلکەیەکی چووکەڵە کەلە پەنای دارەکانی ئەوبەر بوو، دەچەقی.

ئادەم دیسان دەستی کردبوو بە خولانەوە، بەڵام پێش ئەوەی حەمەد پێ بزانێ، ئەو کە چاوی بە حەمەد کەوتبوو تێی تەقاند.

حەمەد ئەوی رەچاو کرد. لە دوور لەبەر تیشکی مانگەشەوێکی کەم شۆق ئادەمی بە پیاوێکی یەکجار کەڵەگەت هاتە بەرچاو.

مانگ ئاوا بوو. حەمەد هاتەوە ئەو شوێنە کە بە رۆژ لێی دانیشتبوو، هەر لەوێ دانیشتەوەو لاقی لە ئاوەکە رۆکردن. ئاوەکە نەختێك فێنك ببوو.

رۆژبایەکی نەرم کە لە پاش نیوەڕۆیەوە هەڵی کردبوو هێشتا بە ئارامی دەهات. جار جار بایەکەی دەخست و سەرلەنوێ هەڵی دەکردەوە.

حەمەد بە بیستنی هەستی پێیەك راچەنی، بەڵام لە جێی خۆی نەبزووت. لەوانەبوو ئەگەر بجووڵێتەوە سەیران رابکا. سەیران بەسپایی و لەسەرەخۆ هات. لە ئاوەکە پەڕیەوەو چووە جێی جارانی و لەوێ لەسەر عەرزی دانیشت. رووناکایی ئەستێران لە تیشکی بێتینی مانگ کە نەختێك لەمەوبەر ئاوابوو، زیاتر بوو، حەمەد بە حاڵو باڵ تارمایی سەیرانێی دەدی. بە بیستنی هەستی پێیانی دەست ولاقی سست بوون و دڵی بە توندی لێی دەدا. چەندین جار بەسەری دا هات کە هەستێ و بچێتە لای سەیران. بەڵام دڵەکوتەیەکی وا توندی لێبوو، و

لەشی بە جۆرێك دەلەرزی کە لەگەڵ هەستایە سەرپێ، ناچار بوو دووبارە دانیشێتەوە. پاش ماوەیەك توانی هەستێتە سەرپێ. هەستاو چوو بۆ لای سەیران.

سەیران بە دیتنی کەسێك کە بۆ لای دەهات، بێئەوەی لە جێی خۆی هەستێ خۆی لە پاش قەدی دارەکان گرت و بە زگەخشکە خۆی گەیاندە لای ئاوەکە.

حەمەد چەند وشەیەکی روو بە سەیران بە دەم دا هات، بەڵام دەنگی گیراو تەنانەت خۆشی لە قسەکانی حاڵی نەبوو و بێدەنگ بوو. سەیران کاتێك دەنگەکەی ناسی راوەستا. حەمەد لە حاڵێك دا لە خۆشییان خەریك بوو باڵ بگرێ خۆی گەیاندە سەیرانێ و دەستی گرت. دەستی وەك ئاسنی سوورەوەبوو گەرم بوون. حەمەد سەیرانی لە ئامێز گرت و سەیرانیش بێ هەست و بێرووح خۆی بە سنگی حەمەدەوە نووساند. حەمەد دەستی لە ئەستۆی کردو گەردنی ماچ کرد، لێوەکانی دەبرژانەوە.

لەو کاتەدا شەو و دارو ئەو ئەسپەی هاتبوو لە لایان راوەستابوو و هەموو شتێکیان لەبیر چووبووەوە. بۆخۆشیان نەیان زانی کەنگێ خۆیان رووت کردەوەو یەکتریان گرت. ئاگایان لە وزەوزی ئەو تەپۆیانەش نەبوو کە وەك هەور لە دەورەیان دەیان گرماند. بە جۆرێك بوون بە یەك وەك هەر لە ئەوەڵ دا بۆ یەکتر دروست بووبن.

دوو سێ جار چوونە نێو ئاوەکەو هاتنەوە دەرو یەکتریان گرتەوە. وایان یەکتر گرتبوو کە هەتا هەتایە لێك جیا نەبنەوە. ئەم یەك گرتنە تامی خاك، تامی رووناکی و تامی ژیانی دەدا. لە نێوەڕاستی ئەم جیهانەدا تاق و تەنیا مابوونەوە. دەت گوت یەکەمین جووتی بەرەی ئادەمیزادن.

بێئەوەی تەماشای یەکتر بکەن بە لێواری چۆمەکەدا بەرەو خوار رۆیشتن. پاشان گەڕانەوە. حەمەد چووە نێو بێستانی. شووتییەکی گەیوی لێکردەوە. شووتییەکەیان شکاندو خواردیان. شووتییەکە فێنك بوو. شنەبای بەیانی هەڵی کردبوو.

لە فێنکایی هەواو تێری دا سووکە لەرزەیەکیان بە لەشی دا هات. هەر کە دنیا رووناك بوو چاویان لە چاوی یەکتر کردو لە نەکاو هەردووکیان پێکەنین. تێکەوە رامان و لەنێو سەرسامی و سەرسوڕمان دا لەدنیای ئەفسوون و مۆجیزەدا بە رووی یەکترەوە پێکەنین.

ئەسپەکەیان دی. دیسان لە جێی جارانی راوەستابوو. پاشووی راستەی بە بەرزگیەوە نووساندبوو و گوێی بەردابوونەوە. سەیران چوو بۆ لای ئەسپەکە. دەت گوت چەندین ساڵە لە

گەڵی راهاتوە، لێی نیزیك کەوتەوە، لاواندیەوەو پاشان یاڵیی گرت و بە دوای خۆی دا هێنا. ئەسپ وەك بەرخی دەستەمۆ بە دوای سەیران دا هات.

حەمەد رووی کردە لای هەرزاڵەکەو بانگی کرد:

"خەلیل، خەلیل، خەلیل."

خەلیل کە هێشتا خەو بەری نەدابوو، ئەوەی دەیدی باوەڕی پێنەدەکرد. لە دڵی خۆی دا گوتی:"حەتمەن خەون دەبینم."

"خەلیل، تەماشای کە خەلیل."

خەلیل چاوی هەڵگلۆفین و دووبارە تەماشای کرد:

"خوایە گیان! چ دەبینم؟"

سەیران ئەسپەکەی لەگەڵ خۆی هێناو لە پەنای کەپرێ بەرەڵلای کرد. ئەسپ لە جێی خۆی نەبزووت. سەیران دەستی بەسەر مل و کەفەڵ و نێوچاوانی ئەسپەکەدا هێنا. لاچاوی بە لاچاوی ئەسپی خەنەییەوە نووساند. ئەسپ و سەیران چەند لەحزەیەك ئاوا مانەوە.

حەمەد فکری کردەوەو لە دڵی خۆی دا گوتی ئەم ئۆگری و دۆستایەتییە بەرهەمی ئەو شەوانەیە کە ئەو دووانە تا بەیانی لە پەنای یەکتر رادەوەستان و ئاوا پاڵیان وێك دەدا، ئەسپ بە بۆنی سەیرانێ دەستەمۆ ببوو. ئەگینا ئاوا لە نەکاو لە نێوان ئینسانێك و ئەسپێك دا ئەم ئۆگرییە دروست نابێ. مەگەر ئەوە کە سەیران بوونەوەرێکی تایبەتی بێ.

خەلیل دەسبەجێ تەنافێکی ئەستووری هێناو لە ملی ئەسپەکەی کردو پاشان سەری تەنافەکەی لەدارێکی نیزیك خۆیان خست.

## (٥١)

ئادەم لەکاتێك دا غاری دەدا بۆ لای کێلگەکەی عەلی سەفابەگ بێ‌پسانەوە لەبەر خۆیەوە دەی‌گوت:"وەڵڵاهی خۆیەتی. بیللاهی خۆیەتی، تەڵڵاهی خۆیەتی! رزگاریمان بوو، گیانمان لە دەست کوشتنی ئەسپی خەنەیی رزگار بوو. ئاغاش بە قەد عەرزو عاسمان لێم رازی دەبێ. کێ دەی‌توانی جێی کابرایەکی وا بدۆزێتەوە، کێ دەی‌توانی خەبەر بە ئاغا بدا کە... وەڵڵاهی خۆیەتی. بیللاهی خۆیەتی. تاوێکی دیکە جەندرمەکان بە سەرکردایەتیی یاوەرو کوڕو کاڵەکەی خۆمان لەگەڵ دێهاتی‌یەکان بە سەرکردایەتیی عەلی سەفابەگ بێستانەکە گەمارۆ دەدەن و ئەویش بێ ئەوەی دەست بۆ چەکەکەی بەرێ، هاوار دەکا تەسلیم، تەسلیم، تەسلیم... ئەدی ئەگەر ئەو نەبوو؟"

لاقی لە عەرزێ چەقین و راوەستا. لەو نیوەشەوەدا گەڕایەوە بێستانەکەو لەبەر خۆیەوە گوتی:"ئاویم بیستوە، ناوی، بەڵام چەتەیەکی بەناوبانگی وەك وی دێ و چەند مانگان لەبەر دەستی خەلیلە کۆسەدا دەبێتە بێستانەوان؟ هیچ کاری دیکەی نیێ؟ لەنێو تەپۆو قامیشەڵان دا ماوەتەوەو دەیەوێ ئاغای بکوژێ؟ کەسێك بی‌هەوێ بی‌کوژێ لەسەر رێگا بۆسەی بۆ نانێتەوە؟ ئەم کابرایە تەنانەت لە جێی خۆشی نابزوێ. کەسێك بی‌هەوێ ئاغای بکوژێ، لە جێی خۆی نابزوێ؟ حەمەدۆك نابێ لە جێی خۆی ببزوێ؟ هەو نیە، هەو نیە..."

لە ئارەق دا شەڵاڵ ببوو. گەڕایەوەو لە حاڵێك دا بۆترشی ئارەقی لەشی بە هەوادا بڵاو دەکردەوە، شل و شەوێق و بەسپایی‌و لەسەرەخۆ وەڕێ کەوتەوە:

"ئاغا حەز ناکا کەس فریوی بدا. کەسێك درۆی دەگەڵ بکا، نینۆکانی دەرخوارد دەداتەوە. ئەو شەوە، ئەو ژنەتیوە دەنگێکی زۆر شیرنی هەبوو. چیی گوت؟ گوتی ئادەم

چما ئەتۆ نەکوژراوی؟ کێ قەرار بوو بم کوژێ؟ ئەو بم کوژێ و ئەم کوژێ، ئەم ئەسپە خەنەیی‌یە دەم کوژێ. ئەسپی خەنەیی کوشتمی، گیانی لێ‌ستاندم. ئەو جندۆکەیە، پەری‌یە، ئەفسوون و جادوویە، ئەفسوون و جادوو! ئاغا وەڵڵاهی بیللاهی ئەفسوون و جادوویە. وەبەر تفەنگ نایە. کەس ناتوانێ بی‌پێکێ، هیچ ئادەمیزادێك، هیچ بنیادەمێك ناتوانێ بی‌هەنگێوێ. بە هیچ جۆر ناتوانی بی‌هەنگێوی. ئەگەر کەسێکیش بتوانێ تفەنگی لێ‌بدا، دەستی گۆج دەبن و چاوی کوێر دەبن. ئەو ئەسپە شەجەرەی سەدوپەنجا ساڵی هەیە. ئەمە درۆی تێدا نیە، ئەو شەجەرەیە حەتمەن نیشان دەدا کە نەسڵ و نەسەبی دەچێتەوە سەر پەری و جندۆکە. ئاغا ئەتۆ زۆر بە هەڵە چووی، زۆر بە هەڵە چووی کە منت وەدوای ئەم ئەسپە خستوە. ئەو ئەسپ نیە..."

قەلأفەتی ژنەکەی، هەمیشە دەهاتە بەرچاوانی. ئەم ئەسپە ئادەمی ماڵوێران کردبوو. هەروەخت یادی ژنەکەی دەکردەوە هەموو ئەو بەڵایانەی بەسەری هاتبوون و تەواوی ماندوو بوونەکەی لەبیر دەچووەوەو سەرتاپای لەشی پڕ دەبوو لەتامەزرۆیی و ئارەزوو، و دەستەکانی گڕیان دەگرت:

"وەڵڵاهی، بیللاهی خۆیەتی."

گەڕایەوەو دووبارە بەرەو کێڵگە دەخۆی نووسا.

"ئەو خەلیلە کۆسەیەش دەکوژن، ئاخر بنیادەم بە ئاشنایەکی چەندین ساڵەی کە زارو گەرووی لە گەرمان وشك بوون، ناڵێ:"هاوڕێ وەرە شووتی‌یەك بەرە بیخۆ، دڵت فێنك دەبێتەوە؟" خەلیلە کۆسەش دەکوژن. چرووکی ناکەس بەچە، با بی‌کوژن."

ئادەم هەتا تولعی بەیانی لە بەینی کێڵگەو قامیشەڵان دا هاتوچۆی کرد، دەڕۆیشت و دەگەڕایەوە. وەختێك تاو هەڵات، ئەو هێشتا لە نێوەڕاستی دەشتێ سەرگەردان بوو.

ڕاست سێ شەوو سێ ڕۆژان هەتا نانی پێ‌پێچەکەی و ئاوی مەتارەکەی تەواو بوو لە قامیشەڵانەوە بۆ کێڵگەو لە کێڵگەوە بۆ قامیشەڵان چوو و گەڕایەوە، چوو و گەڕایەوە...

سێ شەوو سێ ڕۆژان لەجەهەننەمی گومان و دوودڵی دا دەسووتا، و ئەم ئازارە هەتا وەختێك لە نیوەشەوێ دا خۆی لەبن پلیکانەکانی باڵەخانە دیتەوە درێژەی هەبوو. لەسەر پلیکانەکان دانیشت و چاوەڕوان بوو ڕۆژ بێتەوەو ئاغا لە خەو هەستێ.

وەختێك دنیا ڕووناك بوو ئێشك گرانی باڵەخانە چاویان پێی کەوت و نەڕاندیان:"ئەتۆ کێی"و بۆ لای چوون. ئادەم دەسبەجێ ڕاست بووەوەو گوتی:"ئەمنم، ئاغا لە خەو هەستا؟"

ئاغاش کە راست لەو کاتەدا چاوی پێی کەوتبوو، لە پلیکانەکان هاتەخوار. ئادەم هەر کە ئاغای دی گوتی:

"ئاغا، ئاغا، ئاغا، ئاغا,... ئەمن..."

عەلی سەفا بە دەنگێکی کزو بێحاڵ کە وەك لیکاو بە نێو ددانەکانی دا هەڵدەڕژا بانگی کرد:

"دورسوون دورمووش! کوڕم وەرە ئێرە."

ئەویش لە حاڵێك دا دەیگوت:"فەرموو، فەرموو" لە بەردەم عەلی سەفا قوت بووەوە. عەلی سەفا گوتی:"وەرە، وەرە" و بە پلیکانەکان دا چووە سەرێ. کاتێك لە پیکانەکان وەسەر کەوت، راوەستاو دەستی بۆ لای ئادەم ـ کە لە خوار پلیکانەکان وشك ببوو و لە پەستا چاوی دەترووکاندن، پانتۆڵەکەی هەتا ئەژنۆی ریشاڵ ریشاڵ بوو، دەست و لاق و دەم و چاوی کەمرەیان بەستبوو و وەك هەموو شتێك دەچوو، وەك بنیادەم نەبێ ـ راداشت و گوتی:

"کوڕم، دورسوون دورمووش، چما ئەو نەکوژرابوو؟ چما لەسەر کوشتنی وی خەڵك لە بەندیخانەو لەبن داری ئیعدام نین؟ ئێستا چیی لـێبکەین؟"

"چی تۆ بفەرمووی ئاغا!"

ماوەیەك چاویان لە ئادەمەوە بڕی و بە رق و قینەوە تەماشایان کرد. عەلی سەفابەگ بە راوێژێکی ئارام و بێهەڵچوون گوتی:

"کوڕم، دورسوون دورمووش، بۆ هێندەی بیر لـێدەکەیەوە، چما ئەو هەر بەڕاستی نەکوژراوە؟"

"راستە ئاغا."

"ئێستا کەوایە بێئەوەی کەس بزانێ لەگەڵ خۆت بیبە ئاکچاسازو مەیەڵە کەس بزانێ پاچ و پێمەڕەش هەڵگرەو کەسیش لەگەڵ خۆت مەبە. ئەم کارەم بە تەنیا بۆ بکە. جۆرێك لە نێو باتلاغ دا بیشارەوە کە بە کەس نەبینرێتەوە. بەڵام شوێنەکەی نیشانە بکە نەوەکا دوایە کارمان پێی بێ."

"بەچاوان ئاغا."

"ببوورە کوڕم دورسوون دورمووش، بەو کارە چووکەڵانە ماندووت دەکەم. بەڵام بۆخۆت دەزانی ئەگەر لە شار تێبگەن کە ئەو زیندوویە بە جارێك دەبمە پووڵە ڕەشکەیەك. ئەمن نازانم ئەو نەگبەتە چۆن وا لە نەکاو پەیدا بووەوەو تووشی ژانەسەری کردین ـ لەبەر خۆیەوە

دەیبۆڵاند ـ ئاخر ئەمانە ئینسانن، چەند مانگان ون دەبن دوایە رۆژێك دێنەوە کە... لەمانە بێزارم، بێزار. من من، من من، من! یالّلا کورم، لێم ببوورە، چارەمان نیە، هێشتا دەبێ زۆر گرفتاری لە دەست ئەو تووتکەسەگانە بچێژین."

"دەیچێژین ئاغا گرنگ نیە، سەری تۆ سلامەت بێ."

لە پلیکانەکان هاتە خوارێ، تفەنگ و فیشەکدانەکانی لەئادەم وەرگرت و دانیە دەستی یەکێك لە پاسەوانەکان و پاشان بە توندی فەرمانی پێدا:

"وەرە بە دوام دا."

ئادەم گوتی:

"براله، دورسوون، دەبێ چاوم بە ئاغای بکەوێ، مزگێنیەیەکم هێناوە."

دورسوون نەڕاندی:

"وەرە بزانم، مزگێنیەیەکەت سەرت بخوا. بۆمان بوویە ژانەسەر."

"دەبێ ئاغای ببینم."

دورسوون دیسان نەڕاندی:

"وست بە، پێت وایە ئاغا دەیەوێ چاو لە رووت کا. وەپێش کەوە دەی."

ئادەم وەپێشی کەوت و رۆیشت:

"با بچین، بچین ئەتۆش بە چاوی خۆت ببینە کە بە هیچ جۆر گوللەی وێ ناکەوێ. چاك بوو. جێی ئەسپەکە پێ دەزانم. ئێستا هەر بگەینە وێ وەك بە دەستی خۆم دام نابێ بۆت دەبینمەوە. گوللەی لێ نادرێ. ئەگەر لێشی بدرێ کاری لێناکا. بەڵام مەسەلەیەك کە دەمەویست باسی بکەم شتێکی دیکەیە... حەمەدۆکێك هەیە ها؟ ئەمن دیتم. کچێکیشی لەگەڵ بوو... ئەگەر پێت خۆش بوو ئەتۆش تفەنگێك بە ئەسپەکەوە بنێ، بزانە دەتوانی لێی دەی؟ ئەو لە رەگەزی پەرییانە. کەس ناتوانێ تفەنگی لێدا. ئەو جندۆکەیە... ئەوەی دەمەویست بیڵێم ئەمە نەبوو، حەمەدۆکێك هەیە ها؟ ئەمن دیتم. جارێ با ئەسپەکەت پێشان بدەم، پاشان دەچین و جێی ویشت نیشان دەدەم. وەختێك ئاغا ئەم باسە ببیسێ، هەم تۆی خۆش دەوێ و هەم من. وانیە براله، دورسوون؟"

دورسوون دورمووش لە دەستی ئەو کابرایە کە بە لووتی قسەی دەکردو دەیڕاواند جاڕزو دەهری ببوو. دورسوون دورمووش گوێی لە قسەکانی نەدەگرت.

لەبەر خاتری ئەم چەپەڵە دەبوو دەست و پەلی خوێناوی بن. ئەم جۆرە کەسانە مردن هەقی خۆیان بوو... ئادەم کە لە پێش ئەسپی دورسوون دورمووشەوە دەڕۆیشت، راوەستا، زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

"وانیە براله دورمووش، جێیەکەیت نیشان دەدەم. ئەودەم ئاغا هەم لە تۆ رازی دەبێ و هەم لە من، لە منیش رازی دەبێ."

دورسوون گوتی:"ئەرێ، زۆر رازی دەبێ" پاشان نەڕاندی:"بڕۆ."

خەریك بوو هەتاو بکەوێ کە گەیشتنە ئاکچاساز.

ئادەم گوتی:

"براله، دورسوون، تاوێکی دیکە ئەسپەکە بە چوارناڵی دێ و راست لێرەوە تێدەپەڕێ. ئەتۆش خۆت تاقی بکەوە، بەڵکوو توانیت لێی بدەی. بەڵام هیچ پێم وانیە بێنەنگێوی. زەحمەتی تۆش هەروەك هی من بە فیڕۆ دەچێ. پاشان لێرەوە دەچینە بێستانەکە. جارێکیش تۆ بەو دوو چاوانەی خۆت بێبینە باشە؟ ئەتۆ حەمە..."

قسەکەی تەواو نەکرد. گولله کالانەی چاوی کون کرد.

"براله، دورسوون مەم کوژە، ئاخر بۆچی. ئەمن ژنەکەشم نەدی..."

بەخلور خلور بە عەرزییەوە پان بووەوە. دورسوون سێ تفەنگی دیکەشی لەئادەم دان. لاقی چەپی ئادەم چەند لەحزەیەك جووڵا، پاشان تەزوویەکی پێدا هات و جووڵەی لێبڕا.

ئادەم لەپەوڕوو لەسەر زەوی درێژ ببوو و دەست و لاقی لەبەر یەك بڵاو کردبوون. خوێنێکی زۆر لەبن چەنەگەی کۆ ببووەوە.

## (٥٢)

مانگی گەلاوێژێ گەرما لە چوکووراوا گاڵە دەکا. عەرزو عاسمان دەتوێتەوەو گڕ دەگرێ. زەوی قەڵشتان دەدا، پووش دەپەڕێ و دنیا لە زەردایی‌یەکی گڕگرتوودا نوقم دەبێ. کۆمەڵ کۆمەڵ نینۆکە شەیتانە بە لاسکە وشکەکانەوە دەنووسێن، پێستە رەق و رەنگاوڕەنگەکەیان کاڵ دەبێتەوەو بە سپیایی‌یەکی وەك بلێسەوە دەدرەوشێن. مێش و مەگەزو تاك و تەرا پەپوولەی پاشماوەی بەهار گەورەو پیر دەبن و بە قەدەر چەند هێندەی جروجانەوەرو مێش و مەگەزو پەپوولەی دیکەیان لێ دێ.

لەگەرمای گەلاوێژی چوکووراوا باڵندەکانیش وەختی هەڵفڕین کەیف و دەماغی جارانیان نامێنێ و بەرەبەری نیوەڕۆیە بۆ نموونەش باڵندەیەك لە ئاسمان دا نابینرێ. ئەو گەرمایە کە باڵندەی حەوا وشك دەکاو تلپ بەری دەداتەوە، پێی دەڵێن مەل وەرێن.

کێو و تەپۆلکە داغ و سووربووەکان لە تیشکێکی وەك مژدا ون دەبن و وا دێتە بەرچاو کە خەریکی توانەوەن. لە ئاسمانەوە کە لە گەرمان رەنگێکی خۆڵەپۆتینەی بەخۆیەوە گرتوە، هەزاران و بە ملیۆن هەودای باریکی رووناکی هەتا چاو هەتەر دەکا، دەڕژێنە سەر زەوی. کێوە پاڵ بە پاڵەوە خەوتووەکانی تووڕووس کە هەتا دوور راکشاون و ئاسۆیان لە باوەش گرتوە" چیای حەمیدە، نووری حەق، گاورداغلاری، ئیلان کاڵە، دوومڵووکاڵە، قەڵای ئاناوارزاو سەدان تەپۆلکەی وردو درشت لە دوورەوە لە پشت رووناکایی‌یەکی وەك دووکەڵ بە ئاستەم لێك دەکرێنەوە. دەڵێی لێڵ و ناڕوون لە پشتی تۆڕێکەوە دەبینرێن. لە سەرانسەری دەشتێ دا لە بەیانی‌یەوە تا ئێوارێ لەبەر بلێسەی گەرما دەنگی قەڵشینی زەوی و برژینی رووەکەکان دێتە بەر گوێ و لەوئێوەدا

هیچ بوونەوەرێکی گیاندار نایەتە بەرچاو. پیاو لەو گەرما سەختەدا بەردەوام ئارەق دەردەکاو ئارەقەکەش لە گەرمان وشك دەبێتەوە، لەزەوی و شاخ و بەرد هەڵم هەڵدەستێ، دەڵێی خەریکی توانەوەن. بەڵام ئاوەکان لە گەرمایەکی وا داوەستاوو قورس دا هەڵم ناکەن، بەڵکوو خۆیان پان دەکەنەوەو بۆ ئەوەی هەست پێ بکرێ کە دەڕۆن، دەخزێنە رێبازەکەی خۆیان.

حەمەد یەکەم جار بوو لە ژیانی خۆی دا گەرمایەکی وای دەدی. جاری واش بوو خەریك بوو بخنکێ، بەڵام خەلیلە کۆسە کە بەو گەرمایە راهاتبوو، هەروەك هیچ نەبووبێ، دەیگوت:"براله حەمەد، زۆر سەخت نیە، ئاخرەکەی رادێی."

لای ئێواران دەشتی ئاناوارزا زیندوو دەبێتەوە. لە دووری لەسەر دەریای مەڕمەڕە کۆمەڵە هەوری سپی بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوەو هاوکات لەگەڵ وەڕێ کەوتنی هەورەکان رۆژبایەکی فێنکیش هەڵی دەکا. لە پێش دا ماوەیەك دێ، ئەمجار دەیخاو پاشان لە نەکاو زۆر بە توندی هەڵی دەکاتەوە. لە نیزیك دەریای مەڕمەڕە، لە جادەکان و بەندەنەکان گێژەڵووکە بە بەرزایی سپیدارێك بەدەوری خۆیان دا دەسووڕێن و لە دەشتێدا وەڕێ دەکەون. ئەم گێژەڵووکانە لە کاتێك دا بەرز دەبنەوە، دادەمرنەوە، گەورە دەبن و چووك دەبنەوە، بەرز دەبن و نەوی دەبنەوە، لە دەشتێ دا وەڕێ دەکەون. لە نەکاو تەواوی جادەکان، بەندەنەکان، تەپۆلکەکان، عەرزو عاسمان دەچنە هەورێکی گەورەی تۆزوخۆڵەوەو دەشتی بێبڕانەوە ماوەیەکی درێژ لەبن ئەو هەورەدا ون دەبێ، بە جۆرێك کە سەری لووتی خۆت نابینی. هێندێ جاریش ئەو رۆژبایە وەك بای پاش باران تۆزقاڵێك تۆز چیە، لەزەوی هەڵناستێنێ.

جار جار دنیا هێند گەرم دەبێ کە مێشەنگوینە لە خەڵێف دا، جووچکە پەلەوەر لە هێلانەدا، کیسەڵ لە قاپێلکی خۆی دا، گوڵ لە نێو خونچەداو مێرووله لە شارەکەی خۆیان دا لە گەرمان وشك دەبن. خاکی سووتاو بۆنێکی دیکەی هەیە، وشك و تاڵ و گیرە. لەم فەسڵەدا لەبارترین رووەکی خاکی رەق هەڵاتووی چوکووراوا بڕکە "تووکریووم" و پۆتراکی تاڵ و وشك و چڵە خەلەنگ بە بۆنە وشك و گەرما بردووەکەیەوەن.

لە پووشپەڕدا گۆلاوی ئاکچاساز وەکوڵ دێ. ئاوی گۆلاوەکە بە جۆرێك گەرم دەبێ کە ناتوانی قامکیشی تێ ڕۆ کەی. لەو گۆلاوە وەکوڵهاتوە دەنگی زلقەزلق دێتە بەرگوێ. گۆلاو شەووڕۆژ وەك ئاوی مەنجەڵێك کە وەکوڵ هاتبێ قوڵتەقوڵتی دێ و دەکوڵێ. گۆلاو لە تەختی

بنی ڕا دەلەرزێ و وەك غوولێکی گەورە بەنەڕوهۆڕ هەناسە هەڵدەکێشێ. ئەم هەناسەدانە لەگەڵ ئەو نەڕو هۆڕەی لە قووڵایی گۆلاوەکە هەڵدەستێ، لەگەڵ قولتەقولتی ئاوە وەکوڵ هاتووەکەیدا، هەموو ئینسانێکی ناشارەزا لە ناوچەکە تووشی ترس و سام گرتوویی دەکا. بەتایبەتی شەوانە، ئەویش لە شەوی تاریك دا کە مووی لەشی بنیادەم لە ترسان دەبنە نەشتەر.

ئەگەر حەمەد پیاوێکی خاراوو بە ئەزموونی وەك خەلیلی لە پەنا نەبووایە، نەیدەتوانی لە خاکی ئاناوارزاو لە تەنیشت باتلاغی ئاکچاساز بژی.

حەمەد دیسان بە عادەتی خۆی زوو لە خەو هەستاو بە مەبەستی خۆشوتن چووە سەر چۆمی ساووران. ئەوەی دەیدی باوەڕی نەدەکرد. داخوا خەونی دەدی؟ تەڕایی ئاوێی تێدا نەبوو. داهاتەوە دەستی لە ناوەڕۆی چۆمەکە دا. تەنیا خیزو چەوی وەبەر دەستی هات. بەو خەیالە کە رەنگە بە هەڵە لە جیاتی چۆمەکە رووی کردبێتە جێیەکی دیکە بە پەلە چووە راست و چەپ و سەرو خوار. سەری لەو جێیانە دا کە شارەزایان بوو و دەیزانی ئاوەکە لەوێڕا دێ. بە هەڵە نەچووبوو. ئاو ون ببوو! بەڵام چۆن ڕێی تێدەچێ کە چۆمێکی گەورە لە نەکاو غەیب ببێ؟ بیری کردەوە:"کێ دەزانێ، لەوانەیە ئەمەش لە سروشتە تایبەتییەکانی چوکووراوا بێ. پاشان بە فکریدا هات کە خەلیلی لە خەو هەستێنێ و هۆیەکەی لەو بپرسێ.

بانگی کرد:

"خەلیل، خەلیل، خەیلیل، ئاوەکە وشك بووە خەلیل."

خەلیل کە وەخەبەر هاتبوو پرسی:

"چ بووە؟"

"ئاوەکە وشك بووە."

خەلیل بە غاردان هات تەماشای چۆمە وشکەکەی کرد. حەمەد پرسی:

"لەم وەرزەدا هەمیشە ئاوەکە وای لێدێ؟"

خەلیلە کۆسە نەختێك بیری کردەوەو گوتی:

"هێندێ وەختان، هێندێ وەختان لە وەرزی برنج چاندن دا کەم دەبێتەوە، بەڵام قەت ئەم دیوە ئاوا لە بن ڕا وشك ببێ." لەسەر لێوی چۆمە وشکەکە دانیشتن و لاقیان بەلێوارەکەی دا بەردانەوە.

هەتا خۆرهەڵات بێئەوەی قسەیەك بکەن لە پەنای یەکتر دانیشتن و بیریان کردەوە. هەتاو وەك کۆما پۆلوویەکی سووتێنەری گووشراو سەری وەدەرناو دەسبەجێ ژاڵەکانی وشك کردو

دەوروبەری تواندەوە. خاکی نماویی تەختی بنی ساوورانیش هەتا لای نیوەڕۆیە وشك هەڵات و ئەو جێیانەی کە بەرزتر بوون درزی چووکەڵەی وەك داوی جاڵجاڵووکەیان دا.

لای ئێواری سەیران هات. زۆر شڵەژا بوو و ڕەنگی روخساری لە سووریی‌یەوە بەرەو شینی دەچوو. دەم و چاو و بسکەکانی، برۆ و برژانگ و دەست و لاقی لە تۆزوخۆڵ دا ون ببوون. تەنیا ددانەکانی سپی دەچوون. هێندەی غار دابوو هەناسەبڕکەی وێ کەوتبوو:

"ئاوەکەی بەست. ئێستا چ بکەین؟ عەلی سەفا ئاوەکەی بڕی. هەموو شتێکمان قبووڵ کرد. ئێستا تەگبیرمان چیە؟"

حەمەد لە پێش دا نەیدەزانی چۆمێکی وا گەورە چۆن دەکرێ لە نەکاو وشك بێ. بەڵام بە قسەکانی سەیران تێگەیشت کە چۆمێکی وا گەورە چۆن دەکرێ لە ڕەگ و ریشەوە وشك بێ.

چەندین ساڵ پێشتر کابرایەکی خەڵکی ماراش بە ناوی "مستەفا پیشمان ئۆغلی" دێتە ئەو دەشتە. چەند جۆگەیەك لە ساووران جوێ دەکاتەوە، چەند بەندێك هەڵدەبەستێ. دەشتەکە دەکاتە باتلاغێکی لەبار بۆ مەرەزەجاڕ. بەڵام هەرگیز وای نەدەکرد ئاوی ساووران بە تەواوی وشك بێ، هیچ نەبێ بە ئەندازەی ئاش گێڕێك ئاوی زەرد لە پاشماوەی مەرەزەجاڕەکان بە چۆمەکەدا دەهات.

سەیران گوتی:

"دوێنێ سێ سوار بە چوارناڵی هاتنە ئاوەدانی. سەردەستەکەیان دورسوون دورمووش بوو. دورسوون دورمووش دێهاتی‌یەکانی کۆ کردەوەو گوتی:"لە لایەن ئاغاوە پەیامێکم بۆ هێناون. ئاغا سڵاوی لێدەکردن و دەیگوت زەوی‌یەکانم بۆ چۆڵ کەن و دێیەکە بەجێ بێڵن و بڕۆن. ئاغا گوتی ئەگەر دێیەکە چۆڵ نەکەن و نەڕۆن و ئەگەر بە پشت گەرمیی ئەو حەمەدۆکە چڵمنە لە زەوی‌یەکانم نەچنەدەر، ئێستا کە بە برسی کردن و دەستدرێژی بە نامووس نەم توانیوە ئەزیەتیان بکەم، بە بێئاوی ئەزیەتیان دەکەم. پێیان بڵێ وایوای دەکەمە بیابانی کەربەلا. دێیەکانی دیکەش هەروا. دێیەکانی دیکەش بە ئاگری ئێوەوە دەسووتێن، با بسووتێن. چارەی دیکەم نیە. گوناهەکەی لە ئەستۆی من نیە، لە ئەستۆی ئێوەیە. خەڵکی دێیەکانی دیکە ئەگەر بێ ئاو بوون، با بێن حیسابی خۆیان لە حیسابی وایوای جیا بکەنەوە. خەڵکی وایوای لە زەوی‌یەکانی من وەدەرنێن، ئاوەکەیان حازرو ئامادەیە. بەگ گوتی با بێن و نەیکەنە کەللەشەقی. هەموو شتێك تەحەموول دەکرێ بەڵام بێئاوی

نا. پاشان ئاوی گۆلاوەکەش نەدەن بە منداڵان، چونکە هەموویان دەمرن. ئەمن گوتنەکەم لەسەرە، گوناهەکەی با لە ئەستۆی من دا نەبێ." دورسوون دورمووش ئەمانەی گوت و سوار بوو لێی دا ڕۆیشت."

سەیران وەك گوناهێکی کردبێ، چاوی لە چاوی حەمەد نەدەکرد.

چەند ڕۆژ دواتر مەسەلەکە بە تەواوی روون بووەوە:

وەك دەرکەوت عەلی سەفا دەچێتە لای پیشمان ئۆغلی و دەڵێ:

"مستەفابەگ! ئەگەر هەموو ئاوی چۆمەکە وشك کەی بۆ ئەوەی خەڵکی وایوای زەوییەکانی من بەجێ بهێڵن و بڕۆن، سێ ساڵان بێ ئیجارە زەوییەکانت دەدەمێ بیان کەیە برنج."

پیشمان ئۆغڵییش کە شتێکی وای لە خوای دەوێ دەسبەجێ دەچێ بەندەکان بەرزتر دەکا بە جۆرێك کە دڵۆپە ئاوێك چیە نەچێتە ئەودیو بەندەکەو بە چۆمی دا نەچێتە خوار.

عەلی سەفا لە حاڵێك دا خۆی ڕادەنا، بە پێکەنینەوە دەیگوت:

"ئەمن، ئەمن، من من، ئەمن ئەوەم، ئاوا دەکەم. هەر کارێك پێم خۆش بێ دەیکەم. با ئێستا بچن و دڵی خۆیان بەو حەمەدۆکە خەیاڵییە خۆش بکەن." عەلی سەفا بۆیە دەیگوت:"حەمەدۆکی خەیاڵی" چونکە یاوەر فارووق پاش ئەوەی سەرانسەری دەشتێ گەڕاو شوێنی حەمەدۆکی نەدۆزیەوە" سەرەنجام گەیشتە ئەو ئاکامە کە جووتیارەکان هەر بە خەیاڵ حەمەدۆکێکیان بۆخۆیان داتاشیوە. ئەم بیروباوەڕەی خۆشی لەگەڵ هەمووان باس کرد. یاوەر فارووق هەر بەوەندەش رازی نەبوو و ئەو بیروڕایەی خۆی وەك ڕاپۆرتێك دا بە وەزارەتیش.

عەلی سەفابەگ وێڕای قبووڵ کردنی بیروڕای یاوەر لایەنی خۆپارێزی و وریایی وەلا نەناو بەڕێوەبردنی کاروباری مەزراکەی هەتا هەڵهاتنی مەتەڵۆکەی حەمەدۆك بە دورسوون دورمووش ئەسپاردو بۆخۆی چووە ئەو ماڵە کە لە شار هەیبوو. چونکە حەمەدۆك خەیاڵی بووایە یان ڕاستی، ئاشکرا بوو کە بەڵایەك هەڕەشە لە گیانی وی دەکاو مەترسی هەمیشە لە دەوری سەری دەسووڕێ.

بە بڕینی ئاوەکە لە خەڵکی وایوای باشترین و کاریگەرترین شێوەی هەڕەشەو تۆقاندنی دۆزیبووەوەو لەو بارەیەوە زۆر خۆشحاڵ بوو. بڕینی ئاو لە دێیەکی تەواو ئەویش لە مانگی گەلاوێژدا... "پیاوی دەوێ خۆی بۆ ڕاگرێ."

جووتیاران رۆژی یەکەم و دووهەم و سێهەم ئاوی گۆمیلکەکانیان خواردەوە. پاش حەوتوویەك ئاوی گۆمیلکەو قوولکەکانیش وشك بوو. کاریزیان لێدان. خەڵك لە بەیانییەوە تا ئێواریێ و لە شەوێ ڕا تا بەیانی لەسەر کاریزەکان ریزیان دەبەست. پاش ماوەیەکی کورت کاریزەکانیش وشکیان کرد. لەو قوولکانەش دا کە لە قەراخی چۆمی و لە نێوەڕاستی چۆمەکەش دا هەڵیان کەندن دڵۆپە ئاوێك کۆ نەبووەوە.

زۆریان چاڵاو لێدان. باڵاپیاوێك بە عەرزی دا چوونە خوار هەمووی خیزو خڕکە بەرد بوو. با چەندی دەیان توانی چاڵاویان هەڵکەندبا، بەڵام فایدەی چی؟ دوو سەتڵ ئاویان هەڵدێنجاو چاڵاو وشك دەبوو. جووتیارەکان ئەوەندەیان چاڵاو هەڵکەند هەموو بەری دەستیان بلۆقی کردو خوێن و زوخاوی پێدا هاتەخوار. لەنێو ئاوایی بە تاقە رۆژێك جەنازەی هەشت منداڵ بە خاك ئەسپێرا.

گەرماو تۆزوخۆڵێکی زەرد کە بێپسانەوە بەسەر جووتیارەکان دا دەباری هەتا ماڵەکانیان و هەتا کەلێن و قوژبنی ماڵەکانیان و بگرە هەتا بن پێستی دانیشتووانی نێو ماڵەکان کاری دەکرد.

لە گوندی "ئاشاغی چیانلی" کابرایەك لەسەر دڵۆپە ئاوێك نیزیکترین دۆستی خۆی کوشت.

حەمەد بەیانییان زوو لە خەو هەڵدەستا، بەنێوبەندی چۆمەکەدا وەڕێ دەکەوت و چەند سەعات بەرەو لای سەرووی چۆمی دەڕۆیشت. دەگەیشتە نیزیك شاری و دەگەڕایەوە. رۆژ بە رۆژ قەڵشتی نێوبەندی چۆمەکە زۆرترو قووڵتر دەبوون. خاکی هێندێك شوێنی جێ چۆمەکە ببووە تۆزێکی خۆڵەپۆتینەی گەرم و توێی سەرەوەی خاکە قەڵشیوەکەو هەروەها رووبەری هێندێك لە گۆمیلکە گەنیو و قەوزە گرتووەکان پڕ لە کەلاکە ماسی و رەقەی تۆپیو بوون...

لەنێو گۆمیلکەیەکی قەوزەگرتووی پیس و بۆن کردوودا رەقەیەك بۆ ئەوەی لە تینووان نەخنکێ، بە ناهومێدی پەلەقاژەی دەکرد، سەری لەنێو ئاوە قوڕاوییەکە دێنایەدەرو تەماشای دەوروبەری خۆی دەکردو قوڕەکە بەسەر سەرە ناهومێدەکەیەوە وشك دەبوو.

حەمەد لە مردنی ئەو ئاوە بەقەد مردنی ئینسانێك کە خۆشی ویستبێ ئازاری دەچاشت. چۆمە بێئاوەکە گەنیو و مردوو بوو، و بە میلیۆن درزو قەڵشتی گەورەو چووکی تێدابوو.

حەمەد هەموو رۆژێ لەگەڵ تازیەو شیوەنی ئەو چۆمە وشك کردوە دەژیا. بە هیچ جۆر دەخۆی ڕا نەدەدی بیر لەحاڵی جووتیارەکان بکاتەوە. بیری ئەوانی لەمێشکی خۆی دوور دەخستەوەو تەنیا بە هەناسە هەڵکێشانەوە دەیگوت:

"بووینە بەڵا، بووینە بەڵای گیانیان."

خەڵكی گوندەكانی ئاشاغی چیانلی و "گوبەد"و "ئامبریان ئاركی" لەدەوری یەكتر كۆ دەبوونەوەو هەوڵیان دەدا رێگاچارەیەك بدۆزنەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك گیروگرفتەكەیان بۆ چارەسەر نەدەكرا.

ئەگەر عەلی سەفابەگ لە ترسی حەمەد نەچووبا شارۆچكە، لەوانەبوو جووتیارەكان لە گەرمای نیوەڕۆیەك دا لە كاتێك دا لەگیان جاڕز دەبوون، لە نەكاو راست بنەوەو دێیەكە چۆڵ بكەن. لە دانیشتووانی دێیەكانی دیكە وەك "چیانلی"و دەدەفاكلی و ناراڵقشلاّ تاقە كەسێكیش نەهات، كە پێیان بڵێ:"براینە وەرن ئەم دێیە بەجێ بهێڵن با ئێمە لە بەڵای بێئاوی رزگارمان بێ، هەم ئێوە رزگار دەبن و هەم ئێمە، بڕوانن منداڵەكانمان زەردوویییان گرتوە خەریكن وەك مێش و مەگەز قڕیان تێدەكەوێ."

لە هەر گوندەی نەفەرێك هەستا چەندین جار پێكەوە چوونە لای قایەقام و بە درێژی وەزعی خۆیان و حاڵ و ئەحواڵی دێیەكان و مردنی منداڵەكانیان بۆ باس كرد.

قایەقامیش هەموو جارێ بە خۆشحاڵییەكی بێئەندازەوە كە لەبن دڵسۆزییەكی بەدرۆدا شاررابووەوە، دەستی رێك دەخشاندن و دەیگوت:

"زۆر ناڕەحەت بووم... بەڵا دووربێ، بەڵا دوور بێ. سەرتان سلاّمەت بێ... زۆر ناڕەحەت بووم، بەڵام چارە نیە، مستەفا پیشمان ئۆغلی برنجی چاندوە... سامانی نەتەوایەتییە، ناتوانم رێگا بدەم بسووتێ و لەنێو بچێ..."

"زۆر باشە، ئەی تەگبیر چیە؟"

"زۆر ناڕەحەت بووم، زۆریش بەداخم. فكری لێبكەنەوە كاكی من، رێگاچارەیەك بدۆزنەوە."

پاشان لە حاڵێك دا دەیئەنەڕاند، دەیگوت:

"دەتانەوێ ئاوتان بۆ بكێشم؟ چما ئەمن قایەقامم یان میراو؟"

"عەلی سەفا بەتایبەتی ئەو كارەی كردوە. دەیەوێ ئێمە وەدەرنێ و زەوییەكانمان داگیر بكا. بەتایبەتی ئەو كارەی كردوە. ئەو جێی ئاوەكەی پێدا دەڕوا مەرەزەجاڕ نیە... دێهاتی دەوروبەری ئەو شوێنە وەبن ئاو كەوتوون، كەوتوونە بن قوڕو لیتە."

قایەقام دەیگوت:

"كاكی خۆم، ئەمن خۆی تێ هەڵناقوتێنم. بە تایبەتی دەست لە كاروباری عەلی سەفابەگ وەرنادەم. ئەمن كوێخای ویم، یان نوێنەری قانوون؟ بچن لەگەڵ عەلی سەفابەگ رێك كەون،

پاشان وەرنە لای من. وەختێك دەتوانن لەگەڵ عەلی سەفابەگ پێك بێن، بۆ هاتوونە لای من؟ بچنە کن عەلی سەفابەگ، بچنەماڵێی. چما ئێوە وەکیلی دێهاتی‌یەکانی دیکەن کە وەبن قوڕو لیتە کەوتوون؟ ئەگەر ئەوان شکایەتیان هەیە با بێنە لامان. چما هاوین دوو مانگ زیاتری ماوە؟ ئاب و ئەیلوول و بڕایەوە. کەمێك تەحەممول بکەن کاکی خۆم. سەبرو تەحەممول لەشی بنیادەمی پێ قایم دەبێ. کاکی خۆم ئاو کەم خواردنەوە بۆ لەش ساغی باشە. زۆر نارەحەت بووم. بۆ بێ‌ئاوی‌یەکەتان زۆر نارەحەت بووم. ناوچەکەمان زۆر گەرمێنە، زۆر گەرمە. پیاو بە دەمەساتێك شەلاڵی ئارەق دەبێ نووری چاوم! تەنانەت خەریکە ئێسکەکانیشم ببنە ئارەق و بڕژێنە خوار. هەوا زۆر گەرمە، زۆر گەرمە."

برووسکەیان بۆ ئەدەنەو ئەنکەرە لێ‌دا جوابێکیان وەرنەگرتەوەو دژکردەوەیەکیان نەدی.

حەمەدو خەلیلیش جاروبار بێ‌ئاو دەبوون، بەڵام خەلیل دانەدەما. لەنێو باتلاغەکە لە کانی‌یەك ئاوی فێنك و زولاڵی دێنا. ئاوەکەی هەمیشە تازەو فێنك بوو.

سەیران هەر کە دەرفەتێکی بۆ دەڕەخسا دەهاتە لای حەمەد.

جووتیارەکان هەرچەند بە شێوەیەکی زۆر بەرچاویش نەبێ، پشتیان لە حەمەد کردبوو. زۆربڵێ‌یەکان و تۆقیوەکان و کلۆڵ و داماوەکان لە قسەکانیان دا جاروبار پلارێکیان لە حەمەد دەگرت و کەم کەمە قسەیان دەپەڕاندن.

ئەم قسانە وەك خەنجەر کاریان لە دڵی سەیرانێ دەکرد. ئەو، حەمەدی بە تاوانبار نەدەزانی و ئەوەندەی لە دەستی هاتبا، هەوڵی دەدا حەمەد بەو قسانە نەزانێتەوە. وەسمانەزلە بەرامبەر بەو قسە بە توێکڵانە رقی هەڵدەستاو بە توندی تووڕە دەبوو. بە جۆرێك بە گژ ئەوانەدا کە قسەیان بە حەمەد دەگوت، دەهاتەوە کە خوا خوایان بوو وەك خۆیان لێ‌بێتەوە. بەو حاڵەش زاری خەڵکی جەواڵ نەبوو زاری بدرووی:

"هاتنی حەمەدۆك بۆ چوکووراوا چ دەردێکی دەرمان کرد؟"

"عەلی سەفا نابووتی کردین."

"هەر کە ناویم بیست هاتمەوە ئاوەدانی."

"ناوەکەی لەسەر گۆڕەکەی بنووسن."

"پێمان وابوو دەتوانین هومێدمان پێی هەبێ."

"رەبی خوا ناهومێدی کا."

"ئەسپەکانمان چوون."

"ماڵەکەمان چوو."

"ناموسمان چوو."

"گیانمان چوو."

"هەر کە ناویان بیست و زانیمان هاتوە، دێیەکەمان بەجێ نەهێشت و نەڕۆیشتین."

"ناوی لەسەر گۆڕەکەی بنووسن."

هەرچەندی بێئاوی و ژمارەی نەخۆشەکان زیاتر دەبوو، زیاتر تینیان بۆ وەسمانەزلەو حەمەدۆك دێنا:

"لەبەر خاتری وان مەلافەرهادی بەستەزمان، خۆشەویستی بارەگای خوا ئەوە لە بەندیخانەدا دەرزێ."

"بریا فریوی وانی نەخواردبایە."

"بەستەزمانە، لە داری دەدەن."

نەدەبوو ئەم قسانە بە گوێی حەمەد بگەنەوەو نەدەبوو حەمەد قورسایی ئەم وەزعە هەست پێ بکا. سەیران کەوتبووە تەنگانەوە. بەڵام وا دیار بوو حەمەد بۆنێکی کردوە، فکری بۆ هێندێ شت دەچوو، تووڕەو ناڕەحەت و پەرت و پەرێشان دەبوو. ئەمە لەوەڕا دەردەکەوت کە هەمیشە سەیرانی پرسیار کوت دەکرد. لەوانەش بوو هۆی تەواوی ناڕەحەتیەکانی حەمەد قسەیەك بووبێ کە رۆژی رابردوو دایەقەمەر لە زاری دەرچووبوو:

"حەمەد، کوڕە تاقانەکەم. لەوە کە هەر لێرە ماویەوەو دەخۆی و دەنووی ناڕەحەت نی؟ ئاوت کە هەیە، ئەویش ئاوی فێنك، وانیە؟ ئێمە لەنێو دێ ئاگرمان گرت و سووتاین بۆ دڵۆپە ئاوێك ئامادەین گیانمان بدەین."

لەوانەیە دایەقەمەر لەم قسانە نیازێکی خەراپی نەبووبێ. بەڵام وەك ئەوەش نەدەچوو هیچ مەبەستێکی نەبێ. ئەم قسانە تەوس و تەشەرێکی روون و ئاشکرایان تێدا دەبینرا. قسەکانی دایەقەمەر وەك گوللە کاریان لە دڵی حەمەد کرد.

دواتر دایەقەمەر خۆشی لەو قسەیەی کردبووی پەژیوان بووەوە. بەڵام تازە دەرچووبوو، قسە ئەگەر لە زاری دەرچوو ناگەڕێتەوە. لەو رۆژە بە دواوە دایەقەمەر ئێستاش و ئێستاش پێی لە بێستانێ نەنایەوە.

"بۆ ئەو خەڵکە بووینە ژانەسەر. ئاخ تووشی برسیەتی و تینووەتیمان کردن. ئا...خ کە تووشی چ حاڵێکی پەرێشانمان کردن، بووینە هۆی ئەوەی ناموسیشیان بچێ، هومێدیانمان ناهومێد کرد، دڵقایمی و متمانەشمان لێ‌ئەستاندن. ئا...خ، ئا...خ ئا...خ."

## (٥٣)

ئیدریس بەگ شەوانە وەك گورگێکی تەنیاو دڕندە لە چوکووراوا دا دەگەڕا، و ئەو جەندرمانەی بەدوایەوە بوون ـ هەرچەندێك بوونایە ـ سەری لـێدەشێواندن. دەشتی چوکووراوا پیاوی وا بێباکی کەم بەخۆیەوە دیبوو. ئەو جەندرمانەی ئاگایان لە ئازایەتیی و بێباکیی ئەو هەبوو، و دەیان زانی چۆن لە مردن بێمنەتە، هەوڵیان دەدا زۆری لـێنیزیك نەبنەوە. بۆ وێنە ئەگەر خەبەریان دەزانی کە ئیدریس بەگ لە ڕۆژهەڵاتە، ئەوان بۆ لای ڕۆژئاوا دەچوون و لەوێ بە دوای دا دەگەڕان. لەلایەکیش هەمووان دەیان زانی چەندی بەڵا بەسەر هاتوون و لەبەر ئەوەش ڕێزێکی تایبەتیـیان بۆی هەبوو.

ئیدریس هەوڵێکی بێسوودی دەداو چاوەڕوانیـیەکی خۆڕایی هەبوو. لە چوکووراوا خان و ئاغا نەما دەستەوداوێنی نەبێ و پیاوماقووڵ نەما پەنای بۆ نەبا. تەنانەت چووە ئەنتەپ بۆ لای خورشید بەگی کورد کە مەرداڕێکی گەورە بوو.

خورشید بەگ پێی گوتبوو:"دەیناسم، عارف صائم دەناسم، لە شەڕدا پێکەوە بووین. بەڵام ئەم ڕۆژانە پڕڕوو بووەو خۆی لـێگۆڕاوە. زەحمەتە قسەی حیسابیی بچێتە مێشکەوە. هیچ کام لەو قسانە کە تۆ ئێستا دەیان کەی حاڵی نابێ."

بەو حاڵەش سواری ئەسپ بوو و لە ئەنتەپەوە چووە لای عارف صائم بەگ و تکای لـێکرد لەگەڵ ئیدریس بەگ ئاشت بێتەوە.

بەڵام عارف صائم هەر ئەو جوابەی دایەوە کە بە خەڵکی دیکەشی دابووەوەو بەدەستی بەتاڵ بەڕێی کردەوە.

ئیدرس بەگ سەرۆکی عێلی تورکمەنەکان کورد عەلی ئاغای ـ کە پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو، و زستانان لە ئارانی چوکووراوادا و هاوینان لە زوزانی تووڕووس دەژیاـ سێ جار ناردە لای عارف صائم بەگ. عەلی ئاغای شایی بەخۆو سەنگین هەرچەند هەر جارێك دەچووە لای عارف صائم بەگ بە دەستی بەتاڵ دەگەڕایەوە، دیسان لەبەر خاتری ئیدریس بەگ سێ جاران چووە لای عارف صائم بەگ.

پاش عەلی ئاغا "قوردئۆغلی" خەڵکی کووزان کە پیاوێکی زاناو خوێندەوار بوو، بۆ تکایە چووە لای عارف صائم بەگ. شەجەرەی قورد ئۆغلی دەچووە سەر عوسمانیەکان و "کایخانلی"یەکان. ئەویش بە دەستی بەتاڵەوە هاتەوە.

ئیدریس بەگ دەست و داوێنی "پایاسلی ئۆغلی" بوو. ئەم پیاوە کە لە بنەماڵەیەکی یەکجار گەورەو بەناوبانگ بوو، بەڵام بە دەست کورتی لە ماڵە گەورەکەی باب و باپیرانی دا بە تەنیا دەژیا، بۆ ئێوبژی چووە کن عارف صائم بەگ، بەڵام ئەویش ناکامێکی چنگ نەکەوت.

"رەمەزان ئۆغلی" خەڵکی ئەدەنە، یەغموراغا سەرکردەی ئەسپ دزەکان. "کارا مستەفا ئۆغلی تۆفیق"، "ئەحمەدەفەندی"یە سمێڵ درێژ، خەڵکی "چوکاك"، "بولات مستەفا" مل خوار کە کوڕی زۆر بوون و پیاوێکی یەکجار بەهۆش بوو، هەموویان یەك بەیەك چوونە لای عارف صائم بەگ. هەرچەند هەموانیان دەیان زانی ئێوبژیەکەیان بێسوودە، دیسان بۆ ئەوەی بێدڵیی ئیدریس بەگ نەکەن، دەچوونە لای عارف صائم بەگ.

تەنیا وەڵامێك کە ئەو کابرایە بە تەواوی راسپاردەکانی نیازپاکی و ئاشتیی دایەوە ئەوەبوو کە دەیگوت:"ئاخرەکەی بە زیانی من تەواو دەبێ؟ زۆر باشە رادەوەستین بزانین ئاخرەکەی چۆن دەبێ."

عارف صائم بەگ دەرهەقی ئیدریس بەگ زۆری هەست بە دڵسۆزی و بەزەیی دەکردو جەرگی بۆی دەبرژا، بەڵام چارەی نەبوو. ئەم پیاوە پاشەبەرەی ئەو ئینسانە جوامێرو بێفروفێڵ و ئازایانە بوو کە تۆویان لەم چەرخەدا بڕابووەوە! و بوونی دوژمنێکی ئاوا بۆ هەموو کەس شانازی بوو. عارف صائم بەگ بەڕاستی شانازیی بەخۆیەوە دەکرد کە دوژمنێکی وای هەیەو دەیگوت:

"مەخابن، مەخابن، سەد مەخابن کە لەم دنیایەدا تەنیا لەگەڵ وی دەم توانی دۆست بم."

ئیدریس بەگ پاش ئەوەی کەس نەما بی‌نێرێتە تکایەو ناهومێد بوو، ڕۆژێکیان ئێوارێ هاتە ماڵی وەسمانەزلەو بێ‌ئەوەی لە ئەسپەکەی دابەزێ، بانگی کرد:

"مام وەسمان، مام وەسمان!"

وەسمانەزلە بە زاراوە چەرکەسی‌یەکەی‌ڕا ناسیەوەو زانیشی بۆچی هاتوە. بە پێشوازی‌یەوە چوو و گوتی:

"یاڵڵا با بڕۆین."

پاشان ئەسپی ئیدریس بەگی ڕاکێشایە نیزیك نەردیوانی هەرزاڵێ و لەسەر نەردیوانەکەڕا سواری پاشکۆیە ئەسپەکەی بوو و گوتی:"بڕۆ."

هێشتا حەمەد بەخەبەر بوو کە گەیشتنە بێستانی. لە ئەسپەکە دابەزین. حەمەدو ئیدریس بەگ لە تاریکی دا باوەشیان بە یەکتردا کرد. حەمەد گوتی:

"جارێ با ئاگرێك بکەینەوە کە بتوانین روخساری یەکتر ببینین."

دەسبەجێ کۆمایەك چیلکەو چاڵیان خڕ کردەوەو ئاورێکی خۆشیان کردەوەو دوور لە ئاورەکە دانیشتن."

ئیدریس بەگ دەسبەجێ هاتە نێو ئەسڵی مەبەستەکەوە. ڕاستەوڕاست تەماشای روخساری حەمەدی نەدەکردو لەبنەوە چاوی لـێ‌دەکرد، و حەمەدیش چووکترین جموجۆڵی ئەو پیاوە بە دیمەنەی ـ کە روخساری وەك مسی سوور وابوو ـ لەبەر چاو ون نەدەبوو. حاڵەتێکی هەبوو کە متمانەو باوەڕی دەدا بە مرۆڤ. ئیدریس بەگیش حەمەدی ڕاست بەو جۆرە هاتە بەرچاو کە تاریفیان بۆ کردبوو، بەڵام کەمێك ساویلکەی هاتە بەرچاوان و روخساریشی منداڵانە بوو. دەست و لاقی وەك دەست و لاقی منداڵێکی بزۆزو نائارام بوون، وەك دەستی منداڵێکی بزۆزە کە دەت گوت هەر تاوێك پێش ئێستا فڕفڕەو بووکەشووشەکانی شکاندوەو بە غاردان هاتوەتە ئێرە... هیچ هەڵس و کەوتێکی حەمەد بۆ ئیدریس بەگ سەرسوڕهێنەرو چاوەڕوان نەکراو نەبوو.

ئیدریس بەگ گوتی:

"براله حەمەد، دەمەوێ هاوکاریت لەگەڵ بکەم. هاتووم ئەمەت پێ پێشنیار بکەم. دەمەوێ لە ژێر فەرمانی تۆدا بم. چونکە ئەتۆ پیاوێکی زۆر بەناوبانگ و ئینسانێکی پاك و ئازای. بە فەرماندەرایەتیی تۆ لەگەڵ دوژمنان شەڕ کردن بۆ من شانازی‌یەکی گەورەیە."

زۆری قسە کرد، لە قسەکانی دا هێندێ مەسەلەی هێنانەگۆڕێ کە حەمەد تا ئێستا نەیبیستبوون. حەمەد ئەوی پەسند کردو ئافەریمی پێ گوت.

حەمەد بێدەنگ بوو، و جوابێکی نەدەدایەوە. لای نیوەشەوێ بوو کە حەمەد بەرامبەر بەو هەموو پێداگرتنەی ئیدریس بەگ خۆی پێ رانەگیراو مەسەلەی "عەبدی رۆیشت و هەمزە هات"ی موو بە موو بۆ باس کردو بەم رستانە دوایی بە قسەکانی خۆی هێنا:

"تەنیا ئاکامێك کە لە رژانی خوێنی خەجیج، مردنی دایکم و ئاوارەیی لە چیاو بەندەنان دا وەرم گرت، ئەوە بوو کە "عەبدی رۆیشت و هەمزە هاتە جێگای."

ئیدریس بەگ گوتی:

"هەمزەش بکوژە."

حەمەد کە لە ساویلکەیی ئیدریس بەگ پێکەنینی سوار ببوو، گوتی:

"دووبارە هەمزەیەکی دیکە دێتە جێگای. لێرە لەو جۆرە هەمزانە زۆرن. پێت وایە بەو ئاسانییە خاشەبڕ دەبن؟"

ئیدریس بەگ گوتی:

"ئەمن ئەمانە نازانم. ئەگەر من بوومایە لە پێش دا هەمزەم لەنێو دەبردو کاتێك هەمزەیەکی دیکە دەهات، ئەودەم بیرم لە حاڵی ویش دەکردەوە."

وەسمانەزلەو خەلیل و هاوڕێ چەرکەسەکانی ئیدریس بەگ بێئەوەی بێنە نێو باسەکەوە گوێیان بۆ وتووێژەکەیان راگرتبوو. ئەوان هەقیان لە دووی حەمەد دەدا. ئەگەر یەکێك بکوژی هەزاری دیکە لە جێیەکەی شین دەبێتەوە. ئەگەر هەمووانیش یەك جێ قەلاچۆ بکەی، دەستەیەکی دیکە دێنە جێگایان.

حەمەد بەم رستانە باسەکەی بڕیەوە:

"بەڵێ، ئەوەی دەست و باڵی بەستووین، ئەوەی من دەکوژێ، بێئاکام مانەوەی زەحمەتەکانم نیە. ئەوەی وەك خۆرکە من دەخواو لەنێوم دەبا، ئەوەیە کە کارەکەم خەراپتر کرد، لە خەراپ خەراپتر بوو. هاتم برۆی بۆ چاك بکەم، لێم دا چاوم کوێر کرد، ئەویش چاوی دێیەکی گەورە. لەسەر من دێهاتییەکان تووشی زوڵم و زۆر بوون، لەبرسان بایان کردو مردن، لەسەر من... لەسەر من دەستدرێژی کرایە سەر نامووسی کچە نازدارەکانیان. ئێستا ئەوەی دەست و باڵی منی بەستوە، ئەم مەسەلەیەیە."

ئیدریس بەگ کە لە ریشەی دەردو ئازاری حەمەد حالّی نەببوو، لە حالّێك دا لە جێی خۆی هەڵدەستا گوتی:

"جارێ ئەمن دەڕۆم. دوو رۆژی دیکە دێمەوە. گرنگترین کاری ژیانم جێبەجێ دەکەم و دێمەوە. جارێ دەرفەتم نیە. وەختێك هاتمەوە دەچینە چیاو بەندەنان و لەوێ هەموو ئەوانەی باست کردن، لێم حالّی بکە. وەختێك حالّی بووم دەتوانم ببمە مەڵحەمێك بۆ برینەکانت."

حەمەد وەڵامی نەدایەوە. ئیدریس بەگ سواری ئەسپەکەی بوو و گوتی:

"بەخوام سپاردی. قەرارمان دوو رۆژی دیکە."

حەمەد گوتی:"بەخێر چی..." و بە خەم و خەفەتێکی سەیرەوە لە پشتەوەڕا تەماشای کرد.

وەسمانەزلە تەماشای روخساری حەمەدی نەدەکردو پێشی نەدەگوت شەهێنەکەم. ئازارو دڵئێشانێکی قووڵ لە چاوەکانی دا دەبینرا، و خەفەتێکی وەك تازیەداری نیشتبووە سەر روخساری. گنج و لۆچی دەم و چاوی زیاتر ببوون. روخساری وەك چەند دانە داوی جاڵجاڵۆکە دەچوو کە لەسەر یەکیان دانابن.

وەسمانەزلە بەری بەیانی بێستانەکەی بەجێ هێشت:

"کوڕم حەمەد، ئەو عەلی سەفایە ئابووتی کردین، پشتی شکاندین، ئێمەش بەرامبەر بە وی هیچمان لە دەست نەهات."

پاشان وەرسووڕاو بێئەوەی ئاوڕ وەدوای خۆی بداتەوە، لێی داو رۆیشت.

وەك دارێکی ڕزیو کە لەسەر زەوی کەوتبێ و رزیوو گەندەڵەکەی هەڵوەرێ و وەك گۆرانییەکی تاڵ و خەمناك لەبەر گەرمادا دوور کەوتەوە.

شتێك بەری ئەوکێ حەمەدی گرت.

ئیدریس بەگ بەیانی زوو پێش کازیوە گەیشتە باڵەخانەکەی عارف صائم بەگ. پاسەوانانی چەکداری ماڵێ ئەویان دی، بەڵام نەیان توانی فەرمانی راوەستانی پێ بدەن. ئیدریس بەگ بە سواری چووە ژووری حەوشەی. لەنێوەڕاستی حەوشەکە بیست هەنگاو دوور لە خانووبەرەکە راوەستاو هاواری کرد:

"عارف صائم بەگ، عارف صائم بەگ! ئەمن ئیدریسم، ئیدریس. ئەمن هاتم."

عارف صائم بەگ لە نوێنی خەو دەرپەڕی، هاتە پەنا پەنجەرەکە، لایەکی پەنجەرەکەی کردەوەو تەماشای دەرێی کرد. ئیدریس بەگ لە حالێك دا سێ کەس لە پیاوەکانی خۆی لە

دواوه بوون، قیت و قنج لەسەر ئەسپەکەی چەقیبوو و بەمووە زەردەکانی کە لەبن کڵاوە چەرمە رەشەکەی ڕا رژابوونە دەرو بە چەك و زین و رەختی زێونیشان و بەو چاوە شینە پڕشنگدارانەی کە وەك چاوی باڵندەیەکی راوکەر دەچوون، هەروەك پەیکەری غیرەت و ئازایەتی و بەخۆنازین دەچوو.

"عارف صائم بەگ، عارف صائم بەگ. ئەمن ئیدریسم. ئەمن هاتم."

عارف صائم بەگ پەنجەرەکەی کردەوەو بە نەرمترین و گەرمترین و دۆستانەترین راوێژ گوتی:

"فەرموو ئیدریس بەگ، فەرموو بۆ سەرێ، هەر ئێستا خۆم پۆشتە دەکەمەوە."

"عارف صائم بەگ ئەمن نایەمە سەرێ. ئەتۆ فەرموو بۆ خوارێ. پاشان دەمانچەکەشت هەڵگرەو بە چەکەوە وەرە. ئەتۆ سەربازێکی. دەمەوێ حیسابی خۆم لەگەڵ تۆ یەك لا بکەم. دەمانچەکەت هەڵگرەو تەشریفت بێتە خوارێ."

عارف صائم بەگ پەنجەرەکەی پێوەداو کشایەوە بۆ ژووری هۆدەکەی. ئیدریس بەگ بەبێسەبری لە جێی خۆی راوەستابوو و چاوی بڕیبووە دەرکی خانووبەرەکە، چاوەڕوانی هاتنی عارف صائم بەگ بوو. زۆر چاوەڕێ بوو، حەوسەلەی بەسەر چوو. یەکەمین رووناکایی رۆژ دەشتی لستەوەو گەیشتە جێ. هەتا بە قەد سپیدارێك بەرز بوو. ئیدریس بەگ هێشتا چاوەڕێ بوو. سەرەنجام تاقەتی بەسەر چوو:

عارف صائم بەگ، عارف صائم بەگ..."

قسەکەی ناتەواو ما. گوللەیەك لە پشتەوەڕا هاوێژرا، لە ئەستۆی دراو گەرووی لەبەر یەك هەڵتەکاند. لەشی بێگیانی ئیدریس بەگ ئارام و بێدەنگ لەسەر ئەسپەکە کەوتە خوار. کڵاوە چەرمەکەی نەختێك ئەولاتر لە پەنای سەری خزی، قژە زێڕینەکانی بڵاو بوون و لەگەڵ تۆزوخۆڵ لێك دران. خوێنەکەی لە نیزیك شانانی خڕ بووەوەو ئەمجار هەتا مووەکانی رۆیشت و قژەکانی سوور کرد.

هاوڕێیەکانی لە ئەسپەکانیان دابەزین. کڵاوە چەرمەکەیان لەسەر سەریان هەڵگرت و بەدەستیانەوە گرتن و بەخۆیانەوە گوشین و چەند لەحزەیەك لە حوزوور سەرکردەکەیان بێدەنگ راوەستان. دوا ئەرکی خۆیان بەجێ گەیاندو ئەمجار تەرمەکەییان زۆر بە ئارامی وەك ئەوەی بترسن ئازاری پێبگا، لەسەر پشتی ئەسپەکە دابەست و بە بێدەنگی لەوێ دوور کەوتنەوە.

عارف صائم بەگ چەند لەحزەیەك لە پشتەوەڕا تەماشای كردن و گوتی:

"حەیف، سەد حەیف، دەكرا دۆستایەتیی لەگەڵ بكەی."

عەلییەشەل خەبەری كوژرانی ئیدریس بەگی بۆ حەمەد هێنا.

حەمەد چەندە بە كوژرانی ئیدریس بەگ تێك چوو، ئەوەندەش بە هاتنی عەلی خۆشحاڵ بوو.

## (٥٤)

ڕۆژێکیان بەیانی تازە دنیا ڕووناک دەبوو کە ژمارەیەکی زۆر خەڵك لە دەشتی جنووبی قەڵای ئاناوارزاوە بەرەو ڕۆژهەڵات وەڕێ کەوتن. کەس نەیدەزانی بۆچی وەڕێ کەوتوون و دەچنە کوێ. لە ڕێگایەدا دانیشتووانی هێندێك لە گوندەکانی پشتی ساووران وەك "چیانلی"، "نارلیقشلا"و "دەدەفاکلی"یش هاتن و ڕەگەڵ ئەو کۆمەڵە کەوتن. جووتیارەکان، گەورەو منداڵ، ژن و پیاو، ساغ و نەخۆش و پیرو لاو وەك مێشەنگوینە کە خەڵێفەکەی خۆی بەجێ دێڵێ، دێیەکانیان چۆڵ دەکردو ڕەگەڵ ئاپۆرایەکە دەکەوتن. ئێستا دەرکەوتبوو کە ئەو خەڵکە بۆ کوێ و بە چ مەبەستێك وەڕێ کەوتوون. هەورێکی درێژو دووری تۆزوخۆڵ بەرەو شارۆچکە لە زەوی بەرز دەبووەوە. ئەو هەورە درێژە هەتا دەهات درێژترو پان تر دەبوو. خەلیل چوبووە سەر دارێکی بەرز، چاوی لە ئاپۆرایەکە بوو و بۆ حەمەدیشی باس دەکرد. چەند لەحزەیەك دواتر بە پەلە لە دارەکە هاتە خوارێ و گوتی:

"خۆت بشارەوە، دەستەیەکیش لەدێی خۆمانەوە دێنە ئەم بەر."

خەڵکی گوندی وایوایش وەڕێ کەوتبوون، ژنەکان لە پێشەوە، منداڵان بە دوای وان داو لە دوای منداڵانیشەوە پیاوەکان هاتن و وەنێو بێستانی کەوتن. هەریەکەی یەك دوو شووتی‌یان لێ‌کردنەوە، لەبن هەنگڵێ‌یان نان و بێ‌ئەوەی ڕاوەستن، یان قسەیەك بکەن ملی ڕێگایان گرت و ڕۆیشتن و تێکەڵ بە ئاپۆرایەکە بوون کە نەختێك لە پێش وانەوە دەڕۆیشتن. خەلیلیش لەگەڵیان چووبوو.

نیوەی حەشیمەتەکە لەبەری پێیانەوە تا تۆقی سەریان لە قوڕو چڵپاو دا شەڵاڵ ببوو. پیشمان ئۆغڵی بەندی چۆمەکەی ترازاندبوو، ئاوەکەی بەردابووەوە سەر دەشتێ و بۆیە ژمارەیەك لە دێیەکانی سەر ڕێگا وەبن ئاو کەوتبوون.

ئەگەر کەسێك لە پیشمان ئۆغڵی دەپرسی:

"ها پیشمان ئۆغڵی ئەوە چ کارێك بوو کردت؟"

بە پێکەنینەوە وەڵامی دەدایەوە:

"چ بکەم براله، خۆ ناتوانم ئەو هەموو ئاوە بخۆمەوە، دیارە دەبێ بە جێیەك دا بەری دەمەوە..."

پیشمان ئۆغڵی پیاوێکی زگ زلی دەم بە پێکەنین بوو.

دەیگوت:

"با لەو گەرمای هاوینەدا ئەم قو... نە تێرو پڕ ئاو بخۆنەوە. ئەگەر ئەمانە لەجێی ئەو دێهاتیانە بان کە ئاویان نیە، ئەودەم چ قوڕێکیان وەسەری خۆیان دەکرد؟ خەڵکی ئەم خوارە بۆ دڵۆپە ئاوێك گیانیان دەردەچێ. ئێستا ئەمانە ناشکوری بەو نیعمەتەوە دەکەن کە هەتا گوێزینگی لاقیان هاتوە؟ ئاوەکە بەر دەدەمەوە، ئاوەکە بەردەدەمەوە سەر گوندەکانیان با لەو گەرمایەدا چاوو دڵیان تێراو بێ."

پیشمان ئۆغڵی لەنێو شارۆچکەدا بازاڕ بە بازاڕو دوکان بە دوکان دەگەڕا، ئەم قسانەی دەکردو خەڵکی وەپێکەنین دەخست. لە هەمووان زیاتر عەلی سەفابەگ و یاوەر فارووق کەیفیان بەم قسانە دەهات. دەستیان بە بەرزگیانەو دەگرت و قاقا پێدەکەنین.

وەختێك حەشیمەتەکە لەنێو ئەو هەورە پان و بەرینە تۆزو خۆڵەدا کە سات بە سات پان ترو درێژتر دەبوو، گەیشتنە گومبەزی نیزیك شاری، لەحزەیەك ڕاوەستان. دەمەساتێك جموجۆڵێکیان دەنێو کەوت و ئەمجار خرۆشێکی گەورەو مەزنیان لێوە هەستا کە دەنگی گەیشتە نێو شاری. ئەوان سەرانسەری ڕێگاکەیان تا ئەم نوختەیە بە بێدەنگی بڕیبوو. جووتیارەکانی دەوروبەری چۆمی ساووران، جووتیارانی دێهاتی وەبن ئاوکەوتووی دەوروبەری "غەداپلی" دەست ولاق و دەم و چاوو مووی سەرو تەواوی ئەندامی لەشیان لە دەریایەك تۆزوخۆڵ هەڵکشابوون و هاتبوونەدەرو وەك پەیکەرێکیان لێهاتبوو کە لە تۆزوخۆڵ دروستیان کردبێ.

دانیشتوانی شارۆچکە وەختێك ئاگادار بوون کە کۆمەڵێکی زۆرو رق هەستاو لە جووتیارەکان روویان لە شاری کردوە کە جووتیارەکان لەبن گومبەزێ راوەستان و بە نرکەی خۆیان گوێی ئاسمانیان کەڕ کرد. خەڵکی شار لە پێش دا بەبێباوەڕی و سەرسوڕمانەوە تەماشای یەکتریان کردو بێدەنگییەك شاری داگرت. ئەمجار پێکەنین و دەستیان کرد بە گاڵتەو گەپ. بەڵام لەپڕ تەماشایان کردو دیتیان کە لە بەندەنەکەی خوار گومبەزەوە ئاپۆرایەکی بێئەژمارو لەبڕان نەهاتوو وەدەرکەوتن. دەسبەجێ دەرڕابەی هەموو دوکانەکان دادرانەوە، هەموو خۆیان لە ماڵەکانیان هاویشتەوەو دارگەڵەی قاپیان بە پاش دەرگاکانیانەوە نا. یاوەر فارووق نەیدەزانی تەگبیری چیە. قایمقام، فەرمانبەرانی دەوڵەت، ئاغاکان و جەندرمەکان لە مەخفەری جەندرمەدا خۆیان حەشار دا. یاوەر فارووق بە راوێژێکی توندەوە فەرمانی دا سەرەنێزە لە تفەنگەکانیان بدەن.

داخوا ئەمە شۆرش بوو؟ زۆربەی ئاغاکان وەك مێژۆك دەلەرزین. روومایان وەك رووماى مردووان زەرد هەڵگەڕابوو. قایمقام لەبن دیوارێك هەڵکوشمابوو. دەسحێبەکانی لە گیرفانی دەرهێنابوون، و پەیتا پەیتا لەبن لێوانەوە دوعای دەخوێندن و فووی لە خۆی دەکرد.

حەشیمەت هەر کە چاویان بە پردێکی جوانی گەورە کەوت کە لە خوار تەپۆلکەکەی ئەم لای شارەوە بە بەردی سپی دروست کرابوو، دەستیان کرد بە غاردان. بەندەکان لەبن ئەو پردە بوون.

پیشمان ئۆغلی ئاوی ساوورانی بە هۆی ئەو بەندانەوە وشك کردبوو. حەشیمەتەکە بەرە بەرە هات و هەموویان لە پەنای بەندەکان راوەستان. کەس دەنگی لەبەر دەرنەدەهات. هەر کەس دەگەیشتە جێ دەهات و چاوی لەو ئاوەوە دەبڕی کە وەك دەریایەکی چووکەڵە لە پشت بەندەکانەوە داوەستابوو. تەماشای دەکردو چاوەڕێ دەما.

لە نەکاو ئاپۆرای حەشیمەتەکە هەروەك هیچ نەبووبێ ئارام ئارام وەنێو ئاوەکە کەوتن. دەمەساتێك وەزعەکە شێواو پاشان تا چەند لەحزەیەك بێجگە لە ئاپۆرای حەشیمەت لەنێو ئاوەکەدا هیچ دیار نەبوو. وەختێك ئەو حەشیمەتە کە بە توندی پاڵیان وێك دابوو، لێك ترازان، بەندەکان چووکترین شوێنەواریان نەمابوو. نە بەردێك،

نە دارێك و نە تەنانەت چڵە دڕكێك. حەشیمەت پاڵیان وێك دا، خۆیان بە بەندەكان داداو پاشان لێك ترازان. ئاو بەرەو خوار هەڵەڕژا. هاوكات لەگەڵ دەنگی هەڵەڕژانی ئاوەكە هاواری خۆشحاڵییش لە حەشیمەتەكە بەرز بووەوە كە لە هەموو شارەكە گەڕاو شاری خستە لەرزین. جووتیاران لەگەڵ ئەو ئاوەی بەریان دابووەوە، بەرەو خوار وەڕێ كەوتن. پاشان لێكرا داهاتنەوەو لەو ئاوە كە بە كەف پرژاندن دەڕۆیشتە خوار ئاویان خواردەوە. ئەوان لەگەڵ ئاوەكەدا سەرخۆش لە بادەی سەركەوتن وەڕێ كەوتبوون.

وا پێدەكەنین و شادمانی‌یان دەنواندو بە جۆرێك كەوتبوونە جۆش و خرۆش كە كەس گوێی لە قسەی كەس نەبوو. دەت گوت گوێیان كەڕ بووەو هیچ نابیسن. ئەو ئاوەی بەرەو خوار هەڵدەڕژا چەندین كیلۆمیتر سەرەوژێری بڕی و ئەمجار راوەستا. چونكە بەستێنەكە هەزاران قەڵشتی دابوو كە لاقی بنیادەمیان تێوە دەچوو. ئاوەكە دەهات و دەچووە قەڵشتێكەوە. پاش ئەوەی پڕی دەكردەوە دەڕۆیشتە خوارو كاتێك دەگەیشتە قەڵشتێكی دیكە دیسان رادەوەستا تا پڕی دەكردەوەو ئەمجار درێژەی بە رێگای خۆی دەدا. حەشیمەت چاویان بڕیبووە ئەو ئاوە ئەحلەتی‌یە كە نەدەچووە پێش. ئەو شەوە بێ ئەوەی بخەون تا بەیانی لەسەر ئاوەكە چاوەڕێ مان. ئاوەكە لە شەوێ ڕا تا بەیانی تەنیا هەزار، هەزارو پێنسەد هەنگاوێك چووە پێش. ئاوەكە دەهات، دەهات و لەنەكاو بە خوڕە خوڕ دەڕژایە نێو قەڵشتەكان.

وەختێك خەڵكی شار لە ئەسڵی مەسەلەكە ئاگادار بوون، بە خۆشحاڵی لە ماڵەكانیان هاتنەدەرو ئەوانیش وەك جووتیارەكان هاتن و لەسەر ئەو ئاوە كە بە سستی دەچووە پێش و بەردەوام قەڵشتی پڕ دەكردنەوە، كۆ بوونەوەو هەروەك جووتیارەكان چاویان لە ئاوەكەوە بڕی و چاوەڕێ مان.

قایمقام كە زۆر ترسابوو، هەر كە ئاگادار بوو مەسەلە چیە، بە تووڕەیی هاواری كرد:

"دەبێ هەموویان بگرین."

ئەمەش هەر ئەو شتە بوو كە عەلی سەفابەگ لە خوای دەویست. دەستی كرد بە هاندانی قایمقام. بەڵام یاوەر فارووق حەزی بەم كارە نەدەكرد. بە باوەڕی وی:"خەڵك بێئاو ماونەوەو هاتوون بەندی كابرایەكیان خەراپ كردوە، ئەمە شتێك نیە."

بەلام لە پێش چاوی عەلی سەفابەگ ئەم کارە شتێك بوو وەك شۆرش و یاخی بوون. باوەڕی وابوو کە دێهاتی‌یەکان یاخی بوون و پەلاماری شاریان داوەو بە توندی پێی دەچەقاند کە:

"ئەگەر ئەمانە، ئەگەر ئەم کردەوەیەی ئەمانە بێ‌سزا بڕوا، ئەگەر ئەمانە بە توندی سزا نەدرێن، ئاکامێکی زۆر دژواری بەدواوە دەبێ. ئەمە یاخی‌بوونێکە. هەموو ئەو دێهاتی‌یانەی بەشداری ئەم کارە بوون، دەبێ بگیرێن."

داواکاری گشتی لەوێ ڕاوەستابوو، و بیروڕای خۆی دەرنەدەبڕی. عەلی سەفابەگ ئەوی بردە قوژبنێك و هێندێ شتی بە گوێ دا چپاندو زەرفێکی پڕو ئەستووری لەنێو دەستی نا.

تاوێك دواتر داواکاری گشتی گوتی:

"ئێستا بۆ دادگا دەنووسم هەمووی ئەمانە بگرن. حوکمی گیرانیان هەر ئێستا دەردەچێ."

پاشان قۆڵی لە قۆڵی دادپرس ڕاکردو پێکەوە وەدەرکەوتن.

دوانیوەڕۆی ڕۆژی دواتر بوو. ڕۆژبای دەهات و تۆزوخۆڵێکی زۆری ڕەهەوا خستبوو.

دەستەیەك جەندرمە بە فەرماندەرایەتیی یاوەر فارووق لەو جووتیارانە کە چاویان لە ئاوەکەوە بڕیبوو، نیزیك بوونەوە. ئاو قەڵشتەکانی پڕ دەکردەوەو نەدەچووە پێش. جەندرمەکان هاتن و چەند تفەنگێکیان هەڵتۆقاند. جووتیارەکان کۆ بوونەوە سەر یەك و جەندرمەکان هەستیان کرد ئیدی پێویست بە تەق و تۆق ناکا. جووتیارەکانیان بردو لە حەوشەی مەخفەری جەندرمەدا کۆیان کردنەوە، و چونکە حەوشەی جەندرمە جێی هەمووانی تێدا نەدەبووەوە، ژمارەیەکیان بردنە مزگەت و حەوشی مزگەوت و بەشێکیشیان لە "ئالا مەسجید"و قوتابخانەی سەرەتایی و "ئەرمەنی شۆرنی" دا حەپس کردن. حەوشە بەتاڵەکانی شار پڕ بوون لە جووتیاری بەندکراو، و لە کاتێك دا یەك دوو جەندرمە لـێیان وریا بوون، لەبەر ئەو گەرمایە برسی و تینوو مابوونەوە. هیچ کەس لەو جووتیارانە کە لە برسان و لە تینووان جینگڵیان دەدا نیزیك نەدەکەوتەوەو پاروە نانێك و چۆڕە ئاوێکی نەدەدانێ.

لەو بێنەو بەرەیەدا عەلی سەفابەگیش بێ‌کار دانەنیشت و وەلام لە دوای وەلام بۆ جووتیارەکانی گوندی "وایوای"ی بەڕێ کرد:"ئەگەر دێیەکەم چۆڵ کەن و بڕۆن، وا

دەکەم لێتان خۆش بن. ئەگینا بە تاوانی یاخی بوون لە حکوومەت سەردەستەکانتان ئیعدام دەکرێن و بۆخۆشتان هەریەکەی بە پازدە بیست ساڵ حەپس مەحکووم دەبن."

جووتیارەکان چەند رۆژێکی دیکەش خۆیان راگرت و حازر نەبوون ئەو کارە بکەن. بەڵام برسیەتی و تینووەتی ئەوانی تووشی وەزع و حاڵێك کردبوو کە هاواری منداڵانی تینوو وناڵەی ژنان خەوو ئاسوودەیی لە خەڵکی شار هەڵگرت. دانیشتووانی شار کە توانای بیستنی ئەو هەموو ناڵەو هاوارەیان نەبوو، لای بەیانی نان و ئاویان بۆ بەندییەکان هێنا.

وەسمانەزلە حازر نەبوو لەگەڵ عەلی سەفا بەرەورِوو بێ. دەیگوت:

"ئەگەر بش مرم حازر نیم قەلافەتی چەپەڵی ئەو کابرایە ببینم."

بەڵام سەیفەلی مل درێژ کە هێشتا برینەکانی چاك نەببوونەوە، لەگەڵ حسامی کورِی وەسمانەزلەو وەلی چوونە ماڵی عەلی سەفابەگ. داواکاری گشتی و قایمەقامیش لەوێ بوون و خەریکی خواردنەوە بوون. چوون لە سووچێك لەسەر قەنەفە دانیشتن و بە ئەدەب دەستیان لەسەر ئەژنۆیان داناو سەریان بەردایەوە.

داواکاری گشتی گوتی:

"ئێوە زۆرتان خەراپە دەرهەقی عەلی سەفابەگ کردوە، زوڵم لەو پیاوە دەکەن."

سەیفەلی هەستایە سەرپێ ـ سەری لە میچی دەدرا ـ گوتی:"بە هیچ جۆر..."

داواکاری گشتی گوتی:

"وست بە، دانیشە لە جێی خۆت. دوێنێ شەوێ پێنج کەس لە لاوەکانی گوندی ئێوە لە کاتی ئاگردانی کێڵگەی عەلی سەفابەگ دا گیراون."

عەلی سەفا لێی زیاد کرد:

"پێنج کەس، یەکیان دەلی مووسلوویە، ئەوی دیکەشیان ناوی سلێمانە. ئاخر هاورِێیان، چیتان لە من دەوێ، ئەمن چ خەراپەیەکم دەرهەقی ئێوە کردوە؟"

سەیفەلی هەستایە سەرپێ و گوتی:

"ئازادمان بکەن، دێیەکە چۆڵ دەکەین و دەرِۆین. باب و باپیرانمان وەختێك ژیانی کۆچەرایەتییان وەلا نا، هاتنە سەر ئەم خاکە. بەڵام ئێمە بەجێی دێڵین، چارەمان نیە، قیسمەتمان ئەوە بوو. عەرزی باب و باپیرانمان بەجێ دێڵین..."

راوێژی قسەکانی جۆرێك بوو دەت گوت شیوەن و فغان دەکا.

عەلی سەفا بە گەشکە بوونەوە گوتی:

"کەنگێ دەڕۆن؟"

سەیفەلی دیسان هەر بەو راوێژی وەك شیوەن و فغانەوە گوتی:

"دەسبەجێ، هەر کە بەرتان داین سەری خۆمان هەڵدەگرین و دەڕۆین."

داواکاری گشتی گوتی:

"ئێستا کەوایە هەستن بڕۆن. سبەینێ بەیانی ئازادن."

هەستان و رۆیشتن، بۆ سبەینێ بەیانییش جووتیارەکان هەموو ئازاد بوون.

جووتیارەکانی وایوای وەختی گەڕانەوە بە زمانی لە تینووان لە دەم دا وشك بوو و بە بێدەنگییەوە سەرانسەری لێواری ساوورانیان پێوا. ئاوەکە تەنیا هەتا گوندی "ئامبرین ئارکی" چووبووە پێش. لە خوار ئەو دێیە ئاوەکە هێشتا هەر دەڕژایە قەڵشتەکانەوەو پڕی دەکردنەوە.

## (٥٥)

ئەو تیشکە زەردەی لەکاسە سەری دا هەبوو، بە گەیشتنی چەند هەودای باریکی نوور کە لە دوورەوە دەهاتن، زۆرترو بەربلاوتر بوو. هەڵەڕژا، بە خێراییەکی بێئەنداز دەستی بە سووڕان کرد، پەرش و بلاو بوو، پڕیشکی هاویشت و پێوە چوو، ئەمجار بە توندی درەوشایەوە.

هەوا زۆر گەرم بوو. حەمەد تەماشای بەستێنە وشکەکەی دەکرد، تەنکاوێك هاتبوو ئارام و بێدەنگ قەڵشتەکانی پڕ دەکردەوە. لە دڵی خۆی دا گوتی:"دیارە گوندی وایوای بار دەکا."و دیسان ئەو بریسکە پۆلایە هات و نیشتە بنی چاوەکانیەوە. وەسمانەزلە، سەیران، سەیفەلی مل درێژ، مەلا فەرهادی چاوجوان، یۆبازئۆغلێی کەللەشەق، دایەقەمەرو سیلوێرگلین هاتنە بەر چاوانی. دیار بوو هەموویان نیازیان هەیە وایوای بەجێ بێڵن و بڕۆن. لەوانەشە ماوەیەك بێ رۆیبن و دێیەکەیان چۆڵ کردبێ. دوو رۆژ دەبوو کە سەیران سەری بێستانی نەدابوو.

ئاخر جار کە هات چاوەکانی لە پەژارەیەکی کوشندەدا دەدرەوشانەوە. تەنانەت یەك قسەی نالەباریشی بە حەمەد نەگوت. بەڵام وا بە ناڕەحەتی و دڵ ڕەنجاوی تەماشای کرد کە حەمەد هەتا مێشکی ئێسقانەکانی لەرزی. شکان و ترسان داغی خۆیان بە نێوچاوانی سەیرانێشەوە نابوو، و درەنگ یان زوو ئەویشیان لەپێ دەخست.

عەلیەشەل لەوێ بوو. لەسەر لاقە شەلەکەی دانیشتبوو و خەریك بوو لە پەلەبیەك فیت فیتەیەکی سەیری دروست دەکرد. خەلیلە کۆسە چووبووە گوێی رووبارو تەماشای ئەو ئاوەی دەکرد کە قەڵشتەکانی پڕ دەکردەوە.

عەلی پاش ماوەیەك سەری هەڵبڕی و تەماشای روخساری حەمەدی کرد. هەر کە چاوی پێی کەوت بریسکە پۆلاییەکەی لە چاوان دا بەدی کرد. لەحزەیەك شتێکی لە نێوان شادمانی و خەفەت و پێکەنین و گریان دا هاتە سەر روخساری و رابرد. حەمەد هەستا، چوو بۆ لای عەلی و لە پەنای راوەستاو بە دۆستانەترین شێوە تێیەوە راما. دەستی لەسەر شانی داناو ماوەیەك هەر بەو جۆرە مایەوەو پاشان چووە بن کەپرەکەو بوخچەکەی لەبن نوێنەکانی هێنایەدەر. کراس و پانتۆڵێك کە لەبەریدا بوون، دایکەندن و لەولای دانان و خێراو لە چاو ترووکاندنێك دا جلکەکانی خۆی لەبەر کردنەوە. دەمانچەو خەنجەرو دووربینەکەی لە خۆی دان و فیشەکدانەکانی بەستن. فیلینتایەکەی لە شانی کردو عەبا گوڵدۆزیکراوەکەی کە کاری ماراش بوو لەسەریەوە لەبەر کرد. تەقیلەکەی چەند لەحزەیەك لە دەستی دا هێناو برد، بەڵام لەسەری نەناو لە گیرفانی عەباکەی راکرد. گۆرەوییەکانی دەگەیشتنە ئەژنۆی. کەوشەکانی رەق هەڵاتبوون و کەمێك لاقییان دەگوشی، بەڵام هەرچۆنێك با فرەوان دەبوونەوە. ئێستا راست ئەو قەڵافەتەی هەبوو کە یەکەم رۆژی هاتنی بۆ چوکووراوا هەیبوو.

هات و بەرامبەر بە عەلییەشەل راوەستا. بریسکەی چاوەکانی زۆرترو درەوشاوەتر ببوو. ئەو تیشکە زەردەی لە کاسەی سەریدا بوو، لە پەستاو بێپسانەوە وەك لافاو دەڕژا، قەڵشتەکانی پڕ دەکردنەوەو دەدرەوشا.

عەلییەشەل گوتی:

"هەمزە ئەگەر بژی، هەزار ساڵی دیکەش بژی، لەو ترسەی کەوتوەتە گیانی نابێتەوە بنیادەمەکەی جاران. عەرزی بە خزمەتی ئاغای خۆم بکەم هەمزە نابێتەوە هەمزەکەی جاران. کاکە! ئەو ترس و سامە بچێتە خوێنی هەر کەسێکەوە، بچێتە دڵی هەر کەسێکەوە حیسابی تەواوەو فاتیحەی خوێندراوە. عەرزی بە خزمەتی ئاغای خۆم بکەم هەمزە دەستەو داوێنی شاخ و کێو و تەیری ئاسمانیش بووە. ئەم دواییانە وای لێهاتبوو ئەگەر پەڕە مریشکێکی کەوتبایە سەر، ئەگەر گوێی لە وزەی مێشوولەیەك بایە دەردەپەڕی و هاواری دەکرد:"حەمەد هات"و رای دەکرد. ئاخرەکەشی دیتی خۆ شاردنەوە لەنێو ماڵ و تەویلەو دێهات دا سوودی نیە رووی کردە چیاو بەندەنان. هەر رۆژە لە ئەشکەوتێك دا خۆی شاردەوە. دەچوو لە

تاریکترین قوژبنی کونێك دا خۆی حەشار دەدا. نە نانی دەخوارد، نە ئاوی دەخواردەوە، نە دەخەوت. هەر لەوێ کوشم هەڵدەهات و دەمایەوە. پاشان لە نەکاو دەردەپەڕی و هەتا تینی تێدا بوو هاواری دەکرد:"عەلی، ئەوە دێ، نەجاتم بدە، ئەوە دێ"و باوەشی بە من دا دەکرد. بەم جۆرە لە عەلیکۆ ئەشکەوتێك نەما کونێك نەما کە نەچووبێن و سەرمان پێدا نەکردبێ. ئەو رۆژە بەیانی کە لە شوانێکی بیست ئەتۆ هاتوویە دەشتێ، نازانم بڵێم چەند خۆشحاڵ بوو. لە گەڕانەوە نایە. بە تەواوی زگم پێی دەسووتا."

حەمەد پرسی:

"بەزەییت بە هەمزەی دا هات؟"

عەلیپەشەل گوتی:

"بەزاتی خوای بەزەییم پێیدا هات. ئەو رۆژە لێکدا لێکدا دەیگوت:"حەمەد ناتوانێ بە ساغی لە چوکووراوا دەرچێ. چوکووراوا تەڵەی مەرگی چەتەکانە." دەیگوت:"ئەگەر نەجاتیشی بێ، نیوەگیان دەبێ و پاشانیش لێرە دەگیر من دەکەوێ. بەڵام ئەمن هیچ کارم پێی نیە. لە گیانی خۆش دەبم و دوو دانە لە دێیەکانیشمی دەدەمێ، ئەویش لە گیانی من خۆش دەبێ."

پاشان سەری وەسەر سەرینێ کردو نووست. سێ شەو و ڕۆژان خەوت. هەر کە وەخەبەر هات بانگی منی کردو گوتی:"زووبە عەلی، زووبە زووبە، سواری ئەسپەکەی من بەو دەسبەجێ برۆ بۆ چوکووراواو یارمەتیی عەلی سەفابەگ و یاوەری بدە. ئەتۆ نەبی کەس ناتوانێ لە چوکووراوای کاکی بە کاکی شوێنی ئەو شەیتانەی هەڵگرێ..." سواری ئەسپەکەم بووم و هاتمە چوکووراوا چوومەماڵی عەلی سەفابەگ. پێم گوت:"هەمزاغا سڵاوت عەرز دەکاو دەستی مەبارەکت ماچ دەکا." عەلی سەفا زۆری خۆش ویستم. نەیهێشت لەپەنای خۆی بەولاوەتر بچم. چەندین رۆژ لە لای مامەوەو وەك پاشایان میوانداریی لێکردم. بەردەوامیش لەبارەی شوێن گێڕان و وردەکارییەکانیەوە پرسیاری لێدەکردم. ئاخرەکەی رۆژێکیان پێم گوت:"ئاغا، ئەمن بۆ بەجێگەیاندنی فەرمانێك هاتوومە ئێرە. هاتووم شوێنی ئەو حەمەدۆکە بێقیمەتە بدۆزمەوە تا ئێوە بیگرن." گوتم:"هەتا وەختێك ئەو

زیندوویە، ئێمە ئاسوودەییمان نیە. پاشان هاتووم ئەوەشت عەرز کەم کە شوێنی ئەو حەمەدۆکە بەرەڵلایەم دیوەتەوە."

عەلی تا ئێستا روخساری حەمەدی ئەوەندە خەفەتبارو ئەوەندە رەق وەکوو بەرد نەدیبوو و تا ئێستاش ئەو بریسکەی پۆلایەی نێو چاوی بەو جۆرە نەدرەوشابووەوە.

پاش نیوەڕۆ بوو. لە جنووب، لە دووری، لەسەر دەریای مەرمەڕە پەڵە هەورە سپیەکان وردە وردە وێك دەکەوتن و گەورە دەبوون و بەرەو ئاسمان بەرز دەبوونەوە. پاش تاوێك شەپۆلێکی توندی رۆژبا هەڵستا. دنیا نەختێك فێنك بوو، و پاشان کەوت. ئەمجار دووبارە هەڵی کردەوەو دیسان خستیەوە. ئەودەم کە پەڵە هەورە سپیەکان بە تەواوی پڕ بوون، بەرەو ئاسمان هەستان و هەتا بەرزتر دەبوون روونترو گەورەتر دەبوون. پاش ئەوە رۆژبا بە توندی هەڵی کردو تۆزوخۆڵی وەحەوا خست. لەسەر جادەکان گێژەڵووکە هەستان و لە جنووبەوە بەرەو چیاکانی تووڕووس وەڕێ کەوتن.

حەمەد دەستی عەلیەشەلی گرت، چاوی لە چاویەوە بڕی و بێدەنگ بوو.

عەلی وەك لەگەڵ خۆی قسە بکا، گوتی:

"زۆر باشە."

حەمەد:

"ئەمن دەمەوێ سەرێکی وایوای بدەم."

عەلی گوتی:

"ئێستا کەوایە لە دەری شاری چاوەڕێت دەبم. بڕوانە! باش گوێ بۆ قسەکانم راگرە. ئاودرێکی وشك لە دەرەوەی شاری هەیە، پێی دەزانی؟"

"ئەرێ، دەزانم."

"باشە، راست لە لای راستی جادەکە لەو جێیە کە لە ئاودڕەکە دەچیە خوارێ، دارەبەنێکی زۆر پیرو کۆنەساڵ هەیە. لەبن ئەو دارەش قەبرێك هەیە. ئەم دارە تەنانەت لە تاریکێش دا وەك قیر دیارە. لەبن ئەو دارە چاوەڕوانت دەبم."

حەمەد خۆی هەڵداو سواری ئەسپی رووت بوو. هەوسارێك کە خەلیل چەندین رۆژ بە هۆنینەوەیەوە ببوو، لە ئەستۆی ئەسپەکەی کرد. کۆسە بێخەبەر لە دنیا لەو ئاوەوە ڕامابوو کە دەچووە قەڵشتەکانەوە.

حەمەد رووی تێ کردو گوتی:"گەردنم نازا کە خەلیل." ئەمجار ئەسپی دەنگ داو بێستانی بەجێ هێشت، چووە نێو هەورێکی تەپ و تۆزو کەمێك دواتر لە نێوەڕاستی گوندی وایوای لەبن تووە گەورە جڵەوی ئەسپەکەی کێشاو راوەستا.

وەسمانەزلە نەخۆش بوو، لە جێی دا کەوتبوو، بەڵام نەك لە ماڵێ خۆی بەڵکوو لەبن تووە گەورە جێیان بۆ لەسەر نیوتەختێك راخستبوو. دایەقەمەرو سەیران خزمەتیان دەکردو پێی رادەگەیشتن. لەسەر نیوتەختێکیش کە لەخوارەوەی وەسمانەزلە بوو جێی سەیفەلیان راخستبوو. دایکی سەیرانێ و دایکی دەلی مووسلوو کە رۆژی پێشتر کوڕەکەی لەبن چنارێ گیرابوو، لەوێ بوون. لەدێی دا جگە لەو چەند کەسە کەست نەدەدی. دێهاتیەکان بێئەوەی ناوڕێکیش وەدوای خۆیان بدەنەوە، دێیەکەیان بەجێ هێشتبوو.

سەیفەلی بە رق دا چووبوو، دەیگوت:"ناڕۆم و ناڕۆم، ئەمن دەمەوێ لەسەر عەرزی باب و باپیرانم بمرم." بە گریانەوە دەیگوت:"ناوێرم لە جێیەکی دیکە بمرم." ژن و منداڵەکەشی بەو حاڵە بەجێیان نەهێشت و لە دێی دا مانەوە.

جگە لەوانە چیا نشینەکان واتە بنەماڵەی سەیرانێش ماڵەکانیان بەجێ نەهێشتن، و خێزانی مەلا فەرهادیش لەلای وان مایەوە.

حەمەد لە ئەسپەکەی دابەزی و چوو بۆ لای وەسمانەزلە. وەسمانەزلە بە دیتنی وی هێدی هێدی سەری لەسەر سەرینێ هەڵگرت و تەماشای کرد، پاشان دووبارە سەری وەسەر سەرینەکەی کردەوەو چاوی پێکەوە نان.

روخساری ژاکاو و لە جاران پڕ گنج و لۆنج تر بوو. لەبەر چرچ و لۆچان تەنانەت چاویشی بە دەرەوە نەبوون. حەمەد چوو دەستیی لەنێو دەستەکانی خۆی گرت.

وەسمانەزلە بە زەحمەت چاوی هەڵێنان ، تەماشای حەمەدی کرد. حەمەد لە چاوەکانی دا دڵنێشانێکی دوور لە لێخۆش بوونی خوێندەوە.

حەمەد بە دەنگێکی پچڕ پچڕەوە گوتی:

"چۆنی مام وەسمان، بەڵا دوور بی."

وەسمانەزلە وەڵامێکی نەدایەوە. حەمەد بەینێك چاوەڕوان بوو بەڵام وەسمانەزلە دەنگی لێدەرنەهات.

حەمەد دیسان دووپاتی کردەوە:

"مام وەسمان، دەڵێم چۆنی؟"

وەسمانەزلە دیسان وەلاّمی نەدایەوە. دایەقەمەر نێوبژیی کردو گوتی:

"وەسمان، وەسمان بڕوانە حەمەد هاتوە گەردن ئازاییت لێ بخوازێ. کوڕەکە دەڕوا. لێت دەپرسێ چۆنی."

وەسمانەزلە چاوی هەڵێنان و تەماشای روخسای حەمەدی کردو تێیەوە راما. پاش تاوێك بە دەنگێك کە بەحاڵ و باڵ دەبیسترا، گوتی:

"پیر بووم رۆڵەم، پیر بووم، ماندوو بووم حەمەدم، ماندوو بووم، تێشکاوم کوڕم، تێشکاوم..."

ئیدی چاوەکانی لێك نانەوە. حەمەد زانی کە وەسمانەزلە بە توندی لێی زویرە. ئەگەر زویرو دڵڕەنجاو نەبایە پێی دەگوت شەهێنەکەم.

حەمەد چووە لای سەیفەلییش. ئەحواڵی ویشی پرسی. ملە درێژەکەی سەیفەلی ئەختێکی دیکەش درێژ ببوو. سەروچاوی هەموو بریندار بوون و بایان رێنیشتبوو.

حەمەد لە جێی خۆی هەستا. چاوی بەو گوندە چۆڵ وبێدەنگەدا گێڕا. چاوی سووڕا سووڕا هەتا لەسەر سەیرانێ راوەستا. پاشان دووبارە چووە لای وەسمانەزلەو دیسان دەستی وی لەنێو هەردوو دەستی خۆی گرت و ماچی کرد. ئەمجار بە دەنگێکی لەرزۆك و تێکەڵ بە گریانەوە گوتی:

"گەردنم ئازا کە مام وەسمان."

لێوەکانی وەسمانەزلە بزووتن. حەمەد چووە لای دایەقەمەر، دەستی ویشی ماچ کرد. دایەقەمەر لە باوەشێی کردو لاملی ماچ کرد. حەمەد پاش گەردن ئازایی لە هەموو ئەوانەی لەوێ بوون هات لە پەنا سەیرانێ راوەستا. بە هیچ جۆر نەیدەتوانی سەر هەڵبڕێ و تەماشای روخساری بکا. دەستی راستی سەیرانێ بە تەنیشتی دا بەر ببووەوە، بەسپایی گرتی و گوشی. پاشان دیسان بەسپایی وەك ئەوەی بترسێ دڵی بڕەنجێ سەیرانی لە باوەش گرت و لە حاڵێك دا هەروا سەری بەردابووەوە خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی، ئەسپی لینگ داو بەخێرایی لەنێو هەورێکی تۆزوخۆڵ دا لە دێی وەدەر کەوتەوە.

سەیران بێئەوەی بتوانێ پێی بڵێ خواحافیز، تۆغرت خێر بێ، بێئەوەی بتوانێ لە پشتەوەڕا چاوی لێبکاو بێئەوەی بتوانێ بگری یان پێبکەنێ هەروا لەبن تووە گەورە لەبەر هەتاوێ رەق راما.

وەختێك حەمەد گەیشتە دارەبەنەکەی نیزیك شاری، هەتاو لەمێژ بوو ئاوا ببوو. عەلیەیەشەل کە لە دوورەوە تارمایی‌یەکەی لە نێو تەپ وتۆز دا دیبوو، هاتە سەر ڕێگای.

حەمەد گوتی:

"عەلی."

"خۆمم."

حەمەد جڵەوی ئەسپەکەی توند کرد. عەلی گوتی:

"هەر ئێستا دەچین. ئەم وەختانە ئاغا لە ماڵێیە. ئەگەر لە ماڵێش نەبوو ئەتۆ دەچیە سەرێ و چاوەڕوانی دەبی. دەڵێی دورسوون دورمووش لە کێلگەوە منی ناردوە. لەبیرت نەچێ دورسوون دورمووش."

حەمەد گوتی:

"لەبیرم ناچێ."

"گومانت لێناکەن. هەموو شەوێ پیاوی وەك تۆ چەکدار زۆر هاتوچۆی ئەو ماڵە دەکەن."

بە کۆڵانە چۆڵ و تاریکەکانی شارۆچکەدا تێپەڕین و گەیشتنە دەرکی ماڵێك کە دیوارەکانی بڵیند بوون. دەرگایەکی گەورە بوو بەسەر دەروازەیەکی بەرزەوە.

عەلی لە ئەسپەکەی دابەزی و دەرگا دارینەکەی کردەوە. لاو لاوەی دەرگاکە جیڕەی لێهات. حەمەد ئەسپەکەی لێخوڕی بۆ ژوورێ و خێرا دابەزی.

عەلی جڵەوی ئەسپەکەی گرت و پلیکانێکی بە حەمەد نیشان دا کە نەختێك نیزیکتر بوو. حەمەد بە غاردان لە پلیکانەکان وەسەر کەوت و لە دەرکەی دا. دەنگی ژنێك لە ژوورێ ڕا پرسی:

"کێیە؟"

حەمەد بە ئارامی گوتی:

"ئەمنم، لەکێڵگەوە دێم. دورسوون دورمووش ئاغا ناردوومی. ئاغا لە ماڵێیە؟"

دەنگی ژنەکە لە پشتەوە هەستا کە بانگی ئاغای دەکرد:

"ئەفەرێك هاتوە، دەڵێ لە کێڵگەوە هاتووم، دورسوون ناردوومی."

حەمەد بە بیستنی دەنگی ئاغا کە دەیگوت:"بیهێنە ژوورێ." ئارامی‌یەکەی نەماو دڵەکوتەی وێ کەوت. ئاغا لەسەر جێی درێژ ببوو و ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە بوو. حەمەد

هەر کە چووە ژوورێ، بەسپایی دەرگاکەی پێوەدا. ئاغا سەری لەسەر ڕۆژنامەکە هەڵگرت و بە بێموبالاتی پرسی:

"چیە، دیسان چ بووە؟"

حەمەد لە نەکاو بە دەنگێکی قایم و دلێرانە گوتی:

"ئەمنم. ناوم حەمەدۆکە. دەم ناسی؟"

عەلی سەفابەگ ڕۆژنامەکەی لە دەست کەوتەخوارو هەروا لەسەر جێیەکەی مایەوە. ڕەنگی دەم و چاوی هەتا ڕەشکێنەی چاوەکانی وەك گێچ سپی بوو. لێوەکانی لەرزین. چەندین جار زاری کردەوەو پێکیەوە نایەوە بەڵام نەیتوانی یەك قسە بکا.

حەمەد ئەو فیلینتایەی بە دەستیەوە بوو، ڕای داشتێ و سێ جاری دەست پێدا هێنا. چرای ژوورەکە بە بای گوللەکان کووژایەوەو هەر لەو کاتەدا لەنێو خانووبەرەکە قیامەتێك بەرپا بوو. حەمەد بەسپایی لە پلیکانەکان هاتە خوارێ. هەوساری ئەسپەکەی لەدەستی عەلی وەرگرت، خۆی هاویشتە سەر ئەسپەکەی و بە چوارناڵی لەشاری وەدەر کەوت. پاش ئەوەی نەختێك لە شاری دوور کەوتەوە جڵەوی ئەسپەکەی گرت و گوێی هەڵخست. لە شاری جگە لە هەڵڵاو هەنگامەیەکی ناڕوون دەنگێك نەدەهاتە بەر گوێ. نە دەنگی تەقە دەهات و نە دەنگێکی دیکە.

دووبارە ئەسپی لینگ دا.

وەختێك گەیشتە ئاسیاب چەشمە خەریك بوو هەتاو بکەوێ. ئەسپەکەی یەکسەر لێخوڕی بۆ دەرکیماڵی عەبدیخان. لەبەر دەرگا ڕاوەستاو بانگی کرد:

"هەمزاغا، هەمزاغا."

هەمزە هەر کە گوێی لەدەنگەکە بوو دەرپەڕی و هاتە لای حەمەد" حەمەد دەمانچەکەی هەڵکێشاو بە دەنگێکی ئارام گوتی:

"وەپێش کەوە."

هەمزە ڕاوەستاو چەند لەحزەیەك لە حاڵێك دا لە پەستا چاوی دەترووکاندن، تەماشای ئەو پیاوەی دەکرد کە سواری ئەسپەکە بوو. ئەوی ناسی و لە کاتێك دا ڕای دەکرد بۆ نێوەڕاستی ئاوەدانی هاواری کرد:

"خەریکن دەم کوژن، خەریکن دەم کوژن." بە دەنگێك کە دەت گوت دەستیان لە بینێ ناوەو خەریکن دەیخنکێنن، هەر هاواری دەکرد:

حەمەدۆك خەریکە دەم...کو...ژێ، دەم کو... ژێ، دەم کو... ژێ!"

بەم لاو ئەولادا رای دەکرد. لەم دەرگاو ئەو دەرگای دەدا. بەڵام دەرگای هیچ ماڵێك نەدەکرایەوە. حەمەدیش بە مەودایەکی کەمەوە لێی وریا بوو. هەمزە ماوەیەك وەك تۆفانی شیوەن و گریان و ناهومێدی و مەرگ بە هەموو هێزیەوەو بە کەوتن و هەستانەوە لە دەرگای هەموو ماڵێکی داو بە پاڕانەوە گوتی:

"خەریکن دەم کوژن، خەریکن دەم کوژن، بە قوربانتان بم خەریکن دەم کوژن."

تەنانەت گەیشتە بەر دەرکی خۆشیان، پاڕایەوە، بەڵام دەرگای ماڵەکەی خۆیشی بۆ نەکرایەوە.

هەتا بەری پێیانی شەلاڵی ئارەق بوو. چاوی هیچیان نەدەدی، وەك مریشکی سەر بڕاو بەم لاو لادا دەڕۆیشت و شەکەت و داماو بە هەر چوار لای ئاوەدانی دا رای دەکرد. لەحزەیەك راوەستا. نەختێك بیری کردەوە، پاشان هەموو هێزی خۆی کۆ کردەوەو بەرەو دەرەوەی ئاوەدانی دەخۆی نووسا. هەتا لە دێی وەدەر کەوت، لانی کەم دە جار هەڵئەنگووت و تەپڵی سەری وە عەرزی کەوت و هەستایەوە.

حەمەد بێئەوەی بشڵەژێ و بێئەوەی مەودای نێوان خۆی و هەمزە کەم یان زیاد بکا، ئەسپەکەی بە دوادا لـێدەخوڕی. هەر جارێك هەمزە دەخۆی دەنووسا، ئەویش خێراتری لـێدەخوڕی و کاتێکیش ئەو ئارامتر دەڕۆیشت حەمەدیش لەسەرەخۆ لێی دەخوڕی.

بەم جۆرە هەمزە لە پێشەوەو حەمەد بە دوای دا، سێ جار بەدەوری دێ دا سووڕان. هەمزە تاوێك راوەستا، ئاوڕی دایەوەو بە چاوێکی حەبەساوەوە تەماشای حەمەدی کرد. پاشان دیسان لە نەکاو وەك شێتان رای کردەوە. گەیشتە نێو دێ. خۆی بەسەر پێوە ڕانەدەگرت. هەردووسێ هەنگاو دەڕۆیشت و دەکەوت. لەسەر خاك و خۆڵ پان دەبووەوە، پاشان بە زەحمەتێکی زۆر هەڵدەستایەوە، هەوڵی دەدا هەڵێ. حەمەد بەم جۆرە ئەوی هەتا گۆڕەپانی نێو ئاوایی بەکێش کردو لەوێ نەڕاندی:

"لێرە راوەستە."

کەس لەو دەوروبەرە نەبوو. گیان لەبەر دیار نەبوو. هیچ گیان لەبەرێك، تەنانەت نە سەگێك، نە پشیلەیەك و نە لە ئاسمان باڵندەیەك...

هەمزە بە دوا هەوڵ و توانای خۆی جارێکی دیکە هاواری کرد:

"فریام کەون، خەریکن دەم کوژن، خەریکن دەم کوژن و هەر لەوێ بە پێوە ڕەق ڕاما. بە چەپ و ڕاست دا بەلا دا دەهات و وەك گەڵا دەلەرزی. لە کاتێك دا ددانی، ددانی نەدەگرت گوتی:"ئاغای خۆم، مەم کوژە، هەر پێنج دێیەکەمت دەدەمێ، توخوا مەم کوژە..."

پاشماوەی قسەکەی بە سەری زمانیەوە ما. حەمەد فیشەکی دەمانچەکەی لەسەری بەتاڵ کردن. هەمزە دەسبەجێ نەمرد، بە پەنجەکانی دەستی کرد بە چنگەکڕکەو عەرز هەڵکەندن. وەك خول خولە بە دەوری خۆی دا دەسووڕاو عەرزی هەڵدەکەند.

حەمەد بە ئارامی فیلینتایەکەی لە شانی دەرهێناو سێرەی لێگرت. بەستەیەك فیشەکی بە هەمزەوە نان. هەمزە هەر لەوێ لەپەوڕوو جووڵەی لێبڕا. حەمەد بە سواری بە دەوری دا دەسووڕا. عەمباری تفەنگەکەی پڕ دەکردو لە تەرمی بێگیانی هەمزەی بەتاڵ دەکرد. وەك شێتان بە دەوری تەرمەکەدا ئەسپی لێدەخوڕی. نەیدەتوانی رقەکەی ئارام کاتەوەو بەستەیەکی دیکەشی پێوە دەنان.

ئەگەر کەسێك لە دوورەوە تەماشای حەمەدی کردبایە، پێی وابوو خەریکە سەمایەکی سەیری کۆن بە ئەسپەکەی دەکا.

سەرەنجام حەمەد ماندوو بوو. لەنێوەڕاستی گۆڕەپانەکە بەسەر ئەسپەکەوە لەسەر سەری مردووەکە قیت ڕاوەستا. ئارەقی کردبوو. ئارەق بە چۆڕە چۆڕ لە کاکۆڵە ڕەشەکانیەوە دەتکایە سەر ملی ئەسپەکەی. ئارەقی پشتێشی لە عەبایەکەی پەڕیبوو. ئەسپەکەش کەفی دەرکردبوو، ڕەنگی ئەسپی خەنەیی تاریکتر دیار بوو، و مەیلەوڕەشێکی وەك خەڵووز بوو.

جووتیارەکان چەندین جار بە ترس و لەرزەوە لە دەرگاو پەنجەرەی ماڵەکانیان ڕا سەرێکیان پێدا گرت. ئەویان وەك شاخێکی قایم و پتەو بەسەر ئەسپەکەوە دی و دوایە سەریان بردەوە دواوە.

ئەسپی خەنەیی وەك کوورەی ئاسنگەران دەهەندمی و حەمەد هەروا بەسەر ئەسپەکەوە مات و بێجووڵە ڕەق ڕامابوو.

هەتاو بەقەد سپیدارێك بەرز بوو، و حەمەدی بە دەم و چاوو مووی شەلاڵی ئارەقەوەو ئەسپی خەنەیی گەردن کێلی چاو گەورەی لە تیشك دا نوقم کرد. سێبەرەکان کورت و خڕ بوونەوە، دیسان دەنگێك لەنێو ئاوەدانی نەهات. بە جۆرێك کە دەنگی باڵی مێشوولەت گوێ لێنەدەبوو. هەموو جێیەك چۆڵ و بێدەنگ بوو.

دەت گوت لەو رۆژەوە ئەو دێیە دروست کراوە، گیان لەبەر پێی تێنەناوە. تەنیا بێدەنگی بوو و ئەسپێکی خەنەیی بە سوارەوەو لەو خوارەش کەلاکێکی خڕبووەوەو رەش هەڵگەڕاو و ئیدی هیچ... دەت گوت دنیا بەتاڵ و حەتاڵە" نە دەنگی پەلەوەرێك و نە وزەی باڵی زەرگەتەیەك. تەنیا لە دووری لە ئاسۆدا خاردەشت بە رەنگی شینەوە ئارام ئارام هەناسەی دەداو لە ژێر تیشك دا خەوی لـێکەوتبوو، و شتێکی دیکەش داباریني پوولەکەی تیشك بەسەر کەفەڵی ئەسپەکەدا بوو کە سات بە سات جوانتری دەکرد...

حەمەد بە سواری ئەسپەکە لە جێی خۆی مابووەوەو چاوەکانی وەك شەهێنێك بەنێو خانووەکان دا دەگەڕان و لە مەیدانە چۆڵەکانی ئاوەدانی بەخۆڕایی بۆ جووڵەیەك و دەنگێکیان دەڕوانی. حەمەد چاوەڕێ بوو:"ئێستا دەرگایەك، پێنج دەرگا، دە دەرگاو دەرکی هەموو ماڵەکان دەکرێتەوەو خەڵك هەر ئێستا... تاوێکی دیکە مەیدانەکە پڕ دەکەن." بۆچی ئەو چاوەڕوانییەی هەبوو؟ بۆخۆشی نەیدەزانی. بەڵام دیسان چاوەڕێ بوو.

ماوەیەکی دووروودرێژ چاوەڕێ ما، دێیەکە هەر بێدەنگ ترو چۆڵتر بوو. حاشا لە رێبوارێکیش. حەمەد لە تاسەی دەنگێکی چووکەڵەدا دەسووتا. لەپڕ بە دەنگی پێیەك کە بەسپایی لە دوورەوە دەهات، تێك ڕابوو. وەختێك سەری بۆ لای دەنگەکە وەرسووڕاند، دایەحۆریی دیت کە جوانترین جلکەکانی لەبەر کردبوون، چارشێوی سپیی بەسەرەوە بوو، گوارەو گەردن بەندە مەرجانەکەی لە ملی کردبوو، پشتێنە ئاوریشمەکەی کاری تەڕابولسی لە پشتێ بەستبوو و لەسەر ڕا دەهاتە خوارێ.

سەری ئەسپەکەی بۆ ئەولایە کە ئەوی لـێ ڕا دەهات، وەرسووڕاندو رۆیشت بۆ لای. تاوێك دواتر گەیشتنە رووبەڕووی یەکتر. رەنگ و رووی حەمەد کرایەوە، زەردەخەنەیەکی هاتێ و تەماشای یەکتریان کرد. پاشان هەردووکیان سەریان وەرسووڕاندو تەماشای ئەو مردووەیان کرد کە درێژاو درێژ لەسەر زەوی کەوتبوو. دایەحۆرییش زەردەی هاتێ. پاشان چاویان سەرانسەری جادەکەی بەتاقی کردەوەو دووبارە هاتەوەو لەسەر تەرمەکە چەقی. قوولکە بەردەکەی نیزیك تەرمەکە پڕ لە خوێن بوو، مێشە شینکەیەك لەسەر خوێنەکە وەك بریسکە دەدرەوشایەوە.

دیسان چاویان لە چاوی یەکترەوە بڕی. حەمەد دوو هەنگاوی دیکە ئەسپەکەی بۆ لای دایەحۆری لـێخوڕی و گوتی:

"دایە، دایە، دایە گەردنێم ئازا کە."

دایە حۆری هیچی نەگوت و قسەی بە زمانی دا نەهات. حەمەد جڵەوی ئەسپەکەی بۆ لای عەلیکۆ وەرسووڕاندو لینگی دا. ئەسپی خەنەیی وەك هەورە تریشقە لە دێی دوور کەوتەوەو وەك تیرێکی رەش بەرەو عەلیکۆ هاویژراو بە دەمەساتێك لەبەر چاو ون بوو.

کەلاکی هەمزە دوو رۆژی دیکە هەر لەوێ لە پەنا قووڵکە بەردەکە لەسەر زەوی مایەوە. جووتیارەکانیش لە ماڵەکانیان نەهاتنەدەر. تەنیا ئەوانەی زۆریان حەز دەکرد بزانن چ باسە، لە کەلێنی دەرگاوە سەریان دەردێناو ئەوەندەی چاویان دەیدی تەماشایەکی ئەو تەرمەیان دەکرد کە لە نێوەڕاستی مەیدانەکە کەوتبوو. پاشانیش دەسبەجێ سەریان دەبردەوە دواوە.

بەیانیی سێهەمین رۆژ حەسۆ شێلم لە حاڵێك دا پەتێکی بە دەستەوە بوو لە ماڵێ هاتە دەر، گەیشتە نێوەڕاستی مەیدانەکە. پەتەکەی لە لاقی مردووەکە خست، مردووەکەی بە راکێش راکێش بردە شوێنێکی دوور لە ئاوایی و هەڵی داشتە لێژاییەك کە لە خوار ئاشەکەی سمایلەزلەوە بوو. لە حاڵێك دا پێدەکەنی، گوتی:

"سزای خۆت وەرگرت قـ...ی کەچەڵ. کافر، باشیان هەقی خۆت نایە بەری دەستت. ئێستا بڕۆ ببە بە خۆراکی سیسارگە کەچەڵە"

پاش لابردنی تەرمەکە، جووتیارەکان ماوەیەك بێئەوەی کارێك بکەن و رەش و سپی لەسەر یەك دانێن و بێئەوەی قسەیەك لەگەڵ یەکتر بکەن، بە سام گرتوویی تەمبەڵ و بێکار دەستیان بەردانەوەو لەنێو دێی دا دەهاتن و دەچوون...

جووتیاران رۆژێك بە پارێزەوە چوون دەرگای عەمباری خواردەمەنیی هەمزە کەچەڵیان کردەوە. ژنەکانی هەمزە بێئەوەی ناڕەزاییەك دەربڕن لە دوورەوە وێستابوون و بە بێ مووبالاتی تەماشای ئەو جووتیارانەیان دەکرد کە عەمباری خواردەمەنیان دەکردەوە. عەمبار پڕ بوو لە تەنەکە رۆن و تەنەکە هەنگوین و هیزە دۆشاو، سندووقە کشمیش، بادام، گوێز، مێوژەتوو، لەتکە سێو و لەتکە هەرمێ. خواردەمەنییەکە لە پێش چاوی هەموو خەڵکی دێ بێ ئەوەی چووکترین ناڕەزایەتی و شکایەتی لێ پەیدا بێ، برایانە دابەش کرا. بەشی ژنەکانی هەمزەشیان وەلا ناو گوتیان:"بگرن، ئەمەش بەشی ئێوە."

پاش ئەوەی ماوەیەکی زۆر بەسەر دابەش کردنی خواردەمەنی‌یەکەدا رابرد، خەڵکەکە رۆژێك لەبەر دەرکی ماڵی هەمزە کۆ بوونەوەو داوای پووڵ و پارەکانی خۆیان کردەوە. یەکێك لە ژنەکان توورەکەیەکی گەورەی هێناو دایە دەستیان کە لێواو لێوا پڕ لە پارەی کاغەز بوو. دانیشتن و دراوەکەشیان وەك برایان دابەش کردو بەشی ژنەکانی هەمزەشیان جیا کردەوەو وێیان دان. پاشان هەرکەسە چوو، ئەسپ و ولاغ و بزن و گاو مانگای خۆی کە زۆربەیان هەمزەکەچەڵ هێشتا نەی فرۆشتبوون، لە دەرکی ماڵی هەمزە ڕا بردەوە بەر دەرکی خۆی. ئەمجار دەرگای ئەو عەمبارانەیان کردەوە کە چەندین ساڵ بوو پڕ کرابوون لە گەنم و جۆو هەرزن و ئەویشیان برایانە دابەش کردو وەك هەمیشە بەشی ژنەکانی هەمزەش دیاری کرا.

جووتیاران هەمووی ئەم کارانەیان زۆر بە بێدەنگی، کەمێك بە ترس و پارێزەوەو نەختێکیش بە شەرمەوە، ئارام و بێ هەرواو هەنگامە جێبەجێ کرد.

پاییز داهات، بەڵام کەس وەخۆ نەکەوت. بای ساردی پاییزێ هەڵی کرد، سێبەرەکان درێژو رەنگ پەڕیو و بێگیان بوون. دڕووەڵانەکان وشك بوون و چەقڵەکان پەڕین، بەڵام دیسان چووکترین جموجۆڵ بۆ کاروکاسبی لە کەس نەبینرا.

ئەگەر دەنگی دەهۆڵی "ئەبدال ئۆغڵی بایرام" فریایان نەکەوتایە، بێگومان وەرزی وەردو شێویش دەهات و دەڕۆیشت و جووتیارەکان هەروا دەستیان دە پاش خۆیان دەگرتن و شانیان بە پشتەوەدا لار دەکردنەوەو لە یەکترەوە رادەمان و لەنێو دێ دا دەسووڕانەوە.

رۆژێکیان بەیانی هێشتا هەتاو نەکەوتبوو، لە گۆڕەپانی نێوەڕاستی دێ دەنگی دەهۆڵێکیان هاتە بەر گوێ. دەنگی دەهۆڵەکە بڵیندو پڕ متمانەو سەنگین بوو.

جووتیارەکان دەسبەجێ زانیان کە ئەو دەهۆڵ کوتە لە ئەبدال ئۆغڵی بایرام بەولاوە کەس نیە. چونکە لە سەرانسەری تووڕووس دا کەس نەبوو بتوانێ وەك بایرام دەهۆڵ بکوتێ. "جومەك"ی کوڕیشی زوڕنای لێدەدا. ئەویشیان بە دەنگی زوڕنایەکەی ناسیەوە.

ئەبدال ئۆغڵی بایرام لەگەڵ کوڕەکەی بە هەموو قەوەتی خۆی دەهۆڵی لێدەدا، دادەنیشت و هەڵدەستایەوە، هەڵبەز دابەزی دەکرد، دەیگوڕاندو هەڵڵاو هەنگامەی وەڕێ دەخست، هەڵدەسووڕاو سەمای دەکرد. خۆی لەنێو جۆش و خرۆشێکی بێپایان دا بەرەڵڵا کردبوو، ببوو بە گەردەلوولێك لە شادی و دڵخۆشی و لەنێو ئاوایی دا دەستی کردبوو بە گرمەو هەرا. ئەبدال ئۆغڵی ئەوەندەی عومری خۆی وەبیر دەهات هەرگیز ئاوا شادو بە کەیف نەببوو.

لای نیوەڕۆیە بوو کە جووتیارەکان یەك یەك هاتنە گۆڕەپانەکە. تەڕو تەمیزو پاك و خاوێن بوون. جوانترین جل و بەرگی رۆژانی جێژنیان لەبەردا بوو. ژنە بەساڵداچووەکان چارشێوی زۆر سپی‌یان بەسەر خۆیان دا دابوو، و کچانی جحێڵ دەسماڵی واڵی سووریان بە سەرەوە بوو. جلکی رەنگاوڕەنگی سوورو سەوزو بنەوشی‌یان لەبەر کردبوو.

ئەو رۆژە دایە حۆری ببووە یەك چەپکە گوڵ، بە جۆرێك کە لەنێو ئەو هەموو حەشیمەتەدا دیار بوو. هاتن و گۆڕەپانەکەیان پڕ کرد. لە گۆڕەپانی ئاوایی دەرزیت هەڵاویشتبا نەدەکەوتە عەرزی. چەند لەحزە دواتر، حەشیمەت کەوتنە تەماشای سەماو هەڵپەڕینی بایرام و جومەك. جووتیاران لە مەیدانی ئاوایی‌دا لەنێو هاوارو خرۆشی خۆشحاڵی‌یەکی مەزن دا سووڕان و سووڕان و بەدەم شایی و هەڵپەڕینەوە بەرەو دڕووەڵان وەڕێ کەوتن.

دەنگی دەهۆڵی بایرام گەیشتە بەر گوێی جووتیارانی گوندەکانی دیکەی خاردەشتیش. لەو دێیانەشەوە دەنگی دەهۆڵ دەهات. ئەوانیش بەرەو دڕووەڵان وەڕێ کەوتن. دانیشتووانی هەر پێنج دێ وەڕێ کەوتن و لەلای رۆژهەڵات، لەسەرەتای دڕووەڵانەکە لە بناری چیای عەلی‌کۆ یەکیان گرتەوە. لاوان داسەکانیان بەدەستەوە گرت و دڕووەکانیان دروون، و کچەکان دڕووە درووەاوەکانیان کۆ کردەوەو کردیاننە قۆرپی گەورە گەورە. بایرام بە دەهۆڵەوە چووە سەر یەکێك لەو قۆرپیانەو دەستی کرد بە سەما، سەمایەك کە تا ئێستا جووتیارەکان وێنەی‌یان نەدیتبوو. بایرام خۆی لێك دەکێشایەوە، خڕ دەبووەوە، بە دەوری خۆی دا دەسووڕاو باسکی تێك با هەڵدەدان. ئەمە هەڵپەڕینێکی یەکجار کۆن بوو. جووتیاران بە ئیشارەیەکی بایرام کە هەروا سەمای دەکرد، ئاگریان لەو قۆرپیە دڕووە بەردا کە ئەو سەمای لەسەر دەکرد. بایرامیش لەنێو بڵێسەی ئاگرەکەدا لە کاتێك دا جووڵاندنی ئەندامانی لەشی لەگەڵ سەمای بڵێسە ئاگرەکان رێك دەکەوت، هەروا سەمای دەکرد. وەك گڕی ئاگر شەپۆلی‌دا، سووڕاو ئەمجار قیت و قنج لەنێو ئاگرەکە هاتە دەرێ و تێکەڵ بە حەشیمەتەکە بوو.

گڕی ئاگر لەقۆرپیە دڕووەکانەوە گەیشتە دەشتەکە. سەرانسەری ئەو دەشتە کە بە دڕووی وشك داپۆشرابوو بە جارێك گڕی گرت. بای زریان بڵێسە ئاگرەکانی هەڵگرت و بڵاوی کردنەوە، بەم لاولای دا بردن و رشتنی، بڵاوی کردنەوەو گەیاندنیە لای جنووب.

لە دڕووەڵانەوە دەنگی قرچە قرچی سووتانی چەقڵی وشك دەهاتە بەر گوێ و هەراو هەنگامە شەوی پڕ کردبوو. گڕەکان لەم سەری دەشتەوە غاریان دەدا بۆ ئەوسەر. لای پارشێوان سەرانسەری دڕووەڵانەکە گڕی گرت و دەشتەکە لەنێو لافاوی ئاگردا کەوتە شەپۆل دان.

ئیدی خەبەرێك لە حەمەدۆكەوە نەهات و ناوو ناوبانگی ون بوو.

لەو رۆژەوە تا ئێستا جووتیارانی خاردەشت هەموو ساڵێ پێش وەرد برین لە پێش دا دێنە دڕووەڵانەكەو بە بەرپا كردنی رێوشوێنی جێژن دڕووەڵانەكە دەسووتێنن. بڵێسە ئاگرەكان سێ شەو و رۆژان وەك لافاو بەو دەشتەدا دەڕۆن و دەسووڕێن. دەشت لەنێو گەردەلوولێكی ئاگردا دەكەوێتە جموجۆڵ و دەنگی قرچە قرچی سووتانی دڕووەكان دێتە بەر گوێ. هاوكات لەگەڵ ئەم سووتمانە تۆپەڵە نوورێك لەسەر لووتكەی عەلیكۆ دەتەقێتەوەو لووتكەی چیایەكە سێ شەوان وەك رۆژی رووناكی لێ‌دێ.

